# تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز

بەرگی دوازدەیەم

تەفسیری سوورەتەکانی

(الرعد ، إبراهيم ، الحجر)

عەلی باپیر

# پێناسەی کتێب

ناوی کتێـــب : تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز.

نـووســـەر : عەلـی باپـیر.

نەخشەسازیی ناوەوە : عزالدین محمد عمر.

نۆرەو ساڵی چاپ : یەکەم ١٤٤١ ك- ٢٠١٩ز .

تـــیـراژ : ١٠٠٠ دانە .

لە بەڕێوەبەرایەتی گشـتی کتێبـخانەکان ژمارەی سـپاردنی (٧)ی ساڵی (٢٠١٢)ی پێ دراوە

# پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتی

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ باللهِ مِنْ شُرُورِ أنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيئَاتِ أعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأشْهَدُ أنْ لاَ إلَهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢ ﴾ آل عمران، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ ﴾ النساء، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١ ﴾ الأحزاب .

أمَّا بَعْدُ: فإنَّ أصْدَقَ الحَدِيث كَلامُ الله، وَخَيْرَ الْهَدِي هَدْيُ مُحَمَّد ﷺ وَشرَّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلُّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ، وَكُلُّ ضَلالَةٍ فِي النَّار[1] .

خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکان !

هیچ گومانی تێدانیە - بۆ مرۆڤی بڕوادار - کە ئەو تەمەنەی لە خزمەت دوایین کتێبی خوا (قورئان)دا بەسەردەبرێ، جا بە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی لە خزمەتدابووندا بێ؛ خوێندنەوە، تێفکرین و رامان، فێرکردن، کارپێکردن ... هتد، بە باشترین جێگرتن جێگا دەگرێ و ، خاوەنەکەی لە دنیاو دواڕۆژدا لێی بەهرەمەندە

---

١) ئەوە پێی دەگوترێ: (خطبة الحاجة) کە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی فێردەکرد ، پێش هەر قسەیەکی گرنگ . بیڵێن، وەك وتاری جومعەو داخوازییکردن (خطبة)و... هتدو، ئەم وتارە . هەرکام لە: الترمذي: (١١٠٥)، النسائي: (١١٠٤)، ابن ماجه: (١٨٩٢) أحمد: (٣٧٢٠)، طبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێکی هێناوە

منیش کە - وەك باسکردنی چاکەی خوا (التحدّث بنعمة الله) دەیخەمەڕوو- لەوەتی فامم کردۆتەوە، خوای بەبەزەیی‌و بەخشەر چاکەی لەگەڵ کردوومەو، بە فەرمایشتی بەرزو بێ وێنەی خۆیەوە سەرگەرمی کردوومەو، بەر لە تەمەنی بیست ساڵییەوە هیدایەتی داوم، کە قورئانی بەرێزو پێز لەبەر بکەمەو، سەرقاڵی خوێندنەوەی تەفسیرەکانی قورئان‌و تێوەرامانی ئایەتە پڕ بەرەکەتەکانی‌و، لێوردبوونەوەیان بم.

هەر بۆیەش تێکڕای کتێب‌و نامیلکەو وتارو دەرسەکانم، کەمەو زۆر لەبەر ڕۆشنایی قورئان دابوون، کە دیارە هەر ئەمەش شتێکی سروشتییە؛ ئاخر ئایا ئیسلام بێجگە لە قورئان پاشان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەویش هەر ڕوونکردنەوەی قورئان‌و چۆنیەتی جێبەجێکردن‌و کارپێکردنیەتی، شتێکی دیکەیە؟! بێگومان نەخێر.

ئنجا لەمێژ ساڵیش بوو کە براو خوشکانێکی دڵسۆزی نزیك‌و ئاشنام، داوایان لێدەکردم کە دەست بکەم بە دانانی تەفسیرو لێکدانەوەیەکی قورئان، هەتا لە ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٨)دا هاتە دڵمەوە، کە ناوی خوای لێبهێنم‌و دەست بەو کارە گەورەو گرنگە بکەم، بەڵکو وردە وردە بەپێی بوارو دەرفەت، هەرساڵە هەندێکی لێ ئەنجام بدەم، لەگەڵ سەرقاڵیی زۆرو جۆراو جۆریشدا، هەتا دەرفەتێکی وام بۆ دەرەخسێ کە بتوانم خێرایی تێدا بکەم‌و خۆمی بۆ یەکلایی (متفرّغ) بکەمەوەو، خوا پشتیوان بێ تەواوی بکەم، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ.

سەرچاوەی دانانی ئەم تەفسیرو لێکدانەوەیەشم ، وێڕای سەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسیرانەی کە باون‌و ، دەستم پێیان گەیشتوە، بریتیە لە وردبوونەوەو تێوەرامانی خۆم لە خودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان : هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوە: (القرآن يُفسّر بعضُهُ بعضاً)، پاشان سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە پێغەمبەری خواش ڕوونکەرەوە (مُبيِّن)ی قورئانە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿ ...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾

النحل، واتە: وە زیکرمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار ، تاکو ئەوەی بۆ خەڵکی نێرراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بکەیەوە، وە بەڵکو خۆشیان بیربکەنەوە.

ئومێدیشم وایە - بە یارمەتی خوای بەخشەر ﷻ - شایستەیی ئەوەم هەبێ تەفسیرو لێکدانەوەیەکی وا بۆ قورئان پێشکەش بە مسوڵمانانی کوردستان بکەم،

کە لە قورئـان بومشـێتەوەو ، مایەی بەهرەو سوودی خوێنـەران بێ، بەتایبـەتیش کـە زیـاتر لـە سی (٣٠) سـاڵە لەگـەڵ قورئـانی بـەرزو مـەزن‌و تەفسیـرەکانی‌و کتێبـەکانی سوننەتدا خـەریکم‌و ، دەیـان کتێب‌و بەرهـەمی جۆراوجـۆرم لـە زۆربـەی بوارەکـانی زانسـتەکانی شـەریعەتدا پێشـکەش کردوون.

شایانی باسیشە کە ئەو بیست‌و دوو مانگ زیندانیی کرانەم لەلایەن ئـەمریکاوە - لـە (٢٠٠٣/٧/١٠ تـاکو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفـەتێکی گـەورەو گـرنگ بـوو، بـۆ زیـاتر پێـدا قووڵـبوونەوەی کتێبـی خـوا (تبـارك و تعالى)، وە بۆ پەیدابوونی تێگەیشـتنی تایبـەت لەبارەی زۆرێك لە نایەتـەکانی‌یەوە ، ئەم ڕاستییەش لە مەوسووعەی : (الإسـلام كما يتجلّى في كتـاب الله تعالـى)دا زۆر چـاك دەرەوشـاوەتەوە[1]، بـەڵام هـەڵبەتە نالـێم‌و هیچکەسـیش بـۆی نیـە بڵـێ: کـە ئـەم تەفسـیرەی مـن تێروتـەواوە، چـونکە وێـڕای سـنووورداربوونی توانـاو بڕسـتم ، لـە بەرانبـەر کتـێبی لـە هـەموو ڕووێکـەوە ڕەهـا (مطلق)و بێسـنوور (لا محـدود)ی خـوادا، نەشمـویسـتوە کـە زۆر بەمـلاولادا بچـم‌و بچمـە نێـو هـەندێك وردەکـارییەوە، کـە یـان مـن تێیـدا پسپۆڕو شـارەزا نـیم، یـان خوێنـەر پێویسـتی پێی نیـە، لـە کاتێکدا دەیـەوێ لـە قورئـان تێبگـات‌و، بزانـێ خـوا (تبارك وتعـالى) ڕاستەوخۆ چی پێ فـەرمووە ؟!

ئنجا هـەر لێرەشەوە بـە پێویستی دەزانم پڕ بـە دڵ سوپاسی ئـەو بـرا گەنجە ڕووح سـووك‌و گـورج‌و گـۆڵ‌و دڵسـۆزە بکـەم (حـەزی نـەکرد نـاوی بهێـنم)، کـە هـەڵسـا بـە نووسینەوەو هێنـانە سـەر کاغـەزو، پاشان تایپکردن‌و دوایی پێداچوونەوەو هەڵەگـیریی، سـەرجـەم ئەم زنجیـرە دەرسە، کە لە ئەسڵدا لە شێوەی وتـار (محـاضرة)دا پێشکەش کراون، هـەروەها هـەڵسا بە (تخريج)ی سەرجەم دەقەکانی سوننەت، لە سەرچاوە متمانە پێکراوەکانەوەو، زەحمەت‌و ماندووبوونێکی زۆری بە سەرجەم بەرگەکانی ئەم تەفسیـرە کێشـاوە، خـوا بە باشـترین شـێوە پاداشتی بداتەوەو، هـەر صـاڵح‌و سـاغ‌و سـەلامەت‌و

---

١) ئەو مەوسووعەیە کە ئێسـتا چاپ کراوەو ، کەوتۆتـە بەردەسـتی خوێنەران‌و، سـەرجەم هەشـت بـەرگ‌و دەوری سـێ هـەزارو پێـنج سـەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیـەو، هـەوڵمـداوە بەگشـتی تێیـدا باسـی سەرجەم لایەنەکانی ئیسلام بکەم‌و، تاکە سـەرچاوەشم قورئـان بـووە، وێـڕای دەقـەکانی سـوننەت، کە لە هۆش (ذاكرة)دا بووون.

شایانی باسـە ئەو مەوسووعەیە لە چاپی دووەمـی دا ، کـراوە بـە دوازدە (١٢) کتێبـی سـەربەخۆ ، بە مەبەستی ئاسانتـر سوود لـێ بینـرانی

سەربەرزبێ[1]، لە خوای بەرزو بێهاوتاش داواکارم ئەو جۆرە گەنجو لاوانە لە کوڕان و کچان، لەنێو گەلەکەماندا، زۆر بکات

شایانی باسیشە کە ئێمە لەم تەفسیرەماندا باسی بەش (جزء)ەکانی قورئان و دابەشکردنەکانی دیکەی وەك: - (حزب) - ناکەین، چونکە هەر سوورەتێك بۆخۆی شتێکی سەربەخۆیەو، سەرجەم ئایەتەکانی وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك پێکەوە پەیوەستن و، ئاشکراشە کە دابەشکرانی سەرجەم قورئان بۆ سی (٣٠) بەش (جزء) و شەست (٦٠) (حزب)، شتێکە لەلایەن زانایانەوە کراوە، بۆ ئاسانکاریی خوێندنی قورئان، دیارە ئێمە لە دابەشکردنی بەرگەکانی ئەم تەفسیرەشدا، دیسان حیساب بۆ بەشەکان (أجزاء)ی ناکەین و، بە گوێرەی سوورەتەکان، بەرگەکانی دیاریی دەکەین.

دوا قسەشم ئەوەیە کە:

ئەم تەفسیرە - وەك پێشتر گوتمان - لە ئەسڵدا بەشێوەی دەرس و وتار پێشکەش کراوە، بەڵام دواتر خۆم دووجار بە وردیی پێیدا چوومەوەو، بەپێی پێویست دەستکاریم کردوە، دیارە هەموو دەرسێکیش بەناوی خواو ستایشی خوا ﷻ دەستی پێکردوە، بەڵام ئێمە لە سەرەتای دەرسەکانەوە ، ئەوانەمان لابردوە، بۆ زۆر دووبارە نەبوونەوەو، ئەو (خطبة الحاجة)یەی لە سەرەتای ئەم پێشەکییەوە هاتوە، لەجیاتی سەرەتای سەرجەم دەرسەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ، وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧ هەولێر

---

١) ئەو برا دڵسۆزە ئێستاش پاش سوورەتەکانی (الرعد، إبراهيم، الحجر)، سەرگەرمی سوورەتی (النحل)و سوورەتەکانی دوایشیەتیو عەزمیشی جەزم کردوە ، کە ئەگەر تەمەنمان بەردەوام بێ ، هەتا کۆتایی ئەم تەفسیرە سەرگەرمی کارەکەی بێ

# بەرچاوڕوونییەکی گرنگ لەبارەی ئەم تەفسیرەوە

خوێنەری بەڕێز !

هەرچەندە لە (پێشەکی گشتیی) ئەم تەفسیرەدا باسمان کردوە کە بۆ نووسینی ئەم تەفسیرە لە هەموو ئەو تەفسیرە باوانەی دەستم پێیان گەیشتوە بەهرەمەندبووم، هەروەها لە کۆتایی هەر بەرگێکی ئەم تەفسیرەدا، سەرجەم ئەو تەفسیرانەی کەمو زۆر لێیان سوودمەند بووم ناوەکانیانمان بە ڕیز نووسیوە، بەڵام لێرەش وەك جەختکردنەوەی زیاترو بەرچاوڕوونیی باشتر بۆ ئێوەی بەڕێز دەڵێم :

مادام ناوی تەفسیرەکانمان نووسیوە، نە پێویست دەکاتو نەدەشگونجێ بۆ هەر تێگەیشتنو بیرۆکەیەك، کە زۆربەی تەفسیرەکان لەبارەی ئایەتێکەوە، یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێکەوە، دەیهێنن، ئێمە هەموو جارێ ناوی ئەو تەفسیرانە بێنین، بەڵام بێگومان هەر کات بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتی یەکێك لە تەفسیرەکان هەبیو بکەوێتە بەرچاوم، ئنجا چ پەسندی بکەم، چ ڕەفزی بکەم، هەر کات بە پێویستی بزانم، بە تایبەت ئاماژەی پێدەکەم، ئەگەرنا بە ئاماژەی گشتیو بە نووسینی ناوی تەفسیرەکان لە کۆتایی هەر بەرگێك دا، ئیکتیفا دەکەمو، زۆریش لە ئەمانەتی زانستیی (الأمانة العلمية) دەخەفتێمو مەبەستمە ڕەچاوی بکەم، چونکە ئەمینییو ئەمانەت پارێزیی، ڕەوشتێکی گەورەو بەرزی مسوڵمانەتییە

شایانی باسیشە جاری وا هەیە بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتیی خۆمم دەربارەی کۆمەڵە ئایەتێك یان ئایەتێك یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێك، بۆ دروست دەبێ، وەك تێگەیشتنو بۆچوونی خۆم دەینووسم، کەچی ڕەنگە لە تەفسیرەکانی دیکەش – یەکێکیان یان زیاتر – دا هەبێ، ئەویش بەهۆی ئەوەوەیە کە من ئەو تەفسیرەم نەکەوتۆتە بەر دیدە ، یان دیتوومەو لەیادم نەماوە

# پێشەکی ئەم بەرگە

**خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکانم !**

**ئەم بەرگی دوازدەیەمە لە تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز سێ سوورەتان دەگرێتە خۆی : سوورەتی (الرعد)و سوورەتی (إبراهیم)و سوورەتی (الحجر)، شایانی باسە کە وێڕای تەفسیرکردنی ئایەتەکانی ئەو سێ سوورەتە، بە حەوت قۆناغ وەك عادەتی خۆمان – لەم تەفسیرەدا – ئەم بابەتانەش لەم بەرگی (١٢)یەدا هاتوون:**

**١/ لە تەفسیری سورەتی (الرعد) دا :**

**١) کورتە باسێك لەبارەی گۆڕانکارییەوە لە ژیانی مرۆڤ دا**

**٢) کورتە باسێك لەبارەی ئۆخشبوونی دڵانەوە بە یادی خوا**

**٣) کورتە باسێك لەبارەی (اللّوح المحفوظ) و زانیاریی خوا و سڕینەوەو چەسپاندنی خواوە.**

**٢/ لە تەفسیری سورەتی (إبراهیم) دا :**

**١) پێناسەی (شکر) و ئاکامی شوومی سپڵەیی (کفران**

**٢) دە (١٠) لە چاکەو نیعمەتەکانی خوای بەخشەر، لە ژیانی مرۆڤ دا.**

**٣) چەند زانیارییەك کە زانستی مرۆڤناسیی تازە پێیان گەیشتوە**

**٤) کورتەیەك لە بەسەرهاتی ئیبراهیم و هەڵوێستەکانی .**

**٣/ لە تەفسیری سورەتی (الحِجْر) دا :**

**١) کورتە باسێك لەبارەی بورجەکانەوە**

**٢) کورتە باسێك دەربارەی گوێگرتنی شەیتانەکان لە هەواڵی ئاسمانەکان و بەردبارانکردنیان بە بڵێسەی ئەستێرەکان**

٣) سەرنجێکی پێویست

٤) هەڵوەستەیەك لە بەرانبەر بەش بەشکردنی قورئان و ئیسلام دا

٥) بەسەرهاتی صالح و گەلەکەی (ثمود)

٦) یازدە ڕێنمایی و ئامۆژگاریی گرنگی خوا بۆ پێغەمبەرەکەی

پێویستە ئەوەش بڵێین :

کە ئەم بەرگە زۆر دواکەوت، بەڵام خوا یاربێ لەمەودوا بەرگەکانی دیکە ، خێراتر لە جاران بە دوای یەك دا چاپ دەکرێن، ستایش و سوپاسی شایستەش بۆ خوا : ئێستا لە تۆمارکردنی دەرسەکانی ئەم تەفسیرەدا ، گەیشتووینە سووڕەتی (غافر) کە لە جوزئی بیست و چوار (٢٤)ە، خواش پشتیوان بێ ئەو شەش جوزئەی ماویشن لە ماوەی چەند مانگێك دا تەواو دەکەین

هیواداریشم خوێنەرانی بەڕێز، بە وردیی و قووڵیی ئەم تەفسیرە بخوێننەوەو کارلێك (تفاعل)ی باشی لەگەڵدا بکەن و ، هەوڵبدەن بەردەوام حاڵیبوونەکەیان لە خۆیان دابکەنە حاڵ و، زانینەکەیان بگۆڕن بۆ توانین، چونکە بێگومان پێزو بەرهەمی زانیاریی و شارەزایی ، لە کارپێکردنی دایە

سُبْحانَكَ اللّهُمّ وبحمدِكَ، أشهَدُ أن لا إله إلاّ أنتَ ،

أستغفِرُكَ وأتوبُ إليك .

١٩ صفر ١٤٤٠ ك

٢٠١٩/١٠/١٨

هەولێر

# دەستپێك

بەڕێزان !

خوای پەروەردگار پشتیوان بێ لەمڕۆ بە دواوە، کە ئەمڕۆ: (٢٠/ ٩/ ٢٠١٦) زایینییە، ڕۆژی سێشەم، بەرانبەر: (١٩/ ذي الحجة/ ١٤٣٧) کۆچیی، دەست دەکەین بە تەفسیرکردنی سووڕەتی (الرعد)

# پێناسەی سووڕەتی (الرَّعد) و تێوەرۆکەکەی لە پێنج خاڵدا

یەکەم / ئەم سووڕەتە تەنیا یەك ناوی هەیە، ئەوەندەی من ئاگاداربم، ئەویش بریتیە لە (الرعد)، واتە: هەورە تریشقە، وشەی (رعد)یش لە ئایەتی (١٣)دا هاتوە، دەفەرموێ: ﴿ وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعۡدُ بِحَمۡدِهِۦ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ مِنۡ خِيفَتِهِۦ ﴿١٣﴾ ﴾.

دووەم / ئەم سووڕەتە لە ڕیزبەندیی موصحەفدا، ژمارە (١٣)یەو، لە ڕیزبەندیی دابەزیندا، زانایان خستوویانەتە نێوان سووڕەتی (یوسف) و (إبراهیم) واتە: لە دوای (یوسف) سووڕەتی (الرَّعد)یان داناوە، لە ڕیزبەندیی هاتنە خواردا پێش (إبراهیم) دیاننناوە، بۆیە زۆریان لە ڕیزبەندیی دابەزیندا ژمارە (٨٥)یان بۆ داناوە، هەڵبەتە هەندێکیشیان کە گوتوویانە: ئەم سووڕەتە مەدینەییە، لە ڕیزبەندیی دابەزیندا ژمارە (٩٧)یان بۆ داناوە، بەڵام وەك دوایی باسی دەکەین، مەدینەیی بوونی ئەم سووڕەتە، هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە.

سێیەم / ژمارەی ئایەتەکانی: زانا کوفییەکان بە (٤٣) ئایەتیان داناوەو، زانا مەدینەییەکان بە (٤٤)یان داناوەو، زانا شامییەکان بە (٤٥)یان داناوە

دیارە پێشتریش باسم کردوە که بەرزیی‌و نزمیی ژمارەی ئایەتەکان، دەگەڕێتەوە بۆ چۆنیەتی ڕیزکردنی ڕستەکان، جاری وایە ڕستەیەکیان کردۆتە دوو (٢) ئایەت، بۆیە ژمارەی ئایەتەکانی ئەو سووڕەتە زیادی کردوە، یان دوو ڕستەیان کردوون بە یەك ئایەت، بۆیە ژمارەی ئایەتەکان کەم‌و زیادی کردوەو. بەرزیی‌و نزمیی تێکەوتوە بەلاّم زۆربەیان ڕایان وایەو، بە پێی ئەو موصحەفەی لە ژێر دەستی ئێمە دایە، بە (٤٣) ئایەتیان داناوە.

**چوارەم** / هەرچەندە ڕاجیایی هەیە لەسەر مەککەیی، یان مەدینەیی بوونی ئە سووڕەتە، بەلاّم بە ڕای مـن مەککـەیی بوونـی مسۆگـەرەو، ئـەو ڕیوایـەت‌و گـێڕدراوانەی باسی مەدینـەیی بـوونی دەکـەن، لـە ڕووی سـەنەدەوە بێهـێزن، وەك (محمد الطاهر بن عاشور)یش لە (التحرير والتنوير)ەکەی خۆیدا[1] گوتوویەتی: (أخبار واهية) هەموویان هەواڵی بێهێزن.

**پێنجەم** / ئەگەر تەماشای نێوەڕۆکی ئەم سووڕەتە بکەین، هەمان نێوەڕۆکی گشتی سووڕەتە مەککەییەکانە، کە:

١) باسی خوا بە یەکگرتن (توحيد الله)ە - بەدیهێنەرایەتیی خواو، پەروەردگارێتیی خـواو، خـاوەنداریێتیی خـواو، نـاوو سـیفەتە بـەرزو بێ وێنـەکانی خـواو، پەرستراوێتی خـوا، کـە دەبێ تـەنیا ئـەو بپەرسـترێ، چـونکە تـەنیا خـۆی بەدیهێنەرەو، تەنیـا خۆی پەروەردگـارو مشوورخۆرەو، تـەنیا خـۆی خـاوەنی ئـەو ناوو سیفەتە بەرزو بێ‌وێنانەیـە، کـە بـۆی بەکـاردەهێنرێن، بۆیـە دەبێ تەنیـا ئەویش بپەرسترێ

٢) پاشان باسی پێغەمبەرایەتیی‌و وەحیی‌و موعجیزەی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)و، کێشەو مشتومڕی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)، لەگەڵ نەیارەکانیاندا

٣) ئنجا باسی ڕۆژی دوایی‌و، باسی بەهەشت‌و دۆزەخ‌و، سزاو پاداشت

---

[1] ج ١٣، ص ٧٦.

لەم سوورەتەدا باسی بەسەرهاتی هیچ کام لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) نەکراوە، بە دیاریکراویی، بەڵام بە گشتی ئاماژە کراوە بە بەسەرهاتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و، هەڵوێستی ناحەزەکانیان لە بەرانبەریاندا

کەواتە: نێوەرۆکی ئەم سوورەتەش، هەر هەمان نێوەرۆکی سوورەتە مەککەییەکانە بە گشتی، وەك گوتمان هیچ ڕیوایەتێکی جێی متمانەو پشت پێ بەستراویش نیە بۆ ئیسپاتی ئەوە کە ئەم سوورەتی (الرعد)ە، لە مەدینە دابەزیبێ، هەڵبەتە هەندێ لە زانایان - بۆ نموونە: (السیوطي) - بەوە تەوفیقیان کردوە لە نێوان ئەو ڕیوایەتانەدا کە دەڵێن: ئەم سوورەتە لە مەدینە هاتۆتە خوار، واتە: لە قۆناغی مەدینەداو، نێوەرۆکی سوورەتەکەو، ئەو ڕیوایەتە گێڕدراوانەی دیکە کە دەڵێن: لە مەککە هاتۆتە خوار، کە گوتوویانە: ئە سوورەتی (الرعد) لە مەککە هاتۆتە خوار، بەڵام لە قۆناغی مەدینەدا، واتە: دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی کردوە، لە مەککەوە بۆ مەدینە، لەو جارانەدا کە هاتۆتەوە بۆ مەککە، لەو کاتانەدا ئەم سوورەتە دابەزیوە، کەواتە: لە مەککە دابەزیوە، بەڵام لە قۆناغی مەدینەدا، ئەوەش وەك پێکەوە گونجاندنێکی ئەو دوو جۆرە ڕیوایەتانە، بەڵام وەك باسمان کرد: بەلای منەوە شتێکی مسۆگەرو جێی دڵنیاییە، کە ئەم سوورەتە لە قۆناغی مەککەدا هاتۆتەوە خوارو، هیچ پەیوەندیی بە قۆناغی مەدینەوە نیەو، بەسەرنجدانی نێوەرۆکەکەشی، ئەوەمان زۆر لەلا ڕوونو ئاشکرا دەبێ

# دابەشکردنی ئەم سوورەتە بۆ حەوت دەرس

ئێمە ئەو سوورەتەمان بۆ حەوت (٧) دەرس دابەش کردوە، هەرچەندە وەك لە سەرەتای یەکەمین سوورەتی مەککەیدا کە سوورەتی (الأنعام)ە، کە لەم تەفسیرەماندا (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز) بەپێی ڕیزبەندیی موصحەف پێی گەیشتین، باسمان کردوە کە بەڕاستیی دابەشکردنی ئایەتەکانی قورئان، بە تایبەت سوورەتە مەککەییەکان، بۆ چەند دەرسێك، شتێکی ئاسان نیە، چونکە سوورەتە مەککەییەکان، هەر کامیان وەك دەریایەکە کە شەپۆل بەسەر شەپۆلدا دێ، شەپۆل بە دوای شەپۆل دا دێ‌و، بە زەحمەت بۆت لێك جیا دەکرێنەوە، بەلام پۆلێن کردنی ئایەتەکانی سوورەتە مەدینەییەکان، چونکە بابەتەکانیان جۆراو جۆرن، ئاسانترە مەگەر سوورەتە مەککەییەکان کە بەسەرهاتی پێغەمبەرانیان تێدایە، سەرەتاو کۆتایی بەسەرهاتەکان، یاخود لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی بەسەرهاتەکان، ئەوە ئاسان بە دەستەوە دێ، کە دابەشیان بکەین بۆ چەند دەرسێك، بەلام بە هەر حالْ ئێمە: ئەو: (٤٣) یان (٤٤) یان (٤٥) ئایەتەی کە ئەم سوورەتە پێکدێنن، دابەشمان کردوون بۆ حەوت (٧) دەرس:

<u>**دەرسی یەکەم:**</u> لە دوای (بسم الله الرحمن الرحيم)ەوە، لە حەوت (٧) ئایەت پێکدێ،

دیارە ئایەتی یەکەمیان وەك پێشەکیی وایە، کە دەربارەی قورئان دەدوێ:

﴿الٓمٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِۗ وَٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ ١﴾، ئەوە وەك دیباجەو پێشەکیی وایە بۆ کۆی بابەتەکانی ئەو سوورەتەو، ئایەتەکانی: (٢و٣و٤) باسی ناساندنی خوا (عزوجل) لەمیانی نیشانەکانیدا، لەمیانی دیاردەو دیمەنە سروشتییەکاندا دەکەن، کە وەك دوایی باسی دەکەین: پازدە (١٥) لە نیشانەکانی خوا، خراونە ڕوو لەو سێ (٣) ئایەتەدا، ئایەتەکانی: (٥ و ٦)یش باسی ڕۆژی دوایی‌و قیامەت دەکەن‌و، ئایەتی حەوت (٧)یش باسی داواکردنی کافرەکان دەکات، کە داوایان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردوە:

موعجیزەیان بۆ بێنێ، واتە: موعجیزەیەك كە ئەوان دەیانەوێ، ئەگەرنا پێغەمبەری خاتەم موعجیزەو بەڵگەی خۆی پێبووە، كە قورئان بووە .

**دەرسی دووەم:** كە ئەویش هەر حەوت (٧) ئایەتە، لە ئایەتی (٨ - ١٤) دیسان ئەمیش هەر باسی خوای پەروەردگارو، سیفەتەكانی خواو، كارەكانی خواو، نیشانەكانی خوا لە بووندا دەكات، ئەمانیش سەرجەم خوا ﷻ تێیاندا باسی (٢٠) لە سیفەتو كردەوە ناوازەكانی خۆی دەكات، ئاوا بە وشەی خوا (الله) دەست پێدەكات: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَاۖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَ يُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُم بِلِقَآءِ رَبِّكُمۡ تُوقِنُونَ ۝٢ ﴾

**دەرسی سێیەم:** كە چوار (٤) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەكانی: (١٥ - ١٨) دیسان لەسەر ناساندنی خوا ﷻ و، بەراوردی لەگەڵ پەرستراوە ساختەكاندا، دەكات، پاشان هێنانەوەی دوو وێنە بۆ خستنەرووی ماهیەتی هەقو ناهەقو، دواتر باسی سەرەنجامو ئاكامی وەلامدەرەوانی پەیامی خواو، وەلام نەدەرەوانی بانگەوازو پەیامی خوای پەروەردگار، كراوە .

**دەرسی چوارەم:** كە ئەویش دیسان حەوت (٧) ئایەتە، لە ئایەتەكانی: (١٩ – ٢٥)، كە تێیاندا پێناسەی بڕواداران كراوە بە دە (١٠) لە سیفەتە بەرزەكانیانو، باسی سەرەنجامی ئاكامی خێری بڕواداران كراوەو، بە ئاماژەیەكی كورتیش پێناسەی بێبڕوایانو سەرەنجامی شوومیان كراوە .

**دەرسی پێنجەم:** كە شەش (٦) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەكانی: (٢٦ - ٣١) جارێكی دی دیسانەوە گەڕانەوە بۆ ناساندنی خوا (عزوجل)و، داواكردنی كافران بۆ موعجیزە، موعجیزەیەك كە خۆیان ویستوویانەو، پێناسەی بڕواداranو، پێناسەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ و، پێناسەی قورئان، لەم شەش (٦) ئایەتەدا خراونە ڕوو

**دەرسی شەشەم:** ئەویش شەش (٦) ئایەتە، ئایەتەكانی: (٣٢ - ٣٧) باسی سەرەنجامی گەلانی بێبڕوای پێشووو، بەراوردی نێوان خوا ﷻ و پەرستراوە ساختەكانو، سەرەنجامی هاوبەش دانەرانو، خوا بە یەككگران كراوە، هەروەها هەڵوێستی خاوەن كتێبە بە ویژدانەكان لە بەرانبەر قورئانداو، لە بەرانبەر ڕێنمایی خوادا،

خراوەتەڕوو، پاشان خوا ﷻ ئامۆژگاریی پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەكات، كە چۆن مامەڵە بكات لەگەڵیاندا

**دەرسی حەوتەمو كۆتایی :** ئەویش دیسان شەش (٦) ئایەتە، ئایەتەكانی: (٣٨ - ٤٣)

جارێكی دیكە باسی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بە گشتی كراوەو، بەراوردیان پێكراوە لەگەڵ موحەممەد ﷺدا، هەروەها باسی هەمەكارە بوونی خوا ﷻ بوونداو، هەموو شت لەبەر دەستدا بوونیو، هەڕەشەكردنی لە بێبڕوایەكان، كراوەو، بەرپەرچی بێبڕوایانی نكوڵییكەر لە پێغەمبەر ﷺ دراوەتەوە.

ئەمە كورتەو پوختەی نێوەڕۆكی سوورەتی (الرعد)ە، كە وەك گوتمان: ژمارەی ئایەتەكانی: (٤٣)و، بە پێی هەندێك سەرژمێر: (٤٤) یان (٤٥)ە

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی یەکەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسە لە حەوت (٧) ئایەتی سەرەتای سوورەتی (الرعد) پێکدێ، کە بریتین لە ئایەتەکانی: (١ - ٧). سەرەتا لە ئایەتی یەکەمدا کە وەك دیباجەو پێشەکیی‌و ڕێ خۆشکردنێك وایە، بۆ کۆی بابەتەکانی ئەم سوورەتە، پێناسەیەکی قورئان کراوەو، هەڵوێستی بێبڕوایان لە بەرانبەریدا، خراوەتە ڕوو

پاشان لە ئایەتەکانی: (٢ و ٣ و ٤)دا خوای بەرزو مەزن، لەمیانی کۆمەڵێك لە نیشانەکانیدا، خۆی پێناسە دەکات، کە دەوری (١٥) نیشانە لە نیشانەکانی پەروەردگارێتیی خۆی لە بووندا، دەخاتە ڕوو، لە درشتەوە بۆ ورد پێدادێ: سەرەتا دیاردەو دیمەنە گەورەو مەزنەکان، پاشان وردە وردە ورد دەبێتەوە، تاکو دەگاتە ئەو دیاردەو دیمەنانەی کە مرۆڤەکان ڕۆژانە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەن‌و، لە ئایەتی (٥)دا باسی نکووڵیی کردنی بێبڕوایەکان کراوە، لە زیندوو کرانەوەو، پاشان لێپرسرانەوەو سزاو پاداشت، باسکراون

دوایی لە ئایەتی شەش (٦)دا باسی پەلەکردنی کافرەکان کراوە، کە پەلەیان دەکرد: سزایان بۆ بێ، لە جیاتی ئەوەی پەلە بکەن، لەوەدا کە خوا بەزەییان لەگەڵدا بنوێنێ‌و، چاکەیان لەگەڵ بکات‌و، لەسەر ڕەحمەت‌و بەزەیی خۆی بەردەوام بێ لەگەڵیاندا، ئەوان پەلەیان دەکرد کە خوا زوو سزایان بدات !

لە ئایەتی حەوت (٧)یشدا باسی داواکردنی کافرەکان بۆ هاتنی موعجیزە کراوە، واتە: موعجیزەیەك کە ئەوان ویستوویانە، ئەگەر نا وەك پێشتر گوتمان: هەمیشە هیچ کام لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) نەبووە، کە موعجیزەو بەڵگەیەکیان

پێ نەبێ بۆ ئیقناع کردنی بەرانبەرەکانیان، ئەوانەی کە لە هەق دەگەڕێن، کە ئەو کەسە پێغەمبەری خوایە، بۆ ئیسپاتی دەعوای پێغەمبەرایەتیی، هیچ کام لە پێغەمبەران نەبووە، کە بەڵگەو موعجیزەیەکی پێ نەبێ، بەڵام کافرەکان لە بیانوو گەڕاون، بۆیە گوتوویانە: لە قورئان گەڕێ، موعجیزەیەکی دیکەمان بۆ بێنە! هەڵبەتە خوای پەروەردگاریش وەڵامی داونەوە .

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ الٓمٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِۗ وَٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا
يُؤۡمِنُونَ (١) ٱللَّهُ ٱلَّذِي رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَاۖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ
وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَ يُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُم بِلِقَآءِ رَبِّكُمۡ تُوقِنُونَ (٢)
وَهُوَ ٱلَّذِي مَدَّ ٱلۡأَرۡضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۡهَٰرٗاۖ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِۖ
يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ (٣) وَفِي ٱلۡأَرۡضِ قِطَعٞ مُّتَجَٰوِرَٰتٞ
وَجَنَّٰتٞ مِّنۡ أَعۡنَٰبٖ وَزَرۡعٞ وَنَخِيلٞ صِنۡوَانٞ وَغَيۡرُ صِنۡوَانٖ يُسۡقَىٰ بِمَآءٖ وَٰحِدٖ وَنُفَضِّلُ بَعۡضَهَا
عَلَىٰ بَعۡضٖ فِي ٱلۡأُكُلِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ (٤) وَإِن تَعۡجَبۡ فَعَجَبٞ
قَوۡلُهُمۡ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ
ٱلۡأَغۡلَٰلُ فِيٓ أَعۡنَاقِهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ (٥) وَيَسۡتَعۡجِلُونَكَ
بِٱلسَّيِّئَةِ قَبۡلَ ٱلۡحَسَنَةِ وَقَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِمُ ٱلۡمَثُلَٰتُۗ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغۡفِرَةٖ لِّلنَّاسِ
عَلَىٰ ظُلۡمِهِمۡۖ وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ (٦) وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَةٞ
مِّن رَّبِّهِۦٓۗ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرٞۖ وَلِكُلِّ قَوۡمٍ هَادٍ (٧) ﴾

# مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، ئەلیف لام میم ڕا، ئەوانە ئایەتەکانی کتێبی خوانو، ئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆت دابەزێنراوە، هەقە، بەڵام زۆربەی خەڵك بڕوا ناهێنن (١) ئەو خوایەی ﷻ ئاسمانەکانی – وەك دەیانبینن – بەبێ ستوونان (کۆڵەکان) بەرزکردوونەوە، ئنجا چۆتە سەر بارەگاو، خۆرو مانگی ڕام کردوون، هەر کامیان بۆ کاتێکی ناوبراو دەڕوا، (خوا) کاروبار هەڵدەسووڕێنێ، ئایەتەکانی ڕوون دەکاتەوە، بەڵکو لە دیداری پەروەردگارتان دڵنیابن (٢) (خوا) ئەو کەسەیە ﷻ زەوی لێك کێشاوەتەوەو (چیایە) چەسپاوەکانی تێدا داناونو، ڕووبارەکانیشی تێدا گێڕاون، هەروەها لە درەختی هەموو جۆرە میوەکان دوو جووتی (نێرو مێیەکی) داناون، بەشەوگار ڕۆژگار دادەپۆشێ، بە دڵنیایی لەوەدا (کە باسکرا) نیشانە هەن (لەسەر پەروەردگارێتییو خاوەنداریێتیی خوا بۆ بوونەوەر) بۆ کۆمەڵێك کە بیردەکەنەوە (٣) هەروەها لە زەمیندا پارچە زەوی بەتەنیشت یەکەوە هەنو، چەندان ڕەزوباخ لە درەختەکانی ترێو لە کشتوکاڵو، لە درەختەکانی خورمای بنك هاوبەشو بنك جیاواز، بە یەك ئاو ئاودێر دەکرێنو، هەندێکی لە خواردنو تام دا، بەسەر هەندێکی دا هەڵدەبژێرین، بێگومان لەوەدا نیشانە هەن بۆ کۆمەڵێك کە دەفامن (٤) ئەگەر لە (قسەو بیرو ڕایەکیان) سەرت سوڕ دەمێنێ، ئەو قسەیان سەیرە کە دەڵێن: ئایا ئەگەر بووینەوە بە خاك، ئایا لە نوێ دروست دەکرێینەوە؟ ئەوانە کەسانێکن بە پەروەردگاریان بێبڕوانو، ئەوانە کۆتو پێوەندیان لە گەردن دایەو، ئەوانە هاوەڵانی ئاگری دۆزەخن تێیدا هەمیشەیین (٥) پەلەی هاتنی (سزای) خراپەت لێدەکەن، پێش (پاداشتی) چاکەو، لە پێش وانیشدا سزادانە تەمبێکارەکان ڕابردوونو، بێگومان پەروەردگارت وێڕای ستەمو خراپەشیان،

خاوەن لێبوردەییە لەگەڵ خەڵکو، بێگومان پەروەردگـارت سزاو تۆڵەی سەختە (٦) ئەوانەی بێبـڕوان دەڵـێن: دەبووایـە (موحەممـەد) مـوعجیزەو نیشـانەیەك وەك هـی پێغەمبەرانی پێشووی لە پەروەردگاریەوە دابەزێنرابایـە سـەرا بـە دڵنیایـی تـۆ بـەس ورياكـەرەوەیو، هەموو گـەلو کۆمەڵێك ڕێنمایی کارێکیان هەیە (تۆش ڕێ نیشاندەری وانی بە موعجیزەو بەڵگەیەکەوە کە خوای کاربەجێ پێیداوی، نـەك ئـەوەی ئـەوان داوای دەکـەنو دەیکەنە بیـانوو) (٧)}.

# شیکردنـەوەی هـەندێـك لە وشـەكان

( عَمَدٍ ): (جَمْعُ عَمُود وَعِمَادٍ وَيُجْمَعُ: بِعَمَد و عُمُد، والعَمُودُ: خَشَبٌ تَعْتَمِدُ عَلَيْهِ الخَيْمَةُ)، وشـەی (عَمود)، هەروەهـا (عِماد)، کـە بـە (عَمَد و عُمُدُ) کـۆ دەکرێنـەوە، وشەی (عَمود) بریتیـە: لە تەختەیەك کە چادر سەنگی خۆی دەخاتە سەری، خێوەت کە هەڵدەدرێ ئـەو ئەستووندەگەی کـە دەخرێتـە نێوەڕاسـتیەوە، ئەستوندەگێك، یاخود زیاتر، ئەوە پێی دەگوترێ: (عمود)

(ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ): پێشـتریش باسـمان کردوە، کـە: (اسْتَوَى) یـانی: (اسْتَقَرَّ)، یـان (عَلا)، یان (ارْتَفَعَ)، هـەروەهـا (اسْتَوَى) بـە مانـای (اسْـتَولَى) و (ظَهَرَ)ش دێ، هەروەها (اسْتَوَى) بە مانای (استِقَام)ش دێ، واتە: ڕێك بـوو، (اسْتَوَى الشيءُ: اعْتَدَلَ)، هـەروەها (اسْتَوَى) بـە مانـای (قَصَدَ)ش دێ، ئەگـەر بـە (إلـى) تەعـەددا بکات: (إسْتَوَى إلـى السَّمَاء) یانی: (قَصَدَ) ویستی، ڕووی تێکرد

(وَسَخَّرَ ): (التَّسْخِيرُ: سِيَاقَةٌ إلـى الغَرَضِ الـمخْتَصِّ بـهِ قَهْراً)، (تَسخِير) بریتیـە: لـەوەی شـتێك، بـە ناچـاریی بـەرەو ئـەو ئامانجـەی کـە پێیـەوە تایبـەت کـراوە بئـاژوێنرێ و ببـرێ

(يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ): واتە: کـاروبار هـەڵدەسووڕێنـێ، مشووری دەخوا، (التدبُّر: التفكُّرُ فـي دُبُـرِ الأُمُورِ، وَدَبَّـرَ الأَمْرَ: سَاسَهُ، وَنَظَرَ فِي عَاقِبَتِـهِ)، (تَدَبُّر) بە مانای بیـرکردنـەوە دێ لــە سەرەنجــامی کاروبارەکــان، دەگوتــرێ: (دَبَّـرَ الأَمْـرَ: سَاسَـهُ) یــانی: هەڵیسووڕاند، سـەرپەرشـتییکرد، مشووری خواردو، سەرنجی سـەرەنجامەکـەیدا .

(يُفَصِّلُ ٱلْآيَـٰتِ ): واتە: ئایەتەکان ڕوون دەکاتەوە، (الفَصْلُ: إبَانَةُ أَحَدِ الشَّيْئَيْنِ عَنِ الآخَرِ، وَالتَّفْصِيلُ: التَّبيِينُ)، (فَصْل) بریتیە لـە لێك جیاکردنـەوەی دوو شـتان لـە یەکدی، (تَفصِيل)، لێرەدا یانی: (تَبيِين)، واتە: ڕوونکردنەوە، ڕۆشنکردنەوە

(تُوقِنُونَ): واتە: دڵنیابن، بڕوایەکی پتەوتان هەبێ، (الیَقِينُ: العِلْمُ وَزَوَالُ الشَكِّ، يَقِنْتُ الأَمْرَ يَقِناً)، (يَقين) بریتیە: لە زانیاریی‌و، لاچوونی دوو دڵیی، دەگوترێ: (يَقِنتُ الأَمْرَ)، واتە: لەو کارە دڵنیا بووم

( مَدَّ ٱلْأَرْضَ ) : (المَدُّ: البَسطُ والسَّعَةُ، وَمِنْهُ ظِلٌّ مَدِيد، وَمِنْهُ مَدُّ البَحْرِ وَجَزْرُهُ)

(مَدُّ الأَرْضِ)، (مَدُّ)، بریتیە: لە پان کردن‌و فراوان کردنی شتێك، وەك گوتراوە : (ظِلٌّ مدِيد)، واتە: سێبەرێکی درێژ کە بەردەوام بێ، هەروەها وشەی (مَدُّ البحرِ وَجَزْرُهُ) هەڵکشان‌و داکشانی دەریا، لەوەوە هاتوە، کەواتە: (مَدَّ الأَرْضَ)، واتە: زەوی پان ڕاخستوە، درێژی کردۆتەوە، پانی کردوەو فراوانی کردوە .

( رَوَٰسِيَ ) : (جَمْعُ رَاسي، وَهُوَ الثَّابِتُ المُستَقِرُّ: أَي جِبَالاً رَوَاسيَ، وَقَدْ حَذِفَ مَوصُوفهُ لِظُهُورِهِ)، (رَواسِيَ) کۆی (رَاسِي)یە، کە بریتیە لە جێگیرو سەقامگیر، کە مەبەست پێی چیاکانە، واتە: چیایە چەسپاوەکان، بەڵام بۆیە وشەی (جبال) فڕتێنراوە، کە دەبێتە وەسف کراوی (رَوَاسيَ)، (جِبَالاً رَوَاسيَ)، چونکە ئاشکرایە کە مەبەست لە چەسپێنراوەکان، چیایەکانە

( قِطَعٌ ) : (جَمْعُ قِطْعَة، وَهِيَ الجُزْءُ مِنَ الشَّيءِ)، (قِطَع) کۆی (قِطْعَة)یە، (قِطْعَة) بریتیە لە بەشێك لە شتێك، یانی: پارچە زەوییەکان

(صِنْوَانٌ) : (جَمْعُ صِنْو، الصِّنو، والصُّنُو: النَّخْلَةُ المُجْتَمِعَةُ مَعَ نَخْلَةٍ أُخْرَى نَابِتَتَينِ مِنْ أَصْلٍ وَاحِد أَو نَخْلات)، وشەی (صِنو) بە دارخورمایەك دەگوترێ کە لەگەڵ یەکێکی دیکە، یاخود لەگەڵ هەندێك دارخورمای دیکە، پێکەوە کۆبوونەتەوەو، بنکێکیان یەکێکە، واتە: چەند درەختێکن چەند قەدێکیان هەیە، بەڵام یەك بنکیان هەیە، دیارە (صنو) بە (صِنْوَان) کۆ دەکرێتەوە .

( ٱلۡأُكُلِ ) : (المأكول)، واتە: خواردن، مەبەست پێی میوەکەیەتی، خوا دەفەرموێ: هەندێکی بەسەر هەندێکیدا هەڵدەبژێرین، لە جۆری میوەکەیاندا، کە بەتامترە جوانترە، رێکترە

( فَعَجَبٌ ) : (العَجَبُ وَالعُجَابُ: هُوَ الأَمْـرُ الَّذِي يُتَعَجَّبُ مِنْـهُ، وَكَذَا العُجَّا وَالعُجْبَةُ)، وشەی (عَجَب، وعُجَاب، وعُجَّاب، وَعُجْبَةُ) هەموویان بە شتێك دەگوترێن، کە جێگای سەرسوڕمان بێت، مرۆڤ سەری لە بەرانبەریدا سوڕبمێنێ

( ٱلۡأَغۡلَٰلُ ) : (الأَغلاَلُ: جَمْعُ غُلّ: ما يَجعَلُ فِي الرَّقَبَةِ)، (غُلّ) بریتیە لەو کۆتەی کە لە گەردنی مرۆڤ دەکرێ، کە نەتوانێ سەری دابنوێنێ، یاخود سەری بەلای راستو چەپدا بسووڕێنێ

( ٱلۡمَثُلَٰتُ ) : (جَمْعُ مَثُلَة، العُقُوبَة)، (مَثُلاتُ) کۆی (مَثُلَة)یە، بە مانای سزا دێ

# مانای گشتی ئایەتەکان

وەك هەموو سوورەتەکانی قورئان، - جگە لە سوورەتی (التوبة) - ئەم سوورەتەش بە (بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ) دەست پێدەکات :

خوا دەفەرموێ : (بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ) بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، یان بە بەزەیی میهرەبان، یان بەخشندەی میهرەبان، زۆرجاری دیکە گوتوومانە: هەر کاتێك دەڵێی: (بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ) واتە: ئەم کارە دەست پێدەکەم بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، پێویستە چەند مەبەستێك لە دڵ بگیرێن :

١/ ئەم کارە بۆ خوا ئەنجام دەدە

٢/ ئەم کارە بە پشتیوانیی خوا ئەنجام دەدە

٣/ ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا ئەنجام دەدە

٤/ ئەنجامدانی ئەم کارە وەك بەخششێكو چاکەیەك دەیگێڕمەوە بۆ خوا، نەك بە خۆم سەرسام بم

پێویستە ئەو ماناو مەبەستانە بە دڵی مرۆڤدا بێن، کاتێك دەڵێ: (بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ)

خوا دەفەرموێ :

﴿الٓمٓر﴾، کە دیارە ئاوا دەخوێنرێتەوە: ئەلیف۔ لام۔ میم۔ ڕا، پێشتر لە سەرەتای سوورەتی (یونس)دا بە تەفصیل باسی ئەو پیتە پچڕ پچڕانەمان کرد، کە

لە پێش (٢٩) سوورەتی قورئانەوە دێن، کە زۆربەیان سوورەتە مەککەییەکانن‌و، هەندێکیان سوورەتە مەدینەییەکانن، بۆیە لێرەدا هەر ئەوەندە دەڵێین: کە خوا ﷻ لێرەش دەفەرموێ: (الٓمٓر ) ئاوا دەست پێدەکات، ﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ﴾، ئا ئەوانە ئایەتەکانی کتێبێکن، یان ئایەتەکانی کتێبەکەن، کام کتێبە؟ ئەو (ال)ی سەر ﴿ ٱلْكِتَٰبِ ﴾، (ال)ی (عهد)ی پێدەڵێن‌و بۆ ناساندن (تعریف)ە، واتە: کتێبەکە، ئەو کتێبەی کە دەزانین مەبەست پێی قورئانە، ئەم ئایەتانە ئایەتەکانی کتێبەکەن، واتە: ئایەتەکانی ئەو کتێبە ناسراوەن کە بریتیە لە قورئان، ﴿ وَٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ ﴾، ئەوەش کە بۆ لای تۆ نێردراوەتە خوار، لە پەروەردگارتەوە هەقەو ڕاستە، ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵکی بڕوا ناهێنن، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باس دەکەین: کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، کە ئەمە بەڵام (إستدراك)ە‌و، وەڵامی پرسیارێکە کە لە ئەنجامی ڕستەی پێشوودا پەیدا دەبێ، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ ﴾، واتە: ئەوەی کە لە پەروەردگارتەوە بۆ تۆ دابەزێنراوە، هەقە، هەر ئەوە هەقەو ڕاستە .

لێرەدا پرسیارێك پەیدا دەبێ، ئەدی بۆچی کەسانێك هەن بڕوا ناهێنن، بۆچی بێبڕوایەکان بڕوای پێ ناهێنن ؟

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، واتە: زۆربەی خەڵکی هەر نایانەوێ بڕوا بێنن، نەك لەبەر ئەوەی بە ناهەقی دەزانن، بەڵکو نایانەوێ بڕوا بێنن، یاخود لە بڕوا هێنان ناگەڕێن‌و، عەودالی هەق نین، بۆیە بڕوای پێ ناهێنن

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ﴾، لەم ئایەتی دوو (٢)ەوە، تاکو کۆتایی ئایەتی چوار (٤)، خوا ﷻ باسی پازدە (١٥) لە کردەوەو سیفەتە بەرزو بێ وێنەکانی خۆی دەکات، لەمیانی خستنەڕووی دیاردەو دیمەنە سروشتییەکاندا، کە سیفەتەکانی خوایان - وەك ئاوێنەیەك - تێدا دەدرەوشێنەوە :

سەرەتا دەفەرمووێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ﴾، هەڵبەت لێرەدا ئەمە پێناسەی وشەی (الرب)ە، لەو ڕستەیەدا کە دەفەرمووێ: ﴿ وَٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ ﴾، ئەو پەروەردگارەی کە قورئـان لەوەوە بۆ تۆ دابەزێندراوە، کە قورئانێکی هەقە، کێیە؟ ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ﴾، ئەو خوایەی کە ئاسمانەکانی بەبێ کۆڵەکەو ستوون، وەك دەیانبینن، بەرز کردوونەوە

واتایەکی دیکەی: ئاسمانەکانی بەرزکردوونەوە بە چەند ستوونێك، بە چەند کۆڵەکەیەك کە ئێوە نایانبینن، واتە: بە چەند کۆڵەکەیەکی نەبینراو، هەردوو واتایەکەی هەن، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر تیشکی دەخەینە سەر

ئەوە سیفەتی یەکەمی خوا (عزوجل)

سیفەتی دووەمی خوا : ﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ﴾، دوایی چووە سەر عەرش، چوونە سەر عەرشی خوا، بەرزبوونەوەی خوا بۆ سەر عەرش، وەك بۆ خوا شایستەیە، ئێمە هەم لە سوورەتی (الأعراف)دا، هەم لە سەرەتای سوورەتی (یونس)دا، باسی تایبەتمان لەوبارەوە کردوە، لە سوورەتی (الأنعام)یشدا، هەر باسمان کردوە، بۆیە لێرە ناگەڕێینەوە سەری .

سیفەتی سێیەم و چوارەمی خوا (عزوجل): ﴿ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ﴾، کارێکی دیکەی خوا ﷻ ئەوەیە کە خۆرو مانگی دەستەمۆ و ڕام کردوون، ملکەچ کردوون، ﴿ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾، هەر کامێك لە خۆرو مانگ – بەڵکو سەرجەم خڕۆکەو ئەستێرەکانی دیکەش - بۆ کاتێکی ناوبراو، واتە: کاتێکی دیاریکراو لە گەڕدان، لە سووڕاندان .

سیفەتی پێنجەمی خوا : ﴿ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ﴾، کاروبار هەڵدەسووڕێنێ، یانی خوا سەرپەرشتیی کاروبار دەکات، کاروباری بوون بە گشتی

سیفەتی شەشەمی خوا : ﴿ يُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ ﴾، ئایەتەکان ڕۆشن دەکاتەوە

﴿ لَعَلَّكُم بِلِقَآءِ رَبِّكُمۡ تُوقِنُونَ ﴾، بەڵکو بەرانبەر بە دیداری پەروەردگارتان دڵنیابن، بۆیە ئایەتەکانیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، لەم ئایەتەدا شەش سیفەتو، کردەوە ناوازەو بێ وێنەکانی خوا، خراونە ڕوو

ئنجا دێتە سەر باسی :

<u>سیفەتو کردەوەی حەوتەم:</u> ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي مَدَّ ٱلۡأَرۡضَ ﴾، هەروەها خوا ئەو کەسەیە کە زەوی لێک کێشاوەتەوە، (مَدَّ)، بە مانای لێک کێشانەوەو پان کردنو فراوان کردن، دێ .

<u>سیفەتو کردەوەی هەشتەمو نۆیەم :</u> ﴿ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۡهَٰرٗا ﴾، هەروەها خوا لە زەویدا چیایە چەسپاوەکانی داناونو، ڕووبارەکانیشی داناون

<u>سیفەتی دەیەم:</u> ﴿ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ ﴾، دیسان لە هەر میوەیەك جووتێکی داناوە، واتە: لە درەختانی میوەکان، جووتی داناون، چونکە هەموویان نێرو مێیان هەیە، هەندێکیش لە زانایان وایان لێکداوەتەوە، واتە: لە هەر میوەیەك: میوەی هاوینەو زستانە، یاخود میوەی بەم جۆرەو بەو جۆرە، جووتی داناوە، بەڵام من پێم وایە مانای یەکەمیان ڕاستترە، کە مەبەست پێی نێرو مێیە، وەك لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: ﴿ وَمِن كُلِّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَا زَوۡجَيۡنِ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾الذاریات، هەروەها لە سووڕەتی (یس)یشدا، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین .

خاوەنی (تفسیر المیزان) گوتوویەتی: ئەگەر یەکێك بڵێ: چۆن خوا فەرموویەتی: ﴿ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾، خۆ میوەکان نێرومێیان تێدانیەو، لە درەختەکاندا هەیە؟ وەڵامەکەی ئەوەیە کە لێرەدا واتە: (وَمِنَ أَشْجَارِ كُلِّ الثَّمَرَاتِ) ئاوای لێدێتەوە، لە درەختەکانی هەموو میوەکان جووتێك هەیە، کە بە هەر کامێکیان دەگوترێ : (زَوْج).

سیفەتی یازدەیەمی خوا : ﴿ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ ﴾، بە شەوگار ڕۆژگار دادەپۆشێ، واتە: ئەو شوێنەی كە ڕۆژگاری لێ بووە، دوایی شەوگاری بەسەردا دێ كە هەر زەوییە، ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾، بێگومان لەوەدا (كە باسكرا) نیشانە هەن بۆ كۆمەڵێك كە بیر دەكەنەوە، كەسانێك بیرنەكەنەوە، لە هیچ شتێكدا نیشانەكانی خوا نابینن .

ئنجا دێتە سەر باسی هەندێك لە نیشانەكانی دیكەو، هەندێك لە سیفەتەكانی دیكە :

دوازدەیەم : ﴿ وَفِى ٱلْأَرْضِ قِطَعٌ مُّتَجَٰوِرَٰتٌ ﴾، هەروەها لە زەمیندا چەندان پارچەی بە تەنیشت یەكەوە، هەن

سێزدەیەم: ﴿ وَجَنَّٰتٌ مِّنْ أَعْنَٰبٍ ﴾، بیسان چەندان باغ لە ترێیەكان، لە دارمێوەكان

چواردەیەم: ﴿ وَزَرْعٌ ﴾، هەروەها كشتوكاڵ، كە جۆرەكانی دانەوێڵەو، سەوزەو تەرەكار هەموویان دەگرێتەوە

پازدەیەم: ﴿ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ ﴾، درەختەكانی خورما كە بنك هاوبەش و بنك جیاجیان، یانی: چەند درەختێكی خورما دووانیان، یاخود سێیان یان زیاتر، یەك بنكیان هەیە، یاخود هەر كامێكیان بنكێكی تایبەتیی هەیە، (صِنْو) ئەوەیە كە درەختێك، ئنجا درەختی خورما بێ، یان هەر درەختێكی دیكە، یەك بنكیان هەبێ، بەڵام ﴿ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ ﴾، ئەوەیە كە هەر كامێكیان بنكی تایبەتی خۆی هەبێ، ﴿ يُسْقَىٰ بِمَآءٍ وَٰحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَىٰ بَعْضٍ فِى ٱلْأُكُلِ ﴾، هەموویان بە یەك جۆرە ئاو، ئاو دەدرێن، بەڵام هەندێكی لە خواردن، لە میوەدا، لە تام و لە بۆن و ... هتد دا، بەسەر هەندێكی دا هەڵدەبژێرین، ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴾، لەوەدا كە باسكرا، نیشانە هەن بۆ كۆمەڵێك كە بفامن، عەقڵیان بەكاربێنن .

ئنجا خوای زاناو دانا دێتە سەر بابەتێکی دی، دوای خستنەڕووی سیفەتەکانی خۆی، دوای ناساندنی خوّی ﷻ لە میانی دیاردەو دیمەنە سروشتییەکاندا، دەفەرموێ : ﴿ وَإِن تَعۡجَبۡ فَعَجَبٞ قَوۡلُهُمۡ ﴾، ئەگەر لە شتێك سەرت سوڕمێنێ، سەیرترین شتیان ئەو قسەیانە کە دەڵێن: ﴿ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍۗ ﴾، ئایا ئەگەر بووینەوە بە خۆڵ، ئایا جارێکی دیکە لە نوێ دروست دەکرێینەوە؟ ئەو قسەیان کە ئەوان بە سەرسوڕمانەوە دەیڵێن، زۆر جێی سەرسوڕمانە زۆر جێی عاجباتییە! ئاخر خوایەك ﷻ تۆی لە نەبوون هێناوەتە دی، ئێستا تۆ گۆڕانێکت بەسەردا هاتوە چۆن ناتوانێ لە نوێ دروستت بکاتەوە؟ مرۆڤێکی سادە دەتوانێ دوای ئەوەی شتێکی دروست کردوەو لێی شکاوە، لێی تێکچووە، وەك خۆی و چاکتر لە خۆی دروستی بکاتەوە، ئەدی خوا چۆن ناتوانێ؟ ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡۖ ﴾، ئا ئەوانە کەسانێکن بێ بڕوان بە پەروەردگاریان، هەر بۆیەش نکووڵیی لەوە دەکەن کە خوا دەسەڵاتو توانای ئەوەی هەبێ، وەك پێشێ دروستیان بکاتەوە لە نوێ، ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡأَغۡلَٰلُ فِيٓ أَعۡنَاقِهِمۡۖ ﴾، هەروەها ئا ئەوانە کۆتەکان کە لە گەردنیاندا هەن، زۆربەی توێژەرەوان دەڵێن: مەبەست سزای دوارۆژە، بەڵام دەشگونجێ مەبەست پێی دنیا بێ، واتە: ئەوانە لە ئەنجامی لاسایی کردنەوەی کوێرانەی پێشینانی خۆیاندا، وەك ئەوەیان لێهاتوە کە کۆتێك خرابێتە گەردنیانەوەو، نەتوانن سەر بەمەلاولا بسووڕێنن، تاکو نیشانەکانی خوا ببینن، ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾، هەروەها ئا ئەوانە هاوەڵی ئاگرن، یاخود خاوەنی ئاگرن، کە تێیدا هەمیشەیین .

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَيَسۡتَعۡجِلُونَكَ بِٱلسَّيِّئَةِ قَبۡلَ ٱلۡحَسَنَةِ ﴾، پەلەت لێ دەکەن کە خراپەیان بۆ بێ، پێش چاکە، کە مەبەست لە خراپە، سزایە، داوایان دەکرد سزایان بۆ بێ، وەك لە سووڕەتی (الأنفال)دا خوای پەروەردگار لێی گێڕاونەوە[1]:

---

١) ﴿ وَإِذۡ قَالُواْ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلۡحَقَّ مِنۡ عِندِكَ فَأَمۡطِرۡ عَلَيۡنَا حِجَارَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئۡتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿٣٢﴾ ﴾ الأنفال

﴿ وَقَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِمُ ٱلْمَثُلَـٰتُ ﴾ لە حاڵێك دا كە سزا تەمبێكەرەكان لە پێش ئەواندا ڕابردوون، ئەو سزایانەی كە دەبوو ئەوان پێیان تەمبێ بن و پێیان عیبرەت گرتوو بن، پەندییان لێ وەربگرن، ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِّلنَّاسِ عَلَىٰ ظُلْمِهِمْ ﴾، بێگومان پەروەردگارت خاوەن لێبوردنە بەرانبەر بە خەڵك، لەگەڵ ستەم و خراپەو تاوانیشیاندا، ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾، هەروەها بێگومان پەروەردگارت سزاو تۆڵەی سەختە .

لە كۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦٓ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان دەڵێن: دەبووایە (موحەممەد) لە پەروەردگاریەوە نیشانەیەكی دابەزێنرابایە سەر، كە مەبەستیان ئەو موعجیزە بەرهەستانەن، كە بۆ پێغەمبەرانی پێشوو هاتوون

خوای پەروەردگار لە وەڵامیاندا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرٌ ﴾، بێگومان تۆ تەنیا وریاكەرەوەو ترسێنەری، واتە: ئەوە عایدی تۆ نیە، چ جۆرە موعجیزەو بەڵگەیەكت پێبێ بۆ نیسباتی پێغەمبەرایەتیی خۆت و، ئیقناع كردنی ئەوان، بەڵكو ئەوە كاری خوایە، ئەركی تۆ تەنیا ئاگاداركردنەوەو ترساندنە، ﴿ وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ ﴾، بۆ هەر كۆمەڵێك ڕێنمایی كارێك هەیە، بۆ گەلەكەی تۆش و، بۆ هەموو بەشەریەتیش، خوای پەروەردگار ئەم قورئانەی ناردوە كە ڕێ پێشاندەریان بێ، ئەگەر بیانەوێ ڕێ بدۆزنەوە، قورئان بەسە كە ڕێیان پێشان بدات و، بەرچاویان ڕوون بكاتەوە، ئەگەر لە ڕێی ڕاستیش نەگەڕێن، بێگومان هەرچەندە كتێبی دیكەش دابەزن و موعجیزەی دیكەشت بۆ بێن، هەر هەمان هەڵوێستیان دەبێ، كە ئێستا هەیانە

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم :** پێناسەی قورئان و هەڵوێستی زۆربەی خەڵکی لە بەرانبەریدا، کە بریتیە لە بڕوا پێ نەهێنان :

خوا ﷻ پاش ئەوەی دەفەرموێ : ﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، دەفەرموێ: ﴿ الٓمٓرۚ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِۗ وَٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ ﴾

**شیکردنەوەی تویژینەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە کە وەک پێشەکیی و دیباجەی کۆی باس و بابەتەکانی ئەم سوورەتە موبارەکە وایە، لە پێنج بڕگەدا :**

**برگەی یەکەم :** - کە دەفەرموێ : ﴿ الٓمٓرۚ ﴾، وەك پێشتریش باسمان کردوە، باشترین واتایەك کە بۆ ئەو پیتە پچڕ پچڕانە لێك بدرێتەوە، یان باشترین شتێك کە بگوترێ لەبارەی هاتنی ئەو پیتە پچڕ پچڕانەوە، کە لە سەرەتای بیست و نۆ (٢٩) سوورەت لە کۆی سەدو چواردە (١١٤) سوورەتدا، هاتوون، ئەوەیە کە خوا ﷻ دەیەوێ پێمان بفەرموێ: بە مرۆڤایەتیی بە گشتی و بە بێبڕوایان بە تایبەتیی: ئەو پیتانەی کە ئەم قورئانەیان لێ پێکهاتوە، ئەو دەنگانەی کە ئەو قورئانەیان لێ پێکهاتوە، ئەو پیت و دەنگانە: (ا، ل، م، ر، س، ی، ص، ق، ن، ت ـــ هتد)، لەبەر دەستی ئێوەشدا هەن وەك کەرەستەیەك، ئنجا ئێوە ناتوانن نەك وەك وێنەی قورئان هەمووی، بەڵکو وەك وێنەی دە (١٠) سوورەت، بەڵکو وێنەی سوورەتێکیش بێنن، کەواتە: دڵنیابن کە ئەو زاتەی ئەو فەرمایشتەی لەو پیت و دەنگانەی کە وەك کەرەستەیەك لەبەردەستی ئێوەشدا

هەن، پێکهێناوە، بزانن کە زاتێکی بەزری بێ وێنەیە، کە خوایە ﷻ، هەر بۆیەش ئێوە ناتوانن لەو پیتو دەنگانە کە لەبەردەستتاندا هەن، شتێك بڵێن، کە شێوەی ئەو فەرمایشتەی خوا بێ ﷻ ! .

**برگەی دووەم :** - کە دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ﴾، ناوی ئاماژەی: (هذِهِ)، بۆ نیزیکە بۆ مێینە،﴿تِلْكَ﴾ش، بۆ دوورە، ﴿تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ﴾، ئەو ئایەتانە ئایەتەکانی کتێبەکەن، ئاماژەیە بۆ دوور، لەبەرچی؟ لەبەر ئەوەی پلەو پایەی ئایەتەکان زۆر بەرزو دوورە، بۆیە بە ناوی ئاماژە (إسم الإشارة)ی دوور، خوای پەروەردگار ئاماژەی بۆ کردوون، دیارە پێشتریش گوتمان: ﴿ٱلْكِتَٰبِ﴾، ئەلیفو لام (ال)ی سەر (الكِتَب)، ﴿تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ﴾، بۆ ناساندن ()ە مەبەست پێی (عَهْد)ە، بۆ تەعریفو پێناسەیە، واتە: ئەمانە ئایەتەکانی کتێبەکەن، ئەو کتێبە ناوبراوو ناسراوەی کە دەزانن، کە بریتیە لە قورئان .

**برگەی سێیەم :** - ﴿وَٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ﴾، ئەوەی کە لە پەروەردگارتەوە بۆ تۆ دابەزێنراوە هەقە، یانی : هەر ئەوە هەقە، هەقیش، واتە: چەسپاوو شتێك کە پێکەڵبێك (مطابق) بێ لەگەڵ ئەوەدا کە لە واقیعدا هەیە، پێچەوانەوەو دژی هەق، بریتیە لە باطڵ کە بریتیە لە شتی بۆش و پووچ و نەچەسپاو، شتێك کە گونجاو نەبێ لەگەڵ واقیعدا .

**برگەی چوارەم :** - ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ﴾، بەلام زۆربەی خەڵکی بڕوا ناهێنن، ئەمە وەك خاوەنی (التحرير والتنوير)[1] دەڵێ: (الإستدراكُ راجِعٌ إِلى مَا أفادَهُ القَصرُ مِن إبطَالِ مُسَاواة غيرِهِ لَهُ في الحَقّيَةِ إبطَالاً يَقتَضِي ارتِفَاع النِّزَاعِ فِي أَحقِيَّتِهِ، أي: ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ۝١﴾ بِمَا دَلّتَ الأدِلّة عَلَى الإيمان بِهِ)، واتە: ئەم بەلامە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە پێشتر ئەو کورت هەڵێنانە دەیگەیەنێ، لەوەدا کە غەیری قورئان لەگەڵ قورئاندا یەکسان بێ، خوا ئەوەی هەڵوەشاندۆتەوە، بە شێوەیەك هەڵیوەشاندۆتەوە کە نەدەبوو ناکۆکیی و

١) ج ١٣، ص ٧٩ .

مشتومڕ هەبێ لەسەر تەنیا بە هەق زانینی قورئان، واتە: بەلام زۆربەی خەلکی بڕوا ناهێنن، بەوەی کە بەلگەکان دەیگەیەنن، لەسەر بڕوا پێ هێنانی قورئان، واتە: نایانەوێ بڕوا بێنن، بۆیە کێشەو مشتومڕیان هەیە لەسەر هەقانیەتی قورئانو، بڕوای پێ ناهێننو، غەیری قورئان لەگەڵ قورئاندا یەکسان دەکەن .

**مەسەلەی [redacted]** : پێناسەی خوا ﷻ بەوە کە ئاسمانەکانی بەرز کردوونەوەو، چۆتە سەر عەرشو، خۆرو مانگی ڕامکردوون، دەستەمۆ کردوونو، مشوورخواردنی [redacted] بوونەوەرو، ڕوونکردنەوەی ئایەتەکانی، تاکو مرۆڤەکان بڕوا بە دیداری بێنن :

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ۖ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ يُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُم بِلِقَآءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ ﴿٢﴾ ﴾

**ئێمە لە پێنج بڕگەدا، کە لە هەر کامیاندا خوا ﷻ سیفەتێکی خۆیو کردەوەیەکی خۆی دەخاتەڕوو، ئەم ئایەتە دەتوێژینەوە !**

**بڕگەی یەکەم :** - ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ﴾، خوا ئەو کەسەیە کە ئاسمانەکانی بە ستوونانێك کە ئێوە نایانبینن، بەرزکردوونەوە، یاخود ئاسمانەکانی بەرزکردوونەوە، وەك دەیانبینن بەبێ ئەوەی کە ستوونیان لەبەردابێ، ئەستوندەگو کۆڵەگەو پایەیان لەبەر دابێ، هەردوو واتاکەی هەمن

هەڵبەتە لێرەدا ئەمە پەیوەستە بە ئایەتی پێشوو[redacted] کە فەرمووی: ﴿ وَٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ ﴾، ئایا پەروەردگار ئەو (رَبّ)ە، کێیە؟ ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ﴾، ئەو پەروەردگار[redacted] ئەو خوایەیە کە ئاسمانەکانی بەرزکردوونەوە بە کۆڵەکە نەبینراوەکان، یان وەك دەیانبینن بە بێ کۆڵەکە.

وشەی: (رَفَعَهَا: أي خَلَقَهَا مُرتَفِعَةً، مِثلُ ضَيِّقَ كُمَّ الجُبَّةِ)، کە دەفەرموێ: ﴿ رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ﴾، ئەوە نیە کە ئاسمانەکان نەرم بوونو دوایی بەرزی کردبنەوە،

بەڵكو واتە: بە بەرزیی دروستی كردوون، هەروەك لە زمانی عەرەبییدا دەگوترێ: (ضَيَّقَ الخَيَّاطُ كُمَّ الجُبَّةِ، أَو كُمَّ القَمِيصِ)، بەرگدرووەكە قۆڵی جبەكە یان قۆڵی كراسەكەی تەنگ كرد، واتە: بە تەنگیی دروستی كرد، هەر كە هەر دروستی كردوە، تەسك بووە، نەك پێشێ فراوان بووبێ، دوایی تەسكی كردبێتەوە.

مەبەست لە: ﴿ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ﴾، یانی: دروستكراوەكانی سەرێ، جیهانی سەرەوە هەمووی دەگرێتەوە، وشەی (السَّمَاء)و (السَّمَاوَات)و (سَبْعَ السَّمَاوَات)، وەك لە سەرەتای تەفسیری سوورەتی (یونس)دا باسمان كردوە مەبەست پێی هەموو ئەو بوونەیە، كە ئێمە گۆشەیەكی لێ دەبینینو، ناومان لێناوە: بوونەوەر (كَوْن).

ئنجا ﴿ عَمَدٍ ﴾و (عُمُد)، كۆی (عَمُود)، یاخود (عِمَاد)ە یانی: كۆڵەكەو ئەستوندەگ، ستوون، پایە، كە دەفەرموێ: ﴿ تَرَوْنَهَا ﴾، مانایەكەی: ئاوای لێدێتەوە: (بِعُمُدٍ أو بِعَمَدٍ غَيرِ مَرئِيَّةٍ)، بە چەند ستوونێك كە نەبینراون، یاخود یانی: (بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا)، یانی: خوا ئاسمانەكانی بەرزكردوونەوە بەبێ ستوونان، بەبێ كۆڵەكان، وەك بەو شێوەیە دەیانبینن.

هەڵبەتە زۆرێك لە زانایان وایان تەفسیر كردوە، یانی: زانایانی هاوچەرخ، چونكە هەردوو تەفسیرەكە هەر دەگونجێن، دەڵێن: مەبەست لە كۆڵەكە نەبینراوەكان، هێزی كێشندەیە، ئەو هێزی كێشندەیە كە كەهكەشانەكان لەگەڵ یەكداو، هەموو ئەستێرەكان لە نێو كەهكەشانێكی دیاریكراوداو، هەموو خڕۆكەكانی بە یەكەوە پەیوەست كردوە، لە ئەنجامی كێش كردنیان بۆ لای یەك، كە هەم هێزی كێشكردنیان هەیە، هەم هێزی پاڵ پێوەنانیان هەیە، (جذب و طرد)یان هەیە، كە هێزی كێشكردن (جذب)ە، كە خۆر ناهێڵێ ئەو خڕۆكەكەی بەملاولادا بچن و كێشیان دەكات، بەڵام بە هۆی هێزی دەركردن (طرد)یش كە لە نێوانیاندا هەیە، پێوە ناڵكێن و پێوە نانووسێن، دیارە ئەم ڕاستییە لە سوورەتی (لقمان)یش دا، لە ئایەتی ژمارە(١٠)دا، هاتوە: ﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَاۖ ﴾ لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ﴾، لەوێ دەفەرموێ: ﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَاۖ ﴾، ئاسمانەكانی دروست كردوون بەبێ كۆڵەكانێك، كە بیانبینن، یاخود بەبێ

کۆڵەکان وەك دەیانبینن، هەروەها لە سووڕەتی (الحج)، ئایەتی (٦٥)دا، هەر ئاماژە بەو ڕاستییە دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَيُمْسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِۦٓ ﴾ واتە: ئاسمان دەگرێ کە بکەوێتە سەر زەوی، مەگەر بە مۆڵەتی خۆی، دیسان لە سووڕەتی (الفاطر)یشدا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُمْسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ أَن تَزُولَا ۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤١﴾ ﴾، واتە: بێگومان خوا ئاسمانەکانو زەوی دەگرێ کە بڕۆن بەمەلاولادا بچن‌و، ئەگەر لابچن، جگە لە وی، (لە دوای خوا) کەس ناتوانێ بیانگرێ، بێگومان خوا هێدیی لێبوردەیە.

هەڵبەتە گرتنی خوا بۆ ئاسمانەکانو زەوی، تێك ناگیرێ لەگەڵ هەبوونی هێزی کێشەندەدا، چونکە خوا ﷻ کە کارەکانی خۆی ئەنجام دەدا، لە ڕێی هۆکارەکانەوە ئەنجامیان دەدا، لە ڕێی قانوونەکانی خۆیەوە، کارەکان لە بووندا ئەنجام دەدا، کەواتە: دەگونجێ مەبەست لە : گرتنی خوا بۆ ئاسمانەکانو زەوی، ئەو هێزی کێشەندەیە بێ کە لە نێوانیاندا، داینا‌وە کە بەهۆی ئەوەوە بە دەوری یەك دا، دەخولێنەوەو یەکدییان پەیوەست کردووە، بەمەلاولادا ناچن، وەك چۆن دەزووێك دەنکەکانی تەسبیحێك، یاخود ملوانکەیەك، هەموویان پێکەوە ڕیز دەکاتو پێکەوە گرێ دەداتو هەڵناوەرن

**بڕگەی دووەم** : - ﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ﴾، دوایی خوا چووە سەر عەرش، چووە سەر بارەگای خۆی، یاخود بەرز بۆوە بۆ سەر عەرش، یان سەقامگیر بوو لەسەر عەرش، چونکە وشەی ﴿ ٱسْتَوَىٰ ﴾، ئەگەر بە ﴿ عَلَىٰ ﴾، تەعەددا بکات، ﴿ ٱسْتَوَىٰ عَلَىٰ ﴾، هەم بە مانای (اسْتَقَرَّ) دێ، هەم بە مانای (عَلا) دێ، هەم بە مانای (ارتَفَعَ) دێ، زانایان بە هەموو ئەو وشانە، وشەی ﴿ ٱسْتَوَىٰ ﴾یان تەفسیرکردوە، بەلام هەمووشیان گوتوویانە: (الإستواءُ مَعلُومٌ، وَالكَيفيَّةُ مَجهولَةٌ، وَالإيمانُ بِهِ واجِبٌ، وَالسُّؤالُ عَنْهُ بِدْعَةٌ)، ئیمام مالیك بە تایبەتی وایگوتوەو، زۆر لە زانایانی سەلەفیش قسەکەی ئەویان پشتڕاست کردۆتەوە، واتە: ﴿ ٱسْتَوَىٰ ﴾ ماناکەی دیارە کە یانی: چووە سەرێ، یان سەقامگیر بوو، یان بەرزبۆوە، بەلام چۆنیەتییەکەی،

مادام بۆ خوا بەكاربێ، بۆ ئێمە زانراو نیە، فەرزیشە بڕوای پێ بێنینو، شتێكی داهێنراویشە ■ پرسیار لە چۆنیەتییەكە بكەین، چونكە زانایانی پێش مالیك واتە: هاوەڵانو تابیعین خوا لێیان ڕازی بێ، پرسیاریان لەوبارەوە نەكردوە .

هەڵبەتە من تێبینییم لە سەر ئەو قسەیەی مالیك هەیەو، پێم وا نیە كە پرسیاركردن لەوبارەوە بیدعەت بێ، بەڵام ئەو وای تەعبیر لێ كردوە، چونكە ئەگەر وابێ: هەموو ئەو زانایانەی كە قسەیان لەوبارەوە كردوە، ئەهلی بیدعەت بوون! چ ئەوانەی كە تەئویلیان كردوەو، چ ئەوانەش كە نەیانكردوە كە بەداخەوە وەك هەندێك بەهەڵە: پێیان وایە: ڕێبازی سەلەفی صالح هەر ئەوەیە تەئویل نەكرێ! كە لە ڕاستیی دا پێشینی چاك، تەئویلیشیان هەبووە، تەئویل نەكردنیشیان هەبووە، بەڵام تەئویلەكەشیان لە چوارچێوەی بنچینەكانی زمانی عەرەبییدا بووەو، ■ چوارچێوەی دەقەكانی قورئانو سوننەت دا بووەو، تەئویل نەكردنەكەشیان دیسان دوور بووە لەوەی كە وێچواندنی تێدا بێ، بەڵام هەڵبەتە ئەوە سەلامەتترە كە بڵێین: ئێمە چۆنیەتییەكەی نازانین، بەڵام دان بەوەدا دێنین كە خوای پەروەردگار سیفەتێكی هەیە بریتیە لە: ﴿ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ﴾، بەڵام چۆنە؟ نازانین، هەروەك هەموو سیفەتەكانی دیكەی خوای پەروەردگاریش، ئێمە چۆنیەتییەكەیان نازانین ■ زانیاریی خوا، دەستەڵاتی خوا، بەزەیی خوا، حیكمەتی خوا، بەرزبوونەوەی خوا بۆ سەرەوەی ئاسمانەكان، فەرمایشتكردنی خوا، هەروەها هەموو سیفەتەكانی دیكەی، بە تەئكید ئێمە چۆنیەتییەكەیان نازانین، كە ئێمە لە سەرەتای تەفسیری سوورەتی (یونس)و، لە تەفسیركردنی ئایەتی (٥٤)ی سوورەتی (الأعراف)یشدا، بە تەفصیلْ باسی ئەوەمان كردوە .

<u>**برگەی سێیەم**</u> : ﴿ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾، هەروەها خوا خۆرو مانگی دەستەمۆ كردوون، هەر كامێكیان بۆ كاتێكی دیاریكراو دەڕواتو لە گەڕدایە، (الجَرْيُ: السَّيْرُ السَّرِيع)، ڕۆیشتنی خێرا، پێی دەگوترێ: (جَرْي)، ﴿ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾ هەر كامێك لە خۆرو مانگ، بەڵكو ئەوانی دیكەش هەموو خڕۆكەو ئەستێرەكان، دەڕۆن بۆ كاتێكی ناوبراو، كاتێكی دیاریكراو .

**برگەی چوارەم :** - ﴿ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ﴾، کاروبارەکان بەڕێوە دەبات، سەرپەرشتییان دەکات، ئیدارەیان دەکات

**برگەی پێنجەم :** - ﴿ يُفَصِّلُ ٱلْآيَٰتِ لَعَلَّكُم بِلِقَآءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ ﴾، ئایەتەکان ڕۆشن دەکاتەوە، مانایان ڕوون دەکاتەوە، بەڵکو بە دیداری پەروەردگارتان بڕوا پتەوبن، لێی دڵنیابن، بۆیە ئایەتەکانیتان بۆ ڕۆشن دەکاتەوە، تاکو سەرەنجام بڕوایەکی پتەوتان هەبێ، بە دیداری خواو بەوە کە کاتێک دێ، دەچنەوە بەردەستی خوای پەروەردگار، کەواتە: بزانن ئەم ژیانە دنیاییەتان چۆن دەگوزەرێنن، تاکو ئەو کاتە ﷻ چوونەوە خزمەتیو چوونەوە بەردەستی، سەربەرزو ڕوو سوور بن .

**مەسەلەی دووەم** : پێناسەی خوا ﷻ بە چەند سیفەتێک کە پەیوەندییان هەیە بە سەرپەرشتیکردنی خوا بۆ جیهانی خواروو (العالَمُ السُّفْلِي)، زەمینو، لەو شتانەی کە لە زەمین دا هەن :

خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى مَدَّ ٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنْهَٰرًا ۖ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ ۖ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٣﴾ ﴾

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە شەش برگەدا:**

**برگەی یەکەم :** - ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى مَدَّ ٱلْأَرْضَ ﴾، خوا ئەو کەسەیە کە زەوی لێک کێشاوەتەوە، (مَدّ)، بە مانای پان ڕاخستنو فراوان کردنو لێک کێشانەوە دێ، وەک گوتراوە: (ظلٌّ ممدودٌ) سێبەرێکی دوورو درێژ، کە لێک کێشراوە بێتو کورتو کەم نەبێ، مەبەست لێرەدا ئەوەیە: خوا کاتێک زەوی دروست کردوە، لێک کێشراوەتەوە، پانو فراوانە، هەم بۆ بەسەردا ڕۆیشتن، هەم بۆ کشتوکاڵو بۆ کارو کەسابەت تێدا کردن، لێک کێشراوەیەوەو کەم بەرو بەرتەسک نیە .

**برگـەی دووەم :** - ﴿ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ ﴾، چەسپاوەکانی تێدا داناون، ﴿ رَوَاسِيَ ﴾، (جَمْعُ رَاسِي، وَهُوَ الثَّابِتُ الْمُسْتَقِرُّ أَي: جِبَالاً رَوَاسِيَ)، واتە: چیایە چەسپاوەکانی تێدا داناون، بۆچی وشەی (جِبال) فرتێنراوە؟ دەڵێ: (وَقَدْ حُذِفَ الـموصوفُ لِظُهُورِهِ، فَهُوَ كَقَولِهِ ﴿ وَلَهُ الْجَوَارِ الْمُنشَآتُ فِي الْبَحْرِ كَالْأَعْلَامِ ﴿٢٤﴾ ﴾، وَلَهُ الجَوارِي أَي السُّفُنِ الجَوارِي)، واتە: وەسفکراوەکە لەبەر ئاشکرابوونی فرتێنراوە، چونکە ئاشکرایە کە ﴿ رَوَاسِيَ ﴾، چەسپاوەکان، واتە: چیایە چەسپاوەکان، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەو (خوا) ڕۆیشتووەکانی نێو دەریای هەن، کە وەك چیا بەرزەکانن، یانی: کەشتییە ڕۆیشتووەکان، لە دەریادا

**برگـەی سێیەم :** - ﴿ وَأَنْهَارًا ﴾، هەروەها ڕووبارەکانیشی تێدا داناون، هەڵبەتە سەرچاوەی پەیدابوونی ڕووبارەکان، چیاکانن، لە چیاکاندا، ئەو بەفرو باران‌و تەرزەیە ■ دەبارێ، عەمبار دەکرێ‌و کۆ ■ەکرێتەوە، خوای پەروەردگار چیاکانی وا دروست کردوون، ئنجا دوایی بە شێوەی کانی‌و سەرچاوە هەڵدەقوڵێن‌و دەردەقوڵێن، یاخود بەفرو تەرزە ■ کۆدەبێتەو■ دەتوێتەوە، ئەوانە دەبنە سەرچاوەی ڕووبارەکان، بۆیە مەگەر چۆن نەگەڕنا خوا ﷻ هەر کە باسی چیاکانی کرد بێ، باسی ڕێ‌و بانەکانیشی کردوە، چونکە ڕێیەکان بە دۆڵ‌و شێوەکانی چیاکان دا دەڕۆن، هەروەها باسی ڕووبارەکانیشی کردوە، چونکە بەهۆی چیایەکانیشەوە، ڕووبارەکان پەیدادەبن‌و، ئاوی شیرین هەر ئەو ئاوەیە کە لە ئاسمان دێتە خوار، بە شێوەی بەفرو باران‌و تەرزە، کە ئەویش بە زۆریی لە چیاکاندا عەمبار دەکرێ .

وشەی (أَنهار)یش، کۆی (نَهَرْ)ە، کە لە ئەصڵدا بە دۆڵ‌و شیو دەگوترێ، دواییش خوازراوەتەوەو بۆ ئەو ئاوەش کە پێی دا دەڕوات

**برگـەی چوارەم :** - ﴿ وَمِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ ﴾، هەروەها لە هەموو میوەکان، جووتێکی دووانی داناوە، (أَي أَشْجَارِ كُلِّ الثُّمَرَات) لە درەختەکانی هەموو میوەکان، چونکە نێرو مێیەکە، جووتەکە، لە درەختەکاندایە، نەك لە خودی میوەکاندا، هەڵبەتە هەندێك لە زانایان ئاوایان لێکداوەتەو■ دوو جۆرە میوە، گوتوویانە: میوەی هاوینەو زستانە، بەڵام پێم وایە میوەکان تەنیا دوو جۆر

نین، بەڵكو جۆریان زۆر زۆرن، بەڵكو وشەی (زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ) مەبەست پێی نێرو مێیە. ئنجا ئەم مەسەلەیە لە سوورەتی (الذاريات)یشدا هاتوە كە دەفەرموێ: ﴿ وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾، واتە: لە هەر شتێك جووتێكمان دروست كردوە، بەڵكو بیربكەنەوە، واتە: بیر بكەنەوە كە تەنیا خوا تاكە، ئەوی دیكە هەمووی پێویستیی بە یەكێ‌تییە، هەمووی جووتە، ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿ وَمِن كُلِّ شَيْءٍ ﴾، دەگونجێ مەبەست پێی سالیبو موجیبی نێو گەردیلە بێ، وەك لە سوورەتی (يس)یشدا، دەفەرموێ: ﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾، واتە: پاكیی بۆ ئەو خوایەی كە هەموو جووتەكانی دروست كردوون، لەوەدا كە زەوی سەوزی دەكاتو، لە خۆیانداو لەوەشدا كە نایزانن، لەوەدا كە نایزانن، دەگونجێ مەبەست پێی ماددەی بێ ژیان بێ، كە ئەویش ساردو گەرمی هەیە، ئەویش جووتی هەیە، پرۆتۆن خاوەنی بارگەیەكی ئەرێنییەو، ئەلیكترۆن خاوەنی بارگەیەكی نەرێنییە، موجیبو سالیب، (+ و –)، كە ئەوانیش وەك نێرو مێ وان، پێكەوە، ئنجا هەموو شتەكانی دیكەش هەر جووتن: زەویو ئاسمان، بە هەشتو دۆزەخ، چاكو خراپ، بەرزو نزم، تاڵو شیرین، ڕاستو چەپ، دنیاو دواڕۆژ، هەمووی جووتە، تەنیا خوا ﷻ تاكەو بێ هاوەڵو بێ وێنەیە .

ئنجا لەبەرئەوەی ئەو مەسەلەی هەبوونی نێرو مێ، بە تایبەت لە ڕووەكو درەختەكاندا، لە زۆر شوێنی قورئاندا هاتوە بە پێویستم زانی كە ئەم عیبارەتە لە (الجواهر في تفسير القرآن الكريم)[1] بخوازمەوە، كە دەڵێ: (جَعَلَ فيهَا مِن كُلِّ أصنافِ الثَّمَراتِ زَوجَينِ اثنَينِ ذَكَراً وأُنثَى في أزهارِها عِندَ تَكَوُّنِها، فَقَد أظهَرَ الكَشفُ الحَديثُ أنَّ كُلَّ شَجَرٍ وَ زَرعٍ ، لايَتَكوَّنُ ثَمرهُ وَحَبُّهُ إلاَّ من بَينِ اثنَينِ ذَكَرٍ وَأُنثَى ، فَعُضوُ الذَّكَرِ قَد يَكونُ مَعَ عُضوِ الأُنثَى في شَجَرَةٍ واحِدَةٍ ، كَأغلَبِ الأشجارِ، وَقَد يَكونُ عُضو الذَكَرِ في شَجَرَةٍ والأنثَى في شَجَرَةٍ أُخرَى، كَالنَخْلِ وَما كانَ العُضوانِ فيهِ في شَجَرَةٍ واحِدَةٍ، إمّا أن يَكونَا مَعاً في زَهرَةٍ

---

١) ج ٤، ص ٨٩، الطبعة الثانية ، سنة : (١٤٣٧) هـ . - (٢٠١٦) م .

وَاحِدَة، وَإمَّا أن يكونَ كلٌّ مِنهُما في زَهرَةٍ فالأولُ كشَجَرَةِ القُطنِ، والثاني كالقَرْعِ

دەڵێ: خوا ﷻ لە هەموو جۆرە میوەکان جووتێکی داناوە، نێرو مێ، ئەویش لە گوڵەکانیاندا لە کاتی دروست بوونی چرۆو گوڵەکانیاندا کە گوڵ دەدەن، دەرخستنی تازە (واتە: زانستی تازە) دەریخستوە کە هیچ درەختێك و ڕووەکێك میوەکەی و بتکەکەی دروست نابێ، مەگەر لە نێوان دووانیدا، لە نێوان نێرو مێیەك دا، ئنجا جاری وا هەیە کە نێرەکە لەگەڵ مێیەکە، لە یەك درەختدا دەبن، وەك زۆربەی درەختەکان وان، نێرو مێیەکە پێکەوە لە درەختێك دان، جاری واش هەیە، نێرەکە لە درەختێکدا دەبێ و، مێیەکە لە درەختێکی دیکەدا دەبێ، وەك دارخورما، (دارخورما دەبێ تۆی نێرەکە بخەیە سەر مێیەکە، ئەوجار بەردەگرێ)، ئنجا لە درەختێکدا دەبن، جاری وا هەیە لە یەك گوڵدا دەبن، جاری واش هەیە هەر کامێکیان لە گوڵێکدا دەبێ، ئەوە کە هەردووکیان نێرو مێیەکە لە یەك گوڵدا بن، وەك ڕووەکی لۆکە، پەمۆ (قُطن)، هی دووەمیان کە هەر کامێکیان لە گوڵێکدا دەبێ، وەك کوولەکە (قَرْع)، کە نێرەکە لە گوڵێکداو مێیەکە لە گوڵێك دایە .

ڕەنگە یەکێك بپرسێ: باشە بۆچی تەنیا دارخورما پێویستیی بە مرۆڤ دەکات، تۆوی نێرەکەی بەرێ بۆ مێیەکەو تێکەڵیان بکات ؟

وەڵامەکەی ئەوەیە کە :

دارخورما زۆر بەرزەو، کەمتر وایە کە لە ئەنجامی جووڵەی باو، جووڵەی هەنگ و تەیرو تواڵ، تۆوی نێرەکە بچێ بۆ مێیەکە، بۆیە پێویست بەوە دەکات کە مرۆڤ بە دەست تۆوی نێرەکە بەرێ بۆ مێیەکە

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ ﴾، لەبەر ئەوەیە کە هەر کام لە نێرو مێ، پێی دەگوترێ: (زَوج) واتە: بە نێریش دەگوترێ (زوج)و بە مێش دەگوترێ و، بە هەردووکیشیان دەگوترێ: (زَوج)، بەڵام ئەگەر مەبەست هەردووکیان بێ، دەگوترێ: (زَوجَیْن)، ئنجا کە بە وشەی (اثنَین)، تەئکیدی کردۆتەوەو جەختی لێ کردۆتەوە، بۆ ئەوەیە کە خوای پەروەردگار زیاتر جاکەی خۆی بخاتە بەرچاوی ئێمە

**بڕگـــەی پێــنجـــەم :** - ﴿يُغْشِي ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ﴾، بـە شـەوگار، ڕۆژگـار دادەپۆشـێ، خوێنراویشەتەوە: (يُغَشِّي)، (غَشَّى يُغَشِّي، أَغْشَى يُغْشِي)، هەردووکیان هاتوون‌و، یانی: دادەپۆشێ، بە شەوگار ڕۆژگار دادەپۆشێ، کە بە تەئکید مەبەست پێی ئەو شوێنەیــە کە ڕۆژگـاری لێیــە، کە ڕووی زەوییە، هەمیشــە شەوگـارو ڕۆژگـار بـەدوای یەکـەون، هەرکـامێکیان شوێنی خـۆی بـۆ ئـەوی دیکــە چــۆڵ دەکات، بەردەوام‌و هەمیشە نیوەی گۆی زەوی ڕۆژەو نیوەشی شەوەو، شەوو ڕۆژ بـە دوای یەکـدا دێــن، وەك لـە ئایــەتی (٥٤)ی سووڕەتی (الأعراف)دا دەفـەرموێ: ﴿يُغْشِي ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا﴾، واتە: (خوا) بە شەوگار ڕۆژگـار دادەپۆشێ، بە خێرایی شوێنی دەکەوێ، ئەگەر کەسێك لـە دەرەوەی گـۆی زەوییـەوە تەماشای گۆی زەوی بکات، دەبینێ تاریکیی‌و ڕووناکیی، شـــەوو ڕۆژ، زۆر بـە خێــرایی بـە دوای یەکــدا دێن، وەك تـاریکیی ڕووناکیی ڕاو بنێ، بۆیـەش بـە (الفعل الـمضارع) هێناویـەتی: ﴿يُغْشِي ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ﴾ چونکە: ئـەو حـاڵەتـە هەمیشە تازە دەبێتـەوە[1] .

**بـڕگـــەی شـەشـــەم :** - ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾، بێگـومان لــەوەدا، (واتــە: لــەوەدا کــە باســکرا)، نیشــانە هــەن، بــۆ کۆمەڵێــك بیــر بکەنــەوە، ﴿يَتَفَكَّرُونَ﴾ دیسان ئەمیش بە (الفعل الـمضارع)، هێناویـەتی، چونکە دەلالـەت لەسەر تازە بوونەوە دەکات، یانی: هەمیشـە مـرۆڤ دەبێ بیـری تـازە بکاتـەوە، نـەك یەکجار بیر لە شـتێك بکـاتەوەو بـڕوا، بەڵکـو دەبێ هەمیشە ئینسان عەقڵی خۆی بجووڵـێنێ، بە ئەنـدازەی ئـەوە کە دیاردەو دیمەنـە جیاوازە بـە دوای یەکدا هاتووەکان دەبینێ، دەبێ ئەویش عەقڵی خۆی بـە دوایـان بخاتو، بیـری تازەیــان لێبکـاتەوە .

---

١) هەڵبـەتـە ئەویـش لــە ئەنجـامی خولانــەوەی زەوی بـە دەوری خۆیـدا ، لـە بەرانبـەر خـۆردا، بـە خێرایی (٣٠ کم) لە خولەك (دقیقـة)ێك ■

**مەسەلەی چوارەم : دیسان پێناسەی خوا لە میانی دیاردە سروشتییەکاندا، بەلام ئەمجار: دیمەنەکان وردتر دەبنەوە :**

وەك كە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ قِطَعٞ مُّتَجَٰوِرَٰتٞ وَجَنَّٰتٞ مِّنۡ أَعۡنَٰبٖ وَزَرۡعٞ وَنَخِيلٞ صِنۡوَانٞ وَغَيۡرُ صِنۡوَانٖ يُسۡقَىٰ بِمَآءٖ وَٰحِدٖ وَنُفَضِّلُ بَعۡضَهَا عَلَىٰ بَعۡضٖ فِي ٱلۡأُكُلِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ۝٤ ﴾

**توێژینەوەی ئەم ئایەتە موبارەكە لە شەش برگەدا:**

دیسان خوا ﷻ لەسەر پێناسەی خۆیو، ناساندنی خۆی لە میانی خستنە ڕووی سیفەتو كردەوەكانیدا، لە ناوێنەی دروستكراوەكانو دیاردەو دیمەنە سروشتییەكاندا، بەردەوام دەبێ، دەفەرموێ :

**برگەی یەكەم :** - ﴿ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ قِطَعٞ مُّتَجَٰوِرَٰتٞ ﴾، هەروەها لە زەمیندا پارچە (زەمینە) بە تەنیشت یەكەوەكانەوە: هەن، پارچە زەمینە دراوسێیەكانو بە تەنیشت یەكەوە ڕیز بووەكان، هەن.

﴿ قِطَعٞ ﴾، كۆی (قطعَة)یە، ﴿ قِطَعٞ ﴾، واتە: پارچەكان، ﴿ مُّتَجَٰوِرَٰتٞ ﴾، كۆی (متَجَاوِرة)ە، واتە: بە تەنیشت یەكەوە ڕیزبووەكان، ئینسان بە تایبەت كە سواری فڕۆكە دەبێ، لە سەرەوە تەماشا دەكات، ئەو پارچە زەوییانە زۆر جوان بە تەنیشت یەكەوە ڕیز بوون، دراوسێی یەكن، هەڵبەتە ئەو پارچە زەوییانە كە بە تەنیشت یەكەوەن، لە خودی خۆیاندا نیشانەن لەسەر پەروەردگارێتیو مشوورخۆرێتیی خوا، كە ئەو پارچە زەوییانە هەر كامێكیان جۆرە ئامادەییەكی هەیەو، هەر كامێكیان جۆرە تامو چێژێك لە خۆی دا هەڵدەگرێ، جۆرە خێرو بێرێك لە خۆیدا هەڵدەگرێ. هەیە دەبێتە لەوەڕگاو پاوانو، هەیە شوێنی دارو درەختو میوەیەو، هەیە شوێنی كشتوكاڵ: دانەوێڵەیە، هەیە شوێنی كانی سەرچاوەو ڕووبارەو.... هتد

**برگـــەی دووەم :** - ﴿ وَجَنَّٰتٌ مِّنْ أَعْنَٰبٍ ﴾، هـەروەها چـەند بـاخ‌و بێستانێك لـە ترێیەكان

(أعناب)، كۆی (عِنَبْ)ە، یانی: ترێ، كە هەم بە درەختەكەشـی دەگوترێ‌و، [redacted] بە میوەكەش دەگوترێ، هەڵبەتـە بـە عـەرەبیی (كَرْم)یش، پێ دەڵێن، (كَرْم)، واتـە: مێـو، كـە بـە (كُروم)، كۆ دەكرێتـەوە، واتـە: دارمێوەكـان، ﴿ وَجَنَّٰتٌ مِّنْ أَعْنَٰبٍ ﴾، حەسەنی بەصریی خوێندوویەتـەوە: (وَجَنَّاتاً مِن أعنَاب)، واتـە: خـوا چەند باخ‌و بێستانێكی لە دارمێو، [redacted] درەختی ترێ، دروست كردوون .

**برگـەی سێیـەم :** - ﴿ وَزَرْعٌ ﴾، هـەروەها كشتوكـاڵ

(زَرع) ئەوەیە كـە لـە نێـوان دارو درەختـەكـانـدا دەچێنرێ، ئنجـا دانەوێڵـەیە وەك: گـەنم‌و جـۆو نیسـك‌و نـۆك‌و بـرنج (مـەرەزە)و هـەرزن‌و هـەموو جۆرەكـانی دانەوێڵـە، یـاخـود تـەرەكارە وەك: كـاڵەك‌و شـووتیی‌و خەیـارو ترۆزیـی ... یـاخود جۆرەكانی دیكـەی سـەوزەیە، وەك هـەموو ئـەو سـەوزانە كـە دەخورێن: توورو پیازو سیرو كەوەرو كەرەوزو تـەرە تیزەو ... هتد، هـەمووی دەگرێتـەوە .

**برگـەی چـوارەم :** - ﴿ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ ﴾، (نخیل) كۆی (نَخْل)ە، واتـە: درەختانی خورمـا، ﴿ صِنْوَانٌ ﴾، ئەوەیە كە بنكەكەیان یەك بێ بەڵام سەرەكەیان جیـا بێ، واتـە: چـەند دارخورمایـەك كـە یـەك بنكـیان هەیـە، ﴿ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ ﴾، واتـە: كـە خـاوەن یـەك بنـك نەبـن، هـەر كامێكـیان بنكی تایبـەتی خـۆی هـەبێ، هەڵبەتـە (صِنوان)، كـۆی (صِنو وصُنُو) یـە، (وَهِيَ نَخلَةٌ لَهـا رَأسـانِ أو أكثـر وَأَصلُهَا وَاحِد)، دارخورما [redacted] دوو سـەری هەبن، یـاخود زیـاتر، بـەڵام بنكەكـەی یـەك بـێ، (وَقِيـلَ: الصنوانُ: الـمُجتَمِعُ، وَغَيرُ صِنوانٍ: الـمُتَفَرِّقُ)، هەروەهـا گوتراویشـە: (صِنْوان)، واتـە: ئـەو دارخورمایانـەی كـە پێكـەوە كۆبوونەتـەوە، ﴿ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ ﴾، واتە: ئەوانەی كە لێـك جیـان

شایانی باسە: دووانەی (صنو)، بریتیە لە (صِنوان)، بەلام بە بێ تەنووین، بەلام ئەگەر بە تەنوینەوە بێ: (صِنوانٌ)، ئەو کاتە (صِنوانٌ)، کۆی (صنو)ە، بەلام (صِنوان)، بە بێ تەنوین، واتە: دوو دانە (صنو)، هەڵبەتە بەهەمان شێوە (قِنوان)یش، وایە، (قِنُو)، بە (قِنوانٌ)، کۆ دەکرێتەوەو (قِنوان)، واتە: دوو هێشوو .

<u>برگەی پێنجەم</u> : ﴿ يُسْقَىٰ بِمَآءٍ وَٰحِدٍ ﴾، هەمووی بە یەك جۆرە ئاو، ئاودەدرێ. ﴿ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَىٰ بَعْضٍ فِى ٱلْأُكُلِ ﴾، بەلام هەندێکی بەسەر هەندێکی هەڵدەبژێرین لە میوەکەیدا، لە خواردنیدا، (السَّقيُ: إعطاءُ المَشروب)، (سَقيِ)، بریتیە لەوە کە شتێك ئاو بدرێ، هەروەها لە جیاتی (يُسْقَى) خوێنراویشەتەوە: (تُسقَى بِمَاءٍ وَاحِدٍ)، ئاودەدرێ بە یەك جۆرە ئاو، هەروەها وەك چۆن خوێنراوەتەوە: ﴿ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَىٰ بَعْضٍ فِى ٱلْأُكُلِ ﴾، خوێنراویشەتەوە : (يُفَضِّلُ)، هەندێکی بەسەر هەندێکی هەڵدەبژێررێ .

وشەی (أُكُل)یش، کە بە (أُكْل)یش، خوێنراوەتەوە، واتە: ئەوەی کە دەخورێ، میوە، یانی: تامەکانیان جیاوازن‌و بەرزیی‌و نزمیی لە بەینیاندا هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە یەك زەمین دان‌و، یەك جۆرە خۆراکیان هەیەو بە یەك جۆرە ئاو ئاو دەدرێن، ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە خوا چەند هێزێکی پەنهانی تێدا داناون، بە هۆی ئەو هێزە پەنهانانەوە جیاوازییان دەبێ، لە ڕەنگ‌و تام‌و بۆن‌و جۆرو چۆنیەتییان دا، ئنجا ئەوە کە خوا ﷻ لە ڕێی چەند یاسایەکەوە وایکردوە، کە دانەوێڵە، درەختی میوە، سەوزە، ...هتد، بڕوێن‌و، جیا بن لە ڕەنگ‌و تام‌و بۆنیاندا، لەبەرئەوە کە بە پێی چەند یاسایەك ئەوە ڕوودەدا، مانای وا نیە کە ئەوە پێویستیی بە خوا نیە، چونکە خوا ﷻ عادەتی وایە کارەکانی خۆی لە ڕێی یاساکانەوە جێبەجێ دەکات، لە ڕێی هۆکارەکانەوە ئیرادەی خوا جێبەجێ دەبێ .

<u>برگەی شەشەم</u> : لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴾، بێگومان لەوەدا (کە باسکرا) نیشانە هەن بۆ کۆمەڵێك بفامن

ئنجا ئایا حیکمەتی چییە کە لە ئایەتی پێشیدا فەرمووی: ﴿ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ۝٣ ﴾، بەلام لەمەیاندا، فەرمووی: ﴿ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ۝٤ ﴾؟! :

وەلامەکەی ئەوەیە کە :

١- ئینسان دەبێ پێشێ بیر بکاتەوە، ئنجا دەفامێ.

٢- حیکمەتێکی دیکەی ئەوەیە، کە ئەوەی پێشێیان پێویستیی بە بیر لێکردنەوە دەکات، رامانو بیرکردنەوەو هەلوەستە، بەلام ئەوەی دواییان، هێندە ئاشکرایە، ئەگەر ئینسان تۆزێ عەقلی هەبێو سەرنجی بدات، زۆریش تێوەی رانەمێنێو بیر نەکاتەوە، بۆی دەردەکەوێو، نیشانەکانی خوای پەروەردگار لەو دروستکراوانەدا دەبینێ.

**مەسەلەی پێنجەم :** نکوولیی کردنی کافران لە زیندووکرانەوەیان، جێی سەرسوڕمانەو، لەسەر ئەوەش گیرۆدەی سزا دەبن :

خوا دەفەرموێ : ﴿ وَإِن تَعْجَبْ فَعَجَبٌ قَوْلُهُمْ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِى خَلْقٍ جَدِيدٍ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ ٱلْأَغْلَٰلُ فِىٓ أَعْنَاقِهِمْ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ۝٥ ﴾

**توێژینەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە ، لە چوار برگەدا:**

**برگەی یەکەم :** - ﴿ وَإِن تَعْجَبْ فَعَجَبٌ قَوْلُهُمْ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِى خَلْقٍ جَدِيدٍ ﴾، ﴿ وَإِن تَعْجَبْ ﴾، ئەگەر سەرت سوڕدەمێنێ، واتە: ئەگەر سیفەتی سەرسوڕمان لە تۆدا هەیە، ئەوە ئەو قسەیان کە دەلێن: ﴿ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِى خَلْقٍ جَدِيدٍ ﴾، ئایا ئەگەر ئێمە بووینەوە بە گلو خاك، ئایا ئێمە جارێکی دیکە سەر لە نوێ دروست دەکرێینەوە؟ ئا ئەو قسەیە زۆر جێی سەرسوڕمانە، واتە: ئەگەر لە شتێك سەرت سوڕدەمێنێ، لەو قسەیان سەرت سوڕبمێنێ.

شایانی گوتنە :

﴿ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا ﴾، خوێندراویشەتەوە: (إِذَا كُنَّا تُرَاباً)، هەروەها ﴿ أَءِنَّا لَفِى خَلْقٍ جَدِيدٍ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (إِنَّا لَفِي خَلْقٍ جَدِيد).

واتاکانیشیان هەریەکن، بە مەرجێك ڕستەکان وەك پرسیارکردن (إستفهام بخوێندرێنەوە

**برگەی دووەم :** - ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمْ ﴾، خوا ﷻ هەر ئەوەندە ڕوون دەکاتەوە دەفەرموێ: ئا ئەوانە کەسانێکن بڕوایان بە پەروەردگاریان نیە، واتە: ئەوە بێبڕواییانە بە پەروەردگاریان وایان لێ دەکات ﷺ بە سەرسوڕمانەوە بڵێن: ئایا دوای ئەوەی بووینەوە بە خاك و خۆڵ، جارێکی دیکە سەر لە نوێ دروست دەکرێینەوە؟ بێبڕواییان تووشی ئەو نەزانیی و نەفامیی و سەرسوڕمانە نەفامانەیەی کردوون

**برگەی سێیەم :** - ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلْأَغْلَٰلُ فِىٓ أَعْنَاقِهِمْ ﴾، ئا ئەوانە کۆتەکان لە گەردنیان دا هەن

(أَغلال)، کۆی (غُلّ)ە، (غُل)، شتێکە لە گەردن دەکرێ، وەك چۆن کەلەپچە لە دەست دەکرێ و زنجیر لە پێ دەکرێ، (غُلّ)یش، کە کۆیەکەی (أَغلالْ)ە، لە گەردن دەکرێ: (الأَغلالُ: جَمعُ غُلّ وَهُوَ القَيدُ يُوضَعُ فِي العُنُق)، (الأغلال)، زۆربەی توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ئەوە هەڕەشەیەکە بۆ ئەوانە کە خوا ﷻ لە ڕۆژی دواییدا بەرەو شوێنی سزاو لێپرسینەوە، پاڵیان دەدات، لە کاتێکدا کە کۆتیان لە گەردن کراوە بە زەبوونیی و ملکەچیی، چونکە کاتی خۆی عادەتیان وا بووەو ئێستاش هەر وایە، ئەوانەی کە ویسترا بێ وەك دیل بە کەم تەماشایان بکەن و سزایان بدەن، کۆتیان لە گەردن کردوون .

منیش دەڵێم: دەگونجێ مەبەست پێی ئەوە بێ: کە ئەوانەی بەو شێوەیە لە بەرانبەر سەر لە نوێ دروست کرانەوەی خۆیاندا، لەلایەن خوای پەروەردگارەوە، سەریان سوڕدەمێنێ، ئەوانەی کە بێبڕوان بە پەروەردگاریان، لە ئەنجامی ئەوەدا تووشی ئەوە بوون، کە لاسایی کردنەوەی پێشینانیان کردوە بە کۆت و پێوەندێك و دەست و پێی و گەردنی خۆیانیان پێ بەستوە واتە:

دەگونجێ مەبەست ئەوە بێ، کە ئەوانە ئێستا بەو حاڵەتو بەو جۆرە بیرکردنەوەوە، وەك کەسێك وان، کە کۆتیان لە گەردن دا بێ، چونکە عەقڵی خۆیان کۆتو زنجیر کردوە.

**برگەی چوارەم :** - لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾، هەموو ئەوانە خاوەنی، (یاخود هاوەڵی) ئاگری دۆزەخن، کە تێیدا بە هەمیشەیی دەمێننەوە .

**مەسەلەی شەشەم :** پەلەکردنی بێبڕوایان لە هاتنی سزاو بەڵا، لە جیاتی ئەوەی کە داوای ڕەحمەتو نیعمەتی خوا بکەن، وێڕای ئەوەی کە سزاو بەڵا تەمبێ کارەکانی خوا ﷻ لە ژیانی گەلانی پێشوودا، تێپەڕیون و، دەبوو پەندیان لێ وەربگرن .

خوا دەفەرموێ : ﴿ وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلسَّيِّئَةِ قَبْلَ ٱلْحَسَنَةِ وَقَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِمُ ٱلْمَثُلَٰتُۗ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِّلنَّاسِ عَلَىٰ ظُلْمِهِمْۖ وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٦﴾ ﴾

**توێژینەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە ، لە چوار برگەدا:**

**برگەی یەکەم :** - ﴿ وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلسَّيِّئَةِ قَبْلَ ٱلْحَسَنَةِ ﴾، پەلەت لێ دەکەن بە هاتنی خراپە، پێش چاکە

وشەی (سَيِّئَة)، یانی: خراپە، پێچەوانەی (حَسَنَة)یە، یانی: چاکە، بەڵام بە پێی سیاق مانایەکەی دیاریی دەکرێ، لێرەدا (سَيِّئَة)، بە مانای سزاو، بە مانای بەڵاو، بە مانای ناخۆشیی دێ، وەك زانایان گوتوویانە: (السَّيِّئَةُ: الحَالَةُ السَّيِّئَة، وَهِيَ هُنَا المُصِيبَةُ التي تَسُوْ مَن تَحُلُّ بِهِ، والحَسَنَةُ ضِدُّهَا، أي: أَنَّهُم سَأَلُوا مِنَ الآيَاتِ مَا فيهِ عَذابٌ يسوء مَن يُصِيبهُ)، واتە: لێرەدا (سَيِّئَة)،

بریتییە لە حاڵەتێکی خراپ، کە بەسەر کەسێك، بەسەر کۆمەڵێك دێ‌و، پێچەوانەی (حَسَنة)یە، واتە: حاڵەتێکی باش، کەواتە: لێرەدا ئەوانە داوای بەڵایەکیان کردوە کە بۆ ئەوان خراپ بێ، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: پەلەت لێ دەکەن بە هاتنی بەڵایەك کە بۆ ئەوان خراپە، ئەگەرنا مەرج نییە لە خودی خۆیدا، خراپ بێ، چونکە سزادانی خوا بۆ کەسانێك کە شایستەی سزان دادگەرییەو شتێکی باشە، بەڵام بۆ ئەوان خراپە .

<u>برگەی دووەم</u> : - ﴿ وَقَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِمُ ٱلْمَثُلَٰتُ ﴾، هەرچەندە لە پێش واندا بەڵا تەمبێ کەرەکان تێپەڕیوون، ﴿ ٱلْمَثُلَٰتُ ﴾، کۆی (مَثُلَة)یە، وەك (سَمُرَة)[1] (سَمُرات)، کە بە پێنج جۆر خوێنراوەتەوە :

١- (المَثُلات)

٢- (المَثْلات)

٣- (مُثُلات)

٤- (مَثْلات)

٥- (مُثْلات)

مەبەست لە (مَثُلَة)ش کە کۆیەکەی (المَثُلات)ەو، بەو جۆرە خوێندنەوانەی دیکەش، دەخوێنرێتەوە بەڵایەك‌و گرفتارییەکە کە تووشی کۆمەڵێك ببێ‌و، ببێتە مایەی تەمبێ کردن‌و، پەند وەرگرتنی کەسانی دیکە، یانی: (المَصَائِبُ المُنَكِّلات)، ئەو بەڵایانەی کە تەمبێ کارن، کە هەر کەسێك تەماشای ئەو کۆمەڵە بکات، کە ئەو بەڵایەیان تووش بووە، پەندیان لێوەردەگرێ‌و، دەبێتە هۆی سڵەماندنەوەو پرینگاندنەوەی، لەوە کە کارو ڕەفتارێك بکات، کە ئەوانەی ئەو بەڵایەیان تووش بووە، کردوویانە

<u>برگەی سێیەم</u> : - ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِّلنَّاسِ عَلَىٰ ظُلْمِهِمْ ﴾، بێگومان پەروەردگارت خاوەن لێبوردنە بۆ خەڵك وێڕای ستەمەکەشیان

---

١) سَمُرة، شجرة: درەخت

وشەی ﴿ عَلَىٰ ﴾، لێرەدا ماناکەی دەبێتە مانای (مَعَ)، یانی: (مَعَ ظُلْمِهِم)، لەگەڵ ستەمیشیاندا، لەسەر ستەمیشیانەوە، پەروەردگارت خاوەن بەزەییە، خاوەن لێبوردنە لەگەڵ خەڵکدا، واتە: هەرچەندە خراپەو تاوانو ستەمیش دەکەن، بەلام لەبەرئەوەی کە پەروەردگارت خاوەن لێبوردنە، زوو سزایان نادات و دەرفەتیان دەدا بگەڕێنەوە .

بۆچی خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ لَذُو مَغْفِرَةٍ ﴾ خاوەن لێبوردنە، نەیفەرموو، (وَإِنَّ رَبَّكَ لَغَفَّارٌ لِلنَّاسِ عَلَى ظُلْمِهِمْ)؟ وەلام: ئەمە خۆ پاراستنە لەوەی کە پێیان وا نەبێ ئەو لێبوردنەی خوا، لێبوردنێکی هەمیشەییە، ئەگەر فەرمووبای: (لَغَفَّارٌ)، یان (لَغَفُورٌ لِلنَّاسِ عَلَى ظُلْمِهِمْ)، مانای وایە ئەو سیفەتی لێبوردنە لە خوادا، بەرانبەر بە خەڵك کە ستەمو خراپەش دەکەن، سیفەتێکی بەردەوامو هەمیشەییە، بەلام لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ لَذُو مَغْفِرَةٍ ﴾، خاوەن لێبوردنە، ئنجا خاوەنی شتێك دەگونجێ بە کەسێکی ببەخشێ کە شایستەی بێو، بە کەسێکیشی نەبەخشێ، کە شایستەی نەبێ .

<u>**برگەی چوارەم :**</u> ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾، بێگومان پەروەردگاری تۆ سزاو تۆڵەی سەختو توندە. یانی: پەروەردگارت وەك چۆن خاوەن لێبوردنە بۆ خەڵکێك کە ستەمو خراپەش دەکەن، وێڕای ئەوەش بێگومان خاوەنی سزاو تۆڵەیەکی سەختیشە بۆ کەسانێك کە خۆیان وا لێ نەکەن، شایستەی ئەو لێبوردنو بەخششەو، ئەو لوتفەی خوا بن، خوا سزاو تۆڵەشی هەیەو، تەنیا خاوەنی لێبوردن نیە، بەڵکو خاوەنی سزاو تۆڵەیەکی سەختیشە، بۆ کەسانێك کە خۆیان بدەنە بەر تووڕەییو تۆڵەو سزای خوا، کەسانی وا تۆڵەو سزای خوایان بەردەکەوێ، کەواتە، عاقڵ ئەو کەسەیە چ وەك تاك، چ وەك کۆمەڵ، خۆیان وا لێ بکەن شایستەی لێبوردنی خوا بن، شایستەی لوتفو مەرحەمەتی خوا بنو، خۆیان بدەنەبەر بارانی ڕەحمەتی خواو، خۆیان نەدەنە بەر تۆڵەو غەزەبی خوا، ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ مرۆڤەکان خۆیانو، خوای پەروەردگاریش کارزانو زاناو شارەزایەو هەر کەسە، بە پێی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا دەکات .

**مەسەلەی حەوتەمو کۆتایی : داواکردنی کافرەکان کە موعجیزەیەکی تایبەتی وەک هی پێغەمبەرانی پێشوو بۆ موحەممەد ﷺ بێ، وەڵامدانەوەی خوای کاربەجێ بۆ ئەو قسەیەیان کە ئەو داواکردنەی تێدایە، نەک جێبەجێکردنی داواکارییەکەیان :**

ئەمیش لە ئایەتی حەوتو کۆتایی ئەم دەرسەماندا هاتووە : ﴿ وَيَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلَا أُنزِلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِّن رَّبِّهِ ۗ إِنَّمَا أَنتَ مُنذِرٌ ۖ وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ ﴿٧﴾ ﴾

**تویژینەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە سێ برگەدا:**

**برگەی یەکەم :** - ﴿ وَيَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلَا أُنزِلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِّن رَّبِّهِ ﴾، ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوەو بێبڕوان، دەڵێن: دەبووایە (موحەممەد) لە پەروەردگاریەوە نیشانەیەکی دابەزێنرابایە سەر، کە مەبەستیان لە نیشانە، واتە: موعجیزەو بەڵگەیەك کە بەرانبەرەکانی نیقنا بکات کە : موحەممەد ﷺ پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خوایە، ئنجا گومانی تێدا نیە، کە خوا هیچ کام لە پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام) نەناردوون، مەگەر بەڵگەو موعجیزەیەکی پێدا ناردوون، بایی ئەوە بکات کە نیسپاتی دەعوای پێغەمبەرایەتیی خۆیانی پێ بکەن، وەك چەند جارێك ئەو فەرموودەیەمان هێناوە، کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ فەرموویەتی: {مَا مِنَ الأَنبِيَاءِ نَبِيٌّ إلاَّ أُعْطِيَ مَا مِثْلُهُ آمَنَ عَلَيْهِ البَشَرُ، وَإِنَّمَا كَانَ الَّذِي أُوتِيتُ وَحيًا أَوحَاهُ اللَّهُ إِلَيَّ، فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكثَرَهُمْ تَابِعًا يَومَ القِيَامَةِ}، {رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٤٩٨١)، وَمُسْلِم برقم: (٣٨٣)، عَن أَبِي هُرَيرَةَ ﷺ}، واتە: هیچ کام لە پێغەمبەرانی خوا نەبوون کە بەڵگەیەکی پێ نەدرێ، لەسەر ئەوە خەڵك ئیمانی پێ بێنن (بزانن کە ڕاست دەکات)، ئەوەش کە بە من دراوە لەو بوارەدا، وەحییە بۆم هاتوە {واتە: ئەوەی کە پێم دراوە وەك بەڵگە لەسەر پێغەمبەرایەتییم، وەحیو پەیامو بەرنامەی خوایە}، بۆیە ئومێدم وایە کە لە ڕۆژی دواییدا لە هەموویان شوێنکەوتووم زیاتر بن

چونکە هی ئەو ماوەتەوە، بەڵام موعجیزەی پێغەمبەرانی دیکە (علیهم الصلاة والسلام) بە وەفاتی خۆیان، کۆتاییان پێهات، بۆچی؟ چونکە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەر کامێکیان بۆ قۆناغێکو هەلو مەرجێکو، بۆ گەل و میللەتێکی دیاریکراو هاتوون‌و، موعجیزەکەیان هەر ئەوەندە پێویست بووە، بەڵام پێغەمبەری کۆتایی بۆ هەموو بەشەر هاتوە بە پانایی زەمین‌و بە درێژایی زەمان، بۆیە موعجیزەکەشی هەموو ڕۆژگارو سەر زەمینی گرتۆتەوە .

لێرەدا کە دەڵێن : ﴿ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾، وشەی: ﴿ لَوۡلَآ ﴾، بەگشتی بە دوو شێوە دێ :

<u>یەکەم</u> : پێی دەگوترێ: (حرف امتناعٍ لوجود)، وەك: (لَولا زَيدُ لَهَلكَ عَمرو) یانی: لەبەرئەوەی زەید هەیە، بۆیە عەمر نافەوتێ، ئەگەر زەید نەبووایە، عەمر دەفەوتا

<u>دووەم</u> : جۆری دووەمی بەکارهێنانی ﴿ لَوۡلَآ ﴾ بۆ هاندانە (حرفُ تحضيضٍ)، واتە: هاندان‌و دنەدان، کە لێرەدا ﴿ لَوۡلَآ ﴾ بە مانای دووەمی بەکارهاتوە، دەڵێن: دەبووایە (موحەممەد) نیشانەیەکی لە پەروەردگاریەوە بۆ دابەزیبایە، ویستوویانە بڵێن: ئێمە زۆر سوورین‌و زۆر ئارەزوومەندین کە ئیمان بێنین، بەڵام بەڵگەمان لەسەر بەڵگە کەوتوە، کە بێگومان لەوەدا ڕاستیان نەکردوە، چونکە ئەو بەڵگەیەی کە بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دراوە، زۆر ڕوون‌و ئاشکرایە کە قورئانە، وەك پێشتر باسمان کردوە، بەتایبەت لە سوورەتی (یونس)دا، تەفصیلێکی باشمان لەوبارەوە داوە، کە خوا ﷻ لە قورئاندا بە سێ قۆناغ تەحەددای هەموو بەشەری کردوە بە کافرو نامسوڵمانانەوە بەڵکو جندو نینسەوە کە فەرموون: وێنەی قورئان بێنن، ئەگەر نەتانتوانی، وێنەی دە (١٠) سوورەت بێنن، ئەگەرنا وێنەی سوورەتێك بێنن، ئنجا ئەگەر نەتانهێنا‌و، ناشتوانن بیهێنن، ئەوە بزانن کە ئەو قورئانەی ئێوە ناتوانن: وێنەی سوورەتێکی سێ ئایەتیی لێ بێنن، ئەوە فەرمایشتی خوایەو زاتێك ئەو فەرمایشتەی فەرمووە، کە زانیاریی بەزەیی‌و حیکمەت‌و دەسەڵاتیی. لە سەرووی توانای بەشەرەوەیە، بۆیە هیچ کەس ناتوانێ وەك

ئەو فەرمایشتە بێنێ، ئەوەك، زۆرەكەی كە هەموویەتی یان دە (١٠) سوورەتیەتیو، ئەوەك كەمێكیشی كە سوورەتێكی سێ (٣) ئایەتییە

لە سوورەتی (الإسراء)، ئایەتی (٥٩)دا، خوا ﷻ وەڵامی ئەو جۆرە بەهانە گرتنانەی كافرەكان دەداتەوە - كە لە زۆر شوێنان لە قورئان دا هاتوە، هەر لە سوورەتی (الرعد)دا، لە شوێنێكی دیكەش دا دیسان ئەمە باس دەكاتەوە: ﴿ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦٓ ﴾ - ئنجا لە سوورەتی (الإسراء)دا، خوای پەروەردگار وەڵامی ئەو بەهانە گرتنانە دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿ وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرْسِلَ بِٱلْءَايَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلْأَوَّلُونَ ۚ وَءَاتَيْنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبْصِرَةً فَظَلَمُواْ بِهَا ۚ وَمَا نُرْسِلُ بِٱلْءَايَٰتِ إِلَّا تَخْوِيفًا ۝٥٩ ﴾، {واتە: هیچ شتێك ڕێگرمان نەبوو كە نیشانەكان بنێرین، واتە: ئەو نیشانانەی كە كافرەكان داوایان دەكەن، ئەو موعجیزانەی كە كافرەكان دەیانكەنە بیانوو، هیچ شتێك ڕێی لێ نەگرتین}، ئەوە نەبێ كە ئەو جۆرە موعجیزەو نیشانانەشمان ناردن، بەڵام پێشووەكان پێیان بێ بڕوا بوون، (ئنجا وێنەیەك دێنێتەوە) حوشترمان بە گەلی سەموود دا، كە نیشانەیەكی زۆر بەرچاو ڕوونكەرەوە بوو، (موعجیزەیەك بوو بەرچاوی خەڵكی زۆر ڕۆشن دەكردەوە، كە ئەوە لەلایەن خواوەیە

وەك لە تەفسیری سوورەتی (الأعراف)، لە بەسەرهاتی صالح (علیه السلام)و گەلەكەی سەموود دا، باسمان كرد، كە دوای ئەوەی گەلەكەی داوای لێ دەكەن: بەڵگەو موعجیزەیەكیان بۆ بێنێ، لەو كاتەدا لەلای پارچە چیایەك وەستاون، ئەویش دەفەرموێ: چیتان دەوێ؟ دەڵێن: با لەم چیایە، لەم شاخە حوشترێك بێتە دەرو بەچكەكەشی لەگەڵی دا بێ! ئەویش داوا لە خوای پەروەردگار دەكاو چیایەكە دەلەرزێو وەك ئەوەی ژانی بێتێ، یەكسەر حوشترێك كە بەچكەكەشی بە دواویەتی، لێی دێتە دەر، حوشترێكی زۆر گەورە كە بۆتە نیعمەتێكی زۆر گەورەش بۆ گەلی سەموود، بە هەموو ئەو گەلی سەموودە، كە عەشیرەتێك بوون، دەیدۆشن شیرەكەی بەشی هەمووان دەكات، بەڵام ئەوانیش كانییو سەرچاوەیەكیان دەبێ، یەك ڕۆژیش پێویستیی بە خواردنەوەی ئاوی كانییو سەرچاوەكەیان دەبێ، بە تەنیا !

کەچـــی: ﴿ فَظَلَمُواْ بِهَا ﴾، ســـتەمیان لێکـــرد، نەیفـــەرمووە: (فَظَلَمُوهـــا)، هەرچـەندە ستەمیان لە حوشترەکە کرد، بەڵام بۆیە فەرموویەتی: ﴿ فَظَلَمُواْ بِهَا ﴾، چونکە: گـەلی سەموود بەهـۆی حوشـترەکـەوە سـتەمیان کـرد :

١- ستەمیان لـە خۆیـان کـردو ،

٢- لـە پێغـەمبـەرەکـەیان کـردو ،

٣- لـەو پەیـامو بەرنـامەی کە خـوا ﷻ بۆی نـارد بـوون، ئنجـا لەبـەر ئـەوەش کـە خـوا ﷻ بڕیـــاری داوە، ئۆممەتـی موحەممـــەد ﷺ نەفـەوتێنـــێ، ئێستا ئەگـەر یەکێك لـەو موعجیـزانەی کـە داوای دەکـەن بۆیان بێنێ‌و، بڕواشی پـێ نـەهێنن، بە پێی یاسای خوا، دەبێ بفەوتێن، وەك چۆن گەلی (ثمود)و گەلی (عـاد)و گـەلی (نوح)و گەلی (فیـرعەون)، ئەوانـە هـەموویان فـەوتان، دەبێ ئـەوانیش بفـەوتێن، بەڵام بڕیاری خوا وایە، لەبەر ئەوەی موحەممەد ﷺ کۆتـا پێغەمبـەری خوایـەو، ئۆممەتەکەشی کۆتـا ئۆممەتـە، نابـێ بفەوتێ، بۆیە ئەو موعجیزەیـەی بـۆ نـاردوە کـە خــوای پەروەردگـار حیکمـەتی خواسـتوویەتی، نـەك ئـەوەی ئـەوان دەیکەنـە بیـانوو، ئنجا وەڵامی ئـەو داواکارییەیان دەداتـەوە .

<u>**برگـــەی دووەم :**</u> - ﴿ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرٌ ﴾، بێگومـان تـۆ تەنیـا ترسـێنەری، واتـە: تـۆ پەیداکەری موعجیزەو نیشـانان نی، تاکـو بە کەیفی خـۆت بۆیان بێنـی، بەڵکو تۆ تەنیا وریـاکەرەوەو ترســێنەرێکی‌و، ئـەرکی خـــۆت جێبـەجێ دەکــەی، بـەڵام ئەوەی کە جۆری موعجیزەو نیشـانەکان دیاریی دەکـاتو دەیـانـنێرێ، خوایە ﷻ.

<u>**برگـەی سـێیـەم :**</u> - ﴿ وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ ﴾، بۆ هەر کۆمەڵێك ڕێنمایی کارێك هەیـە، کە هی ئەو خـەڵکەی تۆ بریتیـە لەم قورئـانە، ئەگـەر ئەوانـە لـە هیدایـەتو لـە ڕێی ڕاسـت دۆزینەوە بگـەڕێن، قورئـان بەســـە بـۆ ئـەوەی کە ڕێیان پێشان بـدا، ئەگەر هـەر لە بیانووگرتنیش بن، گەلانی پێشوو کـاتێك بیانوویـان گرتـوەو خـوا بۆی جێبـەجـێ کـردوون، دوایی تووشی سزا بـوون، یـانی: پێغەمبـەرانی پێشووش وەك تۆ وریاکەرەوەو ئاگـادارکـەرەوە بوون‌و، پێغەمبەرانی پێشووش بۆ هەموویان بەرنامەیەك هاتوە کـە ڕێـی ڕاسـت پێشـــانی خەڵـکەکەیان بـدات، تـۆش بەهەمـــان

شێوە ورپاکەرەوەی‌و بەرنامەیەکت بۆ هاتوە ڕێی ڕاست پیشانی خەڵکەکە بدات، کە لە هەمان کاتدا بەرنامەکەت بەڵگەو موعجیزەکەشتە، کە قورئانە، کەواتە: ئەگەر لە هیدایەت بگەڕێن‌و لێی بخەفتێن مەبەستیان بێ‌و عەودالی بن، ئەوە لەبەردەستیانە لە قورئانەو، ئەگەر لە بیانووگرتنیش بن، ئەوە بێگومان ئەگەر بیانووی هەندێکیشیان ببڕدرێ، ئەوانی دیکە بیانوویان هەردەمێنێ، بۆ وێنە :

یەکیان دەیگوت: با ئەو چیایەمان بۆ بکرێ بە زێڕ، ئنجا ئەگەر گریمان بیانووی ئەویان بڕابایە، ئەوی دیکەشیان دەیگوت: ئەدی بۆچی بیانووی ئەو بڕدراوە، بۆچی ئەو شتە بۆوی جێبەجێ کراوە منیش فلان شتەم دەوێ... هتد، ئەوە هەر نەدەبڕایەوەو درێژەی دەکێشاو دەبوو بە حیکایەتی مێشێ، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: تۆ تەنیا ورپاکەرەوەی، بەڵگەو موعجیزەکان بە دەست تۆ نین، بە دەست خوای کارزانن، بۆ هەر کۆمەڵێکیش هیدایەت دەرێك‌و ڕێ پیشاندەرێك هەیە، تۆش‌و قورئانەکەشت، ڕێی پیشاندەرو هیدایەتدەری ئەوانی، ئەگەر لە هیدایەت بگەڕێن

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دووەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

لە دەرسەمان حەوت (٧) ئایەتە، ئایەتەکانی: (٨ – ١٤)، لەم حەوت ئایەتەشدا خوای پاكو تاك، لەسەر ناساندنی خۆیو، خستنە ڕووی سیفەتە ناوازەکانیو کارە بێ وێنەکانی بەردەوام دەبێو، ئەگەر لە سێ (٣) ئایەتی پێشوودا، دەوری پازدە (١٥) سیفەتو کاری خۆیی خستنە ڕوو، وەك پێشتر باسمان کرد، لەم حەوت ئایەتەشدا خوا بیست (٢٠) سیفەتو کردەوەی دیکەی بەرزو بێ وێنەی خۆی، دەخاتە ڕوو کە ئێمە سەرەتا سەرژمێریان دەکەین :

١/ خوا دەزانێ تۆلی هەر مێینەیەك چی هەڵگرتوە !

٢/ ئەوەی تۆڵەکان (منداڵدانەکان) کەمو زیادی دەکەن، خوا دەیزانێ

٣/ هەموو شتێك لە لای خوا، بە ئەندازەیەو ئەندازەگیریی کراوە .

٤/ خوا زانای پەنهانو ئاشکرایە

٥/ خوا خاوەنی ئەوپەڕی گەورەییو مەزنییە

٦/ خوا ئەوپەڕی بەرزو باڵایە .

٧/ بۆ خوا یەکسانە قسەی پەنهانو کپ بکەن، یاخود ئاشکراو بە دەنگی بەرز .

٨/ هەروەها خەڵکی خۆ پەنهانکەری شەوو، خەڵکی بە دەرەوەو ئاشکرای ڕۆژ، بۆ خوا یەکسانن‌و، هەموویان دەزانێو دەبینێ

٩/ هیچ کەس نیە، فریشتە چاودێرەکان کردەوەکانی ئەپارێزن

١٠/ مەگەر خەڵك خۆیان بگۆڕن لە چاکەوە بۆ خراپ، یان لە خراپەوە بۆ چاك، ئەگەرنا خوا واقیعیان ناگۆڕێو، دەبێ ئەوان لە ناخەوە خۆیان بگۆڕن

١١/ هەر کاتێك خوا بەڵایەکی بۆ کۆمەڵێك نارد، بەرپەرچدرەوەی نیە .

١٢/ مرۆڤەکان جگە لە خوا، هیچ کەس سەرپەرشتیارو مشوورخۆریان نیە .

١٣/ خوا برووسکەی ترسێنەرو ئومێد بەخش، پێشانی خەڵك دەدا .

١٤/ خوا هەوری قورسی ئاو هەڵگر، دروست دەکاتو دەینێرێ .

١٥/ هەورە تریشقە خوا بە پاك دەگرێو ستایشی دەکات .

١٦/ فریشتەکان بە لێترسانو سام لێکردنەوە، خوا بە پاك دەگرنو ستایشی دەکەن

١٧/ خوا بڵێسەو برووسکەی سووتێنەر دەنێرێ .

١٨/ خوا هەر کەسێکی بوێ بەو بڵێسەو برووسکە سووتێنەرە لە بەینی دەبات .

١٩/ خوا زۆر توانادارو بە تەگبیرە .

٢٠/ خوا داوا لێکراوی هەقەو، خاوەنی بەیامی ڕاستو دروستو بێ گرێو گۆڵە .

﴿ ٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَحۡمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ ٱلۡأَرۡحَامُ وَمَا تَزۡدَادُۖ وَكُلُّ شَيۡءٍ
عِندَهُۥ بِمِقۡدَارٍ (٨) عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلۡكَبِيرُ ٱلۡمُتَعَالِ (٩) سَوَآءٞ مِّنكُم مَّنۡ
أَسَرَّ ٱلۡقَوۡلَ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ وَمَنۡ هُوَ مُسۡتَخۡفِۭ بِٱلَّيۡلِ وَسَارِبُۢ بِٱلنَّهَارِ (١٠) لَهُۥ مُعَقِّبَٰتٞ
مِّنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ يَحۡفَظُونَهُۥ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا
بِأَنفُسِهِمۡۗ وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ سُوٓءٗا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ (١١) هُوَ ٱلَّذِي
يُرِيكُمُ ٱلۡبَرۡقَ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا وَيُنشِئُ ٱلسَّحَابَ ٱلثِّقَالَ (١٢) وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعۡدُ
بِحَمۡدِهِۦ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ مِنۡ خِيفَتِهِۦ وَيُرۡسِلُ ٱلصَّوَٰعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَن يَشَآءُ وَهُمۡ
يُجَٰدِلُونَ فِي ٱللَّهِ وَهُوَ شَدِيدُ ٱلۡمِحَالِ (١٣) لَهُۥ دَعۡوَةُ ٱلۡحَقِّۖ وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا
يَسۡتَجِيبُونَ لَهُم بِشَيۡءٍ إِلَّا كَبَٰسِطِ كَفَّيۡهِ إِلَى ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُغَ فَاهُ وَمَا هُوَ بِبَٰلِغِهِۦۚ وَمَا دُعَآءُ
ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ (١٤) ﴾.

# مانـــای دەقـــاو دەقـــی ئـــایـــەتـــەکـــان

{خوا هەرچی (تۆلی) هەر مێینەیەك هەڵیدەگرێ، دەیزانێ، هەروەها هەرچی منداڵدانەکان کەمی دەکەن‌و زیادی دەکەن (دەیزانێ)و هەموو شتێك لە لای وی بە ئەندازەیە ﴿٨﴾ (خوا) زانای پەنهان‌و ئاشکرایە، گەورەی خۆ بەرزکەرەوەیە ﴿٩﴾ (بۆ زانیاریی خوا) ئەوەتان قسەی پەنهان یان ئاشکرا دەکات‌و، ئەوەتان کە بە شەو خۆی دەشارێتەوە، یان بە ڕۆژ دیار دەبێ، یەکسانن ﴿١٠﴾ (هەموو کەسێك) سۆراخ کەرانێکی فریشتەی لە پێشەوەو لە دواوە هەن، بە فەرمانی خوا دەیپارێزن، بە دڵنیایی خوا حاڵ‌و واقیعی هیچ کۆمەڵێك ناگۆڕێ، تاکو ئەوان ئەوەی لە ناخ‌و دەروونیان دایە نەیگۆڕن‌و، هەر کات خوا ویستی بەڵایەکی خراپ بۆ کۆمەڵێك بنێرێ، هیچ بەرپەرچدەرەوەی نییەو، جگە لە خوا هیچ پشتیوانێکیان نیە ﴿١١﴾ (خوا) ئەو کەسەیە برووسکەتان پێشان دەدات، ترسێنەرو ئومێد بەخشە هەورە گرانەکان پێکدێنێ ﴿١٢﴾ (خوا) هەورە تریشقە بە پاکیی دەگرێ‌و ستایشی دەکات، هەروەها فریشتەکان بە ترس‌و بیمی خواوە (بە پاکیی دەگرن‌و ستایشی دەکەن) خوا بڵێسەو برووسکان دەنێرێ، هەر کەسێکی بوێ پێیان دەپێکێ‌و، ئەوان (بێبڕوایەکان) لەبارەیەوە (لە بارەی خواوە) شەڕە قسە دەکەن، لە حاڵێکدا کە ئەو بەهێزو پلان پتەوە ﴿١٣﴾ پاڕانەوەی هەق‌و گیرا بوو، بەس هی ویەو، ئەوانەی لە جگە لەو (پەرستراوەکان) داوا دەکەن، بۆ هیچ شتێك بە دەنگیانەوە نایەن، مەگەر وەك کەسێك کە هەردووك لەپە دەستی بەرەو ئاوێ ڕاداشتوون تاکو بگاتە زاری، بەڵام ئاوەکە نایگاتێ‌و، پاڕانەوەی کافران هەر لە سەرنکوومیی‌و زایە بوون دایە ﴿١٤﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَمَا تَغِيضُ ٱلْأَرْحَامُ)، واتە : تۆڵەکان، (رَحِم) بە (تۆڵ)و بە (مندالّدان)یش لە زمانی کوردیدا لێکدراوەتەوە. ﴿وَمَا تَغِيضُ ٱلْأَرْحَامُ﴾، واتە: مندالّدانەکانیان، یان تۆڵەکان کەم ناکەن، دەگوترێ: (غَاضَ الشَّيءِ وَغَاضَهُ غَيرُهُ، نحو نَقَصَ وَنَقَصَهُ غَيرُهُ، أَي: مَا تُفسِدُه الأَرْحَام)، (غَاضَ الشَّيء)، واتە: شتەکە کەم بوو، (وَغَاضَهُ غَيرُهُ)، واتە: کەمیی کرد، وەك (نَقَصَ وَنَقَصَهُ غَيرُهُ)، (نَقَصَ)، واتە: کەم بوو، (وَنَقَصَهُ)، واتە : کەمیی کرد، واتە: وشەی (نَقَص)، (غَاضَ)، هەردووکیان هەم بە (لازم) هاتوون، هەم بە (مُتَعَدِّي)یش، هاتوون، لێرەدا ﴿وَمَا تَغِيضُ ٱلْأَرْحَامُ﴾، واتە: مندالّدانەکان، یاخود تۆڵەکان، کەم ناکەن، تێکی نادەن لەوەی کە تێیان دایە .

(بِمِقْدَارٍ) : (الـمِقْدَارُ: مَصْدَرُ مِيمِيٌّ، أَي: بِتَقْدِيرٍ وَمَعْنَاهُ: التَّحْدِيدُ وَالضَّبْط)، (مِقْدَار) کە چاوگێکی (میمیی)یە، واتە: بە ئەندازە، مانایەکەی، یانی: بە دیاریکردنو بە سنووردار کردنەوە

(ٱلْكَبِيرُ) : وشەی (كَبِير) بە مانای گەورە دێ، بەلاّم لێرەدا بە مەجاز بەکارهێنراوە بۆ پایە مەزنیی خوای بەرز

(وَٱلشَّهَٰدَةِ) : (الشَّهَادةِ)، (مَصْدَرٌ بِمَعْنَى الـمَفْعُول: أَي الأَشْيَاءُ الـمَشْهُودة)، واتە: شتە بینراوەکان، کەواتە : ﴿عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ﴾، یانی: زانای شتە پەنهانو ئاشکراو بەرهەستەکان .

(ٱلْمُتَعَالِ ) : (المُتَعَالِي: المُتَرَفِّع)، (متعال) لە ڕیشەدا (مُتَعَالِيَ)یە، بەڵام (يـ)یاکەی دەڕوا، هەروەك خوێنراویشەتەوە: (مُتَعَالِيَ) ئەگەر لەسەری نەوەستی، (المُتَعَال)، واتە: (المُتَرَفِّع)، یانی: خۆ بەرزگەرەوە .

(مُسْتَخْفٍ ) : یانی: خۆ پەنهانکەر، خۆ شێرەرەوە

(وَسَارِبٌ) : واتە: کەسێك کە ئاشکرایە، دەڕوا بە ڕێیەکدا بە ئاشکرایی، (السَّرَبُ: المَسلَكُ في خُفيَةٍ، حَفيرٌ تَحتَ الأرضِ لا مَنْفَذَ لَهُ، القَناةُ الجوفاء، يَدخُلُ مِنها الماءُ الحائِط)، وشەی (سَرَبٌ)، هەم بە ڕێیەکی پەنهان دەگوترێ، هە بە چاڵێك کە لە ژێر زەوی دا لێدەدرێ‌و هیچ کونێکی نیە، هەم بەو تیك‌و درزەی کە ئاو لێیەوە دێتە نێو باغ‌و بێستانەوە، بەڵام ﴿وَسَارِبٌۢ بِٱلنَّهَارِ﴾، واتە: کەسێك [redacted] بە ڕۆژگار بە ڕۆژێ بە ڕێدا دەڕوا، وەك لە سووڕەتی (الكهف)دا، هاتوە : ﴿فَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ سَرَبًا ﴿٦١﴾﴾، واتە: ڕێیەکەی خۆی دیتەوە بە ئاشکرا دیار بوو [redacted] ماسییەکە بە نێو دەریاکەدا ڕۆیی

(مُعَقِّبَٰتٌ ) : کۆی (مُعَقِّبَة)یە، (مُعَقِّبَة)ش، واتە: کۆمەڵە فریشتەیەك کە نۆرە لەگەڵ یەکدیدا دەکەن، (أي المَلائِكةُ يَتَعاقَبون عَلَيهِ حافِظِينَ لَهُ)، فریشتەکان بە دوای یەکدا نۆرە دەکەن، ئەو کەسە دەپارێزن، (والمُعَقِّبات جَمعُ مُعَقِّبَة، إسم فاعِل، عَقِبَهُ أي: تَبِعَهُ)، (مُعَقِّب)، ئەگەر بۆ تاك بێ، یانی : (المَلَكُ المُتَعَقِّبُ)، فریشتەیەك کە هەڵدەستێ بە شوێن کەوتن (تعقیب)و چاودێریی کردن‌و پاراستن، دەشگونجێ: (مُعَقِّبَة)، کۆی (مُعَقِّب) بێ، واتە: شوێنکەوتوو، پارێزەر، ئنجا ﴿مُعَقِّبَٰتٌ﴾یش، کۆی کۆیەکەیە

(فَلَا مَرَدَّ لَهُۥ) : هیچ بەرپەرچ دەرەوەیەکی بۆ نیە، (رَدَّهُ عَنْ وَجهِهِ يَرُدُّهُ رَدًّا وَرِدَّةً وَمَردُوداً وَ مَرَدًّا)، ﴿فَلَا مَرَدَّ لَهُۥ﴾، واتە: هیچ گێڕانەوەیەکی بۆ نیە، بەرپەرچ دانەوەیەکی بۆ نیە .

(ٱلْبَرْقَ) : (البَرْقُ: وَاحِدُ البُرُوقِ للسَّحَابِ)، (بَرْق) بە (بُرُوق)، كۆ دەكرێتەوە، برووسكەكان ئەوەی كە بە چاو دەبینرێ‌و، ئەو تیشكەی كە لە هەورەوە دەردەچێ، كە دوایی باس دەكەین لە ئەنجامی چی پەیدا دەبێ ؟.

(ٱلسَّحَابَ): (جَمْعُ سَحَابَة، وَهِيَ الغَيمُ وَجَمعُهَا سُحُب وَسَحاب وَسحائب)، (سَحابْ)، بە سین (س)، واتە: هەور (الغَيمُ)، كە بە (سَحاب)، كۆ دەكرێتەوەو بە (سُحُب)، كۆ دەكرێتەوەو، بە (سَحائِب)یش كۆ دەكرێتەوە .

(ٱلرَّعْدُ) : (الرَّعدُ: الصَّوتُ الذي يُسْمَعُ مِنَ السَّحاب)، ئەو دەنگەی كە لە هەور دەبیسترێ

(ٱلصَّوَٰعِقَ) : (جَمعُ صَاعِقَة، نَارٌ تَسقط مِنَ السَّماءِ فِي رَعدٍ شَدِيد)، (صاعقة) بریتیە لەو ئاگرەی كە لە ئەنجامی هەورە تریشقەی توندا، لە سەرەوە دێتە خوار، كە مەبەست پێی برووسكەیە

(شَدِيدُ ٱلْمِحَالِ): واتە: زۆر بەهێز، یاخود زۆر بە نەخشەو خاوەن پلانی سەخت‌و مەحكەم، (المَحْلُ: الكَيدُ والمَكرُ: مَحَلَ بِهِ فَهُوَ مَاحِلٌ وَ مَحُولٌ)، (مَحْلْ)، بە مانای پلان‌و فێڵ دێ، بە مانای نەخشە دێ، هەڵبەتە بە مانای فێڵ‌و تەڵەكە دێ، ئەگەر بۆ غەیری خوا بەكاربێ، بەڵام بۆ خوای پەروەردگار دەبێ وشەیەك بەكاربهێنرێ شایستەی خوا بێ، بۆیە ئەگەر بۆ خوا بەكاربێ دەڵێین: ﴿ شَدِيدُ ٱلْمِحَالِ ﴾، واتە: پلانی خوا زۆر مەحكەمەو سەختە، كەس زەفەری پێ نابات هەڵیوەشێنێتەوە، هەروەها : ﴿ شَدِيدُ ٱلْمِحَالِ ﴾، یانی: زۆر بەهێز

(المِحَالُ: إِذَا كَانَتِ المِيمُ فِيهِ أَصْلِيَّةً، فَهُوَ فِعَالٌ بِمَعْنَى الكَيد، وَ مَحَلَهُ: وتَمَحَّلَ: إِذَا تَحَيَّلَ)، (مِحَالُ) ئەگەر(م) میمەكەی ئەسڵیی بێ، ئەوە لەسەر كێشی (فِعَال)، بە مانای فێڵ‌و پلان دێ، دەگوترێ: (مَحَلَ)، فێڵی كرد پلانی داناو، گوتراوە: (تَمَحَّلَ)، هەر بە هەمان واتا، بەڵام ئەگەر (م) میمەكەی

زیادکراو بێ، ئەو کاتە: (فَهوَ مُفعِلٌ مِنَ الحَولِ بمَعنى القُوَّةِ)، ئەو کاتە لەسەر کێشی (مُفعِل)ە، (اسم الفاعِلَ)ە، لە (الحَول)ەوە، هاتووە بە مانای هێز دێ .

(كَبَٰسِطِ كَفَّيْهِ ): وەك کەسێکە کە دوو لەپە دەستەکانی بڵاوکردوونەوەو درێژی کردوون، (بَسَطَهُ)، هەم بە مانای پانکردنەوە دێ، کەسێك دەستی پان بکاتەوە، هەم بە مانای درێژکردنیش دێت، (مَن يَغتَرِفُ الماءَ بِكَفَّينِ مَبْسطوتينِ، او مادّاً يَدَيهِ)، یانی: کەسێك کە بیەوێ مست لە ئاوێ داگرێ، نابێ دەست بکاتەوە، کە بە تەئکید ئاوا ئاو نایەتە نێو زاری، یاخود کەسێك کە هەردووك لەپە دەست بەرەو ئاوەکە ڕادەدێرێ، بەبێ ئەوەی کە دەست بگرێتە بەر ئاوەکەوە بۆ دەمی بەرێ، بە تەئکید ئاوەکە لەخۆوە ناچێتە نێو دەمی .

## مانــای گشـــتی ئایەتەکـــان

خـوا ﷻ لەسـەر خۆناساندنی لـە میـانی خسـتنە ڕووی سیفەتەکانی‌و، لـە میـانی خسـتنە ڕووی کـارە کـردەوە ناوازەکـانی دا، بـەردەوام دەبـێ، چونکە وەك پێشتـر گوتمـان: ئـەم سـوورەتە وەك هـەموو سوورەتە مەککەییـەکان، لـە خولگـەی ئـەو سێ تەوەرەدا دەسـووڕێتـەوە :

ا) باسی خـوا ﷻو ناوو سیفەتەکانی‌و کردەوەکانی‌و نیشانەکانی

ب) باسی پێغـەمبەرایەتیی‌و، وەحیی

ج) باسیی ڕۆژیی دوایی

پانتاییـەکی زۆر لـەم سـووڕەتەدا تەرخـان کـراوە بـۆ باسـکردنی خـوا ﷻو سیفەتەکانی‌و بەدیهێنەرایەتیی خـواو، پەروەردگـارێتیی خـواو، خاوەنـدارێتیی خـواو پەرسـتراوێتیی خـواو، هەمەکـارە بوونی خـوا.

سـەرەتا خـوا دەفـەرموێ : ﴿ ٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَحۡمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ ﴾، خـوا دەزانێ ئـەوەی هـەر مێینەیەك هەڵیگرتـوە، واتـە: لـە تۆلی دا لـە منداڵدانیـدا هـەڵیگرتوە، هەڵبەتـە ئەگـەر بۆ مرۆڤ بێ دەڵـێی: منـداڵـدان، ئەگـەر بۆ ئـافرەت بێ، بەڵام ئەگـەر بـۆ ئـاژەڵ بێ دەڵـێی: لە تۆلی دا، (تۆل) ئەوەیـە کە بەچکەی تێدایـە. چ مرۆڤ بـێ کـە ئـەو کاتـە پێی دەگـوترێ: منداڵـدان، بەڵام وشـەی (تۆل)یشی، بۆ بەکـاردێ، چ ئـاژەڵ بـێ، واتـە: هەر شتێك لە تۆلی هـەر مێینەیـەك دایـە، چ مرۆڤ، چ ئاژەڵ، چ جنـد، خـوا دەیزانـێ، ﴿ وَمَا تَغِيضُ ٱلۡأَرۡحَامُ وَمَا تَزۡدَادُۖ ﴾، هەروەها ئەوەی کە تۆلـەکان کـەمی دەکـەن یـاخود زیادی دەکـەن، کـەمی دەکـەن، واتە: کە لە خـوێنی نێو منداڵـدان، کـەم دەبێ، بـە هـۆی دروسـت بـوونی کۆرپـەوە هەندێکـیش گوتوویـانـە: ﴿ وَمَا تَغِيضُ ﴾، واتـە: بەچکـە دروسـت بـووەو دوایـی لەبەرچـووەو، ﴿ وَمَا تَزۡدَادُ ﴾، مەبەسـت ئـەو بەچکەیە، ئـەو

کۆرپەیە کە وردە وردە گەورە دەبێ، ئنجا چ یەك دانە بێ، دوو سێ چوارو زیاتریش. ﴿ وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُۥ بِمِقْدَارٍ ﴾، هەموو شتێك لەلای خوا بە ئەندازەیە، ئەندازەی هەموو شتێکی گرتوە. ﴿ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلْكَبِيرُ ٱلْمُتَعَالِ ﴾، (خوا) زانای پەنهانو ئاشکرایە، گەورەیەو خۆ بەرزکەرەوەیە

ئنجا خوا عزوجل باسی پەنهان بینیی‌و پەنهان زانیی خۆی دەکات، دەفەرموێ: ﴿ سَوَآءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ ٱلْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ ﴾، بۆ خوا ﷻ یەکسانە، ئەوەتان کە قسەی کپ‌و پەنهان دەکات، ﴿ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ ﴾، هەروەها ئەو کەسەی قسە کە بە دەنگی ئاشکرا دەکات، هەردووکیان وەك یەك خوا قسەکانیان دەزانێ‌و دەبیستێ، ﴿ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍۭ بِٱلَّيْلِ وَسَارِبٌۢ بِٱلنَّهَارِ ﴾، هەروەها ئەوانەتان کە بە شەوگار خۆ پەنهان دەکەن‌و خۆ حەشار دەدەن، یاخود بە ڕۆژگار بە ڕێیەدا دەڕۆن بە ئاشکرا، واتە: ئاشکراو پەنهان لەلای خوا وەك یەکن‌و، دەنگی بەرزو نزم بۆ خوا، وەك یەکن، هەموویان دەزانێ‌و دەبیستێ‌و دەبینێ، ﴿ لَهُۥ مُعَقِّبَٰتٌ مِّنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ ﴾، واتە: هەر کام لە ئێوە ئەی مرۆڤەکان! هەروەها جنیش، چەند سۆراخکەرێکی هەن لە پێشیەوەو لە دوایەوە، ئەو فریشتانەی کە سۆراخی مرۆڤەکان دەکەن، جا چ بۆ پاراستنی کردەوەکانیان، بۆ پاراستنی خۆیان لەو بەڵاو مەترسییانەی کە خوا ﷻ نایەوێ تووشیان ببێ، ئەو فریشتانە دەیانپارێزن، کە دەفەرموێ: ﴿ يَحْفَظُونَهُۥ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ ﴾، دەیانپارێزن، ئەو فریشتە سۆراخکەرانە، ئەو فریشتە پارێزەرانە ئەو مرۆڤە دەپارێزن، لە بەڵای خوا، یاخود بەهۆی فەرمانی خواوە .

ئنجا خوا ﷻ باسی یاسایەکی گەورەو گرنگی خۆی دەکات لە ژیانی مرۆڤدا، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ ﴾، بێگومان خوا حاڵ‌و باڵ‌و واقیعی هیچ کۆمەڵێك ناگۆڕێ، تاکو ئەوان دەروون‌و ناخی خۆیان نەگۆڕن، لە چاکەوە بۆ خراپە، چ لە خراپەوە بۆ چاکە، ﴿ وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوْمٍ سُوٓءًا فَلَا مَرَدَّ

لَهُۥ ﴾، هەر کاتێك خوا بیەوێ خراپەیەك تووشی کۆمەڵێك بکات، بەرپەرچدانەوەی بۆ نیە، گێڕانەوەی بۆ نیە، هەرچی خوا بیەوێ، دەبێ ﴿ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ ﴾، ئەوان جگە لە خوا سەرپەرشتیارو مشوورخۆرو دۆستو هاوکارێکی دیکەیان نیە .

ئنجا خوای کاربەجێ هەندێك لە کردەوەکانی دیکەی خۆی باس دەکات دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا ﴾، خوا ئەو کەسیە کە برووسکەتان پێشان دەدا، هەم بۆ ترساندن، هەم بۆ ئومێدەوار کردن، واتە: ئەو برووسکەیە هەم مایەی ترسو بیمتانە، کە تیشکێکی زۆر بەهێزە هەم مایەی ئومێدەوار کردنیشتانە کە بە زۆریی وایە: هەر هەورێك چەخماخەی داو، هەورە تریشقەو برووسکەی لەگەڵدا بوو، دیارە موتوربە بووەو بارانی پێوەیە، ﴿ وَيُنشِئُ ٱلسَّحَابَ ٱلثِّقَالَ ﴾، هەروەها (خوا) هەورە قورسەکان دێنێتە دی، دروست دەکات، هەڵبەتە لە ئەنجامی ئەوەدا کە ساردو گەرمی هەورەکان لێکدەدا موتوربە دەبنو، کە هەور موتوربە بوو، ئنجا بارانی پێوەیە

﴿ وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعْدُ بِحَمْدِهِۦ ﴾، هەورە تریشقە، هەورە گرمەش خوا بە پاك دەگرێ، بە ستایش کردنیەوە، ﴿ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ﴾، هەروەها فریشتەکانیش خوا بە پاك دەگرنو، ستایشی دەکەن، ﴿ مِنْ خِيفَتِهِۦ ﴾، لە ئەنجامی لێ ترسانی دا، لە ئەنجامی ئەوەدا کە سامو هەیبەتیان بەرانبەر بە خوا هەیە، بیمیان هەیە لە سزای خوا، بۆیە ستایشی دەکەنو، بە پاکیی دەگرن، ﴿ وَيُرْسِلُ ٱلصَّوَٰعِقَ ﴾، هەروەها خوا برووسکەکان دەنێرێ .

﴿ ٱلصَّوَٰعِقَ ﴾، کۆی (صَاعِقَة)یە، (صَاعِقَة): ئاگرێکە لە ئاسمان دێتە خوار کە بریتیە لە برووسکە، ﴿ فَيُصِيبُ بِهَا مَن يَشَآءُ ﴾، خوا هەر کەسێکی بیەوێ، بەو برووسکانە دەیپێکێ، ﴿ وَهُمْ يُجَٰدِلُونَ فِي ٱللَّهِ ﴾، ئەوان لە بارەی خواوە، مشتو مڕو

شەرە قسە دەکەن. ﴿ وَهُوَ شَدِيدُ ٱلْمِحَالِ ﴾. لە حاڵێکدا کە خوا نەخشەو پلانی زۆر بەهێزە، یاخود خاوەنی هێزو توانایەکی بێ سنوورە.

لە کۆتایی دا خوا دەفەرموێ: ﴿ لَهُۥ دَعْوَةُ ٱلْحَقِّ ﴾. پاڕانەوەی هەق هەر هی ئەوە، واتە: پاڕانەوەیەك کە هەق بێو جێی خۆی بگرێو گیرابێ، تەنیا ئەو پاڕانەوەیە کە ئاڕاستەی خوا دەکرێ. ﴿ وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ ﴾. بەڵام ئەوانەی کە لە جگە لەو دەپاڕێنەوە، لە بتو صەنەمەکان، لە پەرستراوە ساختەکان، دەپاڕێنەوە. ﴿ لَا يَسْتَجِيبُونَ لَهُم بِشَىْءٍ ﴾، ئەو پەرستراوانە هیچ وەڵامێکیان نادەنەوە هیچ شتێکیان بۆ جێبەجێ ناکەن، هیچ بە دەنگیانەوە نایەن. ﴿ إِلَّا كَبَٰسِطِ كَفَّيْهِ إِلَى ٱلْمَآءِ ﴾، (ئەو کەسەی کە لە جگە لە خوا دەپاڕێتەوە)، هەر وەك کەسێك وایە کە هەردوو لەپە دەستی پان ڕاخستوون، یاخود درێژکردوون بەرەو ئاوێك ﴿ لِيَبْلُغَ فَاهُ ﴾ بۆ ئەوەی ئەو ئاوە بگاتە نێو زاری، ﴿ وَمَا هُوَ بِبَٰلِغِهِۦ ﴾. ئاوەکەش ناچێتە نێو زاری، چونکە دەستێك کە پان کرابێ، ئاوی تێدا گیر نابێ، ئاوی تێدا ناوەستێ، تاکو بەرزی بکاتەوە بۆ دەمی، یاخود کەسێك کە دەستی بەرەو ئاوەکە ڕاداشتوون، ئاوەکە هەر لە خۆوە نایەتە نێو لەپە دەستانی، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا هُوَ بِبَٰلِغِهِۦ ﴾. ناگاتە زاری، ﴿ وَمَا دُعَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ ﴾، وەك چۆن کەسێك لەپە دەستان بەرەو ئاوێ ڕادەدێرێ، ئاوەکە نایەتە نێو زاری، یاخود کەسێك کە دەست پان دەکاتەوە ئاوەکە نایەتە نێو دەستیو بە دەستیەوە بەند نابێ، بە هەمان شێوەش پاڕانەوەی بێ بڕوایانیش، هەروەك ئەو جۆرە دەست بەرەو ئاو ڕاگێشانەیە، پاڕانەوەی ئەوانیش کە ئاڕاستەی بتو صەنەمو پەرستراوە ساختەکانی دەکەن، جێ ناگرێو زایە دەبێو بێ ئاکام دەبێ .

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم :** خوا ﷻ زانایە بە هەرچی تۆڵی هەر مێینەیەک هەڵیگرتوەو هەر گۆڕانێک کە بەسەریدا دێ، یاخود لەو تۆڵە زیادی دەکات، یاخود کەمی دەکات، هەمووی دەزانێ‌و خوا زانای پەنهان‌و ئاشکرایەو گەورەو خۆ بەرزکەرەوەیە .

خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ ٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ ٱلْأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ ۖ وَكُلُّ شَىْءٍ عِندَهُۥ بِمِقْدَارٍ ﴿٨﴾ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلْكَبِيرُ ٱلْمُتَعَالِ ﴿٩﴾ ﴾



**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە شەش برگەدا:**

**برگەی یەکەم :** - ﴿ ٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ ﴾، خوا ئەوە دەزانێ کە تۆڵی هەر مێینەیەک هەڵیگرتوە خوا دەزانێ ئەو تۆڵە، ئەو بەچکە دانە، بۆ مرۆڤ ئەو منداڵدانە، چی هەڵگرتوە! زانایان دەڵێن: (الحَمْلُ لِلإنسانِ والحَيْوانِ والحَبْلُ لِلإنسانِ فَقَط)، واتە: (حَمل)، بۆ مرۆڤ و بۆ ئاژەڵ‌و زیندەوەران، بەکاردێ، بەڵام وشەی (حَبل)، واتە: منداڵدان، تەنیا بۆ مرۆڤ بەکاردێ، واتە: ئەوەی کە بەچکەدان هەڵیگرتوە، جا چ مرۆڤ بێ، چ ئاژەڵ‌و زیندەوەرانی دیکە بن .

لێرەدا خوا ﷻ لە درێژەی ئەم ئایەتانەدا، دەیەوێ خۆی زیاتر بناسێنێ کە کێیە؟ چۆنە؟ سیفەتەکانی چۆنن؟ ئنجا ئەو کەسەی عەقڵی هەبێ، ئەو خوا بەرزو مەزنەی خاوەنی ئەو سیفەتانە، خاوەنی ئەو کردەوانە، بەراورد بکات لەگەڵ ئەو پەرستراوە ساختانەدا، کە هیچ نین، هیچ شتێکی خۆشیانیان بەدەست

نیەو خاوەنی هیچ توانایەك نین، هیچ نازانن و هیچ ناتوانن، ئەگەر بەراوردیان بکات، ئەو کاتە دەگاتە دڵنیایی تەواو کە تەنیا خوا ﷻ شایستەی بەندایەتیی بۆ کران و پەرستراناه

**برگەی دووەم :** - ﴿ وَمَا تَغِيضُ ٱلۡأَرۡحَامُ وَمَا تَزۡدَادُۖ ﴾، هەروەها خوا دەزانێ ئەوەی کە بەچکەدانەکان زیادی دەکەن، یاخود کەمی دەکەن، پێشتر گوتمان: ﴿ تَغِيضُ ﴾، (أي: تَنقُصُ)، واتە: کەم دەکەن، دەگوترێ: (غَاضَ الدمُ أي: نَقَصَ)، خوێنەکە کەم بوو، یان دەگوترێ: (هذا غَيضٌ مِن فَيض)، ئەوە کەمێکە لە زۆرێك، هەڵبەتە لێرەدا دەگونجێ مەبەست ئەوە بێ: ئەوەی کە منداڵدان کەمی دەکات لە خوێن، چونکە کاتێ کە بەچکە دەکەوێتە نێو بەچکەدانەوە خوێنی حەیز بەنسبەت ئافرەتەوە نامێنێ، چونکە ئەو خوێنە، دەچێتە نێو منداڵدانەوە بۆ ئەوەی ئەو منداڵە یان ئەو بەچکەیە تێیدا پێی بگات، دەشگونجێ مەبەست لە کەم کردن، ئەوە بێ، کە ئەوەی پێشتر لەو بەچکەدانەدا لەو منداڵدانەدا، پەیدا بووە، دوایی لەبار دەچێ، بەنسبەت زیادکردنەکەشی ئەوەیە کە ئەو منداڵدانە تاکو ئێستا، یان ئەو بەچکەدانە، هیچی تێدا نەبووە، بەڵام ئەوجار بەچکەی تێدا پەیدا دەبێ، ئنجا ئەگەر مرۆڤە، یاخود بەچکەی ئاژەڵە، دەشگونجێ مەبەست لە زیادکردن، زێدەبوونی ژمارەی بەچکەکان بێ .

**برگەی سێیەم :** - ﴿ وَكُلُّ شَيۡءٍ عِندَهُۥ بِمِقۡدَارٍ ﴾، هەموو شتێك لەلای خوا بە ئەندازەیە، پێشتر گوتمان: (مِقدار)، چاوگێکی میمییە، واتە: بە ئەندازە، ئەندازەگیریی، کە مەبەست پێی دیارییکردن و سنووردارکردنی شتێکە، هەڵبەتە ئەمە بەرپەرچدانەوەی ژمارەیەکی زۆر لە فەیلەسووفەکانیشە، کە نکووڵییان کردوە لەوەی خوا ﷻ وردەکارییەکان (جزئيات) بزانێ، گوتوویانە: خوا تەنیا شتە گشتییەکان دەزانێ، بەڵام وردەکارییەکان نازانێ، پێیانوابووە خوا لەوە بەرزترە کە شتی بچووك بزانێ، گوتوویانە: خوا خاوەنی ئەوپەڕی بەرزیی و مەزنییەو، دەبێ هەر شتە گەورەو گرنگەکان بزانێ، بەڵام خوا وردە شتان نازانێ، هەڵبەتە بۆیەش خوا بە تەئکید دەفەرموێ: ﴿ وَكُلُّ شَيۡءٍ

عِندَهُۥ بِمِقۡدَارٍ ﴿٨﴾﴾. یان لە سووڕەتی (البقرة) دەفەرموێ: ﴿أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٣١﴾﴾، بەڵكو خوای پەروەردگار باسی زانینی گرانایی گەردێك دەكات، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿وَمَا يَعۡزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثۡقَالِ ذَرَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ﴿٦١﴾﴾يونس

كەواتە: هەر كەسێك نكوولّیی لەوە بكات كە: خوا شتی بچووك دەزانێ، وردە شتەكان دەزانێ، ئەوە پێی كافر دەبێ، بۆیە (أبو حامد الغزّالي)، لە كتێبی (تَهافت الفَلاسفَة)دا، فەیلەسووفەكانی (ئەو فەیلەسووفانەی ■ وا دەڵێن) بەهۆی سێ شتانەوە، بە كافر لە قەڵەم داونو لە بازنەی ئیسلام دەریكردوون :

یەكەم : كە گوتوویانە: بوون (وجود) بێ سەرەتایە، واتە: لە مێژینەیەو سەرەتایەكی نەبووەو، هەر بوو (أزلي) یە .

دووەم : كە نكوولّییان كردوە لەوەی زیندووبوونەوەی جەستەیی هەبێ، گوتوویانە: تەنیا قیامەتی ڕووحانیی هەیە

سێیەم : كە نكوولّییان كردوە لەوەی خوا ﷻ وردە شتان بزانێ، گوتوویانە: خوا تەنیا شتی گەورەو درشتو گرنگ و گەورە دەزانێ

(أبو حامد الغَزالي)، گوتوویەتی: هەر كەسێك یەكێك لەو سێ بۆچوونەی هەبن، ئەوە بۆی بە كوفر لە قەڵەم دەدرێ، هەڵبەتە مەگەر نەزان بێ، یاخود بەلای خۆیەوە تەئویلێكی كرد بێ، كە پێی وابێ لەگەڵ بێ سەرەتاییو هەر بوویی خوای پەروەردگاردا تێك ناگیرێ، وەك ئێمە لە بەرگی دووەمی مەوسووعەی : (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)داو، لە ڕوونكردنەوەی عەقیدەی (الطحاوي)دا، بە تەفصیلّ باسی ئەوەمان كردوە[1] كە هەندێك لە زانایانی

---

١) هەروەها لە مەوسووعەی : (ئیمانو ئیلحاد) ■ ، لە كتێبی : چوارەمی مەوسووعەی: {بیركردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی ■ واقیع دا} دا باسمان كردوە .

ئیسلام ڕایەکی وایان بووە، کە خوا ﷻ، چونکە هەر بوویەو نەبوون (عدم پێش بوونی خوا نەکەوتوە ئنجا سیفەتی بەدیهێنانیش لە خوادا وەك زاتەکەی، ئەویش و هەموو سیفەتەکانی دیکەشی هەر بووە (أزلي)ن، گوتوویانە: ناگونجێ خوا ﷻ سیفەتەکانی پەکخراو (مُعَطَّلْ) بووبن، ئنجا گوتوویانە: جۆری دروستکراوەکان، سەرەتایەکیان نیە، واتە: هەر لە سەرەتاوە خوا دروستکراوەکانی دروست کردوون، نەك (بالذات)، هەر کامێکیان قەدیم بێ! بە هەرحاڵ هەق و ڕاستیی ئەوەیە کە خوا ﷻ لە سووڕەتی (الحديد) ئایەتی (٣)دا فەرموویەتی: ﴿ هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ ﴾، خوا یەکەمین و دوامینە، ئیدی هیچ شتێك پێش بوونی خوا نەکەوتووە، خوا ﷻ لەو کاتەدا کە ویستوویەتی گەردوونی خوڵقاندوە، ئەو بوونەوەرەی کە ئێستاکە دەیبینین، کە زانایان تەمەنی مەزندە دەکەن بە سێزدە (١٣) ملیار و (٧٠٠) ملیۆن ساڵ، چ کە لە پێش ئەو گەردوونەی ئێمەدا خوای پەروەردگار شتی دیکەی خوڵقاند بێ، کە ئێمە نایزانین، بۆ وێنە: خوا باسی عەرش دەکات، بێگومان عەرش هەر دروستکراوی خوایە، هەروەها خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات کە عەرشەکەی لەسەر ئاو بووە: ﴿ وَكَانَ عَرۡشُهُۥ عَلَى ٱلۡمَآءِ ... ۞ ﴾هود، ئاویش هەر دروستکراوی خوایە، گرنگ ئەوەیە خوا ﷻ لە پێش دروست کراوەکانیەوەتی، بەڵام ئایا لە کەیەوە خوا دەستی کردوە بە دروستکردنی دروستکراوەکان؟ ئەوە هەر خوا دەزانێ و، ئێمە دڵنیاین لەوە کە هیچ شتێك لە دروستکراوەکانی خوا، خاوەنی سیفەتی لە مێژینەیی و ئەزەلیی بوون و بێ سەرەتایی نیە، ئەدی بێ کۆتایی؟ خوا ﷻ دەفەرموێ: ئیمانداران لە بەهەشت دا بە هەمیشەیی دەمێننەوەو، کافرەکان لە دۆزەخدا بە هەمیشەیی دەمێننەوە، کەواتە: سیفەتی هەرمـاویی (أبدي) بۆ غەیری خواش هەیە، ئەگەر سیفەتی هەر بوویی (أزلي) نەبێ، بەڵام سیفەتی هەر ماویی (أبدي)یان دەبێ! ئەوەش وەڵامەکەی ئەوەیە کە خوا ﷻ دروستکراوەکان دەهێڵێتەوە، ئەگەر ئیماندارانن، لە بەهەشتدا، ئەگەر بێبڕوایانن لە دۆزەخدا، ئەگەر خودی بەهەشت و دۆزەخن، خوا دەیانهێڵێتەوەو دروستکراوی خوان، کەواتە: هەر خوا دوامین

(آخر)ە: ﴿ هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ ﴾، خوا یەکەمینەو دوامینە، چونکە دروستکراوەکان کە دەمێننەوە، بە هێشتنەوەی خوا، دەمێننەوە[1].

**بڕگەی چوارەم :** - ﴿ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ﴾، (خوا) زانای پەنهانو ئاشکرایە، وشەی (شَهَادَة)، لێرەدا وەك پێشتریش گوتمان: چاوگە بە مانای (مَفعُول)، (الشَّهَادَة)، یانی: (المَشْهُود)، (أي الأشْيَاءُ المَشْهُودَة وَهِيَ الظَّاهِرَةُ المَحْسُوسة)، ئەو شتانەی کە دەبینرێن، یان: بەرهەستن، ئەوانەی کە نا بەرهەستن، خوا دەیانزانێ و پەنهانن، ئەوانەش کە بەرهەستنو هەست پێکراون، خوا ئەوانیش هەموویان دەزانێ

**بڕگەی پێنجەم :** - ﴿ ٱلۡكَبِيرُ ﴾، یانی: گەورە، وشەی (گەورە) لە تێگەیشتنی ئێمەدا، بۆ قەبارەی ئەو شتانەی کە بەرهەستن، بەکاردێ، بەلام لێرەدا خوا ﷻ ئەو وشەیەی بەکارهێناوە بە واتایەك کە بۆ خوا شایستەیە

دەشگونجێ بڵێین: وشەی: ﴿ ٱلۡكَبِيرُ ﴾، بە (مجاز) بەکارهێنراوە بۆ مەزنیی مەعنەویی، هەر چۆن بێ، وشەی: ﴿ ٱلۡكَبِيرُ ﴾، کاتێك کە بۆ خوا بەکاردێ، هەروەك وشەی (عَلي)، واتە: بەرز، کە بۆ خوا بەکاردێ، هەروەها وشەی (عَظيم) مەزن، کە بۆ خوا بەکاردێو، وشەی (حَليم)و وشەی (رَحيم)، هەموو ئەو وشانە کە بۆ خوا بەکاردێن، واتایەکیان هەیە کە بۆ خوا شایستەیەو، بە هیچ شێوەیەك نابێ زەینمان فێڵمان لێ بکات، واتایەك بۆ ئەو ناوو سیفەتانەی خوا بەکاربێنین، کە بۆ خۆمانی بەکاردێنین، بۆیە زانایان لەوبارەوە گوتوویانە: (وَكُلُّ مَا جَرَى بِبَالِك فَالله بِخِلَافِ ذَلِك)، هەرچی بە زەینی تۆدا دێ، خوا پێچەوانەی ئەوەیە، خوا وەك ئەوە نییە .

---

١) وەك پێشتر گوتمان لە هەر کام لە : کتێبی چوارەمی مەوسووعەی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحییو واقیعدا)، (پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی)و، مەوسووعەی: (دەروشاوەیی ئیمانو پووچەڵیی ئیلحاد...)دا، بە درێژیی لەوبارەوە دواوین.

<u>**بڕگەی شەشەم :**</u> - ﴿ ٱلْمُتَعَالِ ﴾، واتە: خۆ بەرزکەرەوە، خوا هەم بەرزەو هەم خۆ بەرزکەرەوەیە، خۆی بە بەرز دەگری، کە لێرەدا مەبەست لە بەرزیی، یان واتایەکە کە بۆ خوا شایستەیە، یاخود دەشگونجێ بگوترێ: مەبەست زاڵیی و بالا دەستییەکی تەواوە، بە شێوەیەک کە هیچ دروستکراوێک ناتوانێ بەسەر خوادا زاڵ بێ و توانای بەسەریدا بشکێ.

<u>**مەسەلەی دووەم :**</u> زانینی قسەی پەنهان و ئاشکراو، دیتنی بابای خۆ حەشاردەر بە شەوێ و، بە دەرەوە لە ڕۆژێ دا، بۆ خوا، یەکسانن و، فریشتەکان بە فەرمانی خوا مرۆڤ دەپارێزن، هەم وەک خودی خۆی دەیپارێزن، لە بەلاو لە ناڕەحەتییەکان و دەیپارێزن، هەم کردەوەکانی دەپارێزن و تۆمار دەکەن :

خوا دەفەرموێ: ﴿ سَوَآءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ ٱلْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍۭ بِٱلَّيْلِ وَسَارِبٌۢ بِٱلنَّهَارِ ﴿١٠﴾ لَهُۥ مُعَقِّبَٰتٌ مِّنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ يَحْفَظُونَهُۥ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ ﴿١١﴾ ﴾

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە چوار بڕگەدا:**

<u>**بڕگەی یەکەم :**</u> - ﴿ سَوَآءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ ٱلْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ ﴾، واتە: بۆ خوا یەکسانە ئەوەی کە لە ئێوە قسەی پەنهان و کپ دەکات، بە دەنگی کپ قسە دەکات، ﴿ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ ﴾، یاخود بە دەنگی بەرزو، دەنگ هەڵدێنێ، بۆ خوا یەکسانە، خوا هەمووی دەبیستێ وەك یەك .

<u>**بڕگەی دووەم :**</u> - ﴿ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍۭ بِٱلَّيْلِ وَسَارِبٌۢ بِٱلنَّهَارِ ﴾، هەروەها یەکسانە بۆ خوا ئەوەتان کە شەوگار خۆی پەنهان دەکات، یان خۆی حەشار دەدا، شەوگار هەر بۆخۆی تاریکە، ئنجا لە شەوێشدا مرۆڤ خۆی حەشار بدات!

﴿ وَسَارِبٌۢ بِٱلنَّهَارِ ﴾، هەروەها ئەوەی کە لە ڕۆژگاردا دەڕواو بەدەرەوەیەو دیارە، بۆ خوا وەك یەکن، یەکسانن، لەوەدا کە هەموویان دەبینێ.

دەگوترێ: (إستَخْفَى أي: أَخْفَى نَفْسَهُ)، خۆی پەنهان کرد، خۆی حەشاردا، (سَارِب: إسْمُ فَاعِلٍ مِنْ سَرَبَ إذَا ذَهَبَ فِي السَّرْبِ وَهُوَ الطَّرِيقُ)، (سَارِب)، (إسمُ فَاعِل)ە لە (فِعل)ی (سَرَبَ)ەوە هاتوە، کە دەگوترێ: (سَرَبَ: إذَا ذَهَبَ فِي سَرْبٍ)، بە (سَرب)دا ڕۆیی، (سَرْب)، یانی: ڕێگا، وەك لە سوورەتی (الکهف)دا دەفەرموێ: ﴿ فَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ سَرَبًا ﴿٦١﴾ ﴾، دەشگونجێ: ﴿ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍۭ بِٱلَّيْلِ ﴾، ئەو کەسەی کە بە شەوگار خۆی پەنهان کردوە، ﴿ وَسَارِبٌۢ بِٱلنَّهَارِ ﴾، یاخود لە ڕۆژێدا دەچێتە کونێکەوەو دەچێتە حەشارگەو پەنایەکەوە، ئەو واتایەش هەڵدەگرێ، بەڵام بە بەلگەی ئەوەی لە ڕستەی پێشوودا، بەراورد لە نێوان دوو کەسدا کراوە: یەکێیان کە بە دەنگی کپ قسە دەکات، و ئەوەی دیکەشیان بە دەنگی بەرز، ئەم دووانەش وا پێدەچێ مەبەست ئەوە بێ: ئەو کەسەی کە بە شەوگار خۆی حەشار دەدا، یاخود بە ڕۆژێ بەدەرەوەیە، بۆ خوا وەك یەکن

<u>برگەی سێیەم</u>: - ﴿ لَهُۥ مُعَقِّبَٰتٌ مِّنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ ﴾، بۆ هەر کامێك لە ئێوە، لە مرۆڤەکان سۆراخکەرانێك هەن.

ئایا ئەو سۆراخکەرانە، کێن ! ئەوانە کە تەعقیب دەکەن و بەدوادادەچن و شوێن دەکەون، بە تەئکید فریشتەکانن، ﴿ لَهُۥ مُعَقِّبَٰتٌ مِّنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ ﴾، لە پێش دەستیەوەو لە دوایەوە، کە مەبەست هەر چوار دەورەیە، لە هەر چوار دەورەیەوە فریشتانێك هەن کە دەیپارێزن، خۆی دەپارێزن لە بەلاو موصیبەت و ناڕەحەتییەکان، کە خوا نەیەوێ تووشی ببن، یاخود دەیپارێزن، واتە: کردەوەکانی دەپارێزن، وشەی (المُعَقِّبَات)، (جَمْعُ مُعَقِّبَة إسمُ فَاعِلٍ مِن عَقَبَهُ أي تَبِعَهُ)، (مُعَقِّبات)، پێشتریش گوتمان: کۆی (مُعَقِّبَة)یە، (مُعَقِّبَة)ەش، (إسمُ فَاعِل)ە، فریشتەیەك کە تەعقیب دەکاو سۆراخی مرۆڤ دەکاو شوێن مرۆڤ دەکەوێ و کردەوەکانی دەپارێزێ، یاخود خۆی دەپارێزێ، دەشگونجێ: (مُعَقِّبات)،

کۆی (مُعَقِّبَة)، بێ (مُعَقِّبَة)ش، کۆی (مُعَقِّبْ) بێ، واتە: (مُعَقِّبَات)، دەبێتە کۆی کۆ، هەڵبەتە هەندێکیشیان وایان لێکداوەتەوە: (مُعَقِّبَات)، گوتوویانە یانی: (مُعتَقِبات)، ئەوانە کە نۆرە لەگەڵ یەکدا دەکەن، ئەو فریشتانە کە فریشتەکانی شەوێ دێن، ئاگایان لە مرۆڤ دەبێ، دوایی فریشتەکانی ڕۆژێ دێن، لە نوێژی بەیانی دا لە کاتی بەرەبەیاندا، یەکدی بەدل دەکەن، بەڵام زۆربەی زانایان هەر وایان لێکداوەتەوە: (مُعَقِّبَات)، یانی: ئەوانەی کە تەعقیبو سۆراغ دەکەن سۆراخی مرۆڤ دەکەن، چ بۆ پاراستنی، چ بۆ تۆمارکردنی کردەوەکانیو قسەکانیو نیەتەکانی نێو دڵیشی .

<u>بڕگەی چوارەم</u> : ﴿يَحْفَظُونَهُۥ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ﴾، دەیپارێزن لە فەرمانی خواوە، واتە: بە فەرمانی خوا کردەوەکانی دەپارێزن، یاخود بە فەرمانی خوا خۆی دەپارێزن ئەوە واتایەکی

واتایەکی دیکەی: ﴿يَحْفَظُونَهُۥ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ﴾، دەیپارێزن لە بەڵایەك کە بە فەرمانی خوا، دێ، یان لە دروست کراوانێك ■ بە فەرمانی خوا دروست بوون، یان پاراستنەکە لە بەڵایەکە کە بە فەرمانی خوایە، یان پاراستنەکە لە دروستکراوانێکە، کە بە فەرمانی خوا دروست بوون، ئنجا پاراستنەکەش دیسان دەگونجێ مەبەست پێی پاراستنی کردەوەکانیو تۆمارکردنیان بێ، دەشگونجێ مەبەست پاراستنی خودی خۆی بێ، تا ئەو کاتەی کە خوا ﷻ مۆڵەت دەدا کە ئەو بەڵایەی بەسەر بێ، ئەو فریشتانە ئەو مرۆڤە دەپارێزن، بەڵکو هەندێك لە زانایان بۆ وێنە: (محمد متولّي الشعراوي) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ: بە ئەزموون دەرکەوتوە کە کاتێك مرۆڤ لە خەو دایە، دووپشكو مارو ئەو شتانەی کە پێوە دەدەن، زەفەری پێ نابەن، منیش بابم – بە ڕەحمەت بێ[1]- بۆی گێڕامەوە - لە کاتێکدا لە خەودا بووەو لەسەر خەرمان خەوتوە – گوتی: خەبەرم بۆوە کە تەماشام کرد: شتێك دەندوك لە لاقم دەدا، سەرنجم دا مارێکە، هەر دەم بە لاقم دادەدا، بەڵام دەمی ناگرێتەوە، هەڵبەتە

١) لە ساڵی (٢٠١٢)ز. دا کۆچیی دوایی کرد

كوردەواریش لەوەوە گوتوویانە: {هەرچی خوای داوە بەلفاوە}، واتە: خوا هەرچییەك دروستیكردوە، لفاوێكیشی لەسەر كردوە، ئنجا هەندێك لە زانایان دەڵێن: لەو كاتانەدا كە مرۆڤ بێدار نیە، ئەوانەی كە پێوە دەدەن: مارە، دووپشكە، هەرچی هەیە، زەفەری پێ نابەن، لەبەرئەوەی فریشتەكان دەیپارێزن، هەتا خۆی بێدار دەبێتەوەو دەتوانێ بەرگریی لە خۆی بكات .

<u>مەسەلەی سێیەم :</u> خوای پەروەردگار باسی یاسایەكی خۆی دەكات، كە بریتییە لەوەی هەتا مرۆڤەكان ناخی خۆیان نەگۆڕن، خوا واقیعی ژیانیان ناگۆڕێ :

خوا دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ سُوٓءٗا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ ﴿١١﴾ ﴾

**شیكردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەكە لە سێ برگەدا :**

<u>برگەی یەكەم :</u> - ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ ﴾، بێگومان خوا ئەوەی كە تووشی كۆمەڵگایەك بووە، ئەو حاڵەتەی كە كۆمەڵگایەك هەیەتی، نایگۆڕێ، تاكو ئەوان ئەو حاڵەتەی كە لە دەروونو ناخیاندا هەیە، نەیگۆڕن، هەڵبەتە لێرەدا خوا بە گشتی فەرموویەتی، واتە: خوا حاڵو واقیعی هیچ كۆمەڵگایەك، ئەگەر لە خێرو خۆشی دابن، نایگۆڕێ بۆ ناخۆشیو بەڵاو گرفتاریی‌و، ئەگەر لە بەڵاو گرفتاریی دابن، نایگۆڕێ، بۆ خێرو خۆشیی‌و نیعمەت، تاكو ئەوان دەست پێشخەریی نەكەن‌و خۆیان نەگۆڕن .

# کورتە باسێک لەبارەی چۆنیەتی گۆڕانکارییەوە لە ژیانی مرۆڤ دا

بەڕێزان !

لە ڕاستییدا واقیعی هەر کەسێكو حاڵەتی هەر کەسێك، چ وەك تاك، وەك کۆمەڵگاش، ڕەنگدانەوەی :

أ- بیرو بۆ چوونەکانی و، ب- خولیاو ئاوەتەکانی و، ج- کردارو ڕەفتارەکانیەتی

ئنجا لێرەدا خوا ﷻ باسی یاسایەکی یاسایەکی زۆر گەورەو گرنگی خۆی دەکات لە ژیانی بەشەردا، کە مرۆڤ نابێ چاوەڕێ بێ حاڵەکەی خۆوە بگۆڕێ، لە چاکەوە بۆ خراپ، یان لە خراپەوە بۆ چاكو، دەبێ خۆی هیممەت بکات، وەك پەندی پێشینان دەڵێ: لە تۆ حەڕەکەتو لە خوا بەرەکەت .

کە دەفەرموێ: ﴿ لَا يُغَيِّرُ ﴾، (التغییرُ: التبدیلُ بالمُغَایر) گۆڕین بە شتێکی جیاواز

کە دەفەرموێ: ﴿ مَا بِقَوْمٍ ﴾، (مَا الموصولَة)یە، یانی: (الذي بقَومٍ)، ئەو حاڵەتەی کە تووشی کۆمەڵگایەك بووە، ئەو حاڵەی کۆمەڵگایەك هەیانە، ئنجا وەك گوتم: چ حاڵێکی باش بێ، چ حاڵێکی خراپ بێ، کە مەبەست پێی واقیعی ژیانو گوزەرانیانە، لە ڕووی سیاسیی‌و ئابووریی‌و کۆمەڵایەتیی‌و ئەخلاقیی‌و لە هەموو ڕووەکانەوە، خوا نایگۆڕێ، تاکو ئەوان خۆیان نەگۆڕن، خۆیان چییە؟ ﴿ مَا بِأَنفُسِهِمْ ﴾، یانی: (الذي بأنفُسِهم)، دیسان (ما) لێرەدا، (مَوصولَة)یە، ئەوەی کە لە نەفسیاندا هەیە، کە بە گشتی سێ شتە :

١/ یان بیرو ڕاو بۆچوونەکانن (الأفكار)

٢/ یاخود نیەتو نیازو مەبەستو خولیاو ئاواتەکانن (الخواطِرُ والنيات)

٣/ یاخود کردەوەو ڕەفتارەکانن (السلوك)

کەواتە: دەبێ تاکەکان دەستکاریی ئەو سێ شتانە لە خۆیاندا بکەن، بیرو بۆچوونەکانیان بگۆڕنو، نیەتو نیازو مەبەستو خولیاو ئاوەتەکانیان بگۆڕنو، کردەوەو ڕەفتارەکانی خۆیان بگۆڕن، ئنجا واقیعەکەیان دەگۆڕێ، لە ڕاستییدا واقیع ڕەنگدانەوەی ناخی مرۆڤە، کاتێك تەماشای گەلانو کۆمەڵگاکانی ڕۆژئاوا دەکەی، بۆچی لە ڕووی پیشەسازییو تەکنۆلۆژیاو لە ڕووی ژیانی سیاسییو، ئابوورییو کۆمەڵایەتییو.... هتدەوە لە پێش مسوڵمانانەوەن !

لە ڕاستییدا لەبەرئەوەی لە ناخیاندا هەندێك سیفەتی باشیان داناون:

أ ) بیرو بۆچوونی باشیان داناوە، بۆ وێنە: ئەگەر حوکمڕانەکانی مسوڵمانان، ئەوانەی کە خۆیان بەسەر مسوڵماناندا فەرز کردوە، ئەو دەوڵەتۆکانە، کە مسوڵماننشینن، ئەوانەی کە بەسەریانەوە حاکمن، بیرو بۆچوونیان وایە کە دەبێ هەمەکارەبنو، خەڵك ژێر دەستو بن دەستی وان بێ، ئنجا حوکمی بنەماڵەییو میراتییە، دیکتاتۆرییە، خۆ فەرز کردنە، هەرچی هەیە .

بەڵام لە ئەورووپاو ڕۆژئاوا حوکمڕانەکان، وا بیر ناکەنەوە کە ئەو خەڵکە بۆ خزمەتی ئەوان دروست کراوە! دەڵێن: ئێمە دەبێ خزمەتی ئەو خەڵکە بکەینو، بەرپرسیارێتیی سپاردەیەکە خەڵك بە ئێمەی سپاردوەو، لە ماوەی دیارییکراوی خۆیاندا هەوڵدەدەن خزمەتی خەڵك بکەنو، دوای بەسەرچوونی ماوەکەیان، بە لە باریی لەسەر کورسییەکەیان دێنە خوارێ، بەڵام هی لای ئێمە: یان دەبێ کورسییەکەیان لە بن دەربێنی، یان دەبێ لەسەر کورسییەکەیان لایانبەری! وەك یەکێك لە نووسەرەکان نووسیبووی: لە ئەمریکا سەرۆك کۆماری پێشووو پێشووتریان هەیە، بەڵام لە وڵاتانی مسوڵماننشین، هیچ سەرۆکێکی پێشووت نیە، مەگەر بە دەگمەن، یان کودەتای بەسەردا کراوە یان بە دەردی خوا لەبەین چووە، یان لە پیرییان مردوە! ئنجا لێرەدا ئەو بیرو بۆچوونە، ئەو قەناعەتە

شتێكی هەڵەیە لە نێومان دا هەیە، كە پێچەوانەی ئیسلامەكەی خۆشمانە، چونكە لە قورئان‌و سووننەتداو لە سیرەی پێغەمبەر ﷺ و خەلیفە ڕاشیدەكاندا، هەمیشە بەرپرسیارێتیی‌و حوكمڕانیی، ئەمانەتێكە كە خەڵك دەیسپێرێ، ئنجا تەنیا لە ئەو كاتەی كە خەڵك پێت دەسپێرێ، ڕەوایەتییت هەیە .

ئنجا هەر لەوەڕا بگرە تاكو مەسەلەكانی:

١- پابەندیی بە یاساوەو، ٢- پاك‌و خاوێن ڕاگرتنی جادەو شەقام‌و، ٣- خاكیی بوون‌و، ٤- ڕاست‌و دروست مامەڵە لەگەڵ یەكدیدا كردن‌و، ٥- ڕێزی مرۆڤ گرتن‌و، ٦- مامەڵە لەگەڵ خەڵكدا كردن، وەك مرۆڤ و هاووڵاتیی‌و، ٧- هاووڵاتیی بوون كردنە سەنگی مەحەك، نەك نیتیما بۆ حیزبێكی دیاریكراو، بۆ هۆزێكی دیاریكراو، بۆ بنەماڵەیەكی دیاریكراو، وەك لە نێو ئێمەدا باوەو، هەمووشی پێچەوانەی قورئان‌و سوننەت‌و شەریعەتە، كەواتە: دەبێ ئەو قەناعەتانە بگۆڕدرێن .

ب ) پاشان دەبێ خولیاو نیازو مەبەستە خراپەكان بگۆڕدرێن، ئەگەر بمانەوێ واقیعەكەمان لە خراپەوە بۆ چاك بگۆڕێ، بۆ وێنە: كەسێك كە حوكمڕانە، خولیاو ئاواتی ئەوەی هەیە، بۆ كوڕەكەشی خەمێ بخوات، حوسنی موبارەك خۆی كرد بوو بە بەلاگێڕو قوربانی جەمالی كوڕی، قەزافی بوو بە بەلاگێڕی (سیف الإسلام)ی كوڕی، عەلی عەبدوڵڵا صالح، بوو بە فیدای ئەحمەدی كوڕی، هەر كامێكیان دەیویست جێ بۆ كوڕەكەی لە دوای خۆی، خۆش بكات، بۆیە خوای زاڵ بالادەست گەسكێكی لێدان‌و، خەڵك خۆشیانی فڕێدان بە كوڕەكانیەوە بۆیە ئەو خولیاو ئاواتە پووچانە دەبێ وازیان لێبێنین .

ج ) ئنجا كردەوەو ڕەفتارە خراپەكان، بۆ وێنە: كەسێك ئیدیعای یاسا سەروەریی دەكات، كە چی پێش هەموو كەس بۆ خۆی یاسا شكێنیی دەكات‌و پابەند نیە بە یاساوە، هەر لە یاسای هاتوچۆوە بگرە هەتا هەر یاسایەكی دیكە، زەوی كشتوكاڵ هی جوتیارانە، هی ئەوەیە كە كشتوكاڵی لێ بكرێ‌و بەرووبوومی خۆماڵییمان هەبێ‌و، پێویستییمان بە بێگانە نەبێ، كەچی ئەوان كۆشك‌و ڤێللای لەسەر دروست دەكەن‌و، داگیری دەكەن‌و سیاج‌و پەرژینی دەكەن،

کێ لە دەسەڵاتدارەکە نیزیکترە، ڤێللایەکەی‌و زەوی پەرژین کردنەکەی زیاترە!! ئاخر برادەر! یاسای چی‌و پاراستنی موڵك‌و ماڵی گشتی چی؟! بەڵێ دەبێ ئەو هەموو بیرکردنەوەو، خولیاو، ڕەفتارانە، بگۆڕرێن بە هی پەسندو باش !

کەواتە: لێرە کە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ﴾، (إِنَّ)، دیارە ئامرازی جەخت کردنەوەو داکۆکیی کردنە، یانی: بێگومان بە مسۆگەریی خوا، حاڵی واقیعی هیچ کۆمەڵگایەك ناگۆڕێ، تاکو ئەوان دەروونی خۆیان نەگۆڕن، ئەمە ئەگەر بەسەر خۆمانیدا جێبەجێ بکەین بەسەر واقیعی هەرێمی کوردستان‌و عێراق‌و وڵاتانی موسوڵماننشین دا؛ بەو شێوەیە دەبێ کە :

<u>یەکەم</u> : بیرو بۆچوونە چەوتەکان فڕێ بدەین، تەماشای قورئان‌و سوننەت (شەریعەت) بکەین‌و ئەو بیرو بۆچوون‌و فیکرە ڕاستانەی کە لە قورئان‌و سوننەت (شەریعەت)دا هەن‌و، عەقڵی سەلیم‌و فیترەتی سەلیم دەلالەتیان لەسەر دەکەن، ئەوانە لە مێشك‌و عەقڵی خۆماندا بچەسپێنین .

<u>دووەم</u> : خولیاو ئاواتە پووچەکان فڕێ بدەین‌و، نیازو مەبەستە باشەکان دابنێین

<u>سێیەم</u> : کردەوەو ڕەفتارو هەڵوێستە پووچەکان فڕێ بدەین‌و، ئەوانەی کە چاك‌و ڕاستن لە خۆمانیاندا بێنینە دی، ئنجا دەبێ چاوەڕێی ئەوە بین کە واقیعەکەمان بگۆڕێ .

بەڵێ: واقیع گۆڕان، بەرهەمی خۆ گۆڕینە[1]، بێگومان لێرەدا کە ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ﴾، مەسەلە تەنیا ئەوە نیە کە

---

١) وەك من لە هەندێك لە کتێبەکانی خۆمدا باسم کردوە بە تایبەتیی کتێبی: (ڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان)، بە تەفصیل باسی ئەوەم کردوە، چۆن دەتوانین گۆڕانکاریی بەسەر خۆماندا بێنین، چۆن دەتوانین پاکسازیی‌و چاکسازیی لە وڵاتی خۆماندا بکەین، دەتوانین ئاوا تەعبیری لێ بکەین: پاکسازیی بە پاکان دەکرێ‌و، چاکسازیی بە چاکان دەکرێ‌و، ڕاستکردنەوە بە ڕاستان دەکرێ‌و، ئیصلاح بە صالحان دەکرێ .

شایانی باسە لە کتێبی (قورئان ■ پاکسازیی ■ چاکسازیی لە هەرێمی کوردستان دا) بە درێژیی لەوبارەوە دواوین

واقیعەکە بگۆڕین، تەنیا بگۆڕدرێ نا، بەڵكو دەبێ بیگۆڕین لە چاكەوە بۆ چاكترو، لە خراپەوە بۆ چاك، بەلاّم ئەگەر لە چاكەوە بۆ خراپ بیگۆڕین، یاخود لە خراپەوە بۆ خراپتر بیگۆڕین، هەر دەستی لێ نەدەین باشترە. ئنجا بێگومان گۆڕانكارییش هەم پێویستیی بە زانیاریی‌و بەرچاو ڕوونیی دەكات، هە پێویستیی بە ئازایەتیی‌و بوێریی دەكات‌و، هەم پێویستیی بە چاكیی‌و پاكیی دەكات، ئەگەر نا بە بێ بەرچاو ڕوونیی، بۆ كوێ دەچی، خەڵك بەرەو كوێ دەگۆڕی؟ هەروەها بەبێ ئازایەتیی‌و بوێریی گۆڕانكاریی ناكرێ، وەك گوتراوە: (إِذَا كُنْتَ ذَا رَأْيٍ فَكُن ذَا عَزِيمَةٍ، فَإِنَّ فَسَادَ الرَّأْيِ أَن تَتَرَدَّدا)، ئەگەر خاوەن بۆچوونێكی ڕاستی، خاوەن عەزیمەت‌و ئیرادەیەكی پتەویش بە، چونكە تۆ ئەگەر دڵ لە دڵ بدەی‌و ڕاڕا بی، واقیعت بۆ ناگۆڕدرێ، با بیرو بۆچوونی ڕاست‌و چاكیشت هەبێ، پاشان دەبێ لە خودی خۆشتدا هەوڵ بدەی: پاك‌و چاك بی، ئەگەرنا (فَاقِدُ الشَيء لا يُعطيه)، كەسێك شتێكی نەبێ، ناتوانێ لێی ببەخشێ

<u>برگەی دووەم :</u> - ﴿ وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ سُوٓءٗا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥ ﴾، هەر كاتێك خوا خراپەی بۆ كۆمەڵێك بوێ، بەربەرچدانەوەی بۆ نیە، ڕەتكردنەوەی بۆ نیە

یەكێك لێرەدا بۆی هەیە بپرسێ: ئایا خوا دەیەوێ خراپە تووشی خەڵكی بكات! چونكە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ سُوٓءٗا ﴾، كە خوا خراپەی بۆ كۆمەڵێك ویست، ئایا خوا خراپەی بۆ خەڵك دەیەوێ ؟

دەڵێین: بە تەئكید نەخێر، بەلاّم ئەمە باسی یاسایەكی خوایە لە ژیانی بەشەردا، بە بەڵگەی ڕستەی پێشوو، كۆمەڵگایەك خۆیان بیرو بۆچوونی هەڵە، خولیاو ئاوات‌و هەست‌و ئەستی پووچ‌و بێكەڵك، ڕەوشت‌و ڕەفتاری خراپ لە خۆیاندا جێ بكەنەوە، دیارە ئەوانە سەرئەنجامەكەیان خراپ دەبێ، واتە: خوا خراپەی بۆ ئەوانە دەوێ، كە بە پێی یاسای خوا، بە ویستی خۆیان بەرەو خراپە دەچن

<u>برگەی سێیەم :</u> - ﴿ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ ﴾، جگە لە خواش سەرپەرشتیارێك، یان دۆستێك، یان نیزیكێك‌و مشوورخۆرێكی دیكەیان نیە، چونكە (وَال)، لە ئەسڵدا (وَالِيَ)یە، یانی: (الذي يَلي أمرَ أحَد)، كەسێك كە

سەرپەرشتیاریی کەسێك دەکات، مشووری دەخوات و ئاگای لێ دەبێ، ئەوان جگە لە خوا، کەسێکی دیکە نیە مشووریان لێ بخوات و، ئاگای لێیان بێ و، سەرپەرشتییان بکات، بە شێوەیەك کە بۆ ئەوان باش بێ .

**مەسەلەی چوارەم :** خوا برووسکەی ترسێنەرو ئومێد بەخش پێشانی مرۆڤان دەدا، هەروەها هەورە گرانەکان دروست دەکات، هەورە ئاو هەڵگرەکان، هەورە تریشقەو فریشتەکانیش خوا بە پاك دەگرن، ستایشی دەکەن و، خوا هەورە تریشقەی ئاگرین دەنێرێ و هەر کەسێك، بیەوێ دەیپێکێ :

خوا دەفەرموێ : ﴿هُوَ ٱلَّذِى يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا وَيُنشِئُ ٱلسَّحَابَ ٱلثِّقَالَ ﴿١٢﴾ وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعْدُ بِحَمْدِهِۦ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِۦ وَيُرْسِلُ ٱلصَّوَٰعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَن يَشَآءُ وَهُمْ يُجَٰدِلُونَ فِى ٱللَّهِ وَهُوَ شَدِيدُ ٱلْمِحَالِ ﴿١٣﴾﴾

**توێژینەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە حەوت برگەدا:**

**برگەی یەکەم :** - ﴿هُوَ ٱلَّذِى يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا﴾، ئنجا خوا ﷻ میهرەبانیی و زانیاریی و دەسەلاتی خۆی، پەروەردگاریتیی خۆی، لە چەند دیمەنێکی دیکەدا دەخاتە بەرچاوی ئێمە، دەفەرموێ: خوا ئەو کەسەیە کە برووسکەتان پێشاندەدا: هەم مایەی ترساندنتانە، هەم مایەی ئومێدەوار کردنتانە (خَوْفًا وَطَمَعًا )، یانی: (تَخويفاً وإطمَاعاً)، ترساندنەو دڵخۆش کردنیشە

(البَرْقُ: الضوء، يَلمَعُ في السَّماء على وَقعِ انفِجَارٍ كَهرَبائي في السَّحابَ)[1]، (بَرق)، بریتییە لەو تیشکەی کە لە ئاسماندا بریقە دەدا، لە ئەنجامی تەقینەوەیەکی کارەبایی لە هەوردا .

---

١) المعجم الوسيط، ص ٥١ .

کە لە ئەنجامی ئەوەشدا هەورەکان موتوربە دەبن و، ساردو گەرمیان لێك دەدات و ئەو بڵێسە ئاگرەی لێ پەیدا دەبێ

**بڕگەی دووەم :** ﴿ وَيُنشِئُ ٱلسَّحَابَ ٱلثِّقَالَ ﴾، هەروەها خوا هەورە قورسەکان پێ دەگەیەنێت و دروست دەکات، پێشتریش گوتمان: (ٱلسَّحَابَ)، کۆی (سَحَابَة)یە، یانی: هەور، (ٱلثِّقَالَ)یش، کۆی (ثَقِيلَة)یە، واتە: قورس، هەورە قورسەکان، واتە: ئەو هەورانەی کە ئاویان هەڵگرتووەو، ئەو ئاوەش لە سێ حاڵەتدا بەرجەستە دەبێ: باران، بەفر، تەرزە، (المطر، الثلج، البَرَد) .

بۆیەش دەفەرموێ: ﴿ وَيُنشِئُ ٱلسَّحَابَ ٱلثِّقَالَ ﴾، هەورە قورسەکان پێدەگەیەنێ، چونکە تیشکی خۆر لە ئاوی دەریاکان دەدا، هەڵم پەیدا دەبێ، با ئەو هەڵمە دێنێ بۆ شوێنە ساردەکان و، کۆ دەبێتەوەو دەبێتە هەورو موتوربە دەبێ و، کەڵەکە دەبێ لەسەر یەك، بۆیە خوای پەروەردگار بە: (إنشَاء)ی هێناوە، چونکە هەور وردە وردەو پلە پلە دروست دەبێ .

**بڕگەی سێیەم :** ﴿ وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعْدُ بِحَمْدِهِۦ ﴾، هەروەها هەورە تریشقە خوا بە پاك دەگرێ، بە ستایش کردنیەوە، واتە: خوا بە پاك دەگرێ لە کەم و کوڕییان و، ستایشیشی دەکات، بە هەموو سیفەتە بەرزەکانی، ئنجا ئایا هەورە تریشقە چۆن خوا بە پاك دەگرێ و، چۆن ستایشی دەکات؟ وەڵام :

یەکەم : چونکە هەورە تریشقە بە پێی فەرمانی خوا دروست دەبێ

دووەم : هەورە تریشقە، چ تیشکەکەی، چ دەنگەکەی، ئێمە بەوردیی نازانین، چیین و چۆنن و چی دەگەیەنن! وەك لە سوورەتی (الإسراء)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ﴾، هیچ شتێك نییە کە خوا بە پاك نەگرێ و، ستایشی نەکات، بەڵام ئێوە لە بە پاکگرتنەکەیان و ستایش کردنەکەیان تێ ناگەن .

**برگەی چوارەم :** ﴿ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِۦ ﴾، فریشتەکانیش خوا بە پاك دەگرن‌و ستایشی دەکەن لە ترسانی، واتە: بیم‌و ترسیان هەیە، سام‌و هەیبەتیان هەیە بەرانبەر بە خوا ﷻ، ئەمەش تانە دانێکەو لە بەر ڕاهاوێشتنێکە بۆ کافرەکان، کە فریشتەکان لەگەڵ ئەو پاکیی‌و چاکییەشیان دا، سام‌و بیم‌و هەیبەتیان بەرانبەر بە خوا هەیە، بە پاکیی دەگرن‌و ستایشی دەکەن، کەچی ئێوە بە ئەرکی بەندایەتیی هەڵئاستن، بەرانبەر بە خوا !!

**برگەی پێنجەم :** ﴿ وَيُرْسِلُ ٱلصَّوَٰعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَن يَشَآءُ ﴾، هەروەها خوا برووسکەکان دەنێرێ: (ٱلصَّوَٰعِقَ)، کۆی (صَاعِقَة)یە، (صَاعِقَة)ش: (نَارٌ تَنزِلُ مِنَ السَّمَاء)، ئاگرێکە لە ئاسمان دێتە خوار کە مەبەست پێی برووسکەیە، کە لە ئەنجامی موتوربە (تلقیح) بوونی هەوردا، پەیدا دەبێ، ئنجا خوا هەر کەسێکی بیەوێ، ئەو برووسکەیەی تووش دەکات، واتە: پێی سزا دەدات‌و دەیفەوتێنێ

(الـمُعجَمُ الوَسِيط)، ئاوا پێناسەی (ٱلصَّوَٰعِقَ)، دەکات: (الصَّاعِقَة: نَارٌ تَسْقُطُ مِنَ السَّمَاءِ، وَالعَذَابُ الـمُهْلِكُ، وَجِسم نَارِيٌّ مُشْتَعِل يَسْقُطُ مِنَ السَّمَاء فِي رَعْدٍ شَدِيدٍ، وَمَانِعَة الصَّوَاعِقِ: عَمُودٌ مِنَ الحَدِيدِ وَنَحْوِهِ، تُقَامُ فِي أَعْلَى الـمَنَازِلِ لِتَقِيهَا الصَّوَاعِقَ الكَهْرَبَائِيَة)[1]، واتە: (صَوَاعِق) کۆی (صَاعِقَة)یە، کە ئاگرێکە لە ئاسمان دێتە خوار، هەروەها بە سزایەکی فەوتێنەریش دەگوترێ‌و، (صَاعِقَة) بریتیە لە ماددەیەکی ئاگریی داگیرساو کە لە سەرەوە دێ، لە کاتێکدا کە هەورە تریشقەی توند هەیە، لەسەر بینا بەرزەکاندا، لوولە ئاسنێك دادەنێن کە پێی دەگوترێ: (مَانِعَة الصَّوَاعِقِ)، بەربەرچەرەوەی بروسکەکان، بۆ ئەوەی ئەو تیشکە کە دێ، ئەو ئاگرو تیشکە کە دێت، لە ڕێی ئاسنەکەوە بچێتەوە نێو ناخی زەوی‌و زیان نەگەیەنێ .

**برگەی شەشەم :** ﴿ وَهُمْ يُجَٰدِلُونَ فِى ٱللَّهِ ﴾، ئەوان لە بارەی خواوە مشتومڕ دەکەن، شەڕە قسە دەکەن

---

١) ص ٥١٥.

(المُجَادَلَةُ: المُخَاصَمَةُ والمُرَاجَعَةُ بالقَوْلِ)، (مجادلة) بریتیە لە دەمبەدەمەو شەڕە قسە کە مرۆڤ مەبەستی ئەوە نەبێ بگاتە هەق و هەقی بۆ دەربکەوێ، بەڵکو مەبەستی ئەوە بێ بەرانبەرەکەی بێ دەنگ و بێ قسە بکات

**برگەی حەوتەم :** ﴿وَهُوَ شَدِيدُ ٱلْمِحَالِ﴾، خوا تەگبیر و نەخشەو پلانی زۆر سەختە، کەس زەفەری پێ نابات هەڵیوەشێنێتەوە یاخود بەر بەرەکانێی بکات، چونکە وشەی (ٱلْمِحَالِ)، ئەگەر لە (مَحْل)ەوە هاتبێ، دەگونجێ بە مانای پلان و نەخشە بێ و، دەشگونجێ لە (حَوْلَ)ەوە، هاتبێ، واتە: هێزو توانا، بە تەئکیدیش خوای پەروەردگار خاوەنی ئەوپەڕی هێزو توانایەو، خاوەنی نەخشەو پلانە بەهێزو پێزەکانیشە، هەڵبەتە لێرەدا هەم : (الطَّبَري)و، هەم (الوَاحِدي)و، زانایانی دیکەش، هەندێ بەسەرهات دەگێڕنەوە، دەربارەی: (عامر بن الطفیل وأربد بن ربیعة) یاخود زۆردارێکی دیکە، کە خوا ﷻ برووسکەیەکی بۆ ناردووەو فەوتاندوویەتی، بەڵام من ئەو حیکایەتانەم نەهێنان، چونکە ڕەنگە ئەو بەسەرهاتانە دوایی بووبن و، ئەو ئایەتەیان بەسەریان دا جێبەجێ کردبێ، وەك زۆر لە هاتنە خوارەکان زانایان وایان مامەڵە لەگەڵدا کردوون، ئایەتەکە هاتۆتە خوار، دوایش بەسەرهاتێك ڕوویداوەو ئەو ئایەتەیان بەسەر ئەو ڕووداوەدا جێبەجێ کردوە

**مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی :** پاڕانەوەی هەق و ڕاست تایبەتە بە خواوەو ئەوانەی کە جگە لە خوا دەپاڕێنەوە، ڕەنج بە خەسارن، واتە: پاڕانەوەکانیان جێی خۆیان ناگرن :

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿لَهُۥ دَعْوَةُ ٱلْحَقِّ وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسْتَجِيبُونَ لَهُم بِشَىْءٍ إِلَّا كَبَٰسِطِ كَفَّيْهِ إِلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُغَ فَاهُ وَمَا هُوَ بِبَٰلِغِهِۦ وَمَا دُعَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ ﴿١٤﴾﴾.

**شیكردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەكە لە چوار برگەدا:**

**برگەی چوارەم :** ﴿ لَهُۥ دَعۡوَةُ ٱلۡحَقِّ ﴾، خوا خاوەنی پاڕانەوەی هەق و ڕاست و بەجێیە، زانایان بە سێ واتا، ئەم ڕستەیان لێك داوەتەوە :

یەكەم : مەبەست لە (حق)، شتی چەسپاوە یانی: پاڕانەوەیەك كە بچەسپێ و جێی خۆیی بگرێ و گیرا بێ، تەنیا ئەو پاڕانەوەیە كە ئاڕاستەی خوا دەكرێ، ئەوە پاڕانەوەی هەق و ڕاستەو، جێگای خۆی دەگرێ، پاڕانەوەیەك كە بەرەو لای خوا بەرز دەكرێتەوە

دووەم : یاخود ئەو بانگەوازەی كە لە هەقەوە دەرچووە، تەنیا ئەو بانگەوازەیە كە شایستەی خوایە: ﴿ لَهُۥ دَعۡوَةُ ٱلۡحَقِّ ﴾، كە لێرەدا (دَعْوَةُ)، بە مانای بانگەوازو خەڵك بانگكردن دێ، نەك پاڕانەوە لە خوا .

سێیەم : ﴿ لَهُۥ دَعۡوَةُ ٱلۡحَقِّ ﴾، یانی: تەنیا خوا شایستەی ئەوەیە كە بپەرسترێ و، دەبێ تەنیا بەندایەتیی بۆ ئەو بكرێ، یانی: لەسەر دروستكراوەكانی خوا پێویستە، كە خوا بە پاك بگرن، بە تاك بگرن و تەنیا ئەو بپەرستن

ڕواڵەتی ڕستەكە هەر سێ واتایەكان هەڵدەگرێ، بەڵام ئەوەی كە مانای یەكەمیان زیاتر زاڵ دەكات، بەسەر مانایەكانی دیكەدا، ڕستەی دواییە كە دەفەرموێ :

**برگەی چوارەم :** ﴿ وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسۡتَجِيبُونَ لَهُم بِشَيۡءٍ ﴾، ئەوانەش كە لە جگە لەو (خوا) دەپاڕێنەوە، بە هیچ شتێك وەڵامیان نادەنەوە، هیچ وەڵامێكیان نادەنەوەو، هیچ شتێكیان بۆ جێبەجێ ناكەن

چونكە هەمیشە خوا ﷻ لە نێوان دوو شتدا، كە پێچەوانەی یەكدین، بەراورد دەكات: ئەگەر پاڕانەوەیەك كە بۆ لای خوا بەرز دەكرێتەوە: هەق بێ و،

جێی خۆی بگریێو، گیرا ببێ، پێچەوانەكەی: ئەو پاڕانەوانەن كە ئاڕاستەی غەیری خوا دەكرێن، لە پەرستراوە ساختەكانی دیكە، كە بە تەئكید ئەو پاڕانەوانە زایە دەبنو، جێی خۆیان ناگرن، بۆیە وا پێ دەچێ هەر مانای یەكەمیان ڕاست بێ. واتە: تەنیا ئەو پاڕانەوەیەی كە بۆ لای خوا بەرز دەكرێتەوەو، ئەو دوعایەی ئاڕاستەی خوا دەكرێت، تەنیا ئەو جێی خۆی دەگرێو، دەچەسپێو گیرا دەبێ، وەك گوتمان بەرانبەرەكەشی: ﴿وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسۡتَجِيبُونَ لَهُم بِشَيۡءٍ﴾، بەڵام ئەوانەی كە لە جگە لەو دەپاڕێنەوە (ئەو پەرستراوانە) هیچ بە دەنگیانەوە نایەن، هیچ جۆرە وەڵامێكیان نادەنەوە

دوایی خوا ﷻ وێنەیەك دێنێتەوەو دەفەرموێ :

**برگەی سێیەم :** ﴿إِلَّا كَبَٰسِطِ كَفَّيۡهِ إِلَى ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُغَ فَاهُ وَمَا هُوَ بِبَٰلِغِهِۦ﴾، (ئەوانەی كە لە جگە لە خوا دەپاڕێنەوەو، ئەوانەی كە لێیان دەپاڕێنەوەو، هیچ وەڵامیان نادەنەوەو بە دەنگیانەوە نایەن)، وێنەیان وەك ئەوە وایە كەسێك كە هەردوو لەپە دەستی خۆی بەرەو ئاوێك پان كردوون، یاخود هەردوو دەستی درێژ كردوون بەرەو ئاوێك، بۆ ئەوەی بگاتە زاری، بەڵام بێگومان لەپە دەستی پان ڕاخراو، لەپە دەستێك كە بەو شێوەیە بێ، پەنجەكانی كرابنەوە، ئاوی تێدا ڕاناوەستێ، تا بیگەیێنێتە زاری، ئەوە واتایەكی .

یاخود تەنیا بەوە كە مرۆڤ دەست درێژ دەكات بەرەو ئاوو دەست ڕادەدێرێ بەرەو ئاو، ئاوەكە نایەتە نێو زاری، ئەو كەسانەش كە لە جگە لە خوا دەپاڕێنەوە، وەك ئەو بابایە وان، كە دەست بەرەو ئاو درێژ دەكات، كە بێگومان ئاوەكە نایەتە نێو زاری، یاخود بە دەستێكی كراوەوەو، بە لەپە دەستی كراوەوە، دەیەوێ ئاو هەڵگۆزێو هەڵهێنجێو بیخاتە نێو زاری، كە بێگومان ناگاتە نێو زاری، كەواتە: ئەوانەش هەرچەندە بپاڕێنەوە لەو پەرستراوانەی خۆیان، ئەو پاڕانەوەیان جێی خۆی ناگرێ، چونكە ئەوان شایستەی پەرستران نینو، شایستەی ئەوە نین كە هیچ داواو تەكلیفێكیان ئاڕاستە بكرێ، چونكە ئەوانە یان ماددەی بێ ژیانن، وەك ئەو خڕۆكەو ئەستێرەو بتو صەنەمو دارە بەردانە، كە دەیان

پەرستن، یان ژیانداری بێ هۆش‌و گۆشن، وەك مشك‌و مارو مانگا... هتد، یان ژیاندارێکی وەك خۆیان‌و لە ئاستی خۆیاندان‌و، زیان‌و سوودی خۆشیانیان بە دەست نیە، تاکو زیان‌و سوود بەو کەسانە بگەیەنن کە لێیان دەپاڕێنەوەو، بەندایەتییان بۆ دەکەن بە هەڵە .

**بڕگەی چوارەم :** ئنجا خوا عزّوجل لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا دُعَآءُ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ ﴾، پاڕانەوەی بێبڕوایانیش تەنیا لە زایە بوون دایە

(الضَّلالُ: التَّلَفُ والضَّيَاع أي ضَائعٌ ضيَاعاً شَدِيداً)، چونکە کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ ﴾، واتە: پاڕانەوەی بێبڕوایەکان لە زایە بوون‌و لەسەر بەفەتارەت چوون دایە، چونکە ئاراستەی شتانێکی دەکەن، کە شایستەی ئەوە نین‌و، وەڵامی ئەوانیان بۆ نادرێتەوەو، هیچیان لە توانادا نیە، وەك لە زۆر لە ئایەتەکانی قورئاندا، خوای پەروەردگار ئەو ڕاستییەی فەرمووە، بۆ نموونە: ﴿ وَلَا يَمۡلِكُونَ لِأَنفُسِهِمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗا وَلَا يَمۡلِكُونَ مَوۡتٗا وَلَا حَيَوٰةٗ وَلَا نُشُورٗا ٣ ﴾ الفرقان، واتە: تەنانەت بۆ خۆشیان زیانیان بە دەست نیەو، سوودیشیان بەدەست نیە، هەروەها مردن‌و ژیان‌و زیندووکردنەوەیان بەدەست نیە، واتە: ئەو پەرستراوانەی کە جگە لە خوا، دەپەرسترێن، هیچ کارەن لە بووندا، هیچ بە دەستن‌و، هیچ لە دەست نەهاتوون

ئنجا ئەمە لێرەدا هەمووی مەبەست ئەوەیە، کەواتە: ئێوە ئەی مرۆڤەکان! تەنیا خوا بپەرستن‌و، تەنیا ڕووی داواو پاڕانەوەکانتان بکەنە خوا ﷻ، هەر ئەو خاوەنی هەموو شتێکەو، هەر ئەو هەموو شتی بە دەستەو، هەمەکارەی دنیاو دوارۆژە

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

# دەرسی سێیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان چوار (٤) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (١٥ – ١٨)، لەو چوار ئایەتەدا خوا دیسان لەسەر ناساندنی خۆی ﷻ بەردەوامە، لە میانی باسکردنی: کڕنووش بۆ بردنی چارو ناچاری، هەموو ئەوانەی کە لە ئاسمانەکانو زەوی دا هەن، هەم خۆیان هەم سێبەرەکانیان، بە تایبەت بەیانیانو ئێواران، هەروەها خوا باسی خاوەندارێتیی خۆی دەکات، بۆ ئاسمانەکانو زەوی کە بێ وێنەیەو، بێ هاوەڵەو، ئەو ڕاستییە لە میانی پێنج پرسیارو وەڵامدا، دەخاتە ڕوو.

پاشان باسی دوو وێنەی ئاویو ئاگریی کراوە، بۆ بەراورد کردنی نێوان هەقو ناهەق، واتە: هەم وێنەیەکی ئاویی هێنراوەتەوە، هەم وێنەیەکی ئاگریی

لە کۆتایی دا خوا باسی سەرەنجامی وەڵامدەرەوانی خوای پەروەردگار دەکات، کە ئەوانەی وەڵامی خوای ﷻ، پەروەردگاریان دەدەنەوە، بە دەم بانگەوازی پەروەردگاریانەوە دەچن، سەرەنجامیان سەرفرازیو بەختەوەرییەو، ئەوانەش کە وەڵامی بانگەوازی پەروەردگاریان نادەنەوەو بە دەم بانگەوازی خواوە ناچن، سەرەنجامیان شوومەو، دووچاری لێپرسینەوەی خراپ و سەرەنجامی دەرد ناك دەبن .

﴿ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَظِلَٰلُهُم بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْأٓصَالِ ۩ ﴿١٥﴾
قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ قُلِ ٱللَّهُ ۚ قُلْ أَفَٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ لَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ
نَفْعًا وَلَا ضَرًّا ۚ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْتَوِى ٱلظُّلُمَٰتُ وَٱلنُّورُ ۗ أَمْ
جَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ خَلَقُوا۟ كَخَلْقِهِۦ فَتَشَٰبَهَ ٱلْخَلْقُ عَلَيْهِمْ ۚ قُلِ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ وَهُوَ ٱلْوَٰحِدُ
ٱلْقَهَّٰرُ ﴿١٦﴾ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌۢ بِقَدَرِهَا فَٱحْتَمَلَ ٱلسَّيْلُ زَبَدًا رَّابِيًا ۚ
وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِى ٱلنَّارِ ٱبْتِغَآءَ حِلْيَةٍ أَوْ مَتَٰعٍ زَبَدٌ مِّثْلُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْحَقَّ وَٱلْبَٰطِلَ ۚ
فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَآءً ۖ وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمْكُثُ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ
﴿١٧﴾ لِلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُۥ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِى
ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ سُوٓءُ ٱلْحِسَابِ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ
وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٨﴾ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەموو ئەوانەی کە لە ئاسمانو زەوی دا هەن، چارو ناچار کڕنووش بۆ خوا دەبەن، هەروەها سێبەرەکانیشیان (کڕنووشی بۆ دەبەن) لە بەیانیانو ئێواراندا (١٥) بڵێ: کێ پەروەردگاری ئاسمانەکانو زەوییە؟ بڵێ: خوا، بڵێ: ئایا جگە لەو دۆستانێکتان گرتوون، کە هیچ سوودو زیانێکی خۆشیانیان بە دەست نیە؟ بڵێ: ئایا کوێرو بینەر یەکسانن؟ یان ئایا تاریکییەکانو ڕووناکیی وەك یەکن؟ یان ئایا هاوبەشانێکیان بۆ خوا داناون، کە دروستکراوی وەك هی خوایان دروستکردوون، سەرەنجام دروستکراوەکانیان لێ تێکەڵ بوون (داخۆ کامیان هی خوایەو کامیان هی پەرستراوەکانە ؟!) بڵێ: خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکەو، هەر ئەو تاکی مل پێ کەچکەرە (١٦) (خوا) لە سەرێوە ئاوی ناردۆتە خوار، چەند دۆڵو شیوێك هەر کامێکیان بە ئەندازەی خۆی ئاوی تێ ڕژاوەو، بۆتە لێزماو و، سەرەنجام لێزماوەکە کەفو خشپو خاڵێکی بەرز بووەوەی هەڵگرت، هەروەها لەو (کانزایـ)ەی ئاگری دەدەنە بەر (و قاڵی دەکەنەوە) بە مەبەستی دروستکردنی خشڵ، یان کەلوپەلیش، خڵتەو کەفی وەك وی هەیە، (وەك هی ئاوەکە کە لە سەرەوە دێتە خوار) بەو شێوەیە خوا وێنەی هەقو ناهەق دێنێتەوە: هەرچی کەفو خڵتەیە، دوور دەخرێتەوەو لادەچێ، بەڵام ئەوەی سوودی بۆ خەڵك هەیە، لە زەمیندا دەمێنێتەوە، بەو جۆرە خوا وێنان دێنێتەوە (١٧) باشترین پاداشت هەیە بۆ ئەوانەی وەڵامی پەروەردگاریان داوەتەوە، بەڵام ئەوانەی وەڵامیان نەداوەتەوەو بە دەنگیەوە نەهاتوون، ئەگەر هەرچی لە زەمیندایەو، وێنەی خۆیشی لەگەڵ بێ، هەیان بێ، دەیکەنە قەرەبووو بەلاگێڕیان (لە ڕۆژی دواییدا) ئەوانە لێپرسینەوەی (بۆ ئەوان) خراپیان هەیەو، جێی حەوانەوەیان دۆزەخەو، ئەوێش خراپترین (جێی پشوودانو) جێی تێدا ڕاکشانە (١٨)}

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(طَوْعًا وَكَرْهًا): (الطَّوْعُ: الإنقيادُ ويضادُّهُ الكَرْهُ)، (طَوْع)، بریتیە لە ملکەچبوونێکی ئارەزوومەندانە، پێچەوانەکەشی، دژەکەشی بریتیە لە (کُرْه)، (کَره)، بریتیە لە پێناخۆش بوونی شتێك، دەڵێ: (الكَرْهُ والكُرْهُ واحِدٌ، وَقِيلَ: الكَرْهُ: المَشَقَّةُ الّتِي تَنالُ الإِنْسَانَ مِنْ خَارِجٍ، وَالكُرْهُ: مَا يَنَالُهُ من ذَاتِهِ، وَهُوَ يعَافُهُ)

(کَرْه) و (کُرْه)، هەندێکیان گوتوویانە: یەك واتایان هەیە، واتە: پێناخۆش بوون، بەڵام هەندێکیان گوتوویانە: (کَرْه)، بریتیە لە ناڕەحەتییەك کە تووشی ئینسان دێ، لە دەرەوەی خۆیەوە، بەڵام (کُرْه)، بریتیە لەوە کە ئینسان لە خودی خۆیدا، شتێکی پێناخۆش بێ

(بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْآصَالِ): (الغُدُوّ)، دوو واتای هەن:

١/ یان کۆی (غُدوَة)یەو، کۆی (غَداة)، کە بە بەرەبەیان دەگوترێ .

٢/ یاخود (غُدُوّ)، یانی: دەستپێك و سەرەتای شتێك، واتە: بەرەبەیان، نەك بڵێین: (غُدُوّ) کۆی (غدوَة) یان (غَداة) بێ، بەڵکو چاوگ (مصدر)ە .

(الآصَال): کۆی (أَصِيل)ە، یانی: ئێوارە، کەواتە: (آصال) یانی: ئێوارەکان، بۆیە دەگونجێ: ﴿ بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْآصَالِ ﴾، (غُدُوّ)، کۆی (غدوَة)، یان (غَداة) بێ، واتە: بەرەبەیانەکان، بۆیە لەگەڵ ئێوارەکاندا بەراورد کراوە، لە قورئاندا وشەی (غُدُوّ)، لەگەڵ (الآصَال)، بەراورد دەکرێ، بەڵام وشەی (غَداة)، ﴿ بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ ﴾، (غُدُوّ)، واتە: بەرەبەیان، (العَشِيّ)، واتە: ئێوارە بەرەبەیان، واتە: لەوکاتەوە کە خۆر هەڵدێ، تاکو لای نیوەڕۆ، (عشي)یش، لە دوای نیوەڕۆ تاکو خۆر ئاوابوون .

( فَسَالَتْ ): (سَالَت الشيءُ يَسِيلُ وَأَسَلْتُهُ)، واتە: ڕژا، دەڕژێ، ڕژاندم، (وَأَسَلْنَا لَهُ العَيْنَ القِطْرِ)، واتە: سەرچاوەی (قِطر) مسمان، بۆ هەڵقوڵاند بوو.

( أَوْدِيَةٌ ): (جَمعُ وَادي، وهُوَ المَوضِعُ الذي يَسِيلُ فِيهِ المَاءُ)، (وادي)، شیوو دۆڵ، ئەو شوێنەی کە ئاوی پێدا دەڕوات

( ٱلسَّيْلُ ): (أَصْلُهُ مَصْدَرٌ وَجُعِلَ اسْمَاً لِلمَاءِ الَّذِي يَأتِيكَ، وَلَم يُصِبْكَ مَطَرُهُ)، (سَيل) لە ئەسڵدا چاوگە، دوایی کراوە بە ناو، بۆ ئەو ئاوەی کە دەتگاتێ، بەبێ ئەوەی کە بارانەکەیت پێ کەوتبێ، تۆ لە شوێنێکی و لە شوێنێکی دیکە باران باریوەو، لێزمەو لافاوەکەی دەگاتە لای تۆ .

( زَبَدًا رَّابِيًا ): (الزَّبَدُ: الرَّغْوَةُ)، واتە: کەف، شتێك کە لەسەر ڕووی ئاو قەرار دەگرێ، ئنجا کەفو کوڵە، پووش و پەلاشە، هەرچی هەیە

( رَّابِيًا ): واتە: بەرزبووەوە، دەگوترێ: (رَبَى، يَرْبُو أَي: نَمَا وَزَادَ)، گەشەی کردو زیاد بوو، یاخود بەرزبۆوە، (رَبية) بۆیە پێی دەگوترێ: لەبەر ئەوەی بەرزترە لە ئاستی زەوی

( حِلْيَةٍ ): (الحِلْيَةُ والحَلْيُ: الزِّيْنَةُ، وَالحَلْيُ مَا يُتَزَيَّنُ بِهِ)، هەر یەك واتایە: (حِلية) لەگەڵ (حَلي) بریتین لەوەی کە خۆی پێ دەڕازێنرێتەوە، بەڵام (حُلِيٌّ) خشڵە

( مَتَٰعٍ ): (كُلُّ مَا يُنتَفَعُ بِهِ وَيُرْغَبُ فِي اقتنائِهِ)، (مَتَع)، هەر شتێکە کە بەهرەی لێوەربگیرێ و، خەڵك ئارەزوو بکات، ئەو شتەی هەبێ

( جُفَآءً ): (الجُفَاءُ: ما يَقْذِفُهُ القِدْرُ والسَّيْلُ مِنَ الزَّبَدِ والغُثَاءِ، وَجَفَّ الشَيءُ جُفَاءً وجَفواً: نَبَا وَبَعُدَ)، (جُفَاء) ئەو کەفەیە کاتێك کە مەنجەڵ دەکوڵێت هەندێك کەفو کوڵی لێ دێتە دەرێ، هەروەها لافاو کە هەڵدەستێ، ئەوەی لەسەر ڕووی

ئاوەکــە قـەرار دەگـرێ، کــە کـەفـو کـوڵو پـووش‌و پەڵاشـە، (جَـفَّ الشَـيءُ جُفَـاءً وجَـفواً: نَبَـا وَبَعُـدَ)، دوورکـەوتەوەو بەو لاوە چـوو.

(فَيَمۡكُثُ): واتـە: دەمێنێتــەوە، دەڵـێ: (مَكَثَ بالـمَكان مُكْثَاً وَمَكْثَاً وَحُكُوثَاً: تَوَقَّفَ وَانْتَظَـرَ) واتـە: لە شوێنەکەی مایــەوە، ئنجـا (مُكثَاً وَمَكْثَاً وَمُكُوثَاً) هــەموویان دەبن بە چاوگ، واتـە: ڕاوەسـتاو چاوەڕێی کـرد.

(ٱلۡأَمۡثَالَ): (جَمْعُ الـمَثَلِ وَالـمَثَـلُ جُملَـةٌ مِـنَ القَـولِ مُقتَطَعَـة مِـن كَلامٍ أو مُرسَلَةٌ بذاته، تُنْقَلُ مِمَّن وَرَدَ فِيـهِ إلـى مُشَابِهِهِ مـن دونِ تغـيير)[1]، بـە کـوردیی دەڵێین: پەنـد، بریتیـە لە ڕسـتەیەکی واتـا بەخـش، کە لـە بەسـەرهاتێك وەردەگـیرێ، بـەڵام بۆ مەبەسـتێکی دیکە بەکـاردێ: بەبێ گۆڕانکاریی.

وەك دەگوتــرێ: (ڕاوچـی خـراپ لـە نـاوی لێڵـدا ڕاو دەکـات)، یـان (دیـزە بـە دەرخۆنـەی لێکـرد)، ئـەو قسانە کـە لـە بەسـەرهاتێك وەرگیـراون‌و، پەنـد (مثـل ڕستەیەکی کورتــەو مانـایەکی زۆر دەبەخشـێ.

(لَٱفۡتَدَوۡاْ بِهِۦٓ): واتـە: دەیانــکردە فیدیـەی خۆیـان، دەیانــکردە قـەرەبووی خۆیـان، (إفتَدَى: قَدَّمَ الفِدیَةَ عَن نَفسِهِ)، (إفتَدَى)، واتـە: قـەرەبووی لـە جیـاتی خۆیـدا، کردیـە بەلاگێـڕی

(ٱلۡمِهَادُ): یان بە مانـای (فِراش)ە، جێگــایەك کـە ڕاخـراوە بـۆ ئــەوەی مرۆڤ تێیـدا پشــوو بـدا، یـاخود (مِهـاد وَ أَمْهِـدة وَ مُهُود)، هـەر سێکیان کـۆی (مَهْـد)ن، واتــە: بێشـکەو لانکە کـە منـداڵ تێیـدا ئیسـراحەت دەکـات .

---

١) الـمعجم الوسيط، ص٨٥٤.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ لە ئایەتی یەکەمدا لەم چوار ئایەتە، هەر لەسەر ناساندنی خۆی و، پێناسەکردنی خۆی و، زیاتر ڕوون کردنەوەی سیفەتەکانی و کارو کردەوەکانی، کە ئاوێنەی تێدا دەرەوشانەوەی بە دیهێنەرایەتیی و، خاوەنداریێتیی و، پەروەردگاریێتیی و، تەنیا پەرستراوێتیی و، ئاوێنەی تێدا ناسین و، تێدا دەرکەوتنی خوای پەروەردگارن، ئەگەر نا ئێمە جگە لەوەی شوێنەوارەکانی خوا ببینین، کە لە شوێنەوارەکانی خوادا، ناوو سیفەتەکانی خوامان بۆ دەردەکەون، ڕێیەکی دیکەمان نیە بۆ گەیشتن بە ناسینی خوا ﷻ لەم ژیانی دنیایەدا[1]

خوا لەسەر ناساندنی خۆی بەردەوام دەبێ و دەفەرموێ: ﴿ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَظِلَالُهُم بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ ﴾، هەر کەسێك کە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، چارو ناچار بە پێخۆش بوون و بە پێناخۆش بوون (بە ویستن و نەویستن)، خۆیان و سێبەرەکانیان، بەیانیان و ئێواران کڕنووش بۆ خوا دەبەن .

هەڵبەتە ئێمە دوایی لە مەسەلە گرنگەکانیشدا باس دەکەین، کە دەفەرموێ: ﴿ طَوْعًا وَكَرْهًا ﴾، زانایان چەند واتایەکیان بۆ لێکداونەوە، کە هەمان مەبەست لە سوورەتی (آل عمران)یش دا، هەر هاتوە: ﴿ أَفَغَيْرَ دِينِ اللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾ ﴾، هەروەها لە سوورەتی (فصلت)یش دا، هاتوە: ﴿ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ ﴿١١﴾ ﴾، مانا گشتییەکەی ئەوە دوو وشەیە ئەوەیە کە: لە هەموو حاڵاندا پێویستە بۆ خوا ملکەچ بن، لە هەموو حاڵاندا بەو شێوەیە بکەن، بە پێخۆش بوون و پێناخۆش بوونەوە.

---

١) جگە لە ڕێی زگماك (فطرة)و وەحیی و پەیامی خوا عزّ و جل

بەڵام واتای دیکەشی هەیە، کە دوایی باسی دەکەین، گرنگ ئەوەیە لێرەدا خوا ﷻ ئەوەمان بۆ دەخاتە ڕوو، کە هەرچی خاوەن هۆش و هەستە، چونکە ﴿ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴾، (مَن) بۆ خاوەن عەقڵ و هۆش و ئیرادەیە، کە جندەکان و مرۆڤەکان و فریشتەکان دەگرێتەوە، هەروەها هەر دروستکراوانێکی دیکەی خوای پەروەردگار دەگرێتەوە، کە بۆ ئێمە باس نەکراون و، ئێمە نایانزانین، بەڵام خوا بۆخۆی دەزانێ چی دیکەی دروستکردوە لەم بوونەدا، گرنگ ئەوەیە هەرچی خاوەن هۆش و هەست و ویست هەیە، هەر کەس کە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، کڕنووش بۆ خوا دەبات، لە هەموو حاڵاندا و بە هەموو شێوەیەك، هەروەها سێبەرەکانیشیان بەیانیان و ئێواران، دیارە کە باسی سێبەرەکانیان دەکات، کە کڕنووش بۆ خوا دەبەن: بەیانیان و ئێواران، لەبەرئەوەیە کە بەیانیان خۆر لە خۆرهەڵاتەوە هەڵدێ، سێبەرەکەیان بەرەو لای چەپ دەکشێ، دوایی ئێوارانیش کە خۆر دەکەوێتە لای چەپ، ئنجا سێبەرەکەیان بە لای ڕاستدا دەکشێ[1].

دوایی دەفەرموێ: ﴿ قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴾، بڵێ: کێ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە؟ خوای بەرزو مەزن بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: لەو خەڵکە بپرسە یاخود لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بە تایبەت و لە خەڵکی بە گشتی، بپرسە، یاخود دەگونجێ تەنیا دوێنراو لێرەدا پێغەمبەری خاتەم ﷺ نەبێ، بەڵکو لە پشت ئەوەوە هەر کەسێکی دیکەشە کە قورئان دەخوێنێ، بپرسە بڵێ: کێ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە؟ ﴿ قُلِ اللَّهُ ﴾، چاوەڕێی وەڵامی ئەوان مەکەو، بۆخۆت بڵێ: خوا ﷻ خاوەنی ئاسمانەکان و زەوییە، چونکە جگە لەو وەڵامە، وەڵامێکی دیکە، کە عەقڵ و لۆژیك و زگماك قبووڵی بکەن، نییە .

﴿ قُلْ أَفَاتَّخَذْتُم مِّن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ ﴾، بڵێ: ئایا جگە لەو (خوا) دۆستانێکتان، مشوورخۆرانێکتان، سەرپەرشتیارانێکتان بۆ خۆتان پەیدا کردوون و کردووتانن بە دۆست و نیزیك و پشتیوان، ﴿ لَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ نَفْعًا وَلَا ضَرًّا ﴾، کە تەنانەت بۆ خودی

١) ئەوە بۆ کەسێك کە لە وڵاتی عێراق و دەوروبەری، بەرەو کەعبە ڕابوەستێ

خۆشیان، هیچ سوودو زیانێکیان بەدەست نیە، ﴿ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الْأَعْمَى وَالْبَصِيرُ ﴾، بڵێ: ئایا کوێرو بینەر یەکسانن؟ ﴿ أَمْ هَلْ تَسْتَوِي الظُّلُمَاتُ وَالنُّورُ ﴾، یان ئایا تاریکییەکانو ڕووناکیی، وەك یەکن؟ هەڵبەتە مەبەست لە کوێر (أعمى)، کەسێکە خوا ناناسێو خوا ناپەرستێو، هاوبەش بۆ خوا دادەنێ، یان بێبڕوایە بەرانبەر بە خوا، مەبەست لە بینەر (بصیر)یش، کەسێکە کە خواناسەو عەقڵو دڵی ڕۆشنە، بەهۆی خوا بە یەکگرتن (توحید)ەوە. ﴿ أَمْ هَلْ تَسْتَوِي الظُّلُمَاتُ وَالنُّورُ ﴾، بڵێ: یان ئایا تاریکییەکان لەگەڵ ڕووناکیی دا، وەك یەکن، تاریکییەکان: هەموو بیرۆکەکانی کوفرو نیفاقو هاوبەش بۆ خوا دانانن، کە زۆرو جۆراو جۆرن، ڕووناکیی (نور)یش، مەبەست: خوا ناسیی‌و خوا بەیەکگرتنە، کە تەنیا یەکە، هەمیشە ئەو شتەی کە ڕاستە، یەکە، بەڵام ئەوەی کە ناڕاستە، زۆرو جۆراو جۆرە، بۆ نموونە :

دوو کۆ دوو ئەنجامە ڕاستەکەی چوارە (٢ + ٢ = ٤)، بەڵام هەر ژمارەیەکی دیکە بگری، کە زۆرو جۆراو جۆرن، هەڵەن

﴿ أَمْ جَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ خَلَقُوا كَخَلْقِهِ ﴾، یان ئایا هاوبەشانێکیان بۆ خوا گێڕاون، کە دروستکراوی وەك هی خوایان دروستکردوون؟ ﴿ فَتَشَابَهَ الْخَلْقُ عَلَيْهِمْ ﴾، سەرئەنجام دروستکراوەکانیان لێ تێکەڵ بوون: کە ئایا کامیان خوا دروستیکردوەو، کامیان هاوبەشەکانو بتو صەنەمەکان پەرستراوەکانی دیکە دروستیان کردوون؟ ئایا وایە؟ هەڵبەتە لێرەدا ئەوە پرسیارێکی بە توانجو تەوسەوەیە، ﴿ قُلِ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ ﴾، بڵێ: هەر خوا بەدیهێنەرو پەیداکەری هەموو شتێکە، ﴿ وَهُوَ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ ﴾، ئەو (خوا) تاکی مل پێ کەچکەرە .

ئنجا خوا ﷻ دوو وێنان دێنێتەوە، بۆ بەراوردی نێوان هەقو ناهەق: بەراوردی نێوان خوا بە یەکگرتنو، هاوبەش بۆ خوا پەیداکردن، بەراوردی نێوان بڕوا بە خوا هێنانو، بێبڕوایی بەرانبەر بە خوا، دەفەرموێ: ﴿ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً ﴾، (خوا) لە سەرێوە ئاوی ناردۆتە خوار، وەك دواتریش باسی دەکەین: (السَّمَاءِ )، واتە: لای سەرەوە،

هەڵبەتە لە زمانی عەرەبییدا: (ٱلسَّمَآءِ ) بە مانای: ئاسمان‌و، جەووو، سەربان‌و، هەوریش هاتوە، بەلام لە ئەصڵی زماندا، بە مانای لای سەروو (فوق)ە، ئنجا لای سەری، چ لێت نیزیك بێ، وەك سەقفی خانوو، یاخود تۆزێك بەرزتر بێ، وەك هەور، یاخود بەرزتر بێ، وەك جەووی ئاسمان، یاخود زۆر بەرزتر بێ، وەك حەوت ئاسمانەكان، هەمووی پێی دەگوترێ: (ٱلسَّمَآءِ )، یانی: سەرەوە، خوا لە سەرەوە ئاوی ناردۆتە خوار، بۆیەش وشەی (مَآءً ) هاتوە تاكو هەر كام لە: باران‌و تەرزەو بەفر، بگرێتەوە. ﴿ فَسَالَتۡ أَوۡدِيَةُۢ بِقَدَرِهَا ﴾، چەند دۆڵ‌و شیوێك هەڵڕژان، ئاویان پێدا هات، هەر كامێكیان بە ئەندازەی خۆی. ﴿ فَٱحۡتَمَلَ ٱلسَّيۡلُ زَبَدٗا رَّابِيٗا ﴾، ئنجا ئەو ئاوە كە بوو بە لێزماوو لافاو، كەف‌و كوڵ‌و خشپ‌و خاڵێكی بەرزبووەوەی لەسەر پشتی خۆی هەڵگرت

ئەوە وێنەیەك، ئنجا دێتە سەر وێنەی دووەم، بەر لەوەی ئەنجامگیرییان لێ بكات، دەفەرموێ: ﴿ وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيۡهِ فِي ٱلنَّارِ ٱبۡتِغَآءَ حِلۡيَةٍ أَوۡ مَتَٰعٖ زَبَدٞ مِّثۡلُهُۥ ﴾، هەروەها لەوەی ئاگری دەدەنە بەری‌و لەسەر ئاگر قاڵی دەكەنەوە، بەهۆی ئاگرەوە دەیتوێننەوە، كە بریتییە لە كانزایەكان، ﴿ ٱبۡتِغَآءَ حِلۡيَةٍ أَوۡ مَتَٰعٖ ﴾، بە ئامانجی وەدەستهێنانی خشڵێك، یاخود دروستكردنی كەلوپەلێك، ﴿ زَبَدٞ مِّثۡلُهُۥ ﴾، ئەویش هیسان خڵتەو كەف‌و شتێكی زیادەی هەیە، كە ڕەگەڵی كەوتوە بەلام بە كەڵك نایەت، ﴿ كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡحَقَّ وَٱلۡبَٰطِلَ ﴾، ئا بەو شێوەیە خوا وێنە بۆ هەق‌و باطیل دەهێنێتەوە، هەق، واتە: شتی چەسپاو، باطیل، واتە: شتی نەچەسپاو بێ نێوەڕۆك، كە مەبەست لە هەق لێرەدا، خوا ناسیی‌و خوا بەیەكگرتنەو، مەبەست لە باطیلیش، بێبڕوایی‌و هاوبەش بۆ خوا دانانە، دوایی دەفەرموێ: ﴿ فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ فَيَذۡهَبُ جُفَآءٗۖ وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمۡكُثُ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، ئەمە ئەنجامگیرییەكەیە، دەفەرموێ: ئەوەی كە كەف‌و خڵتەیە، دەڕواو دووردەكەوێتەوە، خڵتەو خاڵی كانزایەكان‌و، پووش‌و پەلاش‌و كەف‌و كوڵی سەر لێزماوەكان، دەڕوا، با ڕای

دەماڵێو فڕێ دەدرێو دوور دەخرێتەوە، چونکە سوودی نیە، ﴿ وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، بەلام ئەوەی کە سوود بە خەڵک دەگەیەنێ، لە زەویدا دەمێنێتەوە، هەم ئاوەکە کە بە زەویدا دەچێتە خوار، سوودی بۆ خەڵک هەیە، دوایی بە شێوەی کانیو سەرچاوەو بیرو کاریز دێتەوە دەر، هەم ئەو کانزایە کە سوودی هەیە بۆ خەڵک، زێڕە، زیوە، مسە، ئاسنە، هەرچی هەیە، کە بەکاردەهێنرێ بۆ دروستکردنی خشڵو کەلو پەلێك کە خەڵك پێویستیی پێیەتی، ئەوەش دەمێنێتەوە، بەلام خڵتەکەی فڕێ دەدرێ. ﴿ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ ﴾، ئا بەو شێوەیە خوا وێنەکان دێنێتەوە، چونکە وێنە هێنانەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە تۆ ئەو واتاو مەبەستە، کە شتێکی مەعنەوییە لە قاڵبێکی بەرهەستو بینراودا، بۆت بەرجەستە بکرێو، بۆت وێنا بکرێ، ئەو کاتە: عەقڵو چاوو گوێو هەستو خەیاڵو ئەندێشە، هەموویان هاوکاریی یەکدی دەکەن بۆ لێ تێگەیشتنی .

ئنجا خوا ﷻ باسی سەرەنجامی ئەوانە دەکات، کە بە دەم پەروەردگاریانەوە دێنو وەلامی دەدەنەوەو، ئەوانەش کە بە دەنگیەوە نایەنو وەلامی نادەنەوە، سەرەنجامیان دەخاتە ڕوو دەفەرموێ: ﴿ لِلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴾، ئەوانەی کە بە دەم بانگەوازی پەروەردگاریانەوە هاتوون، پاداشتی هەرە باشیان هەیە، ﴿ ٱلْحُسْنَىٰ ﴾، یانی: پاداشتی هەرە باش، کە بێگومان مەبەست لە پاداشتی هەرە باش، بەهەشتەو، ڕەزامەندیی خوایەو، ئەوەیە کە لە بەهەشت دایە، ئەوە ئەگەر مەبەست پێی دواڕۆژ بێ، هەڵبەتە دەشگونجێ مەبەست پێی دنیاش بێ، واتە: لە دنیاشدا سەرەنجامی هەرە چاکیان هەیە، کە بریتیە لە سەربەرزیی،و، پارێزران لە گوناهباریی،و عەیبداریی،و، سەربەرزیی لای خواو خەڵك، کە ئەوەش بێگومان سەرەنجامی هەرە چاکە .

﴿ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُۥ ﴾، بەلام ئەوانەی کە وەلامییان نەداوەتەوە، وەلامی کێ؟ وەلامی پەروەردگاریانو بە دەنگیەوە نەهاتوون: ﴿ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦٓ ﴾، ئەگەر هەرچی لە زەویدا هەیە، هەیانبووایەو،

وێنەی خۆیشی، واتە: هێندەی دیکەشی لەگەڵ دا بووایە، دەیانکردە فەرەبووی خۆیان، دەیانکردە بەلاگێری خۆیان و، دەیانبەخشی تاکو لە سزای خوا دەرباز بن، کە ئەوەش دیسان دەگونجێ مەبەست پێی دنیا بێ، واتە: لە دنیادا، لەسەرە مەرگدا، ئامادەن هەموو ئەوەی کە لە زەویدا هەیەو، هێندەی دیکەشی لەگەڵدا بێ، بیکەنە بەلاگێری خۆیان، تاکو دەربازیان بێ، دەشگونجێ مەبەست پێی دوارۆژ بێ، لە ڕۆژی دواییدا : خۆزگە دەخوازن هەرچی هەمیان بێ، بیکەنە بەلاگێری خۆیان، هەڵبەتە زیاتر مەبەست پێی سەرەنجامی دوارۆژە، چونکە دنیا بەلای خوای کارزانەوە، شتێکی هێندە گرنگ نیە، کە هێندە بە گرنگیی باسی سەرەنجامەکەی بکات

لە کۆتایی دا خوا دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ سُوٓءُ ٱلْحِسَابِ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴾، ئا ئەوانە، (ئەوانەی کە بە دەم بانگی پەروەردگاریانەوە نەچوون، ئەگەر هەرچی لە زەمیندا هەیەو، هێندەی دیکەشی لەگەڵدا بێ، دەیکەنە بەلاگێڕەوەی خۆیان لە ڕۆژی دواییدا)، لێپرسینەوەی خراپیان بۆ هەیە، لێپرسینەوەی خراپ: دیارە لێپرسینەوەی خواو لێپێچانەوەی خوا بۆ بەندەکانی چاکە، لە خودی خۆیدا، چونکە دەبێتە هۆی چەسپاندنی دادگەریی و، چاکەکاران پاداشت وەردەگرن و، خراپەکاران سزا دەدرێن، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿ سُوٓءُ ٱلْحِسَابِ ﴾، واتە: بۆ ئەوانەی کە خراپەیان کردوە، لێپرسینەوەکە بە نسبەت وانەوە خراپە، چونکە لە ئەنجامی ئەو لێپرسینەوەیەدا، تووشی سزا دێن، واتە: بە نسبەت خۆیانەوە خراپە، ئەگەرنا لە ئەسڵدا لێپرسینەوەی خوای پەروەردگار بۆ بەندەکانی بە چاک و خراپیانەوە، چاکە، چونکە مایەی چەسپینی دادگەریی خوای کاربەجێیە، ﴿ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ﴾، جێگاو ماوایان دۆزەخە، (مأوى): ئەو شوێنەیە کە مرۆڤ ئیسراحەتی تێدا دەکات، پشووی تێدا دەدات، پەنای پێ دەبا، کافران جێگاو ماوایان، شوێنی پەنا پێ بردنیان، شوێنی پشوودانیان دۆزەخە، ﴿ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴾، دۆزەخیش خراپترین شوێنێکە کە خەڵک تێیدا پشوو بدات، ئەوەش لێرەدا خوای دادگەر بە تەوس و بە توانجەوە وا دەفەرموێ، ئەگەرنا لە ڕاستیدا لە نێو ئاگری دۆزەخدا، پشوودان و ئیسراحەت و حەسانەوە نیە

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم :** کڕنووش بۆ خوا بردنی سەرجەم ئەوانەی لە ئاسمانەکانو زەمینـدان، خۆیانو سێبەرەکانیان، بەیانیانو ئێواران، چارو ناچار، بە پێخۆش بوونو پێناخۆش بوونەوە :

خوا ﷻ ئەم ڕاستییە گەورەو مەزنە، لەم ئایەتە موبارەکەدا دەخاتە ڕوو: ﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَظِلَالُهُم بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ ﴿١٥﴾﴾

**توێژینەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە سێ بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم :** - ﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾، هەر کەس کە لە ئاسمانەکانو زەوی دایە، کڕنووش بۆ خوا دەبات

وشەی (مَن) لە زمانی عەرەبییدا بۆ خاوەنی هەستو عەقڵو ئیرادە بەکاردێ، هەم بۆ تاك، هەم بۆ دووان، هەم بۆ کۆمەڵیش بەکاردێ، کەواتە: ﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾، دەگونجێ ئاوا مانا بکرێ: هەموو ئەو کەسانەی کە لە ئاسمانەکانو زەویدا هەن، کڕنووش بۆ خوا دەبەن، یاخود هەر کەس کە لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە، کڕنووش بۆ خوا دەبات

ئنجا کڕنووش کە ئێمە لە زمانی کوردییدا بە (سجدة) دەڵێین، دەڵێ: (السجُودُ: هوَ الهَوِيُّ إلى الأرضِ بقصدِ الخُضوعِ)، واتە: کڕنووش، بریتیە لە نزمبوونەوە بۆ زەوی، بە مەبەستی ملکەچیی نواندن، سەر خستنە سەر زەوی .

هەڵبەتە کڕنووش (سجُود) حاڵەتێکی تایبەتی هەیە وەك زاراوەی شەرعیی‌و بریتیە لەوە: کە حەوت ئەندامت : نێوچاوانت‌و، هەردوو لەپە دەستت‌و، هەردوو ئەژنۆت‌و، هەر دوو سینگی پێت، لە زەوی بچەقێنی‌و بیانخەیە سەر زەوی، ئەوە مانای کڕنووش بردنی شەرعییە، کە وەك زاراوەی شەرعیی، کە لە نوێژدا هەیە، یاخود کڕنووش بردنی قورئان خوێندن (سجدة التلاوة)، یان کڕنووش بردنی سوپاسگوزاریی (سجدة الشكر)، بەڵام وەك هەر مانایەکی زاراوەیی‌و عورفیی، ئەگەرنا مەرج نیە هەموو کڕنووش بردنێك، بەو شێوەیە بێ، وەك لە تەفسیری سووڕەتی (یوسف)یش دا، بە تەفصیلیْ باسمان کرد، لە تەفسیری ئایەتی ژمارە (١٠٠)دا، کە دەفەرمویْ: ﴿ وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى ٱلْعَرْشِ وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدًا ﴾، لەویْ بە تەفصیلْ باسمان کردو، لێرەدا دووبارەی ناکەینەوە، کە (سَجدَة) تەنیا ئەوە نیە ئینسان نێوچەوانی بخاتە سەر زەوی‌و، تەنیا ئەوە نیە کە ئینسان بچەمێتەوە بەڵکو بە سڵاو لێکردن‌و، بە مل بۆ کەچکردن‌و، ڕێزلێگرتن‌و، بچووکیی پێشاندان لە بەرانبەر شتێك‌و کەسێکدا، بە ڕەهایی، بەو مانایەش دیْ .

<u>بڕگەی دووەم :</u> - ﴿ طَوْعًا وَكَرْهًا ﴾، ئەمە سێ واتای هەن :

١) دەگونجیْ ماناکەی ئاوا بیْ، (طَوْعًا)، یانی: (تَقَرُّبًا وَ زُلْفى)، بۆ خۆ نیزیك خستنەوە لە خوا، وەك بەندایەتیی کردن بۆ خواو لە ڕووی خۆشەویستییەوە (كَرْهًا)، یانی: لە کاتی لێقەومان‌و سەغڵەتیی‌و تەنگانەداو بە ناچاریی

٢) واتایەکی دیکەی : بە پێخۆش بوون‌و پێناخۆش بوونەوە

٣) واتایەکی دیکەی: (طَوْعًا)، واتە: ئەوە کە ئینسان لە ژێر ئیختیارو کۆنتڕۆڵی دایە، ئنجا ئەوەی ئینسان لە ژێر ئیختیارو کۆنتڕۆڵی دایە، ئەوەیە کە سەر بۆ خوا بخاتە سەر زەوی‌و ملکەچ بیْ بۆ خوا، بەڵام (كَرْهًا) واتە: ئەوەی کە لە ژێر کۆنتڕۆڵ‌و ویستی مرۆڤدا نیە، بۆ وێنە: ئەوە کە ئینسان دەبیْ بە چاو ببینیْ‌و، بە گویْ ببیستیْ‌و، دەبیْ بخەویْ‌و بخواو بخواتەوەو... هتد، هەموو ئەو هەڵسوکەوتانەی کە مرۆڤ دەیانکات، ئینسان بە دەست خۆی نین، هەر دەبیْ بە چاو ببینیْ‌و، هەر دەبیْ بە گویْ ببیستیْ‌و، هەر دەبیْ بە زار قسە بکات‌و،

ئینسان بۆ ئەوەی بمێنێ، هەر دەبێ بخواو بخواتەوە دەبێ بخەوێ، ئنجا ئەگەر بیەوێ وەچەی بەردەوام بێ، دەبێ هاوسەرگیریی بکات، ئەوانە هەموویان بریتین لە پابەندیی بەو یاسایانەی خواوە کە لە ژیانی مرۆڤدا داینـاون، بێئەوەی مرۆڤ لە بەرانبەریان دا ئازاد بێ، مرۆڤ ناتوانێ کە لەم سەر زەوییەی خوا بچێتە دەرێ، مرۆڤ ناتوانێ کە بیەوێ بژییێو بمێنێ، خواردنو خواردنەوەی نەبێو ... هتد، هەموو ئەو شتانەی کە لە ژێر کۆنترۆڵی ویستو خواستی مرۆڤدا نین، وشەی (كَرْهاً) دەیانگرێتەوە .

<u>برگەی سێیەم</u> : - ﴿ وَظِلَٰلُهُم بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْآصَالِ ﴾، هەروەها سێبەرەکانیشیان کڕنووش بۆ خوا دەبەن، بەیانیانو ئێواران، (ظِلال) کۆی (ظِلٌ)ە، کاتێك ڕووناکییەك لە جیسمێك دەدا، لە شتێك دەدا، وێنەکەی کە دەردەچێتەوە لەودیو، ئەوە پێی دەگوترێ: سێبەر، کاتێ خۆر لە ڕۆژهەڵاتەوە دێو لە لای ڕاستەوە لە شتەکان دەدات، لای چەپیان دەبێتە سێبەر، کاتێك خۆر بەرەو ئاوا بوون دەچێ، لەولاوە لە لای چەپەوە لە شتەکان دەدات، لای ڕاستیان دەبێتە سێبەر[١]، بۆیە لە ئایەتی (٤٨)ی سووڕەتی (النحل)دا، دەفەرموێ: ﴿ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَٱلشَّمَآئِلِ سُجَّدًا ﴾، لە لای ڕاستو لای چەپەکانیان، بۆیەش بە نسبەت سێبەرەکانیانەوە دەفەرموێ: بەیانیانو ئێواران، چونکە: سێبەر لەو دوو کاتەدا، زیاتر دەردەکەوێ .

مەبەستی ئەم ئایەتە ئەوەیە کە ئەی مرۆڤەکان! مادام هەرچی کە لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە، هەر کەسێك، بەڵکو هەرچییەك وەك لە شوێنی دیکەدا هاتوە، - بۆ وێنە: لە سووڕەتی (النحل)و لە گەلێك جێی دیکەدا خوای پەروەردگار باسی دروستکراوەکان بە گشتی دەکات، کە هەموویان بۆ خوا ملکەچن، وەك لە سووڕەتی (آل عمران)دا، دەفەرموێ: ﴿ أَفَغَيْرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُۥٓ أَسْلَمَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾ ﴾،

---

١) ئەوە بۆ ئێمەو مانانی خەڵکی کوردستانو عێراقو، بەمەرجێ بەرەو کەعبەش بوەستین، وەك پێشتریش گوتمان

واتە: ئایا جگە لە بەرنامەی خوا دەخوازن، لە حاڵێکدا کە هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە، خۆشو ناخۆش، چارو ناچارو، ویستو ناویست، بۆ خوا ملکەچەو، هەر بۆ لای ویش دەگێڕدرێنەوە – کەواتە: ئێوەش هەر ملکەچی خوای بەرزو مەزن بن !

بەڵێ: مەبەستی ئەم ئایەتەو، ئەو ئایەتی (٨٣)ی سوورەتی (آل عمران)و، ئایەتەکانی دیکە کە لەوبارەوە هاتوون، ئەوەیە کە ئەی مرۆڤەکان! ئێوەش لەو سیستەمەی کە خوا دایناوە لە بووندا، ڕیزپەڕ مەبن، بەڵکو وەك هەموو دروستکراوەکانی دیکە، ئێوەش لەو بەشەی کە دەکەوێتە ژێر کۆنترۆڵو ڕکێفی ویستی ئازادانەی خۆتان، لەو بەشەشدا بۆ خوا ملکەچ بن، وەك چۆن لە بەشە ناچارییەکەو لە بەشە ئیجبارییەکەدا، چار ناچار، بۆ خوا ملکەچن .

پێشتر باسمان کرد کە (الغُدُوّ)، دەگونجێ کۆی (غَدوَة) بێ، یان کۆی (غَدَاة) بێ، واتە: بەرەبەیان، دەشگونجێ (غُدوّ) چاوگ بێ، یانی: (الغُدُوّ: الوَقتُ الذي يَغدُو فيهِ النَّاسُ)، ئەو کاتەی کە خەڵك بەیانیان تێیدا دەردەچێ.

(الآصَال)یش کۆی (أصِيل)ە، یانی: ئێوارە (عِشاء)، هەڵبەتە لێرەدا خوا ﷻ کە دەفەرموێ: هەرچی، یان هەر کەس کە لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە، خۆیانو سێبەرەکانیان، بەیانیانو ئێواران بۆ خوا کڕنووش دەبەنو ملکەچن، ئەگەر یەکێك بڵێ: ئنجا ئەوە یاسایەکی سروشتییە، کاتێك کە خۆر لە خۆرهەڵاتەوە لە شتەکان دەدا، سێبەرەکانیان دەکەونە لای چەپو، ئەگەر خۆر لەلای خۆرئاواوە لە شتەکان بدات، سێبەرەکانیان دەکەونە لای ڕاست !

ئێمە دەڵێین: ئەوە ڕاستەو، خوای پەروەردگاریش لێرەدا هەر باسی یاساکانی خۆی دەکات، بەڵام خوا ﷻ دەیەوێ پێمان بفەرموێ: ئەو یاسایانەی کە خوا دایناون، بۆ هەموو شتەکان، هیچ شتێك نیە لە یاسای خوا لابدات، ئەی مرۆڤ ! تۆش لەو بەشەدا کە دەتوانی لابدەیو، دەشتوانی لانەدەی، لە یاسای خوا لامەدە، بۆ ئەوەی جووڵەی تۆش لەگەڵ جووڵەی هەموو دروستکراوەکانی دیکەدا، یەك بکەوێتەوەو نەبی بە دەنگێکی بۆڕو نەگونجاو لە کۆڕسی بووندا، کە هەمووی خوا بە پاك دەگرێو، هەمووی بۆ خوا ملکەچەو، هیچی لەو یاسایانەی کە خوا

بۆی داناون، لانادات، تۆش لا مەدە، لەو بەشەی ژیانتدا کە دەتوانی لابدەی، ئەگەر نا لە بەشێکی زۆری ژیانی دا، مرۆڤ ناتوانێ لابدات.

بۆ نموونە : کێ بە دەست خۆی بووە، دروست ببێ؟ بەبێ ئەوەی کە خوا پرست پێ بکات، تۆی دروست کردوە

کێ بە دەست خۆی بووە لە فلان گەلە بێ؟ فلانە قەدو قیافەیەی هەبێ؟ فلانە ڕەنگو زمانی هەبێ؟ فلانە ڕەگەزەی هەبێ؟ بێگومان کەس بە دەست خۆی نەبووە، هەروەها کێ بەدەست خۆیەتی، کە ئەگەر بیەوێ بژی، دەبێ بخواو بخواتەوەو، دەبێ هەناسە بداتو، دەبێ بجووڵێو چی بکات ...هتد؟ لە هیچ کام لەو شتانەدا کە زۆر زۆرن، هیبان مرۆڤ تێیان دا ئازادو سەربەست نیە، چونکە مرۆڤ یەکێکە لە دروستکراوەکانی خوا، وەك سەرجەم دروستکراوەکان، بەڵام بایی ئەوەندە کە مرۆڤ تاقی بکرێتەوە خوا لایەك لە ژیانی بۆ هێشتۆتەوە، کە بریتیە لە هەڵسوکەوتە ئیختیارییەکان، کە بە ویستی ئازادانەی خۆی، دەتوانێ ئەنجامیان بدات: چاکە بکات، خراپە بکات، بڕوا بێنێ، بڕوانەهێنێ، دان بە هەقدا بێنێ، دانی پێدا نەهێنێ، بۆ خوا ملکەچ بێ، یان ملکەچ نەبێ، لەگەڵکدا چاکەکار بێ، یان خراپەکار بێ .... هتد.

**مەسەلەی دووەم :** خاوەنداریێتی ڕەهای خوا بۆ بوونو، بەراوردی نێوان خوا ﷻ و پەرستراوە ساختەکانو، وەڵامی ددانشکێن بۆ بتپەرستەکان، کە ئەوان ئەو شتانەی دەیانپەرستن، هیچ کارەنو، هیچ بە دەستنو، شایستەی پەرستران نین :

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ قُلِ ٱللَّهُ ۚ قُلْ أَفَٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ لَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ نَفْعًا وَلَا ضَرًّا ۚ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْتَوِى ٱلظُّلُمَٰتُ وَٱلنُّورُ ۗ أَمْ جَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ خَلَقُوا۟ كَخَلْقِهِۦ فَتَشَٰبَهَ ٱلْخَلْقُ عَلَيْهِمْ ۚ قُلِ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ وَهُوَ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّٰرُ ﴿١٦﴾ ﴾.

**شیكردنه‌وه‌ی ئه‌م ئایه‌ته موباره‌كه ، له ▬ (١٠) برگه‌دا:**

**برگه‌ی یه‌كه‌م :** - ﴿ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، بڵێ: كێ په‌روه‌ردگاری ئاسمانه‌كان‌و زه‌وییه‌؟ وشه‌ی ﴿ رَّبُّ ﴾، پێشتریش زۆرجار باسمان كردوه‌، به‌ مانای په‌روه‌ردگار ▬ مشوورخۆر دێ، به‌ مانای خاوه‌ن دێ، به‌ مانای گه‌وره‌و سه‌روه‌ر دێ، هه‌روه‌ك به‌ مانای په‌رستراویش دێت، به‌ڵام زیاتر به‌ مانای خاوه‌ن‌و ژیێنه‌رو مرێنه‌رو سه‌رپه‌رشت‌و مشوورخۆرو كارهه‌ڵسوڕێنه‌ر، دێ، بڵێ كێ هه‌مه‌كاره‌ی ئاسمانه‌كان‌و زه‌وییه‌؟ كێ خاوه‌ن‌و په‌روه‌ردگار ▬ مشوورخۆره‌؟ هه‌ڵبه‌ته‌ خوا عزّ وجل چاوه‌ڕێی كه‌س ناكات، وه‌ڵام بداته‌وه‌و هه‌ر خۆی ده‌فه‌رموێ :

**برگه‌ی دووه‌م :** - ﴿ قُلِ ٱللَّهُ ﴾، بڵێ: خوا ﷻ، چونكه‌ هیچ وه‌ڵامێكی دیكه‌ی ڕاست نییه‌، كه‌ له‌گه‌ڵ واقیعدا بگونجێ‌و، عه‌قڵ‌و لۆژیكی سه‌لیم‌و، فیتره‌تی ساغی مرۆڤ، قبووڵی بكات، جگه‌ له‌م وه‌ڵامه‌، هیچ وه‌ڵامێكی دیكه‌ نییه‌و، ئه‌سڵه‌ن هیچ كه‌سیش تاكو ئێستا له‌ سه‌ره‌تای مێژووی به‌شه‌ره‌وه‌ تاكو ئه‌م له‌حزه‌یه‌، هیچ كه‌س نه‌یتوانیوه‌، بڵێ: من ئاسمانه‌كان‌و زه‌ویم خولقاندوون، به‌ڵێ هه‌ندێك له‌ فیرعه‌ون‌و طاغووته‌كان هه‌بوون، گوتوویانه‌: ئێمه‌ش ژیان‌و مردنمان به‌ ده‌سته‌و، ئێمه‌ش ڕزق‌و ڕۆزیی خه‌ڵكمان به‌ ده‌سته‌، وه‌ك چه‌واشه‌كاریی، به‌ڵام هیچ كه‌س نه‌یتوانیوه‌ ▬ بڵێ: من مانگ‌و خۆرم دروستكردوون، من ئاسمانه‌كانم هێناونه‌ دی، من ئه‌و شتانه‌م دروست كردوون، مه‌گه‌ر كه‌سێك شێت بووبێ، ئیدیعایه‌كی وایكردبێ !

**برگه‌ی سێیه‌م :** - ﴿ قُلْ أَفَٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ ﴾، بڵێ: ئایا جگه‌ له‌و (كه‌سه‌ كه‌ په‌روه‌ردگار ▬ خاوه‌ن‌و مشوورخۆری ئاسمانه‌كان‌و زه‌وییه‌)، دۆستان‌و نیزیكانێكتان بۆ خۆتان گرتوون‌و، كه‌سانێكی دیكه‌و شتانێكی دیكه‌تان كردوونه‌ سه‌رپه‌رشتیارو نیزیك‌و دۆستی خۆتان؟!

چونکە (أَولِيَاء)، کۆی (وَلِيّ)یە، یانی: نیزیك، دۆست، سەرپەرشتیار، سەرخەر، پشتیوان، مشوورخۆر، هەموو ئەم مانایانەی هەن، واتە: شتێکی زۆر بێ جێتان کردوە، ئەو پرسیارەش پرسیارێکی نکوولیلێکەرانەیە، یانی: شتی زۆر بێ جێتان کردوە، یاخود پرسیارێکی سەرزەنشت کارانە (سؤالٌ تَوبيخي)یە، یانی: نەدەبوو شتێکی وا بێجێ بکەن !

<u>برگەی چوارەم :</u> - ﴿ لَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ نَفْعًا وَلَا ضَرًّا ﴾، کە بۆ خۆشیان هیچ سوودێكو، هیچ زیانێکیان بەدەست نیە، ئنجا کەسێك یان شتێك، سوودو زیانی خۆی بەدەست نەبێ، چۆن هی خەڵکی دیکەی بەدەستە؟ وەك گوتراوە: (مَن لَم يَكُن لِنَفسِهِ، فَكَيفَ يَكُونُ لِغَيرِهِ؟)، کەسێك بۆخۆی سوود نەگەیەنێو بە کەڵکی خۆی نەیەت، بە کەڵکی خەڵکی دیکە چۆن دێ ؟!

<u>برگەی پێنجەم :</u> - ﴿ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الْأَعْمَىٰ وَالْبَصِيرُ ﴾، بڵێ: ئایا کوێرو بینەر یەکسانن؟ کە بە تەئکید مەبەست لە کوێر، کەسێکە کە خوا ناناسێ، یان بڕوای بە خوا نیە، خوا دەناسێ، بەڵام بڕوای پێ نیەو بەندایەتیی بۆ ناکاتو دڵی کوێرە، بینەر (بَصِير)یش، کەسێکە [illegible] خوناسو خواپەرستە، بڵێ: ئایا کوێرو بینەر، وەك یەکن ؟!

<u>برگەی شەشەم :</u> - ﴿ أَمْ هَلْ تَسْتَوِي الظُّلُمَاتُ وَالنُّورُ ﴾، یان بڵێ: ئایا تاریکییەکان لەگەڵ ڕووناکیی دا یەکسانن، وەك یەکن؟! کە مەبەست لە تاریکییەکان (الظلمات)، کوفرە چونکە کوفر زۆرو جۆراو جۆرە بەڵام ڕووناکیی (النُّور)، مەبەست پێی خواناسییو خوا پەرستییو خوا بەیەکگرتنە، کە تەنیا یەکە، چونکە وەك پێشتریش گوتمان: هەمیشە هەق یەکە، بەڵام ناهەق زۆرو جۆراو جۆرە، یانی: چ لە بواری ماتماتیك (رياضيات)دا، چ لە بواری جەبرو هەندەسەدا، چ لە بواری یاسا فیزیاییەکانو، یاسا کیمیاییەکانو، چ لە بواری یاسا عەقڵییەکاندا – بۆ نموونە :

١) هەموو (كُلّ) لە بەش (جُزء) گەورەترە

٢) دوو شتی پێچەوانەوەو دژ بە یەك (متناقض)، پێكەوە كۆنابنەوە

٣) دوو كۆ دوو دەكاتە چوار (٢ + ٢ = ٤)، ئەنجامە ڕاستەكان، هەمیشە یەكن، بەڵام ئەنجامە هەڵەكان، دەگونجێ زۆرو جۆراو جۆریش بن

بۆیە خوا ﷻ لە هەموو قورئاندا، هەمیشە بۆ كوفرو بێبڕوایی، وشەی : تاریكییەكان ﴿ ٱلظُّلُمَٰتُ ﴾، بەكاردێنێ، بۆ هەقو خوا بە یەكگرتنو ئیمان، وشەی : ڕووناكیی (النُّور)، بەكاردێنێ، ئنجا ﴿ ٱلظُّلُمَٰتُ ﴾، هەمیشە بە كۆ دەیهێنێ، كە كۆی (ظُلمَة)ە، یانی: تاریكیی ﴿ ٱلظُّلُمَٰتُ ﴾، تاریكییەكان، بەڵام هەمیشە (النُّور)، بە تاك دێنێ، لەبەرئەوەی هەق یەكێكە .

**برگەی حەوتەم :** - ﴿ أَمْ جَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ خَلَقُوا۟ كَخَلْقِهِۦ ﴾، خوا پرسیارێكی دیكەی نكوولێلێكەرانەیان ئاڕاستە دەكات، كە سەرزەنشتیشی تێدایەو، وەڵامەكەی لە نێوخۆی دایە :

یان ئایا چەند هاوبەشێكیان بۆ خوا داناون، كە دروستكراوی وەك هی خوایان دروست كردو■ دروستكراوانێكیان هێناونە دی، وەك دروستكراوی خوا ؟!

**برگەی هەشتەم :** - ﴿ فَتَشَٰبَهَ ٱلْخَلْقُ عَلَيْهِمْ ﴾، ئنجا دروستكراوەكانیان لێ تێكەڵ بوون، كامەیان دروستكراوی خوایەو، كامەیان دروستكراوی جگە لە خوایە؟! ئایا وایە! ئەمە وەك لە زمانی عەرەبییدا دەڵێ: (سؤال التَهَكُّم)، پرسیار كردنێكی گاڵتە پێكەرانەیە، بە تەوسەوەو بە توانجەوەیە

**برگەی نۆیەم :** - ﴿ قُلِ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ ﴾، بڵێ: خوا بە دیهێنەری هەموو شتێكە، یانی: خوا بەدیهێنەری هەموو شتێكە ■ یەكی لەسەر ئەوە كەوتو■ خوا بیهێنێتە دی، وەك پێشتریش باسمان كردوە لە سووڕەتی (الأنعام)دا، باسم كرد كە كردەوەكانی مرۆڤ ، بەدیهێنراوو دروستكراو نین، تاكو یەكیان لەسەر ئەوە بكەوێ، خوا بیانهێنێتە دی، وەك جەبرییەكان گوتوویانە: یاخود

مرۆڤ بیانهێنێتە دی، وەك موعتەزیلەکان گوتوویانە[1]، کە لە ڕاستییدا بەدیهێنەریەتیی خوای پەروەردگار بۆ شتەکان، واتە: ئەو شتانەی کە پێویستە بەدیبهێنرێن، بەڵام ئەو شتانەی کە پەکیان لەسەر وەدیهێنان نەکەوتوە، بەڵکو وەدەست هێنان (کسب)و، ئەنجام دان (فعل)و، ئەوانە بەس (کافي)ن بۆ ئەوەی پەیدا ببن، ئەو شتانە، وشەی (خلق) یان بۆ بەکارنەهێنراوە، چونکە بریتین لە شتی (جَعْلي)ی، یانی: گۆڕان لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێك، کە خوا ﷻ وشەی (خَلق)ی، لە قورئاندا بەکارهێناوە، بۆ پەیدابوونی شتێك لە نەبوونەوە، بەڵام وشەی (جَعل)و (فِعل)و (کَسب)و (إقتراف)و (إختراق)و (عَمَل)و... هتد، ئەوانەی بەکارهێناون، بۆ دەستوەردانی مرۆڤەکان لە شتەکاندا، بەبێ ئەوەی کە بیانهێننە دی، یانی: مرۆڤێك کە نوێژێك دەکات، پێویست ناکات، بڵێین: نوێژەکەی خوڵقاندوە، ڕۆژوو دەگرێ، پێویست ناکات، بڵێین: ڕۆژووی خوڵقاندوە، چونکە بە نوێژکردنو، ڕۆژوو گرتن، شتێك نەهاتووتە دی، کە بوونی نەبووبێ، یان مرۆڤێك شتێك دەبەخشێ، یاخود قەتڵ دەکات، زینا دەکات، چاکە دەکات، خراپە دەکات، شتێکی نەهێناوەتە دی، کە نەبوو (معدوم) بووبێ، بەڵکو بریتییە لەوە کە شتێکی لە حاڵەتێکەوە گۆڕیوە، بۆ حاڵەتێکی دی، هەر ئەوەندە، یانی: شتێك لە نەبوونەوە نەهاتۆتە دی، کە پێی بگوترێ: (خَلْق)و پەکی لەسەر (خَالق) بکەوێ، تاکو ئەو بەدیهێنەر (خالِق)ە، بڵێین: خوای پەروەردگارە یاخود بڵێین: مرۆڤە، وەك جەبریی و موعتەزیلە، یان جەبریی و قەدەرییە، لەوبارەوە کێشەو مشتومڕی زۆریان بووە .

کەواتە: ﴿ قُلِ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ ﴾، بڵێ: خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە، هەموو شتێك کە دروست کرابێ و، بەدیهێنرابێ و لە نەبوونەوە هاتبێ

١) خوای پەروەردگار بۆی ئاسان کردووم، ئەو ئیشکالە کە ئیشکالێکی لە مێژینە بووە، لەو مەسووعەیەی کە لە زیندانی ئەمەریکییەکاندا نوسیوومە، ئەو ئیشکالە چارەسەر بکەم، کە لە کتێبی دووەمی مەسووعەکەمدا باسم کردوە .

**بڕگەی دەیەم :** - ﴿ وَهُوَ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّـٰرُ ﴾، خوا تاکی مل پێ کەچکەرە تاکی زاڵە، (قهّار)، (صیغة المبالغة)ی (قاهِر)ە، (قاهِر)یش، واتە: مل پێ کەچکەرو زاڵ، کەسێك غەیری خۆی دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە

**مەسەلەی چوارەم :** خوا ﷻ بۆ ڕوون کردنەوەی زیاتری بەراوردی نێوان هەق و ناهەق، کە لە تەوحیدو شیرکدا، یاخود لە ئیمان و کوفردا، یاخود لە طاعەت و تاواندا، بەرجەستە دەبێ، یانی : لەو شتانەدا کە باشن و، لەو شتانەدا کە خراپن لە ژیانی مرۆڤدا، بەرجەستە دەبێ، دوو وێنەمان بۆ دێنێتەوە: وێنەیەکی ئاوییو، وێنەیەکی ئاگرینی بۆ هەق و ناهەق، مانەوەی هەقی سوود بەخش و، بەین چوونی ناهەقی بێ کەڵک :

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَالَتۡ أَوۡدِيَةُۢ بِقَدَرِهَا فَٱحۡتَمَلَ ٱلسَّيۡلُ زَبَدًا رَّابِيًاۖ وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيۡهِ فِي ٱلنَّارِ ٱبۡتِغَآءَ حِلۡيَةٍ أَوۡ مَتَٰعٖ زَبَدٞ مِّثۡلُهُۥۚ كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡحَقَّ وَٱلۡبَٰطِلَۚ فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ فَيَذۡهَبُ جُفَآءٗۖ وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمۡكُثُ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَالَ ﴿١٧﴾ ﴾

ئێمە لە حەوت بڕگەدا ئەو دوو وێنەیە ، دەخەینە ڕوو:

**یەکەم : وێنە ئاوییەکە :**

**بڕگەی یەکەم :** - ﴿ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ﴾، بۆیە نەیفەرمووە: (اَللهُ أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاء)، یان (إلهکم)، یان (رَبُّکم)، چونکە بە پێی سیاقی ئایەتەکان دیارە کە هەمووی قسەیە لەبارەی خواوە ﷻ هەمووی پێناسەی پەروەردگارو ناساندنیەتی، لە میانی سیفەتەکانیو کردەوەکانی دا، دەفەرموێ: لە سەرێوە

ئـــاوی ناردۆتـــە خـــوار، پێشتـــریش باســـمان کـرد، کـە وشـــەی: (سَمَاء)، چـەند مانایـەکی هـەن :

١/ مانـــای ئەسڵـیی (سَـمَاء)، بریتیـــە لـە: سەرەوە (فَوقْ)، (علُو)، بۆیـە گـوتراوە: (کُلُّ مَا عَلاَكَ فَهُوَ سـمَاء)، هەرچی لە سـەرووتەوەیـە ئاسـمانە

٢/ سەقفی خـانوو لـە سوورەتی (الحـج)دا، خـوای پـەروەردگار سـەقفی خـانووی بـە (سمـــاء) ناوهێنـــاوە، وەك دەفـــەرموێ: ﴿ فَلْيَمْدُدْ بِسَبَبٍ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ثُمَّ لْيَقْطَعْ فَلْيَنظُرْ هَلْ يُذْهِبَنَّ كَيْدُهُۥ مَا يَغِيظُ ﴿١٥﴾ ﴾، واتە: بـا ئـەو مرۆڤـە بێنـێ، پـەتێك هەڵبواسـێ، ﴿ فَلْيَمْدُدْ بِسَبَبٍ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ﴾، یـانی: (إلـى سَقفِ البَيت)، پەتێـك بە سـەقفی خانووەکەی هەڵبواسێو ملی خـۆی پێدا بکاتو خـۆی پـێ بخنکێنـێ، بزانێ داخـۆ: بەو فێـڵو تەگبیـری [illegible] دەیکات، ئەوەی پێی قەڵسـە، لادەچـێ ؟!.

٣/ هەروەهـا لێرەو لە شوێنی دیکەش (سَـمـاء) بە مانای هەور هاتوە، ﴿ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ﴾، ﴿ ٱلسَّمَآءِ ﴾، یـانی: (سـحاب) هـەور، لەبەرئـەوەی هـەور لـە سـەرێیـە .

٤/ جـەووی ئاسـمان، لە سوورەتی (النـحل) ئایـەتی (٧٩)دا، خـوا دەفـەرموێ: ﴿ أَلَمْ يَرَوْاْ إِلَى ٱلطَّيْرِ مُسَخَّرَٰتٍ فِى جَوِّ ٱلسَّمَآءِ ﴾، ئایـا تەماشـای باڵندەکـانیان نەکردوە، ڕامکراون لە جـەووی سـەرێ دا .

٥/ هـەروەهـا (سَمَاء)، بە حـەوت ئاسمانەکانیش گـوتـراوە، لەبەرئەوەی ئـەوانیش لە سـەرێـن .

حیکمەتی بەکارهێنـانی وشـەی (مَـاء)یش، ئەوەیە کـە ئـەو ئـاوەی لـە سـەرێ دێتـە خـوار، بە سێ حـاڵـەت دێتـە خـوار :

أ) بە شـێوەی بەفـر (الثلـج)

ب) بە شـێوەی تـەرزە (البَـرَد) .

ج) بە شـێوەی بـاران (المَطـر)

بۆیە لە قورئاندا بە زۆریی وشەی (مَاء) بەکارهاتوە، چونکە باسی هەر کامێك لەو سێیانە بکات، دووەکانی دیکە ناگرێتەوە، جار جاریش بە پێی حال و مەقام، باسی باران و تەرزە (المَطَر و البَرَد) دەکات، بە پێی ئەوە کە حال و مەقامەکە بیخوازێ، بەلاّم بە زۆریی وشەی (مَاء) بەکاردێ، بۆ ئەوەی هەموویان بگرێتەوە .

<u>برگەی دووەم</u> : ﴿ فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌ بِقَدَرِهَا ﴾، چەند دۆڵ و شیوێك، هەر کامێکیان بە ئەندازەی خۆی ئاوی تێدا ڕژا، ئاوی پێدا هات

(أودية)، کۆی (وَادِيْ)یە، کە بەو شوێنە دەگوترێ ئاوی پێدادێ، ئاوی تێدا دەڕژێ، لێزماوی پێدا دێ، بەلاّم دوایی بۆ ئاوەکەش بەکارهێنراوە : ﴿ فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌ بِقَدَرِهَا ﴾، لێرەدا بە شوێنەکە دەگوترێ، بەلاّم جاری وایە بە عەینی ئەو لێزماوە که بە نێو شیوو دۆڵەکەشدا دێ، بەویش دەگوترێ، هەڵبەتە لێرەدا هەندێك لە زانایان گوتوویانە: خوا لێرە ﷻ دەیەوێ پێمان بفەرموێ: کە خوا وەك چۆن ئاوی ناردۆتە خوار لە ئاسمانەوەو، هەر دۆڵ و شیوێك لە قەدەر خۆی، ئەو ئاوە لە خۆیدا جێ دەکاتەوەو پێیدا دەڕوا، بە هەمان شێوەش خوا هیدایەتی خۆی ناردۆتە خوار لە ئاسمانەوەو، هەر کەسە لە قەدەر خۆی، ئەو هیدایەتە وەردەگرێ و، لە عەقڵ و دڵی خۆیدا جێی دەکاتەوە، زۆر لە توێژەرەوان وایانگوتوەو، هەندێکیان لەوبارەوە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺیشیان هێناوەتەوە، فەرموودەکە لە صەحیحی بوخاریی و صەحیحی موسلیم دا هاتوە[1]، کە باسی ئەوە دەکات: خوا ﷻ هیدایەتی خۆی ناردۆتە خوار وەك چۆن ئاوی ناردۆتە خوار، پارچە زەوییەکان هەر کامیان لە قەدەر خۆی، لەو ئاوە بەهرەمەند دەبێ،

---

١) دەقی فەرموودەکەش ئەمەیە: {عَنْ أبِي مُوسَى ، عَنِ النبيِّ صلى الله عليه وسلم قال: مَثَلُ مَابَعَثَنِي اللهُ بِهِ مِنَ الْهُدَى وَالْعِلْمِ، كَمَثَلِ الْغَيْثِ الْكَثِيرِ، أصَابَ أرْضاً، فَكَانَ مِنْهَا نَقِيَّةٌ قَبِلَتِ الْمَاءَ، فَأنْبَتَتِ الْكَلأَ وَالْعُشْبَ الْكَثِيرَ، وَكَانَتْ مِنْهَا أجَادِبُ، أمْسَكَتِ الْمَاءَ، فَنَفَعَ اللهُ بِهَا النَّاسَ، فَشَرِبُوا وَسَقَوْا وَزَرَعُوا، وَأصَابَتْ مِنْهَا طَائِفَةً أخْرَى، إنَّمَا هِيَ قِيعَانٌ، لاتُمْسِكُ مَاءً، وَلاَ تُنْبِتُ كَلأً، فَذَلِكَ مَثَلُ مَنْ فَقِهَ فِي دِينِ اللهِ، وَنَفَعَهُ مَابَعَثَنِي اللهُ بِهِ، فَعَلِمَ وَعَلَّمَ، وَمَثَلُ مَنْ لَمْ يَرْفَعْ بِذَلِكَ رَأْساً، وَلَمْ يَقْبَلْ هُدَى اللهِ الذي أرْسِلْتُ بِهِ} .

بە هەمان شێوەش خوای پەروەردگار، هیدایەتی خۆی، وەحیی خۆی ناردۆتە خوارو، هەر کام لە مرۆڤەکان بە ئەندازەی خۆی، بە پێی شایستەی خۆیو ئامادەیی خۆی، لەو هیدایەتەی خوا بەهرەمەند دەبێ، یاخود لێی بەهرەمەند نابێ .

بەڵام من پێم وایە، لێرەدا مەبەست ئەوە نیە، بەڵکو خوا وێنە دێنێتەوە بۆ ڕوونکردنەوەی هەقو ناهەق، کە ئەنجامگیرییەکەی لە دوایی دا دێ

**بڕگەی سێیەم** : - ﴿ فَٱحْتَمَلَ ٱلسَّيْلُ زَبَدًا رَّابِيًا ﴾، ﴿ ٱلسَّيْلُ ﴾، واتە: (لێزماو لافاوێك کە هەڵدەڕژێ بە دۆڵو شیوەکاندا)، کەفو خڵتەو پووشو پەڵاشێکی بەرزبووەوەی هەڵگرت، لافاوو لێزماو کە بە نێو دۆڵو شیوەکاندا دێ، خڵتەو پووشو پەڵاشو ئەو شتانە لەسەر ڕووی دەردەکەون، چونکە وشەی ﴿ زَبَدًا ﴾، بە مانای: (رَغْوَة)، کەفو، بە مانای (غُثَاء)، پووشو پەڵاش دێ، کە هەڵیدەگرێ، ﴿ رَّابِيًا ﴾، (مُرتَفِعًا)، بەرزبۆتەوە

ئەوە وێنە ئاوییەکە.

**دووەم: وێنە ئاگرییەکە:**

**بڕگەی چوارەم** : - ﴿ وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِي ٱلنَّارِ ٱبْتِغَآءَ حِلْيَةٍ أَوْ مَتَٰعٍ زَبَدٌ مِّثْلُهُۥ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْحَقَّ وَٱلْبَٰطِلَ ﴾، هەروەها لەوەی کە ئاگری دەدەنە بەرێو قاڵی دەکەنەوە، بە مەبەستی ئەوەی خشڵێکی لێ دروست بکەن، یاخود شمەك (کەلوپەلو قاپو قاجاغ، یاخود چەك، یان ... هتد)ی لێ دروست بکەن، ئەویش بە هەمان شێوە خڵتەو خاڵی هەیە

وشەی (متاع)، (كلُّ مَا يُنتَفَعُ بهِ)، هەر شتێکە کە بەهرەی لێ وەربگیرێ، یانی: ئەو شتانەی کە لە کانزایەکان دروست دەکرێن، چونکە: ﴿ وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِي ٱلنَّارِ ﴾، یانی: ئەو کانزایانەی کە دەبێ ئاگریان بدرێتە بەرو قاڵ بکرێنەوە، بۆ ئەوەی نەرم ببنو، بگونجێ شتیان لێ دروست بکرێ، ئنجا خشڵ

بێ، ئامراز بێ، کەلوپەل بێ، هەرچی بێ، لە دروستکراوە کانزاییەکان، ئنجا ئاسن‌و مسە، زێڕو زیوە، هەرچی هەیە، شایانی باسە: ڕستەی : ﴿ وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِي ٱلنَّارِ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (وَمِمَّا تُوقِدُونَ عَلَيهِ فِي النَّار)، واتە: بە ڕاناوی دوێنراو (مُخَاطب)، هاتوە .

﴿ حِلْيَةٍ ﴾ش، هەر شتێکە کە خۆی پێ برازێنرێتەوە، لەو کانزایانەی قاڵ دەکرێتەوە لە زێڕو زیو... هتد

(متاع)یش، هەر شتێکە کە بەهرەی لێوەربگیرێ، چ پارەو دراو بێ، کەلوپەل

<u>برگەی پێنجەم</u> : ﴿ فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَآءً ﴾، (ٱلزَّبَدُ)، هەم بە مانای کەف دێ، هەم بە مانای خڵتە دێ، ئەو شتەی کە لەسەر ڕووی لێزماوەکە قەراری گرتوە، کە کەف‌و خڵتەو پووش‌و پەڵاشە، یاخود ئەو خڵتەو ژەنگ‌و ژارەی کە لە کانزایەکان دەبێتەوەو، فڕێ دەدرێ، ﴿ فَيَذْهَبُ جُفَآءً ﴾، دەڕوا دوور دەخرێتەوە، (الجُفَاءُ: الطَّرِيحُ المَرمِيُّ)، شتێك کە فڕێ دەدرێ‌و دوور دەخرێتەوە .

<u>برگەی شەشەم</u> : ﴿ وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، بەڵام ئەوەی کە سوود بە خەڵك دەگەیەنێ، لە زەویدا دەمێنێتەوە، ئەوەی سوود بە خەڵك دەگەیەنێ، ئاوەکەیە کە لە زەویدا دەمێنێتەوە، بەڵام ئەوەی کە سوودی نیە، پووش‌و پەڵاش‌و کەف‌و خڵتەو خاڵەکەیە، کە دەڕوات، لە وێنەی دووەمیاندا : ئەوەی سوود بە خەڵك دەگەیەنێ زێڕو زیو، یاخود کانزایەکانی دیکەن، وەك : مس‌و ئاسن‌و فافۆن‌و، هەرچی کەلوپەل‌و دراوو خشڵ‌و شتی لێ دروست دەکەن، ئەوەش کە سوودی نیە، خڵتەو ژەنگەکەیە کە لێی دەبێتەوەو فڕێ دەدرێت

**برگەی حەوتەم :** - ﴿كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ﴾، ئاوا خوا وێنان دێنێتەوە، وێنان دێنێتەوە بۆ ئەوەی کە مانا و مەبەستەکان کە شتێکی مەعنەویین و، عەقڵ دەرکیان دەکات، لە قاڵبی بەرهەست دا، لە قاڵبێکدا کە هەستەوەرەکانیش و، خەیاڵیش تەماشایان بکەن، دەیانخاتە ڕوو

گرنگیی وێنە هێنانەوە :

وێنە هێنانەوە لە قورئاندا زۆر گرنگیی پێدراوە، چونکە وەك گوتمان: زیاتر ڕوونبوونەوەی مەبەستەکان بەرجەستە دەکات و، ماناکان لە قاڵبێکی بەرهەستدا دەخاتە ڕوو، بۆیە خوا ﷻ وێنەی زۆری هێناونەوەو، زۆریش مەدحی ئەوانەی کردوە کە لە وێنە هێنانەوەکانی خوا، حاڵی دەبن، وەك دەفەرموێ:

﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾العنكبوت

واتە: ئەو وێنانە بۆ خەڵکی دێنینەوە، بەڵام تەنیا زانایان لێیان تێدەگەن

کەواتە: کاتێ ئینسان لە وێنە هێنانەوەکانی خوا حاڵی دەبێت، دەبێ دڵی خۆش بێ، کە دیارە پشك و بەشی لە زانست و زانیارییدا هەیە

کۆی مەبەستی ئەم ئایەتە موبارەکەش ئەوەیە کە خوا ﷻ دەیەوێ پێمان بفەرموێ :

پەیامێك کە خوا ناردوویەتی بە پێغەمبەراندا (عليهم الصلاة والسلام) کە نێوەڕۆکەکەی بریتیە لە خوا بە یەکگرتن و تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا کردن، پاشان بریتیە لە تاعەت و بەندایەتیی بۆ خواو، بریتیە لە خۆ دوور گرتن لە گوناهو تاوان و، خۆ ڕازاندنەوە بە سیفەتی بەرزو جوان و، خۆ دوور گرتن لە سیفەتی نزم و خراپ، چ لەسەر ئاستی تاکیی، چ لەسەر ئاستی خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی، ئا ئەو هەق و پەیام و بەرنامەیە، هەقە و ڕاستە و چاکە، دەچەسپێ، وەك چۆن ئاوەکە بە زەویدا دەچێتە خوار و دەچەسپێ، لەبەر ئەوەی خەڵك لێی بەهرەمەند دەبن، هەروەك چۆن ئەو خشڵ و کانزایانەش کە شتیان لێ دروست دەکەن، خشڵیان لێ دروست دەکەن، یاخود کەلوپەلیان لێ دروست دەکەن، خەڵك گرنگییان پێ دەدات و دەمێننەوە

بەڵام وەك چۆن کەفو پووش و پەلاشی سەر لێزماوەکە، یاخود خڵتەو ژەنگی کانزایەکان دەڕوات، ئەو شتانەش سوودیان نیە بۆ خەڵك، ئەو بیرو بۆچوونو بەرنامە پووچانە، ئەوانەش دەڕۆن

هەڵبەتە لێرەدا مسوڵمان دەبێ زۆر لە خۆی وریا بێ، کە ئەگەر بمانەوێ بمێنین، دەبێ هەوڵبدەین، سوودبەخش بین بۆ خەڵك و کۆمەڵگا، ئەگەر بێت و سوودبەخش نەبین بۆ خەڵك و کۆمەڵگا، دەڕۆین، چونکە جاری وایە تۆ بەرنامەکەت ڕاستە، بەڵام تۆ بەرنامەکەت لە خۆتدا بەرجەستە نەکردووەو کارت پێ نەکردووە مەرج نیە کە بەرنامەکەت باش بوو، خۆشت باش بی، هەروەك مەرج نیە کە کەسێك بەرنامەکەی هەڵە بوو، خۆشی هیچ شتێکی بە کەڵك نەبێت، چونکە خوا عەقڵ و فیترەتی داوە بە هەموو مرۆڤەکان، وەك چۆن بەهۆی نەقڵەوە بەهۆی وەحییەوە ئینسان دەرکی ڕاستییەکان دەکات، بەهۆی عەقڵ و فیترەتیشەوە، دەرکی بەشێك لە ڕاستیی و، لە قازانج و زیانەکان دەکات، کەواتە: ئێمەش دەبێ وریا بین، ئەگەر لەو جۆرە بین کە سوودمان بۆ خەڵك و کۆمەڵگاو دەوروبەرمان هەبێ، دەمێنین، خۆمان و بەرنامەکانمان، بەڵام ئەگەر سوود نەگەیەنین و، سوودبەخش نەبین، دەڕۆین، ئەوە بە پێی یاسایی خوای کاربزان، کە بێگومان دینەکەمان سوودبەخشەو ڕاستەو هەقە، بەڵام دەبێ خۆشمان ببەینە ئاستی ئایین و بەرنامەکەمانەوە، لە ڕووی تێگەیشتن و ڕاست تێگەیشتن و، لە ڕووی کارپێکردن و پراکتیزە کردن و بەڕێوەبردنیشەوە

<u>مەسەلەی چوارەم و کۆتایی</u> : ئاکامی باشی وەڵامدەرەوانی پەروەردگاریان و، سەرەنجامی شوومی وەڵامنەدەرەوان و پەشێمانییان لە ڕۆژی دوایی دا:

خوا دەفەرموێ : ﴿ لِلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَٱلَّذِينَ لَمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَهُۥ لَوۡ أَنَّ لَهُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا وَمِثۡلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفۡتَدَوۡاْ بِهِۦٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ سُوٓءُ ٱلۡحِسَابِ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴿١٨﴾ ﴾

**شیكردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەكە ، لە حەوت بڕگەدا:**

**بڕگەی یەكەم :** - ﴿لِلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمُ ٱلْحُسْنَىٰ﴾، ئەوانەی كە وەڵامی پەروەردگاریان داوەتەوە، بەدەم پەروەردگاریانەوە هاتوون، پاداشتی هەرە باشیان هەیە.

(ٱلْحُسْنَىٰ)، سیفەتی مەوصووفێكی فرتێنراو (محذُوف)ە، یانی: (العَاقِبَة الحُسْنَى)، سەرەنجامی هەرە چاك، كە لە ڕەزامەندیی خواو، لە بەهەشتی خوای پەروەردگاردا، بەرجەستە دەبێ، هەڵبەتە وەك پێشتریش باسمان كرد: ئەمە بە پلەی یەكەم مەبەست پێی دواڕۆژە بەڵام هەر لە دنیاشدا، ئەوانەی كە بەدەم بانگی پەروەردگاریانەوە دەچن، سەرەنجامو ئاكامیان خێر دەبێ، هەر نەبێ لە عەیبداریی لای خەڵكو، گوناهباریی لای خوا پارێزراو دەبنو، سەربەرزو ڕوو سوور دەبن، بەهۆی پابەندیی بە شەریعەتەوە، مرۆڤ سەربەرز دەبێ، ڕوو سوور دەبێو، هەر كەسێك ئینصافو ویژدانی هەبێ، لە خۆی مەمنوونی دەكاتو، وا دەكات كە لێی ڕازی بێو، لەگەڵ بێ ئینصافیو بێ ویژدانییشدا هیچ ناكرێ .

**بڕگەی دووەم :** - ﴿وَٱلَّذِينَ لَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُۥ﴾، بەڵام ئەوانەی كە وەڵامی پەروەردگاریان نەداوەتەوە، بە دەنگ پەیامو بەرنامەكەیەوە نەهاتوون، ئنجا كە وەڵامیان نەدایەوە، مانای وایە كوفرو تاوانو خراپەیان كۆكردۆتەوە، هەروەك چۆن وەڵامدانەوەی پەروەردگار، واتە: ئیمانیان پێ هێناوەو بۆی ملكەچ بوونو پابەندبوون بە شەریعەتەكەیەوەو، خەمی بەرێوەبردنی شەریعەتەكەیان خواردوە، لە ژیانی تاكیو خێزانیو كۆمەڵایەتیو سیاسییاندا، ئنجا ئەوانەی كە وەڵامی پەروەردگاریان نەداوەتەوەو بە دەنگیەوە نەهاتوون :

**بڕگەی سێیەم :** - ﴿لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ﴾، ئەگەر هەرچی لە زەویدا هەیە، هەمووی بە تێكڕاو، هێندەی دیكەشی لەگەڵدا بێ،

واتە: نەك هەر هێندەی پڕی دنیا، بەڵكو دوو بەرانبەری ئەوەی كە لە دنیادا هەیە، ئەگەر هەموویان هەبێ .

**برگەی چوارەم :** - ﴿ لَافْتَدَوْا بِهِۦٓ ﴾، ئەوە دەیكەنە بەلاگێڕەوەی خۆیان‌و، دەیكەنە قەرەبووی خۆیان، لە ڕۆژیی دواییدا، كاتێ سزای خوا دەبینن، بە خۆزگە دەخوازن‌و بە ئاوات دەخوازن، كە هەرچی لە دنیادا هەیە، هی ئەوان بووایەو هێندەی دیكەشی لەگەڵ دابووایە، بۆ ئەوەی كردبایانە بەلاگێڕی خۆیان‌و، خۆیان لە سزای خوا دەرباز كردبایە .

**برگەی پێنجەم :** - ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ سُوٓءُ ٱلۡحِسَابِ ﴾، ئا ئەوانە لێپرسینەوەی خراپیان بۆ هەیە

(سُوءُ الحِسَاب: مَا يَحُفّ بِهِ مِن إغـلاظٍ وَإهَانَةٍ لِلمُحَاسَب، وَأمَّا أصلُ الحِسَا فَهُوَ حَسَنٌ لأنَّهُ عـدلٌ)[1]. ﴿ سُوٓءُ ٱلۡحِسَابِ ﴾، واتە: ئەوەی كە هاوپێچ دەبێ لەگەڵ ئەو لێپرسینەوەیەی خوادا، لە خۆ لێ توورەكردن‌و، بە سووك تەماشاكردن‌و سزادان، بۆ كەسێك كە لێی دەپرسێتەوە، ئەگەرنا ئەسڵی لێپرسینەوە بۆخۆی شتێكی باشە، چونكە دادگەرییەو مایەی چەسپاندنی دادگەریی خوای پەروەردگارە.

بەڵام بە نسبەت ئەوانەوە كە لێیان دەپرسرێتەوەو، خراپەیان كردوە، لێپرسینەوەكە خراپە، چونكە لە ئەنجامی ئەو لێپرسینەوەیەدا، تووشی سزا دەبن‌و، تووشی ئەو ڕۆژە ڕەشە دەبن، كە دوایی مەرگی خۆیانی تێدا بە ئاوات دەخوازن

**برگەی شەشەم :** - ﴿ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُ ﴾، شوێنی حەوانەوەیان دۆزەخە

(المَأوى كُلُّ مَكان يَأوي إليهِ شيء لَيلاً أو نَهَارًا)، (مَاوى)، هەر شوێنێكە كە هەر شتێك پەنای پێ دەبات، بە شەوێ، یان بە ڕۆژێ، بۆ ئەوەی سەلامەت بێ‌و، تێیدا ئیسراحەت بكات‌و، تێیدا بحەوێتەوە، ئنجا ئەوانە شوێنی تێدا حەوانەوەو، پەنا پێبردن‌و، سەر پێ بردنیان، دۆزەخە

---

١) التحرير و التنوير ، ج ١٣، ص ١٢٣ .

بڕگەی حەوتەم : - ﴿ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴾، خراپترین شوێنی ئیسراحەت تێدا کردنو پشوودانیش، بریتییە: لە دۆزەخ، چونکە لەوێدا پشوودانو ئیسراحەت نییە، ﴿ ٱلْمِهَادُ ﴾، یان بە مانای (فِرَاش)ە، واتە: شوێنێك کە ڕاخراوە، بۆئەوەی ئینسان پشووی تێدا بداتو تێیدا بخەوێ، کە ئەو کاتە بە (مُهُد)، کۆ دەکرێتەوە، وەك: (كِتَاب، كُتُب)، کتێب، کتێبەکان .

دەشگونجێ: ﴿ ٱلْمِهَادُ ﴾، بۆ خۆی کۆ (جمع) بێ، کۆی (مَهد)بێ، یانی: بێشکە، لانکە، کە منداڵ تێیدا ئیسراحەت دەکات، وەك (سَهمْ، سِهَام)، تیر، تیرەکان

کورتەی ماناو مەبەستی ئەم ئایەتە موبارەکەش ئەوەیە کە: خوا ﷻ دوای ئەوەی باسی خۆی کرد ﷻ باسی سیفەتەکانیو کردەوەکانی خۆی کردو، باسی ئەوەی کرد کە هەر ئەو پەروەردگارەو هەمەکارییەو، باسی ئەو هەموو نیشانەو سیفەتە بەرزو ناوازانەی خۆی کرد، کە هەر کامێکیان بە تەنیا، پاساوو بەڵگەی ئەوەیە کە مرۆڤ دەبێ تەنیا خوا بپەرستێ، چ جای هەموویان وێکڕاو پێکەوە، هەروەها باسی پەرستراوە ساختەکانی کرد، ئەوانەی کە خەڵك بە نەزانیی پەنایان پێ دەبەن، ئەگەر دارو بەردن، ئەگەر مرۆڤن، ئەگەر هەواو ئارەزوون، ئەگەر شەیتانن، ئەگەر مانگو خرۆکەو ئەستێرەن، هەرچی هەن، جگە لە خوا هەرچی بپەرسترێ، پەرستراوێکی ساختەو پووچو بێ نێوەرۆکە

دوای ئەوە، ئنجا خوا لە کۆتایی دا: باسی سەرەنجامی ئەوانە دەکات کە ئەهلی ئیمانو خوا بە یەکگرتنن‌و، بە دەنگ بانگەوازی پەروەردگاریانەوە دەچن‌و، بەندایەتیی بۆ خوا ئەنجام دەدەن، کە چ سەرەنجامێکی چاکیان هەیەو، باسی سەرەنجامی شوومی ئەوانەش دەکات، کە ئەهلی شیرکو کوفرن‌و، بەندایەتیی بۆ خوا ناکەن، کە ئەوانیش چ سەرەنجامێکی شوومو خراپیان هەیە !!

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چوارەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان ئایەتەکانی: (١٩ - ٢٥) واتە: حەوت (٧) ئایەت دەگرێتە خۆی‌و، لەو (٧) ئایەتەدا، خوای زاناو توانا ﷻ بە [redacted] (١٠) لە سیفەتە بنەڕەتییەکانیان، پێناسەی بەندە شایستەکانی خۆی، بەندە بڕوادارو پارێزکارەکانی خۆی دەکاتو، باسی سەرەنجامی پڕ خێریان دەکات، هەم هی خۆیان، هەم هی بابو دایکو هاوسەرو ڕۆڵەکانیان، کە بریتیە لە نیشتەجێ بوونیان لە بەهەشتە ڕازاوەو نەبڕاوەکانی خوادا ﷻ.

پاشان ئاماژەیەکیش بە مرۆڤە ناشایستەو پەیمانشکێن‌و، سیفەتە بنەڕەتییە خراپەکانیان دەکات، کە سێ (٣) سیفەتن‌و، سەرەنجامی شوومیشیان دەخاتە ڕوو

﴿أَفَمَن يَعۡلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ كَمَنۡ هُوَ أَعۡمَىٰٓۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ١٩
ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلۡمِيثَٰقَ ٢٠ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ
وَيَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلۡحِسَابِ ٢١ وَٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ
ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ سِرّٗا وَعَلَانِيَةٗ وَيَدۡرَءُونَ بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عُقۡبَى
ٱلدَّارِ ٢٢ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ
يَدۡخُلُونَ عَلَيۡهِم مِّن كُلِّ بَابٖ ٢٣ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ٢٤ وَٱلَّذِينَ
يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفۡسِدُونَ فِي
ٱلۡأَرۡضِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ٢٥﴾

# ماناى دەقاو دەقى ئايەتەكان

{ئایا کەسێك کە دەزانێ (و بڕوای وایە): ئەوەی بۆ لای تۆ نێردراوەتە خوار (قورئان) هەق‌و ڕاستە، وەك کەسێکە کە کوێرە (لە بەرانبەر هەقدا)، بە دڵنیاییی تەنیا خاوەن عەقڵان پەند وەردەگرن (١٩) ئەوانەی پەیمانی خوا بەجێ دێنن‌و بەڵێنی پتەوی خوا هەڵناوەشێننەوە (٢٠) ئەوانەی هەرچی خوا فەرمانی پێکردوە (لە پەیوەندییەکان کە بگەیەنرێ) دەیگەیەنن‌و، سام لە پەروەردگاریان دەکەن‌و، لە لێپرسینەوەی خراپ دەترسن (٢١) ئەوانەی بۆ وەدەستهێنانی (دیداری) ڕووی پەروەردگاریان (لە بەرانبەر ناڕەحەتییاندا) خۆڕاگرتوون‌و، نوێژیان بەرپا کردوە، لەوەی پێمانداون بە پەنهانیی‌و بە ئاشکرا بەخشیویانەو، بە چاکە بەرپەرچی خراپە دەدەنەوە، ئا ئەوانە سەرەنجامی (چاکی) مەنزڵگای دواڕۆژیان هەیە (٢٢) باغ‌و بێستانە هەمیشەییەکان کە خۆیان‌و ئەوانەی شایستەن، لە باب‌و دایکیان‌و، هاوسەرانیان‌و، ڕۆڵەکانیان دەچنە نێویان، فریشتەکانیش لە هەموو دەرگایانەوە لێیان وەژوور دەکەون (٢٣) (پێیان دەڵێن:) سەلامتان لێبێ، بەهۆی خۆڕاگرییتانەوە (ئەم مەنزڵگاو سەرەنجامەی ئێوە) کە چاکترین سەرەنجام‌و مەنزڵگەیە (بە قسمەتتان بووە) (٢٤) بەڵام ئەوانەی پەیمانی خوا پاش پتەوکردنی، دەشکێنن‌و، ئەوەی کە خوا فەرمانی بە گەیاندنی کردوە، دەیبسێنن‌و، تێکدان لە زەمیندا دەکەن، ئەوانە نەفرینیان لێیەو، خراپترین مەنزڵگایان جێیە (٢٥)}

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(يُوفُونَ): (الوَفَاءُ: ضِدُّ الغَدْرِ، وَفَى بِعَهْدِهِ وَفَاءً، وأَوْفَى، وَفَى الشَيءُ: تَمَّ وكَثُر)، (وفاء) پێچەوانەی غەدرە، غەدر یانی: پەیمان و بەڵێن شکێنیی، دەگوترێ: (وَفَى بِعَهْدِهِ وَفَاءً ، وأَوْفَى بِعَهْدِهِ وَفَاءً)، واتە: بەڵێن و پەیمانەکەی خۆی بردەسەر، ئنجا دەگوترێ: (وَفَى الشيءُ أي: تَمَّ وَكَثُر)، واتە: ئەو شتە تەواو بوو، زۆر بوو

(بِعَهْدِ ٱللَّهِ)، بە پەیمان و بەڵێنی خوا، (العَهْدُ: الأَمَانُ وَالـيَمِينُ وَالـمَوْثِقُ وَالذِّمَّةُ)، (عهد): بە مانای (أمان) دێ، کەسێك کەسێك پەنا بدات و، بە مانای سوێند دێ و، بە مانای شتێکی پتەویش دێ و، بە مانای ئۆباڵداریێتیی دێ، یەکێك بە یەکێك دەڵێ: ئۆباڵت بە گەردنم.

(وَلَا يَنقُضُونَ ٱلْمِيثَٰقَ)، دەگوترێ: (نَقَضَ البِنَاءَ، والحَبْلَ والعَهْدَ)، بینایەکە، یان دیوارەکە، یاخود پەتەکە، یان پەیمانەکەی هەڵوەشاندەوە، هەموویان وشەی (نقض)یان بۆ بەکاردێت، (الإِنْتِقَاضُ: الإِنْتِكَاثُ)، (إِنْتِقَاض): بریتییە لە شیکردنەوەو شکنرانەوەی شتێك کە ڕێسترا بێ و چنرابێ

(المِيثَاقُ: العَهْدُ والجَمْعُ: مَوَاثِيق، عَقْدٌ مؤكَّدٌ بِيَمِينٍ وَعَهْدٍ)، وشەی (میثاق) کە بە (مَوَاثِيق)، کۆدەکرێتەوە، یانی: بەڵێن و بە گرێبەست و بەڵێنێك کە جەختی لەسەر کرابێتەوە، بەهۆی سوێند لەسەر خواردن و، پەیمان لەسەر دانەوە، بۆ ئەوە بەکاردێ .

(عُقْبَى ٱلدَّارِ): (العُقْبُ والعُقْبَى: يَخْتَصّان بالثَّوابِ وكَذا العَاقِبة)، وشەی (عُقْب) و (عُقْبى) و (عاقِبة)، هەموویان تایبەتن بە پاداشتەوە، واتە: سەرەنجامی چاك

(سُوٓءَ ٱلْحِسَابِ )، لێپرسینەوەی خراپ، کە ئاوا پێناسە کراوە: (مايَحْفُ بالْحِسا ـ مِنْ إغْلاظٍ وإهانَةٍ لِلْمُحَاسَبِ).

بێگومان لێپرسینەوەی خوا بۆ بەندەکانی لە ئەسڵدا شتێکی باشە، چونکە بەهۆی ئەوەوە دادگەریی دەچەسپێ، چونکە خراپەکاران سزایان دەدرێ‌و، چاکەکاران پاداشتیان دەدرێتەوە، بەلاّم (سُوٓءَ ٱلْحِسَابِ )، بە نسبەت ئەو کەسەوە کە لێی دەپرسرێتەوە ئەگەر بە زبریی ڕیسوا بکرێ‌و، ئەزیەت بدرێ، لە کاتی لێپرسینەوەدا، ئەوە پێی دەگوترێ: (سُوٓءَ ٱلْحِسَابِ )، واتە: لێپرسینەوەیەکی خراپ، کە بۆ بابای لێپرسراوە، خراپە، ئەگینا لە ئەسڵدا، لێپرسنەوەی خوا بۆ بەندەکانی شتێکی باشە .

# مانای گشتی ئایه‌ته‌كان

له‌م حه‌وت ئایه‌ته موباره‌كه‌دا، خوا ﷻ ده (١٠) له سیفه‌ته بنه‌ڕه‌تیی‌و گه‌وره‌و گرنگه‌كانی ئه‌و به‌ندانه‌ی كه هیچ ناوونیشانێكی بۆ دانه‌ناون، به‌ڵام به سه‌رنجدانی نێوه‌ڕۆكی سیفه‌ته‌كان‌و، ئایه‌ته موباره‌كه‌كان، كه ئه‌و (١٠) سیفه‌تانه ده‌گرنه خۆیان، بۆمان ده‌رده‌كه‌وێ كه مه‌به‌ست پێیان ، به‌نده بڕواداره‌كان‌و پارێزكاره‌كان‌و بۆ خوا صوڵحاوو شایسته‌كانن .

له چه‌ند شوێنێكدا خوا ﷻ له سووره‌ته مه‌ككییه‌كاندا، پێناسه‌ی به‌نده‌كانی خۆی ده‌كات

١/ ئه‌مه یه‌كێكه له‌و شوێنانه، كه به (١٠) سیفه‌ت، پێناسه‌ی ئه‌و به‌ندانه‌ی خۆی ده‌كات، كه له‌لای په‌سندو شایسته‌ن

٢/ هه‌روه‌ها له سووره‌تی (المؤمنون)دا، به نۆ (٩) سیفه‌ت پێناسه‌یان ده‌كات

٣/ له كۆتایی سووره‌تی (الفرقان)دا، به دوازده (١٢) سیفه‌ت پێناسه‌یان ده‌كات

٤/ هه‌روه‌ها له سووره‌تی (الشورى)دا، دیسان به ده (١٠) سیفه‌ت پێناسه‌یان ده‌كات

هه‌روه‌ها له چه‌ند جێیه‌كی دیكه‌شدا، خوای كارزان ویستوویه‌تی هه‌ر له‌و سه‌ره‌تایه‌وه كه له قۆناغی مه‌ككه‌دان، پێغه‌مبه‌ر ﷺ و هاوه‌ڵانی به‌ڕێزی په‌روه‌رده بكرێن‌و، برازێندرێنه‌وه به‌و سیفه‌ت‌و خه‌صڵه‌ته گه‌وره‌و گرنگانه‌ی كه كه‌سایه‌تیی ئینسانی مسوڵمانیان لێ پێك دێ، چونكه بێگومان سه‌ره‌كیترین جیاوازیی نێوان بڕواداری بێبڕوایه‌ك، مسوڵمان‌و نامسوڵمانێك، ئه‌وه‌یه كه بابای بڕوادار، چ پیاو بێ، چ ئافره‌ت، چ زانابێ، چ نه‌زان بێ – به‌و واتایه كه شارەزایی‌و خوێنده‌واریی نه‌بێ – بابای بڕوادار ڕازاوه‌یه به سیفه‌ته به‌رزو جوانه‌كان، به

پێچەوانەی مرۆڤی بێبڕواوە، هەرچەندە زاناو شارەزاش بێ، بەڵام ئەو خەسڵەتو سیفەتە بەرزو جوانانەی کە بڕواداران خۆیانیان پێ دەڕازێننەوە، لەواندا نین، جاری واش هەیە بابای بێبڕوا، ئەو سیفەتانەی کە خوا لە فیترەتو سروشتی هەر مرۆڤێکدا دایناون، لە خۆیدا دەیانپارێزێو، خۆی بە سیفەتی جوان دەڕازێنێتەوە، بەڵام هەرچۆن بێ، ئەوەی کە دەتوانێت بە شێوەیەکی گشتگیرو فراوان، خۆی بڕازێنێتەوە بە سیفەتە بەرزو جوانەکانو، لە سەریشیان بەردەوام بێو، لە هەموو حاڵاندا پێشیانەوە پابەندبێ، تەنیا بڕواداره .

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿أَفَمَن يَعۡلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ كَمَنۡ هُوَ أَعۡمَىٰٓ﴾، واتە: ئایە ئەو کەسەی کە دەزانێت ئەوەی بۆ لای تۆ لە پەروەردگارتەوە نێردراوەتە خوار هەقە، وەك ئەو کەسەوایە کوێرە، کەواتە :

<u>یەکەمین سیفەتی</u> مرۆڤی بڕوادارو بۆ خوا صوڵحاوو شایستە، ئەوەیە کە زانیاریی هەیە، زانیاریی هەیە بەو حەقەی کە لە پەروەردگاریەوە بۆ موحەممەد ﷺ گۆتا پێغەمبەری خوا دابەزێنراوە، دیارە زانیاریی هەبوون بە قورئان، بە پەیامی خواش، تەنیا ئەوە نیە، بڵێ: من دەزانم قورئان هەقە، بەڵکو دەبێ لێی وردبێتەوە لێی تێبگات، پێیدا قووڵبێتەوەو بە بەڵگە دڵنیایی بۆ پەیدا بێ، ئنجا ئەوە پێی دەگوترێ: عیلمی هەیە، بە هەقێتیی کتێبی خوا، ئەگەرنا هەموو بڕوادارێك کە بڕوای بەوە هەیە : کە قورئان لە خواوە بۆ پێغەمبەر (محمد) ﷺ دابەزێندراوە، بە شێوەیەکی گشتیی دەگوترێ : زانیاریی هەیە بە هەق بوونی قورئان، بەڵام بە ڕاستیی زانیاریی تەواو بە حەق بوونی قورئان، کە لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ موحەممەد ﷺ نێردراوە، تەنیا بۆ کەسانێك دەستەبەر دەبێ کە باش لە قورئان تێبگەنو، پێیدا قووڵ ببنەوەو لێی شارەزابن .

بێگومان مرۆڤ تاکو زیاتر سەرنجی قورئان بداو لێی تێبگات، زیاتر حەقانیەتی قورئانی بۆ دەردەکەوێو، زیاتر لەو ڕاستییە دڵنیا دەبێ، کە ناگونجێ جگە لە خوا ﷻ هیچ کەسی دیکە ئەو قورئانەی فەرمووبێ .

ئنجا لێرەدا خوا ﷻ کەسێك کە دەزانێ قورئان هەقە لە پەروەردگاریەوە بۆ موحەممەد ﷺ دابەزێنراوە، بەراوردی دەکات لەگەڵ بابای بێ بڕوادا، بەڵام دەفەرموێ: ﴿كَمَنْ هُوَ أَعْمَىٰٓ﴾، واتە: کەسێك کە کوێرە، چونکە لە ڕاستییدا زانیاریی بریتیە لە بینایی ئینسان، هۆی بینینی ئینسان، هەروەك نەزانییش بریتیە لە کوێریی مرۆڤ، کە ڕاستییەکان نابینێ .

<u>سیفەتی دووەم</u> : دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ﴾، بێگومان تەنیا خاوەن عەقڵان بیردەکەنەوە، بیریان دێتەوە، پەند وەردەگرن

وشەی (تَذَكُّر) وەك لە مەسەلە گرنگەکانیشدا باسی دەکەین، لەسەر کێشی (تَفَعُّل)، واتە: وە بیر خۆ هێنانەوە، پەند وەرگرتن، شتێك کە مرۆڤ پێشتر زانیبێتی و ئێستا لێی بێ ئاگابووبێت و، بیهێنێتەوە بەر ئاوێنەی خەیاڵ و هۆشی خۆی .

ئنجا سیفەتی دووەمی ئەو جۆرە کەسانە، بریتیە لەوە کە خاوەن عەقڵن، کەواتە: ئەوانە هەم خاوەن عەقڵن و، هەم ئەهلی عیلمن

وشەی: ﴿ٱلْأَلْبَٰبِ﴾، کۆی (لُبّ)ە، کاکڵ، بەڵام ئەم وشەیە خوازراوەتەوە بۆ مانای عەقڵ، لەبەر ئەوەی مرۆڤ بە عەقڵەوە مرۆڤەو، عەقڵ و هۆش کاکڵی مرۆڤە، وەك چۆن گوێزێك بە کاکڵەکەیەوە گوێزە مرۆڤیش بە عەقڵەکەیەوە مرۆڤە .

<u>سیفەتی سێیەم</u> : کە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلْمِيثَٰقَ﴾، ئەوانەی کە پەیمانی خوا بەجێ دێنن و، پەیمان و بەڵێنی پتەوی خوا ناشکێنن و، هەڵی ناوەشێننەوە

پەیمانی خوا :

أ) دەگونجێ مەبەست پێی ئەو پەیمانە زگماکە بێ کە خوا ﷻ لە سروشتی هەر مرۆڤێکدا داینــاوە، کە بریتیە لە ناسینی خاوەن و پەروەردگارو بەدیهێنەری خۆی و، تەنیا پەرستنی

ب) دەشگونجێ مەبەست پێی ئەو بەڵێن‌و پەیمانە بێ، دوای ئەوەی مرۆڤ بڕوا بە خواو بە ئیسلام‌و بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دێنێ دێتە کایە

ج) دەشگونجێ مەبەست پێی هەموو ئەو پەیمانانە بێ، کە مرۆڤ دەیاندا بە ناوی خواوە، لە مامەڵەی لەگەڵ مرۆڤەکاندا، هەموویان دەگرێتەوە گرنگ ئەوەیە، ئەوانە پەیمانی خوا بەجێ دێنن‌و پێی وەفادار دەبن‌و، بەڵێن‌و پەیمانی پتەوی خوا، ناشکێنن‌و هەڵی ناوەشێننەوە

سیفەتی چوارەم: دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ ﴾، هەروەها ئەوانەی کە هەرچی خوا فەرمانی پێکردوە بگەیەنرێ، دەیگەیەنن، خوا فەرمانی کردوە بە گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی، پێش هەموو کەس: باب‌و دایك، ئنجا هاوسەر، ئنجا رۆڵە، ئنجا خزم، ئنجا دراوسێ، ... هتدو هەموو ئەوانەی کە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەی، واتە: پەیوەندییەکانی نیزیکیی‌و خزمایەتیی‌و کۆمەڵایەتیی

سیفەتی پێنجەم: دەفەرموێ: ﴿ وَيَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ﴾، سام لە پەروەردگاریان دەکەن.

وشەی (خَشْيَة) بریتیە لە لێ ترسان لەگەڵ بە گەورە گرتندا، یاخود: سام‌و بیم هەبوون بەرانبەر بە شتێك، بەهۆی بە گەورە گرتنی‌و بە مەزن گرتنییەوە، ﴿ وَيَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ﴾، سام‌و بیمیان بەرانبەر بە پەروەردگاریان هەیەو بە گەورەی دەگرن .

سیفەتی شەشەم: دەفەرموێ: ﴿ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلۡحِسَابِ ﴾، لە لێپرسینەوەی خراپ دەترسێن، لێپرسینەوەی خراپ، ئەوەیە کە مرۆڤ خراپەکاریی کردبێ‌و، پشتی لە خوا کردبێ، بێگومان دەبێ چاوەڕێی لێپرسینەوەیەکی خراپ بێ، کە بۆ ئەو خراپە، ئەگەرنا لێپرسینەوە کە سزاو پاداشتی بە دوا دادێ، لە خودی خۆیدا، شتێکی باشە

**سیفەتی حەوتەم:** دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِمۡ ﴾، ئەوانەی كە بۆ بەدەست هێنانی ڕووی پەروەردگاریان خۆڕاگر بوون، واتە: بۆ بەدەست هێنانی دیداری ڕووی پەروەردگاریان، یاخود (وجْه) لێرەدا بە مانای ڕەزامەندیی دێ، بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندیی پەروەردگاریان، دیارە خواش ﷻ تەنیا دەرفەت بە كەسانێك دەدات، لە ڕۆژی دوایی دا، تەماشای بكەن و، ڕووی بێ وێنەی ببینن، كە لێیان ڕازیی بێ، كەواتە: (وَجْه) چ بە مانای دیداری ڕووی خوا، یا بە مانای ڕەزامەندیی خوا، لێك بدرێتەوە، سەرەنجامەكەی هەر یەكە، ئەوانەی كە بۆ بەدەست هێنانی دیداری ڕووی خواو، ڕەزامەندیی خواو، پاداشتی خوا، خۆڕاگر دەبن، نەك بۆ ئەوەی پێیان بگوترێ: ئازان، (ما شاء الله) فلان كەس شانی واو باڵی وا !! نەء، تەنها بۆ ئەوە كە خوا لێیان ڕازی بێ و پاداشتی خوا بەدەست بێنن و، بە دیداری خوای پەروەردگاریان شادبن، بۆیە خۆڕاگر دەبن، خۆڕاگر دەبن لەسەر چی ؟

١/ لەسەر بەڵاو گرفتارییەكان

٢/ لەسەر طاعەت كە جێبەجێی بكەن

٣/ لەسەر گوناح كە دەستی لێ هەڵگرن

٤/ هەروەها لەسەر هەموو ئەو شتانەی كە پێویستە مرۆڤ خۆڕاگرییان لەبەردەمدا بكات.

**سیفەتی هەشتەم:** دەفەرموێ: ﴿ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، واتە: نوێژ بەرپا دەكەن، بەرێزان ! سەرنج بدەن !

نوێژ بەرپاكردن، لە قۆناغی هەشتەمدا باسكراوە، چونكە لە ڕاستییدا نوێژ، بەرهەمی گەلێك سیفەتی دیكەی پێش خۆیەتی، ئنجا ئەو نوێژە نوێژێكی ڕاستەقینە دەبێ، نەك كەسێك نوێژ دەكات، بەڵام سیفەتەكانی دیكە لە خۆیدا نەهێنێتەدی و لێیان خاڵیی بێ، ئەو كاتە ئەوە نوێژێكی بێ ڕووحە، نوێژێكی موونافیقانەو دەغەڵانەیە، یاخود نوێژێكی لاساییكەرەوانەو قرپۆكە .

﴿ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، نوێژ بەرپا دەکەن، واتە: بەو شێوەیە کە خوا فەرمانی پێکردوە، جێبەجێی دەکەن، چونکە (إقَامَةُ الشَّيء)، ئەوەیە شتێك ڕاست بکەیەوە، بەپێوە ڕایبگری، چونکە کاتێك کە شتێك ڕادەوەستێنری، بە پێوە ڕادەگیری، تەواوترین و باشترین حاڵەتی خۆیدا دەبێ، بۆیە خوا ﷻ هەمیشە بۆ ئەنجامدانی نوێژ، وشەی: (إقامة)ی بەکارهێناوە، (أقِم الصَّلاة، أقَامُوا الصَّلاة، يُقِيمُونَ الصَّلاة)، واتە: بەو شێوەیە کە خوا فەرموویەتی، نوێژ جێبەجێ دەکات.

سیفەتی نۆیەم : دەفەرموێ: ﴿ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً ﴾، لەوەی کە وەك بژێو پێماندراون، بە پەنهانیی و بە ئاشکرا دەبەخشن و خەرج دەکەن، نوێژ هەقی خوایەو، بەخشین هەقی خەڵکە

سیفەتی دەیەم: دەفەرموێ: ﴿ وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ ﴾، بە چاکە، خراپە پاڵ پێوەدەنێن، کەسێك خراپەیان لەگەڵدا بکات، ئەوان ناچن، وەك ئەو خراپە بکەنەوە، بەڵکو بە سیفەتی باش، ئەو خراپەیە پاڵ پێوەدەنێن، ئنجا جاری وایە، ئەو سیفەتە باشە، بریتیە لە بێدەنگیی و، جاری وایە ئەو سیفەتە باشە، بریتیە لە خۆڕاگریی و قسە پێنەگوتنەوەو، جاری وایە ئەو سیفەتە باشە، بریتیە لەوەی چاکەی لەگەڵدا بکەی، کە ئەو قسەی بە تۆ گوتوە، تۆ دوعای خێری بۆ بکەی، یان ئامۆژگاریی خێری بکەی، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴾، ئا ئەوانە سەرەنجامی مەنزڵگایان هەیە، کە بە تەئکید لێرەدا مەبەست لە سەرەنجام (عُقْبَى) واتە: سەرەنجامی چاك، (ٱلدَّارِ)یش (ال) ئەلیف و لامی پێوەیە، واتە: (الدار الآخرة)، یانی: سەرەنجامی چاکی مەنزڵگای دواڕۆژ، هی ئەو جۆرە کەسانەو خاوەنانی ئەو سیفەتانەیە .

دوایی ئەو سەرەنجامە چاکەی مەنزڵگای دواڕۆژ، ڕوون دەکاتەوە دەفەرموێ: ﴿ جَنَّٰتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا ﴾، چەند باغ و بێستانێکی هەمیشەیین، دەچنە نێویان و، تێیاندا نیشتەجێ دەبن، ﴿ وَمَن صَلَحَ مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ ﴾، خۆشیان و ئەوانەش کە شایستەن، لە باب و دایکیان و، لە هاوسەرانیان و، لە ڕۆڵەو وەچەکانیان، لەگەڵیاندا نیشتەجێ دەبن، لەو بەهەشتە ڕازاوەو نەبڕاوانەدا،

﴿ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَدۡخُلُونَ عَلَيۡهِم مِّن كُلِّ بَابٖ ﴾، فریشتەکانیش لە هەموو دەرگاو لە هەموو دەروازانەوە لێیان وەژوور دەکەون، ﴿ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡ ﴾، پێیان دەڵێن: سەلامتان لێ بێ، بەهۆی ئەوەوە کە خۆتان ڕاگرت، بەهۆی پشوو درێژیی و خۆڕاگریی و ڕاوەستاوییتانەوە، لەسەر جادەی شەریعەت، ﴿ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ﴾، ئا ئەو سەرەنجامە چاکەی ئێوە، باشترین سەرەنجامی مەنزڵگای دوارۆژە، پیرۆزباییان لێدەکەن و، سڵاویان لێدەکەن و، خۆش حاڵیی دەردەبڕن، بەوەی کە بەو ئاکام و سەرەنجامە باشە گەیشتوون

ئنجا خوا ﷻ لە ئایەتی ژمارە (٢٥)دا ئاماژەیەکی کورتیش دەکات، بەوانەی کە خراپەکارن، بەوانەی کە خۆش نەویستراون و لەلایەن خوای پەروەردگارەوە، ناپەسندن، بە سێ لە سیفەتە بنەڕەتییەکانیان پێناسەیان دەکات و، سەرەنجامیشیان دەخاتە ڕوو :

دەفەرموێ :

١) ﴿ وَٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ ﴾، بەڵام ئەوانەی کە : پەیمانی خوا، دوای ئەوەی کە پتەو کراوە، دەیشکێنن، دوای ئەوەی کە پەیمانەکە بە پتەویی بەستراوە، بە پتەویی لێیان وەرگیراوە، دەیپسێنن دەیشکێنن و، هەڵیدەوەشێننەوە

٢) ﴿ وَيَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ ﴾، ئەوەی کە خوا فەرمانی پێکردوە بگەیەندرێ، لە پەیوەندییەکان، ئەوان دەیبچڕێنن، ئەو پەیوەندییانە دەپچڕێنن ﴿ وَيُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، هەروەها لە زەمیندا خراپەکاریی دەکەن

بێگومان هەر کەسێك پەیمانی لەگەڵ خوا هەڵوەشاندەوەو، پەیوەندییەکانی لەگەڵ خەڵکدا دابڕین و پچڕاندنی، سەرەنجامەکەی هەر ئەوەیە کە خراپەکاریی بکات لە زەویدا، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴾، ئا ئەوانە نەفرینیان بۆ هەیەو، مەنزڵگای خراپیان بۆ هەیە، مەنزڵگای خراپ بێگومان مەبەست پێی دۆزەخەو، بەهۆی ئەوەوە کە لە ڕەحمەت و بەزەیی خوا دوور دەخرێنەوە، تووشی دۆزەخ دەبن .

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** سیفەتی یەکەمو دووەمی بەندە شایستەکانی خوا زانایی‌و دانایی، یاخود شارەزایی‌و عاقڵمەندیی‌و ژیرییە :

خوا دەفەرموێ : ﴿أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَىٰٓ ۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩﴾﴾

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە دوو بڕگەدا :**

**بڕگەی یەکەم :** - خوا دەفەرموێ: ﴿أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَىٰٓ﴾، ئەو هەمزە (أ)یەی کە چۆتە سەر (فَمَن)و بووە بە: (أَفَمَن) بۆ پرسیارکردنە، بەڵام پرسیارکردنی نکوولّیلێکەرانە (الإسْتِفْهامُ الإِنْكاري پرسیارکردنی نکوولّیلێکەرانەش، پێویستیی بە وەڵام ناکات، چونکە وەڵامەکەی لەنێو خۆیدایە، ئەگەر بڵێم: ئا ئەمە دەفتەر نیە؟ چاوەڕێ ناکەم، بەرانبەرەکەم بڵێ: با ئەمە دەفتەرە، چونکە ئاشکراو ڕوونە، ئەگەر بڵێم: ئایا ئەمە قورئان نیەو موصحەف نیە؟ وەڵامەکەی پێویست ناکات‌و چاوەڕێ ناکەم کەسێك بڵێ: با قورئانە، چونکە دیارە ئنجا خوا عز وجل لێرەدا دەفەرموێ: ئایا کەسێك کە دەزانێ ئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆ لای تۆ دابەزێنراوە، هەقە، وەك ئەو کەسە وایە کە کوێرە؟! وەڵامەکەی ئاشکرایە: بێگومان نەخێر، یەکسان نین .

هەڵبەت لێرەشەوە بۆمان دەردەکەوێ کە بەڕاستیی سیفەتی یەکەم، بۆ کەسانێك کە بیانەوێ دینداریی ڕاستو دروست بکەن، ئەوەیە کە شارەزابن لە وەحییو پەیامێك کە خوا دایبەزاندوە، بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ، کە بە پلەی یەکەم لە قورئاندا بەرجەستەیەو، وەك زۆر جاری دیکەش گوتوومانە: سوننەتی پێغەمبەریش ﷺ هەر بریتیە لە چۆنیەتی جێبەجێ کردنی قورئان، بەڵێ لە سوننەتدا، هەندێ حوکمو یاسا هەن کە بە ڕوونیی لە قورئاندا نینو، سوننەتیش بەگشتیی وەحیی خوایە بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەوەی کە بە ڕێكو ڕاستیی بە ئێمە گەیشتبێو، لێی دڵنیابین کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی، یان کردوویەتی، یان دانی پێدا هێناوە

بەڵێ یەکەمین خەسڵەتو سیفەتی کەسێك کە بیەوێ دینداریی ڕاستو دروست بکاتو، بەندەیەکی شایستەی خوا بێ، ئەوەیە کە لە وەدا خوا ناردوویەتە خوار بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ زانابێ، تێیدا شارەزابێ، لێی دڵنیایی کە ئەوە هەقەو لە پەروەردگارەوە بۆ پێغەمبەری خاتەم دابەزێنراوە، پێچەوانەی ئەویش، بریتیە لە کەسێك کە کوێر بێ، واتە: نابینا بێ، نەبینەر بێ، ئەو هەقە نەبینێو نەزانێ .

<u>برگەی دووەم</u>: - ﴿إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾، بێگومان تەنیا خاوەن عەقڵان بیریان دەکەوێتەوە، شارەزایانی زمان دەڵێن: (التَّذَكُّرُ: جَعْلُ الشَّيءِ مَذْكُوراً)، (ذِكر) بریتیە لە باسکردن، یاخود بریتیە لە ئەوە کە ئینسان شتێکی لە زەیندا ئامادەبێ، پێچەوانەی (ذِكر) بریتیە لە (نسیان) واتە: فەرامۆشکردنو لەبیرچوون، ئنجا (تذكُّر) لەسەر کێشی (تَفَعُّل)ە، واتە: هێنانەوە بیرخۆ، لە زەیندا ئامادەکردنی شتێك، بۆچی خوا ﷻ وشەی (تَذَكُّر)ی زۆر بەکارهێناوە؟ چونکە لە ڕاستییدا هەموو ئەو حەقیقەتانەی کە خوا ﷻ خستوونیە دوو توێی کتێبی کۆتایی خۆیەوە، لە فیطرەتو سروشتی مرۆڤدا دایناون، وەك ڕەگو ڕیشەو ئەصڵەکەیان، بۆیە هەر کەسێك فیطرەتو سروشتی تێك نەچوو بێ، کاتێك ڕاستییەکانی قورئان دەبیستێ، ڕاستییەکانی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، شەریعەتی خواو پێغەمبەری خوا دەبیستێ، هەست دەکات: پێیان ئاشنایە،

هەست دەکات کە ئەوەی بیستوویەتی دەیبستیّ‌و دەیبینیّ، شتێکە پەیوەندیی بە ناخی ئەویشەوە هەیە، بۆیە خوا ﷻ وشەی (تذکر) بەکاردێنیّ، مرۆڤ هەر ئەوەندەی دەویّ ڕاستییەکانی قورئان بخاتەوە بیرخۆی‌و، سەرنجیان بداتو، تێیانەوە ڕامێنیّ، ئەگەرنا ئەو ڕاستییانە، زگماك و فیطرەتی مرۆڤ، پێیان ئاشنایەو دەیانناسیّ.

کە خوا دەفەرمویّ : ﴿ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾، دیارە ﴿ إِنَّمَا ﴾ (أداةُ الحَصْرِ والإِثْبات)ە، ئامرازی کورتهەڵێنان‌و چەسپاندن، واتە: تەنیا خاوەن عەقڵان بیر دەکەنەوە، تەنیا خاوەن عەقڵان وەبیریان دێتەوە، تەنیا خاوەن عەقڵان پەند وەردەگرن‌و، بەهرەمەند دەبن لەو ڕاستییانەی کە لە قورئان دا هەن، لە فیترەت‌و ناخی ئەوانیشدا هەن، چونکە ئینسان ئەگەر عەقڵی خۆی بەکارنەهێنیّ‌و ڕانەمێنیّ‌و ورد نەبێتەوە، ڕاستییەکانی ناکەونەوە بیر، ئەو ڕاستییانەی کە لە قورئاندا هەن، ﴿ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾یش، ﴿ أُوْلُواْ ﴾، کۆیەو تاکی نیە واتە: (أصحاب)، خاوەنان، ﴿ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾ کۆی (لُبّ)ە و، (لُبّ)یش یانی : عەقڵ، ﴿ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾، یانی: خاوەنانی عەقڵان، خاوەن ئاوەزان، ڕاستییەکانیان بیر دەکەونەوەو، بەهرەمەند دەبن‌و پەندیان لیّ وەردەگرن .

**مەسەلەی [redacted] : سیفەتی سێیەم، بەجێهێنانی پەیمان‌و نەشکاندنی بەڵێنی پێدەوی خوا :**

وەك خوا عزّ وجل دەفەرمویّ: ﴿ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلْمِيثَٰقَ ﴿٢٠﴾ ﴾، بەندە شایستەکانی خوا، سێیەمین سیفەتی گەورەو گرنگیان، ئەوەیە کە پەیمانی خوا بەجێدێنن‌و، بەڵێن‌و پەیمانی پێدەو ناشکێنن .

(الوَفَاءُ بالعَهْدِ: أن يُحَقِّقَ المَرْءُ مَا عَاهَدَ عَلَى أَنْ يَعْمَلَهُ)، وەفاداریی بە پەیمان، پابەندیی بە پەیمانەوە، ئەوەیە کە مرۆڤ ئەوەی بەڵێنی داوە، جێبەجێی بکات.

کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ ﴾، ئەمە دوو واتایان هەڵدەگرێ :

١/ (عهد الله، مَصْدَرٌ مُضَافٌ إلى مَفْعُولِه)، بەمجۆرە: (مَا عَاهَدُوا اللهَ على فِعْلِه)، چاوگەو پاڵدراوەتە لای بەرکار (مَفْعُول) یانی: ئەوەی کە پەیمانیان بە خوا داوە ، ئەنجامی بدەن، ئەنجامی دەدەن

٢/ (عهدِ الله، مَصْدَرٌ مُضَافُ إلى فاعِلِه)، بەمجۆرە (ما عَهِدَ اللهُ بِه إليْهِم)، چاوگێکی پاڵدراوە بۆ لای بکەرەکەی، واتە: ئەوەی کە خوا ﷻ بۆ ئەوانی ڕەوانکردووەو، پەیمانی وەرگرتوە لێیان، کە دەبێ ئەنجامی بدەن، ئەنجامی دەدەن

کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلۡمِيثَٰقَ ﴾، دیارە کەسێك وەفاداربێ بە پەیمان، پەیمان ناشکێنێ، بەڵام ئەمە بۆ زیادە جەختکردنەوەیە، جاری وایە مرۆڤ لە سەرەتاوە وەفادار دەبێ بە پەیمان، بەڵام دوایی دەیشکێنێ، یانی: نایگەیەنێتە سەر، مەرج نیە هەر کەسێك لە سەرەتاوە وەفادار بوو بە بەڵێن و پەیمان، لە کۆتاییشدا هەر وابێ، واتە: ئەمانە لە سەرەتاو سەرەنجامدا هەر وەفادارن، بە بەڵێن و پەیمانی خواوە ﷻ .

پێشتریش باسمان کرد: پەیمانی خوا (عهد الله) :

١) دەگونجێ مەبەست پێی ئەو پەیمانە خوارسکە بێ کە مرۆڤ لێی وەرگیراوە، کە دەبێ خواو خاوەنی خۆی بناسێ و، بەندایەتیی بۆ بکات و بیپەرستێ

٢) هەروەها دەگونجێ مەبەست پێی حاڵەتی چوونە نێو ئیمان و ئیسلام بێ

٣) دەشگونجێ مەبەست پێی کۆی ئەو بەڵێن و پەیمانانە بێ، کە مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤەکانی دیکەدا، دەیاندا، دەبێ پێیانەوە پابەند بێ، واتە: هەموو ئەو گرێبەستانەی لە مامەڵەی لەگەڵ مرۆڤەکاندا، گرێیان دەدات، دەبێ نەیانبسێنێ و نەیانشکێنێ و پێیانەوە پابەند بێ

**مەسەلەی سێیەم :** سیفەتەکانی: چوارەم و پێنجەم و شەشەم، کە بریتین لە گەیاندنی ئەو پەیوەندییانەی خوا فەرمانی پێکردوون بگەیەنرێن و، سام و بیمیان بەرانبەر بە پەروەردگاریان و، مەترسییان لە لێپرسینەوەی خراپ لە ڕۆژی دوایدا :

خوای پەروەردگار دەفەرموێ : ﴿ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢١﴾ ﴾

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە ، لە سێ بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم :-** ﴿ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ ﴾، ئەمە سیفەتی چوارەمە: کەسانێك کە ئەوەی خوا فەرمانی پێکردوە بگەیەنرێ، دەیگەیەنن، کە مەبەست هەموو ئەو پەیوەندییانەن، کە دەبێ کۆمەڵگایەکی تەندروست و ساغ، لە نێو خۆیدا ئەو پەیوەندییانە بگەیەنێ :

١/ پەیوەندیی نێوان ژن و مێردە

٢/ پەیوەندیی نێوان باب و دایك و ڕۆڵەکانە

٣/ پەیوەندیی نێوان خزمانە بە گشتی

٤/ پەیوەندیی نێوان دراوسێیەکانە

٥/ پەیوەندیی نێوان حوکمڕانان و خەڵك و کۆمەڵگایە

٦/ پەیوەندیی نێوان پێکهاتەکانی کۆمەڵگایە، بۆ نموونە هەژار و دەوڵەمەندن

٧/ پەیوەندیی نێوان کۆی ئەو توێژانەیە کە کۆمەڵگایان لێ پێکدێ

٨/ پەیوەندیی نێوان مسوڵمانان و نامسوڵمانانە لە کۆمەڵگایەکدا، ئەوانە هەموویان دەگرێتەوە، بەندە شایستەکانی خوا ئەوانەن کە هەموو ئەو پەیوەندییانەی خوا فەرمانی پێکردوە بگەیەندرێن، دەیانگەیەنن

**برگەی دووەم :** - ﴿ وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ﴾، ئەمەش سیفەتی پێنجەمە: سامو بیمێکی بە گەورە گرانەو بە مەزن گرانەیان هەیە، بەرانبەر بە پەروەردگاریان واتە: لە پەروەردگاریان دەترسێنو سامو بیمیان بەرانبەری هەیە، بەهۆی بە مەزن گرتنیانەوە بۆی، چونکە دەڵێ: (الخَشْيَة: الخَوْفُ المَشُوبُ بتَعْظيمٍ)، (خَشْيَة) ترسێکە کە ئاوێتەیە لەگەڵ بە مەزن گرتندا، زۆر کەس لە مانای لە خوا ترساندا، بەهەڵەدا چووە، لە خوا ترسان، ئەوە نیە خوا وەك شتێکی مەترسیلێکراو بێ، بەڵکو لە خوا ترسان ئەوەیە کە تۆ لەبەرئەوەی خوا زۆر مەزنە، زۆر بەرزە، زۆر گەورەیە، زۆر دادگەرە تۆ لە کردەوەکانی خۆت دەترسێی کە خوا ﷻ بە پێی کردەوەکانی خۆت مامەڵەت لەگەڵدا بکاتو، سزات بداتو، تووشی سزاو ئازارو چەرمەسەریی ببی، ئەگەرنا خوا ﷻ لە زاتی خۆیدا: خۆشویستراوو بە مەزن گیراوو بە گەورە گیراوەو مل بۆ کەچکراوە

**برگەی سێیەم :** - ﴿ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلْحِسَابِ ﴾، ئەم ڕستەیە سیفەتی شەشە دەگرێتە خۆی :

لە لێپرسینەوەی خراپ دەترسێن، لێپرسینەوەی خراپ وەك پێشتریش باسمان کردوە، لێپرسینەوەی خوا بۆ بەندەکانی لە خودی خۆیدا چاکە، بەڵام لێپرسینەوەی خراپ ئەوەیە، بۆ ئەو کەسە خراپ بێ، ئەو لێپرسینەوەیەی لەگەڵدا بکرێ، کەسێکیش لێپرسینەوەیەکی لەگەڵدا دەکرێ، بۆی خراپ بێ، کە لاڕێو خراپەکارو تاوانبار بێ .

ئنجا کە لێرەدا دەفەرموێ : ﴿ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ ﴾، دەمەوێ تۆزێك شی بکەمەوە :

(الوَصْلُ: ضَمُّ شيءٍ لِشَيءٍ، وَضِدُّهُ : القَطْعُ، وَيُطْلَقُ مَجَازاً على القُرْبِ وَضِدّهُ : الهجر واشتهر مجازاً، أيْضاً فِي الإحْسانِ والإكْرامِ وَمِنْهُ: صِلَةُ الرَّحِمِ

واتە: (وصل) ئەوەیە کە شتێك بە شتێکەوە بنووسێنرێ، کە پێچەوانەکەی بریتیە لە (قطع) واتە: بڕین، هەروەها بە شێوەی مەجاز بە مانای نیزیکی بەکاردەهێنرێ، کە پێچەوانەکەشی بریتیە لە دووریی لێکردن، هەروەها بە

مەجاز وشەی (وصل) بەکارهێندراوە بۆ چاکەکاریی و ڕێز لێگرتن، وشەی: (صلة الرحم) واتە: گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی، لەوەوە هاتووە .

ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ ﴾، وەك تەفسیرمان کرد، چەمکەکەی گشتییەو هەموو ئەو پەیوەندییانەو ئەو نیزیکییانەی، کە خوا فەرمانی کردوە بگەیەنرێن، دەگرێتەوە .

**مەسەلەی چوارەم : سیفەتەکانی: حەوتەم و هەشتەم و نۆیەم و دەیەم :** بریتین لە : خۆڕاگریی لەبەر ڕەزامەندیی خواو، بەدەستهێنانی دیداری خواو، بەرپاکردنی نوێژو، بەخشینی ماڵ و سامان بە ئاشکراو بە پەنهان و، بەرپەرچدانەوەی خراپە بە چاکە :

خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ وَٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ .... ﴿٢٢﴾ ﴾

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە چوار بڕگەدا :**

**بڕگەی یەکەم :** - ﴿ وَٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ ﴾، سیفەتی حەوتەم: بەندە هەڵبژاردەکانی خوا، بەندە شایستەو پەسندەکانی خوا، ئەوانەن کە خۆیان ڕاگرتووە بەمەبەستی وەدەستهێنانی ڕووی پەروەردگاریان، واتە: دیداری ڕووی پەروەردگاریان، یان مەبەست لە ڕوو (وَجه) ڕەزامەندییە، واتە: بە مەبەستی وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی پەروەردگاریان .

وشەی (ٱبْتِغَآءَ) [١] یانی: (طَلَب) داواکردن، کەواتە: ئەوانە خۆڕاگرن و خۆڕادەگرن و ئەهلی صەبرن، بەڵام خۆڕاگریی و پشوو درێژیی و ڕاوەستاوییەکەیان، بە هاندەری وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خواو دیداری خوایەو،

١) الإبتغاء : إفتعالٌ من (بَغى : طَلَب) کەواتە : (ابتغاء) یانی : لێ خەفتان ، هەوڵ بۆدان .

ئەوەیان کردۆتە ئامانج: کە لە ئەنجامی ئەو خۆڕاگرییەدا، خوا لێیان ڕازی بێ‌و بە دیداری شادبن، واتە: لەبەر ئەوەی خوا ﷻ فەرمانی کردوە بە خۆڕاگریی، خۆڕادەگرن، نەك بۆ مەبەستێکی دیکە، وەك ئەوەی خەڵك بڵێن: ئازان، یان مەدحیان بکرێ‌و، یاخود لەبەر ئەوەی زەمیان نەکرێ، لەبەر بێ صەبریی، بەڵکو هاندەرو پاڵنەریان بۆ خۆڕاگریی، بریتیە لە وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا، هەڵبەتە هەموو کردەوەکانی مرۆڤ ، ئەگەر بەو هاندەرە پاڵنەرە نەبن‌و، ئەگەر بەمەبەستی ئامانجی ڕازیبوونی خواو، وەدەستهێنانی پاداشتی پەروەردگارە خاوەنەکەیان، نەبن، پاداشتیان لە بەرانبەردا وەرناگرێ‌و دەبێتە سەمپانی[1] پووشێ.

بڕگەی دووەم : ﴿ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، سیفەتی هەشتەم: ئەوانەی کە نوێژیان بەرپا کردوە، پێشتریش باسمان کرد کە لە قورئاندا تەنیا وشەی (أقام) بۆ نوێژ (صلاة) بەکارهاتوە واتە: بۆ بەجێهێنانی نوێژ وشەکانی: (أقام، یقیم، أقم، یقیمون، أقاموا) بەکارهاتوون، (أقاموا الصلاة) یانی: نوێژیان بەرپا کردوە، بۆیەش ئەو وشەیە بەکاردێ، چونکە هەر شتێك کاتێك لە حاڵەتی وەستان‌و ڕاوەستاندا دەبێ، بۆ وێنە: مرۆڤ، ئەوە تەواوترین حاڵەتیەتی لە باشترین حاڵەت‌و دیمەنی خۆیدا قەرار دەگرێ، کەواتە: (أقاموا الصلاة) واتە: نوێژەکە ئەنجام دەدەن، بەو شێوەیە کە خوا فەرمانی پێکردوە، ئەنجام بدرێ، نەك هەر لە کۆڵ خۆیانی بکەنەوە، بەڵکو مافی تەواو بە ڕواڵەت‌و دەروونی نوێژەکەیان دەدەن :

أ) ڕواڵەتی نوێژەکەیان، وەك قورئان خوێندن‌و زیکرەکانی نێو نوێژو، جموجۆڵەکانی نوێژ بە تەواویی بەجێ دەگەیەنن، ئارامیان تێدا دەگرن، هەروەها نوێژەکە لە کاتی خۆیدا دەکەن‌و، نوێژەکان بە کۆمەڵ دەکەن‌و، لە شوێنی پاکدا دەیکەن .

---

١) واتە : بێ بەرهەم دەبێ، چونکە (سەپان) بابای جوتیار (فَلاّح)ە. جوتیارێك هیچ بەرهەمی نەبێ جگە لە پووش و پەڵاش. ڕەنج بەخەسار بووە

ب) مافی نێوەوەی نوێژەکەشیان دەدەن، نێوەرۆکی نوێژەکەشیان دێننە دی، وەك: ملکەچیی بۆ خوا، بیرکردنەوە لە مانای ئەو ئایەتانەو ئەو وشە موبارەکانە ■ لە نوێژەکەدا دەگوترێن، ئنجا دوای نوێژەکەش خۆپاراستن لە هەر شتێك کە پێچەوانەی نوێژ بێت و، لەگەڵ نوێژدا تێك بگیرێ. ئەوە نوێژ بەرپاکردنەو، ئەوە مافی خۆی بە نوێژ دانە .

**برگەی سێیەم :** - ﴿ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً ﴾، سیفەتی نۆیەم : لەوەی کە پێمانبەخشیون، بە پەنهان و بە ئاشکرا، سامان و ماڵی خۆیان بەخشیوە، مەگەر چۆن دەنا لە قورئاندا هەمیشە نوێژو زەکات پێکەوە دێن: ﴿ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾، هەروەها نوێژو ماڵ بەخشین پێکەوە دێن، لەبەر ئەوەی نوێژ، هەقی خوای پەروەردگارەو، ماڵ بەخشین، هەقی خەڵکە، ئیسلامیش لەو دوو وشەیەدا کورت دەبێتەوە : خواپەرستیی و خەڵك دۆستیی

**برگەی چوارەم :** - ﴿ وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ ﴾، سیفەتی دەیەم : بە چاکە خراپە پاڵپێوە دەنێن ، واتە: کەسێك خراپەیەکیان لەگەڵ دەکات، ئەوان ناچن وەك ئەو کەسە خراپە بکەنەوە، بەڵکو بە چاکە ئەو خراپەیە دەفع دەکەن و پاڵ پێوە دەنێن، لە بەرانبەر خراپەدا چاکە دەکەن، هەڵبەتە دەشگونجێ مەبەست ئەوە بێ: کە ئەگەر خراپەیەکیان لە دەست قەوما، بە چاکە ئەو خراپەیە لە کۆڵ خۆیان دەکەنەوە، کە لە هیچ کام لە تەفسیرەکاندا ئەوەم نەبینیوەو ئێستا هاتە دڵم، کە مەرج نیە لێرەدا تەنیا مەبەست ئەوە بێ: لە مامەڵە لەگەڵ خەڵکدا، لە بەرانبەر خراپەیاندا، چاکە دەکەن، بەڵکو دەشگونجێ لە مامەڵە لەگەڵ خۆیاندا، هەر کاتێك خراپەیەکیان لێ قەوما، وشەیەکی خراپیان بە دەمدا هات، نیازو خولیایەکی خراپیان لە دڵ گەڕا، یان کردەوەیەکی خراپیان ئەنجامدا[1]، بە دوای دا چاکەیەك دەکەن، بۆ ئەوەی بەو چاکەیە، کاریگەریی نەرێنیی خراپی ئەو خراپەیە، دەفع بکەن و پاڵ پێوەبنێن و،

---

١) کە ئەمیش دەگونجێ لە کاتی مامەڵەیان لەگەڵ خەڵکدا، یان لە خودی خۆیان دا بێ

دووری بخەنەوە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە، فەرموویەتی: {وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا}، (أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (٢١٣٥٤)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: ١٩٧٨)، وَالدَّارِمِيُّ بِرقم : (٢٨٣٣)، وَحَسَّنَهُ الألباني}، واتە: بە دوای خراپەدا چاکە بکە، دەیسڕێتەوە

کەواتە : ئەوانە بوونە (١٠) سیفەتو خەسڵەتی بنەڕەتیی و بنچینەیی، کە خوا ﷻ بەندە زاناو دانایەکانی خۆی، بەندە شارەزاو عاقڵمەندەکانی خۆی، پێ پێناسە کردوون .

**مەسەلەی پێنجەم :** ئەنجامی خاوەنانی ئەو دە (١٠) سیفەتانە، بریتیە لە ئاکام خێریی، ئەویش نیشتەجێبوونە لە بەهەشتەکانی خوادا، لەگەڵ باب و دایکانیان و، هاوسەرانیان و ڕۆڵەکانیاندا :

خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ٢٢ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَدۡخُلُونَ عَلَيۡهِم مِّن كُلِّ بَابٖ ٢٣ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ٢٤﴾

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە لە حەوت بڕگەدا :**

**بڕگەی یەکەم :-** لە کۆتایی ئایەتی ژمارە (٢٢)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عُقۡبَى ٱلدَّارِ﴾، ئا ئەوانە سەرەنجامی چاکی مەنزڵگای دوارۆژیان هەیە، (العُقْبَى: العَاقِبة، وَهِيَ الشَّيءُ الَّذِي يَعْقُبُ أي: يَقَعُ عَقِبَ شيءٍ آخر، وَقَدْ اشْتَهَرَ اسْتِعْمَالُها فِي آخِرةِ الخَيرِ: والعَاقِبة لِلْمُتَّقِين، والعَاقِبة للتَّقْوى)، وشەی (عُقْبَى) بریتیە لە شتێك کە بەدوای شتێکدا دێ، لە دوای وی دەبێ و، وشەی (عُقْبَى) زیاتر بۆ ئاخیر خێری بەکاردێ، بۆ ئەوە کە لە دوارۆژدا ئینسان خێرو چاکەی بە قسمەت ببێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ ١٢٨﴾الأعراف:

دەفەرموێ: سەرەنجام (كە مەبەست پێی سەرەنجامی چاكە) بۆ پارێزكارانە، هەروەها دەفەرموێ : ﴿ وَٱلْعَـٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ ﴿١٣٢﴾ ﴾طـه. سەرەنجام (سەرەنجامی خێر) بۆ پارێزكارییە .

كەواتە: ﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ لَهُمْ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴾، یانی: سەرەنجامی چاكی ڕۆژی دوایی‌و مەنزڵگای دوایی، لە گرەوی ئەو جۆرە كەسانەدایە كە خاوەنی ئەو (١٠) سیفەتەن

ئنجا دوایی خوا ﷻ پێناسەی ئەو عاقبەت خێریی‌و ئەو سەرەنجامە چاكە دەكات، دەفەرموێ :

<u>برگەی دووەم</u> : - ﴿ جَنَّـٰتُ عَدْنٍ ﴾، بەهەشتە هەمیشەییەكان، (جَنَّـٰتُ) كۆی (جَنَّة)ە، واتە: باخ‌و بێستان، دارو درەخت‌و سەوزایی‌و میوەجات

(عَدْنٍ) بە مانای (إسْتِقْرار) دێ، (الْعَدْنُ: الإسْتِقْرارُ) واتە: بەهەشتە هەمیشەییەكان، بەهەشتە سەقامگیرە بەردەوامەكان، باخە سەقامگیرو بەردەوامەكان، ئەو سەرەنجامە خێرە پێكدێنن

<u>برگەی سێیەم</u> : - ﴿ يَدْخُلُونَهَا ﴾، دەچنە نێو ئەو باخانە

<u>برگەی چوارەم</u> : - ﴿ وَمَن صَلَحَ مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّـٰتِهِمْ ﴾، هەروەها هەر كەسێك كە شاسیتە بێ‌و چاك بێ، لە باب‌و دایكانیان‌و هاوسەرانیان‌و ڕۆڵە‌و وەچەیان .

وشەی (آباء) بابەكان، (أُمهات) دایكەكانیش، دەگرێتە خۆی، (الآباء يَشْمُلُ الأُمَّهاتِ على طَرِيقَةِ التَّغْلِيب) وشەی (آباء) (أُمَّهات)یش، دەگرێتە نێو خۆی، چونكە لە زمانی عەرەبییدا بنچینەیەك هەیە: هەر كاتێك نێرومێ پێكەوە باسكران، ڕاناوی نێرینە بەكاردێ‌و، مێینەش دەگرێتەوە. لە زمانی عەرەبییدا دەگوترێ: (الأَبَوَيْن، الأَبَوَان، الوَالِدَيْن، الوَالِدَان)، كە (أَبَوَيْن)، واتە: باب‌و دایك (وَالِدَيْن) واتە: باب‌و دایك، (أَبَوَيْن) دووان، (مُثَنّى)ی، (أَب)ە‌و (والِدَيْن) دووان،

(مُثنّى)ی (والِد)ەو، (أَبُ و والِد) هەردووکیان بە مانای باب دێن، بەڵام بۆ دایکیش بەکاردێن، بە بەڵگەی ئەوە کە لێرەدا کراوە بە دوو، کە مەبەست ئەوە نیە دوو باب بن، بەڵکو مەبەست پێی بابو دایکن

خوا دەفەرموێ : خۆیانو ئەوانەی کە شایستەن لە بابو دایکیانو هاوسەرانیانو وەچەکەیان، دەچنە نێو ئەو بەهەشتانەوە

ئەمە وەك ئایەتەکەی سوورەتی (الطّور) وایە ﷺ دەفەرموێ : ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَآ أَلَتْنَٰهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَيْءٍۚ كُلُّ ٱمْرِيِٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٞ ﴿٢١﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوەو وەچەکەشیان بە ئیمانەوە شوێنیان کەوتوون، ئێمە وەچەکایانیان دەگەیەنینە، ئەوانو بەوانیان پەیوەست دەکەینو، لە کردەوەی ئەوانیش کەم ناکەینەوە (بیخەینە سەر پاداشتو کردەوەی وەچەکەیان، بۆ ئەوەی پێیان بگەن)، بەڵکو خوا لە بەخششی خۆی، رۆڵەکان دەگەیەنێ بە بابو دایکەکان، ﴿ كُلُّ ٱمْرِيِٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٞ ﴾، هەر کەسە بارمتەی کردەوەکانی خۆیەتی .

هەڵبەتە لێرەدا تەنها باسی وەچە دەکات، بەڵام لە سوورەتی (الرعد)دا، هەروەها لە سوورەتی (غافر)یشدا، باسی بابو دایكو هاوسەرانو وەچەش دەکات

ئە ئایەتانەش ئەوە دەگەیەنن کە لە بەهەشتێدا، مرۆڤ لەگەڵ هاوسەری، لەگەڵ بابو دایکی، لەگەڵ ڕۆڵەکانی، پێکەوە کۆدەبنەوە، ئنجا وشەی (آباء) وەك چۆن بابو دایکی نزیك دەگرێتەوە، بابو دایکی دووریش دەگرێتەوە، واتە: ئەنكو باپیرو ... هتد، هەروەها وشەی: (ذُرِيَّة)یش وەك چۆن کوڕو کچ دەگرێتەوە، نەوەو نەوەی ئەوەش دەگرنەوە، وشەی: (أَزْوَاج)یش کۆی (زَوْج)ە، کە هەم بۆ نێرو هەم بۆ مێ بەکاردێ، جا بەپێی ئەم ئایەتانە بێ: خوا ﷻ ئەوانەی کە نزیکایەتیی ڕەچەڵەکیان پێکەوە هەیە، لە بەهەشتدا مادام هەموویان ئەهلی ئیمانن، پێکیان دەگەیەنێو، ئەگەر هەندێکیان لە خوارێ بن،

خوای پەروەردگار لە بەخششی خۆی ئەوانەی خوارێ دەباتە لای ئەوانی سەرێو پلەیان بۆ بەرز دەکاتەوە، بەبێ ئەوەی لە پاداشتو کردەوەی ئەوانەی شوێنیان بەرزە، کەم بکاتەوە .

**برگەی پێنجەم :-** ﴿وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ﴾، فریشتەکانیش لە هەموو دەرگایەکەوە لێیان وەژوور دەکەون، لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە فریشتەکان، زۆر دەچن بۆ لایانو زۆر لێیان وەژوور دەکەون، کە دوایی دەریدەخات بۆچی زۆر دەچنە لایان .

**برگەی شەشەم :-** ﴿سَلَٰمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ﴾، پێیان دەڵێن: سڵاوتان لێبێ بەهۆی خۆڕاگرییتانەوە، یانی: ئەم ڕێزلێگیرانەی ئێوە، کە فریشتە سەلامتان لێدەکەنو لەو شوێنانەدا نیشتەجێ بوون، بەهۆی خۆڕاگرییو پشوو درێژییتانە، زۆر جار باسمان کردوە: خۆڕاگریی بەگشتیی دەبێتەوە سێ بەش، سێ جۆر :

١/ خۆڕاگریی لەسەر طاعەت، ئینسان فەرمانبەریی خوا بکات لە ژاتی خۆیو، لە چوار چێوەی ماڵو خێزانیو، لە چوار چێوەی کۆمەڵگادا، پابەندی شەریعەتی خوا بێو، خۆڕاگربێ لەسەر طاعەتو فەرمانبەریی خوا

٢/ خۆڕاگریی لەسەر گوناهو تاوانو لادان، خۆڕاگر بێ: تووشی گوناهو تاوان هەڵەو پەڵە نەبێ

٣/ خۆڕاگریی لەسەر بەڵاو موصیبەتو تاقیکردنەوەی خواو، ئارامگرتن لە بەرانبەر پێشهاتە ناخۆشەکانو ڕووداوو کارەساتەکان دا، ئەو شتانەی پێی ناخۆشن، لە بەرانبەر بەڵاو قەدەرە ناخۆشەکان دا خۆڕاگر بێ، سکاڵانەکاتو ناشوکریی نەکات

**برگەی حەوتەم :-** ﴿فَنِعْمَ عُقْبَى ٱلدَّارِ﴾، واتە: باشترین سەرەنجامی مەنزڵگای دواڕۆژ ئەم سەرەنجامەی ئێوەیە، یانی: (فَنِعْمَ عُقْبَى ٱلدَّارِ عُقْبَاكُم) باشترین سەرەنجامی مەنزڵگای دواڕۆژ، ئەم سەرەنجامەی ئێوەیە، کە بریتییە لە نیشتەجێ بوونتان لەو جێگاو ڕێگا پڕ ڕێزو حورمەتو نازو نیعمەتەدا .

**مەسەلەی شەشەم و کۆتایی : سێ (٣) سیفەتی بنەڕەتیی بێبڕوایان و سەرەنجامی شووم و بێ خێریان :**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴿٢٥﴾ ﴾

**تویژینەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە ، لە پێنج برگەدا :**

**برگەی یەکەم :** - ﴿ وَٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ ﴾، ئەوانەی کە پەیمانی خوا پاش پتەو کردنی و گرێدانی، دەشکێنن، پەیمانەکە هەڵدەوەشێننەوە

**برگەی دووەم :** - ﴿ وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ ﴾، هەرچی کە خوا فەرمانی پێکردوە بگەیەنرێ، ئەوان دەیبڕن، دەیپچڕن

(النَّقْضُ: الإِبْطَالُ وعَدَمُ الوَفَاءِ)، (نَقْض) بریتیە لە هەڵوەشاندنەوەو وەفادار نەبوون، واتە: هەموو پەیوەندییەکان کە خوا فەرمانی کردوە بگەیەنرێن، ئەوان دەیانپچڕێنن، چ پەیوەندیی نێوان ڕۆڵەو باب و دایک، چ پەیوەندیی هاوسەرێتیی، چ پەیوەندیی خزمایەتیی، هی دوورو نیزیک، چ پەیوەندیی دراوسێیەتی، تا کۆتایی .

**برگەی سێیەم :** - ﴿ وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، لە زەمیندا خراپەکاریی دەکەن، لەسەر زەوی خراپەکاریی و تێکدان دەکەن، بەدڵنیایی هەر کەسێک پەیمانێ کە لەگەڵ خوا بەستوویەتی، هەڵیوەشاندەوەو، پەیوەندییەکانی لەگەڵ خەڵکدا پچڕاندن، بێگومان سەرەنجامەکەی هەر بریتیە لە خراپەکاریی و تێکدان و ئاشووب نانەوەو ئاژاوە لەسەر زەوی

ئنجا کەسانێک بەو شێوەیەبن :

**بڕگەی چوارەم :** - ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ ﴾، ئا ئەوانە نەفرینیان بۆ هەیە، (اللَّعْنَةُ: البُعْدُ عَنِ الرَحْمَةِ والخِزْيُ)، (لعنة) بریتیە لە دووریی لە بەزەیی خواو لە سەرشۆڕیی‌و زەبوونیی .

**بڕگەی پێنجەم :** - ﴿ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴾، هەروەها ئا ئەوانە مەنزڵگای خراپیان بۆ هەیە، مەنزڵگای خراپیش بە تەئکید مەبەست پێی دۆزەخە، دۆزەخی پڕ ئاگری بڵێسەدار

خوا پەنامان بدات بە لوتفو کەرەمی خۆی، بەهۆی پارمەتییدانمان بۆ خۆ دورگرتن، لەو سیفەتانەی کە خاوەنەکانیان تووشی دۆزەخ دەکەن، کە بریتین لە بێ پەیمانیی‌و بێ بەڵێنیی لەگەڵ خواداو، پچڕاندنی پەیوەندییەکان لەگەڵ خەڵکی خواو، خراپەکاریی کردن لە سەرزەمینی خوادا

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

٥٢

# دەرسی پێنجەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان ئایەتەکانی: (٢٦ - ٣١) دەگرێتە خۆی، لەم شەش (٦) ئایەتەدا :

١/ سەرەتا : خوا ﷻ باسی ئەو ڕاستییە دەکات، کە فراوان کردنو گرتنەوەی بژیو، واتە: زۆرکردنو کەم کردنی ڕۆزییو بژیو، تەنیا بە دەست خوایە

٢/ هەروەها باسی زێدە دڵخۆش بوونی بێبڕوایان دەکات، بە ژیانی زوو تێپەڕو کە بایەخی دنیا

٣/ پاشان باسی داواکاریی کافرەکان دەکات، کە نیشانەو موعجیزەیەکی وەك هی گەلانی پێشوو بۆ پێغەمبەری خاتەم دابەزێ، ئنجا خواش ﷻ لە وەڵامدا ئەو ڕاستییە دەخاتە ڕوو، کە گومڕابوونو ڕێی ڕاستگرتن، تەنیا بە دەست خوایە، واتە: کەسانێك لە ڕێی ڕاست گرتن بگەڕێنو لێی بخەفتن، قورئانو پەیامێك کە خوا بە پێغەمبەری خاتەمدا ناردوویەتی، بەسە بۆیان ببێتە بەڵگەو نیشانە کە هەم بەرنامەیەو، هەم بەڵگەشە، کەسێك لە ڕاستیی بخەفتێ، ئەوە بەسیەتیو، کەسێکیش نەیەوێ ڕێی ڕاست بگرێو، ڕێی گومڕایی سەرگەردانیی بگرێ، بێگومان ئەویش لە جوغزی ویستی ڕەهای خوای پەروەردگار نەچۆتە دەرێ .

٤/ دوایی خوا ئەو ڕاستییە دەخاتە ڕوو، کە بە یادی خوا، دڵان ئارام دەگرنو ئۆخژنیان بۆ دێو، سوکنایییان بۆ دێو، دادەمرکێن

٥/ پاشان خوا باسی سەرەنجامی باشی بڕواداران کردار باش دەکات

٦/ دوایی خوای زاناو توانا ئەو ڕاستییەش دەخاتە ڕوو، کە ڕەوانەکردنی (موحەممەد) ﷺ هەروەك ڕەوانەکردنی پێغەمبەرانی دیکەیە بۆ گەلانی پێشوو، کە پەیامی خوایان پێدا نێردراوە

٧/ پاشان خوا ﷻ پێناسەی قورئان دەکات، ئەگەر گریمان: قورئان چیایەکانی پێ لە شوێنی خۆیان هەڵقەندرابانو، زەوی پێ قڵت قڵت کرابایەو، بڕابایەو، مردووی پێ دوێندرابانایە، ئەگەر خوا نەیویستبایە بڕوابێنن، هەر ئیمانیان نەدەهێنا .

٨/ لە کۆتایی دا : خوا باسی سەرەنجامی خراپو شوومی بێبڕوایان لە دنیادا دەکات، کە بریتیە لە بەڵاو گرفتاریو لێقەومان

﴿ ٱللَّهُ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ وَفَرِحُواْ بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ
إِلَّا مَتَٰعٞ ﴿٢٦﴾ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَةٞ مِّن رَّبِّهِۦۚ قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ
وَيَهۡدِيٓ إِلَيۡهِ مَنۡ أَنَابَ ﴿٢٧﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ
تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ طُوبَىٰ لَهُمۡ وَحُسۡنُ مَـَٔابٖ
﴿٢٩﴾ كَذَٰلِكَ أَرۡسَلۡنَٰكَ فِيٓ أُمَّةٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهَآ أُمَمٞ لِّتَتۡلُوَاْ عَلَيۡهِمُ ٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ
وَهُمۡ يَكۡفُرُونَ بِٱلرَّحۡمَٰنِۚ قُلۡ هُوَ رَبِّي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ مَتَابِ ﴿٣٠﴾ وَلَوۡ
أَنَّ قُرۡءَانٗا سُيِّرَتۡ بِهِ ٱلۡجِبَالُ أَوۡ قُطِّعَتۡ بِهِ ٱلۡأَرۡضُ أَوۡ كُلِّمَ بِهِ ٱلۡمَوۡتَىٰۗ بَل لِّلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ جَمِيعًاۗ
أَفَلَمۡ يَاْيۡـَٔسِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن لَّوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَهَدَى ٱلنَّاسَ جَمِيعٗاۗ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ
تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُواْ قَارِعَةٌ أَوۡ تَحُلُّ قَرِيبٗا مِّن دَارِهِمۡ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ وَعۡدُ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخۡلِفُ
ٱلۡمِيعَادَ ﴿٣١﴾ ﴾

# مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{خوا بۆ هەر کەسێك بیەوێ، بژێو فراوان دەکات، (و بۆ هەر کەسێك بیەوێ لێی دەگرێتەوە)و وە تەنگ دێنێ، (بێبڕوایان)یش بە ژیانی دنیایان زۆر دڵخۆش بوون، لە حاڵێکدا کە ژیانی دنیا لە چاو (ژیانی) دواڕۆژ، تەنیا ڕابواردنێکی کەم و کورتە ﴿٢٦﴾ ئەوانەی بێبڕوان دەڵێن: دەبووایە (موحەممەد) لە پەروەردگاریەوە نیشانەو موعجیزەیەکی (وەك هی پێغەمبەرانی پێشووی) دابەزێنرابایە سەر، بڵێ: بە دڵنیایی خوا هەر کەسێکی بوێ، سەرگەردانی دەکات، هەرکەسێکیش لە ناخەوە بگەڕێتەوە{ و دان بە هەقدا بنێ}، بەرەو لای خۆی ڕێنمایی دەکات ﴿٢٧﴾ ئەوانەی بڕوایان هێناوەو، دڵەکانیان بە یادی خوا سوکنایان بۆ دێ، ئاگاداربن! دڵان بە یادی خوا، ئۆخژنیان بۆ دێو ئۆقرە دەگرن ﴿٢٨﴾ ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، خێرو خۆشیی تەواوو سەرئەنجامی چاکیان هەیە ﴿٢٩﴾ بەو شێوەیە لە کۆمەڵێکدا ڕەوانەمان کردووی، کە کۆمەڵانی دیکەی لە پێشدا ڕابردوون، تاکو ئەوەی بۆمان سروش کردووی، بەسەریاندا بیخوێنیەوەو، بەوانەی بە خوای میهرەبان بێبڕوان، بڵێ: ئەو (خوا) پەروەردگارمە، جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، پشتم هەر بەو بەستوەو، گەڕانەوەشم تەنیا بۆ لای ویە ﴿٣٠﴾ ئەگەر قورئانێك هەبووایە کە چیاکانی پێ ڕۆێنرابان، یان زەوی پێ بڕدرابایە، یان مردووانی پێ دوێنرابان، مەگەر خوا ویستبای، دەنا هەر بڕوایان نە دەهێنا، بەڵکو کاروبار هەمووی هی خوایە، ئایا ئەوانەی بڕوایان هێناوە، لەوبارەوە دڵنیا نەبوون، کە ئەگەر خوا ویستبای (زۆریان لێ بکات) تێکڕای خەڵکی دەخستە سەر ڕاستە ڕێ! ئەوانەی بێبڕوان بەردەوام بەهۆی ئەوەوە کە دەیکەن لە کارو ڕەفتاری خراپ، بەڵای ڕاچڵەکێنەریان بەسەر دێن، یان ئەو بەڵایە دەکەوێتە نیزیك ماڵەکەیان، هەتا بەڵێنی خوا دێ (بە هاتنی ڕۆژی دوایی)، بێگومان خوا گفتو بەڵێن دوا ناخات ﴿٣١﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ): واتە: بژێو فراوان دەکات، (بَسْطُ الشيء: نَشْرُهُ وَتَوْسِيعُهُ، بَسَطَ الرِّزْقَ: وَسَّعَهُ)، وشەی (بَسْط) یانی: ڕاخستن‌و فراوان کردن (بَسَطَ الشَّيْءَ يَبْسُطُهُ بَسْطاً)، شتەکەی بڵاوکردەوەو فراوان کرد

لێرەدا وشەی: ﴿ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ ﴾، واتە: بژێوو ڕۆزیی بۆ فراوان دەکات، بۆی زیاد دەکات

(وَيَقْدِرُ): (يَقْدِر) یانی: (يُضَيِّق) وە تەنگ دێنێ، کەمی دەکاتەوە، (قَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُ: ضَيَّقَ)، وەك لە سووڕەتی (الطلاق)دا هاتوە، بژێوی لێ وەتەنگ هێنراوە، عادەت وایە شتی فراوان، زۆرەو، شتی تەنگ‌و تەسك، کەمە

(وَفَرِحُوا): واتە: زۆر دڵخۆش بوون، دڵێ: (الفَرَحُ: إِنْشِرَاحُ الصَّدْرِ بِلَذَّةٍ عَاجِلَةٍ، وأَكْثَرُ ما يَكُونُ فِي اللَّذَّاتِ الْبَدَنِيَّةِ الدُّنْيَوِيَّةِ) .

(فَرَحْ) بریتیە لە سینە گوشاد بوون بەهۆی چێژێکەوە کە زوو دێتە دەست‌و، بە زۆریی بۆ ئەو لەززەت‌و چێژانە بەکاردێ، کە پەیوەندییان بە جەستەوە هەیەو لە دنیادا هەن

(أَنَابَ): (الإِنَابَةُ إِلَى اللهِ: الرُّجُوعُ إِلَيْهِ بِالتَّوْبَةِ وإِخْلاصِ العَمَلِ)، (الإِنَابَةُ إِلَى اللهِ) واتە: گەڕانەوە بۆ لای خوا، بە پەشێمان بوونەوە، کە بە کردەوە بگەڕێیەوەو، کردەوەی خۆت بۆ خوا ساغ بکەیەوە .

(تَطْمَئِنُّ): (الطُّمَأْنِينَةُ: السُّكُونُ بَعْدَ الإِنْزِعَاجِ)، (طمَأْنِينَةْ) بریتیە لە سوکنایی هاتن‌و ئۆخژن هاتن‌و، ئارام گرتن‌و سەقام گیربوون، پاش جووڵە جووڵ

(طُوبَىٰ): هەندێك گوتوویانە: (طُوبَى: شَجَرَةٌ فِي الجَنَّة)، درەختێکە لە بەهەشت، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ ئاماژەی پێکراوە، کە سوار چوار سەد

(٤٠٠) ساڵ بەژێر سێبەرەکەیدا دەڕوات، بۆ ماوەی سەد (١٠٠) ساڵ نابڕێ، یاخود (طُوبَىٰ): (كلُّ مُسْتَطابٍ في الجنّة من: بقاء، بلا فناء، وَعِزٍ بلا زوالٍ، وَغِنَىً بلا فقْرٍ)، (طُوبَىٰ) هەر لەززەت لێ وەرگیراوێکە لە بەهەشتدا لە: مانەوەی بەبێ لەبەینچوون، بالا دەستیی بەبێ لە دەست چوون، بێنیازیی و دەوڵەمەندیی بەبێ هەژاریی

(مَتَابِ): دەگونجێ بە مانای گەڕانەوەو تۆبە بێ، دەشگونجێ بە مانای شوێنی گەڕانەوە بێ، ﷻ لێرەدا بە مانای شوێنی بۆ ﷻ گەڕانەوەیە، واتە: شوێنی بۆ لا گەڕانەوەی من، تەنیا خوایە ﷻ

(سُيِّرَتْ): یانی: ڕۆێنران لە شوێنی خۆیان، جووڵێنران، ڕۆیشتێنران، دەگوترێ: (سَيَّرَهُ في البَلَدِ: أخْرَجَهُ مِنْ مَكانِهِ)، وڵات بەدەری کرد: لە شوێنی خۆی دەریکرد، وەدەرینا

(يَاْيْـَٔسِ): ﴿أَفَلَمْ يَاْيْـَٔسِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، واتە: ئایا ئەوانەی بڕوایان هێناوە، نائومێد نەبوون، دەگوترێ: (يَئِسَ مِنَ الشَّيءِ) بە مانای لێی نا ئومێد بووو، بە مانای زانی (عَلِمَ)ش دێ، لەبەرئەوەی ئینسان کە لە شتێك نا ئومێد بوو، واتە: لە بوونی شتێك نا ئومێد بوو، مانای وایە دڵنیا دەبێ لە نەبوونیو، ئەگەر لە نەبوونی نائومێد بوو، دڵنیا دەبێ لە بوونی، بۆیە وشەی: (يَيْئَسُ) دڵنیایی لێیەوە لازم دێ، بۆیە (يَيْئَسُ) بە مانای (يَسْتَيْقِنُ)و (يَعْلَم) هاتوە، واتە: دڵنیا بووو زانی .

(قَارِعَةٌ): (القَارِعَةُ: الشَّدِيدُ مِنَ الشَّدَائِدِ وَهِيَ دَاهِية)، بەڵایەك كە زۆر سەخت بێ، زۆر توند بێ، پێی دەگوترێ: (قَارِعَة) كۆیەكەی (قَوَارِع)ە، وەك: (كَارِثَة) كە بە (كَوَارِث) كۆدەكرێتەوە، یانی: بەڵا .

(تَحُلُّ): واتە: دێت، دەكەوێتە ئەو شوێنە، (حَلَّ بالمَكانِ حُلولاً وَمَحَلاًّ)، واتە: لەو شوێنە نیشتەجێ بوو، كەوتە ئەو شوێنە، (المَحَلُّ: المكَانُ الذي يُحَلُّ بِهِ)، (مَحَلّ) وێڕای ئەوەی ﷻ بە چاوگ (مصدر) دێ، بە مانای ناوی شوێنیش دێ

# مانای گشتی ئایەتەکان

بەرێزان !

پێشتر چەند جارێك باسمان کردوە، کە ئەم سوورەتە بەگشتی باسی سیفەتەکانی خوایە ﷻ، پانتاییەکی زۆر بۆ پێناسەی خوا لەمیانی سیفەت و کردەوەکانیدا، تەرخان کراوە، هەروەها لەم سوورەتەدا باسی پێغەمبەرایەتیی ﷺ وەحیی کراوەو، باسی رۆژی دوایی و، سزاو پاداشتی خوا کراوە، بەلام بە پلەی یەکەم ئەم سوورەتە باسی خواناسیی (معرفة الله)یە .

لێرەش دەفەرمویّ : ﴿ ٱللَّهُ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ﴾، خوا بژیو فراوان دەکات بۆ هەر کەسێك کە بیەویّ و، تەنگی دەکات.

پێچەوانەی فراوان کردن : تەنگ کردنە، واتە: بۆ هەندێکان بژیو فراوان دەکات و، بۆ هەندێکان لێیان وەتەنگ دێنیّ، یاخود: بۆ هەر کەسێك: لە قۆناغێکدا بژیوی فراوانی پێدەدات و، لە قۆناغێکدا رزق و بژیوەکەی لیّ وەردەگرێتەوەو لێی وەتەنگ دێنیّ .

﴿ وَفَرِحُوا۟ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، ئێمە بەپێی سیاق دەزانین کە لێرەدا (فاعل)ی (فَرِحُوا) کە (و)ەکەیە، دەبێتە (فاعل)ی (فَرِحَ) کە بۆ کۆی (جمع)ەو دەزانین مەبەست پێی کۆمەڵی بێبڕواو کافرەکانە، واتە: بێبڕوایەکان زۆر دڵخۆش و شادمان بوون بە ژیانی دنیا، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکان باس دەکەین: (فَرَح) بریتییە لەوپەڕی دڵ خۆشیی، خوا ﷻ لە مەقامی زەم و سەرزەنشتیاندا دەفەرمویّ: زۆر دڵخۆش و شادمان بوون بە ژیانی دنیا، ﴿ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ إِلَّا مَتَٰعٌ ﴾، ژیانی دنیاش لەچاو دوارۆژ، لە چاو مەنزڵگای دوارۆژو بەهەشت، تەنیا شتێکە بەهرەیەکی کەمی لیّ وەردەگیریّ، یاخود رابواردنێکی کەمە، گوزەرانێکی کەمە، یانی: نیعمەتێکی کەم و خۆشییەکی کەمە .

ئنجا دووبارە دێتەوە سەر باسی ئەوە کە پێشتریش خوا ﷻ هەر باسی کرد، لە ئایەتی ژمارە(٧)داو، بە هەمان شێوە دووبارەی دەکاتەوە، لێرەش دەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان دەڵێن: دەبووایە لە پەروەردگاریەوە نیشانەیەکی دابەزێنرا بووایە سەر، وەك پێشتریش گوتمان: ئەمە لێرەدا ئەوە دەگەیەنێ کە ئەوان قورئانیان هەر نادیدە گرتوە، یانی: قورئانیان بە موعجیزەو بەڵگەو نیشانەی پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺ دانەناوەو، نادیدەیان گرتوە، یاخود داوایان کردوە کە موحەممەد ﷺ موعجیزەو نیشانەیەکی وەك هی پێغەمبەرانی پێشوو کە بەڵگەی بەرهەست بوون، بۆ بێ، بۆ وێنە: گۆچانەکەی مووسا ﷺ و، حوشترەکەی صاڵح و، مردوو زیندووکردنەوەی عیسا ﷺ، بەڵگەو نیشانەیەکی ئاوا، بۆ پێغەمبەری خاتەم بێ، لێرەدا وشەی (لَوْلَآ) بۆ هاندان (تَحْضِيض)ە، یانی: دەبووایە نیشانەیەکی لە پەروەردگاریەوە بۆ دابەزێنرابایە! لە ئایەتی پێشووتردا، خوا ئاوای وەڵام دایەوە: ﴿ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرٌ وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ ﴾، تۆ تەنیا ترسێنەرو ورياكەرەوەی و ، بۆ هەر کۆمەڵێك ڕێنماییکارێك بوو.

بەڵام لێرەدا بە جۆرێکی دیکە، وەڵام دەداتەوەو، دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ ﴾، بڵێ: بێگومان خوا هەر کەسێك کە بیەوێ گومڕای دەکات، ڕێی لێ ون دەکات، یان: لە ڕێ ونی دەکات، ﴿ وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ ﴾، هەروەها هەر کەسێك لە ناخەوە بەرەو لای خوا بگەڕێتەوەو، دان بەو هەقە دابێنێ، کە خوا ناردوویەتی، ڕێنمایی دەکات، کەواتە: ئەگەر ئەوانە لە هیدایەت بگەڕێن، ئەوە بەهۆی قورئانەوە ڕێی ڕاست بیبینیان، لەبەردەستە، ئەگەر بیانەوێ بگەڕێنەوە، بەڵام ئەگەر مەبەستیان تەنیا ئەوە بێ: بیانوو بگرن، ئەوە بێگومان ئەوان لەو جۆرە کەسانەن کە خوا گومڕایان دەکات، ئەوانەی لە بیانوو گرتن و لە بەهانە بگەڕێن، خوا گومڕایان دەکات، خواش هەر کەسێك کە بیەوێ، گومڕای دەکات، واتە: لەو کەسانەی کە لە هەق ناگەڕێن، ئەگەرنا خوا لە گۆترە کەس گومڕا ناکات، هەروەك لە گۆترەش کەس هیدایەت نادات .

لێرە دەفەرموێ: ﴿ وَيَهْدِيٓ إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ ﴾، هەر کەسێك کە بۆ لای خوا بگەڕێتەوە، ڕێنمایی دەکاتو دەستی دەگرێ، هەروەها لە سووڕەتی (إبراهیم)دا بۆمان باس دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾، واتە: خوا ستەمکاران گومڕا دەکات، کەواتە: ئەوانەی کە خوا گومڕایان دەکات، ستەمکارو خراپەکارن، ئەوانەش کە خوا ڕێنماییان دەکات، بۆ خوا صولْحاون‌و بەرەو خوا وەردەچەرخێن‌و، هەنگاو بەرەو خوا دەنێن، بۆیە خواش دەستیان دەگرێ، بەلام ئەوەی پشت لە خوا بکات، خوا ﷻ بێ پاك‌و بێنیازە، وەك دواییش تیشکی زیاتر دەخەینە سەر چەمك‌و واتای ئەم ئایەتە

ئنجا خوا ﷻ هەر بە بۆنەی باسی خوا ﷻو، پەیوەندیی لەگەلْ خواو، بەندایەتیی بۆ خواوە، باسی سیفەتێکی زۆر گەورەو گرنگی بڕواداران دەکات، کە بریتیە لەوەی دلْیان بە یادی خوا سوکنایی‌و ئۆخژنی بۆ دێ، دادەمرکێ‌و ئارام دەگرێ، دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ﴾، ئەوانەی بڕوایان هێناوەو دلْەکانیان بە یادی خوا ئارام دەگرن، بە یادی خوا دادەمرکێن، بە یادی خوا سوکناییان بۆ دێ، پڕ دەبن لە ئۆخژن‌و هێمنیی، ﴿ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴾، ئاگاداربن ! دلان تەنیا بە یادی خوا سوکنایی‌و ئۆخژنیان بۆ دێ

ئنجا هەر لەسەر پێناسەکردنی بڕواداران بەردەوام دەبێ، دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ طُوبَىٰ لَهُمْ وَحُسْنُ مَـَٔابٍ ﴾، ئەوانەی کە بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان ئەنجامداوە، (طُوبَىٰ ) بۆ ئەوان‌و سەرئەنجامی چاك بۆ ئەوان

(طُوبَىٰ )، یان بە مانای درەختێکە لە بەهەشت، وەك پێشتر باسمان کردو دواییش باسی دەکەین، یان: (طُوبَىٰ ) (مُؤنَّث)ی (أَطْيَب)ە، کە (صيغة التفضيل)ی (طَيِّب)ە، یانی: زۆر پاك‌و چاك‌و، زۆر سوود بەخش‌و بەتام‌و چێژ، (أَطْيَب)یش واتە: بە تام‌و چێژتر پاك‌و چاکتر، (طُوبَىٰ )ش، حالەتی (تأنيث)ی (أَطْيَب)ە، ئنجا ئەگەر واشبێ، چ (طُوبَىٰ ) بلێین، چ (أَطْيَب) دەبێ ئەمە سیفەتی وەسفکراو (مَوْصُوف)ێکی

قرتێنراو (مَحْذُوف) بێ، واتە: شتێك هەبێ بە (طُوبَىٰ) وەسف کرابێ، بەلام قرتێنرابێ لەبەرئەوەی وشەکە دەیگەیەنێ، یانی: پاداشتی هەرە باش بۆ ئەوان، هەروەك لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ ٱلْحُسْنَىٰ ...﴾ یونس: ٢٦ یانی: (المَثُوبَةُ الحُسْنَى) کە لەوێشدا (حُسْنَى) سیفەتی (مَوْصُوف)ێکی (مَحْذُوف)ە، ﴿وَحُسْنُ مَـَٔابٍ﴾، هەروەها باشترین سەرەنجام بۆ ئەو بڕوادارانەی کە کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن .

ئنجا خوا ﷻ ڕوو دەکاتە پێغەمبەر ﷺ و پێی دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ أَرْسَلْنَـٰكَ فِىٓ أُمَّةٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهَآ أُمَمٌ﴾، ئاوا بەو شێوەیە تۆمان ڕەوانە کرد لە نێو کۆمەڵێکدا، لەپێش ویدا کۆمەڵانێکی دیکە ڕابردوون، واتە: تۆ ڕیزپەڕ (شاذ)نی لە نێو پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة والسلام) گەل و کۆمەڵگایەکەی تۆش شتێکی ڕیزپەڕ نیەو، لە نێو هەموو گەلان و کۆمەڵگا پێشووەکاندا، خوا پێغەمبەرانی ڕەوانە کردوون، کەواتە: ڕەوانەکرانی تۆش لە نێوانیاندا حاڵەتێکی ئاسایی و سروشتیی هەیە.

وشەی ﴿كَذَٰلِكَ﴾، یانی: ئاوا بەو شێوە سەر سوڕهێنەرە، بەو شێوە گرنگ و گەورەیە، کە تۆمان پێ ڕەوانکردوە، کە ئەوە وێچواندنی شتێکە بە خودی خۆی، یانی: (كَذَلِكَ الإرْسَالِ العَجِيبِ أرْسَلْنَاك)، ئاوا بەو شێوە ڕەوانەکراوە سەرسوڕهێنەرە، تۆمان ڕەوان کرد، دەشگونجێ ئەوە وێچواندنی ڕەوانکردنی پێغەمبەر (محمد) ﷺ بێ، بە ڕەوانەکردنی پێغەمبەرانی پێشوو، واتە: وەك چۆن ئەوانمان ڕەوانکردوە تۆشمان ڕەوانکردوە، بۆچی؟

﴿لِّتَتْلُوَا۟ عَلَيْهِمُ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ﴾، تاکو ئەوەی کە بۆ تۆمان سروش کردوە، بۆ لای تۆ وەك پەیام ناردوومانە، کە قورئانە، بەسەریاندا بخوێنیەوە، ﴿وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِٱلرَّحْمَـٰنِ﴾، لە حاڵێکدا کە ئەوان بێ بڕوان (بە خوای) میهرەبانی (خاوەن بەزەیی و بەخششی بێسنوور) .

﴿ قُلْ هُوَ رَبِّي ﴾، بڵێ: ئەو (خوا) پەروەردگارو خاوەن و هەمەکارمە، ﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾ جگە لەو هیچ پەرستراوێکم نیە، ﴿ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ مَتَابِ ﴾، پشتم هەر بەو بەستووە، گەڕانەوەشم هەر بۆ لای ویە، سەرەنجامم هەر بۆ لای ئەوە .

لە کۆتایی دا خوا عزوجل باسی قورئان دەکات و دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّ قُرْءَانًا سُيِّرَتْ بِهِ ٱلْجِبَالُ ﴾، ئەگەر قورئانێك هەبووایە کە چیایەکانی پێ ڕۆێندرابان، یانی: لە شوێنی خۆیان هەڵقەندرابان و ڕۆیشتبان، ﴿ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ ٱلْأَرْضُ ﴾، یاخود زەمینی پێ بڕدرابایە، زەمینی پێ قڵت قڵت و بڕ بڕ کرابایە، ﴿ أَوْ كُلِّمَ بِهِ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾، یاخود مردووانی پێ دوێنرابان .

ڕستەی : (ئەگەر قورئانێك هەبووایە، ئەو (سێ) سیفەتەی تێدابان: چیایەکانی پێ جوولێنرابان و پێ ڕۆێندرابان و، زەوی پێ بڕ بڕ کرابایەو، مردووانی پێ دوێندرابان)، وەڵامەکەی قرتێندراوە، یانی: ئەگەر قورئانێکی ئاواش هەبووایە، مەگەر خوا ویستبای، ئەگەرنا هەر بڕوایان نەدەهێنا، ئەوە وەڵامی ئەو قسەیە کە دەیانگوت: ﴿ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾، دەبووایە (موحەممەد) لە پەروەردگاریەوە نیشانەو موعجیزەیەکی وەك هی پێغەمبەرانی پێشووی بۆ بێ، دابەزێتە سەری، خوا دەفەرموێ: ئەگەر ئەم قورئانە ئەو کارانەشی پێکرابان، کە لە هەندێ ڕیوایەتاندا هاتوە، کافرەکانی مەککە بە پێغەمبەریان ﷺ گوتوە: وەرە چیای صەفامان بۆ لێرە لابەرە، ئەو چیایانەی دەوری مەککە لابەرە یاخود وەرە ئەو چیایەمان بۆ بکە بە زێڕ، یاخود فلان کەس و فلان کەسمان بۆ زیندوو بکەوە، لێیان بپرسین ! ئنجا خوا ﷻ پێیان دەفەرموێ: ئەگەر ئەم قورئانە ئەوانەشی هەمووی پێ بکرابانایە، وەڵامەکەی قرتێندراوە، واتە: ئەگەر ئەوانەشی هەموو پێکرابانایە، هەر بڕوایان نەدەهێنا .

ئنجا دەفەرموێ : ﴿ بَل لِّلَّهِ ٱلْأَمْرُ جَمِيعًا ﴾، بەڵکو کار هەمووی هی خوایە، بەڕێوەبردنی کاروباری بوون، هەمووی تێکڕا هی خوایە ﷻ و ئەو خوایەی کە هەموو شتێکی بەدەستە، ئەوپەڕی لێزانیی و زانایی هەیە، ئنجا حیکمەتی خواو زانیاریی خوا، وای خواستوە کە ئەم قورئانە بەڵگەو موعجیزەی تاك و تەنیای پێغەمبەری خاتەم ﷺ بێ، بۆ نیسپاتی پێغەمبەرایەتیی

دوایی دەفەرموێ : ﴿ أَفَلَمْ يَاْيْـَٔسِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَهَدَى ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ﴾، ئایا ئەوانەی بڕوایان هێناوە، نائومێد نەبوون، لەوە کە ئەگەر خوا ویستبای، تێکڕای خەڵکی ڕێنمایی دەکرد، ئنجا وشەی (أَفَلَمْ يَاْيْـَٔسِ)، مانا ڕواڵەتییەکەی: ئایا نائومێد نەبوون؟ یانی: لەچی نائومێد نەبوون، یانی: لە پێچەوانەی ئەو قەناعەتە نائومێد نەبوون، کە هەرچاوەڕێ دەکەن، خوا ﷻ هەموو کەس ڕێنمایی بکات؟ ئاخر خوا نەیویستوە هەموو کەس بە زۆر ڕێنمایی بکات، واتە: دەبێ نائومێد بن لەوەی کە خوا هەموو کەس بە زۆر ڕێنمایی بکات، ئەوە ئەگەر وشەی (يَاْيْـَٔسِ)، بە مانا ڕواڵەتییەکەی خۆی، لێك بدەینەوە واتە: ئیمانداران دەبێ نا ئومێدبن لەوەی کە خوا بە زۆر هەموو خەڵکی ڕێنمایی بکات، هەموو خەڵکی بخاتە سەر ڕێی ڕاست .

بەڵام وشەی (يَاْيْـَٔسِ)، بە مانای (يَعْلَم)یش هاتوە، یان (يَسْتَيْقِن) واتە: ئایا بڕواداران زانیارییان بۆ پەیدا نەبووە، دڵنیا نەبوون، کە ئەگەر خوا ویستبای تێکڕای خەڵکی دەخستە سەر ڕێی ڕاست، بەڵام نەیویستوە بە زۆر بیانخاتە سەر ڕێی ڕاست، بۆیە ڕێی ڕاست ناگرن، خوا ویستوویەتی: تاقییان بکاتەوە، بۆیە ئازادو سەرپشکی کردوون .

﴿ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُواْ قَارِعَةٌ ﴾، بەردەوام ئەوانەی بێبڕوان بەهۆی ئەوەوە کە دەیکەن، بەهۆی کردەوە خراپەکانیانەوە، بەڵایان بەسەر دێن، بەڵایەکی داچڵەکێنەر، ڕاچڵەکێنەر، ڕاتەکێنەر، چونکە وشەی (قَارِعَة) لە (قَرْع)ەوە، هاتوە کە بریتیە لە دەنگێك بزرینگێتەوە گوێی ئینسان کاس بکات، یاخود ئینسان قولاغ بکات، واتە: بەڵایەکی وا کە ڕایان بچڵەکێنێ، بەردەوام کافرەکان بەهۆی کردەوە خراپەکانیانەوە بەڵای ڕاچڵەکێنەریان بەسەر دێن، ﴿ أَوْ تَحُلُّ قَرِيبًا مِّن دَارِهِمْ ﴾، یاخود لە نیزیك ماڵەکانی ئەوان، ئەو بەڵایانە دەکەون، مەبەست پێ دەرودراوسێیەکانیانە، کەلانی دراوسێیان بەڵای خوایان بەسەر دێن .

﴿ حَتَّىٰ يَأْتِيَ وَعْدُ ٱللَّهِ ﴾، هەتاکو بەڵێنی خوا دێ، بەڵێنی خوا بە تەئکید مەبەست پێی ڕۆژی دواییە، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴾، بێگومان خوا گفت دوناخات، هەرگیز گفتی خوا وا نابێ کە نەیەتە دی، هەمیشە بەڵێنو گفتی خوای پەروەردگار لە کاتو شوێنی خۆیدا، دێتە دی .

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم :** زێدەکردن و فراوانکردنی ڕۆزیی، بۆ هەر کەسێک و، لێگرتنەوەو کەمکردنەوەی، تەنیا بەدەست خوایە ﷻ، بێبڕوایانیش لەوپەڕی دڵخۆشییان بە ژیانی دنیایە، کە ڕابواردنێکی کەم و کورتە، لە چاو ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوەی دواڕۆژ :

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ وَفَرِحُوا۟ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا مَتَٰعٌ ﴿٢٦﴾ ﴾

**توێژینەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە ، لە سێ بڕگەدا :**

**بڕگەی یەکەم :** - ﴿ ٱللَّهُ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ﴾، خوا ڕۆزیی فراوان دەکات بۆ هەر کەسێک کە بیەوێ و، وە تەنگ دێنێ

(البَسْطُ مُسْتَعارٌ للكَثْرَةِ ولِلدَّوامِ، وَالقَدْرُ كِنايَةٌ عَنِ القِلَّةِ)، وشەی (بَسْط): (کە لە زمانی عەرەبییدا، بە مانای پان ڕاخستن و فراوان کردن و درێژکردنەوەی شتێک دێ)، بەڵام لێرە خوازراوەتەوە بۆ زۆریی و بەردەوامیی، ﴿ ٱللَّهُ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ ﴾، واتە: خوا بژێو زۆر دەکات و دەوامی پێدەدا، ﴿ لِمَن يَشَآءُ ﴾، بۆ هەر کەسێک کە بیەوێ، چ لەسەر ئاستی تاک، چ لەسەر ئاستی کۆمەڵگاکان، ﴿ وَيَقْدِرُ ﴾،

هەروەها کەو تەنگ دەکاتەوەو، لێ دەگرێتەوە لە بژیو بۆ هەر کەسێکو بۆ هەر کۆمەڵگایەك کە بیەوێ، هەڵبەتە خوا ﷻ لێرەدا بە ڕەهایی وای فەرمووە کە زیادکردنو کەمکردنی بژیوو ڕۆزیی بەدەست خوایە، بەڵام بێگومان ویستی خوا ﷻ، چ بە نسبەت زیادکردنو کەمکردنی بژیووەوە، چ بە نسبەت سەرکەوتنو ژێرکەوتن لە جەنگدا، چ بە نسبەت بەرەو پێشچوونو بەرەو دوا گەڕانەوەوە لە هەموو بوارەکانو کایەکانی ژیانو گوزەراندا، ئەو ویستەی خوا ﷻ لە میانی هۆکارەکاندا جێبەجێ دەبێ

کەواتە: کە دەفەرموێ: خوا بژیو فراوان دەکات، بۆ هەر کەسێك کە بیەوێ، یانی: ئەوە یاسای خوایەو لە میانی یاساکانیدا بژیو فراوان دەکات، کەسێك تێبکۆشێو هەوڵ بداتو خۆی ماندوو بکاتو ڕەنج بدات، خوا بژیوەکەی بۆ فراوان دەکات، وەك گوتراوە: (لە تۆ حەرەکەت لە خوا بەرەکەت)، هەروەها کە بژیویش تەنگ دەکاتەوەو لێی دەگرێتەوە، ئەوە بۆ کەسێکە کە تەنبەڵ تەنبەڵ دابنیشێو هەوڵو ڕەنج نەدات، بە تەنگیدا وەك گوتراوە: (ئاسمان زێڕو زیو نابارێنێ)، بەڵام خوا ﷻ لەم ڕستە موبارەکەدا، دەیەوێ تێمان بگەیەنێ کە هەمەکارەی گەردوونو کائینات، هەمەکارە لە ژیانی مرۆڤەکاندا، خوای بەرزی مەزنە، خوای کارزانە کە دیارە ئەویش لە میانی ئەو یاسایانەدا کە لە ژیانی بەشەردا داناون، تەصەرووف لە ژیانی بەشەردا دەکاتو کاروباری ژیانیان هەڵدەسووڕێنێ .

<u>بڕگەی دووەم</u> : ﴿وَفَرِحُوا۟ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾، بە پێی سیاق دەزانرێ کە (فاعل)ی (فَرِحوا)، واتە: ئەو (و)ە کە بۆ کۆیە، مەبەست پێ بێبڕوایەکانە، واتە: بێبڕوایەکان دڵخۆش بوون بە ژیانی دنیا

شایانی باسە : کەمتر بینیومە توێژەرەوان ئاماژەیان بەوە کردبێ، کە (فَرَحٌ)، واتە: ئەوپەڕی دڵخۆشیی[1]، چونکە خوا ﷻ هەر کات دڵخۆش بوون، بە ژیانی دنیای بێبڕوایانو کافرانو تاوانبارانی، باسکردبێ، بە وشەی (فَرَحٌ)،

١) مفردات ألفاظ القرآن، ص٣٩٢، المطبعة العصرية / ٢٠١٢م .

هێناویەتی، واتە: ئەوپەڕی دڵخۆشیی (أَشَدُّ السُّرور)، ئنجا ئەوپەڕی دڵخۆشیی مرۆڤ، دەبێ بە پاداشتی خواو ڕەزامەندیی خواو ڕەحمەتو بەرەكەتی خوا بێ، وەك لە سووڕەتی (یونس)دا، دەفەرموێ : ﴿ قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ ﴿٥٨﴾ ﴾، واتە: بڵێ: بە بەخششی خواو بە بەزەیی خوا، با تەنیا بەوە زۆر دڵخۆش بن، نەك واتایەكەی ئەوە بێ: با تەنیا بەوە دڵخۆش بن، بەگشتی، چونكە ئەگەر وابووایە، دەبووایە ئینسان بە لەش ساغیی‌و، بە ماڵو منداڵی چاكو، بە ڕزقو ڕۆزیی فراوانو، بە سەركەوتنو، بە خواردنی خۆش، دڵخۆش نەبێ ! كە لە ڕاستییدا ئەوە پێچەوانەی فیطرەتی بەشەرەو، پێچەوانەی عەقڵو مەنتیقو واقیعیشە، خواش ﷻ هەرگیز شتێك كە پێچەوانەی فیطرەتو سروشتو عەقڵو مەنتیقو واقیع بێ، لە بەندەكانی داوای ناكات .

ئنجا كە لە سووڕەتی (یونس)دا دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ ﴿٥٨﴾ ﴾، وەك ■ شوێنی خۆیدا باسمان كردوە، واتە: تەنیا با بەوە زۆر دڵخۆش بن، كەواتە: زۆر دڵخۆش بوون، دەبێ تەنیا بە بەخششی خواو بە بەزەیی خوا بێ، بەڵام دڵخۆش بوون، كەمێك دڵخۆش بوون، مادام نەگاتە ئەوپەڕی، بە شتەكانی دیكەش، ڕەوایەو دروستەو شتێكی سروشتییە، كە مرۆڤ بە سەروەتو سامان دڵخۆش دەبێ، بە خانووبەرەی چاك، بە دەوڵەمەندیی، بە لەش ساغیی، بە زانیاریی ... هتد

هەر بۆیەش خوا ﷻ لێرەدا زەمی كافرەكان دەكات، كە دەفەرموێ: ﴿ وَفَرِحُواْ بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾، هەروەها لە سووڕەتی (القصص)دا ئەوانەی بڕواداربوون لە گەلی قاڕوون ـ واتە: بەنو ئیسرائیل، كە بێگومان قاڕوون لە گەلی بەنو ئیسرائیل بووە ـ ئنجا بڕوادارەكان پێی دەڵێن: ﴿ لَا تَفۡرَحۡۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَرِحِينَ ﴿٧٦﴾ ﴾، واتە: زۆر شادمانو دڵخۆش مەبە (بە ژیانی دنیا)، بێگومان خوا زۆر

دڵخۆشانی خۆش ناوێن، واتە: زۆر دڵخۆشان بە ژیانی دنیا، ئەگەرنا دڵخۆشیی و شادمانیی لە شەریعەتی خوای پەروەردگاردا، شتێکی زەمکراوو سەرزەنشتکراوو نەویستراو نیە، بەڵام زۆر دڵخۆش بوون بە دنیا، شتێکە لە شەریعەتی خوای پەروەردگاردا زەمکراوو سەرزەنشتکراوە چونکە ژیانی دنیا هێندە ناهێنێ کە شادمانیی و، دڵخۆشییەکەی تێیدا بگاتە نەوپەڕی .

<u>**برگەی سێیەم :**</u> - ﴿ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا مَتَٰعٞ ﴾، ژیانی دنیاش لە چاو دواڕۆژ، تەنیا ڕابواردنێکی کەمە

(الـمَتَاعُ: مَا يُعِدُّهُ الـمَرْءُ إعْدَاداً لِيُنفِقَهُ فِي سَفَرٍ قَصِيرٍ)، (متاع) شتێکە کە مرۆڤ ئامادەی دەکات، بۆ ئەوەی لە سەفەرێکی کورتدا، خەرجی بکات

یاخود: (الـمَتَاعُ: كُلُّ مَا يُنْتَفَعُ بِهِ)، (متاع) هەر شتێکە کە بەهرەی لێوەربگیرێ

یان (متاع)، واتە: خۆشیی و لەززەتێکی زوو تێپەڕ، کە خوا عز وجل دەفەرموێ: ژیانی دنیا لە چاو دواڕۆژ، تەنیا ڕابواردنێک و گوزەرانێکی زوو تێپەڕو کە و کورتە، کەواتە: زۆر پێی دڵخۆش مەبن، لەوبارەوەش فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ زۆرن، ئێمە دووانیان لێ بە نموونە دێنینەوە :

١) { عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: نَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى حَصِيرٍ، فَقَامَ وَقَدْ أَثَّرَ فِي جَنْبِهِ، قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ! لَوْ اتَّخَذْنَا لَكَ وِطَاءً، فَقَالَ: مَا لِي وَلِلدُّنْيَا؟ مَا أَنَا فِي الدُّنْيَا إِلاَّ كَرَاكِبٍ اسْتَظَلَّ تَحْتَ شَجَرَةٍ، ثُمَّ رَاحَ وَتَرَكَهَا }، {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ بِرقم: (٣٧٠٩)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (٢٣٧٧) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَابْنُ مَاجَهْ بِرقم: (٤١٠٩)، وَالحَاكِمُ بِرقم: (٧٨٥٩)، وَالبَيْهَقِي فِي (شعب الإيمان) برقم: (١٠٤١٥)}

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێک لەسەر حەسیرێک خەوتبوو، کە هەڵسا شوێنکەی لە لاتەنیشتی پێغەمبەر ﷺ کرد بوو، (جا لە لاقی، یان لە کەلەکەی، یان

شان‌و قۆڵی، دیار بووە شوێنکەی[1] لێکردووە چونکە ڕەق بووە)، ئێمەش گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! با شوێنێکی نەرمت بۆ پەیدا بکەین (بە پێی سیاق دەزانرێ: مەبەست ئەوە بووە: با جێیەکی نەرمت بۆ ڕابخەین، بۆ خەوتنت)، فەرمووی: من‌و دنیا لە کوێین؟ (واتە: پێکەوە ناگونجێین، یانی: ڕابواردنی دنیاو خۆشیی دنیا، کە پێغەمبەری خوا ﷺ زیاد لەوەی کە پێویستە، گرنگیی‌و بایەخی پێبدات: شوێنی نەرم‌و چی‌و چی بۆ خۆی پەیدا بکات، ئنجا وێنەی هێنایەوە فەرمووی): من لە ژیانی دنیادا، تەنیا وەك سوارێکم کە لە ژێر سێبەری درەختێکدا پشوویەك دەدات، دوایی دەڕواو بەجێی دێڵێ.

٢) هەروەها لەو بوارەوە ئەو فەرموودەیەش هەیە: {عَنِ الْمُسْتَوْرِدِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: {وَاللَّهِ مَا الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلاَّ كَمَا يَغْمِسُ أَحَدُكُمْ أُصْبُعَهُ فِي الْيَمِّ، ثُمَّ يَرْفَعُهَا فَيَنْظُرُ بِمَا تَخْرُجُ}، {رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٨٠٤٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٧١٢٦)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤١٠٨)، وَالْحُمَيدِي برقم: (٨٥٥)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦١٥٩) وَالبزار برقم: (٣٤٦٠) وَاللَّفْظُ لَهُ}

واتە: موستەورید خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە خوا دنیا لە بەرانبەر دواڕۆژدا، تەنیا وەك ئەوە وایە، یەکێك لە ئێوە پەنجەی خۆی بخاتە نێو دەریایەکەوە، دوایی بەرزی بکاتەوەو تەماشای بکات، بە چی دەگەڕێتەوە بۆ لای؟

واتە: ئەو تەڕیی‌و ئاوەی بە پەنجەتەوە دێتەوە، کە دەیخەیە نێو دەریا، چەندە، دنیاش لە چاو دواڕۆژدا، ئەوەندەیە، کە دیارە ئەو تەڕاییەی کە بە پەنجەتەوە دەمێنێتەوە، زۆر زۆر کەمە، لە چاو ئاوی دەریاو، زۆر شتێکی بچووکە، پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێ: ژیانی دنیا لە چاو دواڕۆژ ئاوایە، کەواتە: پێی هەڵمەخەڵەتێن

١) شوێنکە: اثر، شوێنەوارێکی کەم

**مەسەلەی دووەم:** دووبارە داواکردنی بێبڕوایان کە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ نیشانەو موعجیزەیەکی وەک پێغەمبەرانی پێشووی بۆ بێ، یاخود بیهێنێ، خوای زاناو توانایش بەوە وەڵامیان دەداتەوە، کە خوا بەپێی سیستەمێک کە دایناوە: کەسانێکی شایستەی گومڕایی، گومڕا دەکات، کەسانێکیش شایستەی هیدایەت بن، ڕێنماییان دەکات:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَةٞ مِّن رَّبِّهِۦۗ قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِيٓ إِلَيۡهِ مَنۡ أَنَابَ ﴿٢٧﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە دوو بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم:** - ﴿ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَةٞ مِّن رَّبِّهِۦۗ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان، گوتیان: دەبووایە نیشانەیەکی لە پەروەردگاریەوە دابەزێتە سەر، واتە: موعجیزەیەکی بۆ بێ، لێرەدا وشەی (لَولا) بە مانای (هَلاَّ)یەو بۆ هاندان و دنەدان (تحضیض)ە، کە گومانی تێدا نیە: مەبەستیان موعجیزەی جیاواز لە قورئانە، وەک ئەوان دانیان بەوەدا نەهێنا بێ، کە قورئان بەڵگەو نیشانەیە بۆ نیسپاتی پێغەمبەر ﷺ! هەرچەندە نەشیانتوانیوە کێبڕکێ لە بەرانبەر قورئاندا بکەن، بەڵام داوایان کردوە کە (موحەممەد) موعجیزەو نیشانەیەکی وەک ئەوەی پێغەمبەرانی پێشووی بۆ بێ، کە بێگومان مەبەستیان ئەو موعجیزەو بەڵگانە بوون، کە بۆ وێنە: داوودو سولەیمان (علیهما السلام) بۆیان هاتوون، کە داوود (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ئاسنی بۆ نەرم کراوەو، باڵندەو چیا کاتێک موناجاتی لەگەڵ خوای پەروەردگاردا کردوە، لەگەڵیان گوتۆتەوەو، گەلێ شتی دیکەی بۆ ڕام و دەستەبەر کراوە، پێغەمبەر سولەیمان (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)یش بای بۆ دەستەمۆ کراوەو، جندو شەیتانەکانی بۆ دەستەمۆ کراون،

لەگەڵ باڵندان‌و، لەگەڵ زیندەوەراندا قسەی کردوەو... هەتا کۆتایی ئەو موعجیزانەی کە سولەیمان هەیبوون، هەروەها مووسا (عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم)، کە دەستی ڕاستی خستۆتە بن قۆڵی‌و دەریهێناوە، وەك گڵۆپ داگیرساوە، وەك چرایەك، بەبێ ئەوەی هیچ نەخۆشییەکی هەبێ، هەروەها گۆچانەکەی فڕێداوەو بۆتە ئەژدیهاو مارێکی گەورە هەروەها حوشترەکەی صالح‌و... هەتا کۆتایی، ئەو موعجیزانەی کە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم)، هەر کامێکیان لە ڕۆژگاری خۆیدا، چ شتێك زۆر باو بووبێ، خەڵك بە چ شتێك زۆر سەرسام بووبن، لەو جۆرە، خوا بەڵگەو نیشانەی بۆ ئەو پێغەمبەرە ناردوە، تاکو خەڵکەکەی ڕۆژگاری خۆی، قەناعەتی پێ بێنێ، کە ڕاست دەکات: پێغەمبەری خوایەو، دەستەوسانیان بکات، دەبووایە بەڵگەیەك بێ، کە ئەوان لە بەرانبەریدا، دەستە پاچەو دەستەوسان بن، ئەوانیش داوای شتێکی ئاوایان کردوە لە پێغەمبەری خاتەم، کە لەم سووڕەتەدا، ئەمە دووجار دووبارە بۆتەوەو، لە سووڕەتی (العنكبوت)دا خوا ﷻ وەڵامی ئەو قسەیەیان دەداتەوە، لەوێش دەڵێن: ﴿ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۝٥٠ ﴾، واتە: دەبووایە لە پەروەردگاریەوە موعجیزەی بۆ دابەزێنرابان .

خوا ﷻ وەڵامیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ۝٥١ ﴾، ئایا بۆ ئەوان بەس نیە، کە ئێمە کتێبمان دابەزاندۆتە سەر تۆ بەسەریاندا دەخوێنرێتەوە ! واتە: ئەگەر لە هەق بگەڕێن، ئەم قورئانەی کە بۆ تۆ دابەزێنراوە کە بەسەریاندا دەخوێنرێتەوە، بەڵگەو نیشانەیەکی تەواوو تێرو تەسەلە، بۆ ئەوانیش‌و بۆ خەڵکەکانی دوای وانیش، تاکو دنیا بە کۆتا دێ، لەسەر ڕاستێتیی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ، ئەوەی لە هەقیش نەگەڕێ: ئەگەر نیشانەشیان بۆ بێن، بە شێوەیەکی دیکە وێنایان دەکەن، وەك لە ئایەتەکانی دیکەدا دەفەرموێ: ئەوان وەك جادوو وێنای دەکەن، دەفەرموێ: ئەگەر ئەوە بووایە، دەیانگوت: ئەوە جادووگەرە یان ئەوە جادووی لێکردووین، وەك لە سووڕەتی (الحجر)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا مِّنَ

ٱلسَّمَآءِ فَظَلُّواْ فِيهِ يَعۡرُجُونَ ﴿١٤﴾ لَقَالُوٓاْ إِنَّمَا سُكِّرَتۡ أَبۡصَٰرُنَا بَلۡ نَحۡنُ قَوۡمٞ مَّسۡحُورُونَ ﴿١٥﴾﴾،

واتە: ئەگەر ئێمە دەروازەمان بەرەو ئاسمان لێ کردبانەوە، وەك داوایان دەکرد، ئنجا ئەوان پێیدا سەرکەوتبان بەو دەروازەرەدا (خوای زاناو توانا وای بۆ هەڵخستبان، کە بتوانن بەرەو سەرێ بچن)، دەیانگوت: ئێمە چاومان داپۆشراوە، ئێمە کۆمەڵێکین جادوومان لێکراوە، چاو بەستمان لێکراوەو هەڵخەڵەتێنراوین !

بڕگەی دووەم : - بۆیە خوا ﷻ لە وەڵامی ئەو داوایەیاندا، دەفەرموێ : ﴿قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِيٓ إِلَيۡهِ مَنۡ أَنَابَ﴾، واتە: بڵێ: بێگومان خوا هەر کەسێکی بیەوێ، گومڕای دەکات، سەرگەردانی دەکات، ونی دەکات لە ڕاستە ڕێ‌و، هەر کەسێکیش کە لە ناخەوە بەرەو خوا بگەڕێتەوە دەستی دەگرێ‌و ڕێنمایی دەکات‌و، دەیخاتە سەر ڕێی ڕاست، ئنجا ئەم ڕستە موبارەکە، کە وەك وەڵامێك وایە بۆ داواکردنی کافرەکان بۆ موعجیزەی تایبەت، دوو ڕاستیی مەزنی لێوەردەگیرێن :

یەکەم : بێ باکیی‌و بێ نیازیی خوا ﷻ دەردەخات، واتە: وەنەبێ خوا پەکی لەسەر وان کەوتبێ، چونکە بایی ئەوەندە کە ئەوانی پێ ئیقناع بکرێن، بەڵگەی ناردوە، کە قورئانە، لەسەر ڕاستێتیی پێغەمبەر ﷺ، ئنجا ئەگەر بڕوایان هێنا، باشەو، ئەگەر بڕوایان نەهێنا، زیان لە خۆیان دەدەن، وەنەبێ خوا پەکی لەسەر ئەوان کەوتبێ، ئەم تەعبیرە: بێ نیازیی خواو بێ باکیی خوا دەگەیەنێ بەرانبەریان

دووەم : هەروەها ئەوەش دەگەیەنێ کە هەر کەس لە هیدایەت بگەڕێ، ئەوە لەبەردەستیەتی، بەڵام کەسێك لە هیدایەت نەگەڕێ‌و لێی نەخەفتێ‌و مەبەستی نەبێ، بێگومان یاسای خوای دادگەری لەسەر دەچەسپێ، کە بریتیە لەوەی: هەر کەسێك پشت لە بەرنامەو هیدایەتی خوا بکات، لە ڕێ ون دەبێ‌و، سەرگەردان دەبێ‌و، سەری لێ دەشێوێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ﴾، بڵێ: خوا هەر کەسێك کە بیەوێ گومڕای دەکات، بەهۆی ئەوەوە کە پشت لە بەرنامەی خواو هیدایەتی خوا دەکات، ﴿وَيَهۡدِيٓ إِلَيۡهِ مَنۡ أَنَابَ﴾، بەڵام ئەوەی بەرەو خوا بگەڕێتەوە، بێگومان خوا دەستی دەگرێ‌و ڕێنمایی دەکات .

ئنجا لێرەدا خوا بە ڕەهایی فەرموویەتی: هەر کەسێکی بیەوێ، گومڕای دەکات، بەڵام لە سوورەتی (إبراهیم)دا بۆمان دەردەخات: کێ گومڕا دەکات؟ کە دەفەرموێ: ﴿ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾، واتە: خوا ستەمکاران گومڕا دەکات

هەروەها لە سوورەتی (البقرة)دا بۆمان ڕوون دەکاتەوە: کێ گومڕا دەکات ! دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ﴾، واتە: تەنیا لادەران و لاڕێیان پێی گومڕا دەبن، بەڵام ئەو کەسەی کە بەرەو خوا بگەڕێتەوە، مەبەستی بێ خوا ڕازی بکات و، لە هیدایەت بخەفتێ و عەودالی بێ، ئەوە خوا پەروەردگار هیدایەتی خستۆتە بەردەستی و، دەتوانێ پێی بە ئامانج بگات و، بەر پێی خۆی پێ ببینێ و، ڕێی خۆی پێ ببینێ .

**مەسەلەی سێیەم : بڕواداران دڵیان بە یادی خوا ئۆقرە دەگرێ و، سوکنایی بۆ دێ و دادەمرکێ :**

خوا ﷻ فەرموویەتی : ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴾

واتە : ئەوانەی بڕوایان هێناوە، بە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە بڕوایان پێی بهێنرێ، دڵەکانیان بە یادی خوا ئۆقرە دەگرن و، سوکناییان بۆ دێ و، ئۆخژنیان بۆ دێ و دادەمرکێن و، فەرەحناییان بۆ دێ

دوایی خوا ﷻ بۆ جەختکردنەوە، دەفەرموێ: ﴿ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴾، ئاگادار بن! وریا ببنەوە! دڵان تەنیا بە یادی خوا ئۆقرە دەگرن، (الإطمئنان: السُّكونُ واستُعيرَ هُنا لليقينِ وَعَدَمِ الشَّكِ)، (إطمئنان) بە مانای ئارامگرتن و ئۆقرەگرتن و داسەکنانە، بەڵام لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ دڵنیایی و نەبوونی دوودڵیی

# کورتە باسێک لە بارەی ئۆخژن بوونی دڵانەوە بە یادی خوا

بەڕێزان !

خوا پشتیوان بێ، ئێمە لەبەر تیشکی هەردووك ئایەتی : (٢٨و٢٩)ی سووڕەتی: (الرَّعد)دا، لە سێ بڕگەدا، سێ تیشك دەخەینە سەر ئەو بابەتە :

خوا دەفەرموێ : ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ طُوبَىٰ لَهُمْ وَحُسْنُ مَـَٔابٍ ﴿٢٩﴾ ﴾

**<u>بڕگەی یەکەم</u> : پێناسەی (ذكر الله):**

ڕاغیبی ئەصفەهانیی دەڵێ[1]: (الذكر ذِكران: ذِكرٌ بالقَلْبِ وذِكرٌ باللِّسان وكل واحد منهما ضربان ، ذكرٌ عن نسيان، وذكر لا عن نسيان بل عن إدامة حفظ...

یانی: یادکردن دوو یادکردنە: یاد کردن بە دڵ، یاد کردن بە زمان، ئنجا هەر کام لە یاد کردنی بە دڵو یاد کردنی بە زمانیش، دوو جۆرن :

دەگونجێ یاد کردنەوەکە دوای لە بیرچوونەوە بێو، دەشگونجێ بەبێ لەبیرچوونەوە بێ... هەڵبەتە ئەو گوتوویەتی: یاد کردنی بە دڵو یاد کردنی بە زمان، بەڵام ﷺ ڕاستییدا دەبێ جۆرێکی دیکەشیان بۆ زیاد بکەین: یادکردنی بە دڵو زمانیش .

---

١) مفردات ألفاظ القرآن، ص ١٩٦، المطبعة العصرية / ٢٠١٢م .

**ئنجا ئایا مەبەست لە یادی خوا لێرەدا چییە ؟**

**١) هەندێك گوتوویانە: مەبەست لە یادی خوا واتە: لێترسانیو هەبوونی سامو هەیبەت بەرانبەریو هەستکردن بە چاودێریی خوا، ئەویش بەوەی کە مرۆڤ لەو شوێنانەدا بوەستێ کە خوا فەرمانی پێکردوە، جێبەجێی بکاتو، ئەوە کە خوا ڕێی لێ گرتوە، توخنی نەکەوێ .**

**٢) بەلام هەندێك گوتوویانە: (ذكرالله)، مەبەست لە یادی خوا، بریتیە لە قورئان، وەك خوا ﷻ لە سووڕەتی (الزمر)دا دەفەرموێ: ﴿ فَوَيْلٌ لِّلْقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ﴿٢٢﴾ ﴾، واتە: سزای سەخت بۆ ئەوانەی دڵیان ڕەقە لە بەرانبەر یادی خوادا**

**٣) دەشگونجێ مەبەست لە یاد (ذكر) لێرەدا یادی خوای پەروەردگار بێ، بە دڵو بە زمان، واتە: بەسەر زمان داهێنانو، بە دڵدا هێنانی ناوی خواو سیفەتەکانی خوا**

**شایانی باسیشە : کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ﴾، دوایی دەفەرموێ: ﴿ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴾، هەردووکیانی بە (الفعل المضارع) هێناوە، (تَطْمَئِنُّ، تَطْمَئِنُّ)، ئەویش لەبەرئەوەیە کە: ئۆقرەگرتنی دڵو سوکنایيو ئۆخژن بۆ هاتنی دڵو دەروون، بەهۆی یادی خواوە، دەبێ هەمیشە تازەبووەوەو بەردەوام بێ، ئەوە بە نسبەت پێناسەی یادی خواوە .**

**<u>بڕگەی دووەم</u> : ئایا ئۆخژن بۆ هاتنو ئۆقرە گرتنی دڵ، بە یادی خوا، چۆنەو، هۆکارەکانی چینو، بەرهەمی چییە !**

**١) جارێ ئینسانی بڕوادار، ئینسانی خواناسو خوا پەرست، سەرنج دەداتە داهاتووی خۆی، ڕۆشنی دەبینێ، بۆچی؟ چونکە ئەوەی پەرێزی پاکە، بێ باکە، یان: ئەوەی پەرێزی پاکە، بەرچاوی ڕووناکە، کەسێك ژیانەکەی بەو شێوەیە بگوزەرێنێ، کە جێی پەسندی خوایە، هەمیشە خێر لە خوای پەروەردگار چاوەڕێ دەکاتو ئومێدەوارو گەشبینەو، دڵخۆشە بە ئایندەی خۆی کە ئایندەکەی بریتیە لەوەی بگاتە ڕەزامەندیی خوا، بەهەشتی خوا، لە دنیادا بە ئیمانەوە بڕوا، وەك چۆن بە ئیسلامەوە ژیاوە، بە ئیمانەوە بڕواو، لە دواڕۆژیشیدا بە دیداری خوا شاد بێتەوە**

٢) پاشان ئینسانی بڕوادارو خواناس، ئینسانی هەمیشە لە خزمەت خوا دابوو، دڵ ئۆقرە گرتوە بە یادی خوا، کاتێك تەماشای ڕابردووی خۆیشی دەکات، دیسان ڕابردووی خۆیشی ڕۆشن دەبینێ، دەزانێ لە کوێوە هاتوەو، بۆچی هاتوە؟ نەك تاریكو تەڵەمو لێڵی ببینێو، نەزانێ کێ هێناویەتیو، بۆچی هاتوەو لەکوێوە هاتوە ؟

٣) هەروەها بابای خواناسی پەیوەست بە خواوە، ئێستای خۆیشی ڕۆشن دەبینێو، دەزانێ کە دەبێ چۆن مامەڵە بکات ! لە ژیانی تاکیيو خێزانیيو کۆمەڵایەتیی دا: دۆست کێیە؟ دوژمن کێیە؟ حەڵاڵ، حەرام، چاك، خراپ، ڕاست، چەوت، هەموو ئەوانە لێك دەکاتەوە، بە ڕووناکیی هیدایەتو یادی خوای پەروەردگار، بۆیە ئێستای خۆیشی ڕۆشن دەبینێ، نەك هەموو شتێکی لێ تێکەڵو پێکەڵو ئاوێتە بووبێو، سەری خۆی لێ دەرنەکات !

٤) بابای خواناسو خواپەرستو، هەمیشە خوا لە یاد، لە بەرانبەر بەڵاو گرفتارییەکاندا، پشت بە خوا بەستوویە، دڵ قایمە، یانی: بە هەر خوڕڕەیەك ناخەجڵێو، بە هەر گرفتێك کە دێتە پێشی بە چۆك دانایەت، بەڵکو ڕاوەستاوە لە بەرانبەر بەڵاو گرفتارییەکاندا، چونکە پشتی بە خواوە داوە .

٥) مرۆڤی بڕوادارو خواناس، لەبەرئەوەی لە ژیانیدا ئامانجدارە بۆیە ژیانی خۆی، پڕ لە حیکمەتو بەها دەبینێ، لەبەرئەوە کە ئامانجو مەبەستێکی بەرزی هەیە، کە بریتییە: وەدەستهێنانی بەخششو ڕەزامەندیی خوا، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ ﴿٢٩﴾ ﴾الفتح، واتە: بەخششی خواو ڕەزامەندیی خوا لە ژیانیاندا بە ئامانج دەگرنو کردوویانە بە لووتکەی هیواو ئاواتیان، مرۆڤێکیش ئاوا بیر بکاتەوە، ژیانی بە بچووكو بێ مانا نابینێ .

٦) مرۆڤی بڕوادار پاداشتی خواو، سوپاسگوزاریی خوا، لەسەر کردەوەکانی چاوەڕێ دەکات، وەك خوای بەخشەر دەفەرموێ: ﴿ مَّا يَفۡعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمۡ إِن شَكَرۡتُمۡ وَءَامَنتُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمٗا ﴿١٤٧﴾ ﴾النساء، واتە: خوا چی داوە لە سزادانی ئێوە! ئەگەر ئێوە سوپاسگوزارو بڕوادار بن، بێگومان خوا سوپاسگوزاری زانایە

خـوا ﷻ خـاوەنی هـەموو شتێكە، بـەڵام یـەكێك لـە سیفەتە بـەرزو پەسـندەكانی ئەوەیـە كـە: سوپاسـگوزاریی دەكـات بـۆ بەنـدەكانی، سوپاسـیان دەكـات، پاداشـتیان دەداتــەوە، ئــەوەش دیســان دەبێتــە هــۆی نۆخــژنو نۆقرەیــیو نارامیــی، دڵو دەروونـی.

٧) مرۆڤـی بـڕوادار دنیـا وەك تاقیگـا دەبینـێ، نـەك وەك تـاكە دەرفـەتی ژیـان، بـۆ ڕابواردنو لـەوەڕان! بەڵكـو وەك دەرفەتێـك كـە دەبـێ هـەوڵو ڕەنجی تێدا بـدات، نـەك تێیـدا ڕابوێــرێ، بۆیـە گوریسـی لـەبن ڕاناخـات[1]. ئەگـەر خۆشـییەكی دنیـای لەدەسـت چـوو، پێـی وانیـە كـە بێمـراد بـووەو نائومێـدیی ڕووی تێناكـاتو، ئەگـەر ناخۆشـییەكیشـی بەسـەر هـات، پێـی وانیـە گەیشـتۆتە بـن بەسـت، دەڵـێ: لەسـەر ناخۆشـییەكان پاداشـتم هـەیـەو، لەسەر خۆشییەكانیش سوپاسـی خـوا دەكـەمو لـە هـەموو حاڵانیشـدا پاداشـتم هەیـە .

٨) مرۆڤـی خوانــاسو خواپەرســتی خـوا لـە یــاد، مـردن بـە پـردو دەروازەی ژیـانی ئەبەدیـی دەزانــێ، نەك بە چاڵێكـی تـاریكی بـێ بـنو، پێـی وا نیـە كـە ژیـان ــ وەك یەكێك لە مولحیدەكان گوتوویەتی: لـەو دوو وشـەیەدا خولاصــە دەبێتـەوە، (أرحامُ تـدفعُ، و قبـورٌ تبلَـعُ)، منداڵـدان دەرداوێـنو، گۆڕەكـانیش هەڵدەلووشـن ــ نـا، بەڵكـو ئینسانی ئیماندار ژیانی دنیا وا دەبینـێ، كە هۆڵی تاقیكردنەوەیەو، دەرفەتێكە بۆ ئـەوەی ئینســان پاداشــتی خـوای تێـدا وەدەسـت بێنـــێو، خـۆی تێـدا ڕووسـوورو سـەربەرزی لای خـواو خـەڵك بكـات

٩) مرۆڤـی ئیمانـدار، بـە یـادی خــواو پەیوەندیــی لەگــەڵ خــوادا، دەزانــێ كـە: نارەحەتییو گرفتارییەكـان، هۆكاری پـەروەردە بوونو بـەرەو خـوا چوونن، بەڵـێ بابـای بـڕوادار، نارەحەتیـــیو گرفتـــارییو ئـێشو ژانو موعانـاتو تاڵییـەكان، وا تەماشـا دەكـات، كە ئەوانـە هــەموویان بۆ پـەروەردە بوونو، كـامڵ بوونو، پتـەو بوونو بەهێـز بوونو، سـەرەنجام زیاتر بەرەو خـوا چوونو، صالح بوونـنـی، بۆیـە وەك یەكـێك لـە زانایـان گوتوویـەتی: (كَمْ مِنْ مِحنَةٍ تضمَنَّتْ مِنْحَةً)، زۆر بـەڵا، نیعمەتییـان گـرتۆتـە نێو خۆیـان .

---

١) گوریسی لە بـن ڕاناخـات، دنیـا بە كـۆڵ دا نـاداتو نایكـاتە ئامـانجو ئـاواتی گـەورەی

١٠) دەیەم و کۆتایی: پەیوەندیی لەگەڵ خوادا ﷻ مایەی سەقامگیریی و نەلەخشاوییە، وەك خـوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ ﴾يونس، بێگومان خـوا ﷻ لە یەك حاڵدایەو ناگۆڕێ، بە نسبەت خۆیەوە، نەك بە نسبەت مامەڵەی لەگەڵ دروستکراوەکانیدا، چونکە لە بواری مامەڵە لەگەڵ دروستکراوەکانی دا: ﴿ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِى شَأْنٍ ﴿٢٩﴾ ﴾الرحمن، خوا بە نسبەت مامەڵەیەوە لەگەڵ دروست کراوەکانیدا: بەرز دەکات و نزم دەکات، هەژار دەکات و دەوڵەمەند دەکات، سەر دەخات و ژێر دەخات، دەمرێنێ و دەژیێنێ... هتد، بەڵام بە نسبەت خۆیەوە، خوا ﷻ کەمیی و زیادیی، بەرزیی و نزمیی، ڕووی تێناکات، ئنجا مرۆڤ بە ئەندازەی ئەوە کە بە خواوە پەیوەست دەبێ، لەگەڵ خوادا پەیوەندیی دەبێ، پەیوەندیی ئێمە لەگەڵ خوادا، یەك ڕێی هەیە، ئەویش بەندایەتییە بۆ خـواو، یاد کـردنی خواش، بە دڵ و، بە زمان و، بە هەردووکیان، بە پەنهان و بە ئاشکراو، لە هەموو حاڵەتاندا، بریتییە لە هۆکارێکی زۆر گەورەو گرنگی بەندایەتیی خۆدا تۆخکردنەوەی مرۆڤ بۆ خوا ﷻ وەك ئەهلی تەصەووف و عیرفان گوتوویانە: (الذِّكْرُ مَنْشُورِ الوِلاَيَةِ)، لە ڕێی یادی خـواوە ئینسان دەگاتە دۆستایەتیی خواو یادی خوا: پەیژەی پێدا لە خـوا نزیکبوونەوەو، صالح بوون و بەرەو خـوا چـوونە .

<u>بڕگەی سێیەم</u> : یەکێك بۆی هەیە بڵێ: ئایا لێرەدا کە خوا دەفەرموێ : ﴿ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴾، ئاگادار بن ! دڵان بە یادی خوا ئۆقرە دەگرن و، ئۆخژنیان بۆ دێ، بەڵام لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ : ﴿ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ﴾الأنفال، واتە: هەرکات باسی خوا کرا: دڵیان ڕادەچڵەکێ و، هەر کات ئایەتەکانییان بەسەردا خوێنرانەوە: ئیمانیان زیاد دەکات و، پشتیش بەس بە پەروەردگاریان دەبەستن .

ئایا دڵ ڕاچڵەکین بە یادی خواو، دڵ ئارامگرتن بە یادی خوا، دژی یەکدی نین ؟!

لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر، چونکە ئەوانە بە دوو ئیعتیباری جیان، تۆ لەو ڕووەوە کە خوا ﷻ ئەوپەڕی دادگەریی هەیە، ئەوپەڕی کارزانییو کاربەجێی هەیەو، بە پێی کردەوەکان مامەڵە لەگەڵ مرۆڤەکاندا دەکاتو، سزاو پاداشتیان دەداتەوە، دەبێ مرۆڤ هەمیشە ترسی هەبێ لە دادگەریی خواو، لە کردەوە خراپەکانی خۆیو، لەوە کە خوا نەگەر بە دادگەریی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا بکات، بە پێی کردەوە خراپەکانی، تووشی سزا دەبێ، لەو ڕووەوە ترسو سامو هەیبەتی دەبێ بەرانبەر بە خوای دادگەر، بەڵام لەو ڕووەوەو بەو ئیعتیبارانەی کە باسمان کردن، کە خوا ﷻ خاوەنی ئەوپەڕی بەزەییو میهرەبانییو بەخششو کەرەمو لوتفە، یادی خواکردن (ذکر الله) دەبێتە هۆی دڵ ئارام بوونو دڵ نۆقرە گرتن

**مەسەلەی چوارەم :** بڕواداراني كردەوە باش، باشترین ژیانو چاكترین سەرەنجامیان هەیە :

خوا دەفەرموێ : ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ طُوبَىٰ لَهُمۡ وَحُسۡنُ مَـَٔابٖ ﴿٢٩﴾ ﴾

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە، لە دوو بڕگەی کورتدا :**

**بڕگەی یەکەم :** ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ طُوبَىٰ لَهُمۡ ﴾، ئەوانەی بڕوایان هێناوەو، کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون، (طُوبَىٰ)یان هەیە

(طُوبَىٰ)، (طُوبَى: مُؤَنَّثُ الأَطْيَب)، (أَطْيَب)، مانای هەرە باشو چاك، (مُؤَنَّث)ەكەی (طُوبَىٰ)یە، كە لە ڕاستییدا (إسْمِ تَفْضِيل)ە، بۆ (طَابَ)، (طَابَ)، یانی: باشو چاكو ڕێك بوو، ئنجا (أَطْيَب)، واتە: هەرە باشو چاك، ئەوە بە باری نێرینەدا، بە باری مێینەشدا (طُوبَى)یە، ئنجا كۆی (أَطْيَبُ)، بریتییە لە (أَطَايِب)و كۆی (طُوبَى)ش، بریتییە لە (طُوبِيات، وطُوَبْ)، (طَابَ، طِيبَاً أي :

حَسُنَ)، کەواتە : (طُوبَی لَهُ)، یانی : چاکترین شتیان بۆ هەیە، کە لێرەدا : (المَثُوبَةُ الطُّوبَی) واتە: پاداشتی هەرە چاك، یان: (الحَیَاةُ الطُّوبَی)، واتە: ژیانی هەرە چاكو پاكیان بۆ هەیە .

**برگەی دووەم :** - ﴿ وَحُسۡنُ مَـَٔابٖ ﴾، باشترین شوێنی بۆ گەڕانەوە، (آبَ، یَؤُبُ، أَوْبًا، وَمَآبًا)، (آبَ، یؤُبُ)، یانی: (رَجَعَ، یَرْجِعُ)، گەڕایەوە، دەگەڕێتەوە، (مَآب)، یانی: ئەو شوێنەی کە مرۆڤ بۆ لای دەگەڕێتەوە کەواتە: باشترین سەرەنجامو باشترین کاتو شوێنێك کە مرۆڤ بۆی دەگەڕێتەوە، لە گرەوی ئەوانە دایە، کە بریتیە لە ڕەزامەندیی خواو بەهەشتی خوا .

لەوبارەوەش ئەم دوو فەرموودەیە دێنین :

**فەرموودەی یەکەم :** {عَنْ عُتْبَةَ بْنَ عَبْدٍ السُّلَمِيِّ يَقُولُ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَسَأَلَهُ عَنْ الْحَوْضِ وَذَكَرَ الْجَنَّةَ، ثُمَّ قَالَ الأَعْرَابِيُّ: فِيهَا فَاكِهَةٌ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَفِيهَا شَجَرَةٌ تُدْعَى طُوبَى}، {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ بِرقم : (١٧٦٧٩)، وابن حبان برقم: (٧٤١٤)، قال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح لغيره، والطبراني في (الكبير) برقم: (٣١٣)}

واتە: عوتبەی کوڕی عەبدی سولەمیی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: عەرەبێکی دەشتەکیی هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێکرد، دەربارەی حەوز (ی کەوسەر)و باسی بەهەشتی کرد، پاشان (پیاوە) خێڵەکییەکە گوتی : ئایا لە بەهەشتدا میوە هەیە؟ فەرمووی : بەڵێ، درەختێکی تێدایە پێی دەگوترێ: طووبا .

**فەرموودەی دووەم :** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ : إِنَّ فِي الْجَنَّةِ لَشَجَرَةً يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِي ظِلِّهَا مِائَةَ سَنَةٍ، وَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ وَظِلّٖ مَّمۡدُودٖ}، {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٣٢٥٢)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٢٨٢٨)، وَالتِّرْمِذِيُّ برقم : (٢٥٢٣)}

ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: لە بەهەشتدا درەختێك هەیە کە سوارچاکێك سەد (١٠٠)ساڵ بە ژێر سێبەرەکەیدا

دەڕوات، تەواوی ناکات. (فـەرمووی:) ئەگەر دەتانەوێ بەڵگەی ئەمـە لە قورئاندا ببینن، بخوێننەوە: ﴿ وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ ۝٣٠ ﴾الواقعة، واتە: سـێبەرێکی لێك کێشراوەی دوورو درێـژ .

**مەسـەلەی پێنجـەم :** ڕەوانـەکرانی پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ لـە نێـو کـۆمەڵـگـاکـەیدا، وەك ڕەوانەکـرانی پێغـەمبەرانی پێشـووبەو شـتێکی ڕیزپـەڕ نیـە، لـەو بـوارەدا:

خـوا ﷻ دەفـەرموێ : ﴿ كَذَٰلِكَ أَرْسَلْنَٰكَ فِىٓ أُمَّةٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهَآ أُمَمٌ لِّتَتْلُوَا۟ عَلَيْهِمُ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِٱلرَّحْمَٰنِ ۚ قُلْ هُوَ رَبِّى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ مَتَابِ ۝٣٠ ﴾

شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە ■ کورتیی ، لە حەوت برگەدا :

**برگـەی یەکـەم :** ﴿ كَذَٰلِكَ أَرْسَلْنَٰكَ فِىٓ أُمَّةٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهَآ أُمَمٌ ﴾، ئـاوا بـەو شێوەیە تۆمان ڕەوانە کرد لە نێو کۆمەڵێکدا، کە لـە پـێش ویـدا، کۆمەڵگایەکـانی دیکەش ڕابردوون، (واتە: پێغـەمبەرانیشـیان تێـدا ڕەوانە کـراون) .

کە دەفەرموێ : ﴿ كَذَٰلِكَ ﴾ بەو شێوەیە، دوو واتـایـان بۆ لـێك داوەتـەوە :

یـەك : وەك ئەو ڕەوانە کردنـە ڕۆشـنەی کـە تـۆی لەسـەری، ڕەوانمـان کـردووی، واتـە : ﴿ كَذَٰلِكَ ﴾، بە خـۆی چوێنراوە (شُبِّهَ بِنَفْسِهِ

دوو : پەیـامی تـۆش هـەروەك پـەیامی پێغەمبـەرانی پـێش خـۆت (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، وایە. کافرەکـان هەمیشە سەرسامییو سەرسوڕمانیان دەربـڕیوە: کـە چـۆن دەبـێ خوا پێغەمبەرێکی مرۆڤ بنێـرێ؟ دەبووایـە فریشـتە بنێـرێ، چـۆن

دەبێ پێغەمبەرێکی وەك موحەممەد ﷺ بنێرێ؟! دەبووایە پەیام بۆ فلان‌و فیسار بنێرێ! وەك لە سوورەتی (الزخرف)دا خوای پەنهانزان دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا الْقُرْآنُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ الْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾﴾، واتە: گوتیان: دەبووایە ئەم قورئانە لەسەر یەکێك لەو دوو پیاوەی، کە لە دوو شارە گەورەکاندا هەن، {واتە: (طائف)و (مكة)} دابەزیبایە .

بۆیە خوای بەرزو مەزن لە زۆر شوێنان ئەوەیان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە ناردنی موحەممەد ﷺ وەك پێغەمبەر لەو کۆمەڵگایەی خۆیدا، شتێکی ڕێزپەڕو نائاسایی نیە، کە پێشتر نەبووبێ.

**برگەی دووەم :-** دوایی دەفەرموێ: ﴿لِّتَتْلُوَا عَلَيْهِمُ الَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ﴾، تاکو ئەوەی کە بۆ تۆمان ناردوە، بۆ تۆمان سروش کردوە، بەسەریاندا بخوێنیەوە

واتە: ڕەوانەکرانی تۆ بەو پەیامەی خواوە، بۆ ڕێنمایی کردن‌و ڕێی ڕاست پێشاندانیان‌و، بەرەو خوا بردنیانە، نەك بۆ ئەوەی تۆ بەڵگەو موعجیزەی سەیرو عەجایب، بە پێی دڵخواستی ئەوان، بێنی، ئەوە کاری تۆ نیە، کاری تۆ ئەوەیە: پەیامی خوایان پێ ڕابگەیەنی، ئنجا تۆش پشت ئەستووری بەو بەڵگەو موعجیزەیە، کە هەر لە خودی پەیامەکەتدایە، کە قورئانە، قورئانێك کە خوا بۆ تۆی ناردوە، هەم پەیام‌و بەرنامەی تۆیە، هەم بەڵگەو موعجیزەی نیسپاتی ڕاستیی تۆشە، هەڵبەتە ئەمە ئاماژەیە کە قورئان تاکە بەڵگەو موعجیزەی نیسپاتی پێغەمبەرایەتیی موحەممەدە ﷺ، ئەگەرنا بێگومان پێغەمبەری خوا موعجیزەی دیکەشی زۆرن‌و، شتی یاسا دڕ لەسەر دەستی وی، زۆر ڕوویان داوە، وەك لە مەوسوعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)، لەو کتێبەدا[1] کە تەرخانمان کردوە بۆ ژیانی پێغەمبەر ﷺ، ئاماژەمان بە زۆرێك لەو موعجیزانە کردوە .

---

١) بڕوانە، الكتاب السابع، (خاتم النبيين محمد: موجز سيرته، وبراهين نبوته، ومقامه الرفيع، وواجبنا تجاهه) ، ط ٢ / ٢٠١٧ م .

**بڕگەی سێیەم :** - ﴿ وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِٱلرَّحْمَٰنِ ﴾، واتە: لە حاڵێکدا کە ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە، بێبڕوان بەرانبەر بە خوای خاوەن بەزەیی، یانی: بەردەوامن لەسەر بێبڕوایی .

لێرەدا وشەی (الرّحمان)، هەڵبژێردراوە لە جیاتی (اللّه)، لە جیاتی ئەوەی بفەرموێ: ﴿ وَهُمْ يَكْفُرُونَ باللّه ﴾، فەرموویەتی: ﴿ وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِٱلرَّحْمَٰنِ ﴾، تاکو دەریبخات کە بێبڕوایی ئەوانە، چەندە ناشیرین‌و ناقۆڵایە، کە بەرانبەر بە خوایە، کە خاوەنی ئەوپەڕی میهرەبانیی‌و بەزەیی‌و لوتف‌و کەرەمە، کەچی ئەوان بەرانبەری بێبڕوان !!

**بڕگەی چوارەم :** - ﴿ قُلْ هُوَ رَبِّى ﴾، بڵێ: ئەو (خوایە میهرەبان‌و بەخشندەیە پەروەردگارو خاوەن‌و هەمەکارەی منە ﷻ.

**بڕگەی پێنجەم :** - ﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، واتە: هەر ئەو پەرستراوی بە هەقە، کەواتە: ئەو شتانەی کە ئێوە دەیانپەرستن، هیچیان شایستەی پەرستن نین‌و، لە ڕاستییدا ئێوە ڕەنج بە خەسارن، چونکە شتانێك دەپەرستن، کە شایستەی پەرستران نین .

**بڕگەی شەشەم :** - ﴿ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ ﴾، پشتم هەر بەو دەبەستم، پشتم تەنیا بەو بەستوە

**بڕگەی حەوتەم :** - ﴿ وَإِلَيْهِ مَتَابِ ﴾، گەڕانەوەشم تەنیا بۆ لای ئەوە، لە زمانی عەرەبییدا کاتێك (جارّ ومجرور)، پێش (فعل و فاعل) دەخرێن، کورت هەڵهێنان دەگەیەنێ، واتە: من تەنیا پشتم بەو قایمە، پشتم بەو بەستوە گەڕانەوەشم تەنیا بۆ لای ئەوە

(متاب)، یان چاوگ (مصدر)ی (میمي)یە لەسەر کێشی (مَفْعَل)، بە مانای گەڕانەوە بۆ لای خوا، یاخود (متاب)، ناوی شوێن (اسم مکان)ە، بە مانای شوێنی

بۆ لا گەڕانەوە، واتە: ئەو شوێنەی كە من بۆ لای دەگەڕێمەوە، تەنیا لای خوای پەروەردگارە .

هەڵبەتە لە هەردوو حاڵەتدا، وشەی (مَتَاب)، لەبەرئەوەی لە كۆتایی ئایەتدایە، ئەگەرنا لە ئەسڵدا (ي)ی هەیە، (وَإِلَيْهِ مَتَابِي)، تۆبەكردنو پەشێمانبوونەوەی من، تەنیا بۆ لای ئەوە

**مەسەلەی شەشەم :** خستنەڕووی ئەو ڕاستییە كە بێبڕوایان هەر ئایەتەوێ بڕوا بێننو، ﷺ بیانوو گرتن دەگەڕێن، بۆیە نابێ بڕوادارال گوێ بە بڕو بیانوویەكانیان بدەنو، بەهانە گرتنی ئەوان، دووچاری گومانو دوو دڵییان بكات :

خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿وَلَوْ أَنَّ قُرْءَانًا سُيِّرَتْ بِهِ ٱلْجِبَالُ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ ٱلْأَرْضُ أَوْ كُلِّمَ بِهِ ٱلْمَوْتَىٰ ۗ بَل لِّلَّهِ ٱلْأَمْرُ جَمِيعًا ۗ أَفَلَمْ يَاْيْـَٔسِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَهَدَى ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ۗ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُوا۟ قَارِعَةٌ أَوْ تَحُلُّ قَرِيبًا مِّن دَارِهِمْ حَتَّىٰ يَأْتِىَ وَعْدُ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿٣١﴾﴾

شیكردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەكە ﷺ لە (١٠) بڕگەدا :

**بڕگەی یەكەم :** - ﴿وَلَوْ أَنَّ قُرْءَانًا سُيِّرَتْ بِهِ ٱلْجِبَالُ﴾، ئەگەر قورئانێك ببووایە، چیایەكانی پێ ڕۆێندرابان، ﴿سُيِّرَتْ﴾ واتە: (زُيِّلَتْ، أو أُزيلَتْ)، (سَارَ)، یانی: ڕۆیشت (سُيِّرَ)، یانی: ڕۆێنرا، ڕۆیشتێنرا، لە شوێنی خۆی لادرا، یانی: ئەگەر قورئانێك ببووایە كە چیایەكانی پێ ڕۆێنرابانو جووڵێنرابانو، لە شوێنی تێدا سەقامگیربوونی خۆیان، لادرابان .

**بڕگـــــەی دووەم :** - ﴿ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ ٱلْأَرْضُ ﴾، یـــاخود زەوی پــێ بڕدرابـــایە، سەرزەمینی پێ دابڕ دابڕ کرابـایە، پـێ پارچە پارچـە کرابایـە

**بڕگـەی سێـیـەم :** - ﴿ أَوْ كُلِّمَ بِهِ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾، یاخود مردووانی پێ دوێنرابـان، یـانی: مردووانــی پــێ زیندووکرابـــانەوە، دوایی ئاخافتنــیان لەگەڵ قورئانـدا کردبایـە، لێرەدا خـوا ﷻ ســێ شـتی زۆر سـەرسـوڕهێنـەر کە بریتـین لە :

١) لە جێـی خۆ لابردنی چیایەکـانو جووڵێنرانیـان

٢) دابـڕ دابـڕ کردنـی زەویو، پارچە پارچە کردنـیو، قڵت قڵت کردنـی

٣) زیندووکردنـەوەی مردووانو، دوێنـرانیـان

ئـەو سـێیەی کردوون بـە سـێ سـیفەتی کریمـانەیی قورئـانێـك، دەفـەرموێ: ئەگەر قورئـانێك ببووایە، ئەو سێ شـتـەی پــێ کرابـان، بـەڵام وەڵامەکـەی دیـار نیـە، وەڵامەکـەی فرتێـنراو (محذوف)ە، لەبەر ئـەوەی سـیاقەکـە دەیگـەیەنـێ

ئنجـا هـەندێك لە زانـایـان دەڵـێن :

**یەکـــەم** : یـانـی: ئەگـەر قورئانێـك ببووایە کە چیـایەکـانی پـێ ڕۆێنرابانو، زەوی پێ بـڕ بــڕ کـرابایەو، مردووانـی پــێ دوێنـرابـــان (لَكَانَ هَذا القُرآنُ)، ئـەوە ئـە قورئـــانە دەبــوو .

**دووەم** : هەنـدێکی دیکە گـوتوویانە: نـەخێر وەڵامـی: ئەگـەر (لَوْ)، ئەوەیـە: (لَكَفَرُوا بالرَّحْمَان)، ئەوانـە ئەگـەر قورئـانێکی ئـاواش ببووایـە، هــەر بێبــڕوا دەبــوون بــە خــوای میهرەبــان .

**سێیەم** : هەندێکی دیکـەش گـوتوویـانە: وەڵامـی ئەگـەر (لَـو) {لــە زمـانی کوردییـدا (لَـوْ)، دەبێتــە ئەگــەر، ئەگـەر} قورئـانێك ببووایە: چیــایەکانی پێ ڕۆێنرابانو، زەوی پــێ بـڕ بـڕ کرابایـەو، مردووانـی پـێ دوێنـرابایــە (لَمَا آمَنُوا بـهِ)، دیسان موشـریكو کـافرەکـان بـڕوایان پـێ نەدەهێنـا، وەك چـۆن بـڕوا بـەم قورئـــانە ناهێنــن، کە ئەو شـتـانەی پـێ ناکرێـن، ئەگەر قورئانێك ببووایـە، ئـەو سـێ کارە سـەرسـامکەرەشی ئەنجام دابـانـایە، دیسـان بـڕوایـان پــێ نەدەهێـنـا .

هەڵبەتە من ئەوەی سێیەمم زیاتر بە دڵە، هەرچەندە یەکەمیش ڕێی تێدەچێو، سێیەمیش لە یەکەم نیزیکە، بەلاّم سێیەمم زیاتر بە دڵەو، هەمان مەبەست لە سوورەتی (الأنعام)یشدا هاتوە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلْمَوْتَىٰ وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَىْءٍ قُبُلًا مَّا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوٓا۟ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ ﴿١١١﴾ ﴾، واتە: ئەگەر ئێمە فریشتەمان دابەزاندبایانە سەریان، مردووان دواندبایانو، هەموو شتێکمان بۆ خڕ کردبانەوەو بە پێشوازییانەوە چووبانایە، یاخود ڕووبەڕوویان چووبانایە، دیسان نەدەگونجا بڕوا بێنن، مەگەر خوا ویستبای، بەلاّم زۆربەیان نافامن .

☜ ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (الأنعام)دا، ☜ بەرگی پێنجی ئەم تەفسیرەیە، بە تەفصیلْ ئەو ئایەتەمان تەفسیر کردوە

ئنجا لەوبارەوە بەسەرهاتێکیش گێڕدراوەتەوە، هەرچەندە لە ڕووی سەنەدەوە بێهێزە، بەلاّم زۆربەی تەفسیرەکان هێناویانە، منیش هێنام، بۆ زیاتر بەرچاوڕوونیی، هەر کام لە (الطبري، وابن كثير، الرّازي)و، تەفسیرەکانی دیکەش هێناویانە، بەلاّم من لە (فتح القدير)ی (الشوكاني)یەوە[1]، ئەم ڕیوایەتەم هێنا :

{عَنْ عطِيَّة العُوفِي قَالَ: قَالُوا: لِمُحَمَّد ﷺ: لَوْ سَيَّرْتَ لَنَا جِبَالَ مَكَّةَ، حَتَّى تَتَّسِعَ فَنَحْرُثَ فِيهَا، أَوْ قَطَعْتَ لَنَا الأَرْضَ، كَمَا كَانَ سُلَيْمَان يَقْطَعُ لِقَوْمِهِ بِالرِّيحِ، أَوْ أَحْيَيْتَ لَنَا الْمَوْتَى، كَمَا كَانَ يُحيِي عِيسَى الْمَوْتَى لِقَوْمِهِ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ وَلَوْ أَنَّ قُرْءَانًا سُيِّرَتْ بِهِ ٱلْجِبَالُ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ ٱلْأَرْضُ أَوْ كُلِّمَ بِهِ ٱلْمَوْتَىٰ ۗ بَل لِّلَّهِ ٱلْأَمْرُ جَمِيعًا ۗ أَفَلَمْ يَا۟يْـَٔسِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ... ﴿٣١﴾ ﴾}، (أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبِي حَاتِم وَأَبُو الشيخ وَابْنُ مرْدَوَيه

---

١) ج ٢، ص ١٠٢.

عەطیيەی عووفیی گوتوویەتی: بە موحەممەد ﷺ یان گوت: (بە دڵنیایی هاوبەش بۆ خوا دانەرو کافرەکانی مەککە بوون) گوتیان: ئەگەر چیایەکانی مەککەت بۆ ڕۆیندباین، بۆت دوورخستباینەوە، تاکو سەرزەمینی مەککە، فراوان بێ‌و کشتوکاڵی تێدا بکەین، یاخود زەوییت بۆ بڕ بڕ کردباین، وەك چۆن سولەیمان بەهۆی باوە، زەوی بۆ گەلەکەی دەبڕی، یاخود مردووانت بۆ زیندوو کردبایتەوە، وەك چۆن عیسا مردووی زیندوو کردبوونەوە، بۆ گەلەکەی! خواش ﷻ ئەم ئایەتەی نارده خوار .

<u>برگەی چوارەم</u> : - ﴿ بَل لِّلَّهِ ٱلْأَمْرُ جَمِيعًا ﴾، واتایەکەی ئاوایە: بەڵکو کار هەمووی هی خوایە، واتە: ئەم داواکارییانەی پێغەمبەری خوا ﷺ یان دەڵێن، ئەو داواکارییانەی کە ئاڕاستەی پێغەمبەری خوایان دەکەن، لە شوێنی خۆیاندا نین، چونکە کار هەمووی بە دەست خوای بەرزی مەزنە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەرکی ئەوە نیە ئەو کارانە بکات، وەك لە ئایەتەکانی دواتردا خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: تۆ تەنیا گەیاندنت لەسەرەو، ئەو مەبەستە لە چەند شوێنێکی قورئاندا دووبارە کراوەتەوە، بۆ وێنە:

ا/ ﴿ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ ﴿٤٠﴾ ﴾ الرعد

ب/ ﴿ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٥٤﴾ ﴾ النور.

ج/ ﴿ فَهَلْ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٣٥﴾ ﴾ النحل .

لە چەند جێیەکی قورئاندا دووبارە بۆتەوە کە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)و پێغەمبەری خاتەم لە نێویاندا، تەنیا گەیاندنی پەیامی خوایان لەسەرەو، ڕوونکردنەوەی ئەو پەیامەیان لەسەرە، بەڵام: زەوی وا لێ بکات‌و، چیایان لابەرێ‌و، مردووان زیندوو بکاتەوە! ئەوە کاری پێغەمبەر ﷺ نیەو، ئەگەر خوا ﷻ هەندێك لەو جۆرە کارانەی بۆ پێغەمبەرانی پێشووش کردوون، لەبەرئەوە بووە کە ئەو جۆرە موعجیزانە، بۆ ئەو کاتە گونجاو بوو ون، بەڵام بۆ ئێستای بەشەرییەت لە دوای هاتنی پێغەمبەری خاتەم ﷺ، ئەو جۆرە

موعجیزانە گونجاو نین، بەڵکو ئەو جۆرە موعجیزەیەی کە بۆ پێغەمبەری خاتەم هاتوە کە قورئانە، تا ئەوە لە ئاستی تێستای بەشەرییەت دایە، وەك دوایی زیاتر لەوبارەوە قسە دەکەین .

**بڕگەی پێنجەم :** - ﴿ أَفَلَمۡ يَاْيۡـَٔسِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن لَّوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَهَدَى ٱلنَّاسَ جَمِيعٗاۗ ﴾، ئایا ئەوانەی بڕوایان هێناوە، نائومێد نەبوون، کە ئەگەر خوا ﷻ ویستبای: تێکڕای خەڵکی دەخستە سەر ڕاستە ڕێ، ڕاستە ڕێی پێ دەگرتن .

لێرەدا زانایان لەبارەی وشەی: (يَاْيۡـَٔسِ)، مشتو مڕیان زۆر بووە :

١/ (أَفَلَمْ يَيْئَسْ)، یانی: ئایا نائومێد نەبوون، بەڵام ئەوان گوتوویانە: یانی: (أَفَلَمْ يَتَبَيَّنوا)، ئایا بۆیان ڕوون نەبۆتەوە ؟

٢/ هەندێکیان گوتوویانە: (أَفَلَمْ يَعْلَموا)، ئایا نازانن ؟

٣/ هەندێکیان گوتوویانە: (أَفَلَمْ يَسْتَيْقِنوا)، ئایا دڵنیا نەبوون ؟

خاوەنی (إعـرَاب القُـرآنِ الكـريم وبيانُـهُ)، (محـي الـدّين الـدرويش)، لـە تەفسیرەکەیدا[1]، دەڵێ: (قِيلَ اسْتُعْمِلَ اليأسُ بمَعْنَى العِلْم، لأنَّ اليَائس عَنِ الشيء، عَالِمٌ بأنَّهُ لا يَكُونُ، كَما اسْتُعْمِلَ الرَّجَاءُ في مَعْنَى الخَوْف، والنِّسيَانُ فِي مَعْنَى التـرْكِ

کە قسەکەیم زۆر پێ جوانە، زۆر جاران گوتوومە: بۆ هەندێك لەو جێگایانەی زانایان تێیان دا کەوتوونە مشتو مڕ، تەماشای زۆر لە تەفسیرەکان دەکەم، کە زیاتر لە (٣٠) تەفسیرم لەبەردەستدا هەیە، بەڵام ئەو تەعبیرەی (محي الدين الدرويش)م لە هەموویان پێ جوانتر بوو، دەڵێ :

گوتراوە: لێرەدا (يأس)، (کە بە مانای نائومێدیی دێ) بە مانای زانیاریی بەکارهاتوە چونکە بابای نائومێد (لە شتێك) دەزانێ کە ئەو شتە نابێ، واتە: کەسێك کە لە شتێك نائومێد دەبێ، زانیاریی بەڵکو دڵنیایی بۆ پەیدا دەبێ،

---

١) [illegible] ٥ ، ص ١٢١.

کە ئەو شتە نابێ و، زانیاریی بوونی ئەو شتەی بۆ پەیدا دەبێ، هەروەك چۆن وشەی ئومێد (رَجاء)، بە مانای ترس (خَوف)، هاتووە، وشەی لەبیرچوون (نسیان)، بە مانای پشتگوێ خستن و واز لێهێنان هاتووە (وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ نَسُواْ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمْ ﴿٦٧﴾ ﴾التوبة. واتە: ئەوان خوایان لە بیر چوو، خواش ئەوانی پشتگوێ خست و، وازی لێهێنان)

قسەکەی جوانە، یانی: ﴿ أَفَلَمْ يَاْيْـَٔسِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، واتە: ئایا ئەوانەی بڕوادارن، نائومێد نەبوون لە بڕوا هێنانی ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە، تاکو زانیارییان بۆ پەیدا بێ بەوە کە بڕوا ناهێنن، یانی: دەبێ لە بڕوا هێنانیان نائومێد بن، ئنجا زانیارییان بۆ پەیدا دەبێ و، دڵنیاییان بۆ پەیدادەبێ بە بڕوانەهێنانیان، کە دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَمْ يَاْيْـَٔسِ ﴾، (الإستفهام الإنكاريُّ، لإنكار عَدَم يأسِ الَّذِينَ آمَنُوا من إيمان الكُفّار)، پرسیارکردنێکی نکوولیلێکەرانەیە و، نکوولییە لە نائومێد نەبوونی ئەوانەی بڕوایان هێناوە لە بڕواهێنانی کافران .

واتە: خوا ﷻ نکوولیی دەکات و، دەفەرموێ: ئایا هەر نائومێد نەبوون لەوەی کە بێبڕوایان ئیمان بێنن ! نائومێد بن، لە بڕوا هێنانیان تاکو زانیاریی و دڵنیاییتان بۆ پەیدابێ بەوەی ئەوانە بڕوا ناهێنن

﴿ أَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَهَدَى ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ﴾، ئاوای لێ دێتەوە: (لإنَّهُ لَو يشاءَ الله لهَدَى النَّاسَ جَميعاً)، یانی: دەبوو نائومێد بن، چونکە ئەگەر خوا بیەوێ، تێکڕای خەڵکی دەخاتە سەر ڕاستە ڕێ، لێرەدا، وشەی: (هَدى) بە مانای ڕێ پێشاندان نیە، چونکە خوا ڕێی پێشانی هەموو خەڵك داوە، بەڵکو (هَدی)، بە مانای خستنە سەر ڕاستە ڕێ، دێ، چونکە وشەی (هدایة)، وەك چۆن بە مانای (ڕێ پێشاندان)، دێ، بە مانای: (خستنە سەر ڕاستە ڕێ)ش دێ، کە لێرەدا مانای دووەم مەبەستە، چونکە خوا ﷻ ویستوویەتی و کردووشیەتی، کە بریتییە لەوەی: هیدایەتی خەڵکی داوە و بە گشتیی پێغەمبەرانی بۆ ناردوون و، بەرنامەی بۆ ناردوون و، بەرچاوی ڕوونکردوونەوە و ڕێی پێشان داون، بەڵام بێگومان هەموویانی نەخستۆتە سەر ڕاستە ڕێ، چونکە نەیویستووە زۆریان لێبکات و

ویستوویەتی ئازادیان بکا، بۆیە کاتێك ئازادی کردوون، هەندێکیان بە ویستی ئازادانەی خۆیان، ڕاستە ڕێیان گرتوەو، هەندێکیشیان بە ویستی ئازادانەی خۆیان، لە ڕاستە ڕێ لایاندایەو، پشتیان لە ڕاستە ڕێ کردوە

**بڕگەی حەوتەم :** - ﴿ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُواْ قَارِعَةٌ ﴾، بەردەوام ئەوانەی بێبڕوان، بەهۆی ئەوەوە کە بە وردەکاریی و کارامەیی کردوویانە، لە کوفرو بێ دینیی و دژایەتیی ئیسلام و مسوڵمانان، بەڵای ڕاچڵەکێنەرو داچڵەکێنەریان بەسەر دێن .

(القَارِعَةُ فِي الأَصْلِ وَصفٌ مِنَ القَرْعِ، وَهُوَ ضَربُ جِسمٍ بِجِسمٍ آخر، ولَمَّا كَانَ القَرْعِ يُحدِثُ صَوْتاً مُبَاغِتاً، يَكُونُ مُزْعِجاً، لأَجْلِ تِلْكَ البَغتَة، صَارَ القَرْ مَجازاً لِلمبَاغتة والمفَاجَاة... وَالمُرَادُ هُنَا الحَادِثَةُ المفْجِعَة بِقَرِينَة إسْنَاد الإصَابَةِ إلَيْهَا [١]

واتە: وشەی (قارعة) لە بنەڕەتدا وەسفە لە (قرع)ەوە، {(قرع) واتە: زرینگە}، دەنگێك کە شتێکی بە شتێکی ڕەق بکەوێ، دەنگێکی لێ بێ، زرینگەیەکی لێ بێ، بەریەککەوتنی جسمێك لەگەڵ جسمێکی دیکەدا، ئنجا لەبەرئەوەی کە (قرع)، دەنگێکی کتوپڕی لێ دێ و، دەنگێکی بێزارکەرەو، ڕاچڵەکێنەرە، بۆیە لەبەر ئەو کتوپڕییەی ئەو زرینگەیە، وشەی (قرع) بەکارهێنراوە بە مەجاز بۆ شتێك کە کتوپڕو لە نەکاو بێت، کە لێرەدا مەبەست لە (قارعة)، ڕووداوێکی دڵتەزێنە، ڕووداوێکی ڕاچڵەکێنەری هەژێنە، بە بەڵگەی ئەوەی کە وشەی (إصابة)ی پاڵدراوەتە لا. ﴿ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُواْ قَارِعَةٌ ﴾، مادام وشەی تووشبوون و بەسەرهاتنی پاڵدراوەتە لا، کەواتە: مەبەست پێی بەڵاو گرفتارییە

**بڕگەی هەشتەم :** - ﴿ أَوْ تَحُلُّ قَرِيبًا مِّن دَارِهِمْ ﴾، یاخود ئەو بەڵا، داچڵەکێنەرو ڕاچڵەکێنەرە، ئەو بەڵاهەژێنە، لە نیزیك ماڵەکەیان بکەوێ، واتە: مەرج نیە بەسەر خۆیان بێ، بەڵام بەسەر دەرو دراوسێ و دەوروبەریان دێ، کە دیارە کاتێك

---

١) التحرير والتنوير ج ١٣، ص ١٤٦.

کە ئینسان بەڵایەکی لە تەنیشتی لە دەوروبەری دەکەوێ، مەرج نیە هەر بە خۆی بکەوێ، ئەگەر هەر لە نیزیکیشی بکەوێ، ڕایدەچڵەکێنێ‌و دایدەچڵەکێنێ، دەڵێ: لەوانەیە دواییش نۆرەی من بێ، کەسێك ئەگەر لە جەنگ دابێ‌و هاوەنێك یان تۆپێك لە تەنیشتیبدات، دایدەچڵەکێنێ با پارچەکانی‌و ساچمەکانی، پێشی نەکەون، دەترسێ ئەوجار یەکێکی دیکە کە دێ، بەوی بکەوێ .

**برگەی نۆیەم:** - ﴿ حَتَّىٰ يَأْتِيَ وَعْدُ ٱللَّهِ ﴾، واتە: بەردەوام ئەو بەڵایانە بەسەر ئەوانەی بێبڕوان دێن، ئەو بەڵا داچڵەکێنەرانە، تاکو بەڵێنی خوا دێ ﴿ وَعْدُ ٱللَّهِ ﴾، لێرەدا (وَعْد: مَصْدَرٌ بِمَعْنَى الـمَفْعُولِ أي: مَوعُودُ الله)، واتە: بەڵێن پێدراوی خوا، کە مەبەست لە بەڵێن پێدراوی خوا، یان سزای دنیایە، یاخود هاتنی ئاخیر زەمان (ساعة)ە، یاخود هەڵسانەوەو زیندووبوونەوەو ڕۆژی دوایی (القيامة والبعث واليوم الآخر)ە .

**برگەی دەیەم:** - ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴾، بێگومان خوا کاتی تەرخانکراو بۆ ڕوودانی قیامەت، یان بۆ ڕوودانی هەر شتێك، دوا ناخات

(الـمَوعِدُ والـمِيعَادُ والـمُوَاعَدَةُ: الوَقْتُ والـمَوْضِع)، هەر سێ وشەی: (مَوعِد، مِيعاد، مُوَاعَدَة)، بە مانای: (کاتی ڕوودانی شتێك) دێن‌و، بە مانای شوێنیش دێن، واتە: شوێنێك کە ئەو کارەسات‌و ڕووداوەی تێدا ڕوو دەدات، کە بە تەئکید لێرەدا مەبەست پێی (ساعة)، یاخود (قیامة)ە

## پوختەی مانای ئەم ئایەتە :

کورتەو پوختەی مانای ئەم ئایەتە موبارەکە ئەوەیە کە: ئەی بڕواداراینە! ئەی مسوڵمانینە! ئێوە ئەو ڕاستییە بزانن! کە بێبڕوایەکان لە بیانوو دەگەڕێن، چونکە ئەگەر گریمان لە جیاتی ئەم قورئانە، خوا قورئانێکی ناردبایە، چیایەکانیشی پێ لە شوێنی خۆیان لابرابان‌و، زەوییشی پێ بڕ بڕ کرابایەو، مردووانیشی پێ زیندوو کرابانایەوەو دواییش دوێنرابانایە، دیسان هەر بڕوایان نەدەهێنا، چونکە یەکیان لەسەر بەڵگە نەکەوتوە، یەکیان لەسەر نیشانەو موعجیزە نەکەوتوە، بۆ زانینی

ڕاستێتیی موحەممەد ﷺ کە پێغەمبەری خوایە، بەڵکو هەر نایەنەوێ بڕوا بێنن، وەك ئایەتی (١١١) سوورەتی (الأنعام)یش زۆر بە ڕوونیی هەمان مەبەست دێنێ، کە خوا دەفەرموێ : ﴿ وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَا إِلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ الْمَوْتَىٰ وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَيْءٍ قُبُلًا مَّا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ ﴿١١١﴾ ﴾ الأنعام

واتە : ئەگەر فریشتەشمان بۆ لا دابەزاندبان‌و، مردووانیش قسەیان لەگەڵدا کردبان‌و، هەموو شتێکیشمان ڕووبەڕوو بۆ خڕکردبانەوە، دیسان مەگەر خوا ویستبای (زۆریان لێ بکات)، ئەگەرنا هەر بڕوایان نەدەهێنا، بەڵام زۆربەیان نافامن.

هەروەها لە سوورەتی (الحجر)یشدا هەر لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا مِّنَ السَّمَاءِ فَظَلُّوا فِيهِ يَعْرُجُونَ ﴿١٤﴾ لَقَالُوا إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَارُنَا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورُونَ ﴿١٥﴾ ﴾

واتە: ئەگەر دەرگایەك (دەروازەیەك)مان لە ئاسمان لێ کردبانەوە، تاکو لێی سەرکەوتبان (وەك پەیژەو قالدرمەیەك پێیدا ڕۆیشتبان بۆ سەرێ) دەیانگوت: ئەوە ئێمە چاومان پەردەپۆش کراوە، ئەوەی کە دەیبینین ڕاست نیە، بەڵکو جادوومان لێکراوە. (واتە: ئەگەر ئەو شتانەی داوایان دەکەن بۆشمان هێنایانە پێش، هەر بڕوایان نەدەهێنا) .

دوایش کە دەفەرموێ : ﴿ أَفَلَمْ يَيْأَسِ الَّذِينَ آمَنُوا ﴾، ئایا هەر نائومێد نەبوون، ئەی بڕواداریندا لە بڕوا هێنانیان، تاکو زانیارییتان پەیدا بێ، بە بڕوا نەهێنانیان، چونکە ئینسان کاتێك لە بوونی شتێك نائومێد دەبێ، زانیاریی بە نەبوونی پەیدا دەبێ، بۆیە ﴿ أَفَلَمْ يَيْأَسِ الَّذِينَ آمَنُوا ﴾، یەکسەر زانایان بە پەیوەست (لازم)ەکەی لێکیان داوەتەوە، ئەگەرنا ﴿ أَفَلَمْ يَيْأَسِ ﴾ یانی: ئایا نائومێد نەبوون ! بەڵام وەختێك ئەوانەی کە بڕوادارن، نائومێد دەبن لە بڕواهێنانی کافران، واتە: دڵنیا دەبن‌و زانیارییان پەیدادەبێ، بە بڕوا نەهێنانیان، بۆیە هەندێکیان وایان لێکداوەتەوە: ئایا ئەوانەی بڕوایان هێناوە، زانیارییان پەیدا نەبووە، کە بێبڕوایەکان، بڕوا ناهێنن ؟

﴿ أَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَهَدَى ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ﴾، ئەگەر خوا ویستبای تێکڕای خەڵکی هیدایەت دەدا، واتە: ئەگەر ویستبای زۆریان لێ بکات، بەڵام نەیویستوە زۆریان لێ بکات، دوایش خوا ﷻ هەڕەشە دەکات، دوای ئەوەی دڵی بڕواداران دەداتەوە ئەوانەی ئیمان ناهێنن لە سۆنگەی ئەوەوە نیە کە : نوقصانیی‌و ناتەواویی لە موعجیزەی پێغەمبەرەکەتاندا (عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، هەبێ ناتەواویی لە بەرنامەو پەیامەکەی دا نیە، بەڵکو ئەوانە هەر نایەنەوێ بڕوا بهێنن، ئەگەرنا دەزانن، هەق لە کوێیە !

دوایی هەڕەشە دەکات لەوانەی بێبڕوان، دەفەرموێ: ئەوانەی هەمیشەو بەردەوام بەڵای داچڵەکێنەریان بەسەر دێن، یاخود لە تەنیشتیان دەکەون، لە تەنیشت مەنزڵگاکانیان، تاکو بەڵێنی خوا، دێ، بەڵێنی خوا یانی: سزای دنیایی، وەك لە جەنگی بەدرو، فەتحی مەککەو، حونەین‌و ئەوانەدا ڕوویدا، {بەنسبەت کافرەکانی مەککەو دەوروبەریەوە}هەروەها هەر بەڵایەکی کتوپڕی دیکە .

یاخود ﴿ وَعْدُ ٱللَّهِ ﴾، بەڵێنی خوا، واتە: هاتنی ئاخیر زەمان (ساعة)، یاخود هەڵسان‌و زیندووبوونەوە (قیامة و بعث)، دوایش خوا ﷻ بۆ تەئکیدکردنەوەو جەختکردنەوە دەفەرموێ: بێگومان خوا بەڵێن دوا ناخات، واتە: لەو کاتەی کە دەبێ تێیدا ڕووبدات‌و، لەو شوێنەی کە دەبێ تێیدا ڕووبدات، دوای ناخات‌و دەیهێنێتە دی .

خوا بە بەزەیی‌و لوطفی بێسنووری لە بەڵای کتوپڕ و سزای گورچك بڕ بمانپارێزێ

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی شەشەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان (٦) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەكانی: (٣٢ – ٣٧)، كە تێیاندا باسی چەند بابەتێك كراوە، ئەو بابەتانەی باسكراون، شەشن :

١/ گاڵتە پێكردنی كافرانی پێشوو، بە پێغەمبەرانی خۆیان (عَلَیْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، وەك هی كافرانی ڕۆژگاری موحەممەدە ﷺ، یان: گاڵتە پێكردنی كافرانی ڕۆژگاری موحەممەد، بە موحەممەد ﷺ و سزا درانیانی لە لایەن خواوە، وەك هی گەلە كافرە پێشووەكانە

٢/ بەراوردێكی نێوان خوا - كە تاكە پەرستراوی هەقە -و ئەو هاوبەشانەی كە بە خەیاڵی هاوبەش بۆ خوا دانەران و بێبڕوایان، هاوتای خوان، كراوە

٣/ سزاو جەزرەبەدانی كافران لە دنیاو دواڕۆژدا، وەك ڕاستییەك خراوەتە ڕوو

٤/ وەسفی پاداشتی پارێزكاران كە بەهەشتی هەمیشەیی خوایە، كراوە، كە هەم میوەكەی، هەم سێبەرەكەی، هەمیشەییەو نابڕێتەوە

٥/ هەڵوێستی نەرێنییانەی بەشێك لە خاوەن كتێبان لە بەرانبەر قورئاندا، كە بریتییە لە نەویەری دڵخۆشبوونیان بەوەی كە بۆ پێغەمبەری خاتەم هاتووە، هەڵوێستی نەرێنیی پێڕ تاقمەكانی ئەهلی كوفر، كەوا پێدەچێ مەبەست پێی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان بن .

٦/ پێناسە كردنی قورئان بە حیكمەتێك كە بە زمانی عەرەبیی هاتووەو هۆشداریدانە پێغەمبەر ﷺ كە ئەگەر شوێن ئارەزووی كافرەكان بكەوێ، پاش زانیاریی خوا بۆ هاتنی، هیچ كەس لە سزای خوا، نایپارێزێ، كە بە تەئكید لێرەدا مەبەست پێی تێگەیاندنی كافرەكانە، كە با نائومێد بن، لەوەی پێغەمبەری خاتەم بەدوای ئارەزووی ئەوان بكەوێو، با دڵنیابن كە هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ كاری وا ناكات، بە دوای ئارەزوویان بكەوێ، كەواتە: با دەست لەو هەوڵە نەزۆكانەیان هەڵبگرن، كە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕاستە شەقامی خوا لابدەن، بۆ سەر ڕێچكەو كوێرە ڕێیەكانی خۆیان

﴿ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَمْلَيْتُ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ فَكَيْفَ كَانَ
عِقَابِ ﴿٣٢﴾ أَفَمَنْ هُوَ قَآئِمٌ عَلَىٰ كُلِّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ قُلْ سَمُّوهُمْ أَمْ
تُنَبِّـُٔونَهُۥ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلْأَرْضِ أَم بِظَٰهِرٍ مِّنَ ٱلْقَوْلِ بَلْ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ مَكْرُهُمْ
وَصُدُّواْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٣٣﴾ لَّهُمْ عَذَابٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَلَعَذَابُ
ٱلْءَاخِرَةِ أَشَقُّ وَمَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ ﴿٣٤﴾ مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا
ٱلْأَنْهَٰرُ أُكُلُهَا دَآئِمٌ وَظِلُّهَا تِلْكَ عُقْبَى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّعُقْبَى ٱلْكَٰفِرِينَ ٱلنَّارُ ﴿٣٥﴾
وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمِنَ ٱلْأَحْزَابِ مَن يُنكِرُ بَعْضَهُۥ قُلْ
إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ وَلَآ أُشْرِكَ بِهِۦٓ إِلَيْهِ أَدْعُواْ وَإِلَيْهِ مَـَٔابِ ﴿٣٦﴾ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ
حُكْمًا عَرَبِيًّا وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَمَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا
وَاقٍ ﴿٣٧﴾ ﴾.

# مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی پێش تۆش (ئەی موحەممەد ﷺ!) گاڵتە بە پێغەمبەرانێك كرا، منیش ماوەیەك لەوانە گەڕام كە بێبڕوا بوون (وازم لێهێنان)، دوایی گرتمن (و سزام دان)، ئنجا سزای من چۆن بوو؟ ﴿٣٢﴾ ئایا كەسێك كە بەسەر هەموو كەسێكەوە ڕاوەستاوەو، دەزانێ چی دەكات (وەك پەرستراوانێك وایە كە بێئاگان؟)، ئەوان (هاوبەش دانەران)یش هاوبەشانێكیان بۆ خوا دانان، بڵێ: ناویان بێنن، یان ئایا هەواڵی شتێكی پێدەدەن (بە خوا) كە لە زەمیندا نایزانێ؟ یان ئایا هەر قسەیەكی ڕووكەشیی دەكەن، بەڵكو ئەوانەی بێبڕوان (لەلایەن شەیتانەوە) پیلانەكەیانیان بۆ ڕازێنراوەتەوەو، لە ڕاستە ڕێ لادراونو، هەر كەس خوا سەرگەردانی بكات، هیچ ڕێنماییكارێكی نابێ ﴿٣٣﴾ (بێبڕوایان) لە ژیانی دنیادا، سزاو ئازاریان هەیەو، سزاو ئازاری دوا ڕۆژ دژوارتریشەو، هیچ پارێزەرێكیان نیە لە دوارۆژدا ﴿٣٤﴾ حاڵو وەسفی بەهەشتێك كە بەڵێندراوە بە پارێزكاران (بەمجۆرەیە:) ڕووباری بە ژێردا دەڕۆن، میوەو سێبەرەكەی بەردەوامو هەمیشەییە، ئا ئەوە ئاكامی (خێری) ئەوانەیە كە پارێزیان كردوەو، ئاگری دۆزەخیش ئاكامی شوومی بێبڕوایانە ﴿٣٥﴾ ئەوانەی (پێشتریش) كتێبمان پێ داون، زۆر خەنی دەبنو شادمان دەبن بەوەی بۆ لای تۆ دابەزێنراوەو، لە تاقمە (كافرە)كان هی وا هەیە، نكووڵیی لە هەندێكی دەكات (كە لەگەڵ ناهەقییەكانی ئەواندا تێكدەگیرێ)، بڵێ: تەنیا فەرمانم بەوە پێكراوە كە خوا بپەرستمو هاوبەشی بۆ دانەنێم، (خەڵكی) تەنیا بۆ لای وی بانگ دەكەمو، گەڕانەوەشم هەر بۆ لای ویە ﴿٣٦﴾ بەو شێوەیە حیكمەتێكی عەرەبییمان دابەزاندوە، ئەگەر بێتو شوێن ئارەزووەكانیان بكەوی، دوای ئەوەی زانیارییت لە خواوە بۆ هاتوە، هیچ سەرپەرشتیارو چەپاڵە دەرێكت نیە (لە سزای خوا) ﴿٣٧﴾}

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱسۡتُهۡزِئَ): (الهُزءُ: مَزْحٌ فِي خفْيَةٍ، وَالإسْتِهْزَاءُ: ارتياد الهُزْءِ وتعاطي الهزء)، وشەی (هُزْءُ)، بریتیە لە گاڵتە پێکردنێکی پەنهان، وشەی (اسْتِهْزَاء)یش، بریتیە لە خەفتان لە گاڵتە پێکردن‌و، بریتیە لە خودی گاڵتە کردنەکەش

(فَأَمۡلَيۡتُ): واتە، مۆڵەتم دان، ڕستم بۆ درێژکردن، بوارم دان، (الإمْلاء: الإمدادُ، وأمْلَى لَهُمْ: أمْهَلَ، وَأَصْلُ أمْلَيْتُ أمْلَلْتُ)، دەگوترێ: (أمْلَى لَهُمْ: أمْهَلَ)، واتە: مۆڵەتی دان، وشەی: (أمليتُ)، لە ڕیشەدا لە (أمْلَلْتُ) هاتوە

(أُكُلُهَا) : (الأكْلُ : مَا يُؤكَلُ منه ، يَعْنِي : المأكولُ)، ئەوەی لێی دەخورێ، کە بریتیە لە میوەی درەختەکان

(حُكۡمًا عَرَبِيًّا) : هەندێك لە زانایان وشەی (حُكْماً)یان بە وشەی حوکم کردن‌و حکومڕانیی، لێک داوەتەوە، بەڵام وا پێدەچێ بە مانای حیکمەت بێ، بۆیە (حُكماً)، یانی: (حکمة) (الحِكْمَة: إصابة الحق بالعلم والعمل)، (حکمة)، بریتییە لەوەی کە ئینسان هەق دەپێکێ، وەك زانایی پێ هەبوون‌و جێبەجێکردن، (فالحكمة من الله: معرفة الأشياء وإيجادُها على غاية الإحكام، والحكمة من الإنسان: معرفة الموجودات وفعلُ الخيرات)، حیکمەت لەلایەن خواوە، بریتیە لە زانینی شتەکان‌و پەیداکردنی شتەکان بە ئەوپەڕی ڕێك و پێکیی، بەڵام حیکمەتی مرۆڤ، بریتیە لەوەی کە مرۆڤ بە دروستکراوەکان ئاشنا بێ‌و کردەوە باشەکان ئەنجام بدات، لە شوێنەواردا هاتوە {الصَّمْتُ حُكْمٌ وَقَلِيل فَاعِلُهُ}، بێدەنگی حیکمەتە، بەڵام ئەنجامدەرانی کەمن، کەواتە: وشەی (حکم)، بە مانای حیکمەت دێ، دواتریش زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەو مەسەلەیە

# مانای گشتی ئایەتەکان

بەڕێزان !

ئەم دەرسەو دەرسی دوایش بە گشتی لەبارەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ پەیامەکەی‌و نەیارەکانی‌و، سەرەنجامی هەردوو لایەنەوەن، لێرەدا خوا ﷻ ڕوو لە پێغەمبەری خاتەم دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ ﴾، بە دڵنیایی گاڵتە کراوە بە پێغەمبەرانێکی پێش تۆش، واتە: تۆ تاکە پێغەمبەرێك نی کە نەیارو دوژمنەکانت گاڵتەت پێ دەکەن، کە هەمیشە گاڵتە کردن، نیشانەی عەقڵ سووکییە، نیشانەی ناتێگەشتووییە، بە زۆریی وایە، مەگەر گاڵتە پێکراوەکە زۆر شایستەی گاڵتە پێکردن بێ، خوا دەفەرموێ: لە پێش تۆشدا گاڵتە بە پێغەمبەرانێك کراوە، ﴿ فَأَمْلَيْتُ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾، منیش ڕستم درێژ کرد، بۆ ئەوانەی بێبڕوان، مۆڵەتم دان، دەرفەتم دان، واتە: دەرفەتم دان کە بزانرێ: چی دەکەن؟ دەگەڕێنەوە، ناگەڕێنەوە؟ ﴿ ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ ﴾، ئنجا (کە خوا ﷻ زانیویەتی تاکو کاتێکی دیاریکراو، ناگەڕێنەوە) گرتمن، سزام دان، ﴿ فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ ﴾، سزادانی من چۆن بوو؟ لە ئەسڵدا: ﴿ فَكَيْفَ كَانَ عقابي ﴾بووە، بەڵام (ي)یەکە (حذف) کراوە ، هەرچەندە لە هەندێ خوێندنەوەدا هاتوە : ﴿ فَكَيْفَ كَانَ عقابي ﴾، سزادانی من، تۆڵەی من چۆن بوو، یانی: زۆر سەرسوڕهێنەر بوو، ﴿ أَفَمَنْ هُوَ قَآئِمٌ عَلَىٰ كُلِّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ ﴾، ئنجا خوا سبحانه وتعالى بەراوردێکی نێوان خۆی‌و ئەو پەرستراوە ساختانە دەکات، کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەیانپەرستن، دەفەرموێ: ئایا کەسێك کە ڕاوەستاوە بەسەر هەموو کەسێکەوە، کە چی دەکات، چۆن دەکات؟ چاودێریەتی بەسەری ڕادەگات، ئنجا بەرانبەرەکەی فرتێنراوە، یانی: ئایا زاتێکی ئاوا، یەکسانە لەگەڵ بتانێك دا، پەرستراوانێکدا کە

ئاگایان نەك لە خەڵك نیە، لە خۆشیان نیـە؟! ﴿ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ قُلْ سَمُّوهُمْ ﴾، هەروەها (كافرەكان) هاوبەشیان بۆ خوا دانان، بڵێ: ناویان بێنن

ئەمە دوو واتای هەن :

یەكەم : ناویان بێنن، ئەگەر ڕاست دەكەن، كێ و كێن !

دووەم : واتە : ئەوانە تەنیا ناون، ناوی بێ نێوەرۆكن، كەواتە: ناوەكانیان بڵێن، چونكە تەنیا ناون و هیچ نێوەرۆكیان نیە

﴿ أَمْ تُنَبِّـُٔونَهُۥ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، یان ئایا ئێوە هەواڵ بە خوا سبحانه وتعالی دەدەن، بە شتێك كە لە زەمیندا نایزانێ؟ هەر شتێك كە زانیاریی خوا پێوەی پەیوەست نەبوو، واتە: بوونی نیە، واتە: ئەو پەرستراوانەی كە ئێوە دەیانپەرستن، خوا وەك پەرستراو نایانزانێ، دەزانێ ئەوە بت و صەنەم و دارو بەردو مانگ و ئەستێرەو چی و چین، دەیانزانێ، بەڵام بە سیفەتی پەرستراوێتیی نایانزانێ، ئنجا كە خوا شتێكی نەزانی كەواتە: بوونی نیە، چونكە زانیاریی خوا پەیوەست دەبێ، بەو شتانەوە كە هەن، ﴿ أَم بِظَـٰهِرٍ مِّنَ ٱلْقَوْلِ ﴾، یان هەروا قسەیەكی ڕووكەشیی دەكەن، واتە: هەر ناوێكی ڕواڵەتییەو بە ڕووكەشیی ئەوانە بە پەرستراو دەزانن! ﴿ بَلْ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ مَكْرُهُمْ ﴾، بەڵكو فێڵ و پیلانی بێبڕوایەكان بۆیان ڕازێنرایەوە (هەڵبەتە لەلایەن شەیطانەوە بۆیان ڕازێنراوەتەوە)، ﴿ وَصُدُّواْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ﴾، هەروەها لە ڕاستە ڕێ لادران، خوێنراویشەتەوە: (وصَدُّوا عَنِ ٱلسَّبِيلِ)، واتە: لە ڕاستە ڕێ خەڵكیان لادا، ﴿ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴾، هەر كەسێك خوا گومڕای بكات، هیچ ڕێنمایی كارێكی چنگ ناكەوێ، بەدڵنیایی خواش لەگوێترە كەس گومڕا ناكات .

﴿ لَّهُمْ عَذَابٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَشَقُّ ﴾، لە ژیانی دنیادا، سزاو ئازاریان بۆ هەیەو، سزاو ئازاری دواڕۆژ، قورسترو زەحمەترو دژوارتریشە

سزای دنیا، هەندێكیان گوتوویانە: ئەوەیە كە بەدیل دەگیرێن و دەكوژرێن لە جەنگەكاندا، بەڵام چونكە ئەم سوورەتە مەككەییە، بۆیە ئەگەر واش بێ، یانی:

لە داهاتوودا ئەو سزایەیان بۆ دێتە پێش، یاخود بەڵاو موصیبەتیان بەسەر دێ، بەڵام من وای تێدەگەم - وەك دوایی زیاتر تیشكی دەخەمە سەر - كە ژیانی كافران خۆی لە خۆیدا، سزاو ئازارو ئەشكەنجەیەو، هەمووی دڵە ڕاوكێ و نارەحەتییە، ﴿ وَمَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ ﴾، لە بەرانبەری خوادا (واتە: لە بەرانبەر سزادانی خواو تۆڵە ستانەوەی خوادا) هیچ پارێزەرێكیان نییە، هیچ كەسێك و هیچ شتێك نییە كە چەپاڵەیان بدات .

ئنجا دێتە سەر باسی وەسفی جێگاو ڕێگاو پاداشتی ئەو پارێزكارانە، كە بریتیە لە: بە هەشتەكانی خوا، ﴿ مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ﴾، وێنەی ئەو بەهەشتەی كە بەڵێن دراوە بە پارێزكاران (مَثَلْ)، بە مانای سیفەت دێ، یانی: سیفەت و وەسفی ئەو بەهەشتە، ئەوەندە سەرسوورهێنەرە وەك پەند (مَثَل) وایە، چۆنە؟ ﴿ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾، ڕووبارى بە ژێردا دەڕۆن، ﴿ أُكُلُهَا دَآئِمٌ وَظِلُّهَا ﴾، خواردنەكەی هەمیشەییەو سێبەرەكەیشی، واتە: هەم میوەكەی، هەم سێبەرەكەی بەردەوامە، نەك وەك درەختی دنیا وەرزێك هەبێ و وەرزێك نەبێ، یاخود وەك درەختەكانی دنیا: گەڵاڕێزان ڕوویان تێبكات و، سێبەرەكەیان نەمێنێ، ﴿ تِلْكَ عُقْبَى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ ﴾، ئا ئەوە سەرەنجامی باشی ئەوانەیە كە پارێزیان كردوە، ﴿ وَّعُقْبَى ٱلْكَٰفِرِينَ ٱلنَّارُ ﴾، سەرەنجامی بێ بڕوانیش، بریتیە لە ئاگر، واتە: ئاگری دۆزەخ

پاشان دێتە سەر هەڵوێستی خاوەن كتێبەكان و تاقمە كافرەكانی دیكەش و دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ ﴾، ئەوانەش كە كتێبمان پێداون، زۆر دڵخۆش دەبن، بەوەی كە بۆ تۆ نێردراوەتە خوار، هەڵبەتە مەبەست پێی ئەوانەیە كە لە خاوەن كتێبەكان بڕوایان هێناوە، یاخود مەبەست پێی ئەوەیە كە: بە گشتی خاوەن كتێبەكان دڵخۆش بوون بەوەی كە پێغەمبەرێكی دیكە هاتوە پێغەمبەری خاتەم ﷺ هاتوە، كە ئەویش پێغەمبەرانی پێش خۆی بە ڕاست زانیوە، بەرلەوەی پێغەمبەری خوا بچێتە مەدینەو، بەرژەوەندیی جوولەكەو نەصرانییەكان لەگەڵ بەرژەوەندیی ئیسلام و

مسولمانانەدا، تێك بگیرێ، بەرژەوەندییە ناهەقییەکانی ئەوان، لەگەڵ بانگەوازی ئیسلامدا تێك بگیرێ، ﴿ وَمِنَ ٱلْأَحْزَابِ مَن يُنكِرُ بَعْضَهُۥ ﴾، لە تاقمەکان، لە پێرو پارتەکان {کە مەبەست پێی ئەهلی کوفرە، کە ئەوانە بەش بەش و، تاقم تاقم و، جۆر جۆر بوون} لەوان هەیە کە نکوولیی لە هەندێکی دەکات، نکوولییان لەو بەشەی کردوە کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی ئەواندا تێکگیراوە، لەگەڵ کلتووری ئەوان و لەگەڵ بیرو بۆچوونی هەڵەو پووچی ئەواندا، تێکگیراوە، ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ وَلَآ أُشْرِكَ بِهِۦٓ ﴾، بڵێ: من تەنیا بەوە فەرمانم پێکراوە کە خوا بپەرستم و، هاوبەشی بۆ دانەنێم، ﴿ إِلَيْهِ أَدْعُوا۟ وَإِلَيْهِ مَـَٔابِ ﴾، هەر بۆ لای وی بانگەواز دەکەم و، گەڕانەوەشم هەر بۆ لای ویە .

لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَـٰهُ حُكْمًا عَرَبِيًّا ﴾، ئاوا بەو شێوەیە، بەو شێوە دابەزاندنە ئەم قورئانەمان دابەزاندوە، لە حاڵێکدا کە حیکمەتێکەو، بە زمانی عەرەبییشە، ﴿ أَنزَلْنَـٰهُ ﴾، (فعل و فاعل و مفعول)ە، یانی (أَنْزَلْنَا القُرآن)، ﴿ حُكْمًا عَرَبِيًّا ﴾، هەردووکیان (حال)ن: ﴿ حُكْمًا ﴾، یانی: (حِكْمةً)، ﴿ عَرَبِيًّا ﴾ یانی: بە عەرەبیی، واتە: ئەم قورئانەمان دابەزاندوە لە حاڵێکدا کە حیکمەتەو، لە حاڵێکیشدا کە بە زمانی عەرەبییە، واتە: زمانێکی ڕۆشن، نەك حیکمەتێکی عەرەبیی بێ، وەك دوایی زیاتر تیشکی دەخەینە سەر، ﴿ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم ﴾، ئەگەر بە دوای ئارەزووەکانیان بکەوی، ﴿ بَعْدَمَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ ﴾، دوای ئەوەی زانیارییت بۆ هاتوە، واتە: زانیاریی وەحیی و پەیامی خوا، ﴿ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا وَاقٍ ﴾، لەلایەن خواوە، واتە: لە بەرانبەر سزای خوادا، هیچ سەرپەرشتیارو هیچ پارێزەرێك و چەپاڵەدەرێکت نیە، ئەی موحەممەد ﷺ! ئەمە هەرچەندە ڕووی لە پێغەمبەری خوایە ﷺ، بەڵام مەبەست پێی کافرەکانە، کە ئێوە ئەی کافرینە! نائومێد بن لەوەی کە پێغەمبەری خوا دوای ئارەزووەکانتان بکەوێ، هیچ تەماعێکتان لەوەدا نەبێ کە پێغەمبەر ﷺ دەستبەرداری ئەو هەقە بێ، کە خوا بۆی ناردوە .

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم** : ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە : گاڵتە پێکردنی بێبڕوایان بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) نەریتێکی لەمێژینەی بێبڕوایانە، ■ بواری مامەڵەیان لەگەڵ پێغەمبەران و نێردراوانی خوادا :

خـوا دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَمْلَيْتُ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ ﴿٣٢﴾ ﴾

**توێژینەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە ، لە چوار بڕگەدا :**

**بڕگەی یەکەم** : - خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ ﴾، بێگومان گاڵتە بە پێغەمبەرانێکی پێش تۆش کراوە، واتە: ئەی موحەممەد! دڵت لە خۆت دانەمێنێ، پێت وابێ: تۆ یەکەمین پێغەمبەری خوای کە گاڵتەت پێکراوە! بەڵکو ئەوە عادەتی بەردەوامی بێبڕوایان بووە، کە گاڵتەیان بە پێغەمبەرانی خۆیان (علیهم الصلاة والسلام) کردوە، گاڵتە پێکردنیش چەند شێوازێکی هەن :

١/ دەگونجێ بە قسە بێ

٢/ دەگونجێ بە لاسایی کردنەوەی کردەیی بێ

٣/ دەگونجێ بە چاوو برۆ جووڵاندن و، بە لێو لێ هەڵقرچاندن بێ .

٤/ لەم ڕۆژگارەی ئێمەش دا، شێوازەکانی گاڵتە پێکردن زۆر زیادیان کردوە، وەك: کاریکاتێر دروستکردن، بە فیلم، یان بە وێنە، وەك لە ساڵانی ڕابردوودا،

بەردەوام لە فەرەنساو لە هەندێك لە دەوڵەتانی ئەسكەندەنافییو، لە ئەمریكا، بەرانبەر بە پێغەمبەری پایە بەرزی ئیسلام، موحەممەد ﷺ، باشترین مرۆڤ و، سەروەری پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، ئاوا بێ ئەدەبیانە رەفتار كراوە، كە هەرچۆن بێ، گاڵتە پێكردن مادام عادەتی كافرانە بەگشتی، عادەتێكی سووكە، كە وەك پێشتریش باسمان كرد: گاڵتە پێكردن، مەگەر چۆن، ئەگەرنا نیشانەو بەڵگەی عەقڵ سووكییو نەزانییو كەمودەنیی بابای گاڵتە پێكەرە بۆیە هەرگیز پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ئەوەیان لە خۆیان نەوەشاندۆتەوە، ئەوەش كە لە قورئاندا هاتوە كە خوا ﷻ لەسەر زاری ئیمانداران دەفەرموێ: ﴿ إِن تَسْخَرُواْ مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾هود، واتە: ئەگەر ئێوە گاڵتەمان پێ بكەن، ئێمەش گاڵتەتان پێ دەكەین، وەك چۆن گاڵتەمان پێدەكەن، وا پێدەچێ زیاتر مەبەست پێی قیامەت بێ، كە لە قیامەتدا، دوای ئەوەی كە بێبڕوایان ئەو خەونو خەیاڵەی كە بە دوای كەوتوون، خەیاڵ پڵاوەكانی كە بە دوایان كەوتوون، بۆیان دەردەكەوێ كە هیچ نین، دەبنە گاڵتەجاڕی بەهەشتیان .

__بڕگەی دووەم :__ - ﴿ فَأَمْلَيْتُ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، خوا دەفەرموێ: مۆڵەتم دا بەوانەی كە بێبڕوان، (أملى لە)، واتە: ڕستی بۆ درێژ كرد، مۆڵەتیدا، بواری دا، بۆیە (أَمْلَيْتُ)یان، بە: (أَمْهَلْتُ)و بە: (تركت مدةً)، لێكدراوەتەوە، یانی: ڕستم بۆ درێژكرد، بوارمدا، دەرفەتمدا، لێی گەڕام، كە لێرەدا (أمليت)، بە (ل) تەعەددای پێكراوە، ﴿ فَأَمْلَيْتُ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، مانای (أَمْدَدْتُ)، دەگەیەنێ، یانی: (أَمْدَدْتُ لهم)، ڕستم بۆ درێژكردن، یانی: (أملى) مانا ئەسڵییەكەی خۆی كە (مۆڵەتم دا)یە، دەیگەیەنێ، بەهۆی بەركار خوایتنیش بە (ل)، مانای (ڕستم بۆ درێژكرد)یشی خراوەتە نێوو نێواخن (تضمين)ی كراوە .

__بڕگەی سێیەم :__ - ﴿ ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ ﴾، دوایی گرتمن، گرتن (أخذ)، كینایەیە لە سزادانو ئازارو ئەشكەنجەدانو تۆڵە لێ ستاندنەوە

**برگەی چوارەم :** - ﴿فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ﴾، سزادانی من، تۆڵە ستاندنەوەی من، چۆن بوو؟ هەڵبەتە لێرەدا ئەوە بۆ سەرسوڕماندن (تَعْجِيب)ە، (الإِسْتِفْهَام لِلتَّعْجِيب)، ئەو پرسیار کردنە بۆ سەرسوڕماندنە، واتە: سەرت سوڕبمێنێ لە سزای من، چۆن بوو؟ زۆر سەخت بوو، زۆر بێڕەزابوو، زۆر چاوەڕوان نەکراو بوو بۆ بێبڕوایەکان .

**مەسەلەی دووەم :** بەراوردی نێوان: خوا کە تاکە پەرستراوی بە هەقەو، پەرستراوە ساختەکانو، دەرخستنی پووچییو، بێ نێوەرۆکیی، پەرستراوەکانی هاوبەش بۆ خوا دانەران :

خوا دەفەرموێ: ﴿أَفَمَنْ هُوَ قَآئِمٌ عَلَىٰ كُلِّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ قُلْ سَمُّوهُمْ أَمْ تُنَبِّـُٔونَهُۥ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلْأَرْضِ أَم بِظَـٰهِرٍ مِّنَ ٱلْقَوْلِ بَلْ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مَكْرُهُمْ وَصُدُّوا۟ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٣٣﴾﴾

شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە ، لە هەشت برگەدا:

**برگەی یەکەم :** - سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿أَفَمَنْ هُوَ قَآئِمٌ عَلَىٰ كُلِّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ﴾، ئایا کەسێك کە ڕاوەستاوە بەسەر هەر کەسێکەوە، کەچی دەکات ! واتە: چاودێرو ئاگاداری کردەوەکانیەتی، ئەوەی کە وەدەستی دێنێ، ئایا کەسێك کە ئاوایە؟ هەڵبەتە وەڵامەکەی قرتێنراوەو دەگونجێ ئاوا بێ: (كَمَنْ لَيْسَ كَذَلِكَ؟)، وەك کەسێك وایە، یان وەك کەسانێك وایە کە وانین؟ هەندێکیش ئاوایان لێکداوەتەوە: (أي: أَفَمَنْ هُوَ قَائِم عَلَى كُلّ نَفْس بِمَا كَسَبَتْ، ومن جعلوهم له شركاء، سواء في استحقاق العبادة؟).

واتە: ئایا ئەو کەسەی ئاگاداری کردەوەی هەموو کەسێك و، ئەوانەی گێڕاویانن بە هاوبەشی، یەکسانن، لە شایستەیی پەرستران ؟!

بێگومان پەرستراو، خاوەن، پەروەردگار، بەدیهێنەر، دەبێ ئاگادارو شارەزاو مشوورخۆری پەرستەرەکانی بێ، ئەوانەی کە دەیپەرستن و بەندایەتیی بۆ دەکەن، ئاگای لێیان بێ و بەسەریان ڕابگات

ئنجا خوا دەفەرموێ: ئایا زاتێك کە خوایە ﷻ و ڕاوەستاوە چاودێرە بەسەر هەر کەسێکەوە کە چی دەکات و چۆن دەکات! بە سیاق و سەلیقە دەزانین مەبەست ئەوەیە: ئایا خوای پەروەردگار کە شایانی پەرستران و بەندایەتیی بۆ کرانە، وەك شتانێك وایە کە وا نین، کە کراون بە هاوبەشی خوا ؟ بێگومان نەخێر

خاوەنی (التحرير والتنوير) دەڵێ: {القَائِمُ عَلَى الشيء: الرَّقِيبُ، فَيَشْمِلُ الحِفْظ والإِبْقَاء وَالإِمْدَادُ، وَلِتَضَمّنُه مَعْنَى الرّقيب، عُدِّيَ بحَرْفِ (على)، المُفِيد للاستِعْلاء المجازي}، (القِيَام عَلَى الشيء)

واتە: بەسەر ئەو شتە ڕاگەیشت، ئاگاداری بوو، سەرپەرشتییکرد، چاودێریی کرد، یانی: چاودێر، (ئەو دەڵێ: چاودێر، بەڵام من پێم وایە مانایەکەی زۆر فراوانترە هەرچەندە ئەویش دەڵێ:) وشەی (الرقیب)، چاودێر، هەم پاراستن، هەم هێشتنەوە، هەم هاوکارییکردن دەگەیەنێ، ئنجا لەبەرئەوەی کە ﴿ أَفَمَنْ هُوَ قَآئِمٌ ﴾، مانای چاودێری گرتۆتە نێو خۆی، بە پیتی (على) تەعەددای پێکراوە، ﴿ أَفَمَنْ هُوَ قَآئِمٌ عَلَىٰ كُلِّ نَفْسٍ ﴾ کە مانای بەسەر ڕاگەیشتن و باڵادەستیی مەجازیی دەگەیەنێ .

بە کوردیی واتە: ئایا خوایەك کە ئاگاداری هەموو شتێکە، ئاگاداری وردو درشتە، بەسەر هەموو شتێك ڕادەگات، بەسەر هەموو شتێکەوە چاودێرە، وەك پەرستراوانێك وایە کە وانین و، هیچیان لە دەست نایەت؟ بە دڵنیاییەوە نەخێر !

**برگەی دووەم :** - ﴿ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ﴾، واتە: ئەوانە هاوبەشیان بۆ خوا گێڕان، هاوبەشیان بۆ خوا دانان، ئەمە (و)ی (الحالیة)یە، (أي: والحال أنهم جعلوا لهُ شركاء)، لە حالێکدا کە ئەوان هاوبەشیان بۆ خوا داناون، واتە: لە پەرستن و بەندایەتیی بۆ کردندا .

**برگەی سێیەم :** - ﴿ قُلْ سَمُّوهُمْ ﴾، ئەمە دوو واتای هەن :

ا) بڵێ: ناویان بێنن، واتە: ناویان بێنن، ئەوانە کێن ؟ چین !.

ب) یاخود ناویان بێنن، چونکە ئەوانە بەس ناون و هیچ نێوەڕۆکیان نیە

ئنجا: ﴿ قُلْ سَمُّوهُمْ ﴾، بڵێ: ناویان بێنن، یان ناویان بنێن، لە کوردییدا هەردووکیان لە بەرانبەر ئەو وشەیەدان :

ا/ ناویان بێنن، ئەگەر هەن، کوان، با بزانین: کێن و کێن ؟

ب/ یاخود ناویان بنێن، چونکە هەر ناون و هیچ نێوەڕۆکیان نیە، کەواتە: وەك لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسْمَآءً سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم ﴿٤٠﴾ ﴾، واتە: ئێوە تەنیا ناوانێك دەپەرستن جگە لە خوا، کە خۆتان و باب و باپیرانتان ئەو ناوانەتان لەو شتانە هەڵداون و، هەر ناوی ڕووتن .

**برگەی چوارەم :** - ﴿ أَمْ تُنَبِّـُٔونَهُۥ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، یان ئایا هەواڵ بە خوا دەدەن بە شتێك کە نایزانێ لە زەویدا! ئایا هەواڵی شتێکی پێ دەدەن کە خوا زانیاریی پێی نیە لە زەویدا، جا شتێك کە خوا زانیاریی پێی نەبێ، لە زەویدا، دیارە نیە، چونکە: ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٩٧﴾ ﴾المائدة، واتە: بێگومان خوا بە هەموو شتێك زانایە، ئنجا شتێك کە خوا نەیزانێ، دیارە نیە، زانیاریی خوا پەیوەست دەبێ بەو شتانەوە کە هەن، یان دەگونجێ هەبن، بەڵام شتێك کە نەبێ، زانیاریی خوا پێیەوە پەیوەست نابێ .

یەکێك بۆی هەیە، بڵێ: ئاشکرایە ئەو بتانە هەبوون، ئنجا ئەگەر ماڵ و خۆرن، ئەگەر دارو بەردن، ئەگەر سادین[1] و سەرپەرشتیاری بتەکانن!! دەڵێین: بەڵێ هەبوون، بەڵام وەك پەستراو نەبوون، واتە: خوای پەروەردگار، وەك پەرستراو نایانزانێ، بەڵام وەك دارو بەردو مانگو خۆر و ئەستێرە، دەیانزانێ، پسپۆڕانی زمان گوتوویانە : (إستفهام إنكاري توبيخيٌ، أي: ما كان لكم أن تفتروا على الله فتضعوا لهُ شركاء لم يُنبئكم بوجودهم)، ئە پرسیارلێکردنە، پرسیارلێکردنی نکووڵیلێکردنی سەرزەنشتکارانەیە، واتە: ئێوە بۆتان نەبوو درۆ بە ناوی خواوە هەڵبەستن و، هەندێك هاوبەشانی بۆ دابنێن کە خوا هەواڵی پێنەداون، هەمن، شتێکیش خوا نەیفەرمووبێ هەیە، دیارە نیە، وەك هاوبەش بۆ خوا، نیە، نەك وەك دارو بەردو ئەستێرەو خۆرو مانگو هەواو ئارەزوو، مارو دووپشك و بۆق و، ئەو شتانەی دیکە کە ئێستاش لەگەڵدابێ، خەڵکێکی زۆر ـ لە کاتێکدا کە لە ڕاستە شەقامی خوا بەیەکگرتن لادەداو، تووشی کوێرە ڕێی شیرك و بتپەرستیی دێن ـ دەیانپەرستن .

لە سوورەتی (یونس)دا ئەم مەسەلەیە بەو شێوەیە هاتوە: ﴿ قُلۡ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعۡلَمُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ١٨ ﴾ واتە: بڵێ: ئایا هەواڵ بە خوا دەدەن بە شتێك کە نە لە ئاسمانەکان و نە لە زەوی دا، نایزانێ، واتە: بوونی نیە، نە لە سەرێ و، نە لە خوارێ .

<u>بڕگەی پێنجەم :</u> - ﴿ أَم بِظَٰهِرٖ مِّنَ ٱلۡقَوۡلِ ﴾، یان ئایا ئێوە هەواڵ بە خوا دەدەن، هەر بە قسەیەکی ڕواڵەتیی و ڕووکەشیی، بڵێ: ئایا هەواڵ بە خوا دەدەن بە شتێك، کە لە زەویدا نایزانێ، یاخود ئایا هەر هەواڵی پێدەدەن بە شتێك، کە شتێکی ڕواڵەتیی و ڕووکەشییە ؟

هەڵبەتە لێرەدا ﴿ بِظَٰهِرٖ مِّنَ ٱلۡقَوۡلِ ﴾، واتە: شتێکی ڕووکەشیی و ڕواڵەتیی، یانی شتێك کە بوونێکی چەسپاوی نەبێ، ئەگەرنا مەبەست پێی شتێکی

١) سادن، کۆیەکەی، (سَدَنة)یە. یانی، بتەوان مەزارگەوان

بینراوو ئاشکرا، نیە، بەڵکو مەبەست پێی شتێکی ڕوکەشیی‌و ڕوواڵەتییە کە نێوەڕۆکی نەبێ .

**بڕگەی شەشەم :** ﴿ بَلْ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا مَكْرُهُمْ ﴾، (خوا ﷻ دەفەرموێ:) نەخێر، ئەوانە هیچیان وانین، بەڵکو ئەوانەی بێبڕوان، فێڵ‌و پیلانی خۆیانیان بۆ ڕازێنرایەوە، (مَكر)، بریتیە لە شاردنەوەی ئامرازەکانی زیان گەیاندن، یان مەبەست پێی ئەو شیرکەیە کە ڕەواجی پێدەدەن، کە تەنیا فێڵێکە خەڵکی سادەی پێ هەڵدەخەڵەتێنن .

ئنجا یەکێك بۆی هەیە بڵێ: ئایا: ﴿ زُيِّنَ ﴾ کە بکەر نەزانراو (مجهول الفاعل) هاتوە بۆیان ڕازێنراوەتەوە کافرەکان ئەو فێڵ‌و پیلانەی خۆیانیان بۆ ڕازێنراوەتەوەو بۆ جوانکراوە ئایا ڕازێنەرەوەکە کێیە؟ بە دڵنیایەوە شەیتانە، وەك خوا ﷻ لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ ﴿٣٨﴾ ﴾، واتە: شەیتان کردەوە خراپەکانی بۆ بێبڕوایان ڕازاندۆتەوە

**بڕگەی حەوتەم :** ﴿ وَصُدُّوا عَنِ السَّبِيلِ ﴾، هەروەها لە ڕێ لادران، بە لاڕێ دابران، لە ڕاستە ڕێ لادران، خوێنراویشەتەوە: (وصَدُّوا) واتە: خەڵکیان لە ڕێ لادا، واتە: دوای ئەوەی کە پیلان‌و فێڵی خۆیانیان بۆ ڕازێنرایەوە لەلایەن شەیتانەوە، خەڵکیان لە ڕێ لادا، یانی: لە ئاکامی ئەوەدا، لە ڕاستە ڕێ لادران .

**بڕگەی هەشتەم :** ﴿ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ ﴾، هەر کەسێك خوا گومڕای بکات، هیچ ڕێنماییکارێکی بۆ نیە، هیچ کەسێکی نیە دەستی بگرێ‌و بیخاتەوە سەر ڕاستەڕێ، خواش ﷻ ـ وەك چەند جارێکی دیکەش گوتوومانە: ـ لە گۆترە کەس گومڕا ناکات، هەروەك لە گۆترەش کەس هیدایەت نادات، بەڵکو خراپەکاران گومڕا دەکات، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يُضِلُّ بِهِ إِلَّا الْفَاسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ﴾البقرة

هەروەها دەفەرموێ : ﴿ وَيُضِلُّ اللَّهُ الظَّالِمِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾إبراهيم

هەروەها خوا چاکەکارانیش ڕێنمایی دەکات، وەك دەفەرموێ : ﴿ وَيَهْدِيٓ إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ ﴾ الشورى .

﴿ وَيَهْدِيٓ إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ ﴿٢٧﴾ ﴾الرعد

ئەم ئایەتە پیرۆزە شەش جۆرە شێوازی گرتوونە خۆی، وەك خاوەنی (التحرير التنوير)[1]، گوتوویەتی :

<u>یەك</u> : سەرزەنشت کردنیان لەسەر ئەوەی بتو صەنەمەکانی خۆیان، قیاس دەکەنە سەر خوا، بە قیاس کردنێکی ناتەواو و نەزانانە، کە دەفەرموێ: ﴿ أَفَمَنْ هُوَ قَآئِمٌ عَلَىٰ كُلِّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ ﴾، کە وەك گوتمان: بەرانبەرەکەشی ئەوەیە: (كَمَنْ هُوَ لَيْسَ كَذَلِكَ) !

<u>دوو</u> : ئەوە کە خوا ﷻ بە نەزانو نەفامیان دادەنێ، کە هەندێك ناویان داناون: نێوەرۆکیان نیە، هەندێك ناویان داناون، لەسەر هەندێك شتو کردوویانن بە پەرستراوی خۆیان، کە دەفەرموێ : ﴿ قُلْ سَمُّوهُمْ ﴾، بلێ: ناویان بێنن، داخۆ کێن ؟ یاخود ناویان بنێن، چونکە تەنیا ناون .

<u>سێ</u> : هەڵوەشاندنەوەی ئەوەی کە پەرستراوەکانیان پەرستراو بن، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا وەك پەرستراو نایانزانێ: ﴿ أَمْ تُنَبِّـُٔونَهُۥ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، ئایا هەواڵ بە خوا دەدەن بە شتێك کە نایزانێ لەسەر زەویدا، واتە: نایزانێ بە سیفەتی پەرستراو

<u>چوار</u> : ئەوە کە لافی ئەوە لێدەدەن: کە ئەوانە پەرستراون، تەنیا قسەیەو، لەگەڵ واقیعدا ناگونجێ، وەك دەفەرموێ : ﴿ أَم بِظَـٰهِرٍ مِّنَ ٱلْقَوْلِ ﴾، ئایا هەواڵ بە خوا دەدەن بە شتێك کە هەروا قسەیەکی ڕووکەشییەو، هیچ حەقیقەتو نێوەرۆکێکی نیە .

---

١) ج ٦، ص ١٥٢.

پێنجەم : خوای پەروەردگار ئەو ڕەفتارەیان بە فێڵو پیلان پێناسە دەکات، ﴿ بَلْ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ مَكْرُهُمْ ﴾، بۆ ئەوانەی کە بێبڕوان، پیلانو فێڵەکەیان بۆ ڕازێنرایەوە .

شەش : ئەوە کە ئەوانە خەڵك لە ڕاستە ڕێ لادەدەنو، خۆشیان لاڕێ دەبن، ﴿ وَصُدُّواْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ﴾، یان: (وَصَدُّوا عَنِ السبيل

**مەسەلەی سێیەم :** بێبڕوایان لە ژیانی دنیایاندا ئازارو سزایان هەیەو، سزای دوا ڕۆژیشیان سەختترو دژوارترەو، هیچ پارێزەرێکیان نیە، کە لە سزای خوا چەپەڵەیانداو بیانپارێزێ :

خوا دەفەرموێ : ﴿ لَّهُمْ عَذَابٌ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَشَقُّ ۖ وَمَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ ﴿٣٤﴾ ﴾

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە ، لە سێ بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم :** ﴿ لَّهُمْ عَذَابٌ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، ئەوانە سزاو ئازاریان بۆ هەیە لە ژیانی دنیادا، ئایا مەبەست لەو سزاو ئازارە چییە ؟

ا) هەندێك لە زانایان گوتوویانە: (بالقتلِ والأسْر)، بەوە کە دەکوژرێنو بە دیل دەگیرێن، بەڵام ئەو سوورەتە لە مەککە هاتۆتە خوار، مەگەر بڵێین: خوا هەڕەشەیان لێدەکات کە لەمەودوا، ئەگەر لەسەر ئەو کوفرو بێبڕواییەتان بەردەوام بن، لە قۆناغێکی دیکەدا، کە قۆناغی مەدینەیەو، جەنگو جیهاد لەسەر مسوڵمانان پێویست دەکرێ، بۆ بەرگریی لە خۆیان، تووشی سزاو ئازار دەبن

ب) هەندێکی دیکە گوتوویانە: (بالكوارث والمصائب)، بەڵاو گرفتارییتان بەسەر دێن، لە ژیانی دنیادا، کافرەکان ئەومیان هەیە

ج) بەڵام من دەڵێم: (حياة الكُفْر عَذَابٌ وَشَقَاء)، ﴿ لَّهُمْ عَذَابٌ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، بێبڕوایان لە ژیانی دنیادا، سزایان بۆ هەیە، چونکە هەموو ئەو بێبڕوایانە نەگوزراون و بە دیل نەگیراون، هەمووشیان مەرج نیە بەڵایان بەسەربێ، بۆیە من بەو واتایەم لێکداوەتەوە کە لە ڕاستییدا لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوە :

هەموو بابایەکی خوانەناس و بێبڕوا لە ڕاستییدا لە ئازارێکی دەروونیی دایە، لەبەر چاولێڵیی دایە، تەماشای ڕابردووی خۆی دەکات، تاریکی دەبینێ، تەماشای داهاتووی خۆی دەکات تاریکیی دەبینێ، تەماشای ئێستای خۆی دەکات، تاریکیی و لێڵیی دەبینێ، ئارەزووەکانی بەسەریدا زاڵدەبن، شەیتان بەسەریدا زاڵ دەبێ، لە هەموو شتێك دەترسێ، وەك پێشتر باسمان کرد، لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا، کە دەفەرموێ : ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾الرعد

**بڕگەی دووەم :** ﴿ وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَشَقُّ ﴾، سزاو ئازاری دواڕۆژ دژوارترەو زەحمەتترە

(شَقَّ عَلَيْهِ الشَّيءُ وَشَقَّهُ فَهُوَ شِقٌّ وشاقٌّ و الجَمْعُ شواقّ)، ئەو شتەی لەسەر قورس و دژواربوو، بەزەحمەت بوو، بێگومان سزای دواڕۆژ بە بەراورد لەگەڵ هی دنیادا، بە دڵنیاییەوە قورسترەو زەحمەتترو دژوارترو سەخترە بۆ بێبڕوایان، کۆی (شِقٌّ وشاقٌّ)یش (شواقّ)ە

**بڕگەی سێیەم :** ﴿ وَمَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ ﴾، لەلایەن خوا هیچ پارێزەریان نیە، هەڵبەتە (واق)، لە بنەڕەتدا (واقي)یەو، بەڵام لەبەرئەوەی کە کۆتایی ئایەتە، (ي)ەکە فڕتێنراوە، هەندێکیشیان هەر وایان خوێندۆتەوە، (الوَاق: الحَائِلُ دُونَ الضـرّ)، (واق) پەردەیەکە ناهێڵێ زیان تووشی مرۆڤ بێ، کە

دەفەرمویٚ : ﴿ وَمَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ ﴾، یانی: (مالهم منْ عَذابِ اللهِ منْ وَاق)، ▪ سزای خوا هیچ پارێزەرێکیان نیە، ئەوەش بە بەڵگەی ئەوەی کە پێشیٚ باسی ئەوە دەکات، یانی: بێبڕوایان لە سزاو ئازاری خوا، لە دوارۆژدا کە تووشیان دێ، یاخود لە دنیاشدا کە تووشیان دێ، هیچ چەپاڵە دەرێک و، هیچ پارێزەرێکیان نیە، کە لە سزای خواو لە بەڵای خواو، لەو نارەحەتییانەی کە خوا بۆی داناون، چ لە دنیادا بە هۆی کوفرو بیٚ دینییانەوە، چ لە دوارۆژدا، وەك سزا، بیانپارێزێ .

<u>مەسەلەی چوارەم</u> : پێناسەی ئاکامی باشی پارێزکاران، کە بەهەشتێکی بەردەوامی پڕ جۆگەو رووباری، میوە بەردەوام و سێبەر هەمیشەییەو، پێناسەی ئاکامی بێبڕوایانیش کە ئاگری دۆزەخە :

خوا دەفەرمویٚ : ﴿ مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۖ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ ۖ أُكُلُهَا دَآئِمٌ وَظِلُّهَا ۚ تِلْكَ عُقْبَى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ ۖ وَّعُقْبَى ٱلْكَـٰفِرِينَ ٱلنَّارُ ﴿٣٥﴾ ﴾.

شیکردنەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە ، لە پێنج بڕگەدا:

<u>بڕگەی یەکەم</u> : ﴿ مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ﴾، وێنەی ئەو بەهەشتەی کە بەڵێن دراوە بە پارێزکاران، (مَثَل) دەگونجیٚ بە مانای وصف بیٚ، (وصف الجنة التي وعد المتقون)، دەشگونجیٚ بە مانای پەند (مَثَل) بیٚ، واتە: سیفەتی ئەو بەهەشتە، هێندە سەرسوڕهێنەرە وەك پەند وایە، ئەو قسە نەستەقانەی کە بەسەر دەمی خەڵکەوەن و، لە بۆنەی جۆراو جۆردا بەکاریان دێنن

ئیبنو قوتەیبە: دەڵیٚ: (الـمَثَلُ: الشَّبَهُ فِي أَصْلِ اللُّغَةِ، ثم قد يصير بمَعْنَى صُورَةِ الشيءِ وَصِفَتِهِ، يُقَالُ مَثَّلْتُ لَكَ كَذَا: أَيْ صَوَّرْتُهُ وَوَصَفْتهُ، فَأَرَادَ هُنَا

بمَثَل الجَنَّةِ: صورتَها وصِفتَها)[1]، واتە: (مثل) بە مانای وێنە (شَبَه)یە، لە زماندا، ئنجا جاری وایە وشەی (مثل) بە مانای وێنەی شتێك و سیفەتی شتێك دێ، دەگوترێ: (مثَّلْتُ لَكَ كذا)، أي (صوَّرت)، واتە: ئەو شتەم بۆ وێناکردی، بۆم پێناسەکردی، کەواتە: لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿مَّثَلُ ٱلۡجَنَّةِ﴾، یانی: وێنەکەی و وێناکەی، دیمەنەکەی و وەسفەکەی .

ئنجا بزانین ئەو بەهەشتەی کە بەڵێن دراوە بە پارێزکاران، چۆنە ؟!

**بڕگەی دووەم :** - ﴿تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾، یەکەمین سیفەتی ئەوەیە کە ڕووباری بەژێردا دەڕۆن، واتە: ڕووبار بە ژێر کۆشکەکاندا دەڕۆن، کە لە نێو باخ و بێستانەکان دان

**بڕگەی سێیەم :** - ﴿أُكُلُهَا دَآئِمٞ وَظِلُّهَا﴾، (أُكُل)، یانی: (مأكول)، ئەوەی کە دەخورێ لەو درەختانە، واتە: میوەکەی، بەروبوومەکەی هەمیشەییە

﴿وَظِلُّهَا﴾، سێبەرەکەشی، سێبەری درەختەکانیشی هەمیشەییە، وەك لە سوورەتی (الواقعة) ئایەتی (٣٣)دا دەفەرموێ: ﴿لَّا مَقۡطُوعَةٖ وَلَا مَمۡنُوعَةٖ﴾، ئەوە لەبارەی میوەکەیەوە، ﴿لَّا مَقۡطُوعَةٖ﴾، واتە: نابڕێ و بڕدراو نیە، ﴿وَلَا مَمۡنُوعَةٖ﴾، ڕێ لێگیراویش نیە .

دەربارەی سێبەرەکەشی دەفەرموێ : ﴿وَظِلّٖ مَّمۡدُودٖ ٣٠﴾، سێبەرێکی دوورو درێژ، کە نابڕێتەوەو بەردەوامە

**بڕگەی چوارەم :** - ﴿تِلۡكَ عُقۡبَى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ﴾، ئا ئەوە سەرەنجامی چاکی ئەوانەیە کە پارێزیان کردوە، سەرەنجام و ئاکامی ئەوانەی کە خۆیان پاراستوە لە گوناهان، ئنجا گوناه دوو جۆرە: یان چواندنی واجبانە، یان شکاندنی قەدەغانە، زۆر کەس وادەزانێ: گوناه، هەر ئەوەیە کە ئەو شتانەی خوا

---

١) فتح القدير للشوكاني ج ٣، ص ١٠١ – ١٠٢.

قەدەغەی کردوون، بیانکەی و ئەنجامیان بدەی!! بەلام نەخێر، بەڵکو پێش ئەوە: گوناه بریتیە لەوە کە ئەوەی خوا فەرزی کردوە، بیچوێنی، بەڵکو لەڕاستییدا ئەگەر مرۆڤ خۆی بپارێزێ لە چواندنی ئەو شتانەی کە خوا لەسەری پێویست کردوون، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکیی، دەپارێزرێ لەو شتانەی کە خوا لێی قەدەغە کردوون، بە بەڵگەی ئەو ئایەتە کە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۝٤٥﴾، واتە: بێگومان نوێژ خاوەنەکەی قەدەغە دەکات لە هەر قسەیەکی ناقۆڵاو، هەر کردەوەیەکی خراپ، واتە: نوێژ خاوەنەکەی لە قسەو کردەوەی خراپ دەگێڕێتەوە، واتە: تۆ ئەگەر نوێژکەری باش بیو، فەرزی خوا جێبەجێ بکەی، قەدەغەی خوا ناشکێنی، هەمیشە شەیتان لە کاتێکدا کە مرۆڤ لە خوا بێ ئاگا دەبێ، دڵەکەی بێ ئاگا دەبێ، لەو کاتانەدا زەفەر بە مرۆڤ دەبات .

**بڕگەی پێنجەم :** - ﴿وَّعُقْبَى ٱلْكَٰفِرِينَ ٱلنَّارُ﴾، سەرەنجامی بێبڕوایانیش ئاگرە، ئەمە یانی: (لَيْسَ لهم عاقبة ولا منتهى إلاّ ذلك)، هیچ سەرەنجامێك و هیچ کۆتاییەکیان نیە، جگە لە ئاگر، کە بە دڵنیاییەوە مەبەست پێی ئاگری دۆزەخە، خوا لە ئاگری دۆزەخ چەپاڵەماندا، بە لوتف و کەرەمی خۆی بمانپارێزێ

**مەسەلەی پێنجەم :** کتێب پێدراوانی پێشوو، زۆر دڵخۆش دەبن بەوەی بۆ لای موحەممەد ﷺ دابەزێنراوەو، هەندێك لە پێڕو تاقمە کافرەکانیش نکوڵیی لە بەشێك لەو پەیامەی پێغەمبەر ﷺ دەکەن، کە بریتیە لەو بەشەی کە لەگەڵ بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانیاندا ناگونجێ :

خوا دەفەرموێ : ﴿وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمِنَ ٱلْأَحْزَابِ مَن يُنكِرُ بَعْضَهُۥ ۚ قُلْ إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ وَلَآ أُشْرِكَ بِهِۦٓ ۚ إِلَيْهِ أَدْعُوا۟ وَإِلَيْهِ مَـَٔابِ ۝٣٦﴾

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە ، لە پێنج برگەدا:**

**برگەی یەکەم :** - ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ ﴾، ئەوانەی کە کتێبمان پێداون، واتە: پێش تۆ کتێبی ئاسمانیی، کتێبی خواییان پێدراوە، کە مەبەست پێی جوولەکەو نەصرانییەکانن و، هەموو ئەوانی دیکەی وەك وانن، ﴿ يَفْرَحُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ ﴾، دڵخۆش دەبن بەوەی کە بۆ لای تۆ نێردراوەتە خوار، توێژەرەوانی قورئان هەروایان لێکداوەتەوە، گوتوویانە: دڵخۆش دەبن، بەڵام پێشتر باسمانکرد، گوتمان: وشەی (فرح)، یانی: ئەوپەڕی دڵخۆشیی، واتە: زۆر دڵخۆش دەبن، خەمی نەبن، زۆر شادمان دەبن بەوەی کە بۆ لای تۆ نێردراوەتە خوارەوە، ئنجا ئایا مەبەست لەوانە کێن ؟

**یەك :** مەبەست پێی خاوەن کتێبەکانە بەگشتی، کە زۆر دڵخۆش بوون بەوەی کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەرێکی دیکەی خوایەو هاتووە، ئەوەی کە بە پێغەمبەرانی پێشوویە، بە ڕاستی دەزانێ، بەگشتی پێی دڵخۆش بوون، چونکە ماوەیەك بوو کە هیچ کام لە پێغەمبەران نەهاتبوون، خەڵك ڕەنگە هەر لە ئەصڵی پێغەمبەران و پەیامەکانیشیان کەوتبنە گومانەوە، بەڵام بەوە کە پێغەمبەرێکی دیکەش هات، کە پێغەمبەرانی پێش خۆیشی بەڕاست دەزانێ و، لە کتێبی ئەو پێغەمبەرە کۆتاییەدا کە قورئانە، باسی هەموو ئەو پێغەمبەرانە دەکریٌ و، مەدح و سەناو ستایشیان دەکریٌ و، بەسەرهاتەکانیان دەگێڕدرێنەوە، بێگومان ئەوە بۆتە مایەی دڵخۆش بوونیان، چونکە ئەو ڕاستییانەی کە لە قورئاندا هاتوون، لەگەڵ ئەو ڕاستییانەی کە لە کتێبەکانی ئەواندا هەن، لە زۆربەیدا - ئەوانەی کە دەستکاریی نەکراون لە کتێبەکانی ئەواندا - تێك دەگەنەوە

**دوو:** یان کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ ﴾، مەبەست پێی بڕوادارەکانیانە، ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە بە موحەممەد ﷺ کە پێغەمبەری کۆتاییەو، بە قورئان، کە دوایین کتێبی خوایە، دڵخۆش بوون بە پەیام و وەحیی خوا

<u>بڕگەی دووەم</u>: ﴿ وَمِنَ ٱلۡأَحۡزَابِ مَن يُنكِرُ بَعۡضَهُۥ ﴾[1]، لە پارت و کۆمەڵ و تاقمەکانی ئەهلی کوفر، هەیانە نکووڵیی لە هەندێکی دەکات، لێرەدا دەگونجێ مەبەست لە (أحزاب) خاوەن کتێبە ئاسمانییە پێشووەکان بێ، دەشگونجێ مەبەست لە (أحزاب) هاوبەش بۆ خوا دانەران و کافران بێ بەگشتی

من ئەوەی دووەمیانم زیاتر پێ ڕاستە، واتە: لە پێڕو تاقمەکانی ئەهلی کوفر بەگشتی، هەیانە کە بەشێك لە قورئان نکووڵیی لێدەکات و دانی پێدا نانێ، ئەو بەشەشی ئەوەیە کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی ئەواندا تێك دەگیرێ، لەگەڵ عەقیدە پووچەکەیان، لەگەڵ پەرستنە بۆشەکەیان، لەگەڵ ڕەوشتە خراپەکانیان، لەگەڵ هەڵوێستە خراپەکانیان، لەگەڵ کارو کەسابەتی ناشەرعییان، لەگەڵ حوکمڕانیی ستەمکارانەیان، لەگەڵ فێڵزخکاریی و گەندەڵییاندا، تێکدەگیرێ، ئەوەی کە لەگەڵ بەرژەوەندییان دا تێکگیراوە، نکووڵییان لێکردووە و دانیان پێدانەهێناوە .

<u>بڕگەی سێیەم</u>: ﴿ قُلۡ إِنَّمَآ أُمِرۡتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱللَّهَ وَلَآ أُشۡرِكَ بِهِۦٓۚ ﴾، بڵێ: من تەنیا بەوە فەرمانم پێکراوە کە خوا بپەرستم هیچ هاوبەشی بۆ دانەنێم، یانی: پێغەمبەری خوا ﷺ. لێرەدا فەرمانی پێکراوە کە بۆ هەردوو کۆمەڵەکە، هەم ئەوانەی کە زۆر دڵخۆشن بەوەی کە بۆ لای نێردراوەتە خوارو، هەم ئەوانەش کە نکووڵیی لە بەشێك لە پەیامەکەی دەکەن، پێیان ڕابگەیەنێ کە ئەو تەنیا بە خوا بە یەکگرتن ڕەوانەکراوەو، بە دوو شتان فەرمانی پێکراوە :

<u>یەکەم</u>: خوا بپەرستێ

<u>دووەم</u>: هاوبەشی بۆ دانەنێ، یانی: خوا بە یەکگرتن لە خۆیدا بێنێتە دی

ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە کە پێشێ فەرموویەتی: ﴿ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱللَّهَ ﴾، دوایی فەرموویەتی: ﴿ وَلَآ أُشۡرِكَ بِهِۦٓۚ ﴾، کە خوا بپەرستم و، هاوبەشی بۆ دانەنێم،

---

١) الحزب: جماعة فيها غِلَظٌ، بڕوانە، مفردات ألفاظ القرآن، ص١٣٠، المطبعة العصرية/ ٢٠١٢م. واتە، حیزب کۆمەڵێکن پتەویی و زبرییان هەبێ

چونکە: ئەگەر مرۆڤ خوای پەرست، بەڕاستی خوای ناسیوو خوای پەرست، هاوبەشیشی بۆ دانانێ، ئەوانە هاوبەش بۆ خوا دادەنێن، کە خوا ناناسن و چاك خوا ناپەرستن، باش لێی حاڵی نەبوون، ئەوانە تووشی شیرك و هاوبەش بۆ خوا دانان دەبن، ▪ لە دەرەوەی بازنەی ئەهلی ئیسلام، ▪ لەنێو بازنەی ئەهلی ئیسلامدا، وەك لەوبارەوە لە کۆتایی سووڕەتی (یوسف)دا باسێکی خەست خۆڵمان لەبارەی شیرك و هاوبەش بۆ خوا دانەرانەوە کردوە

**برگەی پێنجەم :** - ﴿إِلَيْهِ أَدْعُواْ وَإِلَيْهِ مَـَٔابِ﴾، تەنیا بۆ لای وی بانگەواز دەکەم ، گەڕانەوەشم بەس بۆ لای ویە

وشەی ﴿مَـَٔابِ﴾، (ي)کەی فڕتێنراوە، یانی: (وإليه مآبي)، دەگوترێ: (آب، يؤب، أوباً)، گەڕایەوە ، دەگەڕێتەوە ، گەڕانەوە، ئنجا (مآب)، دوو واتای هەن :

١) شوێنی بۆ ▪ گەڕانەوەی من، کە دەچمەوە بەردەستی، بەس خوایە

٢) ئەو زاتەی کە من دەگەڕێمەوە بۆ لای، بۆ لای و، پەشێمان دەبمەوە، تۆبە دەکەم، هەر خوای بەرزی مەزنە، واتە: وشەی (مآب) هەم دەگونجێ مەبەست پێی گەڕانەوە بۆ لای خوا بێ، وەك لێبڕانەوەو پشت پێ بەستن و پەنا پێبردن و، بۆ لا پەشێمان بوونەوە، یاخود، یانی : شوێنی گەڕانەوەی من، سەرەنجامی من، تەنیا لای ئەوە .

**مەسەلەی شەشەم و کۆتایی :** پێناسەی قورئان بە حیکمەتێك کە بە زمانی عەرەبیی نێردراوە و، هۆشداریی دانە پێغەمبەر ﷺ، کە ئەگەر شوێن ئارەزووەکانیان بکەوێ، هیچ پارێزەری نابن، کە لە سزای خوا چەپاڵەی بدەن و سزای خوای لێ دووربخەنەوە :

خوا دەفەرموێ : ﴿وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ حُكْمًا عَرَبِيًّا وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَمَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا وَاقٍ ۝٣٧﴾.

**شیكردنه‌وه‌ی ئه‌م ئایه‌ته‌ موباره‌كه‌ ، سێ بڕگه‌دا:**

**بڕگه‌ی یه‌كه‌م :** ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ حُكْمًا عَرَبِيًّا ﴾، ئاوا به‌و شێوه‌یه‌ حیكمه‌تێكمان ناردۆته‌خوار، له‌ حاڵێكدا كه‌ به‌ زمانی عه‌ره‌بییه‌، واته‌: ئه‌مو قورئانه‌مان ناردۆته‌ خوار له‌ حاڵێكدا كه‌ حیكمه‌ته‌و له‌ حاڵێكدا كه‌ به‌ زمانی عه‌ره‌بییه‌

هه‌ڵبه‌ته‌ هه‌ندێك له‌ زانایان، وشه‌ی (حُكْم)یان به‌ حوكمڕانیی به‌ به‌رنامه‌و به‌ دادوه‌ری (قضاء) لێكداوه‌ته‌وه‌، به‌ڵام زیاتر وا پێده‌چێ كه‌ مه‌به‌ست له‌ (حكم) لێره‌دا حیكمه‌ت بێ، حیكمه‌تیشمان پێشتر چه‌ند جارێك واتا كردوه‌، كه‌ كورتترین پێناسه‌ی ئه‌وه‌یه‌: (إصابة الحق علماً وَعَمَلاً)، ئه‌وه‌یه‌ كه‌ مرۆڤ له‌ رووی زانیاریی‌و زانینه‌وه‌و، له‌ رووی كاركردن‌و جێبه‌جێ كردنه‌وه‌، هه‌ق بپێكێ، یانی: هه‌ق بناسێ‌و كاریشی پێ بكات، له‌ هه‌موو ڕووه‌كانه‌وه‌ ئه‌وه‌ باشترین پێناسه‌ی حیكمه‌ته‌، یانی: زانیاریی ڕاست‌و دروست‌و، كرداری ڕێك‌و پێك، به‌ پێی ئه‌و زانسته‌ .

بۆیه‌ش ده‌ڵێین: (حكم) لێره‌دا به‌ مانای حیكمه‌ته‌، چونكه‌ ئه‌وه‌ له‌ شوێنی دیكه‌ی قورئانیشدا هاتوه‌، بۆ وێنه‌: له‌ سووره‌تی (مريم)، ئایه‌تی ژماره‌ (١٢)دا، ده‌فه‌رموێ : ﴿ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْحُكْمَ صَبِيًّا ﴾، خوای په‌روه‌ردگار باسی یه‌حیا ده‌كات، ده‌فه‌رموێ: جارێ هه‌ر مێرد منداڵ بوو حیكمه‌تمان پێدا بوو، لێره‌ش كه‌ ده‌فه‌رموێ : ﴿ حُكْمًا عَرَبِيًّا ﴾، یانی: ئه‌م قورئانه‌ خاوه‌ن حیكمه‌ته‌و به‌ زمانی عه‌ره‌بییشه‌

خاوه‌نی (التحرير والتنوير) گوتوویه‌تی : (عربيــاً : حَالٌ ثَانيةٌ وَلَيْسَ صِفَةً لـ (حُكْماً) إذ الحكمة لا توصف بالنسبة إلى الأمم، وإنما المعنى أنه حكمة مُعَبَّرٌ عنها بالعربية، فَحَصَلَ لِهَذَا الكتاب كَمَالاَن: كَمَالٌ مِنْ جِهَةِ مَعَانِيهِ وَمَقَاصِدِهِ، وَهُوَ كَونه حُكْماً، وَكَمَال مِنْ جِهَةِ ألْفَاظِهِ، وَهُوَ المكْنِيُّ عَنْهُ بِكَونِهِ عَرَبِياً)، واته‌: (عربياً) حاڵی دووه‌مه‌، نه‌ك سیفه‌ت بێ بۆ ﴿ حُكْمًا ﴾،

{یانی: خوا نەیویستوە بفەرموێ: حیکمەتێکی عەرەبیی، واتە: حیکمەتێك كە پاڵ دەدرێتە لای گەلی عەرەب، چونکە ئەم حیکمەتە حیکمەتێکی ڕەببانییە، ئەگەرنا عەرەب ئەو كاتە خۆیان لە جەهالەتو نەزانیی دابوون‌و، لە ڕاستییدا موحەممەد ﷺ، بە سیفەتی عەرەببوونی خۆی، قورئانی نەفەرموە، بەڵکو بە سیفەتی پێغەمبەری خوا بوون، قورئانی وەرگرتوەو لە نێو واقیعی كۆمەڵگای عەرەبییدا قورئان هەڵتەقولاوە، بەڵکو لەلایەن خواوە هاتوە، ئەگەرنا واقیعی نەتەوەی عەرەب لەو كاتەدا كە موحەممەد ﷺ لەنێویاندا ڕەوانکرا، پێچەوانەی ئەو حیکمەتە بوو كە خوا ناردی‌و پێچەوانەی ئەو پەیامە بوو، ئەوە بوو كە سێزدە (١٣) ساڵ لە مەككە هەر دژایەتییان كردو بوونە پەرچو لەمپەر لەڕێیدا، كەواتە: دیارە واقیعەكە پێچەوانەی ئەوە بووە، چونکە هەندێك لەوانەی كە دەمارگیریی عەرەبییان هەیە، دەڵێن: ئەوەتا خوا دەفەرموێ: ﴿ حُكۡمًا عَرَبِيًّا ﴾، ئنجا (حكم) بە مانای حوكومڕانیی بێت، یا بەمانای حیکمەت بێ، ئەوە هی عەرەبانە! (میشێل عەفلەق)و حیزبەكەی كاتی خۆی، وایان دەگوت! هەروەها هەندێك لەوانەش كە دەمارگیریی نەتەوەیی دیكەیان هەیە، ئنجا كوردن، فارسن، توركن، دژی عەرەب، ئەوانیش دەڵێن: قورئان هی عەرەبانە، ئەوەتا خوا دەفەرموێ : ﴿ حُكۡمًا عَرَبِيًّا ﴾، كە وەك گوتم: ئەوە بەهۆی نەزانییەوەیەو، بەهۆی ناشارەزاییەوەیە لە زمانی عەرەبیی، چونکە ﴿ عَرَبِيًّا ﴾، سیفەت نیە بۆ ﴿ حُكۡمًا ﴾، بەڵکو حاڵە، حاڵی دووەمە، ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَٰهُ حُكۡمًا عَرَبِيًّا ﴾، ئاوا ئەو قورئانەمان دابەزاندوە، لە حاڵێكدا كە حیکمەتەو، لە حاڵێكیشدا كە ئەو حیکمەتە بە زمانی عەرەبییە}[1]، چونکە حیکمەت پاڵ نادرێتە لای گەلان، بەڵکو مەبەست ئەوەیە كە ئەو حیکمەتە بە زمانی عەرەبیی تەعبیری لێكراوە، كەواتە: قورئان دوو سیفەتی زۆر تەواوی هەن :

یەكەم : لە ڕووی ماناو مەبەستەكانییەوە، بە حیکمەت پێناسە كراوە

دووەم : لە ڕووی بێژەو وشەكانییەوە، كە بە عەرەبیی پێناسە كراوە

١) نێوان كەوانەكان زیادەی خۆمە، كە كەوانەیەكی فراوانە !.

خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الشعراء)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ١٩٢ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ١٩٣ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ١٩٤ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ١٩٥ ﴾، واتە: ئەم قورئانە نێردراوە خواری پەروەردگاری جیهانییانە، گیانی ئەمیندار (کە جیبریلە) هێناویەتە خوار بۆ سەر دڵی تۆ، تاکو تۆ لە وریاکەرەوەکان بی، بە زمانێکی عەرەبیی ڕۆشن (دابەزیوە).

جێی خۆیەتی ئەوەش بزانرێ: کە هەر وشەی (عربي) یانی: قسەیەکی مانا ڕۆشنو ڕاشکاوو ڕوون، ڕاغیبی ئەصفەهانیی دەڵێ: (العَرَبِي: الفَصيح البيِّن مِنَ الكَلامِ، يُقالُ: مَا بالدَّار عَرِيب أي: أحَدٌ يُعْرِب عَنْ نَفْسِه، وَفي الحَديث: {فإنَّ الثَّيِّبَ تُعْرِبُ عَنْ نَفْسِهَا بلسانها، وَالْبِكْرُ رِضَاهَا صَمْتُهَا}[1]، حُكْمَاً عَرَبِياً قيلَ مُفْصِحاً، يُحِقُّ الحَقَّ وَيُبْطِلُ البَاطِلَ

واتە: (عَرَبِي)، یانی: قسەیەکی ڕوونو پاراو، دەگوترێ: (مَا بالدَّار عَرِيب)، واتە: کەس لە ماڵ نیە کە قسە بکاتو تەعبیر بکات لە دەروونی خۆی، لە فەرمایشتی پێغەمبەریش ﷺدا: هاتوە بێوەژن بە زمانی خۆی هەڵوێستی خۆی دەردەخات، بەڵام کچ ڕازیبوونەکەی لە بێدەنگبوونی دایە (لە کاتی مارەکردندا)، کەواتە: ﴿ حُكْمًا عَرَبِيًّا ﴾، گوتراوە: حیکمەتێکە کە زۆر ڕوونو ڕاشکاوە، هەق دەچەسپێنێو ناهەق دەپووکێنێتەوە .

<u>بڕگەی دووەم :</u> - ﴿ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَمَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ ﴾، ئەگەر شوێن ئارەزووەکانیان بکەوی، دوای ئەوەی زانیارییت بۆ هاتوە

یانی: ئەگەر بە دوای ئارەزووی هاوبەش بۆ خوا پەیداکەران، یان: بەدوای ئارەزووی کافرەکان بکەوی، دوای ئەوەی کە زانیارییت لە خواوە بۆ هاتوە، کە پەیامو وەحییی خوات بۆ هاتوە

وەڵامەکەی لە بڕگەی دوایی دایە :

[1] ) اخرجه ابن ماجه برقم: (١٨٧٢)، وَصَحَّحَهُ الألبَانِي.

**برگەی سێیەم :** ﴿ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا وَاقٍ ﴾، لەلایەن خواوە، یان لە بەرامبەر سزای خوادا، هیچ سەرپەرشتیارو هیچ پارێزەرێکت بۆ نیە

(الولي: النصير)، (والواقي: المدافع)، (ولي) بە مانای: یارمەتییدەر، هاوکارو سەرپەرشتیار، دێ، (واق)یش بە مانای: بەرگرییکار دێ، کەواتە: تۆ لەلایەن خواوە تووشی سزا دەبی

ئنجا ئەمە لە ڕاستییدا بریتییە لە نائومێدکردنی هاوبەش بۆ خوا پەیداکەران لەوەدا کە :

١/ تەماعیان هەبێ لەوەدا کە پێغەمبەر ﷺ، بچێتە سەر قسەی وان

٢/ یان خوا ﷻ، وەڵامی پێشنیارەکانیان بداتەوەو موعجیزەی وەك هی پێغەمبەرانی پێشوو، بێ، ئەمە زیاتر ڕووی لە هاوبەش پەیداکەرانە، هەرچەندە لە ڕواڵەتدا ڕووی لە پێغەمبەرە ﷺ، کە ئەو جۆرە تەعبیرەش لە قورئاندا زۆرەو، لە سوورەتی (یونس)دا بە تەفصیلێ باسمان کردوە[1].

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

١) واتە: ئەوەی کە بە ڕواڵەت کەسێك بدوێنرێ‌و، لە ڕاستیی دا مەبەست کەسێکی دیکە، یان کەسانێکی دیکە، بێ

# دەرسی حەوتەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان شەش (٦) ئایەت دەگرێتە خۆی، کە بریتین لە ئایەتەکانی: (٣٨ – ٤٣)، ئەو شەش ئایەتە بە پێزە کە ئایەتەکانی کۆتایی سوورەتی (الرعد)ن، شەش بابەتی گرنگ دەگرنە خۆیان :

بابەتی یەکەم : جەختکردنەوەی ئەو ڕاستییە کە پێش موحەممەد ﷺ، خوا ﷻ پێغەمبەرانی دیکەی ڕەوانکردوون‌و، هاوسەرو ڕۆڵەشی پێداون‌و، بەبێ مۆڵەتی خواش هیچ پێغەمبەرێك هیچ موعجیزەو بەڵگەیەکی نەهێناوە .

بابەتی دووەم : ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە، کە هەموو کارەکان، هەموو ڕووداوەکان‌و پێشهاتەکان، کاتێکی دیارییکراویان هەیەو، خوای بالآدەست، سڕینەوەو چەسپاندنیان، تێدا ئەنجام دەدات .

بابەتی سێیەم : خوا ﷻ چ هەندێك لەوەی هەڕەشەی پێ لە کافرەکان دەکات، پێشانی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ بدات، کە مەبەست پێی بەلاو گرفتاریی بەسەر هێنانیانە، یان سزادرانیانە لە جەنگو ڕووبەڕووبوونەوەیان لەگەڵ مسوڵمانان، لە داهاتوودا، چ بەرلەوەی خوا موحەممەد ﷺ بمرێنێ، ئەوە بێگومان موحەممەد، وەك هەر کام لە پێغەمبەران، تەنیا گەیاندنی پەیامی خوای لەسەرەو، لێپرسینەوەو پاشان سزاو پاداشت دانەوەش، تەنیا کاری خوایە .

بابەتی چوارەم : خستنەڕووی ئەو ڕاستییە، کە خوای زاڵی کاربەدەست، دەستی کراوەیە بۆ هەڵسوکەوتکردن لە دنیاداو، هیچ کەس ناتوانێ بڕیاری خوا هەڵبوەشێنێتەوەو، لێپرسینەوەو سزاو پاداشتی خوا، زۆر خێراو دەستو بردە.

ئایەتی پێنجەم : ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە، کە کافرانی پێشووش پلانو نەخشەی زۆریان داڕشتبوون لە دژی پێغەمبەرانو پەیامەکانی خوا، بەڵام نەخشەیەك کە ڕەها بێو هەڵنەوەشێنرێ، تەنیا لە لای خوایەو، هەموو نەخشەو پلانەکانی کافرانیش، لە ژێر نەخشەو هەیمەنەی خوادان، دواییش بێبڕوایان دەزانن : ئایا کێ سەرەنجامی مەنزڵگای دواڕۆژی لە گرەودایە.

ئایەتی شەشەمو کۆتایی : وەڵامدانەوەی بێبڕوایان کە دەڵێن: ئەی موحەممەد! تۆ پێغەمبەر نی، وەڵامدانەوەیان بەوەی کە بڵێ: واتە: (پێغەمبەر ﷺ بفەرمویێ): خوا بەسە شایەد بێت لە نێوانمانداو، کەسێك کە زانیاری کتێبی خوای لە لایە، واتە: کتێبە پێشووەکان، ئەویش شایەد بێ .

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجًا وَذُرِّيَّةً ۚ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ
بِآيَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ۗ لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ ﴿٣٨﴾ يَمْحُو اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ ۖ وَعِندَهُ أُمُّ
الْكِتَابِ ﴿٣٩﴾ وَإِن مَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِي نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَاغُ وَعَلَيْنَا
الْحِسَابُ ﴿٤٠﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَأْتِي الْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا ۚ وَاللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ ۚ
وَهُوَ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴿٤١﴾ وَقَدْ مَكَرَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلِلَّهِ الْمَكْرُ جَمِيعًا ۖ يَعْلَمُ مَا تَكْسِبُ
كُلُّ نَفْسٍ ۗ وَسَيَعْلَمُ الْكُفَّارُ لِمَنْ عُقْبَى الدَّارِ ﴿٤٢﴾ وَيَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَسْتَ مُرْسَلًا ۚ
قُلْ كَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَمَنْ عِندَهُ عِلْمُ الْكِتَابِ ﴿٤٣﴾ ﴾.

# مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی (ئەی موحەممەد!) لە پێش تۆدا پێغەمبەرانێکمان ناردوون‌و هاوسەران‌و وەچەشمان پێدابوون‌و، هیچ پێغەمبەرێك بۆی نەبووە، نیشانەو موعجیزەیەك بهێنێ (بۆ سەلماندنی پێغەمبەرایەتیی خۆی)، مەگەر بە مۆڵەت‌و ویستی خوا، بۆ هەر کاتێکی دیاریکراو، تۆمارکردن (نووسراو)ێك هەیە (٣٨) خوا هەرچییەکی بیەوێ، دەیسڕێتەوەو لای دەبات‌و، هەرچییەکیشی بوێ، دەیچەسپێنێ‌و، تۆمارکردن‌و نووسینی بنەڕەتیی تەنیا لە لای ویە (٣٩) ئەگەر هەندێك لەوەی گفتیان پێدەدەین، وەك هەڕەشە، پێشانت بدەین (ئەی موحەممەد!)، یان بەرلەوە بتمرێنین، بێگومان تۆ تەنیا گەیاندنی پەیامی خوات لەسەرەو، لێپرسینەوە لەسەر ئێمەیە (٤٠) ئایا بێبڕوایەکان نابینن کە ئێمە دێین لەلایەکانی زەمین کەمدەکەینەوەو، خوا بڕیار دەدات‌و چی بوێ دەیکات‌و، هیچ کەس هەڵوەشێنەرەوەی بڕیار، کاری وی نیەو، لێپرسینەوەی وی خێرایە (٤١) ئەوانەی لە پێش واندا بێبڕوابوون، پیلانیان گێڕاو، نەخشەو پلان هەمووی هی خوایە، هەر کەسێك چی وەدەست بێنێ، دەیزانێ‌و، لەمەودوا بێبڕوایان دەزانن: ئاکامی مەنزڵگای دوارۆژ هی کێیە؟ (٤٢) ئەوانەی بێبڕوان دەڵێن: تۆ ڕەوانەکراونی، بڵێ: خواو ئەو کەسەی زانیاری کتێبی لەلایە، بەسن بۆ شایەدیی نێوان من‌و نێوە (٤٣)}.

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

( وَذُرِّيَّةً ): (الذرية: نَسْلُ الرَّجُلِ ويُسْتَعْمَل للوَاحِد وَالجَمْع وَأَصْلُه الجَمْع) وشەی (ذرية) بە وەچەی پیاو لە قەڵەم دەدرێ، واتە: ڕۆڵە، بۆ تاك و بۆ (كۆ)ش بەكاردێ، بەڵام لە ئەسڵدا بۆ كۆیە

( بِإِذْنِ ٱللَّهِ ): (أَي: إرَادَتِهِ وَأَمْرِهِ وَعلمه)، (إِذْن) بە مانای ویست و فەرمان دێ، بە مانای زانیارییش دێ، بەڵام بێگومان (إِذْن) تایبەتترە لە زانیاریی، چونكە (إِذْن) مەگەر چۆن دەنا كاتێك بەكاردێ، كە ویستی پەروەردگاری لەگەڵ دایە، واتە: ئەو شتانەی كە دەكەونە چوار چێوەی ویستی خواوە

( أَجَلٍ ): (المُدَّةُ المَضْرُوبَة للشيء، وَأَصْلُهُ إِسْتِيفَاء الأَجَل، أَي: مُدَّةُ الحَيَاةِ) وشەی (أجل) بریتیە لە كاتی دیاریكراو بۆ شتێك و، بنچینەكەشی بریتیە لە تەواوبوونی ماوەی ژیان

( كِتَابٌ ): (الكِتَابُ فِي الأَصْلِ اسْمٌ للصَّحِيفَة مَعَ المَكْتُوبِ فِيهِ، وَيُعبَّر عَن الإِثْبَاتِ وَالتَّقْدِيرِ وَالإِيجاب والفرض والعزم، بالكتابة، فالإرادة مبدأ والكتابة منتهى)، (كتاب) لە بنەڕەتدا ناوە بۆ ئەو شتەی كە تێیدا دەنووسرێ و، خودی نووسینەكەش، بەڵام وشەی نووسین (كتابة) تەعبیری پێ دەكرێ بۆ: چەسپاندنی شتێك، ئەندازەگیریی كردنی شتێك، پێویست كردنی شتێك، فەرزبوون، عەزم كردن لەسەر شتێك، چونكە ویستن سەرەتایە و، نووسینیش كۆتاییە

( يَمْحُواْ ٱللَّهُ ): واتە: خوا دەسڕێتەوەو لادەبات، (المَحْو: إِزَالَة الأَثَر) لابردنی شوێنەوار

( أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ ): (أُمّ) واتە: دایك، بە مانای بنەڕەتو بنچینەش دێ، {كُلُّ شَيءٍ ضُمَّ إِلَيْهِ سَائِرُ مَا يَلِيهِ، يُسَمَّى أُمّاً، (أُمُّ الكِتَاب)، اللَّوحُ المَحفُوظ لكون العلوم كُلُّها منسوبة إليه (أم القرى) و (أم النجوم) المجرة}

واتە : هەر شتێك كە ئەوەی لە دوای دێ، بۆ لای پاڵ دەدرێ، پێی دەگوترێ (أم)، (أم الكتاب)، {بە سوورەتی فاتیحە دەگوترێ، لەبەر ئەوەی كە سوورەتەكانی دیكە دوای وی دێنو، پوختەی مانای هەموو سوورەتەكان لە نێو ئەو سوورەتەدا، كۆكراوەتەوە، هەروەها (أم الكتاب) بە زانیاریی بێسنووری خواش دەگوترێو، بە (لوح المحفوظ)یش كە بە پێی ناوەكە، دەبێ جیسمێك بێ (لوح) واتە: تەخت، (محفوظ) واتە: پارێزراو، كە زانایان دەڵێن: دروستكراوێكی خوایە كە خوای زاناو توانا هەموو زانیارییەكانی خۆی دەربارەی دروستكراوەكان، تێدا تۆمار كردوون، هەندێكیش دەڵێن: ئەوە هەر ڕەمزە بۆ زانیاریی خوا، چونكە ئێمە كاتێك بمانەوێ شتێكمان لە بیر نەچێ دەینووسین، بەڵام خوا ﷻ لەبەرئەوەی هەمیشە هەموو شتێكی لەبەرچاوەو، هیچ شتێك فەرامۆش ناكات ، بۆ نیزیك خستنەوە لە عەقڵی ئێمە، وای بۆ وێنا كردووین، كە زانیاریی خوا وەك ئەوە وایە هەمووی تۆمار كرابێ}[1]، ئنجا (لوح المحفو ) لەبەر ئەوەی هەموو زانیارییەكان پاڵ دەدرێنە لای وی، بۆیە وای پێگوتراوە (أُمُّ القُرَى)ش، مەككەیە، چونكە بنچینەی شارو دێهاتەكانی دەوروبەری بووەو، (أُمُّ النُّجُوم)یش بە مەجەڕڕە دەگوترێ :

( ٱلْبَلَٰغُ ): (البلوغُ وَالبَلاَغُ: الإِنْتِهَاء إِلى أَقْصَى المَقْصَد وَالمُنْتَهَى، وَالبَلاَغُ التَّبْلِيغ)، وشەی (بلوغ) و (بَلاَغ) واتە: گەیشتنە ئەوپەڕی شتێكو كۆتاییەكەی، وشەی (بلاغ) بە مانای گەیاندنیش هاتووە كە لێرەدا مەبەست ئەوەیە .

( ٱلْحِسَابُ ): (الحساب: إِسْتِعْمَال العَدَد، حَسَبْتُ أَحْسَبُ حِسَاباً وَحُسْبَاناً: عَدَدْتُهُ (حِسَاب) بریتیە لە بەكارهێنانی ژمارە، دەگوترێ: (حَسَبْتُ، أَحْسَبُ) ژماردم،

---

١) نێوان دوو كەوانەكان زیادەی خۆمە

دەژمێرم، ژماردن، یانی: (عَدَدْتُهُ) واتە: ژماردم، کە بێگومان لێرەدا مەبەست پێی لێپرسینەوەیە، چونکە کە خوای شارەزا، سەرژمێری کردەوە چاكو خراپەکانی مرۆڤ ، دەکات .

❙ ﴿يَحْكُمُ﴾ (أي: يَقضِي، الحُكْمُ: الفِقهُ وَالعِلْمُ والقَضَاء)، وشەی (حُكْم) بە مانای زانیاریی‌و تێگەیشتن دێ‌و، بە مانای بڕیاردانیش دێ‌و، بە مانای جێبەجێکردنی بڕیاریش دێ

❙ ﴿لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِۦ﴾: واتە: هیچ بە دواداچوویەك نیە بۆ بڕیارەکەی، دەگوترێ: (عَقَّبَ عَلَيْهِ : كَرَّ وَرَجَعَ) واتە: بە دوای داچوو، گەڕایەوە، (أي: لاَ أحَدٌ يَتَعَقَّبُهُ وَيَبْحَثُ عَنْ فِعْلِهِ: عَقَّبَ الحَاكِمُ عَلَى حُكْمِ مَنْ قَبْلَهُ: تَتَبَّعَهُ)، واتە: هیچ کەسێك نیە بە دوای بڕیارەکانی دابچێ‌و لێیان بکۆڵێتەوە، هەڵیان بوەشێنێتەوە، (عَقَّبَ الحَاكِمُ عَلَى حُكْمِ مَن قَبْلَهُ) واتە: دادوەر بە دوای بڕیارەکە داچوو، هەڵیوەشاندەوە، چاوی پێداخشاندەوە، وەك شاعیرێك دەڵێ: (وَمَا بَعْدَ حُكْمِ اللهِ تَعْقِيب) دوای بڕیاری خوا، هیچ بە دواداچوونێك نیە، چونکە بڕیاری خوا یەکلاییکەرەوەیە .

﴿ مَكَرَ ﴾: (المَكْرُ: صَرْفُ الغَيْرِ عَمَا يقصدهُ بحيلة)، (مَكْر) بریتیە لەوەی کە کەسێك لە ئامانجی خۆی لابدرێ بە فێڵێك، بە شێوەیەکی پەنهان، یان نەخشە دانان‌و کار هەڵسووڕاندنێکی پەنهان

# مانای گشتی ئایەتەکان

دیارە ئەم شەش ئایەتە گراون بە میسکی خیتامی ئەم سوورەتە موبارەکە، واتە: بە ئایەتەکانی : (٣٨ ـ ٤٣)، خوا ﷻ، سوورەتی (الرعد)ی کۆتایی پێهێناوە سەرەتا دەفەرمویٚ : ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ ﴾، بێگومان، بە دڵنیاییەوە لە پێش تۆشدا پێغەمبەرانێکمان ڕەوانە کردوون .

وشەی لام (ل)، یان بۆ سوێندە، یان بۆ دڵنیاکردنەوەو تەئکیدە، (قد)یش بەهەمان شێوە کە دەچێتە سەرکرداری ڕابردوو، دووبارە مانای ساغکردنەوە (تحقیق) دەگەیەنێ، کەواتە: لێرەدا دوو ئامرازی دڵنیاکردنەوەو جەختکردنەوە هاتوون، ئنجا ئایا حیکمەتەکەی چییە بۆ خوا، ئاوا دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا ﴾، بێگومان، بەدڵنیاییەوە لە پێش تۆشدا پێغەمبەرانێکمان ڕەوانە کردوون؟!

<u>یەکەم :</u> بەرپەرچدانەوەی کافرەکانە، ـ ئەوانەی کە بێخەبەربوون لە باس‌و خواسی پێغەمبەرانی پێشوو ـ پێیان وابووە کە موحەممەد ﷺ، تاکە کەسێکە، گوتبێ: من پێغەمبەری خوام‌و باسی ئەوەی کردبێ کە لەلایەن خواوە، ڕەوانەکراوە! بۆیە خوا ﷻ، دەفەرمویٚ: زۆر بە دڵنیایی لە پێش تۆدا پێغەمبەرانێکمان ڕەوانەکردوون، لە گەلە پێشووەکاندا، ﴿ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجًا وَذُرِّيَّةً ﴾، هاوسەران‌و وەچەشمان پێدابوون

<u>دووەم:</u> حیکمەتێکی دیکەشی ئەوەیە کە هەندێکیان ڕەخنەیان لە پێغەمبەری خوا گرتوە، کە چۆن دەبیٚ پێغەمبەری خوا هاوسەری هەبیٚ‌و ڕۆڵەی هەبیٚ؟ بەڵکو هەندێکیان ڕەخنەیان لێگرتوە : چۆن دەبیٚ بە بازاڕدا بڕوات؟ وەك خوا دەفەرمویٚ: ﴿ وَقَالُوا۟ مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ يَأْكُلُ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشِى فِى ٱلْأَسْوَاقِ ۞٧ ﴾

الفرقان، واتە: گوتیان: ئەوە چ پێغەمبەرێکە، خواردن دەخواتو بە بازاڕدا دەڕوا ؟ ئەوان بە خەیاڵی خۆیان پێیان وابووە کە مرۆڤ لەوە کەمترە: ببێتە نوێنەری خواو ڕەوانەکراوی خواو، تەنیا فریشتەکان شایستەی ئەوەن کە ببنە ڕەوانەکراوی خوا، ﷺ خواردنیان نیەو هاوسەریان نیەو، ئەو پێداویستییانەیان نین کە مرۆڤەکان هەیانن .

بەڵام بێگومان مرۆڤ دەگونجێ زۆر بەرزو گەورەو ناوازە بێ، ئەگەر بۆ خوا صوڵحاو بێو پەیوەندیی لەگەڵ خوادا هەبێ، بۆیە نوێنەرایەتیی خواشی پێدەکرێو، دەگاتە پلەیەك کە فریشتەکان کڕنووشی بۆ ببەن، کڕنووشی ڕێزگرتن، هەروەك دەشگونجێ زۆر خۆی خراپو نزم بکاتەوە بە شێوەیەك کە هەرچی نەفرینکەرە، نەفرینی لێبکات، ﴿ إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ۝٥٥ ﴾ الأنفال ، واتە: بێگومان خراپترین ژیاندارو پێڕۆ، ئەوانەن کە بێبڕوان، چونکە بڕوا ناهێنن .

ئنجا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأۡتِيَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ ﴾، هیچ پێغەمبەرێك بۆی نەبووە، نیشانەیەك بهێنێ، مەگەر بە مۆڵەتی خوا، مەبەست موعجیزەو بەڵگەیەکە لەسەر ڕاستێتیی دەعوای پێغەمبەرایەتییەکەی، (آیة) لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە، واتە، بەڵگەو موعجیزەیەك بهێنێ لەسەر ئەوەی: ڕاست دەکات لەوەدا کە دەڵێ: من پێغەمبەری خوام، هیچ پێغەمبەرێك ئەوەی بۆ نیە، ﴿ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ ﴾، مەگەر بە مۆڵەتی خوا، بە ویستی خوا، بە ڕێگا پێدانی خوا، یان بە فەرمانی خوا، (إذن)، هەموو ئەو واتایانە دەگرێتەوە

﴿ لِكُلِّ أَجَلٖ كِتَابٞ ﴾، بۆ هەر کاتێکی دیاریکراو، تۆمارکردنێك هەیە، نووسینێك هەیە، هەندێکیش وایان لێکداوەتەوە بۆ هەر کارێك، کاتێکی دیاریکراو هەیە، بەڵام لە ڕاستییدا، وشەی ﴿ أَجَلٖ ﴾، یانی: (المدّة المضروبة لشيء)، کاتێکە بۆ شتێك دیاریکراوە، ﴿ كِتَابٞ ﴾، یانی: تۆمارکردن، نووسین، یانی: هەموو کاتێکی دیاریکراو، تۆمارکردنێکی هەیە، کە لەلای خوای پەروەردگار، زانراوەو تۆمارکراوە

﴿ يَمْحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ ﴾، خوا ئەوەی بیەوێ، دەیسڕێتەوەو لای دەبات، لە دروستکراوان، لە بڕیاران، لە یاساکانی شەریعەتان، کە دەیانئێرێ، لە موعجیزان، کە بۆ پێغەمبەرانیان دەنێرێ، جۆرێك بە کەڵکی ڕۆژگارێك دێ، دوایی ئەو لادەبات، یەکێکی دیکە بۆ ڕۆژگارێکی دی دێنێ، هەروەها هەندێك یاسا کە تایبەتن بە هەندێك هەلومەرجەوە بۆ پێغەمبەرێك، لە شەریعەتی پێغەمبەرێکدا دایاندەنێ، بەڵام دوایی کە ئەو هەلو مەرج و ژینگەیە گۆڕا، ئەوانە لادەبات و هەندێك یاسای دیکە دێنێ، یان خوا ﷻ دەربارەی هەندێ گەل و نەتەو[redacted] هەندێ بڕیار دەدات، دوایی کە گەل و نەتەوەیەکی دیکە دێ، ئەو بڕیارانە دەگۆڕێ، بە بڕیارانێکی دیکە، ﴿ يَمْحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴾، خوا ئەوەی کە بیەوێ، لایدەبات، دەیسڕێتەو[redacted] ئەمە:

١) هەم دروستکراوەکان دەگرێتەوە. ٢) هەم بڕیارەکان، ٣) هەم موعجیزەکان، ٤) هەم یاسا شەرعییەکان، ﴿ وَيُثْبِتُ ﴾، هەروەها ئەوەش [redacted] بیەوێ دەیچەسپێنێ، جێگیری دەکات، ﴿ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ ﴾، لەلای خواش بناغەی کتێب، ئەسڵی کتێب هەیە، کە مەبەست پێی زانیاریی بێسنووری خۆیەتی، یان ئەو (اللوح المحفوظ)یە، ئەو دروستکراوەی خوا هەموو زانیارییەکانی دەربارەی دروستکراوەکانی خۆی، تێدا تۆمار کردوون .

﴿ وَإِن مَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ وَعَلَيْنَا ٱلْحِسَابُ ﴾.
بێبڕوایان هەمیشە پێغەمبەری خوایان هەڵدەپێچا، پەلەیان لێدەکرد، تاڵووکەیان لێدەکرد، دەیانگوت: ئەوەی کە هەڕەشەی پێ لە ئێمە دەکەی، بۆچی خوا بۆمان نانێرێ؟ پێغەمبەری خواش ﷺ دڵی سەغڵەت دەبوو، ڕەنگە بە دڵیدا هاتبێ، کە: خوایە! هێندە هەڵمەدەپێچن و سەغڵەتم دەکەن، سزایەکیان بۆ بنێرە، شتێکیان پێشان بدە !

بۆیە لێرەدا خوا دەفەرموێ : ﴿ وَإِن مَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ ﴾، ئەگەر ئێمە هەندێك لەوەی کە گفتیان پێدەدەین، واتە: هەڕەشەیان پێی لێ دەکەین، پێشانت بدەین، ﴿ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ ﴾، یان بەرلەوە بتمرێنین، لە هەردوو حاڵاندا، چ بەشێك لەو

سزایەی کە هەڕەشەی پێ لەوان دەکەین، پێشانت بدەین، یا بتمرێنین و ئەو سزادانەی خوا کە هەڕەشەی پێ لەوان دەکەین، نەیبینی، لە هەردوو حاڵەندا: ﴿ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ وَعَلَيْنَا ٱلْحِسَابُ ﴾، بێگومان تۆ تەنیا گەیاندنت لەسەرەو لێپرسینەوەش لەسەر ئێمەیە، کەواتە: تۆ لەسەرت نیە ئەو سزایەیان بۆ بێنی، هەروەك بۆشت نیە، بە ئارەزووی ئەوان موعجیزەو بەڵگە بهێنی، بەڵكو خوا ئەو موعجیزەو بەڵگەیەت پێدەدات، بۆ سەلماندنی پێغەمبەرایەتیی خۆت، کە کارزانیی و لێزانیی خوا، دەیخوازێ و گونجاوە لەگەڵ ئەو کۆمەڵگایەدا، کە تۆ تێیدا ڕەوانکراوی، کە بریتیە لە ئەوانەی سەرەتا پێغەمبەر ﷺ ، لە نێویاندا بووە : عەرەبەکان، تاکو دنیا کۆتایی دێ، ئەو موعجیزەو بەڵگەو نیشانەیەی خوا بۆی ناردووی، بە کەڵکی هەموو مرۆڤایەتیی دێ، دوای خۆشت، بەرشتی هەیەو هەر کارایە، ئنجا وەك چۆن ئەو موعجیزانە بەدەست تۆ نین و بە دەست خوان، بەهەمان شێوەش: سزادانی ئەوانیش دووبارە هەر بەدەست خوایە، بەڵام تۆ گەیاندنی پەیامی خوات لەسەرەو، لێپرسینەوەش لەسەر ئێمەیە. ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا نَأْتِى ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا ﴾، خوا دەفەرموێ: ئایا نەیانبینی کە ئێمە دێین لە ئەملاولای زەوی، لە چوار دەوری زەوی، کەم دەکەینەوە ﴿ وَٱللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِۦ ﴾، خواش بڕیار دەدات و، هیچ بەدواداچوویەك نیە بۆ بڕیارەکەی، کەسێك نیە بە دوای دابچێ و هەڵیبوەشێنێتەوە، یان بڵێ: بۆچی واتکرد؟ ﴿ وَهُوَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴾، لێپرسینەوەی ویش زۆر خێرایە .

ئنجا ئایا مەبەست لەوە چییە کە خوا دەفەرموێ: لە چوار دەوری زەمین کە دەکەینەوە؟ دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا، زیاتر تیشکی دەخەینە سەر، بەڵام واپێدەچێ مەبەست ئەوەبێ، کە خوا دەیەوێ بەو بێبڕوایانە بفەرموێ: ئایا دەستی خوا نابینن لە کۆمەڵگاکاندا، لە ژیانی مرۆڤەکاندا: دەسەڵاتداران لادەبات، هەیە دەوڵەمەندە، هەژار دەکەوێ، هەیە هەژارە، دەوڵەمەند دەبێ، هەیە بێ دەسەڵاتە، دەسەڵاتی دەکەوێتە دەست، ئنجا جیلەکانی مرۆڤ، یەك لە دوای یەك، وەك شەپۆلەکانی دەریا، دەڕۆن و بەدوای یەکدا دێن، ئایا نابینن خوا ﷻ بەردەوام گۆڕانکاریی دەکات و، بەردەوام تەدەخخولی هەیە لە ژیانی مرۆڤدا، تەصەڕرووف

دەکات، کەواتە: ئێوە بۆچی ئاوا بێ باك و بێ منەتن؟ لە حاڵێکدا خوا ﷻ هەیمەنەی هەیە بەسەر ژیانی مرۆڤدا، سەرزەمین و ئەوەی لەسەری دەژی !

﴿ وَقَدْ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾، دەفەرموێ: بێگومان ئەوانەی پێش وان، فێڵیان کرد، پیلانیان گێڕا، ﴿ فَلِلَّهِ ٱلْمَكْرُ جَمِيعًا ﴾، بەڵام پلان و نەخشە، هەمووی لەبەردەستی خوا دایە، یاخود فێڵ و تەڵەکەو پیلانەکانی ئەوان، هەموویان لە ژێر ڕکێف و هەیمەنەی خوای پەروەردگار دان، ﴿ يَعْلَمُ مَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ ﴾، هەر کەسێك هەر شتێك دەکات، دەیزانێ، ﴿ وَسَيَعْلَمُ ٱلْكُفَّٰرُ لِمَنْ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴾، لەمەودواش بێبڕوایان، دەزانن سەرەنجامی مەنزڵگا، واتە: مەنزڵگای دوارۆژ، سەرەنجامە چاکەکەی بۆ کێیە؟ بێگومان بۆ ئەهلی ئیمانە .

لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَسْتَ مُرْسَلًا ﴾، ئەوانەی بێبڕوان دەڵێن: تۆ ڕەوانەکراونی، یانی: خوا تۆی ڕەوانە نەکردووە، ئەو قسانە هەر لە گیرفانی خۆت دەردێنی و، هەر لەخۆوە بانگەشەی پێغەمبەرایەتیی دەکەی، ﴿ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ وَمَنْ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْكِتَٰبِ ﴾، بڵێ: خوا بەسە شایەد بێ لە نێوان من و ئێوەدا، ئەو کەسەش کە زانیاریی کتێبی پێیە، کە مەبەست پێی کتێبە پێشووەکانە، ئەو کتێبانەی کە خوا بۆ پێغەمبەرانی پێشوو، دایبەزاندوون .

شایەدیدانی خواش لە نێوان پێغەمبەری خاتەم و بێبڕوایانێکدا، کە نکووڵییان کردوە، لە پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺ، ئەوەیە کە :

١/ موعجیزەیەکی پێداوە، ناتوانن نەك وەك وی، بەڵکو تەنانەت سێ ئایەتی وەك ویش بێنن

٢/ هەروەها ئەوەیە کە خوا ئەو پێغەمبەرە ﷺ، سەر دەخات، پشتی دەگرێ، دەیپارێزێ

٣/ پەیام و بەرنامەکەی بە هەموو دنیا ڕادەگەیەنێ، کە ئەوەش واقیعێکە و ئێستا دەچێتە چاوی هەموو کەسێکەوە

ئنجا دوای چوارده پانزده سەدەش پاش ئەوەی خوا وایفەرمووە، شایەدییدانی ئەوانەش ﷺ زانیاریی کتێبە پێشووەکانیان لەلایە، وەك ئێمە لە باسێکی سەربەخۆدا، لە تەفسیری ئایەتی ژمارە (١٥٧)ی سوورەتی (الأعراف)دا، بە تەفصیلْ باسمان کردوە، کە چۆن ئێستاشی لەگەلْ دابێ، نیشانەکانی پێغەمبەری خاتەم ﷺ، لە تەوراتیشدا، لە ئینجیلیشدا، واتە: لە (پەیمانی کۆن)و (پەیمانی نوێ)دا، ئێستاش دوای ئەو هەموو دەستکاریی کران و گۆڕانەش، نیشانەکانی پێغەمبەری خاتەم ﷺ هەر هەن، جگە لەوەی کە لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خاتەمدا، کۆمەڵێك لە زانایانی خاوەن کتێبان، لە جوولەکەکان و نەصرانییەکان، ئیمانیان پێهێناوەو، دڵخۆش بوون بەوەی کە پێغەمبەری خاتەمو کۆتایی دێ، بەڵام دوایی جوولەکەکان لەبەر حەسوودیی، بڕوایان پێ نەهێنا، چونکە چاوەڕوانییان کردوە، کە ئەو پێغەمبەرە لە نێو بەنو ئیسرائیلدا بێ، لە حاڵێکدا کە لە نێو گەلی عەرەبدا هات، ئەوانیش حەسوودییان بە خۆیشی و بە گەل و نەتەوەکەشی برد، بۆیە بڕوایان پێ نەهێنا

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم** : ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە کە موحەممەد ﷺ ڕیزپەڕ (شاذ) نیە لە نێو پێغەمبەرانی خوادا، کە پێش ڕەوان کراون و، هاوسەرو ڕۆڵەشیان هەبوون و، بەبێ مۆڵەتی خواش هیچ پێغەمبەرێک بەڵگەو موعجیزەیەکی نەهێناوە :

خوا (عز و جل) دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجًا وَذُرِّيَّةً وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ ﴿٣٨﴾ ﴾

واتە: لەپێش تۆشدا (ئەی موحەممەد ﷺ!) پێغەمبەرانی دیکەمان ڕەوانە کردوون (بۆ لای کۆمەڵگاکانیان)و هاوسەرو ڕۆڵەشمان پێداون، بەبێ مۆڵەتی خواش هیچ کام لە پێغەمبەران هیچ موعجیزەو نیشانەیەکی نەهێناوە (بۆ سەلماندنی ڕاستێتیی خۆی و پێغەمبەرایەتیی خۆی)، هەر ڕووداوێکیش کاتێکی دیاریکراوی هەیە .

مەبەستی سەرەکیی ئەم ئایەتە پیرۆزە، ئەوەیە کە ئەی موحەممەد ! تۆ ڕیزپەڕو دەگمەن نی، شتێکی نا ئاسایی و ڕیزپەڕ نی، بەڵکو تۆش وەک پێغەمبەرانی پێشوو، لە نێو گەلی کۆمەڵگای خۆتدا ڕەوانکراوی، تۆش کە هاوسەرت هەیەو ڕۆڵەت هەن و، کچت هەن و کوڕت هەن، ئەوە وەک زۆربەی هەرە زۆری پێغەمبەرانی، کە هاوسەریان هەبووەو ڕۆڵەشیان هەبووە، تۆش هەروەک ئەوانی، ئنجا بەڵگەو موعجیزەیەکیش کە ئەوان داوای دەکەن، بۆیان ناهێنی، لەبەرئەوەیە کە هیچ کام لە پێغەمبەران، بەدەست خۆیان نەبووە، چ بەڵگەو موعجیزەیەک بۆ سەلماندنی پێغەمبەرێتیی خۆیان بێنن، بەڵکو خوای کاربەجێ هەر کام لە پێغەمبەران، بەڵگەو موعجیزەیەکی پێداوە کە گونجاو بووە لەگەڵ حاڵەتی کلتووریی و فیکریی و ئاستی هەمە جۆرەی ئەو کۆمەڵگایەدا، کە ئەو پێغەمبەرەی تێدا ڕەوانکراوە

**تـوێـژینـەوەی ئـەم ئایـەتە موبارەکـە ، لـە چوار برگـەدا :**

**برگـەی یەکـەم :** ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ ﴾، بـە دڵنیـایی‌و بـە جەختکردنـەوە : لـە پێش تۆشدا پێغـەمبەرانێکمان ڕەوانەکردوون، ناردوومانن

پێشـتریش ئامـاژەم پێـدا: ئـەو جەختکـردنەوەو تەئکـید کردنەوەیـە، لـەبەرئەوەیە، هـەندێك لـە کافـرو هـاوبەش بـۆ خـوا دانەرەکـان، کە شـارەزای پێغەمبەرانی خواو بەسەرهاتەکانیان نەبوون، وایانـزانیوە کە موحـەممـەد ﷺ، تاکە کەسێکە لە نێو مرۆڤاندا، بانگەشەی پێغـەمبەرایەتیـی دەکـات! خـواش ﷻ، زۆر بە تەئکیدکردنەوە ـ هەندێکیان وای تەفسیـر دەکەن، کە سوێند دەخـوات ـ دەفەرمـوێ: لە پێش تۆشـدا ئێمـە پێغـەمبەرانێکمان ڕەوانەکردوون .

بـەڵام پـێم وایـە (ل)، هـەرچەندە بـۆ قەسـەمیش بەکـاردێ، بـەڵام لێـرەدا بـۆ تەئکیدو دڵنیـاکردنەوەیە، (قد)یش هەر بۆ ساغکردنـەوەو دوو دڵـیی نەهێشـتنی کەسی بەرانبـەرە .

ئە  ڕاستییەش لە زۆر لـە ئـایەتەکانی قورئـاندا، دووبـارە کراوەتـەوە، کە لـە پێش موحـەممـەد ﷺدا، خـوا پێغـەمبـەرانی زۆری ڕەوانـە کـردوون، بۆ وێنـە :

١- لــە سـوورەتی (غـافر)، ئـایەتی (٧٨)دا، دەفـەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ ۗ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ۚ فَإِذَا جَاءَ أَمْرُ اللَّهِ قُضِيَ بِالْحَقِّ وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْمُبْطِلُونَ ﴾، واتـە: بـە دڵنیـایی لـە پـێش تۆشـدا پێغەمبەرانێکمـان ڕەوانـە کردوون، هـەیانە بەسەرهاتەکەیمـان بەسـەر تۆدا خـوێندۆتەوە، هـەشیـانە کە بەسەرهاتەکەیمـان بـۆ تـۆ نەگـێڕاوەتەوەو، هـیچ پێغـەمبەرێك بـۆی نەبـووە نیشـانەو بەڵگەیەك بێنێ، مـەگەر بە مۆڵەتی خـوا (یـان: بە ویستی خـوا، یـان: بە فەرمـانی خـوا)، هەر کاتێ فەرمـانی خـوا هاتبـێ، بـە هـەق دادوەرییـان لـە

نێوانـدا کـراوە، یـانی: بـە هـەق بڕیاریـان بـۆ دراوەو، لـەو کـاتەدا ئەوانـەی کـە لـەسـەر بەتـاڵو ناهـەقیـی بوون، زیـانبـاربـوون .

٢- هـەروەها لـە سـوورەتی (الروم)، ئـایەتـی (٤٧)دا، بـە هـەمـان شـێوە دەفـەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَآءُوهُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ فَٱنتَقَمْنَا مِنَ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ ۖ وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾، لێـرەدا، وشـەی: ﴿ مِن قَبْلِكَ ﴾پـێش ﴿ رُسُلًا ﴾، خراوەو، وشـەی: ﴿ إِلَىٰ قَوْمِهِمْ ﴾یش، زیـاد کـراوە، واتـە: بێگومـان لـە پێش تـۆدا پێغەمبەرانێکمـان بۆ لای کۆمـەڵگـاکـانیـان (کۆمەڵەکانیان)، ڕەوانکرد، ﴿ فَجَآءُوهُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ ﴾ بـە بەڵـگـە ڕۆشـنو ئـاشکرایەکـانەوە هاتنـە لایـان، ئنجا تۆڵەمان لە تاوانباران کردەوەو، سەرخستنی بڕوادارانیشمان لەسەر پێویست بوو.

هیچ پێغەمبەرێك نەبوو بەڵگەیەکی نەدرێتێ، موعجیزەیەکی نـەدرێتی، کـە ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی خۆی پێ بکات، وەك پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا کە بوخـاریی‌و موسلیم، لـێی دەگێڕنــەوەو، چەند جارێك ئەو فەرموودەیەمان هێنـا، دەفەرموێ: {ما مِنَ الأنبياءِ نَبيٌّ إلاَّ أُعْطِيَ ما مِثلُهُ آمَنَ عَلَيهِ البَشَرُ، وَإِنَّما كانَ الَّذي أُوتِيتُ وَحيًا أَوحَاهُ اللهُ إِلَيَّ، فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكثَرَهُمْ تابِعاً يَومَ القِيامَةِ}، {رَوَاهُ البُخارِيُّ برقم: (٤٩٨١)، وَمُسْلِم برقم: (٣٨٣)، عَن أَبي هُرَيرَةَ ﷺ}

واتە: هیچ کـام لـە پێغەمبـەرانی خـوا نـەبوون (علیهم الصلاة والسلام) کـە بەڵگەیەکی پێ نـەدرێ، لـەسەر ئەوە خـەڵك ئیمانی پـێ بێنن‌و (بزانن کە ڕاست دەکـات)و ئەوەی بەمنیش دراوە لـەو بوارەدا، وەحییە بۆم هاتوە (واتە: ئەوەی کە پێمدراوە وەك بەڵگە لەسەر پێغەمبەرایەتییم، وەحیی‌و پەیام‌و بەرنامەی خوایە) بۆیە ئومێدم وایە کە لـە ڕۆژی دواییدا لـە هـەموویـان شـوێنکەوتـووم زیـاتر بـێ

پاشـان خـوای کـارزان‌و میهرەبان پاسـایەکی گـەورەو گرنگـی خـۆی لـە ژیـانی بەشەردا دەخاتـەڕوو و دەفـەرموێ : ﴿ فَٱنتَقَمْنَا مِنَ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ ﴾، دوایی تۆڵـەمان لـەوانە سـتاند کـە تـاوانباریـیـان دەکـرد، ﴿ وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، پشتگرتنی بـڕواداران‌و هـاوکـارییکردنیـانمـان لـەسـەر پێویسـت بوو .

**بڕگەی دووەم :** - ﴿ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَٰجًا وَذُرِّيَّةً ﴾، ئێمە هاوسەران و وەچەمان پێدابوون

(أزواج)، کۆی (زوج)ە، (زوج)یش هەم بۆ پیاو بەکاردێ، هەم بۆ ئافرەت، واتە: هەم بۆ مێردو هەم بۆ ژن، (ذُرية)ش، واتە: وەچە (نسْل)، یانی: ڕۆڵەمان پێدابوون، کچ و کوڕمان پێدابوون، جگە لە ژمارەیەکی زۆر کەم لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، کە ئەوەی ئێمە دەیزانین: تەنیا (یەحیا)و (عیسا)ن، (سەلامی خوایان لەسەر بێ)، ڕەنگە هی دیکەش هەبوو بن، خوا باسی نەکردبن، ئەگەرنا ئەوانی دیکە، هەموو پێغەمبەران هاوسەریشیان هەبوون، ـ هەبووە هاوسەرێک و، هەبووە زیاتریش، بۆ وێنە: ئیبراهیم و یەعقووب و داوود و سولەیمان ـ ئنجا وەچەو ڕۆڵەشیان هەبوون، جگە لە هەندێک کە زۆر کەمن، ئەوەی ئێمە دەیزانین تەنیا (عیسا)و (یەحیا)ن، سەلامی خوایان لەسەر بێ

**بڕگەی سێیەم :** - ﴿ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾، هیچ پێغەمبەرێک بۆی نەبووە، نیشانەو بەڵگەیەک بێنێ، مەگەر بە مۆڵەتی خوا .

لێرەدا مانای لە (إذن) بریتیە ویستی دروست کردن، دەڵێ: {فاستعير الإتيان للإظهار، واستُعير (الإذن) للخلق والتكوين}، وشەی (إتيان)، خوازراوەتەوە بۆ دەرخستن، یانی : هیچ پێغەمبەرێک بۆی نەبووە، هیچ نیشانەیەک ئاشکرا بکات و دەربخات

وشەی (إذن)یش، خوازراوەتەوە بۆ: دروستکردن و هێنانەدی (إلاّ بإذن الله)، یانی: (إلاّ بخلق الله)، (إلاّ بتكوين الله)، مەگەر بەوە کە خوا بۆی دروست بکات، یان خوای پەروەردگار ئەو شتەی بۆ بێنێتە دی

**بڕگەی چوارەم :** - ﴿ لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ ﴾، بۆ هەر کاتێکی دیاریکراو، تۆمارکردنێک هەیە، نووسینێک هەیە، (الأجَلُ: الوَقْتُ المؤقّت بە: عَمَلٌ معزومٌ أو موعودٌ)، (أجل)، بریتیە لە کاتێک کە کردەوەیەکی لەبەرچاوگیراو، یان بەڵێن دراو، تێیدا دیاریکراوە، (الكتاب: المكتوب وهو كناية على الضّبط

والتحديد)، (كِتاب)یش بە مانای نووسراوە، کە لێرەدا کینایەیە لە دیارییکردنو تۆمارکردنی شتێك

مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە پێغەمبەرانی پێشوو، هەرکامێکیان بە مۆڵەتو ویستی خوا، موعجیزەو بەڵگەیان هێناونو، تۆش بە هەمان شێوەو، بۆ هەر کاتێکی دیارییکراویش، تۆمارکردنێك هەیە، کەواتە: تۆش کە لەو کۆمەڵگایەدا رەوانکراوی، لەو حاڵو کاتەدا رەوانکراوی، کە دوا قۆناغی ژیانی مرۆڤە، خوا ﷻ، جۆرە موعجیزەو نیشانەیەکی بە تۆ داوە، کە لەگەڵ ئەو دوا قۆناغەی ژیانی مرۆڤدا بگونجێ .

**<u>مەسەلەی دووەم</u> :** خوای زاناو توانا هەرچی بیەوێ: دەیسڕێتەوە، یان دەیچەسپێنێ، زانیاریی نەگۆڕاویش تەنیا لەلای خۆیەتی :

خوا دەفەرموێ : ﴿ يَمْحُوا۟ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ ۖ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ ﴿٣٩﴾ ﴾، واتە: خوا ﷻ هەرچی بیەوێ دەیسڕێتەوەو لای دەبات، ئەوەش کە بیەوێ دەیچەسپێنێ، تۆمارگەو نووسینی بنەڕەتیی زانراوەکان، هەر لە لای خۆیەتی

**تێڕوانینێك لەم ئایەتە موبارەکە ، لە دوو بڕگەدا :**

**<u>بڕگەی یەکەم</u> :** - ﴿ يَمْحُوا۟ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ ﴾، خوا ئەوەی کە بیەوێ، هەر شتێك کە بیەوێ، دەیسڕێتەوە، لایدەبات، ﴿ وَيُثْبِتُ ﴾ هەر شتێکیش کە بیەوێ، دەیچەسپێنێو سەقامگیری دەکات .

وشەی (يُثْبِتُ)، خوێنراویشەتەوە: (يُثَبِّتُ) هەردووك خوێندنەوەکان هەنو هەر یەك ماناشیان هەیە، ئەوەندەیە (وَيُثْبِتُ)، واتە: دەچەسپێنێ، بەڵام : (يُثَبِّتُ)، ماناکەی بەهێزترە، چونکە زانایان دەڵێن: (زِيادَةُ المَبْنَى تَدلُّ عَلَى زِيادَةِ المَعْنَى)، وشەیەك کە پیتەکانی زیاتر بن، ماناکەشی بەهێزترە .

وشەی ﴿ يَمْحُوا ﴾، (حقيقة المحو : إزالة الشيء وكَثُرَ في إزالة الخطّ أو الصورة)، (محو) لە ئەسڵدا بریتیە لە لابردنی شتێك، بەڵام زیاتر بۆ سڕینەوەو لابردنی نووسین، یان وێنە، بەكاردێ

كە دەفەرموێ: ﴿ يَمْحُوا اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ ﴾، خوا هەر شتێكی بیەوێ، دەیسڕێتەوەو لایدەبات، ﴿ وَيُثْبِتُ ﴾، هەر شتێكیشی بیەوێ، بە پێچەوانەی لابردنەوە: دەیچەسپێنێ، دەیهێڵێتەوە .

دوایی ئێمە چەمكی ئەو ڕستەیە زیاتر ڕووندەكەینەوە

بڕگەی دووەم : ﴿ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ ﴾، ئەسڵی نووسینەكەش لەلای خۆیەتی

وشەی (أُم)، وەك پێشتر باسمان كرد، یانی: ئەصڵ، شتێك كە شتەكانی دی بۆ لای وی بگەڕێنەوە (كتاب)یش بە مانای: تۆماركردنو نووسین دێ، واتە: بنچینەو بناغەی تۆماركردنو نووسین، لەلای خۆیەتی، واتە: تۆمارگە لای خۆیەتی

# کورتە باسێک لە بارەی (اللَّوح المحفوظ)و زانیاری خواو سڕینەوەو چەسپاندنی خواوە

**یەکەم: مەبەست لە (اللَّوح المحفوظ)و زانیاری خوا، چییە ؟!**

زۆرێک لە زانایان گوتوویانە: مەبەست لە: ﴿أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ﴾، (اللَّوح المحفوظ)ە، ئەو تەختەیە کە پارێزراوەو خوا هەموو زانیارییەکانی خۆی تێدا تۆمار کردوە، دەربارەی دروستکراوەکانی، کە بە (أُم الکتاب)و بە (کتابٍ مبین)و بە (إمامٍ مُبین)یش تەعبیری لێکراوە، هەندێکیش دەڵێن: ئەو وشانە هەموویان، واتە: (اللَّوح المحفوظ)و (أُم الکتاب)و (کتاب مبین)و (إمامٍ مبین)، مەبەست پێیان: زانیاریی ئەزەلییو بێ سەرەتاو کۆتایی خوایە ﷻ، بەڵام ئایا بۆچی ئەو وشانە بەکارهاتوون ؟

لەبەرئەوەی ئێمەی مرۆڤ، ئەگەر بمانەوێ شتێک بزانینو لەبیرمان نەچێ: دەینووسین، وەک گوتراوە: (قَیِّدوا العلم بالکتابة)، زانیاریی بە نووسین ببەستنەوە، لەبەرئەوەی ئێمە عادەتمان وایە، وا تێدەگەین، کە هەر شتێک بتەوێ: لێت تێکنەچێو لێت تێکەڵنەبێو، لە بیرت نەچێتەوە دەبێ بینووسی، خواش ﷻ، بە پێی عەقڵی ئێمە دەماندوێنێ، دەفەرموێ: زانیارییەکانی من، هێندە چەسپاون، هێندە ڕوونن، وەک چۆن ئێوە شتێک کە دەینووسن، لێتان تێکەڵنابێو، لێتان تێکناچێو، لە بیرتان ناچێ، زانیارییەکانی منیش دەربارەی دروستکراوەکان بەو شێوەیەن، وەک نووسراوبنو تۆمارکرابن

بەڵام دەشگونجێ کە مانا ڕواڵەتییەکەیان مەبەست بێ‌و خوا ﷻ زانیارییەکانی خۆی هەموو لەو شتەدا تۆمار کردبن‌و چەسپاندبن کە پێی دەگوترێ :

١) (اللّوح المحفوظ)، بە ئیعتیباری ئەوەی پارێزراوە

٢) پێی دەگوترێ: (أم الكتاب)، بە ئیعتیباری ئەوەی هەموو دروستکراوەکانی خوا زانیارییەکانیان دەگەڕێنەوە ئەوێ .

٣) پێی دەگوترێ: (إمام مبين) بە ئیعتیباری ئەوەی پێشەوای دروستکراوەکانە، لەپێش هەموویانەو، پێش ئەوەی دروستکراوەکان دروست بن، زانیارییەکان لەوێ دا بوون .

٤) پێی دەگوترێ: (كتابٍ مُبين)، بەو ئیعتیبارەی کە نوسینێکی ڕوون‌و ئاشکرایە، یانی: بە ئیعتیباری جیا جیا، ناوی جیا جیای لێنراون، ئەگەرنا هەر یەك شتە، ئەگەرچی هەندێك لە زانایان گوتوویانە: (اللّوح المحفوظ)، جیایە لەوو، ئەو جیایە لەوو...هتد، بەڵام ئەوەم پێ دوورەو، ئەگەر مەبەست ئەوەش بێ، کە خوا دروستکراوێکی هەیە؛ زانیارییەکانی خۆی هەموو تێدا نووسیون، دەربارەی دروستکراوەکانی، دەڵێین: ناوەکان بۆیە جیا جیان، بە ئیعتیباری جیا جیا، هەروەك چۆن خوا ﷻ ناوی لە جبریل ناوە جبریل‌و، پێشی دەفەرموێ: (الروح الأمين)و، (الروح القدس)، چەند ناوێکی لێ هەڵداون، بە ئیعتیباری جیا جیا .

**دووەم : مەبەست لە : ﴿ يَمْحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ ﴾ چییە ؟!**

لە ڕاستییدا خوا ﷻ، هەم لە نێو دروستکراوەکانیدا، هەم لە نێو یاساکانی دا، هەم لە نێو بڕیارەکانی دا، هەم لە نێو موعجیزەکاندا، کە بۆ پێغەمبەرانیان دەنێرێ، لە هەموو شتەکاندا بەردەوام، ئەم حاڵەتی سڕینەوەو چەسپاندنە، ئەنجام دەدات، با تەماشا بکەین :

لە سوورەتی (الإسراء )دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَمَحَوْنَآ ءَايَةَ ٱلَّيْلِ وَجَعَلْنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبْصِرَةً لِّتَبْتَغُواْ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ وَلِتَعْلَمُواْ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلْحِسَابَ ۚ وَكُلَّ شَىْءٍ فَصَّلْنَٰهُ تَفْصِيلًا ﴿١٢﴾ ﴾، واتە: ئێمە شەوگارو ڕۆژگارمان کردن بە دوو نیشانە،

نیشانەی شەوگارمان سڕیەوە، (ڕووناکییمان لێ سڕیەوە، تاریکمان داهێنا)و نیشانەی ڕۆژگارمان ڕوون کرد ، تاکو (لە ڕۆژگاردا کاسبیی بکەن‌و) لە بەخششی پەروەردگارتان بخوازن، هەروەها تاکو ژمارەی ساڵان‌و ژماردن‌و بزانن‌و، هەموو شتێکیشمان ـ کە پێویست بێ ـ بە باشیی ڕوون کردۆتەوە .

(مُبصرة)، یانی: بینەر، خەڵك تێیدا دەبینێ، یان ئەوە زێدەڕۆییە بۆ ڕووناکیی، دەشگونجێ مەبەست لە (آیة اللَّیل)، مانگ بێ، کە مانگ خوای پەروەردگار خەفەی کردوە، ڕووناکییەکەی لێ ستاندۆتەوەو، مەبەست لە: (آیة النهار)، خۆرە، کە خۆر ڕۆشن‌و پڕشنگدارە .

خاوەنی (التحریرو التنویر)[1]، لەبارەی (محو)و (إثبات)ەوە گوتوویەتی :

وشەی (محو)، بە مەجاز نەك وەك حەقیقەت، بەکاردەهێنرێ بۆ گۆڕینی حاڵەکان‌و، گۆڕینی واتاکان، وەك هەواڵەکان‌و نەرکە شەرعییەکان، وەك هەڕەشەو، گفت‌و بەڵێن ﷻ خوای کارزان ناڕاستەی بڕواداران‌و، خراپەکاران‌و بێبڕوایانیان دەکات، چونکە هەر کامێك لەوانە، چەمك‌و واتایەکی هەیە، ئەگەر ئەو چەمك‌و واتایە گونجا لەگەڵ ئەوەی کە لە واقیع دایە، ئەوە گونجانەکە پێی دەگوترێ: ئیسبات‌و چەسپاندن‌و، ئەگەر چەمك‌و واتایەکەی نەگونجا، لەگەڵ ئەوەی کە لە واقیع دایە، پێی دەگوترێ: (محو)، واتە: سڕانەوە، چونکە بریتیە لە لابردنی چەمك‌و واتایەکەی

بەڵام وەك پێشتر گوتم‌و ئێستاش دووبارەی دەکەمەوە ، لە ڕاستییدا: ﴿ يَمْحُواْ اللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ ﴾، لە هەموو بوارەکاندا هەیە :

١/ لە نێو دروستکراوەکاندا :

أ) هەر لە کەهکەشانەکانەوە بگرە، کە خوا هەندێ لە کەهکەشانەکان لە نێو دەبات‌و هی دیکە دروست دەکات، هەتا ئەستێرەکان‌و خرۆکەکان ، هەر کامێك لەوانە تەمەنێکی دیاریکراوی هەیە، وەك زانیاریی فیزیاو گەردوونناسیی ئێستا

---

١) ج ١٣، ص ١٦٥.

بۆیان دەرکەوتوە، یانی: ئەو ئەستێرەیەی کە دە ملیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠) ساڵی تیشکی لە ئێمەوە دوورە، ئێستا کە دەیبینین، ئەوە هی دە ملیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠) ساڵ لەمەو پێشەو ئێستا ڕەنگە نەمابێ .

ب) ئنجا وەرە خوارتر سەر زەوی، خوای پەروەردگار بەردەوام دروستکراوان دروست دەکاتو، هی تازە پەیدا دەکاتو دەچەسپێنێو هی، دیکە لەبەین دەبات .

ج) هەروەها لە جەستەی مرۆڤدا: لە هەر چرکەیەکدا، دەوری: سەدو بیستو پێنج ملیۆن (١٢٥,٠٠٠,٠٠٠) خانە لە جەستەی مرۆڤ دەمرنو، هی تازە شوێنیان دەگرنەوە .

د) هەروەها جەستەی ژیانداران‌و زیندەوەران‌و ڕووەکەکانیش بە هەمان شێوە .

٢/ لەنێو ڕووداوو پێشهاتەکان ‌دا :

ئنجا لە جیهانی دروستکراوان بێینەدەر، بەرەو جیهانی ڕووداوو پێشهاتەکان، بەردەوام ڕووداوو پێشهاتەکان ڕوودەدەن، لەسەرئاستی بوونەوەرو، لەسەر ئاستی ژیانی مرۆڤو جندو، ئاژەڵو، ڕووەك و ... هتد .

٢/ لەنێو ڕووداوو پێشهاتەکان دا :

ئنجا بێینە سەر بواری موعجیزەکانی خوا ﷻ، کە بۆ پێغەمبەرانی ناردوون، بەردەوام خوا ﷻ موعجیزەی پێغەمبەرانی گۆڕیون، ئەو موعجیزەیەی کە بە نووحی داوە، جیابوو لەو موعجیزەی کە بە شوعەیبی داوە، یان بە صالحی داوە، یان بە ئیبراهیمی داوە، یان بە مووسای داوە، یان بە عیسای داوە، هەر بۆیە موعجیزەی پێغەمبەری خاتەمیش جیابووە لە موعجیزەی هەموویان، موعجیزەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ لەوەدا لە هەموویان جیابووە، کە بریتی بووە لە موعجیزەیەکی فیکریی، زانستیی‌و عەقڵیی، لەبەرئەوەی مرۆڤ، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا (موحەممەد) ﷺ کە کۆتا پێغەمبەری خوایە، بۆی

رەوانکراوە، کاتێك گەیشتۆتە قۆناغێك کە لەمەودوا دەبێ مرۆڤ لە رێی عەقڵ و شعوورییەوە، بدوێنرێ، نەك لە رێی هەستەوەرەکانییەوە، موعجیزەی هەموو پێغەمبەرانی پێشوو، موعجیزەی بەرهەست بوون، گۆچانەکەی مووسا، مردوو زیندووکردنەوەی عیسا، حوشترەکەی صالح، موعجیزەکانی سولەیمان، موعجیزەکانی داوود، موعجیزەکانی پێغەمبەرانی دیکە، هەموویان شتی بەرهەست بوون، بۆچی؟ چونکە مرۆڤ لەو قۆناغانەدا لە حالەتێك بووە، کە پێویستی بەوە بووە: لە رێی هەستەکانییەوە، لەرێی بینین و بیستن و هەستەکانیەوە بدوێندرێ و ئیسپاتی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرانی بۆ بکرێ، بەڵام دوایی بەشەرییەت کە زیاتر کامڵ بووە، چونکە دروستکراوەکانی خوا بە گشتی زیاتر بەرەو کامڵ بوون دەچن، مرۆڤ بە تایبەتی، بەردەوام بەرەو گەشەکردن و بەرەو پێش چوون دەچێ، جا کاتێك کە بەشەرییەت گەیشتۆتە قۆناغی کامڵبوون و پێگەیشتنی، خوای بەرز موعجیزەیەکی بۆ پێغەمبەر ناردوە، کە لەگەڵ ئەو قۆناغەی پێگەیشتن و کامڵ بوونی مرۆڤدا، بگونجێ و ئەویش ئەوەیە: ئەو موعجیزەیە عەقڵ و شعوورو هەستی مرۆڤ بدوێنێ و نەك هەستەوەرەکانی و کە مرۆڤ بە عەقڵ و شعوور لە ژیاندارانی دی جیا دەکرێتەوە، ئەگەرنا ژیاندارانی دیکەش لە هەستەکاندا: بینین و بیستن و چێژتن و تامکردن و بۆنکردن و بەرکەوتن و ئەوانە لەگەڵ مرۆڤدا هاوبەشە.

٤/ لە بواری یاساکانی شەریعەت دا :

پاشان لە یاساکانی شەریعەتیشدا، خوا حاڵەتی سڕینەوە (محو) و چەسپاندن (إثبات)ی ئەنجامداوە، هەندێك لە یاساکان، کە لە شەریعەتی هەندێك لە پێغەمبەراندا بوون، لە وردەکارییەکاندا، دوایی خوای زانا ئەوانی لابردوەو بە یاسای دیکە شوێنیانی گرتۆتەوە .

بەڵێ لە ڕاستیدا : حاڵەتی (سڕینەوەو چەسپاندن)، کە خوا ئەنجامیان دەدات، چەمك و واتاکەیان زۆر فراوانەو، هەر لە کەهکەشانەوە، تا گەردیلە دەگرێتەوە، شتە مادديیەکان دەگرێتەوەو، شتە مەعنەوییەکان دەگرێتەوە، موعجیزەکانی پێغەمبەران دەگرێتەوە، ڕووداوو پێشهاتەکان دەگرێتەوە، وردو درشتی بوون، دەگرێتەوە، بەلام بە پێی سیاق وا پێدەچێ مەبەست ئەوەبێ کە : ئەوانەی داوایان دەکرد موحەممەد ﷺ، موعجیزەیەکی وەك هی پێغەمبەرانی پێشوو بهێنێ، خوای کاربەجێ دەیەوێ تێیانبگەیەنێ : کە ئەو ڕۆژگارە بەسەرچوو، لەبەرئەوەی ئەو حوکمەی کە بۆ ئەو ڕۆژگارە هەبوو، کە موعجیزەی بەرهەست بۆ پێغەمبەرەکە بێ، تاکو ئیسپاتی پێغەمبەرایەتی خۆی پێبکات، لە نێو خەڵك و کۆمەڵگایەکەی خۆی دا، مادام ئەو ڕۆژگارە بەسەرچوو، ئەو حوکمەش کە دەبێ ئەو جۆرە موعجیزەیە بێ، ئەویش بەسەرچوو، ئەوە سڕایەوەو، ئێستا ڕۆژگارێکی دیکە هاتۆتە پێشەوە، پێویستی بە حوکمێکی تازەیەو دەبێ موعجیزەیەکی تازە، لە جۆرێکی دیکە بۆ پێغەمبەری خاتەم بێ، کە گونجاوە لەگەڵ ئاستی کۆمەڵگایەکەیدا، کە کۆمەڵگایەکەی پێغەمبەر ﷺ، سەرەتا عەرەبەکان بوون، دوایی هەموو مرۆڤایەتیی لە ڕۆژگاری خۆیدا بوون، دوای ڕۆژگاری خۆیشی، تا دنیا بە کۆتا دێ .

<u>سێیەم</u> : چەمك و واتای وشەکانی مەبەست (إثبات) و (محو) و (أم الكتاب) :

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَمْحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ ﴾، (إثبات)، یان (تثبیت)، ئەگەر خوێندنەوەکە (یثبِّتُ)، بێت[1]، حەقیقەتەکەی بریتییە لەوە کە شتێك بچەسپێنرێ لە جێی خۆی، بەلام بە مەجازیش بەکاردەهێنرێ، بۆ پێچەوانەی سڕینەوەو لابردن .

---

١) چاوگ (مصدر)ی (یُثْبِتُ)، (إثبات)ەو، چاوگی (یُثَبِّت)، (تثبیت)ە .

ئنجا هەندێك لە زانایان زۆر وشەكانی: (محو وإثبات)یان وردكردوونەوە، بۆ وێنە :

١) گوتوویانە: (محو)، ئەوەیە كە خوا ئیلهامی دڵی گوناهباران دەكات، كە واز لە گوناهان بێننو گوناهان بسڕنەوەو، ئەوە لە دڵیاندا دەچەسپێنێ كە لەمەودوا تاعەتو چاكە ڕەچاو بكەن

٢) هەروەها هەندێكیان گوتوویانە: (محو)، ئەوەیە كە خوای پەروەردگار گوناه لە كۆڵ بڕواداران دەكاتەوەو، تاعەتیان بۆ دەچەسپێنێ، یاخود نەخۆشیی و دەرد لە كۆڵ خەڵكو ژیانداران دەكاتەوەو، شیفایان بۆ دەچەسپێنێ .

٣) هەروەها خوا هەندێك لە زیندەوەران (محو) دەكاتو دەیانسڕێتەوەو لایاندەباتو، زیندەوەرانی دی دێنێتە شوێنیان

بەزۆر شێوە مانایان لێكداونەوەو وەك گوتم: چەمكو واتای: (مَحو) و (إثبات)، زۆر فراوانن

دەربارەی: ﴿أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ (جمال الدين القاسمي) دەڵێ: (قال الرازي: العرب تسمي كل ما يجري مجرى الأصل للشيء أمّاً له، ومنه أم الرأس: للدماغ، وأم القرى: لمكة، وكلُّ مدينة، فهي أمٌّ لما حولها من القرى، فكذلك أمُّ الكتاب، هو الذي يكون أصلاً لجميع الكتب

واتە: ڕازیی گوتوویەتی: عەرەب هەر شتێك كە بنچینەبێ بۆ شتێك، پێی دەڵێن: (أم)، وەك (أم الرأس)، كە مێشكە، (أم القرى)، ناو بووە بۆ مەككە، لەبەرئەوەی هەموو ئاوەدانییەكانی دی لە دەوری مەككە بوون، هەروەها (أم الكتاب)یش، ئەوەیە كە بنەڕەت بێ بۆ هەموو كتێبەكان، یان بۆ هەموو زانیارییەكان .

وەك گوتمان: لە بارەی: ﴿يَمۡحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثۡبِتُۖ﴾ەوە، زانایان قسەیان زۆر كردوە، بۆ نموونە :

١) هەندێك گوتوویانە: (مَحو وإثبات)، تایبەتە بە بڕیارەكانی خواوە، وەك ئەجەلو ڕزقو نەخۆشیی و ساغیی و سەرخستنو ژێرخستن

٢) هەندێك گوتوویانە: مەبەست پێی سڕینەوەی یاسا پێشووەکانو، چەسپاندنی یاساکانی دیکەیە لە شەریعەتدا

٣) هەندێك گوتوویانە: مەبەست پێی سڕینەوەی ئەو موعجیزانەیە کە بۆ پێغەمبەرانی پێشوو هاتوونو، چەسپاندنی جۆرێکی دیکەیە لە موعجیزە کە بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ هاتوە .

بێگومان، چەمکی: ﴿ يَمۡحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثۡبِتُ ﴾، بۆ هەر کام لەو سێ واتایەو، بۆ زۆر فراوانتریش، دەشێ، بەڵام ئەگەر بۆ یەکەمیان بەکاری بێنین، دەبێ بڵێین: خوا بە پێی یاساکانی خۆی لە ژیانی مرۆڤدا، گۆڕانکاریی دەکات، واتە: ئەگەر ڕزقی کەسێك زیاد دەکات، هی یەکێك کەم دەکات، یەکێك ساغ دەکات، یەکێك نەخۆش دەکات، یەکێك دەمرێنێ، یەکێك دەژیەنێ، ئەوە هەمووی بە پێی یاساکانی خوایەو، هیچی گۆترەکاریی نیە .

بۆ واتای دووەمیان، کە خوای پەروەردگار هەندێك یاسا کە بۆ پێغەمبەرانی دیکەی ناردوون، لایان دەباتو، هەندێکی دیکە دەچەسپێنێ، دەبێ بڵێین: بە پێی گۆڕانکاریی کۆمەڵگایەکان، خوا یاساکانی شەریعەتی گۆڕیون، لە وردەکارییەکانیاندا، ئەگەرنا لە هێڵە گشتییەکاندا، بەرنامەی پێغەمبەران لە هێڵە گشتییەکانیاندا، وەك: بووناسیی و، ئیمانو عەقیدەو، عیبادەتو، حەڵاڵو حەرامە سەرەکییەکانو، ڕەوشتو ئاکارە سەرەکییەکان، هەمووی یەك بووە، بەڵام لە هەندێك وردەکارییدا کە بەپێی هەلومەرجو ژینگەکان گۆڕاون، خوای پەروەردگار یاساکانی گۆڕیون .

بۆ واتای سێیەمیشیان دەبێ بڵێین: بە پێی گۆڕانی ئاستی فیکریی خەڵكو پێداویستییان، خوای کاربەجێ موعجیزەکانی گۆڕیون، هەر بۆیەش ئەو موعجیزەیەی کە بۆ پێغەمبەری خاتەمی ناردوە، موعجیزەیەکی: عەقڵیی، فیکریی، زانستیی، ئەدەبیی بووە، چونکە ئەوە لەگەڵ مرۆڤایەتییەکی پێگەیشتوو لە کۆتا قۆناغی تەمەنی لەسەر زەویدا، دەگونجێ.

**<u>مەسەلەی سێیەم</u> : چ خوای کارزان ئەوەی هەڕەشەی پێ لە کافران کردوە، بەشێکی بهێنێتە دیو پیشانی پێغەمبەری بدات، چ پێش ئەوە بیمرێنێ، ئەو تەنیا گەیاندنی لەسەرەو، لێپرسینەوەش تەنیا هی خوایە :**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن مَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ وَعَلَيْنَا ٱلْحِسَابُ ﴿٤٠﴾ ﴾، واتە: هەندێك لە سزای گفت پێدراوی کافرەکان، نیشانی تۆ بدەین، (ئەی پێغەمبەر! ﷺ)، چ پێش ئەوە بتمرێنین، تۆ تەنیا گەیاندنی پەیامی خوات لەسەرەو، لێپرسینەوەش لەسەر خوایە .

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە ، لە دوو برگەدا:**

**<u>برگەی یەکەم :</u>** - ﴿ وَإِن مَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ ﴾، وشەی (وَعَدَ، يَعِدُ)، مانای (أَوعَدَ، يُوعِدُ)، دەگرێتە خۆی، (أَوعَدَ)، یانی: هەڕەشەی کرد، (يُوعِدُ)، یانی: هەڕەشەی لێدەکات، (وَعِيداً)، هەڕەشە کردن، بەڵام (وَعَدَ)، یانی: گفتی دا، (يَعِدُ)، گفتی پێدەدا، (وَعْداً)، واتە: گفتدان، بەڵێندان .

ئنجا لە قورئاندا خوای پەروەردگار وشەی (وعْد)ی هەم بۆ گفتو بەڵێنی چاك بەکارهێناوە کە بە شتێکی باش گفت بە کەسێك بدرێ، پێی دڵخۆش بێو لێی بەهرەمەندبێ، هەم بۆ هەڕەشەو ترساندنیش بەکاریهێناوە، لێرەدا دەفەرموێ: ئەگەر هەندێك لەوەی کە هەڕەشەی پێ لەوان دەکەین، پێشانت بدەین، یان بەرلەوە بتمرێنین، چۆن دەزانین لێرەدا: ﴿ نَعِدُهُمْ ﴾، مانای هەڕەشەیە؟ چونکە دیارە خوای دادگەر گفتی هەڕەشەی بە بێبڕوایەکان داوە، چونکە لەسەر کوفر خوای کارزان، پاداشتی خەڵك لە دنیادا ناداتەوە، تاکو گفتو بەڵێنێکی باشیان پێبدات!! بۆیە بەپێی سیاق ئەوە دەزانین، ئەگەرنا وشەی ﴿ نَعِدُهُمْ ﴾، لە ئەسڵدا هەم بۆ گفتو بەڵێنی باش بەکاردێ، هەم بۆ هەڕەشەو ترساندنیش .

- - -

خـوا دەفەرموێ: ئەگـەر بەشێك لـەوەی كە هەڕەشـەی پێ لـەوان دەكەین‌و گفتیـان پێدەدەین، پێشانی تۆی بدەین، ئەی موحـەمـەد! ﷺ. ﴿أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ﴾، یـان پێشانت نەدەیـن‌و تۆ بمرێنیـن، ئەو سـزادانەی كە خـوای دادگـەر هەڕەشـەی پێ لەوان كردوە، تۆ نەیبینی، لـە هـەردوو حـاڵاندا: ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَاغُ وَعَلَيْنَا الْحِسَابُ﴾، بێگومـان تـۆ تەنیـا گەیـاندنی پەیـامی خـوات لەسـەرە ﴿وَعَلَيْنَا الْحِسَابُ﴾، لێپرسینەوەش تەنیا لەسەر ئێمەیە، ئەوە بوو خـوا ﷻ، سەرئەنجام: نەك لـە قۆنـاغی مـەككـە، بەڵكـو لـە قۆنـاغی مـەدینـەدا، هـەندێك لـەوەی كە هەڕەشـەی پێ لـە كافرەكان كرد بوو، لـە جـەنگی بـەدرو، لـە فەتحی مـەككـەو، لـە جـەنگی حونەیـن‌و، لـەو ڕووبەڕووبوونـەوانەدا، هـەنـدێك لـەوەی كە گفتی پێ بـە كافرەكاندا بوو، هەڕەشـەی پێ لێكردبوون، پێشـانی پێغـەمبـەری ﷺدا .

كە دەفەرمـوێ : ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَاغُ﴾، یـانی: تۆ تەنیـا گەیـاندنـت لەسـەرە، تـۆ لەسـەرت نیـە موعجیـزەیـان بـۆ بێنـی، یـان ئـەو سـزایەی ئـەوان پەلـەی لێدەكەن، بۆیـان بێنـی، وەك لـە سوورەتی (الأنفال)دا هـاتـوە كە پەلـەیـان دەكرد، سزایـان بۆ بێ ، خـوا دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالُوا اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٢﴾﴾

واتـە: گوتیـان: خـوایە! ئەگـەر ئـەو قورئـانـە هـەقە لـەلایەن تـۆوە، بەردمـان بەسـەردا ببـارێنە لـە سـەرێوە، یـان سزایەكی بە ئێشـمـان بۆ بنـێـرە

تـۆ لەسـەرت نیـە لـەبەر ئـەو پەلـە پەلـەی ئـەوان، بـەپێی داخـوازیی ئـەوان، سزایـان بۆ بێنیـە پێش، بەڵكـو تـۆ تەنیـا گـەیـاندنی پەیـامی خـوات لەسـەرە، ﴿وَعَلَيْنَا الْحِسَابُ﴾، تەنیـا لـێپرسـینەوەشیـان لەسـەر ئێمـەیە، واتە: ئێمە تەنیـا لێپرسینەوەمـان لەسـەرە، نەك وەڵامدانەوەی پێشنیـارەكانیـان، ئـەوەی كە داوای دەكـەن، ئەو داخـوازییـانەی كە دەیـانكەن، خـوای كـارزان خۆی مولـزەم نەكـردوە هـەر كەسێك شتێكی لـێ داواكـرد، پێـی بـدات .

**مەسەلەی چوارەم : هۆشداریی دانە کافرەکان کە بەردەوام خوا لە ژیانی مرۆڤدا گۆڕانکاریی دەکات و لە دەوروبەری زەوی کەم دەکاتەوە، لە دەسەلاتی حوکمڕانان کەم دەکات، هیچ کەسێک هەڵوەشێنەرەوەی بڕیاری [redacted] نییە :**

خوا دەفەرموێ : ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَأْتِي الْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا ۚ وَاللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ ۚ وَهُوَ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴿٤١﴾ ﴾

**توێژینەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە ، [redacted] سێ بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم :- ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَأْتِي الْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا ﴾، ئایا نەیانبینیوە: ئێمە دێین لە دەوروبەری زەوی، لە چواردەوری زەوی، لە لایەکانی زەوی، کەم دەکەین ؟!**

**ئایا مەبەست لەوە چییە ؟!**

**زانایان پێنج واتایان بۆ هێناون :**

**١) هەندێکیان گوتوویانە: بانگەوازی ئیسلامیی بەردەوام بڵاودەبێتەوە، پانتاییەکەی فراوان دەبێ و، بەرە لە ژێر پێی بێبڕوایەکان دەردێنێ**

**٢) هەندێکی دیکە گوتوویانە: مەبەست لێرەدا ئەو گۆڕانکارییانەیە، کە خوا لە ژیانی مرۆڤدا دەیانهێنێتە دی، بەپێی یاساکانی خۆی، حوکمڕانان لەبەین دەچن، یان لە کاردەکەون، دەوڵەمەندان لەبەین دەچن، یان هەژار دەبن، زانایان وەفات دەکەن، یان لادەدەن، یان چاک دەبن، چاکەکاران لێیان تێکدەچێ، خراپەکاران دەگەڕێنەوە، نەخۆش چاکدەبن...هتد، هەموو ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە ژیانی مرۆڤدا دەبن**

٣) هەندێکیش گوتوویانە: ئەوە هۆشداریی دانە بە بێبڕوایەگانو ترساندنیانە، کە بوونەوەر هەمووی‌و، ئەو زەوییەی ئێوە لەسەری دەژین، لە ژێر هەیمەنەو دەستەڵاتی خوادایە، ئێوەش بەرەو ئەو سەرەنجامە دەچن کە خوای باڵا دەست بۆی دیاریی کردوون، هەڵبەتە ئەم واتایە لە سووڕەتی: (الأنبیاء)یش. لە ئایەتی (٤٤)دا، هاتوە : ﴿ أَفَلَا يَرَوْنَ أَنَّا نَأْتِي ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَآ أَفَهُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴾، واتە: ئایا نابینن! ئێمە دێین لە لایەکانی زەوی کەم دەکەینەوە، ئایا ئەوان زاڵ دەبن، واتە: چارەنووسی زەوی هەمووی لە ژێر دەستی ئێمە دایەو، چارەنووسی بوون، هەمووی لە ژێر دەستی ئێمە دایە، ئێوە بە تەمای چین! بە تەمای ئەوەن ئێوە زاڵ بن‌و، سەرئەنجام هی ئێوەبێ؟ ئەگەر وا بیربکەنەوە، خەیاڵ پڵاوتانکردوە

٤) هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: مەبەست لەم ئایەتە بەپێزە ئاماژە کردنە بە فتووحاتی ئیسلامیی کە دوایی ئیسلام دەسەڵاتی دەبێت‌و، بەهێز ڕووبەڕوو دەبێتەوە لەگەڵ کافرەکاندا، بەڵام من ئەوە بە دوور دەزانم‌و پێم وانیە ئەو ئایەتە ئەوە بگەیەنێ

٥) هەندێکی دیکە گوتوویانە: مەبەست ئەوەیە: لە وشکانیی کەمدەبێتەوەو پانتایی دەریا زیاد دەکات، چونکە بەستەڵەکەکان دەتوێنەوە

دەڵێین: ئەم واتایەش لەگەڵ ئایەتەکەدا گونجاوە، بەڵام بە پێی سیاقی ئایەتەکە، وادەرناکەوێ مەبەست پێی ئەوەبێ، بەتایبەتیی کە ئەوە تەنیا زانایان‌و پسپۆڕان دەیزانن، ئەوە لە لایەکەوەو، لە لایەکی دیکەشەوە: لەم دوادواییەدا کە مرۆڤ زۆر دەستکاریی سروشتی کردوەو، چینی ئۆزۆن کونی تێبووەو، ئەو تیشکانە دێنە خوار کە لە ئەنجامی کونبوونی بەرگە هەوای زەوی دا، دەبنە هۆی توانەوەی بەستەڵەکەکانی سەرووی دنیا، ئەوە لەم ڕۆژگارەدا پەیدابووە !

بەڵام مانای ڕاست هەر ئەوەیە کە خوای پەروەردگار، دەیەوێ تێمانبگەیەنێ: کە ئەم زەوییە چارەنووسی‌و سەرەنجامی بە دەستی خوای

بالادەستە، تەصەڕووفی تێدا دەكات، هەم لە زەوی دا، وەك زەوی، هەمیش لە خەڵكی سەر زەوی دا، بە هەموو چین و توێژەكانیەوە .

**برگەی دووەم :** ﴿وَٱللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِۦ﴾، خواش بڕیار دەدات و حوكم دەدات و، هیچ تێهەڵچووەوەیەك و، هیچ چاو پێداگێڕەوەیەك و، هیچ بەدواداچوونێك، بۆ حوكم و بڕیاری خوا نیە

(المُعَقِّب: مَنْ يَكرُّ على الشيءِ فيُبْطِلُه)، (مُعَقِّبْ) كەسێكە بە دوای شتێك دەگەڕێ و هەڵیدەوەشێنێتەوە، (وحقيقته من يَعْقُبُهُ ويُقفِّيه بالردِّ والإبطال)، (مُعَقِّب) لە (عَقِب)ەوە هاتووە واتە: پاژنەپێ، كەسێك بە دوای شتێك دادەچێ و، بەدوای دەگەڕێ، هەڵیدەوەشێنێتەوە .

یانی: هیچ هەڵوەشێنەرەوەیەك و بەدواداچوونێك و سۆراغكەرێك نیە بۆ بڕیاری خوا، ئەو بڕیارەی كە خوا دەیدات، ئەو حوكمەی كە خوا دەیدات، یەكجارەكییەو یەكلاییكەرەوەیە

**برگەی سێیەم :** ﴿وَهُوَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ﴾، خوا لێپرسینەوەی زۆر خێرایە، مەبەست ئەوە نیە كە پەلە بكات لە لێپرسینەوەی بەندەكانی، بەڵام لە كاتێكدا وەختی لێپرسینەوە دێ، بە خێرایی تێكی دەپەڕێنێ و دەست و برد، ئەو لێپرسینەوەیە ئەنجام دەدرێ، كە لێپرسینەوەكەش بۆ ئەهلی ئیمان، سەرەنجامەكەی پاداشت دانەوەیەو، بۆ بێبڕوایان و خراپەكارانیش، بریتیە لە سزادان .

**مەسەلەی پێنجەم :** كەلانی بێبڕوای پێشووش پیلانی زۆریان گێڕاون، بەڵام پیلانەكانیان لە ژێر ڕكێفی ویستی ڕەهای خوادا بوون و، خواش بە كردەوەی هەموو كەس ئاگادارەو، كافرانیش لەمەودوا دەزانن كە سەرەنجامی مەنزڵگای دواڕۆژ، بۆ كێ دەبێ !

خوا دەفەرموێ : ﴿وَقَدْ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلِلَّهِ ٱلْمَكْرُ جَمِيعًا يَعْلَمُ مَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ وَسَيَعْلَمُ ٱلْكُفَّٰرُ لِمَنْ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٤٢﴾﴾

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە لە چوار برگەدا:**

**برگەی یەکەم :** - ﴿ وَقَدْ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾، بێگومان ئەوانەی پێش وانیش پیلانیان گێڕا، فێڵیان کردو نەخشەی خراپیان دانا، بۆ دژایەتییکردنی پێغەمبەرانی خواو بۆ دژایەتیی کردنی پەیامو بەرنامەکانی خوا، کە لە بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانی ئەوانیان دەدا، تەماشا بکەن! دوژمنانی پێغەمبەرانی خوا، کێ بوون؟ هەمیشە خۆ بە گەورەدانەران و خۆشگوزەرانان بوون، تاوانباران و ستەمکاران بوون، ئەوانە بۆچی دژی پێغەمبەرانی خوا ﷺ و ئەو پەیامە خواییە بوون کە هێناویانە؟ لەبەرئەوەی زانیویانە: ئەگەر ئەو پەیامو بەرنامەیەی خوا بچەسپێ، بەرژەوەندییەکانی ئەوان لەبەین دەچن، بۆیە ئەوانە پیلانی زۆریان گێڕاون

**برگەی دووەم :** - ﴿ فَلِلَّهِ ٱلْمَكْرُ جَمِيعًا ﴾، بەلام مەکرو نەخشەو پیلانی ئەوان هەمووی لەبەردەستی خوادایە، یاخود: هەر خوا خاوەنی هەموو تەگبیرو نەخشەو پیلانێکە .

(المَكْـرُ: صَـرْفُ الغَيْـرِ عَمـا يَقْصِـده بحيلـة، أو التدبيـرُ الخَفـيُّ)، وەك پێشتریش گوتمان، (مکر) بریتیە لە لادانی بەرانبەرەکەت لەو ئامانجەی کە بۆی دەچێ، بەلام بە فێڵێك، یان بریتیە لە نەخشەدانانێکی پەنهانکاریی .

**برگەی سێیەم :** - ﴿ يَعْلَمُ مَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ ﴾، خوا عز و جل هەر کەسێك هەر شتێك دەکات، دەیزانێ و پێی ئاگادارەو چاودێریەتی

**برگەی چوارەم :** - ﴿ وَسَيَعْلَمُ ٱلْكُفَّٰرُ لِمَنْ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴾، لەمەودوا بە دڵنیاییەوە، کافرەکان دەزانن مەنزڵگای سەرەنجامی دوارۆژ بۆ کێیە؟ ئەمە خوێنراویشەتەوە: (وَسَيَعلَمُ الكافِرُ)، بابای بێبڕوا دەزانێ سەرەنجامی دوارۆژ لە گرەوی کێدایە ؟

کەواتە :

یەك : پێش ئەوانیش پیلانکاریی کراوە، بەلام پیلانەکان، فێلّو فەرەج و نەخشە خراپەکان، سەری خاوەنەکانیان خواردوە .

دوو : خوا بالادەستی ڕەهایە، هەموو شتێك لە بن دەستی خوادایەو، ئەو پیلان و نەخشەیەش کە دایدەنێن، هەر لەژێر ڕکێفی وی دایە

سێ : خوا بە کردارو ڕەفتاری بەندەکانی زانایە

چوار : سەرەنجامی باشیش لە گرەوی بڕواداران دایەو، کافرانیش بێمرادو بێئاگام دەبن

مەسەلەی شەشەم و کۆتایی : خوا فەرمان بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ دەکات، کە لە بەرانبەر تکوولّییکاران لە پێغەمبەرایەتییەکەیدا بڵێ: خواو زانای کتێبە ئاسمانییەکان بەسە ، شایەدبن لە نێوانماندا :

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَسۡتَ مُرۡسَلٗاۚ قُلۡ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدَۢا بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡ وَمَنۡ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلۡكِتَٰبِ ﴿٤٣﴾ ﴾

شیکردنەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە ، لە سێ بڕگەدا:

بڕگەی یەکەم : ﴿ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَسۡتَ مُرۡسَلٗاۚ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان، (بەچی بێبڕوان؟ بێبڕوان بە خوا، بە فریشتەکانی خوا، بە پێغەمبەرانی خوا، بە کتێبەکانی خوا، بە ڕۆژی دوایی، بێبڕوان بە هەموو ئەو شتانەی کە دەبێ ئیمانیان پێ بهێنرێ)، ئەوانەی بێبڕوان دەڵێن: ﴿ لَسۡتَ مُرۡسَلٗاۚ ﴾، تۆ ڕەوانەکراو نی، واتە: تۆ لەلایەن خواوە ڕەوانە نەکراوی، پەیامت پێدا نەنێردراوە، بەلام بەبێ ئەوەی کە هیچ بەڵگەیەك بخەنەڕوو

**برگـەی دووەم :** ﴿ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ﴾، بڵێ: خوا بەسە شایەد بێ لە نێوان منو ئێوەدا

**برگـەی سێیـەم :** ﴿ وَمَنْ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْكِتَٰبِ ﴾، هەروەها ئەو کەسەی کە زانیاریی کتێبی لەلایە، بەسە شایەد بێ لە نێوانماندا

أ/ شایەدییدانی خوا بۆ پێغەمبەری خاتەم (موحەممەد ﷺ)، لە چەند شتێك دا بەرجەستەیە :

**یەکەم :** موعجیزەکەی، ئەو قورئانەی پێی داوە موعجیزەیەو بەڵگەیەکی دەستەوسانکەرە، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە، تەحەددای مرۆڤ و جندی کردوە کە قورئانێکی وابێنن، نەخێر (١٠) سوورەت بێنن، نەخێر سوورەتێك بێنن، بەڵام هەموویان دەستەوسانو دەستە پاچە بوون لە بەرانبەریدا، کەواتە: ئەوە فەرمایشتی خوایە، ئنجا دوایش کەسێك کە لە قورئان تێبگاتو لێی وردبێتەوە، سەیر دەکات ڕووەکانی ئیعجازی قورئان بێ کۆتایین، وەك لە مەوسووعەی : (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله عز و جل)دا، لەو کتێبەدا[1] کە تەرخانمان کردوە بۆ باسی کتێبەکانی خواو باسی قورئان، باسمان کردوە کە ڕووەکانی ئیعجازی قورئان، واتە: بوارەکانی کە قورئان خەڵکیان تێدا دەستە پاچە دەکات، سنووردار نین، یەك نیەو دوو نینو دە نین، بەڵکو لە هەر ڕۆژگارو زەمانێکدا، لە هەر کۆمەڵگایەکدا، بەپێی پێویستیی ئەو کۆمەڵگایە کە پێویست بێ بزانن: قورئان فەرمایشتی خوایەو، بەڵگەی ڕاستێتیی پێغەمبەری خوایە ﷺ، قورئان ڕووی تازەو بواری تازە، لە ئیعجازو دەستەوسانکردنی خۆی پێشان دەدات .

**دووەم :** پشتگیرییکردنی خوا بۆ پێغەمبەرەکەی‌و، سەرخستنی

**سێیەم :** پارێزگاریی لێکردنی خوا عزو جل بۆ قورئانو بۆ پێغەمبەریش ﷺ

---

١) بڕوانە : (الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله تعالى) .

**چوارەم** : سەرەنجامی خێری پێغەمبەری خوا (محمد) ﷺ، کە ئێستا ئێمە دوای (١٤ ـ ١٥) سەدە، ئەوە وەك ڕۆژ لە نێوەڕاستی ئاسماندا دەبینین

ب / شایەدیدانی زانایانی خاوەن کتێبانیش بەوەیە کە نیشانەکانی پێغەمبەری خاتەم ﷺ ، لە کتێبەکانی خۆیاندا دەبینن ، وەسفەکانی دەبینن .

وەك لە تەفسیری ئایەتی (١٥٧)ی سوورەتی (الأعراف)دا ، باسێکی تێرو تەسەلمان لەوبارەوە کردوە .

هەروەها لەوبارەوە :

١) لە سوورەتی (الشعراء)یش، لە ئایەتی (١٩٧)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ ءَايَةً أَن يَعْلَمَهُۥ عُلَمَٰٓؤُاْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾، ئایا بۆ ئەوان ئەوە بەڵگەو نیشانە نیە (کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە)، کە زانایانی بەنو ئیسرائیل، گەلی ئیسرائیل، بیزانن، یانی: بزانن کە قورئان کتێبی خوایەو، بزانن کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە، لەبەرئەوەی نیشانەکانی لە کتێبەکانیاندا هەن، ئایا بۆ ئەوان نابێتە بەڵگەو، بۆ ئەوان نیشانە نیە ؟!

٢) شایانی باسە :

ژمارەیەك لە زانا بەرجەستەکانی بەنو ئیسرائیل، کاتی خۆی ئیمانیان بە پێغەمبەری خوا (محمد) ﷺ هێنا، لە پێشەوەی هەموویان (عبدالله بن سلام)، وەك خوا لە سوورەتی (الأحقاف)، لە ئایەتی (١٠)دا، دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، واتە: بڵێ: ئایا دەبینن، {پێم بڵێن} ئەگەر ئەم قورئانە لەلایەن خواوە بوو، ئێوەش پێی بێبڕوا بوون، شایەدێکیش لە بەنو ئیسرائیل شایەدیی دا، لەسەری (کە ئەم موحەممەدە

پێغەمبەری خوایەو، ئەم قورئانە وەحیی‌و پەیامی خوایە)، ئەو ئیمانی پێهێناو، ئێوەش خۆتان بە زل گرت، (واتە: ئێوە هەڵوێستو وەڵامتان چی دەبێ؟)، بێگومان خوا کۆمەڵی ستەمکاران ناخاتە سەر ڕاستە ڕێ

٢) هەروەها لە سوورەتی (الأعراف)، ئایەتی (١٥٧)دا، دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلۡأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ ... ﴾ واتە: ئەوانەی کە شوێن ڕەوانەکراوی پێغەمبەری نەخوێندەوار (یان: نەشارەزا بە کتێبە ئاسمانییەکان)، دەکەون، کە ناوونیشانەکانی بە نووسراویی دەبینن لە لای خۆیان، لە تەوراتو ئینجیلدا، ئەوانە کەسانێکن کە خوای پەروەردگار موژدەی چاکی پێداون .

ئەو سێ نموونەو لە زۆر شوێنی دیکەدا خوای پەروەردگار باسی شایەدییدانی خاوەن کتێبەکانو زانایانی خاوەن کتێبەکان دەکات، لەسەر ڕاستێتیی پێغەمبەری خاتەم ﷺ، کە هەم شایەدییدانی خواو، هەم شایەدییدانی ئەو زانایانە کە ئەهلی ئینصاف بوون، بەسە، کە بەڵگەبێ لەسەر ئەوەی کە موحەممەد ﷺ ڕەوانەکراوە لە لایەن خواوەو، کە دەفەرموێ: من پێغەمبەری خوام، قسەیەك نیە لە گیرفانی خۆی دەریهێنابێ‌و، لە خۆیەوە فەرمووبێتی .

لێرەش دا کۆتایی بە تەفسیرکردنی سوورەتی (الرّعد) دێنین‌و دەڵێین :

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەستپێك

بەڕێزان !

ئەمڕۆ کە (١١)ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (١٤٣٨)ی کۆچییە، بەرانبەر (٦/ ٦/ ٢٠١٧) زایینی، خوا پشتیوان بێ، دەست دەکەین بە ڕوونکردنەوەی ماناو مەبەستەکانی ئایەتە بە پێزەکانی سووڕەتی (إبراهیم) ﷺ، کە ئەم سووڕەتە تەنیا ئەو ناوەی هەیە، سەرەتاش پێناسەی سووڕەتی (إبراهیم) دەکەین، لە چەند خاڵێکدا :

# پێناسەی سووڕەتی (إبراهیم) و نێوەڕۆکەکەی

١/ سووڕەتێکی مەککەییە، ناوەکەی هەر سووڕەتی (إبراهیم)ە، بە بڕوای تێکڕای زانایان، ئەویش لەبەر ئەوەی بەسەرهاتی ئیبراهیم ﷺی تێدا هاتوە، هەڵبەتە بەسەرهاتی ئیبراهیم (خَلِيلُ الله) لە گەلێك لە سووڕەتەکاندا هاتوە، بەڵام لێرەدا بەسەرهاتێکی تایبەتە، لە پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) تەنیا باسی بەسەرهاتی ئیبراهیم کراوە وێڕای ئاماژەیەکی کورت بە بەسەرهاتی مووسا ﷺو دوو جاران ناوهێنرانی.

٢/ ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سووڕەتە، زانایان ڕاجیاییان هەیە لەوبارەوە، هەندێکیان کە پێیان دەگوترێ: (عُلَمَاءُ البَصْرَة) یان (أَهْلُ البَصْرَة) دەڵێن: ژمارەی ئایەتەکانی: پەنجاویەك (٥١)ە، بەڵام زانایانی ئەهلی کووفە دەڵێن: پەنجاودوو (٥٢)یەو، زانا مەدینەییەکانیش دەڵێن: پەنجاوچوار (٥٤)ەو، زانایانی شامیش گوتوویانە: ژمارەیان پەنجا (٥٠)یە.

هەڵبەتە ئەو موصحەفانەی کە بە پێی خوێندنەوەی (حفص)ن، ژمارە (٥٢)یان تەبەننیی کردوە، ئێمەش هەر لەسەر ئەوە ڕۆیشتووین، جاری دیکەش باسمان کردوە کە ڕاجیایی زانایان دەربارەی ژمارەی ئایەتەکان، ناگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە یەکێکیان بڵێ: ئەم ئایەتە هەیەو ئەوی دیکە نکوولیی لێ بکات! هەموویان لەسەر هەموو ڕستەکانی قورئانو، هەموو وشەو پیتەکانی قورئانیش یەکدەنگن[1]، بەڵام لە کوێ ئایەتێك کۆتایی پێ دێو، لە کوێ ئایەتێکی دی دەست پێدەکات، واتە: لە کورتیی و درێژیی ڕستەکاندا، زانایان ڕاجیاییان هەیە ئەگەرنا لە قەبارەی سوورەتەکەدا بە ڕستەکانیەوە، بە وشەکانیەوە، بەڵکو بە پیتەکانیشیەوە، زانایان هەموویان یەکدەنگن.

٣/ سوورەتی (إبراهيم)، دوای سوورەتی (الشورى)و، پێش سوورەتی (الأنبياء) دابەزیوە، واتە: لە ڕیزبەندیی دابەزین (ترتيب النزول)دا، ژمارە حەفتا (٧٠)ی هەیە، بەڵام لە ڕیزبەندیی (مصحف)دا، ژمارە چواردە (١٤) یە.

٤/ نێوەرۆكو مەبەستەکانی سوورەتی (إبراهيم)مان، دابەش کردوون بۆ چواردە (١٤) بابەت :

١) لە ئایەتەکانی: (١و ٢و ٣)دا، باسی ئامانجی دابەزێنرانو نێردرانی قورئان کراوە .

٢) لە ئایەتی ژمارە (٤)دا، باسی ئامانجی نێردرانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) کراوە .

٣) لە ئایەتەکانی: (٥ – ٨)دا، ئاماژە بە بەسەرهاتی مووسا ﷺ و گەلەکەی کراوە، هەڵبەتە ناوی مووساش هاتوە لەم سوورەتەدا، بەڵام زۆر بە کورتیی ئاماژەیەك بە بەسەرهاتەکەی کراوە .

٤) لە ئایەتەکانی: (٩ – ١٧)دا، وتووێژێکی ئاوازەی نێوان سەرجەم پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)و تێکڕای گەلە کافرەکانیان باسکراوە، کە لە قورئاندا تاکەو، تەنیا لەم شوێنەدا بەم شێوە هاتوە.

---

١) ئایەتەکانی قورئان ژمارەیان، (٦٢٣٦)و، ژمارەی وشەکانی قورئان، (٧٧،٤٣٩)و، ژمارەی پیتەکانی، (٣٢١،١٩٠).

٥) لە ئایەتی ژمارە (١٨)دا، خوا ﷻ سەرەنجامی کردەوەو کاری بێبڕوایانمان بۆ وێنا دەکات، لە وێنەیەکی سەرنجڕاکیشدا.

٦) لە ئایەتەکانی: (١٩و ٢٠)دا، ئەو ڕاستییە خراوەتە ڕوو، کە خوا ﷻ ئاسمانەکان‌و زەوی بە هەق هێناونە دی.

٧) لە ئایەتەکانی: (٢١و ٢٢و ٢٣)دا، گفتوگۆیەکی نێوان شوێنکەوتووانی کوفر، سەرانی ئەهلی کوفر، بە شەیتانیشەوە، خراوەتە ڕوو .

٨) دوو وێنە هێنراونەوە بۆ ڕوونکردنەوەو وێناکردنی بەرنامەی ڕاستی خواو، ڕێچکەی پووچی کوفر، لە ئایەتەکانی: (٢٤ – ٢٧) دا .

٩) خستنەڕووی سەرەنجامی کافرانی ناسوپاس‌و سپڵەو پێ نەزان، لە ئایەتەکانی : (٢٨ – ٣٠)دا .

١٠) ڕێنمایی کردنی بڕواداران بۆ نوێژکردن‌و، ماڵ‌و سامان بەخشین، کە لە ئایەتی (٣١)دا خراوەتە ڕوو .

١١) ناساندنی خوا ﷻ لە میانی خستنە ڕووی نیعمەتەکانیدا، کە سەرجەم (١٠) نیعمەتن، لە ئایەتەکانی: (٣٢ – ٣٤)دا .

١٢) باسکردنی ڕازو نیازو پاڕانەوەیەکی گەورەی ئیبراهیم (خَلِیلُ اللّٰه) ﷺ لە ئایەتەکانی: (٣٥ - ٤١)دا، خراوەتە ڕوو .

١٣) خستنە ڕووی سەرەنجامی کافرانی ستەمکار لە دوارۆژدا، لە ئایەتەکانی: (٤٢ – ٥١)دا .

١٤) مەبەستی چواردەیەم‌و کۆتایی، کۆتایی هێنانی ئەم سوورەتە موبارەکە، بەو ڕاستییە کە ئەم قورئانە ئاگاداریی‌و، هۆشداریی‌و، زانیارییە، لەبارەی یەکتایی خوای بەرزی مەزنەوە، کە لە ئایەتی ژمارە (٥٢)دا، باسکراوە .

٥/ کۆی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە، کە پەنجاودوو (٥٢)ە، دابەشمان کردوون، بۆ شەش دەرس :

دەرسی یەکەم : ئایەتەکانی : (١ - ٨) .

دەرسی دووەم : ئایەتەکانی : (٩ - ١٨) .

دەرسی سێیەم : ئایەتەکانی : (١٩ - ٢٣) .

**دەرسی چوارەم :** ئایەتەكانی : (٢٤ - ٣٤) .

**دەرسی پێنجەم :** ئایەتەكانی : (٣٥ - ٤١) .

**دەرسی شەشەم :** ئایەتەكانی : (٤٢ - ٥٢) .

ئنجا لە كۆتایی تەفسیركردنی ئایەتەكانیشدا، لێكۆڵینەوەیەك لەبارەی ژیان و بەسەرهاتەكانی ئیبراهیم (خَلِیلُ الله)وە ﷺ دەكەین، كە هەوڵماندا لێكۆڵینەوەیەكی تێرو تەسەل بێ، چونكە ئەم سوورەتە بە ناوی ئیبراهیمەوە ناونراوەو، ئێمەش وەك بنچینەیەك ئەوەمان ڕەچاو كردوە، كە لە هەر سوورەتێك دا بەناوی هەر پێغەمبەرێك (عَلَیهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) ناونرابێ، لێكۆڵینەوەیەكی تێرو تەسەل، لەبارەی ئەو پێغەمبەرەوە بكەین، كە ئەو سوورەتە موبارەكەی بە ناوەوە كراوە .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی یەكەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە هەشت (٨) ئایەت پێك دێ، ئایەتەكانی : (١ - ٨)، كە چوار مەبەستی سەرەكیی تێدا خراونە ڕوو :

<u>یەكەم:</u> ئامانجی نێردرانی قورئانو، هەڵوێستی نەرێنییانەی بێبڕوایان، لە بەرانبەریدا.

<u>دووەم :</u> ئامانجی نێردرانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بە گشتی.

<u>سێیەم :</u> ئاماژەیەك بە ئامانجی نێردرانی مووسا ﷺ بۆ لای گەلەكەی: بەنو ئیسرائیل .

<u>چوارەم :</u> خستنە ڕووی ئەو ڕاستییە مەزنە، كە ئەوە یاسای خوایە، سوپاسگوزاریی دەبێتە مایەی زیاد بوونی نیعمەتەكانو، سپڵەییش هۆكاری لاچوونیانە .

أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ الٓر ۚ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ
إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿١﴾ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ
وَوَيْلٌ لِّلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى
ٱلْءَاخِرَةِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍۭ ﴿٣﴾ وَمَآ
أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ ۖ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى
مَن يَشَآءُ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٤﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ أَنْ
أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ وَذَكِّرْهُم بِأَيَّىٰمِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ
لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٥﴾ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ
عَلَيْكُمْ إِذْ أَنجَىٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ وَيُذَبِّحُونَ
أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ۚ وَفِى ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٦﴾
تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ۖ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِى لَشَدِيدٌ ﴿٧﴾
وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِن تَكْفُرُوٓا۟ أَنتُمْ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿٨﴾ ﴾.

# مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، ئەلیف لام را، (ئەم قورئانە) کتێبێکە بۆ لای تۆمان دابەزاندوە (ئەی موحەممەد!) تاکو بە مۆڵەتی پەروەردگاریان، خەڵکی لە تاریکاییان بەرەو ڕۆشنایی بێنیەدەر، بەرەو ڕاستە ڕێی (خوای) زاڵی ستایشکراو (ڕێنماییان بکەی) ﴿١﴾ ئەو خوایەی ﷻ هەرچی لە ئاسمانەکان‌و لە زەمین دایە هی ویە، هاواریش بۆ بێبڕوایان لە ئازارێکی بە ئێش ﴿٢﴾ ئەوانەی ژیانی دنیایان خۆشدەوێ‌و، بەسەر دواڕۆژدا هەڵیدەبژێرن‌و، خەڵکی لە ڕێی خوا لادەدەن‌و، لاریی بۆ دەخوازن، ئەوان لە گومڕاییەکی دوور دان ﴿٣﴾ هیچ پێغەمبەرێکیشمان بە زمانی گەلەکەی نەبێ، نەناردوە، تاکو بۆیان ڕوون بکاتەوە (دەبێ چۆن بکەن‌و چی بکەن؟) ئیدی سەرەنجام : خوا هەر کەسێکی بوێ گومڕاو، هەر کەسێکیشی بوێ ڕاستە ڕێی دەکات‌و، ئەو (خوا) زاڵی کارزانە ﴿٤﴾ بە دڵنیاییەوە مووساشمان بە نیشانەکانمانەوە نارد: کە گەلەکەت لە تاریکاییان بەرەو ڕۆشناییان دەربێنەو، ڕۆژەکانی خوایان بخەوە یاد، بێگومان لەوەدا نیشانە هەن، بۆ هەر زۆر خۆڕاگرێکی سوپاسگوزار ﴿٥﴾ یاد بکەوە! کاتێك مووسا بە گەلەکەی خۆی گوت: چاکەی خوا بەسەرتانەوە یاد بکەنەوە: کاتێك کە لە دارو دەستەی فیرعەون قوتاری کردن، لە حاڵێکدا کە ئازارێکی خراپیان پێ دەچێژتن‌و، کوڕەکانتانیان سەردەبڕی‌و ئافرەتەکانتانیان لە ژیاندا دەهێشتەوەو، لەو حاڵەشتاندا تاقیکردنەوەیەکی مەزن لە پەروەردگارتانەوە هەبوو ﴿٦﴾ یادیش بکەنەوە! کاتێك پەروەردگارتان ڕایگەیاند : ئەگەر سوپاسگوزاریی بکەن (لەسەر چاکەکانم) بە دڵنیاییەوە بۆتان زیاد دەکەم، بەڵام ئەگەر ناسوپاس‌و، سپڵە بن، ئەوە سزاو ئازارم (بۆ سپڵان) توندە ﴿٧﴾ مووساش (بە گەلەکەی خۆی) گوت: ئەگەر ئێوەو هەموو ئەوانەی لەسەر زەویین ناسوپاس بن، بە دڵنیایی، بێگومان، خوا بێنیازی ستایشکراوە ﴿٨﴾}.

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

( بِإِذْنِ رَبِّهِمْ ): بە مۆڵەتی پەروەردگاریان، یان بە ویستی پەروەردگاریان، (الإِذْنُ: فِي الشَّيْءِ: إِعْلاَمٌ بِإِجَازَتِهِ وَرُخصَةٌ فِيهِ، بِإِذْنِهِ، أَي: بِإِرَادَتِهِ وَأَمْرِهِ) وشەی (إذن): لە شتێکدا، واتە: ڕێپێدانیو مۆڵەت پێدانیو، وشەی (إذن)، بە مانای ویستی خوا دێو، بە مانای فەرمانی خواش دێ .

( وَوَيْلٌ لِّلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ): (قَالَ الأَصْمَعِيّ: وَيلٌ: قُبْحٌ، وقَدْ يُسْتَعْمَلُ للتَّحَسُّرِ)، (وَيل) لە زمانی عەرەبیی دا بە مانای شتی ناشیرینو ناقۆڵا دێو، بە مانای خەفەت خواردنیش دێ، خاوەنی (المعجم الوسیط)یش[1] دەڵێ: (الويلُ: حُلُولُ الشَّرِّ وَكَلِمَةُ العَذَاب)، واتە: (وَیل) ئەوەیە کە شەڕو خراپەیەك ڕوو لە ئینسان بکاتو، وشەی سزاو ئازاریشە هەندێکیش گوتوویانە: (ویل) ناوی چاڵێکە لە دۆزەخدا .

( يَسْتَحِبُّونَ ): هەر (يُحبُّون)ە، بەڵام پیتی (س) و (ت)ی بۆ زیاد کراون، واتە: خۆشیان دەوێ، بەڵام لێرەدا بە (يُؤْثِرون)مان مانا کرد، واتە: بەسەریدا هەڵدەبژێرن، چونکە بە وشەی: (علی) تەعەددای پێکراوە، {بەرکار (مفعول بە) خواستوە} بۆیە وێڕای مانای خۆی، مانای وشەیەکی دیکەشی خراوەتە نێو، کە لە زمانی عەرەبیی دا (تضمین)ی پێدەگوترێ، واتە: خرانە نێو، وەك دوایی باسی دەکەین .

( وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا ): لارییان بۆی دەوێ، واتە: بۆ ئایینو بەرنامەی خوا، دەیانەوێ لارو وێر، خوارو خێچ، بیخەنە بەرچاو، وشەی (عِوَج) بۆ شتی مەعنەویی بەکاردێ، بەڵام (عَوَج) بۆ شتی ماددییە، دەگوترێ: (جِدارٌ عَوَج) واتە: دیوارێکی لار.

---

١) ص ١٠٦١.

( بِأَيَّىٰمِ ٱللَّهِ ): وشەی (أيام) کۆی (يَوْم)ەو، (أيّامُ الله، أي: أيّام بطشه لأعدائِهِمْ، وَتَأييدِهِ لَهُمْ) واتە: ئەو ڕۆژانەی کە خوا تۆڵەی لە دوژمنانیان تێدا ستانلۆتەوەو، پشتگیریی ئەوانی کردوە، زۆر جاران باسمان کردوە، وشەی: (يوم) بە مانای ماوەیەك لە کات دێ، نیدی مەرج نیە (١٢) سەعات، یاخود (٢٤) سەعات بێ، بەڵکو مەبەست ئەو کاتانەن، ئەو قۆناغانەن، کە دەستی خوایان تێدا دەرکەوتوە، بۆ پشتگیریی بڕواداران و، تووڕەیی و تۆڵەی خوا بۆ دوژمنانی بڕواداران .

( يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ ): واتە، سزاو ئازارێکی خراپیان پێدەچێژتن، (السوم : الذَّهابُ في ابتغاء الشيء) واتە: وشەی (سوم) بریتیە لەوە کە ئینسان بڕوا بە دوای شتێکدا .

( بَلَآءٌ ): (البَلاءُ: الإخْتِبَارُ، وَهُنا المُصيبة بالشَّرِّ) وشەی (بَلاء) لە ئەسڵ زماندا بە مانای تاقیکردنەوە دێ، بەڵام لێرەدا بە مانای تاقیکردنەوە بە بەڵاو ناڕەحەتیی، دێ .

( تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ ): واتە: پەروەردگارتان ڕایگەیاند، (التأذُّن: مُبَالَغَةٌ فِي الأَذانِ، مِثْلُ تَوَعَّدَ مِنْ أَوْعَدَ، وَتَفَضَّلَ مِنْ أَفْضَلَ) وشەی (تأذُّن) واتە: ڕاگەیاندنێکی زۆر بە توخیی، چونکە وشەی (اذان) واتە: ڕاگەیاندن، بەڵام (تَأذُّن) واتە: زۆر بە توخی ڕایگەیاند، وەك وشەی (تَوعَّد) واتە: هەڕەشەیەکی توخی لێکرد، یان (أفْضَل) واتە: بەخشی، بەڵام (تَفَضَّل) واتە: زۆری بەخشی .

# مانای گشتی ئایەتەکان

ئەم هەشت (٨) ئایەتە کە دەستپێکی بابەتەکانی ئەم سوورەتەن، وەك لە پێناسەی ئەم سوورەتەداو، لە پێناسەی ئەم دەرسەشدا باسمان کرد، چەند بابەتێکی گرنگ دەگرنە خۆیان.

وەك پێشتریش گوتمان: ئەم سوورەتە سوورەتێکی مەککەییە، سوورەتە مەککەییەکانیش وەك لە سەرەتای سوورەتی (الأنعام)دا باسمان کردوە، کە لە دوای سوورەتی (الفاتحة) سوورەتی (الأنعام) یەکەمین سوورەتی مەککەییە لە ڕیزبەندیی (مصحف)دا، لەوێدا بە تەفصیل باسی سروشتی سوورەتە مەکەییەکانو، سروشتی سوورەتی مەدینەییەکانمان کردوە، واتە: پێویستە خوێنەرانی بەڕێز، بگەڕێنەوە بۆ ئەوێ، بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی سروشتی سوورەتە مەککییەکانو سوورەتە مەدەنییەکانو، خاڵە هاوبەشو، خاڵە جیاوازەکانیانەوە .

بەڵام لێرەدا بەنسبەت سوورەتی (إبراهیم)ەوە دەڵێین: ئەگەر ئەم سوورەتە لە ڕیز بەندیی دابەزیندا، حەفتایەمین سوورەت بێت، مانای وایە (٦٩) سوورەت لە پێش سوورەتی (إبراهیم)دا دابەزیون، هەر بۆیەش خوا ﷻ لێرەدا هەندێك بابەت بە کورتیی ئاماژە ئاسا باس دەکات، بۆ وێنە: لێرەدا کە باسی مووسا ﷺ دەکات، زۆر بە کورتیی ئاماژەی پێ دەکاتو، کە باسی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) دەکات بە گشتی، دیالۆگو گفتوگۆیەك لە نێوان پێغەمبەرانو گەلەکانیاندا دێنێ، چونکە لە (٦٩) سوورەتەکەی پێش ئەم سوورەتەدا، خوا بە درێژیی باسی بەسەرهاتی پێغەمبەرانی (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) کردوە، هەر کامێکیان لەگەڵ گەلەکەی دا، هەروەها بە درێژیی باسی بەسەرهاتی مووسا ﷺ لەگەڵ گەلەکەی (بەنو ئیسرائیل)دا کراوە، بۆیە لێرەدا خوا ﷻ تەنیا ئاماژە دەکات بەو شتانەی کە پێشتر کە بە درێژیی باسی کردوون .

لێرەدا ئەم سوورەتە ئاوا دەست پێدەکات: ﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، زۆرجار باسمان کردوە کە کاتێک کە ئەم ڕستە موبارەکە دەخوێنرێتەوە، پێویستە ئەوە بە زەین و دڵدا بهێنرێ کە :

١/ من ئەو کارە بە ناوی خواوە دەستپێدەکەم .

٢/ بۆ خوا دەستی پێدەکەم، ئامانج/ ڕازیکردنی ویە .

٣/ لەم کارەدا پشت بە خوا دەبەستم، واتە: سەرسامو موعجەب نیم بە خۆم، بەڵکو بە توانای خواو، بە ڕێپێدرانی خوای پەروەردگار ئەم کارە دەکەم .

٤/ ئەم کارە بە پێی ئایین و بەرنامەی خوا ئەنجام دەدەم .

﴿ الٓر ﴾ ئەم پیتە پچڕ پچڕانە، لە سەرەتای تەفسیری سوورەتی (یونس)دا، بە تەفصیلێ قسەمان لێ کردوون، کە باشترین مانا لێکدانەوە، یان باشترین لێتێگەیشتن بۆ ئەو پیتە پچڕ پچڕانە، ئەوەیە کە :

خوا ﷻ دەیەوێ بەو خەڵکە بفەرموێ: ئەم قورئانەی کە لەبەردەستتانە هەر لەو پیتانەو لەو دەنگانە، پێکهاتوە کە ئێوە قسەیان پێ دەکەن: (ا، ل، ر، ص، ق، ن ... هتد)، واتە: مادام ئێوە ناتوانن، نەك وێنەی ئەم قورئانەو، وێنەی دە (١٠) سوورەتو، بەڵکو وێنەی سوورەتێکیشی بێنن، کەواتە: بزانن: ئەو قورئانەی لەو پیتو دەنگانە پێك هاتوە، کە وەك کەرەستەیەك لەبەردەستی ئێوەشدا هەن، بەڵام ئێوە ناتوانن بەشێکی گچکەی ئەم قورئانەشیان لێ پێکبێنن: سەرچاوەکەی خوای بەرزی بێ وێنەیە، نە پێغەمبەر (موحەممەد ﷺ)و، نە هیچ کەسێکی دیکەشە .

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴾، واتە: ئەمە کتێبێکە دامانبەزاندوە بۆ لای تۆ، تاکو خەڵکی بە مۆڵەتی پەروەردگاریان، لە تاریکاییان دەرباز بکەی بەرەو ڕووناکیی، لە تاریکاییان، تاریکایی لە ڕووی بوونناسیی و لە ڕووی فیکریی و، لە ڕووی عەقیدەیی و، لە ڕووی پەرستن و، لە ڕووی ڕەوشت و، لە ڕووی حوکم و سیاسەت و، لە

ڕووی نابووریی‌و، لە ڕووی کۆمەڵایەتیی‌و ... هتدەوە لە هەموو تاریکاییەکان دەریانبێنی، بەرەو ڕۆشنایی ڕوو لە خوا کردن، ڕۆشنایی ڕاستە شەقامی خوا، کە بەرنامەیەکی گشتگیرە بۆ دەرو دەروونی مرۆڤ، بۆ هەموو بوارو ڕەهەندەکانی ژیان‌و گوزەران، بەڵام ئەوەش: ﴿ بِإِذۡنِ رَبِّهِمۡ ﴾، بە مۆڵەتی پەروەردگاریان .

ئنجا بەرەو کوێ؟ ئەو ڕووناکییە چییەو کوێیە، کە ئەوانی بۆ دەرباز دەکەی؟ ﴿ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ﴾، بەرەو ڕاستە شەقامی خوای زاڵی ستایشکراو .

ئنجا پێناسەی خوا دەکات: ﴿ ٱللَّهِ ٱلَّذِي لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، ئەو خوایەی کە هەرچی لە ئاسمانەکان‌و زەوی دا هەیە، هی ئەوە، وشەی : ﴿ ٱللَّهِ ﴾، خوێنراویشەتەوە : ﴿ اللهُ ٱلَّذِي ﴾، کە هەر یەك واتای هەیە، ئەو خوایەی کە هەرچی لە ئاسمانەکان‌و زەوی دا هەیە، موڵکی ئەوە، ﴿ وَوَيۡلٞ لِّلۡكَٰفِرِينَ مِنۡ عَذَابٖ شَدِيدٍ ﴾، هاواریش لە ئازارێکی سەخت بۆ بێبڕوایان، هاوار بۆ ئەوان، یاخود سزا بۆ ئەوان، ماڵ وێرانیی بۆ ئەوانەی کە ئازارێکی سەخت‌و بێ ڕەزا، بەرۆکیان دەگرێ، لەسەر ئەوە کە بێبڕوان‌و، بەرانبەر بە خوا، سپڵەو نا سوپاسن .

ئنجا پێناسەی ئەو بێبڕوایانە دەکات، دەفەرموێ : ﴿ ٱلَّذِينَ يَسۡتَحِبُّونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجًا ﴾، ئەوانەی کە ژیانی دنیایان خۆشدەوێ‌و هەڵیدەبژێرن بەسەر ژیانی دوا ڕۆژدا، ئنجا هەر ئەوەندەش نا؟! ﴿ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، خەڵك لە ڕێی خوا لادەدەن، یان خۆیان لادەدەن لە ڕاستە شەقامی خوا،[1] ﴿ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجًا ﴾، هەروەها خواریی‌و لاریی بۆ ڕێبازی خوا دەخوازن، واتە: دەیانەوێ ئایین‌و بەرنامەی خوا خوارو خێچ، بخەنە بەرچاو، ئەو حاڵەتە ڕێك‌و ڕاست‌و هاوسەنگەی کە شەریعەتی خوا

---

١) چونکە (صَدَّ) هەم مانای (لازم)ی هەیە، یانی، خۆی لایدا، هەم مانای (مُتَعدّي)یش یانی ، خەڵکی لادا .

لەسەریەتی، دەیانەوێ ئەو حاڵەتە تێکبدەن، بە پڕوپاگەندەو بانگەشەو بە وێناکردنی ناشیرین، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلِۢ بَعِيدٖ ﴾، ئا ئەوانە لە گومڕاییەکی دوور دان، واتە: گومڕا بوونو ڕێیان لێ تێکچووەو، زۆریش دوور کەوتوونەوە، بۆیە بە زەحمەت دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ ڕاستە شەقامی خوا .

ئنجا خوا ﷻ باسی ئامانجی نێردرانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) دەکات، دوای ئەوەی باسی ئامانجی نێردرانو، دابەزێنرانی دوایەمین کتێبی خۆی کرد، کە قورئانە، دەفەرموێ : ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ ﴾، هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە، مەگەر بە زمانی گەلەکەی خۆی .

وشەی (لسان) بە مانای ئەو زمانە گۆشتینە دێ کە ئینسان قسەی پێ دەکات، بەڵام لێرەدا بە تەئکید مەبەست پێی لوغەتە، واتە: ئەو زمانەی کە خەڵك پێی دەئاخفێ، بەڵام لێرەدا وشەی (لسان) خوازراوەتەوە بۆ لوغەت، کە ئێمە لە زمانی کوردیی دا، هەردووکیان هەر زمانیان پێ دەڵێین، بەڵام ئەوەتا لە عەرەبییدا، بە وشەی زمان کە (زمانە گۆشتینەکەیە) کە خواردنو شتی پێدەخورێ (لسان)ی پێ دەڵێن، بەڵام ئەو زمانەی کە قسەی پێ دەکەین، لوغەتی پێ دەڵێن .

(قوم) واتە: کۆمەڵە خەڵکێك، بۆچی؟ ﴿ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡ ﴾، تاکو بۆیان ڕوون بکاتەوە، چییان بۆ ڕوون بکاتەوە؟ ئەو پەیامەی کە خوا پێیدا ناردوە، ﴿ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُ ﴾، ئیدی سەرئەنجام: خوا هەر کەسێکی بیەوێ گومڕای دەکاو، هەر کەسێکیشی بوێ، دەیخاتە سەر ڕاستە ڕێ، وشەی (يهدي) لێرەدا بە مانای خستنە سەر ڕاستە ڕێ، دێ، نەگەرنا وەك ڕێ پێشاندان، خوا ویستوویەتیو براوەتەوە خوا پێغەمبەرانی (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ناردوە، کە بە زمانی خەڵکەکە بدوێنو، بۆیان ڕوون بکەنەوە، کەواتە: هیدایەت بە مانای (ڕێ پێشاندان) ئەوە تێپەڕیوەو، خوا ویستوویەتی، بەڵام ئەوەی کە بەستوویەتەوە بە ویستی خۆیەوە، مانایەکی دیکەی هیدایەتە، کە بریتییە لە:

خستنە سەر ڕاستە ڕێ، ئنجا ئایا خوا دەیەوێ کێ گومڕا بکات و دەیەوێ کێ بخاتە سەر ڕاستە ڕێ؟ ئەوە دواتر هەر لەم سوورەتەدا زیاتر قسەی لێ دەکەین، بە تەئکید خوا ﷻ نە کەس لە گۆترە لە ڕێ لادەداو، نە کەسیش بە گۆترە دەخاتە سەر ڕاستە ڕێ، بەڵکو ئەوانەی شایستەی ڕێ لێتێکچوون بن، خوا ئەوانە گومڕا دەکات و، ئەوانەی شایستەی ڕێ دۆزینەوە بن، خوای پەروەردگار دەستی ئەوانە دەگرێ، ئنجا شایستەییەکەش، مرۆڤ بۆخۆی لە خۆیدا دەیهێنێتە دی، ئەو حاڵەتە کە مرۆڤ لە خۆیدا دەیهێنێتە دی، بە پێی ئەو حاڵەتە، خوا ﷻ لەگەڵ مرۆڤدا مامەڵە دەکات، ﴿ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾، خوا زاڵی کارزانە، باڵادەست و زاڵەو، کار بەجێشە، هەرچی کە دەیکات لە جێی خۆی دایە .

ئنجا ئاماژەیەك دەکات بە بەسەرهاتی مووسا ﷺ لەگەڵ گەلەکەیدا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَـٰتِنَآ أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ وَذَكِّرْهُم بِأَيَّىٰمِ ٱللَّهِ ﴾، بە دڵنیاییەوە: ئێمە مووسامان بە نیشانەکانی خۆمانەوە نارد، کە گەلەکەت لە تاریکاییان دەربێنەو ڕۆژەکانی خوایان بێنەوە یاد .

کە دەفەرموێ : نیشانەکانی خۆمان، دەگونجێ مەبەست پێی، ئەو ڕستانە بێ کە بەرنامەی خوایان لێ پێکهاتوە، چونکە خوا ناوی لەوان ناوە (آیات)، دەشگونجێ مەبەست پێی ئەو بەڵگەو موعجیزانە بێ، کە خوا بە مووسای داون، کە وەك لە سوورەتی (النمل)دا خوا باسی کردوە، نۆ (٩) نیشانە بوون: ﴿ فِى تِسْعِ ءَايَـٰتٍ ﴾، هەروەها لە سوورەتی (الإسراء)یشدا باسیان کراوە: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَـٰتٍۭ بَيِّنَـٰتٍ ﴿١٠١﴾ ﴾، واتە: بەدڵنیایی نۆ نیشانەی ڕۆشنمان دابوونە مووسا .

کە ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (الأعراف)دا، بە تەفصیل باسمان کردوون، ئەو نۆیانە کامانەن، هەر نۆیان لە سوورەتی (الأعراف)دا خراونە ڕوو .

خوا دەفەرموێ: ئێمە مووسامان بە نیشانەکانی خۆمانەوە نارد، (یانی: هەم ئەو ئایەتانەی کە بەرنامەی خواو شەریعەتی خوایان لێ پێکدێ، هەم ئەو موعجیزانەی کە بەڵگەن بۆ سەلماندنی ڕاستێتیی مووسا ﷺ)، بۆچین مووسامان نارد ؟ ﴿أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ﴾، پێمان گوت: خەڵك و گەلەکەت دەر بێنە لە تاریکاییان بەرەو ڕۆشنایی، ﴿وَذَكِّرْهُم بِأَيَّامِ اللَّهِ﴾، ڕۆژەکانی خواشیان بخەوە یاد، واتە: ئەو ڕۆژانەی کە چاکەو نیعمەتی خوا بۆ گەلی بەنو ئیسرائیلیان تێدا دەرەوشاوەتەوەو، تووڕەیی و تۆڵەی خوایان بۆ فیرعەون و دارو دەستەکەی، تێدا دەرکەوتوە ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾ بێگومان لەوەدا نیشانە هەن، بۆ هەر زۆر خۆڕاگرێکی زۆر سوپاسگوزار .

﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ﴾، یاد بکەوە ! کە کاتێك مووسا بە گەلەکەی خۆی گوت: چاکەی خوا بەسەر خۆتانەوە یاد بکەنەوە، هەڵبەتە چاکەی خوا لەسەر گەلی مووسا ﷺ، لەسەر بەنو ئیسرائیل، هەر یەك و دووان نەبووە، بەڵام لێرەدا: وشەی: (نِعْمَةَ) یانی: جینسی نیعمەتەکانی خوا، چاکەکانی خوا بە گشتیی، یاد بکەنەوە، کە چەندان موفرەدەی لە ژێردا کۆدەبنەوە ﴿إِذْ أَنجَاكُم مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ﴾، کاتێك کە لە دارو دەستەو شوێنکەوتووانی فیرعەون دەربازی کردن، کە چییان لێ دەکردن؟ ﴿يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ﴾، سزایەکی خراپیان پێتان دەچێژت، سۆغرەو بێگاریان پێدەکردن و، ئەشکەنجەیان دەدان، ﴿وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ﴾، نێرینەکانتانیان، کوڕەکانتانیان سەردەبڕین و، ئافرەتەکانتانیان دەهێشتنەوە، بۆ خزمەت و بۆ ڕابواردن ﴿وَفِي ذَٰلِكُم بَلَاءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ﴾، لەوەدا تاقیکردنەوەیەکی مەزن هەبوو لە پەروەردگارتانەوە بۆ ئێوە، واتە: لەو سزاو ئەشکەنجەیەدا ، کە لەلایەن فیرعەون و دارو دەستەکەیەوە دەدران، تاقیکردنەوەیەکی سەخت و مەزن هەبوو بۆ ئێوە، یاخود لەو دەربازکرانەتاندا، تاقیکردنەوەیەك و چاکەیەکی مەزنی پەروەردگارتان هەبوو .

وشەی (بلاء) هەم دەگونجێ بە مانای تاقیکردنەوە بێ، بە باری ناڕەحەتیی دا، هەم دەکرێ بەمانای تاقیکردنەوە بێ بە باری خۆشییدا .

﴿ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ﴾ ئەمە دەگونجێ قسەی مووسا ﷺ بێ بۆ گەلەکەی، دەشگونجێ ڕاستییەك بێ کە خوای پەروەردگار لێرەدا ڕایگەیاندبێ :

یاد بکەوە ! کاتێك پەروەردگارتان ڕایگەیاند: ئەگەر سوپاسگوزاریی بکەن، بۆتان زیاد دەکەم .

سوپاسی خوا کردن، وەك زۆر جاری دیکەش گوتوومانە: هەم بە دڵ دەکرێ، کە مرۆڤ چاکەکە بە هی خوا بزانێ، هەم بە زمان دەکرێ، کە دانی پێدا بێنێ، هەم بە ئەندامەکانیش دەکرێ، کە ئەو چاکەیەو نیعمەتە لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاربێنێ، هەر چاکەیەك ئاوا سوپاسگوزاریی لەسەر بکرێ، ﴿ لَأَزِيدَنَّكُمْ ﴾، بۆتان زیاد دەکەم ﴿ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ ﴾، بەڵام ئەگەر سپڵەش بوون، نا سوپاس بوون، ئەوە سزای من سەختە .

لێرەدا وشەی: (كفرتم) لەبەرئەوەی لە بەرانبەر (شكرتم)دا هاتووە یانی: ئەگەر سپڵەو نا سوپاس بن و، بێ ئەمەگ بن و، بە مانای بێبڕوایی نییە، بە بەڵگەی ئەوەی بەراوردی پێکراوە لەگەڵ (شكر)دا .

﴿ وَقَالَ مُوسَىٰٓ ﴾، مووسا ﷺ گوتی: (بە گەلەکەی خۆی گوت): ﴿ إِن تَكْفُرُوٓاْ أَنتُمْ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴾، ئەگەر ئێوەو تێکڕای ئەو خەڵکەی کە لە لەسەر زەمین دەژین، هەمووتان سپڵەو، نا سوپاس بن، (یان دەگونجێ مەبەست پێی بێبڕوابن بێ)، ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴾، بێگومان خوا بێ نیازی ستایشکراوە، دەوڵەمەندەو بێ نیازە پەکی لەسەر ئیمانی ئێوە یاخود لەسەر سوپاسگوزاریی ئێوە، نەکەوتوە ئەگەر ئێوە سوپاسی بکەن، یان نەکەن و، بەرانبەر بە چاکەکانی بە ئەمەگ و بە وەفا بن، یاخود بێ ئەمەگ بن، خوا هەر ستایشکراوەو، لە خودی خۆیدا شایستەی هەموو ستایشێك و مەدح و سەنایەکە .

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**<u>مەسەلەی یەكەم</u> : پێناسەی قورئان: ئایا لە كوێوە هاتووە؟ بۆچی دابەزێنراوە؟ دابەزێنەرەكەی چ زاتێكە؟ ئەوانەی نەیارنی، چۆنن و كێن ؟**

خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ : ﴿ الٓر ۚ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿١﴾ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَوَيْلٌ لِّلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْءَاخِرَةِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ ﴿٣﴾ ﴾.

**شیكردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەكە ، لە دوازدە (١٢) بڕگەدا :**

**<u>بڕگەی یەكەم</u> : - ﴿ الٓر ﴾، ئەوانە سێ پیتن، دەبێ بە جیاجیا بخوێنرێنەوە، پێیان گوتراوە: (الحروف المقطّعَة) پیتە لێك دابڕاوەكان، یان پیتە پچڕ پچڕەكان، كە وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا: خوا ﷻ دەیەوێ بەو خەڵكە بفەرموێ: ئەو قورئانەی لەبەر دەستتانە، هەر لەو پیتانە پێكدێت كە ئێوە قسەیان پێ دەكەن، بەڵام ئێوە دەستەوسانن لە بەرانبەر قورئاندا، كە وێنەی قورئان، یان وێنەی دە (١٠) سووڕەتی قورئان، یان وێنەی سووڕەتێكیشی، بێنن، كەواتە: بزانن كە ئەم قورئانە كە دەستەوسانكەرە بۆ ئێوەو بۆ ئینس و جینن، بزانن كە ئەوەی فەرموویەتی: خوای بەرزی بێ وێنەیە .**

**بڕگەی دووەم :** - ﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ ﴾، ئەمە وەك شارەزایانی زمانی عەرەبیی دەڵێن: شتێکی لە پێشەوە ڕەچاو (تقدیر) کراوە، بۆ وێنە: (هَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ )، واتە: ئەمە کتێبێکە بۆ لای تۆمان دابەزاندوە، ئایەتی یەکەمی سوورەتی (الأعراف)یش شێوەی ئەم ئایەتە دەکات، بەڵام لەوێ ئاوایە: ﴿ الٓمٓصٓ ١ كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيۡكَ فَلَا يَكُن فِي صَدۡرِكَ حَرَجٞ مِّنۡهُ لِتُنذِرَ بِهِۦ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ٢ ﴾، وەك لە تەفسیری سوورەتی (الأعراف)دا بە تەفصیلْ قسەمان لەبارەوە کردوە .

**بڕگەی سێیەم :** - ﴿ لِتُخۡرِجَ ٱلنَّاسَ ﴾، تاکو خەڵکی دەرباز بکەی، ئەم قورئانە بۆچی نێردراوە، بۆچی دابەزێنراوە؟ بێگومان ئامانجێك لە پشت دابەزاندنیەوە هەیە، ئەویش ئەوەیە کە خەڵك دەرباز بکەیو بیانهێنیەدەر، لە کوێو بۆ کوێ ؟!

**بڕگەی چوارەم :** - ﴿ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ﴾، لە تاریکاییەکان بەرەو ڕووناکیی، لە هەموو قورئاندا، وشەی ﴿ ٱلظُّلُمَٰتِ ﴾، هەر بە کۆ هاتوە، تاریکاییەکان (ظلمات)، کە کۆی (ظُلْمَة)ە، بەڵام وشەی ﴿ ٱلنُّورِ ﴾، هەر بە تاك هاتوە (نور) ڕووناکیی .

بێگومان کە خوا ﷻ دەفەرموێ: لە تاریکاییەکان دەریانبێنی بەرەو ڕووناکیی، واتە: لە تاریکاییەکان لە ڕووی بووناسییەوە، لە ڕووی ئیمانو عەقیدەوە، لە ڕووی حوکمو سیاسەتەوە، لە ڕووی حەڵاڵو حەرامەوە، لەڕووی ڕەوشتو ئاکارەوە، لە هەموو ئەو جۆرە تاریکاییانەوە، دەریانبێنی بەرەو ڕۆشنایی، واتە: بەرەو ڕۆشنایی هیدایەتی خواو، بەرەو ڕۆشنایی ئایینو بەرنامەو شەریعەتی خوا .

**برگەی پێنجەم :** - ﴿ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ ﴾، بە مۆڵەتی پەروەردگاریان، پێشتر باسمان كرد وشەی: (إِذْن)، واتە: مۆڵەتدان، یاخود ویستنی خوای پەروەردگار، یاخود ڕێگا پێدانی .

**برگەی شەشەم :** - ﴿ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴾، بەرەو ڕاستە شەقامی خوای زاڵی ستایشكراو، وشەی: (ٱلْعَزِيزِ)، یانی: (الّذي لاَ يُغْلَب)، ئەو كەسەی كە كەس توانای بەسەریدا ناشكێ‌و، كەس پێی ناوێرێ، (ٱلْحَمِيدِ)یش بە مانای ستایشكراو (المحمود) دێ .

**برگەی حەوتەم :** - ﴿ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، ئنجا پێناسەی خوا ﷻ دەكات‌و، دەفەرموێ: ئەو خوایەی كە هەرچی لە ئاسمانەكان‌و زەویدا هەیە، هی ئەوە، هەڵبەتە وشەی: (ٱللَّهِ ٱلَّذِى)، خوێنراویشەتەوە: ﴿ اللهُ ٱلَّذِى ﴾، ئنجا ئەگەر بفەرموێ: ﴿ ٱللَّهِ ٱلَّذِى ﴾، ئەوە بادەدرێتەوە (عطف) دەگرێتەوە، سەر ئەوەی پێشێ، كە دەفەرموێ: ﴿ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْحَمِيدِ الله ٱلَّذِى ﴾، ئەو ﴿ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴾، ئەو خوایەی كە هەرچی لە ئاسمانەكان‌و زەویدا هەیە، هی ئەوە، بەڵام ئەگەر بە (رَفْع) بخوێنرێتەوە، ئەو كاتە دەبێتە ڕستەیەكی سەربەخۆ ﴿ اللهُ ٱلَّذِى ﴾، ئەو خوایە كە هەرچی لە ئاسمانەكان‌و زەویدا هەیە، موڵكی ویە، واتاكانیان هەر یەكن .

**برگەی هەشتەم :** - ﴿ وَوَيْلٌ لِّلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴾، هاواریش بۆ بێبڕوایان لە سزایەكی سەخت .

وشەی (وَيْل : مَصْدَرٌ لاَ يُعْرَفُ لَهُ فِعْلٌ، وَمَعْنَاهُ : الهَلاَكُ، وما يَقْرُبُ مِنْهُ مِنْ سوءِ الحَالِ)، واتە: (وَيْلٌ) چاوگەو نەزانراوە كردارێكی هەبێ، لێیەوە داتاشرابێ‌و وەرگیرابێ، ماناكەشی بریتییە لە: لەبەین چوون، یاخود هەر واتایەك كە لێیەوە نزیكە، وەك حاڵ خراپیی .

ڕستەی: ﴿ وَوَيْلٌ لِّلْكَٰفِرِينَ ﴾، ئەلیفو لامە(ال)کەی بۆ ناساندن (تعريف)ە، بەڵام ناساندنی (عهد)ە، نەك تێکڕای کافران، واتە: ئەو کافرانەی کە نامادەنەبوون لە تاریکاییانەوە بەهۆی ئەو قورئانەوە، بێنەدەر بەرەو ڕۆشنایی .

**بڕگەی نۆیەم :** - ﴿ ٱلَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْأَخِرَةِ ﴾، ئەوانەی کە ژیانی دنیایان خۆشتر دەوێ لە دواڕۆژو، بەسەریدا هەڵیدەبژێرن، پێشتر باسمانکرد، کە وشەی ﴿ يَسْتَحِبُّونَ ﴾ چونکە بە (على) تەعەددای پێکراوە، ﴿ يَسْتَحِبُّونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْأَخِرَةِ ﴾ ئەگەرنا پێویستیی بە پیت (حرف) ناکات بۆ بەرکار (مفعول) خواستن و دەگوترا: (يُحِبُّونَ الحياة الدُّنيا)، بەڵام کە بە (على) تەعەددای پێکراوە، مانای (يُؤْثِرُونَ)ی خراوەتە نێو، واتە: (يُحِبُّونَ الحَيَاةَ الدُّنيا وَيُؤْثِرُونَها عَلَى الآخرة) ژیانی دنیایان خۆشدەوێ و هەڵیشیدەبژێرن بەسەر ژیانی دواڕۆژدا .

**بڕگەی دەیەم :** - ﴿ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، خەڵکی لە ڕێی خوادا لادەدەن .

وشەی: (صَدَّ، يَصُدُّ) هەم بە (لازم) هاتووە، هەم بە (متعدّي): (صَدَّ الإنْسَانُ عَنْ سَبِيلِ الله) واتە: ئەو مرۆڤە خۆی لە ڕێی خوای لادا، یاخود: (صَدَّ الإِنْسَانُ غَيْرَهُ عَنْ سَبِيلِ الله) ئەو مرۆڤە غەیری خۆی لە ڕێی خوادا لادا، هەردووکیشیان لێرەدا دەگونجێن، بەڵام زیاتر مانای دووەمیان واتە: خەڵك لە ڕێی خوادا لادەدەن، گونجاوترە .

**بڕگەی یازدەیەم :** - ﴿ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا ﴾، هەروەها لاریی بۆ (بەرنامەی خوا) دەخوازن، واتە: دەیانەوێ ڕێی خواو بەرنامەی خوا، لارو خوارو خێچ بخەنە بەرچاو، تاکو خەڵك لێی بسڵەمنەوە، ئەمە عادەتێکی لە مێژینەی ئەهلی کوفرە لە بەرانبەر شەریعەتو بەرنامەی خوادا، چونکە دەزانن ئەگەر ئایینی

خوا، وەك حاڵەتی سروشتیی و ئاسایی خۆی، بکەوێتە بەرچاوی خەڵك، خەڵك عەودالی دەبێ و بڕوای پێ دێنێ، چونکە لەگەڵ عەقڵی سەلیم و فیترەتی ساغدا دەگونجێ، بۆیە دەیانەوێ خوارو خێچی بکەن و، لار بیخەنە بەرچاوان، تاکو خەڵك لێی بسڵەمێتەوە .

**بڕگەی دوازدەیەم :** - ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلِۭ بَعِيدٖ ﴾، ئا ئەوانە لە گومڕاییەکی دوور دان، واتە: لە گومڕاییەك دان، هێندە دوور کەوتوونەوە، بە زەحمەت دەگونجێ بگەڕێنەوە سەر ڕاستە شەقامی خوا .

**مەسەلەی دووەم :** ڕوونکردنەوەی لەو ڕاستییە کە سەرجەم پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمِ) بە زمانی گەلەکانیان نێردراون، تاکو بتوانن بەرنامەی خوایان بۆ ڕوون بکەنەوە :

خوا دەفەرموێ : ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡۖ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٤﴾ ﴾.

شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە ، لە سێ بڕگەدا :

**بڕگەی یەکەم :** - ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡ ﴾، هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە، مەگەر بە زمانی گەلەکەی، تاکو بۆیان ڕوون بکاتەوە .

بە پێی سیاق دیارە کە چییان بۆ ڕوون بکاتەوە! پەیامی خوایان بۆ ڕوون بکاتەوە، ئایین و بەرنامەی خوایان بۆ ڕوون بکاتەوە، وشەی (لِسان)یش ئەو زمانە گۆشتینەیە کە مرۆڤ قسەی پێ دەکات، بەڵام لێرەدا (لِسان) بە مانای (لُغَة) بەکارهاتوە، دەڵێ :

(أُطْلِقَ اللسَان عَلَى اللُغَةِ إطْلاَق الـمَحَلّ عَلَى الحَالّ بِهِ، مِثلُ : سال الوَادِي) واتە: وشەی (لِسان) بە مانای زمانی قسە پێكردن (لُغَة) بەكارهاتووە وەك (مَحَلّ) بەكارهاتوە، بەڵام مەبەست پێی ئەو شتەیە كە لەوێ دایە، كە بریتیە لە (لُغَة)كە، كە (لُغَة) بە زمان (لسان) دەردەكەوێو، دەردەبڕدرێ، وەك دەگوترێ: (سَالَ الوَادِي)، (وادي) بەو دابڕاوایی‌و چاڵاییە دەگوترێ، كە لە نێوان دوو گردان دایە، دۆڵ (وادي) ئەوەیە، بەڵام دوایی بەو ئاوەی كە بە نێو ئەو چاڵایی‌و قووڵاییەدا دێ، گوتراوە: (وادي)، كە دەگوترێ: (سَالَ الوَادِي) واتە: ئاو بە نێو دابڕاواییەكەو بە نێو دۆڵەكەدا هات .

سێ ئەنجامگیریی گرنگ لەم ڕاستییە :

یەكەم : دەرخستنی یاسایەكی گشتیی خوا ﷻ، كە خوا هەموو پێغەمبەرانی (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ناردوون خەڵك حاڵی بكەن‌و، بە زمانی خۆیان تێیان بگەیەنن.

دووەم: بە نسبەت پێغەمبەری خاتەمیشەوە (موحەممەد ﷺ) یەكێك بۆی هەیە، بڵێ: كەواتە: پێغەمبەری خاتەم تەنیا بۆ گەلی عەرەب نێردراوە، چونكە قورئان بە زمانی عەرەبیی نێردراوەو هاتۆتە خوارو، خۆیشی بە زمانی عەرەبیی ئاخاوتوە ؟

دەڵێین: بەڵێ، بەڵام هەر دەبووایە بە زمانی یەكێك لە نەتەوەكان بێ، خوای كارزانیش زمانی عەرەبیی هەڵبژاردوەو ئەوەش زۆر حیكمەتی تێدان كە لە شوێنی خۆیدا خراونە ڕوو[1].

ئنجا خوا ﷻ لە دەیان ئایەت، لە سوورەتە مەككییەكاندا ڕاگەیاندوە، كە قورئان‌و موحەممەد، بۆ هەموو بەشەر نێرراون، بۆ وێنە:

أ ـ ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ﴿١٥٨﴾ ﴾الأعراف، واتە: بڵێ: ئەی خەڵكینە! من ڕەوانەكراوی خوام بۆ نێوە بۆ هەمووتان .

---

١) لە كتێبی: (سۆزی نەتەوایەتیی)دا، لەو بارەوە دواوین، بڕوانە : چاپی چوارەم/ ٢٠١٨ز.

ب ـ هەروەها لە سوورەتی (سبا)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾، واتە: تۆمان نەناردوە، مەگەر بۆ تێکڕای خەڵکی مـوژدەدەرو ترسێنەر بی، بەلام زۆربەی خەڵکی نازانن .

ج ـ لە سوورەتی (التکویر)دا دەفەرموێ : ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾، واتە: ئەم قورئانە تەنیا بیرخەرەوەیە بۆ هەموو جیهانییان .

کەواتە: خوا ﷻ زۆر بە ڕوونیی ڕایگەیاندوە، کە: بەڵێ، قورئان بە زمانی عەرەبییەو، پێغەمبەریش ﷺ لە نێو گەلی عەرەب دا بووە، بەڵام هەم قورئانیش و، هەم پێغەمبەری خواش (محمد ﷺ) بۆ تێکڕای بەشەر نێردراون، وەك خوا دەربارەی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾الأنبياء، واتە: تۆمان تەنیا وەك بەزەیی بۆ جیهانییان ناردوە .

سێیەم: هەروەها لەو ئایەتە وەردەگیرێ کە تەرجەمەکردنی قورئان بۆ هەموو زمانەکانی دنیا، فەرزە، بگرە تەفسیرو ڕوونکردنەوەی مەبەستەکانی قورئانیش، هەر فەرزە، چونکە خوا ﷻ مادام قورئانی بۆ هەموو بەشەر ناردوەو، پێغەمبەریشی ﷺ بۆ هەموو بەشەرو تێکڕای مرۆڤایەتیی ناردوە، بە جیاوازیی ڕەنگ و زمانەکان، کەواتە: لەسەر مسوڵمانان فەرزە، قورئان بۆ هەموو زمانەکان تەرجەمە بکەن، بۆ ئەوەی هەموو ئەو خەڵکەی کە پێغەمبەری خاتەم بۆیان نێردراوە، بە زمانی خۆیان هیدایەت و بەرنامەی خوایان بکەوێتە بەرچاو، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِۦ ﴾، ئنجا چونکە ئەو کۆمەڵگاو خەڵکانەش، کە پێغەمبەری خاتەمیان بۆ نێردراوە، هەموو نەتەوەکانن، بە هەموو زمانەکانەوە کەواتە: فەرزە لەسەر مسوڵمانان، کە قورئان بۆ هەموو

زمانەکان وەرگێڕن، نەك تەنیا ڕاستە مانایەکەی، بەڵکو شیکردنەوەو ڕوونکردنەوەی مانــاو مەبەستەکانیشی، واتە: تەفسیرکردنی قورئانیش فەرزە بۆ هەموو زمانەکان، چونکە خوا ﷻ پێغەمبەرانی ناردون بۆ لای خەڵکەکانی خۆیان، تاکو بە زمانی خۆیان بۆیان ڕوون بکەنەوە ئنجا دیارە ئەگەر گەلی کورد زمانەکەی کوردییەو، گەلی فارس زمانەکەی فارسییەو، گەلی ئینگلیز زمانەکەی ئینگلیزییەو، گەلی فەرەنسی زمانەکەی فەرەنسییەو ... هتد، کەواتە: لەسەر مسوڵمانان فەرزە بۆ هەموو نەتەوەکان بە زمانەکانی خۆیان قورئانیان بۆ ڕوون بکەنەوە، تاکو ئەوەی کە خوا ﷻ ویستوویەتی، بێتەدی .

**بڕگەی دووەم :** - ﴿ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِي مَن يَشَآءُ ﴾، سەرەنجام خوا هەر کەسێکی بوێ، گومڕای دەکاتو، هەر کەسێکیشی بوێ، دەیخاتە سەر ڕاستە ڕێ، ئەمەش بە پێی یاسای خوا لە ژیانی بەشەردا، کە هەر کەسێك خۆی وا لێ بکات شایستەیی ئەوەی هەبێ، خوا گومڕای بکات، خوا گومڕای دەکاتو، یاسای خوای بەسەردا دەچەسپێ، وەك چۆن کەسێك لە شوێنێك بێ، کە میکرۆبی تێدابێ، یان خواردنێك بخوات، یان خۆی بداتە بەر سەرماو گەرما بە پێی قانوونی خواو بە ویستی خوا، نەخۆش دەکەوێ، لە ئەنجامی ئەوەدا کە خۆی وایکردوە، نەخۆش بکەوێ .

هەروەها کەسێکیش کە وەرزش بکاتو، خواردنی چاكو پاك بخواتو، ئاگای لە جەستەی خۆی بێو، بیپارێزێ، ئەویش دیارە ساغ دەبێو، بە پێی ویستی خوا ساغ بووە، بەڵام بە پێی یاسای خوا، چونکە خۆی ئەو هۆکارانەی کە تەندروستییان لەسەر بەندە، هێناونیە دی .

**بڕگەی سێیەم :** - ﴿ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾، خوا زاڵی کارزانە، خوا باڵادەستەو زاڵەو، لێزانو کارزانە، کارەکانی لە جێی خۆیان دان .

**مەسەلەی سێیەم** : ئامـاژە بـەو ڕاستییـە : کـە مووساش ﷺ هـەر بـە مەبەسـتی دەرباز کردنـی گـەلەکـەی لـە تـاریکـاییـەکـان بـەرەو ڕووناکیـی، نێردرابووو، بـۆ ئـەوەش کـە چاکـەکـانی خـوایـان بخـاتـەوە یـادو، مووساش ﷺ هـەر وایکـردوە :

خوا فەرموویەتی : ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَذَكِّرْهُم بِأَيَّامِ اللَّهِ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٥﴾ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ أَنجَاكُم مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ ۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَاءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٦﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئـەم دوو ئـایـەتە موبـارەکـە ، لـە ئـۆ بـڕگـەدا :**

**بـڕگـەی یەکـەم** : - ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا ﴾، بـە دڵنیاییـەوە مووسامـان بـە نیشانـەکـانی خـۆمـانـەوە نـارد.

وشـەی (آيات) : هـەم ڕسـتـەکـانی بـەرنـامـەکـانی خـوا، بـە ئـایـەت نـاونراون، هـەم مـوعجیزەو بـەڵگـەکـانی کـە بـە پێغـەمبـەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) دراون، بـەڵکو دیـاردە سروشتییـەکانیش، بـە ئـایـەت نـاوزەندکراون، بـەڵام ئـەم واتایـەی سێیـەم لێـرەدا لـەگـەڵ ئـەم سیـاقەدا نـاگونجـێ، چونکـە مووسـا ﷺ دیـاردە سروشتییـەکـانی لـەگـەڵ خـۆی دا نـەهێنـا بوون .

خـوا عـز و جـل لـە سـوورەتـی (الإسـراء)دا دەربـارەی ئـایـەتـەکـانی مووسا، کـە ئـایـا چـەند بـوون؟ دەفـەرموێ : ﴿ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ ﴿١٠١﴾ ﴾، هـەروەهـا لـە سـوورەتـی (النمـل)یشـدا دەفـەرموێ: ﴿ فِي تِسْعِ آيَاتٍ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ

وَقَوۡمِهِۦٓ ﴿١٢﴾، ئنجا ئێمە لە سوورەتی (الأعراف)دا، بە تەفصیلی باسی ئەو نۆ (٩) نیشانەیەمان کردوە، کە بەمجۆرە بوون :

١و٢ : دووانیان : گۆچانەکەی‌و، دەستی ﴿ وَأَلۡقِ عَصَاكَ ... ﴿١٠﴾ ﴾ ﴿ وَأَدۡخِلۡ يَدَكَ فِي جَيۡبِكَ ... ﴿١٢﴾ ﴾ النمل .

٣و٤ : دووانیشیان : وشکە ساڵیی‌و، بێ دەرامەتیی‌و بێ بەروبوومیی ﴿ وَلَقَدۡ أَخَذۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ ... ﴿١٣٠﴾ ﴾ الأعراف .

٥و٦و٧و٨و٩: پێنجیشیان: لافاوو کوللەو ئەسپێ‌و بۆق‌و خوێن، کە خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الأعراف) دا باسی کردوون: ﴿ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلۡجَرَادَ وَٱلۡقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ءَايَٰتٖ مُّفَصَّلَٰتٖ ﴿١٣٣﴾ ﴾.

**بڕگەی دووەم :** - ئنجا ئایا خوا مووسا عليه السلام ی بۆچی نارد؟ ﴿ أَنۡ أَخۡرِجۡ قَوۡمَكَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ﴾، پێمان فەرموو: خەڵکەکەت لە تاریکاییان بەرەو ڕووناکیی، دەربێنە.

دیارە بەنو ئیسرائیل لە زۆر جۆرە تاریکیی دیکەش دابوون، کە گەلانی دیکە ڕەنگە لەو تاریکاییانەدا نەبووبن :

أ) لە تاریکایی سۆغرەو بێگار دابوون .

ب) لە تاریکایی ئەوەدا بوون، کە نێرینەکانیان سەر دەبڕدران‌و، مێینەکانیان دەهێڵرانەوە .

ج) لە تاریکایی ئەوە دابوون، کە وەك کۆیلە تەماشا دەکران .

لە هەموو ئەم تاریکاییانە، دەریانبێنە بەرەو ڕووناکیی، ڕووناکیی ئازادیی‌و سەربەستیی بەندایەتیی بۆ خوا .

**بڕگەی سێیەم :** - ﴿وَذَكِّرْهُم بِأَيَّىٰمِ ٱللَّهِ﴾، ڕۆژەکانی خوایان بخەوە یاد، وەك پێشتر باسمان کرد: (أيامِ الله) واتە: ئەو ڕۆژانەی کە دەسەڵاتی خوایان تێدا دەرکەوتووە بۆ سزادانی دوژمنەکانتان، کە فیرعەون و دارو دەستەکەی بوون، دەسەڵاتی خواو چاکەو بەزەیی خوایان تێدا دەرکەوت، بۆ هاوکاریی و پشتگیریی ئێوەو دەربازکردنتان.

**بڕگەی چوارەم :** - ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَىٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾، واتە: بێگومان لەوەدا کە باسکرا، نیشانەی زۆر هەن بۆ هەر خۆڕاگرێکی سوپاسگوزار، ﴿صَبَّارٍ﴾، صیغەی موبالەغەی (صابر)ە، (صابر)یش یانی: خۆڕاگر، ﴿صَبَّارٍ﴾، زۆر خۆڕاگر، ﴿شَكُورٍ﴾ صیغەی موبالەغەی (شاكر)ە، (شاكر) واتە: سوپاسگوزار، بەڵام ﴿شَكُورٍ﴾، واتە: زۆر سوپاسگوزار .

کەواتە: کەسێك لەسەر ناڕەحەتییەکان زۆر خۆڕاگربێ و، زۆریش سوپاسگوزار بێ، لە بەرانبەر چاکەو نیعمەتەکانی خوادا، ئەوە باشتر پەند وەردەگرێ و، باشتر نیشانەکانی خوا دەرك دەکات و دەیکەونە بەرچاو .

**بڕگەی پێنجەم :** - ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ﴾ یاد بکەوە ! کاتێك کە مووسا بە گەلەکەی خۆی گوت: چاکەی خوا بەسەر خۆتانەوە یاد بکەنەوە، چاکەی خوا ببینن، ئنجا دوایی بەشێك لەو چاکانەی خوایان بۆ ڕوون دەکاتەوە، دەفەرموێ :

**بڕگەی شەشەم :** - ﴿إِذْ أَنجَىٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ﴾، کاتێك کە لە دارودەستەی فیرعەون دەربازی کردن، ﴿آل﴾ واتە: (أتْبَاع) (آل فرعون) ئەوانەی شوێنکەتووی فیرعەون بوون، لەگەڵ فیرعەون دا بوون، دارودەستەی بوون .

**بڕگەی حەوتەم :** - ﴿يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ﴾، سزای خراپیان پێ دەچێژتن، واتە: هەمیشە لەوە دەخەفتان سزاتان پێ بچێژن، وەك چۆن کەسێك مەڕێك یان ئاژەڵێك دەبات بۆ دەشت و کێو بیلەوەڕێنێ، ئنجا

دەخەفتێ: گوێ لەوەڕی باشتری لێیە، لەوێ بیلەوەڕێنێ، فیرعەونو دارودەستەكەشی، لێتان دەخەفتان: ■ سزایەك خراپترە ئەوەتان بۆ بدۆزنەوەو ئێوەی پێ سزا بدەنو، بە ئێوەی بچێژن .

**برگەی هەشتەم :** - ﴿ وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ﴾، نێرینەكانتانیان سەردەبڕینو، ئافرەتەكانیشتانیان دەهێشتنەوە (لە ژیاندا دەیانهێڵانەوە) .

لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ يُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ ﴿٤٩﴾ ﴾، واتە: (و)ی لەگەڵ نەهێناوە، هەروەها لە سوورەتی (الأعراف)یشدا كە دەفەرموێ :

﴿ ... يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يُقَتِّلُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ... ﴿١٤١﴾ ﴾

دوایی ئەو سزا خراپە، بەوە تەفسیر دەكات كە: نێرینەكانیان دەكوشتنو مێینەكانیان دەهێشتنەوە .

بەڵام لێرەدا كە (و)ی هێناوە، یانی : خراپە پێ چێژتنەكە بە جیا دادەنێ، دوایش ئەوە كە نێرینەكانیان سەربڕیونو ئافرەتەكانیشیان هێشتوونەوە، ئەوەش بە دوو جۆرە بەلای دیكەو، بە دوو جۆرە سزای دیكە دادەنێ، كە لەلایەن فیرعەونەوە، ئەو سزایانە ئەنجام دەدران .

**برگەی نۆیەم :** - ﴿ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴾، لەوەدا تاقیكردنەوەیەكی مەزن هەبوو، لە پەروەردگارتانەوە بۆ ئێوە .

پێشتریش باسمان كرد كە: (بَلاء) لێرەدا كە دەفەرموێ: ﴿ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٌ ﴾، دەگونجێ بگوترێ: (وَفِي ذلِكُمُ الإنجَاء)، ئا لەو دەربازكردنەی ئێوەدا، لەو ڕزگاركردنو قوتاركردنەی ئێوەدا، بەڵایەكی مەزن لە پەروەردگاتانەوە هەبوو، (بَلاء) لە زمانی عەرەبییدا، دەگونجێ مانای نیعمەتو چاكە بێ، یانی: چاكەیەكی مەزنی خوای بەخشەر بۆ ئێوە، هەبوو، واتە: تاقیكردنەوەیەكی مەزنی پەروەردگار بە باری ئیجابیو چاكەدا هەبوو بۆ ئێوە .

یاخود: لەو سزاو ئازارەدا کە فیرعەون و داروودەستەکەی بە ئێوەیان دەچێژت، بەڵاو موصیبەت و ناخۆشییەکی مەزن هەبوو بۆ ئێوە، چونکە وشەی (بَلاء) هەم بە مانای بەڵا دێ، هەم بە مانای نیعمەتیش دێ، لە ئەسڵیشدا بە مانای تاقیکردنەوە هاتوە .

**مەسەلەی چوارەم** : ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە خوای پەروەردگار ﷻ بە سوپاسگوزاریی، چاکان زیاد دەکات و، بە ناسوپاسیی، لایان دەبات :

خـــوا دەفـــەرموێ : ﴿ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ ﴿٧﴾ ﴾ .

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە ، لە سێ بڕگەدا :**

**بڕگەی یەکەم :-** ﴿ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ ﴾، یاد بکەوە! کاتێك پەروەردگارتان ڕایگەیاند، ئیعلامی کرد، ئاشکرای کرد، دەگوترێ: (آذَنَ) واتە: ڕایگەیاند، ﴿ تَأَذَّنَ ﴾، یانی : زۆر بە تۆخیی ڕایگەیاند، وەك پێشتر گوتمان: (أوْعَدَ) واتە: هەڕەشەی کرد، (تَوَعَّدَ) واتە: هەڕەشەیەکی سەختی کرد، هەروەها (أفْضَلَ) یانی: بەخشی، (تَفَضَّلَ) واتە: زۆری بەخشی، ﴿ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ ﴾ کاتێك پەروەردگارتان زۆر بە تۆخیی، زۆر بە جەختکردنەوە، ڕایگەیاند، چی ڕاگەیاند ؟

**بڕگەی دووەم :-** ﴿ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ﴾، ئەگەر سوپاسگوزاریی بکەن، بۆتان زیاد دەکەم، واتە: ئەو چاکانەی کە پێتان دەبەخشم، ئەگەر لە بەرانبەریاندا سوپاسگوزاریی بکەن و شوکرانە بکەن، ئەو چاکانەتان بۆ زیاد دەکەم .

زانایان لەبارەی (ل)ی سەر: ﴿لَئِن شَكَرْتُمْ﴾ەوە، دەڵێن: (اللامُ موطئةٌ لِلقَسَمِ وَالقَسَمُ لِلتّأكيد)، واتە: لام زەمینە خۆشکەرە بۆ سوێند، سوێند نیە بەڵام ڕێی بۆ خۆش دەکات، سوێندیش بۆ جەختکردنەوەیە .

هەندێکی دیکە گوتوویانە: (ل) هەر بە مانای سوێندە، واتە: سوێند بە خوا، ئەگەر سوپاسگوزاریی بکەن، بۆتان زیاد دەکەم .

ئایا ئەم قسەیە قسەی مووسایە ﷺ بەرانبەر گەلەکەی؟ وابێدەچێ، چونکە هەر لەو سیاقەدا هاتووە یانی: ئەگەر لە بەرانبەر چاکەکانی خوادا، کە لەگەڵی کردوون، سوپاسگوزار بن، خوا لەو چاکانە بۆتان زیاد دەکات، واتە: هەر لە جۆری خۆیان، بۆتان زیاد دەکات، یان لە جۆری دیکە، لە چاکەکانی خۆی، بۆتان زیاد دەکات .

ئەگەریشی هەیە کە ئەوە قسەی خوای پەروەردگار بێت، ئاواخنی کرد بێت لەگەڵ قسەکانی مووسا ﷺ کە لەگەڵ گەلەکەیدا کردوونی، هەرچۆنێکی بێ، ئەمە یاسایەکی خوییە، لە ژیانی بەشەردا، ڕاگەیەنراوە .

بۆیە زانایان لێرەدا یاسایەکیان هەڵێنجاوە دەڵێن: (الشُّكرُ سِياجُ النِّعَم)، واتە: سوپاسگوزاریی پەرژینی چاکەکانە، ئەوان وایانگوتوە .

بەڵام من دەڵێم: (الشُّكرُ زائِدُ النِّعَم)، واتە: سوپاسگوزاریی مایەی زیادکردنی چاکەکانە، بەهۆی سوپاسکردنی خواوە، چاکەکان زیاد دەبن، نەك هەر دەپارێزرێن، وەك پەرژینێك چۆن باخێك دەپارێزێ، بەڵکو زیادیشیان دەکاو گەشەیان پێدەدا .

## پێناسەی (شُکر) :

(شُکر) هەم بە دڵ دەکرێ، هەم بە زمان دەکرێ، هەم بە ئەندامەکان دەکرێ :

یەك : ئەو سوپاسکردنەی خوا، کە بە دڵ دەکرێ، بریتییە لەوە : کە چاکەکانی خوا، لە خوای بەخشەر بزانی، وەك خوا عز و جل دەفەرموێ: ﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ﴿٥٣﴾ ﴾النحل، واتە: هەر چاکەیەك لە نێوەدا هەیە، لە خواوەیە، (أَن تُرجِعَ النِّعَمَ إلى المُنْعِم)، واتە: چاکەکان بۆ چاکەکار بگێڕیەوە، کە خوایە ﷻ.

دوو : ئەو سوپاسەی کە بە زمان دەکرێ، بریتییە لەوە: کە تۆ دان بەو چاکانەی خوادا بێنیو بیانسەلمێنی، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴿١١﴾ ﴾الضحى، واتە: ئنجا باسی چاکەکانی پەروەردگارت بکە .

سێ : سوپاسکردنی ئەندامەکانیش، بریتییە لەوە: کە تۆ بە کردەوەو بە ئەندامەکانی جەستە، ئەو چاکانە لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاربێنی، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ ٱعْمَلُوٓاْ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا ﴿١٣﴾ ﴾سبأ، واتە: ئەی ئالی داوود! ئەی بنەماڵەی داوود! ئەی نیزیکانی داوود! سوپاسکردن ئەنجام بدەن، ﴿ ٱعْمَلُوٓاْ ﴾، کەواتە: (شکر)، دەکرێ، نەك تەنیا بگوترێ .

بەڵێ بەو جۆرە سوپاسگوزاریی کردن، دەبێتە هۆی زیادبوونی چاکەکانی خوا، بۆیەش ئەوەم ڕوون کردەوەو لە زۆر جێی دیکەش ڕوونم کردۆتەوە، تاکو هیچ کەسێك وا نەزانێ، کە هەر بڵێی: سوپاس بۆ خوا (الشُکرُ لله)، پێت وابێ یەکسەر خوا بەوە چاکەکان زیاد دەکات، نا، چونکە خوا نەیفەرمووە: (لَئِن حَمَدتُم لأَزِيدَنَّكُم)، کە (حَمد) بریتییە لە: ستایشکردنی خوا بە دڵو بە زمان، بەڵام (شُکر) وێڕای ستایشکردنی خواو، وێڕای ئەوەی تۆ نیعمەتەکانی خوا

دەگێڕیەوە بۆ خوا، بە دڵو بە زمان، دەبێ بە كردەوەش نیعمەتەكانی خوا، لە ڕەزامەندیی خوادا بەكاربێنێ .

ئنجا ئەوە قانوونی خوایە، كەسێك خوا زانیاریی پێبداتو، زانیارییەكە لە نێو خەڵك بڵاوبكاتەوەو، كاری پێ بكات، زانیارییەكە زیاد دەكات، هەروەها كەسێك خوا ماڵو سامانی پێبدات، ماڵو سامانەكە ببەخشێو ڕەنێوی بێنێو بەكاری بێنێ، زیاد دەكات، ئیسان خوا عەقڵو دانایی بە كەسێك بدات، عەقڵەكەی بەكاربێنێ، بێگومان زیاد دەكات، هەروەها هەموو نیعمەتو چاكەكانی خوا، لە ڕەزامەندیی خوادا بەكاریان بێنێ، بە پێز دەبن بەرهەمدار دەبنو بەرەكەتیان دەكەوێتێ .

<u>برگەی سێیەم :</u> - ﴿ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ ﴾، واتە: بەڵام ئەگەر ناسوپاس بن، بێگومان سزای من سەختە، لێرەدا كە دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِن كَفَرْتُمْ ﴾، وشەی (كُفْر) وێڕای ناسوپاسیی، دەشگونجێ بە مانای بێبڕوایيو كوفركردن بێ، بەڵام لێرەدا بە مانای ناسوپاسییو سپڵەیی دێ، چونكە لە بەرانبەر: ﴿ لَئِن شَكَرْتُمْ ﴾ دایە، پێچەوانەی سوپاسگوزاریی (شُكر)یش بریتیە لە (كُفران) ناسوپاسییو سپڵەیی، بەڵام پێچەوانەی بێ بڕوایی (كُفر) بریتیە لە بڕواداریی (إیمان) .

ئنجا كاتێك خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ ﴾، واتە: لە جیاتی ئەوەی خوا ﷻ بفەرموێ: بە سەختیی سزاتان دەدەم، فەرموویەتی: هەمووتان ئاگاداربن ! كە سزای من سەختە، بۆیە وایفەرمووە: ئەگەر فەرموویای: بە سەختیی سزاتان دەدەم، تەنیا سزادانی دەگەیاند، بەڵام كە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ ﴾ ئەمە هەم لابردنی چاكەو نیعمەتەكە دەگرێتەوە، هەم سزادانی ئەو خاوەن نیعمەتەش دەگرێتەوە، كە سوپاسی خوای لەسەر نەكردوە .

لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، کە دەفەرموێ: {أَحِبُّوا اللهَ لِمَا يَغْذُوكُمْ مِنْ نِعَمِهِ} (أخرجه الترمذي برقم: (٣٧٨٩)، وقال: حسن غريب، والطبراني برقم: (١٠٦٦٤)، والحاكم برقم: (٤٧١٦)، وقال هذا حديث صحيح الإسناد ولم يخرجاه، تعليق الذهبي في التلخيص: صحيح)، واتە: خواتان خۆشبوێ، لەبەرئەوەی لە چاکەکانی خۆی دەرخواردی ئێوەی دەداو، بە ئێوەیان دەچێژێ .

**مەسەلەی پێنجەمو کۆتایی : ڕاگەیاندنی مووسا ﷺ: بۆ بێنیازیی خوا لە هەموو کەس :**

خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِن تَكْفُرُوٓاْ أَنتُمْ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ ﴿٨﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە ، لە [redacted] برگەدا :**

**برگەی یەکەم :-** ﴿ وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِن تَكْفُرُوٓاْ أَنتُمْ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ﴾، مووسا گوتی: ئەگەر ئێوەو هەرچی لە زەمیندا هەیە، تێکڕاتان ناسوپاسگوزاربن (یان بێبڕوا بن)، ﴿ تَكْفُرُوٓاْ ﴾، دەگونجێ بە مانای ناسوپاسگوزاریی بێ، دەشگونجێ بە مانای بێبڕوایی بێ، واشپێدەچێ زیاتر مەبەست مانای یەکەم بێ، واتە: ئەگەر ئێوەو هەرچی خەڵکی سەر زەوییە، ناسوپاسگوزارو پێنەزانو بێ ئەمەگ بنو، کوفرانی چاکەکانی خوا بکەن .

**برگەی دووەم :-** ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ ﴾، بێگومان خوا بێنیازی ستایشکراوە، بێنیازو دەوڵەمەندە، خەڵك ئیمانی پێ بێنێ، یان پێ نەهێنێ، یان خەڵك سوپاسی بکات، یان نەیکات، خوا یەکی پێ ناکەوێ، بۆخۆی هەم بێنیازەو هەم ستایشکراوە، ئەگەر ئێوەش ستایشی نەکەنو، چاکەکانی نادیدە بگرنو، بێوەفاو بێ ئەمەگ بن، یاخود ئەگەر ئێوەش بێبڕوا بن، ئەوە خوا لە خودی

خۆیدا، شایستەی ئەوەیە کە ئیمانی پێ بهێنرێ‌و، شایستەی ئەوەیە کە ستایش بکرێ‌و، شایستەی ئەوەیە کە مەدح‌و سەنا بکرێ .

حیکمەتی ئەم تەعبیرەش وەك زانایان گوتوویانە: ئەوەیە کە بێبڕوایان پێیان وابووە: ئەگەر بێت‌و ئیمان بە خوا بێنن، یاخود بۆ خوا سوپاسگوزاریی ئەنجام بدەن، ئەوە چاکەیەکە لەگەڵ خوادا دەیکەن، بۆیە خوا ﷻ لەسەر زمانی مووسا ﷺ ئەو ڕاستییەی پێ ڕاگەیاندوون، کە ئەخێر خوا بێنیازەو شایستەی هەموو سوپاسکرانێك‌و، شایستەی هەموو ڕێزو تەقدیر بەرانبەر نواندێکە، ئنجا ئەگەر ئێوە وابن، یان وا نەبن، بەڵام کەسێك کە چاکە دەکات‌و، لە بەرانبەر چاکەی خوادا، ئەهلی شوکرو سوپاس دەبێ‌و، لە بەرانبەر خوادا، ئەهلی ئیمان دەبێ، ئەوە بۆخۆی قازانج دەکات، ئەوەی کە بە پێچەوانەشەوەیە: هەر بۆخۆی زەرەر دەکات، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ مَّنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا فَلِنَفۡسِهِۦۖ وَمَنۡ أَسَآءَ فَعَلَيۡهَاۗ ﴿٤٦﴾ ﴾فصلت، واتە: هەر کەسێك چاکە بکات، سوودەکەی بۆ خۆیەتی‌و هەر کەسێك خراپە بکات، زیانەکەی بۆ خۆیەتی .

کۆتایی ئەم دەرسەمان بەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دێنین، کە فەرموودەیەکی قودسییە، واتە: خوا ﷻ فەرموویەتی، بەڵام پێغەمبەر لە خوای پەروەردگارەوە دەیگێڕێتەوە، یانی: بە شێوازی خۆی دایدەڕێژێ، بەڵام مانایەکەی لە خواوەیە، خوا دەفەرموێ :

{يـا عِبَـادِي! إنِّـي حَرَّمْـتُ الظُّلْـمَ عَلَـى نَفْسِـي وَجَعَلْتُـهُ بيْـنَكم مُحَرَّمـا، فَـلاَ تَظَالَمُوا، يا عِبَـادِي! كُلُّكُمْ ضَالٌّ إلاّ مَنْ هَدَيْتُـهُ، فَاستَهدُونِي أَهْدِكُمْ .

يا عِبَادِي! كُلُّكُمْ جَائِعٌ إلاّ مَنْ أَطْعَمْتُهُ فَاستَطعِمُونِي أُطْعِمْكُمْ .

يا عِبادِي! كُلُّكُمْ عَارٍ إلاّ مَنْ كَسوتُهُ، فاسْتَكْسُونِي أَكْسُكُمْ .

يـا عِبَـادِي! إنَّكُـمْ تُخْطِئُـونَ باللَّيـلِ وَالنَّهـارِ، وَأَنـا أغْفِـرُ الذُّنـوبَ جَمِيعـاً، فَاسْتَغْفِرُونِي أَغْفِرْ لَكُمْ .

يا عِبَادِي! إنَّكُمْ لَـنْ تَبْلُغـوا ضُرِّي فَتَضُرُّونِي، وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفعِي فَتَنْفَعُونِي .

يـا عِبَـادِي! لَـوْ أنَّ أوَّلَكُمْ وَآخِـرَكُـمْ وَإنْسَـكُمْ وَجِنَّكُمْ، كَانُـوا عَلَـى أتْقَـى قَلْبِ رَجُـلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ، مـا زَادَ ذلِكَ فـي مُلْكِي شَيْئًا .

يـا عِبَـادِي! لَـوْ أنَّ أوَّلَكُـمْ وَآخِـرَكُـمْ وَإنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، كَـانُـوا عَلَـى أفْجَـرِ قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ، مـا نَقَصَ ذلِكَ من مُلْكِي شَيْئًا .

يـا عِبَـادِي! لَوْ أنَّ أوَّلَكُمْ وَآخِـرَكُـمْ وَإنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ ، قَامُوا فـي صَعِيدٍ وَاحِدٍ فَسَـألُونِي، فَأعْطَيْتُ كُلَّ إنْسَانٍ مَسْألَتَهُ، مـا نَقَصَ ذلِكَ مِمـا عِنْدِي، إلاَّ كَمـا يَنْقُصُ الـمِخْيَطُ إذَا أُدْخِلَ الْبَحْرَ .

يـا عِبَـادِي! إنَّمـا هِيَ أعْمَـالُكُمْ أُحْصِيهـا لَكُمْ ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إيـاهـا، فَمَنْ وَجَدَ خَيْراً فَلْيَحْمَدِ اللّه، وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذلِكَ، فَلا يَلُومَنَّ إلاَّ نَفْسَهُ} . {أخْـرَجَـهُ مُسْلِمٌ بـرقم: (٢٥٧٧)، وَابْـن حِبَّـانَ بـرقم: (٦١٩)، وَالحَـاكِمُ بـرقم: (٧٦٠٦)، وَقَـالَ: صَحِيح عَلَـى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ} .

واتـە: ئـەی بـەندەكـانم ! مـن سـتـەمم لـەسـەر خۆم قەدەغـە كـردوە، لـە نێـو ئێوەشـدا قەدەغـەم كـردوە، سـتـەم لـە يـەكدی مەكـەن .

ئـەی بـەندەكـانم ! هـەر كـامێك لـە ئێوە گـومڕايـە، مەگـەر ئـەوەی مـن بيخـەمـە سـەر ڕێـی ڕاسـت، دەجا داوای خسـتنـە سـەر ڕێـی ڕاسـتم لـێ بكـەن، بـۆ ئـەوەی بتـانخـەمە سـەر ڕێـی ڕاسـت .

ئـەی بـەندەكـانم ! هـەر كـامێك لـە ئێوە برسـيـيە، مەگەر ئـەوەی مـن خـواردنی پـێ بـدەم، ئنجـا داوای خـواردنـم لـێ بكـەن، بـۆ ئـەوەی خـواردنتـان پـێ بـدەم .

ئـەی بـەندەكـانم ! هـەر كـامێك لـە ئێوە ڕووت و بێ پۆشـاك دەبێ، مەگەر ئەوەی مـن بيپۆشـم، ئنجـا داوای پۆشـاكم لـێ بكـەن، بـۆ ئـەوەی پۆشـاكتـان بكـەمە بـەر .

ئـەی بـەندەكـانم ! ئێوە بـە شـەوو ڕۆژ هـەڵـە دەكـەن و گـونـاهـان دەكـەن، منـيش هـەمـوو گـونـاهـان دەبـوورم، ئنجـا داوای لێبـوردنم لـێ بكـەن، بـۆ ئـەوەی لێتـان ببـوورم .

ئـەی بـەندەكـانم ! ئێـوە نـاتوانن بگەنـە ئـاسـتێك كـە زيـان لـە مـن بـدەن و، نـاشتوانن بگەنـە ئـاسـتێك كـە سوود بـە من بگەيـەنن.

ئەی بەندەکانم! ئەگەر ئەوانەی پێشێتانو ئەوانەی دواییتان، هەموو مرۆڤەکانو جندەکانتان ، بەپێی دڵی پارێزکارترین پیاو بن لە ئێوە، هیچ لە موڵکی من زیاد ناکات .

ئەی بەندەکانم ! ئەگەر ئەوانەی پێشێتانو ئەوانەی دواییتان مرۆڤەکانتانو جندەکانتان، هەمووتان بە پێی دڵی تاوانبارترین پیاو بن، ئەوە هیچ لە موڵکی من کەم ناکات.

ئەی بەندەکانم ! ئەگەر ئەوانەی پێشێتانو ئەوانەی دواییتان، مرۆڤەکانتانو جندەکانتان ، هەموویان لە شوێنێك ڕابوەستنو هەموویان داوام لێ بکەنو، هەر کامێك لە ئێوە داوایەکەی بۆ جێبەجێ بکەم، ئەوە لەوەی کە لە لامە هیچ کەم ناکات، مەگەر ئەو ئەندازەیە کە دەرزییەك دەخرێتە نێو ئاوی دەریاوە چەندی لێ کەم دەکات، داواکانی ئێوەش، لەوەی کە لە لای منەو لە موڵکی منە، هەر ئەوەندەی لێ کەم دەکات .

ئەی بەندەکانم ! تەنیا کردەوەکانی خۆتانن، بۆتان دەژمێرمو سەرژمێر دەکەمو، دوایی پاداشتتان دەدەمەوە، یان سزاتان دەدەم بە پێی کردەوەکانتان، ئنجا هەر کەسێك چاکەی بینی، با ستایشی خوا بکاتو، هەر کەسێك جیا لەوەشی بینی، (واتە: سزای بینی، خراپەی بینی) با جگە لە خۆی، لۆمەی کەس نەکات .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دووەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان ■ (١٠) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (٩ – ١٨)، لەم دە (١٠) ئایەتەدا خوای زاناو شارەزا، وتووێژێکی ئاوازەو تاکی نێوان سەرجەم پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) تێکڕای نەیاران و ناحەزان دەگێڕێتەوە، کە لە قورئاندا وێنەیەکی دیکەی نیە، نێوەرۆکی وتووێژەکەش بریتیە لە: باسی هاتنی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) بۆ لای گەلەکانیان، بە بەڵگە ڕوون و ئاشکراکانەوە، خستنە ڕووی پەیامی خۆیان کە نێوەرۆکەکەی بریتیە لە: خوا بە یەکگرتن و تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا کردن، خۆ پاراستن لە : هاوبەش بۆ خوا دانان، جگە لە خوا پەرستن .

هەروەها خستنە ڕووی :

هەڵوێستی نەرێنییانەی بێبڕوایان، هەڕەشەو گوڕەشەیان لە پێغەمبەران و (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)و بێ باکیی دەربڕینیان، سەرەنجام تەدەخولی خوا ﷻ، دەربازکردنی بڕواداران، فەوتاندنی زۆردارانی خۆسەپێن .

﴿ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا۟ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ ۛ وَٱلَّذِينَ مِنۢ
بَعْدِهِمْ ۛ لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ فَرَدُّوٓا۟ أَيْدِيَهُمْ فِىٓ أَفْوَٰهِهِمْ
وَقَالُوٓا۟ إِنَّا كَفَرْنَا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ وَإِنَّا لَفِى شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَنَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٩﴾ قَالَتْ
رُسُلُهُمْ أَفِى ٱللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ يَدْعُوكُمْ لِيَغْفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ
وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ قَالُوٓا۟ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا
عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأْتُونَا بِسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ إِن نَّحْنُ إِلَّا
بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ وَمَا كَانَ لَنَآ أَن نَّأْتِيَكُم
بِسُلْطَـٰنٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾ وَمَا لَنَآ أَلَّا نَتَوَكَّلَ
عَلَى ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنَا سُبُلَنَا ۚ وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيْتُمُونَا ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ
﴿١٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ۖ
فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٣﴾ وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۚ ذَٰلِكَ
لِمَنْ خَافَ مَقَامِى وَخَافَ وَعِيدِ ﴿١٤﴾ وَٱسْتَفْتَحُوا۟ وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿١٥﴾ مِّن
وَرَآئِهِۦ جَهَنَّمُ وَيُسْقَىٰ مِن مَّآءٍ صَدِيدٍ ﴿١٦﴾ يَتَجَرَّعُهُۥ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُۥ وَيَأْتِيهِ
ٱلْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ ۖ وَمِن وَرَآئِهِۦ عَذَابٌ غَلِيظٌ ﴿١٧﴾ مَّثَلُ
ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ ۖ أَعْمَـٰلُهُمْ كَرَمَادٍ ٱشْتَدَّتْ بِهِ ٱلرِّيحُ فِى يَوْمٍ عَاصِفٍ ۖ لَّا يَقْدِرُونَ
مِمَّا كَسَبُوا۟ عَلَىٰ شَىْءٍ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَـٰلُ ٱلْبَعِيدُ ﴿١٨﴾ ﴾

# مانای دەقاو دەقی ئایەتەكان

{ئایا هەواڵی ئەوانەی پێش خۆتانتان بۆ نەهاتوە: گەلی نووحو عادو سەموودو ئەوانەی دوای وانیش، كە جگە لە خوا نایانزانێ، پێغەمبەرانیان بە موعجیزان (بەڵگە ئاشكرایەكان)ەوە هاتنە لایان، كەچی ئەوان دەستیان بە زاریانەوە ناون، گوتیان: ئێمە بێبڕوایین بەوەی پێی نێردراونو، بە دڵنیایی ئێمە سەبارەت بەوەی ئێمەی بۆ بانگ دەكەن، لە دوو دڵییەكی خەست داین ﴿٩﴾ پێغەمبەرەكانیان گوتیان: ئایا دوو دڵیی لە (بوونو یەكتایی) خوای پەیداكەری ئاسمانەكانو زەویدا هەیە؟! بانگتان دەكات: تاكو لە گوناهەكانتان بتانبوورێو، بۆ كاتێكی دیاریكراو دواتان بخات (لە ژیاندا بتانهێڵێ)، (بێبڕوایەكان) گوتیان: ئێوەش بەس مرۆڤێكی وەك ئێمەن، دەتانەوێ لەو پەرستراوانەی بابو باپیرانمان دەیانپەرستن، لامان بدەن، دەجا (ئەگەر ڕاست دەكەن) بەڵگەیەكی ڕوونمان بۆ بێنن (لەسەر ڕاستیی ئەوەی دەیڵێن) ﴿١٠﴾ پێغەمبەرەكانیان پێیانگوتن: (ڕاستە) ئێمەش تەنیا بەشەری وەك ئێوەین، بەڵام خوا چاكە لەگەڵ هەر كام لە بەندەكانیدا دەكا، كە بیەوێ (بیكاتە ڕەوانەكراو)، بەبێ مۆڵەتی خواش، ناتوانین هیچ بەڵگەیەكتان بۆ بێنین (جگە لەوەی پێمانەو، خوای كارزان بە كافی زانیوە)، بڕوادارانیش با تەنیا پشت بە خوا ببەستن ﴿١١﴾ ئنجا بۆچی پشت بە خوا نەبەستین ا لە حاڵێكدا كە ڕێبازەكانمانی (بۆ گەیاندنی پەیامەكەی) پێشانداوین، مسۆگەریش هەرچەندە ئازارمان بدەن، خۆڕاگر دەبینو، پشت بەستووانیش با تەنیا پشت بە خوا ببەستن ﴿١٢﴾ ئەوانەی بێبڕواش بوون، بە پێغەمبەرەكانی خۆیانیان گوت: بە دڵنیایی لەسەر زەوی خۆمان وەدەرتاندەنێین، یان دەبێ بگەڕێنەوە نێو ئایینو ڕێبازەكەمان! پەروەردگاریشیان سروشی بۆ كردن (بۆ پێغەمبەران): مسۆگەر ستەمكاران دەفەوتێنین ﴿١٣﴾ هەروەها ئێوەش دوای وان، لەو سەر زەمینەدا (كە تێیدا چەوسێنرانەوە) نیشتەجێ دەكەین، ئەوەش

بۆ کەسێکە کە (تەنیا) لە پایەی من بترسێ‌و، لە هەڕەشەی من بترسێ ﴿١٤﴾ ئیدی سەرەنجام (پێغەمبەران) داوای یارمەتیی‌و سەرکەوتنیان (لە خوا) کرد، (خواش بە دەنگیانەوە هات)و، سەرەنجام هەر ملهوڕێکی نەسەلمێن، بێمرادو دەستخەڕۆ بوو ﴿١٥﴾ لە پشتیەوە دۆزەخ هەیەو لە ئاوێکی زووخاوی پێی دەخورێتەوە ﴿١٦﴾ بە زەحمەت دەیخواتەوەو نزیک نیە (بە سێنایی) لە گەرووی بچێتە خوار، لە هەموو شوێنێکیشەوە مردنی بۆ دێ، بەلام نامرێ‌و، لە پشتیەوەش ئازارێکی زەبەلاح هەیە ﴿١٧﴾ وێنەی کردەوەی ئەوانەی کە بە پەروەردگاریان بێبڕوان، وەک خۆڵەمێشێکە کە بایەکی بەهێز لێی بدات، لە ڕۆژێکی بە ڕەشەبادا، لەوەی کردوویانە (لە کاری باش) دەستیان بە هیچی ناگات، ئا ئەوەیە گومڕایی دوور ﴿١٨﴾ } .

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

( فَرَدُّوٓاْ أَيۡدِيَهُمۡ فِيٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ ): واتە: دەستیان بە زاریانەوە نان، ئەمە بە سێ جۆریان ئاوایان لێكداوەتەوە: (عَضّوا الأنامِل غَيْظاً، أو أومأوا إلى السكوت، أو ردُّوا أيديهم في أفْواهِ الأنْبياء فأسْكَتُوهُمْ)، واتە: پەنجەی خۆیانیان گەزی لە تووڕەییان، یاخود: ئاماژەیان بۆ كردن كە بێدەنگ بن، یاخود: دەستیان بە دەمی پێغەمبەرانەوە ناو بێدەنگیان كردن .

( مُرِيبٖ ): یانی: شتێك كە دەتخاتە نێو دوو دڵییەوە، (المُوقِعُ في الرَّيْبِ)، وشەی: (شَكٌّ مُرِيب) واتە: دوو دڵییەكی زۆر خەست، وەك دەگوترێ: (لَيْلٌ أَلْيَل) شەوێكی شەو، لە كوردەواریی خۆشماندا دەڵێن: (سارده ئەمما سارد)، (شِعْرٌ شَاعِر) واتە: شیعرێك، كە بە ڕاستیی شیعرە .

( فَاطِرِ ): (الفَطْرُ: الشَّقُّ طُولاً، وَفَطْرُ اللهِ الخَلْقَ: إيجَادُهُ إيَّاهُ) (فَطْر) بەوە دەگوترێ: كە شتێك بە باری درێژییدا لەت بكرێ، كە دەگوترێ: خوا دروستكراوەكانی (فطر) كردوون، واتە: پەیدای كردوونو هێناونیە دی.

( يَمُنُّ ): (مِنْ المِنَّة: الإحْسَانُ وَالإعَانة)، یانی: (يَمُنُّ) لە (مِنَّة)ەوەیە كە بریتییە لە چاكەكردنو هاوكاریی كردن، هەندێكی زمانی عەرەبیی هەیە دەڵێ: (المِنَّة: تَهْدِمُ الصَّنِيعَةَ ، وَتُوجِبُ القَطِيعَة) واتە: منەتكردن چاكەیەك كە كراوە دەیڕووخێنێو لە بەینی دەباتو، دەبێتە هۆی دابڕان لە نێوان چاكەكەرو چاكە لەگەڵكراودا .

( مِلَّتِنَا ): (المِلَّة: الطَّرِيقَةُ وَالدِّيْنُ وَالشَّرِيْعَة)، وشەی (مِلَّة) بە مانای: ڕێبازو بەرنامەو شەریعەت، دێ .

( مَقَامِي ): (المقَامُ: مَكانُ القِيام او مُطلَق الوُجُود، مَقَام)، (خاف مقامي) واتە: لە پایەی من، لە پێگەی من بترسێ، یاخود لە من بترسێ، (مقام) بە مانای بوونی ڕەها دێ .

( وَعِيدِ ): (وعيدي) واتە: لە هەڕەشەی من .

( وَٱسۡتَفۡتَحُواْ ): (الإستفتاحُ: طَلَبُ الفتح، وَهُوَ النَّصْر)، (إِسْتِفْتَاح) بریتیە لە داواكردنی فەتح، كە بریتیە لە داواكردنی هاوكاریی‌و یارمەتیی .

( وَخَابَ ): (الخَيْبة: فَوْتُ الطَّلَب) (خَيْبَة) بریتیە لەوە كە كەسێك ئەوەی داوای دەكات، لە دەستی بچێ‌و بێمراد بێ .

( جَبَّارٍ ): (المتعاظِمُ الشَّديد التكبُّر)، (جَبَّار) كەسێكە خۆی بە مەزن بگرێ‌و زۆر خۆی بە زل بگرێ .

( عَنِيدٍ ): (المُعَانِدُ للْحَق) (عنيد) واتە: نەسەلمێن، كەسێك كە دان بە هەقدا ناهێنێ .

( صَدِيدٍ ): (القَيْح) واتە: كێم‌و زووخاو .

( يَتَجَرَّعُهُۥ ): واتە: بە زەحمەت بۆی قووت دەچێ، (التَّجَرُّعُ: تَكَلُّفُ الجُرْعِ، وَالجُرْعُ: بَلْعُ الماءِ)، (جُرْع) ئەوەیە كە ئینسان ئاو قووت بدات، (تَجَرُّع) واتە بە زەحمەت قووتدانی ئاو .

( يُسِيغُهُۥ ): واتە: لە گەرووی دەچێتە خوار، (السوغُ: إِنْحِدَارُ الشَّرَابِ فِي الحَلْقِ بِدُونِ غُصَّةٍ)، (سوغ) بریتیە لەوە كە خواردنەوەیەك لە گەروو بچێتە خوار بەبێ ئەوەی كە لە گەروو بگیرێ، واتە: بە ئاسانیی لە گەروو بچێتە خوار .

( كَرَمَادٍ ): (الرَّماد: ما يَبْقَى مِنْ احتِرَاقِ الحَطَبِ وَالفَحْم)، واتە: خۆڵەمێش، کاتێك دارێــك، یــان خەڵووزێــك، دەسووتێنــرێ ئــەوەی کــە لــێی دەمێنێتــەوە، پێـی دەگوتــرێ : خۆڵەمێش .

( عَاصِفٍ ): واتە: با، بەلام لێرەدا (يَومٍ عاصفٍ) (أي: عَاصِفٍ رِيحُهُ) واتــە: ڕۆژێك کــە بایەکــەی زۆر بــەهێـــزە، وەك دەگوتــرێ: (يَوْمٌ مَـاطِرٌ، أي: سَحَابُهُ) واتــە: ڕۆژێك کە هەورەکەی بارانـاوییە .

## مانای گشتی ئایەتەکان

وەك پێشتر باسمان کرد: ئێرە تاکە شوێنێکە، ئەو جۆرە وتووێژەی نێوان سەرجەم پێغەمبەرانی لەگەڵ ئایەرەگانیاندا، تێدا هاتبێ، تاکە شوێنێکە لە قورئاندا بە پێی زانیاریی منو پێم وایە وێنەی نیە، بەڵێ، جاری دیکە هەیە، کە خوا ﷻ بەگشتی باسی پێغەمبەرانی کردوە، بەڵام ئاوا وتووێژو دیالۆگێك لە نێوان هەموو پێغەمبەراندا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)و ئایارەنەگانیاندا بێ، ئێرە تاکە شوێنێکە .

خوا ﷻ هەر لە درێژەی ئەو باسو خواسانەدا، کە باسی ئامانجی ئێردرانی کتێبەکانی خواو، ئامانجی ڕەوانەکرانی پێغەمبەرانی خوا ﷺ دەکات، کە لە نێویاندا باسی مووسا (عَلَيْهِ السَّلَام) کرا، کە بۆ دەرباز کردنی بەنو ئیسرائیل هات لە تاریکاییەکان، بەرەو ڕۆشنایی، لە درێژەی ئەوەدا دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا۟ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ ﴾، ئایا هەواڵی ئەوانەی پێش خۆتانتان پێ نەگەیشتوە؟ ئنجا ئەوانەی پێش خۆمان کێن؟! کە دیارە ئەم تەعبیرە ئێمە دەگرێتەوە، کە ئێستا قورئان لەبەردەستی ئێمە دایە، سەردەمی پێغەمبەری ﷺ گرتۆتەوە، دوای ئەویش تاکو ئێستاو دوای ئێمەش، تاکو دنیا بە کۆتا دەگات، ئایا هەواڵی ئەوانەی پێش خۆتانتان پێ نەگەیشتوە !

﴿ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ ﴾، گەلی نووحو عادو سەموود، ئەم سێ گەلە، واتە : (گەلی نووحو گەلی عادو گەلی سەموود)، گەلی نووح، نووحیان ﷺ بۆ هاتو، گەلی عاد هوودیان ﷺ بۆ ڕەوانەکراو، گەلی سەموودیش، صالحیان ﷺ بۆ ڕەوانەکرا، نوحو هوودو صالح، لە قورئاندا لە زۆر جێیان پێکەوە هاتوونو، ئەو گەلانە، هەرسێکیان لە پێش ئیبراهیم دا ﷺ هاتوون، ﴿ وَٱلَّذِينَ مِنۢ

بَعۡدِهِمۡ ﴾، ئەوانە دوای وانیش، ئایا هەواڵی دوای ئەوانیشتان پێ نەگەیشتوە؟ ﴿ لَا يَعۡلَمُهُمۡ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾، بێجگە لە خوا کەس نایانزانێ، کەس نایانزانێ واتە: بەوردیی، بە هەواڵی ڕاستو دروست، کەس نایانزانێ، ئەگەر نا زانیاریی پچڕ پچڕ، کەمو زۆر هەر هەبووە لە نێوان خەڵکدا، دەربارەی پێغەمبەران (عَلَيۡهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)و ئەو گەلانەی کە پێغەمبەرانیان بۆ نێردراونو، سەرەنجام ئەو گەلانە فەوتێنراون، بەهۆی ئەوەوە کە سەرپێچییان کردوە لە فەرمانی خواو پێغەمبەرانی خوا (عَلَيۡهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) .

ئنجا خوا بەسەرهاتەکەیان دەگێڕێتەوە: ﴿ جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ﴾، پێغەمبەرانیان بە بەڵگە ئاشکرایەکانەوە هاتنە لایان، ﴿ فَرَدُّوٓاْ أَيۡدِيَهُمۡ فِيٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ ﴾، کەچی ئەو گەلە کافرانە دەستیان بە زاریانەوە نا :

أ/ دەستیان بە زاری پێغەمبەرانەوە نا، بە کردەوە .

ب/ یاخود ئاماژەیان بۆ کردن: بێدەنگ بن .

ج/ یان دەستیان بە زاری خۆیانەوەنا، وەك گاڵتە پێکردن .

د/ یان وەك ئاماژە پێکردن کە پێغەمبەران بێ دەنگ بن .

ئەو چوار مانایانە هەموویان دەگرێتەوە، ﴿ وَقَالُوٓاْ إِنَّا كَفَرۡنَا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ ﴾، ئەو گەلە کافرانە بە پێغەمبەرەکانی خۆیانیان گوت: ئێمە بێبڕواین بەوەی کە ئێوەی پێ ڕەوانە کراون، ئنجا بە تەئکید ئەوان قەناعەتیان نەبوو بەوەی کە پێغەمبەران، پەیامی خوایان پێدا ڕەوانە کرابێ، کەواتە: ئەوەش جۆرێکە لە گاڵتە پێکردن، وەك لە سووڕەتی (الحِجْر)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِي نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ إِنَّكَ لَمَجۡنُونٞ ٦ ﴾، واتە: (بێبڕوایەکان) گوتیان: ئەی ئەو کەسەی کە (ذِكْر)ی بۆلا دابەزێنراوە ! تۆ شێتی، هەڵبەتە کەسێك یادخەرەوە (ذِكْر)ی بۆلا دەبەزێنرێ، شێت نیە، واتە: ئەی ئەو کەسەی کە پێت وایە: قورئانت بۆ دابەزێنراوە ! لێرەدا ئەمە جۆرێکە لە گاڵتە پێکردن .

﴿ وَإِنَّا لَفِي شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَنَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴾، بێگومان ئێمە لە دوو دڵیی داین، سەبارەت بەوەی كە ئێمەی بۆ بانگ دەكەن، دوو دڵییەك كە زۆر خەستو خۆڵە چونكە: ﴿ مُرِيبٍ ﴾: (المُوقِعُ فِي الرَّيْب) شتێك كە دەتخاتە نێو دوو دڵییەوە، ئنجا ئەمە وەك ئەوە وایە لە كوردەواریی خۆماندا دەڵێ: شەوێكە بەلام شەو (لیلٌ أليَل)، یاخود شیعرە بەلام شیعر (شِعرٌ شاعِر) .

ئنجا كە ئەوان هەڵوێستی نەرێنییانەو خراپیان بەرانبەر پێغەمبەران دەردەبڕن، با بزانین پێغەمبەران چی دەفەرموون؟ ﴿ قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي ٱللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، پێغەمبەرەكانیان گوتیان: ئایا دوو دڵیی هەیە لە خوادا، بەدیهێنەری ئاسمانەكانو زەوی؟! ئەم ئاسمانو زەوییە هەموو كەسێك دەزانێ پەیدابوون، كاتێك بووە نەبوونو پەیدا كراون، ئنجا ئایا ئەو كەسەی كە بەدیهێناون، عەقڵ ڕێ دەدا لەبارەی وییەوە دوو دڵ بی، گومانت هەبێو، دڵ لە دڵ بدەی، ئەگەر عەقڵی سەلیم بەكاربێنی؟! مەگەر هەموو پەیدابوویەك پەیداكەرێكی نیەو، هەموو ڕێكخراوێك ڕێكخەرێكی نیە؟ ئایا ئەم كەونو كائیناتە، سیستماتیكو ڕێكوپێكو پڕ یاساو پڕ وردەكارییە، كە هەمووی لە شوێنی خۆی دایە، لە گەردیلەوە تا كەهكەشان، ئایا دەگونجێ بێ خاوەن بێ؟! بێگومان ناگونجێ .

هەڵبەتە ئەوە ئەگەر ئەوانە مولحید بووبن، ئەوە واتاكەیەتی، بەلام ئەگەر مولحید نەبوو بنو، بەس هاوبەشیان بۆ خوا دانابێ، واتە: ئایا دەگونجێ دوو دڵ بن، لە یەكتاییو تەنیا پەرستراوێتیی، خوایەك دا كە بەدیهێنەری ئاسمانەكانو زەوییە؟ بێگومان مادام هەر ئەو ئاسمانەكانو زەوی وەدیهێناونو ڕێكی خستوونو پەیدای كردوون، دەبێ هەر ئەویش بپەرسترێ .

﴿ يَدْعُوكُمْ لِيَغْفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ ﴾، بانگتان دەكات بۆ ئەوەی لە گوناهەكانتان لێتان ببووری، ﴿ وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾، هەروەها دواتان بخات بۆ كاتێكی دیاریكراو، واتە: بە بەلای ناگەهان نەتانفەوتێنێ، بە ڕووداوو كارەساتێك، نەتانفەوتێنێ، بەڵكو بە مردنی ئاسایی خۆتان بمرن .

ئنجا نـەیارانی پێغـەمبـەران (بێبـڕواکان) دووباره وه دەنگ دێن: ﴿ قَالُوٓاْ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا ﴾ گوتیـان: ئێـوه تـەنیـا مرۆڤـی وەك ئێمـەن، ﴿ تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا ﴾، دەتانـەوێ: ئێمـە لـەوه لابـدەن کـە بـابو باپیرانمـان پەرستوویانـە! ﴿ فَأۡتُونَا بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ ﴾، بـەڵگـەیـەکی ڕوونو ئـاشکرامـان بـۆ بێنـن .

دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا، زیاتر تیشك دەخەینـە سەر ئـەو سێ بیانـوو پاساوەی بێبـڕوایان، لـە بـەرانبـەر پێغـەمبـەرانـدا (عَلَيۡهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) .

ئنجا پێغـەمبـەران وەڵامیـان دەدەنـەوه :

﴿ قَالَتۡ لَهُمۡ رُسُلُهُمۡ إِن نَّحۡنُ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ ﴾، پێغـەمبـەرەکانیـــان پێیـــان گوتـن: بـەڵێ ڕاستـە ئێمەش بـەشـەرین، مرۆڤیـن وەك ئێوه ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ ﴾، بـەڵام خـوا چاکـە دەکات لـەگەڵ هـەر کام لـە بـەندەکانی دا کـە بیـەوێ، واتـە: بـەڵـێ ئێمـەش مرۆڤیـــن وەك ئێـوه، بـەڵام مرۆڤ بوونمـان، ڕێمـان لـێناگرێ، کـە خـوا چاکـەمـان لـەگەڵدا بکـات‌و، بمـانکـاتـە پێغـەمبـەر (عَلَيۡهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، واتـە: مرۆڤبوونی ئێمـە، ڕێگر نیـە لـەوەی کـە خـوا چاکـەمـان لـەگـەڵدا بکـات‌و، بـە شێوەیـەکی تایبـەت زانیاریمان فێـر بکـات، کـە بریتیـە لـەوەی وەحییمـان بـۆ بنێـرێ‌و، بمـانخـانـە سـەر ڕاستـە شـەقامی خـۆی، ﴿ وَمَا كَانَ لَنَآ أَن نَّأۡتِيَكُم بِسُلۡطَٰنٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ ﴾، ئـەوەی کـە دەڵـێن: بـەڵگـەیـەکی ڕوونو ئـاشکرامـان بـۆ بێنن، ئێمـە نـاتوانیـن بـەڵگـەتـان بـۆ بێنیـن، مەگـەر بـە مۆڵـەتی خـوا .

واتـە: مۆڵـەتی خـواش هـەر لـەسـەر ئـەوەیـە کـە تـا ئێستا پێشانمـان داون، خـوا ئـەوەنـده موعجیزەو بـەڵگـەی بـە هـەر کامێکمـانی داوه، بـە بـەس (کافي)ی زانیوه، ئنجا ئـەگـەر بـەوه قەناعەت نـەکـەن، کـە هێنـاومـانـە، ئـەو بیانـووەش کـە دەیگرن، ئـەویشتـان بـۆ ببـڕین‌و، داواکاریـەکـەتان جێبـەجـێ بکـەیـن، بیانـوویـەکی دیکـە

دەگرن ﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾، بڕوادارانیش با تەنیا پشت بە خوا ببەستن، یانی: ئێمەش پێشەوای بڕوادارنین، پشتمان بە خوا بەستووەو، گوێ نادەینە بیانووگرتنی ئێوە .

وەك تێبینی دەکرێ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) وەڵامی ئەو قسەیان نەداوەتەوە کە دەڵێن: ﴿ تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا ﴾، دەتانەوێ: ئێمە لابدەن لەوەی باب و باپیرانمان پەرستوویانە، چونکە لەوەدا ڕاستیان کردووەو، پێغەمبەران هاتوون کە خەڵك لابدەن لە بتپەرستیی، باب و باپیرانیش ئەگەر بە ڕێی هەڵەدا ڕۆیشتبن و، جگە لە خوایان پەرست بێ، شتێکی وەك خۆیان، یان لە خوار خۆیان، پەرستبێ، ئەرکی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ئەوە بووە کە خەڵك لەو زەلکاوی بتپەرستیی و جگە لە خوا پەرستیی، دەربێنن، بۆیە ئەو تۆمەتەیان ڕەت نەکردوەتەوە، چونکە ئەو تۆمەتەیان لەجێی خۆیدا بووە، زۆر ڕاستە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) هاتوون خەڵك لە تاریکایی دوور لە خوایی و، تاریکایی بتپەرستیی، هاوبەش بۆخوا دانان، دەربێنن، بەرەو ڕۆشنایی خوا بەیەکگرتن (التوحید) و تەنیا خواپەرستیی .

ئنجا پێغەمبەران بەردەوام دەبن دەڵێن: ﴿ وَمَا لَنَآ أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى ٱللَّهِ ﴾، چیمانە! بۆچی پشت بە خوا نەبەستین؟ ﴿ وَقَدْ هَدَىٰنَا سُبُلَنَا ﴾، لە حاڵێکدا خوا ڕێبازەکانی خۆمانی پێشانداوین، واتە: ئەو ڕێبازانەی کە پەیامی خوایان لێوە بگەیەنین و، شەریعەتی خوایان لێوە بچەسپێنین، شێوازو ئامرازەکانی پێشانداوین، ﴿ وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيْتُمُونَا ﴾، بە دڵنیاییەوە ئێمە خۆڕاگر دەبین هەرچەندە ئێوە زۆر ئازارمان بدەن و ناڕەحەتمان بکەن، ﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴾، پشت بەستووانیش با تەنیا پشت بە خوا ببەستن .

ئنجا دووبارە ئەوانەی بێبڕوابوون، وە دەنگ دێنەوەو قسە دەکەن ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ﴾، ئەوانەی

بێبڕوابوون بە پێغەمبەرەکانی خۆیانیان گوت: بە دڵنیایی لەسەر زەمینی خۆمان وەدەرتان دەنێین، یاخود دەبێ بگەڕێنەوە نێو ئایینو بەرنامەکەی ئێمە.

تەماشا بکەن! بێبڕواکان دەڵێن: ﴿ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ ﴾، وەك ئەو پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)و شوێنکەوتەکانیان، خەڵکی ئەو وڵاتە نەبن، بەشیان بەو نیشتیمانو بەو خێرو بێرەوە نەبێ، هەموو دیکتاتۆرێك هەروا بیر دەکاتەوە، وا دەزانێ عیبادو بیلاد هی وینو، هەر کەسێك لە ژێر ڕکێفی وان بچێتە دەرێ، بەشی نیە، نە بە نیشتیمانەوە، نە بە خێرو بێریەوە، نە بە هیچ شتێکەوەو دەبێ بڕوا، (یان دەبێ لەگەڵی مەدار بکات، یان دەبێ بار بکات)، یان (دەبێ باری ئەو لەسەر پشتی بار بکات، یاخود لەبەری بار بکات)، ئاوا بیر دەکەنەوە !! .

لە حاڵێکدا کە پێغەمبەران بێ دەسەڵات بوونو، شوێن کەوتووانیان خەڵکە چەوساوەو هەژارو بێدارەکان بوون، خەڵکە بێ دەسەڵاتەکان بوون، توانای ئەو دەسەڵاتدارو خۆشگوزەرانو ستەمکارو ملهوڕانەیان نەبووە، تاکو لەگەڵیاندا ڕووبەڕوو ببنەوە، خواش ﷻ کاربەجێو کارزانە، ئەرکێك ناخاتە سەرشانی بەندەکانی خۆی، کە لە توانایاندا نەبێ، جا ئەگەر پێغەمبەرانن (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، یان شوێنکەوتووەکانیان، یان هەر کەسێکی دیکەیە، بۆیە لێرەدا خوا بۆخۆی وە دەنگ دێ: ﴿ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾، پەروەردگاریان سروشی بۆ کردنو پەیامی بۆ ناردن بۆ پێغەمبەران: دڵنیا بن ئێمە ستەمکاران دەفەوتێنین .

ئەوانەی کاتێك لە بواری بەڵگەدا تێکدەشکێن، پەنا دەبەنە بەر هێز، دوای ئەوەی کە لە بواری هێزی لۆژیك (قوة المنطق)دا شکست دەخۆن، پەنا دەبەنە بەر لۆژیکی هێز (منطق القوة) .

ئنجا خوا ﷻ لەسەر سروشکردنەکەی خۆی هەر بەردەوام دەبێ، دەفەرموێ: ﴿ وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ﴾، بێگومان ئێوە لەو سەرزەمینەی کە ئەوان هەڕەشەتان لێدەکەن، کە دەرتانبکەن لێیو وەدەرتان بنێن، ئێوە نیشتەجێ

دەکەین لە دوای وان، یانی: دوای ئەوەی ئەوان دەفەوتێنین، ئێوە نیشتەجێ دەکەین لەو سەر زەمینەدا .

﴿ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ ﴾، ئا ئەوەش بۆ کەسێکە لە پایەی من بترسێ‌و لە هەڕەشەی من بترسێ، نەك لە هەڕەشەی ناحەزان‌و، ستەمکارانێك کە گیانی خۆشیانیان بەدەست نیە، ▪ جای گیانی خەڵکی دیکەیان بەدەستی بێ !

﴿ وَٱسْتَفْتَحُوا۟ ﴾، پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) داوای یارمەتییان کرد، یاخود هەرکامێکیان داوای یارمەتیی کرد، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) داوای یارمەتییان کردبێ، داوای هاوکارییان کردبێ‌و خواش یارمەتیی بۆ ناردن، (إستِفتاح: طَلَبُ الفَتحِ وَهُو النَّصر) واتە: داواکردنی کرانەوە کە بریتیە لە: سەرکەوتن، ﴿ وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴾، بێمرادو دەستخەڕۆ بوو، هەموو ملهوڕێکی نەسەلمێنی کەللە ڕەق، ﴿ مِّن وَرَآئِهِۦ جَهَنَّمُ ﴾، (لە دنیادا بێمرادو دەستخەڕۆ بوون)، لە پشتیشیەوەش دۆزەخ هەیە .

(مِنْ وَرائِهِ) واتە: لە پشتیەوە، بۆیە فەرموویەتی: لە پیشتیەوە، چونکە: بڕوای پێ نیە، شتێك کە لە پشتت بێ، نایبینی، واتە: ئەو نازانێ، نەگەرنا دۆزەخ چاوەڕێیەتی، نەگەرنا لە ڕووی زەمەنییەوە لە پێشیەوەیەتی، بەڵام بۆیە دەفەرموێ: (وَرائِهِ) چونکە شتێك کە لە پشت مرۆڤە، هەستی پێ ناکات، ئەوانیش لەبەرئەوەی بڕوایان پێ نەبووە، نەیانبینیوە، بە چاوی عەقڵ‌و دڵیان نەیانبینیوە ﴿ وَيُسْقَىٰ مِن مَّآءٍ صَدِيدٍ ﴾، لە ئاوێکی زووخاویی دەیدرێتێ، واتە: لە جیاتی ئاو، کێم‌و زووخاوی دەدرێتێ، ﴿ يَتَجَرَّعُهُۥ ﴾، زۆر بە زەحمەت بۆی قوت دەچێ، ﴿ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُۥ ﴾، نەسڵەن هەر نزیکیش نیە کە بە ئاسانیی بۆی قووت بچێ، نەك هەر بە ئاسانیی بۆی قوت ناچێ، بەڵکو هەر نزیکیش نیە، ئەدی چۆن بۆی قووت دەچێ؟ زۆر بە زەحمەت! (تَجَرُّع) بریتیە لەوەی کە ئینسان شتێك قووت بدات، بەڵام زۆر بە زەحمەت، دڵۆپە دڵۆپە،

﴿ وَيَأْتِيهِ ٱلْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ ﴾، لە هەموو لایەکەوە مردنی بۆ دێ، کەچی ناشمرێ، وەك یەکێك بە یەکێك دەڵێ: هەموو ئەندامەکانی لەشم نازاریان هەیە ! ئەویش لە هەموو لایەکەوە مردنی بۆ دێو هەموو هۆکارەکانی مردن دەوریان داوە، بەڵام ناشمرێ، ﴿ وَمِن وَرَآئِهِۦ عَذَابٌ غَلِيظٌ ﴾، لە پشتیەوە سزایەکی بێ ڕەزاو زەبەلاح هەیە، ﴿ غَلِيظٌ ﴾ بە شتێك دەگوترێ: زبرو بەهێزو پتەو بێ .

ئنجا خوا ﷻ لە کۆتاییدا: باسی سەرەنجامی کاری بێبڕوایانو سەرەنجامی کردەوەکانیان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ مَّثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ ۖ أَعْمَٰلُهُمْ كَرَمَادٍ ٱشْتَدَّتْ بِهِ ٱلرِّيحُ فِى يَوْمٍ عَاصِفٍ ﴾، وێنەی کردەوەی ئەوانەی بێبڕوان بە پەروەردگاریان، ﴿ كَرَمَادٍ ٱشْتَدَّتْ بِهِ ٱلرِّيحُ فِى يَوْمٍ عَاصِفٍ ﴾، وەك خۆڵەمێشێکە لە ڕۆژێکی ڕەشەبا دارداا، بایەکی بەهێزی بێو لێی بدات، ئایا بایەکی بەهێز لێیبدات چی لێدێ ؟ ﴿ لَّا يَقْدِرُونَ مِمَّا كَسَبُوا۟ عَلَىٰ شَىْءٍ ﴾، خۆڵەمێشێك لە ڕۆژێکی ڕەشەباداردا بێ، ئنجا بایەکی بەهێزیش بێ لەو خۆڵەمێشە بدات، پرش‌و بڵاو دەبێتەوە بۆیە : ﴿ لَّا يَقْدِرُونَ مِمَّا كَسَبُوا۟ عَلَىٰ شَىْءٍ ﴾، کردەوەکانی ئەوانیش لە ڕۆژی دواییدا، توانایان بەسەر هیچی دا نابێو، هەموویان لەدەست دەچێ، ﴿ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلْبَعِيدُ ﴾، ئا ئەوەیە گومڕایی دوور، گومڕاییەك کە خاوەنەکەی زۆر دوور کەوتۆتەوە لە ڕاستە شەقام، کەسێك زۆر دوور کەوتبێتەوە، زۆر بە زەحمەت دەتوانێ بگەڕێتەوە .

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**<u>مەسەلەی یەکەم</u> : پێغەمبەران هەمیشە بە بەڵگەگەلی ڕوونەوە هاتوون و، نەیارەکانیشیان هەردەم بەبێ بەڵگەو، بە پاساوو بیانووی بێ جێیەوە، بەرپەرچیان داونەتەوە :**

**خوا عزو جل دەفەرموێ :** ﴿ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا۟ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ ۛ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۛ لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَرَدُّوٓا۟ أَيْدِيَهُمْ فِىٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَقَالُوٓا۟ إِنَّا كَفَرْنَا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ وَإِنَّا لَفِى شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَنَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٩﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە ، لە شەش بڕگەدا :**

**<u>بڕگەی یەکەم</u> :-** ﴿ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا۟ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ ﴾، **ئایا هەواڵی ئەوانەی پێش خۆتانتان پێ نەگەیشتوە، گەلی نووح و گەلی عادو گەلی سەموود .**

**وەك گوتمان: ئەو سێ گەلە، ئەو سێ کۆمەڵگایە، لە قورئاندا زۆر باسکراون و لە گەلە پێشووەکانن و شوێنەوارەکانیشیان ماون، لە نێو هەموو میللەتانی پێشوودا، باسی تۆفانی نووح کراوە، وەك لە تەفسیری سووڕەتی (هود)دا بە تەفصیلْ باسمان کرد، هەروەها هەر لە تەفسیری سووڕەتی (هود)دا بە تەفصیلْ باسی گەلی (عاد)مان کرد، کە شوێنەوارەکانی لە کوێن؟**

خواش پشتیوان بێ لە تەفسیری سوورەتی (الحجر)یشدا، بە تەفصیلێ باسی گەلی سەموود دەکەین، کە صالِحیان بۆلا ڕەوانە کراوە .

**برگەی دووەم :** - ﴿ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۛ لَا يَعۡلَمُهُمۡ إِلَّا ٱللَّهُۚ ﴾، هەروەها ئایا هەواڵی ئەوانەی دوای ئەوانیشتان پێ نەگەیشتوە، کە بێجگە لە خوا کەس نایانزانی، واتە: بێجگە لە خوا، کەس بە وردەکارییەوە، هەواڵی ڕاستەقینەی لەبارەی ئەوانەوە، لەلا نیە، ئەگەرنا کەمو زۆر، پێغەمبەران و گەلەکانیان لە نێو مرۆڤایەتیی دا، باس و خواسیان لە نێو خەڵك و لە نێو کۆمەڵگاکاندا، هەر بووەو، شوێنەوارەکانیان و، قسەی دەماودەم هەر بوو ون، بەڵام هەواڵێ لە زانیارییەکی بێ خڵتەوە هەڵبقوڵێ، تەنها لەلای خوای پەروەردگارە، بۆیە دەفەرموێ : ﴿ لَا يَعۡلَمُهُمۡ إِلَّا ٱللَّهُۚ ﴾.

**برگەی سێیەم :** - ﴿ جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ﴾، پێغەمبەرەکانیان بە بەڵگە ڕوون و ئاشکرایەکانەوە، هاتنە لایان .

(بَیِّنات) کۆی (بَیِّنة)یە، یانی: بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا، کە مەبەست بۆ مرۆڤ ڕوون بکاتەوەو بیخاتە بەر ڕۆشنایی، کە بێگومان هیچ کام لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) نەبووە، کە بە بەڵگەی ڕوون و ئاشکراوو نکووڵیلێنەکراوەوە کە نیقناعکەر بێ بۆ بەرانبەرەکەی، نەهاتبێ، هیچ پێغەمبەرێك نەبووە موعجیزەو بەڵگەی نەبێ، ئنجا هەیانە خوا باسی بەڵگەو موعجیزەکەی کردوە، وەك بەڵگەو موعجیزەکانی مووسا و عیسا و صالِح، هەشیانە خوای پەروەردگار باسی بەڵگەو نیشانەکانی نەکردوە، بە وردیی، بەڵام بە گشتی فەرموویەتی : ﴿ لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ﴿٢٥﴾ ﴾الحديد، ﴿ فَلَمَّا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ...﴿٨٣﴾ ﴾غافر، ﴿ ...جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ... ﴾ إبراهيم، واتە: هیچ کام لە پێغەمبەران نەبوون بە بەڵگەو موعجیزەیەکەوە نەهاتبێ، کە نیسپاتی دەعوای پێغەمبەرایەتیی خۆی پێ بکات، چونکە هەر کەسێك ڕاست بێتەوەو بڵێ: من پێغەمبەرم! ئەوە نابێ، بۆیە جیاوازیی نێوان

ڕاستو درۆ بریتیە لە: بەڵگە، بەڵام دوای ئەوەی کە پێغەمبەران بە بەڵگەی ڕوونو ئاشکراوە هاتوون، ئەوان (بێبڕوایەکان) چییان کردوە ؟

<u>برگەی چوارەم :</u> - ﴿ فَرَدُّوٓاْ أَيۡدِيَهُمۡ فِيٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ ﴾، ئەوان دەستیان بە زاریانەوە نا، ئەم تەعبیرە زۆر واتایان بۆ لێکداونەوە، بەڵام من چواریانم بە دڵن :

ا/ (عَضُّوا الأنامِل): واتە: ئەو گەلە کافرانە، دەستیان خستە نێو دەمی خۆیان، واتە: پەنجەی خۆیانیان گەزی، لە داخو لە ڕقو خەفەتان، کە ئەو پەیامەو بەرنامەیان بۆ هێناون، کە جیایە لەوەی ئەوانو بابو باپیرانیان لەسەری بوون .

ب/ (أشارُوا إليهم بالسُّكوت): ئاماژەیان بۆ کردن کە: بێدەنگ بنو، قسە نەکەن، ئەو پەیامەی پێیانە، نەیگەیەنن .

ج/ (قامُوا بالتَّصْغِيرِ وَالإستِهزَاء): دەستیان بردە دەمیان، واتە: فیکەیان کێشاو گاڵتەیان پێ کردن .

د/ دەستی خۆیانیان بە کردەوە بە زاری پێغەمبەران گرت، تاکو بێدەنگیان بکەن .

هەر کام لەو چوار واتایانە دەگونجێن .

هەندێکیشیان گوتوویانە: دەستی پێغەمبەرانیان بە زاری خۆیانەوە ناوە، کە ئەم واتایەم بە دوور دێتە بەرچاو .

<u>برگەی پێنجەم :</u> - ﴿ وَقَالُوٓاْ إِنَّا كَفَرۡنَا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ ﴾، ئەو گەلە کافرانە بە گەلەکانی خۆیانیان گوت: ئێمە بێبڕواین بەوەی کە ئێوەی پێ ڕەوان کراون .

کە ئەمە بەتەئکید جۆرێکە لە گاڵتە پێکردن، ئەمە وەك ئەوە وایە کە لە سوورەتی (الحجر) دا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِي نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ إِنَّكَ لَمَجۡنُونٞ ٦ ﴾، واتە: (کافرەکان) گوتیان: ئەی ئەو کەسەی کە زیکرت بۆ لا دابەزێنراوە ! بێگومان تۆ شێتی .

كافرەكانی قورەیش وایان بە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دەگوت، كە مەبەستیان ئەوە نەبووە، زیكری بۆلا دابەزێنراوە، واتە: ئەی ئەو كەسەی كە پێت وایە زیكرت بۆ دابەزێنراوە ! (بە گاڵتە پێ كردنەوە) .

**برگەی شەشەم :** - ﴿ وَإِنَّا لَفِي شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَنَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴾، بێگومان ئێمە لە دوو دڵییەك داین لەوەدا كە ئێمەی بۆ بانگ دەكەن، دوو دڵییەكی زۆر خەست، كە بێزارمان دەكات، دوو دڵییەك كە زۆر نارەحەتكەرە .

پێشتر باسمان كردوە (شَك) واتە: دوو دڵیی، (مُرِیب)یش واتە: شتێك كە ئینسان دەخاتە نێو دوو دڵییەوە، (المُوقِعُ في الرَّیب) .

هەندێك گوتوویانە: (رَیب) بریتیە لە: گومانو دوو دڵییەك كە جێی خۆی نەبێ، یان: دوو دڵییەكی بێزاركەرو جارەزكەر .

هەندێكیش گوتوویانە: (شَكٌّ مُرِیب) وەك ئەوە وایە كە بڵێی: (لَیلٌ أَلیَل) شەوێكی شەو، تاریكییەكی تاریك، مەبەست پێی ئەوەیە كە زۆر خەست بووە، لە دوو دڵییدا .

**مەسەلەی دووەم** : وەڵام دانەوەی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) كە لە بوونی خوای تاكدا، جێگای دوو دڵیی نیە، چونكە خوا پەیداكەری بوونەوەرەو، بۆ لێبوردنیشی لێیان، بەندەكان بۆ بەرنامەی خۆی بانگ دەكات، لەسەر زمانی پێغەمبەران :

ئەم مەسەلە گرنگە لە بەشێك لە ئایەتی ژمارە (١٠)دا دەخەینەڕوو، خوا ﷻ فەرموویەتی : ﴿ قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي ٱللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَدْعُوكُمْ لِيَغْفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم چەند پستە موبارەکە ، لە سێ برگەدا:**

**برگەی یەکەم :** - ﴿ قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي ٱللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، پێغەمبەرەکانیان (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) کە بۆلایان نێردرابوون، گوتیان: ئایا لە خوادا دوو دڵیی هەیە، کە بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوییە؟!

ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) دەگونجێ دوو واتایان لە خۆ بگرێ :

أ/ ئایا کەسێك عەقڵێکی سەلیمی هەبێ، دەبێ لە بوونی خوادا بکەوێتە گومان دوودڵییەوە لە حاڵێکدا کە بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوییە، واتە: بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوی، دوو دڵیی لە بوونی دا نیە، ئەگەر کەسێك عەقڵی خۆی بە چاکی بەکاربهێنێ .

ب- ئایا لە تەنیا پەرستراوێتیی خوادا، کە بەدیهێنەرو پەیداکەری ئاسمانەکانو زەوییە، جێی دوو دڵیی هەیە، واتە: هەر کەسێك عەقڵی خۆی باش بەکاربێنێو، عەقڵەکەی باش کار بکات، نابێ لەوەدا کە دەبێ تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا بکرێ، خوایەك کە پەیداکەری ئاسمانو زەوییە نابێ هیچ دوو دڵییو لەرەلەرو دڵ لە دڵدانی هەبێت .

**برگەی دووەم :** - ﴿ يَدْعُوكُمْ لِيَغْفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ ﴾، بانگتان دەکات بۆ ئەوەی لە گوناهەکانتان بتانبوورێ، واتە: کە خوا پێغەمبەرانی (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) ناردوون، بۆ بەرژەوەندیی مرۆڤەکان خۆیان، ناردوونیو هیچ کارێکی خۆی بە وان نیە، بەڵکو کاری خۆیانی پێیانە، خوا ﷻ کاری خۆیانی، بە بەندەکانە، نەك کاری خۆی پێیان بێ، کارەکەیشی ئەوەیە کە بانگیان دەکات بۆ شوێنکەوتنی بەرنامەکەی تاکو لێیان ببوورێ، واتە: تاکو بە شێوەیەك ژیان بەرنە سەر، شایستەی ئەوە بن، خوا لە هەڵەو کەمو کورییەکانیان

ببووریٖ، چونکە مرۆڤی بیٖ هەڵەو کەمو کوڕیی هەر نابیٖ، بە حوکمی ئەوەی کە سروشتەکەی وایە، هەم دەتوانیٖ چاك بکات‌و، هەم دەتوانیٖ خراپ بکا، دەتوانیٖ بەرز بیٖ‌و، دەتوانیٖ نزم بیٖ، دەتوانیٖ ڕاست بڕواو، دەتوانا لار بڕوا، کەواتە: کەم‌و زۆر مرۆڤ، هەڵەو کەم‌و کوڕیی هەر دەبیٖ‌و، پێویستیی بە لێبوردنی خوا هەر هەیە، ئنجا خوا ﷻ کە بانگی مرۆڤەکان دەکات، لەسەر زمانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) کاری خۆیانی پێیانە، ئەویش ئەوەیە کە لێیان ببووریٖ‌و چاوپۆشییان لیٖ بکات‌و، سەرەنجام شایستەی ئەوە بن، کە بە پاکیی‌و چاکیی ژیانی دنیا بگوزەرێنن‌و، دوایش شایستەی ئەوە بن: بیانخاتە ئەو بەهەشتانەوە، کە بۆ بەندە چاك‌و پاکەکان ئامادەی کردوون .

<u>بڕگەی سێیەم</u> : - ﴿وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾، هەروەها خوا عز و جل دواتان دەخات بۆ کاتێکی دیاریکراو (کاتێکی ناوبراو)، کە بە تەئکید مەبەست ئەوەیە، ژیانی دنیا دەگوزەرێنن‌و بە بەلای ناگەهان‌و بە کارەساتێکی کتوپڕ، کە گەلان‌و کۆمەڵگاکانی پێشووی پیٖ لە بەین بردوون، ئێوە لە بەین نابات، بەڵکو دەتانهێڵێتەوە، تاکو تەمەنی سروشتیی‌و ئاسایی خۆتان دەگوزەرێنن .

<u>مەسەلەی سێیەم</u>: پاساو هێنانەوەی بێبڕوایەکان، بۆ بڕوانەهێنانیان بە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، بەوە کە :

١/ پێغەمبەرانیش وەك ئەوان مرۆڤن .

٢/ دەیانەویٖ لە ڕێی پێشینانیان لایان بدەن .

٣/ بەڵگەیەکی ڕوونیان نەهێناوە :

خوا دەفەرمویٖ: ﴿قَالُوٓاْ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأْتُونَا بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ١٠﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە ، لە سێ برگەدا:**

**برگەی یەکەم :** - ﴿ قَالُوٓاْ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا ﴾، بێگومان خوا ﷻ لەسەر زمانی بێبڕوایەکان ئەم فەرمایشتەی فەرمووە .

(کافرەکان) گوتیان: ئێوەش هەر مرۆڤێکی وەك ئێمەن .

ئەوە کە پێغەمبەران مرۆڤن، بۆیە نەیارەکانیان بڕوایان پێ نەهێناون، لە زۆر شوێنی قورئاندا دووبارە بۆتەوە، بۆ وێنە، لە سووڕەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ : ﴿ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓاْ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٤﴾ ﴾، واتە: هیچ شتێك ڕێی لە خەڵك نەگرت بڕوابێنن، کاتێ کە ڕێنمایی خوایان بۆ هات، مەگەر ئەوە کە گوتیان: ئایا خوا پێغەمبەرێکی مرۆڤ و، ڕەوانەکراوێکی مرۆڤی ناردوە، ئنجا هەر لەوێ، خوا ﷻ وەلامی داونەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّوْ كَانَ فِى ٱلْأَرْضِ مَلَٰٓئِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكًا رَّسُولًا ﴿٩٥﴾ ﴾الإسراء، واتە: بڵێ ئەگەر لەسەر زەوی فریشتەی لێبانایە، (گونجاو بایە فریشتەکان لەسەر زەوی ژیابوونایە، وەك ژیانی ئاسایی وەك مرۆڤانیان بگوزەرانندباو)، بە ئارامیی ڕۆیشتبان، ئەو کاتە ڕەوانەکراوێکی فریشتەمان لە ئاسمانەوە بۆ دادەبەزاندن .

بەڵێ مرۆڤەکان دەبێ کەسێك بۆیان بنێردرێ، وەك خۆیان مرۆڤ بێ، خاوەنی هەمان سروشتی ئەوان بێ‌و، بەزمانی ئەوان قسە بکات‌و، لە شێوەو دیمەنی ئەواندا بێ .

**برگەی دووەم :** - ﴿ تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا ﴾، (کافرەکان گوتیان:) دەتانەوێ لەوە لامان بدەن، کە باب‌و باپیرانمان پەرستوویانە، واتە:

دەتانەوێ لەو ڕێبازو ڕچەیە کە ئێمە گرتوومانەتە بەر، کە هی باب و باپیرانمانەو، ئەو پەرستراوانەی کە ئەوان پەرستوویانن، {ئەی پێغەمبەرەکان (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)!} دەتانەوێ لەوە لامان بدەن !

**برگەی سێیەم :** ﴿فَأْتُونَا بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ﴾، بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرامان بۆ بێنن .

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە: ئێوە بەڵگەتان نەهێناوە! هەڵبەتە هیچ پێغەمبەرێك بێ بەڵگە قسەی نەکردوە، وەك لە فەرمایشتێکی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە کە لە (صحیحي البخاري ومسلم)دا هاتوەو زۆر جاری دیکە هێناومە لە تەفسیری ئایەتانی دیکەدا، کە دەفەرموێ: {ما مِنْ نَبِيٍّ مِنَ الأَنْبِياءِ إِلاَّ وَقَدْ أُعْطِيَ مِنَ الأياتِ ما آمَنَ عَلَى مِثْلِهِ الْبَشَرُ....}، (أَخرجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٤٧٢)، وَالبُخارِيُّ برقم: (٤٩٨١)، وَمُسْلِم برقم: (٣٨٣)).

واتە: هیچ کام لە پێغەمبەران نەبووە، مەگەر خوا بەڵگەو موعجیزەکی وای داوەتێ، کە لەسەر بناغەی ئەوە مرۆڤەکان بڕوا بێنن، واتە: بۆ ئەوان ئیقناعکەر بێ، بۆ هەر کەسێك کە بە دوای هەقدا، عەودالْ بێ و وێڵ بێ، ئەمما کەسێك لە بیانووگرتن بێ، وەك گوتراوە: ئەگەر دز دز بێ تاریکە شەو زۆرە، کەسێك لە بیانوو گرتن بێ، بیانوو نابڕێ .

**مەسەلەی چوارەم :** وەڵامدانەوەی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) :

١/ بە سەلماندنی مرۆڤ بوونیان .

٢/ بەڵام خوا چاکە لەگەڵ هەندێك لە بەندەکانیدا دەکات .

٣/ بەڵگەو موعجیزە تەنیا بە مۆڵەتی خوا دێ .

٤/ پشتمان بە خوا قایمە، لە سۆنگەی ئەوەوە کە ڕێنمایی کردووین .

٥/ هەرچەندە ئازارمان بدەن، خۆڕاگر دەبین :

ئەو وەڵامانەی پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) لە ئایەتی (١١و ١٢)دا هاتوون، خوا ﷻ دەفەرمووێ : ﴿ قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ إِن نَّحْنُ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ ۖ وَمَا كَانَ لَنَا أَن نَّأْتِيَكُم بِسُلْطَانٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ۚ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾ وَمَا لَنَا أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى اللَّهِ وَقَدْ هَدَانَا سُبُلَنَا ۚ وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَا آذَيْتُمُونَا ۚ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُتَوَكِّلُونَ ﴿١٢﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە بەپێزە، لە حەوت بڕگەدا:**

<u>**بڕگەی یەکەم :**</u> - ﴿ قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ إِن نَّحْنُ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ ﴾، پێغەمبەرەکانیان، گوتیان: بێگومان ئێمەش هەر مرۆڤێکی وەک ئێوەین.

واتە: ئەو قسەیەتان لێ دەسەلمێنین کە ئێمەش مرۆڤین وەک ئێوە، ئێمە نکووڵیی لەو ڕاستییە ناکەین، تەماشای قورئان بکەن! لە هەموو قورئاندا نابینی: پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) نەیارەکانیان شتێکیان گوتبێ، ڕێی تێچوو بێت و، ئەوان نکووڵیی لێ بکەن، هەرگیز! هەر هەقێک هەر کەسێک گوتبێتی، پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) دانیان پێدا هێناوە، بەڵکو خوا ﷻ ئیبلیس قسەی کردوە، کە قسەکەی ڕاست بووە، ڕاستییەکەی لێ سەلماندوە، وەک لە سووڕەتی (الحجر)دا، خوا ﷻ لەسەر زمانی ئیبلیس دەفەرمووێ: ﴿ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾، واتە: هەموو بەندەکانت گومڕا دەکەم، جگە لە بەندە ساغبووەوەکانت، خواش ﷻ دەفەرمووێ : ﴿ هَٰذَا صِرَاطٌ عَلَيَّ مُسْتَقِيمٌ ﴿٤١﴾ ﴾، واتە: ئەوە ڕێیەکی ڕاستە، لەسەر من، واتە: ئەوە کە تۆ دەسەڵاتت بەسەر بەندە چاکەکانی مندا نیە، ئەوە یەکێکە لە یاسایەکانی من، کە مامەڵەی پێ لەگەڵ بەندەکانمدا دەکەم، یاخود ئەوە کە دەسەڵاتت بەسەر بەندە ساغەکانی، بەندە هەڵبژاردەکانی مندا، نیە، ئەوە ڕێیەکی ڕاستە لەسەر من، یان لە سووڕەتی

(سبأ)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُۥ فَٱتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٠﴾ ﴾، واتە: بێگومان ئیبلیس گومانی خۆی لەگەڵ مرۆڤەکاندا ڕاست بردە سەر، گومانەکەی ڕاست دەرچوو، هەموویان شوێنی کەوتن، جگە لە کۆمەڵێك لە بڕواداران .

یانی : کە ئیبلیس گوتی: هەموویان گومڕا دەکەم، جگە لە کۆمەڵێك لە بەندە هەڵبژاردەکانت، یان بەندە دڵسۆزەکانت، خوا ﷻ دەفەرموێ : ئیبلیس گومانەکەی ڕاست دەرچوو .

بۆیە لێرە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلَام) ئەوە کە کافرەکان دەڵێن: ئێوە تەنیا مرۆڤێکی وەك ئێمەن، ئەوەیان لێ دەسەلمێنن‌و دەڵێن: ﴿ إِن نَّحْنُ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ ﴾، بێگومان ئێمە تەنیا مرۆڤێکین وەك ئێوە .

<u>بڕگەی دووەم</u> : - ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ﴾، بەڵام خوا چاکە دەکات لەگەڵ هەر کام لە بەندەکانی دا، کە بیەوێ، واتە: خوا ﷻ هەر کام لە بەندەکانی کە بیەوێ، چاکەی ئەوەی لەگەڵ دەکات، کە بیکاتە پێغەمبەرو، وەحیی بۆ بنێرێ، واتە: مرۆڤ بوونی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلَام) ڕێی ئەوەی لێ نەگرتوون، کە خوا هەڵیانبژێرێ‌و، بیانکاتە پێغەمبەرو چاکەیان لەگەڵدا بکات، هەمیشە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلَام) تەماشای مرۆڤیان کردوە، بەپێی ئەوە کە لە شەریعەتی خوادایەو، پێگەو پلەیەك کە پێی دراوە، کە: پێغەمبەران مرۆڤن، بەڵام وە نەبێ مرۆڤ هێندە دروستکراوێکی نابووت بێ، شایستەیی ئەوەی نەبێ، کە خوا بیدوێنێ بە شێوەی تایبەت‌و، فریشتەی بنێرێتە لاو، وەحیی بۆ بنێرێ‌و پەیامی خۆی بۆ بنێرێ !

<u>بڕگەی سێیەم</u> : - ﴿ وَمَا كَانَ لَنَآ أَن نَّأْتِيَكُم بِسُلْطَٰنٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾، کافرەکان گوتیان: ﴿ فَأْتُونَا بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ ﴾، بەڵگەیەکی ڕوون‌و ئاشکرامان بۆ بێنن، کە وەك گوتمان بەتەئکید لە بیانوو گەڕاون، ئەگەرنا هی

پێغەمبەرێك (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم) بە بێ بەڵگەی ڕوونو، بە بێ موعجیزە، نەچووە ڕووبەڕووی هیچ گەلو کۆمەڵگایەك ببێتەوە، هەر لەخۆوە لەو گۆڕە بڵێ: من پێغەمبەری خواو وەحییم بۆ دێ! شتی وا نەبووە، هەر پێغەمبەرێك کە خوا ناردوویەتی، موعجیزەو بەڵگەیەکی داوەتێ، وەك لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە، لە زۆر لە ئایەتەکانیشدا هاتوە، بۆ نموونە :

أ/ خوا لە سوورەتی (الحديد)دا دەفەرموێ : ﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ ﴿٢٥﴾ ﴾.

ب/ لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ : ﴿ جَاءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِالْبَيِّنَاتِ ﴿٣٢﴾ ﴾.

ج/ لە سوورەتی (غافر)دا دەفەرموێ : ﴿ فَلَمَّا جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ ﴿٨٣﴾ ﴾، پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم) بە بەڵگە ڕوونو ئاشکراکانەوە چوونو، بەڵگەو موعجیزەی هەر کام لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم) بە پێی ئەو هەلومەرجە بووە، کە ئەو کۆمەڵگاو گەلەی ئەو، تێیدا بووە، بە پێی ئاستی عەقڵی ئەوانو، بە پێی پێداویستیی ئەو ڕۆژگارە بووە .

<u>**بڕگەی چوارەم**</u> : - ﴿ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ﴾، با بڕواداران تەنیا پشت بە خوا ببەستن، یانی: ئێمەش کە پێشەوای بڕوادارانین، پشتمان بە خوا قایمە .

بۆیەش پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم) وایان فەرمووە، چونکە بۆیان دەرکەوتوە کە نەیارەکانیان هەر لە شتێك دەخەفتێن، بیکەنە بیانووو پاساوی ئەوە کە بڕوایان پێ نەهێنن، پاشان زانیویشیانە کە ئەنجامی بڕوا پێ نەهێنانیان، سەردەکێشێ بۆ دژایەتییکردنو پەنابردنە بەر لۆژیکی هێز، دوای ئەوەی کە لە بواری هێزی لۆژیکدا تێکدەشکێن، لە بەرانبەر پێغەمبەران دا (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم) .

<u>**بڕگەی پێنجەم**</u> : - ﴿ وَمَا لَنَا أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى اللَّهِ وَقَدْ هَدَانَا سُبُلَنَا ﴾، (دەفەرموون) چیمانە، بۆچی، پشت بە خوا نەبەستین، لە حاڵێکدا کە ئێمەی ڕێنمایی کردوە بۆ ڕێبازەکانمان؟ واتە: ڕێبازەکانمان بۆ گەیاندنی

پەیامی خوا، کە ڕێبازەکانی گەیاندنی پەیامی خواش جۆراو جۆر بوون، بە پێی بارودۆخ و ژینگەکان، وشەی (سَبیل)، واتە: ڕێباز، هەمیشە لە قورئاندا ئەگەر پاڵدرابێتە لای خوا، ﴿ سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، ﴿ سَبِيلِ رَبِّكَ ﴾، دەبینین: بە تاک هاتوە چونکە ڕێبازی خوا یەکە، بەڵام لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَقَدْ هَدَىٰنَا سُبُلَنَا ﴾، هەروەها لە کۆتایی سوورەتی (العنکبوت)یشدا، کە دەفەرموێ : ﴿ وَٱلَّذِينَ جَـٰهَدُوا۟ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ﴿٦٩﴾ ﴾، بەڵێ: وشەی (سُبُل)، لێرەداو لە کۆتایی سوورەتی (العنکبوت)یشدا، بە مانای ڕێبازی خوا نیە، چونکە ڕێبازی خوا یەکێکەو کۆ (جمع) ناکرێتەوە، بەڵکو مەبەست پێی شێوازەکان و ڕێبازەکانی خزمەتکردنی پەیامی خواو گەیاندنی پەیامی خوایە، کە دیارە ڕێبازی خواو، پەیامی خوا، بە زۆر جۆرو شێوازو ڕێبازو ئامراز دەگەیەنرێ و خزمەت دەکرێ .

**بڕگەی شەشەم :** ﴿ وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيْتُمُونَا ﴾، (پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) دەفەرموون) بە دڵنیاییەوە خۆڕاگر دەبین، هەرچەندە ئێوە ئازارمان بدەن .

چ ئازاری مەعنەویی: کە لە بەدرۆدانان و گاڵتەپێکردن و تۆمەتبارکردن بە شێتیی و، بە جادووگەرێتیی و، بە فاڵچیەتیی و...هتددا، خۆی دەبینێتەوە، چ ئازاردانی جەستەیی: کە لە دەرکران و، گرتن و، بەردباران کردن و، کوشتن و، ئەشکەنجەدانی جەستەیی دا، خۆی دەبینێتەوە، واتە: بە هەر جۆرێك لە ئازارەکان، ئازارمان بدەن و، هەرچەندە ئازارمان بدەن، هەر خۆڕاگر دەبین، یانی: ئێمە دەستبەرداری پەیامی خوا نابین .

**بڕگەی حەوتەم :** ﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴾، لە کۆتاییدا پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) دەڵێن: با پشت بەستووان تەنیا پشت بە خوا ببەستن، زۆرجاری دیکەش گوتوومانە: کاتێ (جار و مجرور) پێش (فعل و فاعل) کەوتن، مانای کورت هەڵێنان دەگەیەنێ، واتە: ئەوانەی کە پشت بە شتێك دەبەستن، با تەنیا پشت بە خوا ﷻ ببەستن .

سەبارەت بە وشەی (تَوَكُّل)یش: (التَّوَكُّلُ: الإعتِمادُ وتَفْويضُ التدبيرِ إلى الغَيْرِ، ثِقَةً، بِأَنَّهُ أعلَمُ بما يَصلُحُ)، واتە: (تَوَكُّل) بریتیە لە: پشت بەستن بە غەیرو مشوورخواردن عایدی ئەو کردن، لە ئەنجامی متمانە هەبووندا، بەوە کە ئەو زاناترە : چی چاکەو چۆن بۆ ئەو باشە !

ئەوەی تێبینی دەکرێ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بەرپەرچی ئەو قسەیەی نەیارەکانی خۆیانیان نەداوەتەوە، کە گوتوویانە: ﴿ تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا ﴾، دەتانەوێ لەوە لامان بدەن کە باب‌و باپیرانمان پەرستوویانە. وەلامی ئەوەیان نەداوەتەوە، چونکە: ئەو قسەیان ڕاست بووە، پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) هاتوون ئەو خەڵکە لەو ڕێچکەو کوێرە ڕێیانە دەرباز بکەن، کە باب‌و باپیران‌و پێشینانیان لەسەریان بوون، ئنجا بۆیە وەلامیان نەداونەوە، چونکە قسەکەیان، زۆر قسەیەکی بێ جێیەو زۆر نامەنتیقییە: ئایا باب‌و باپیرانتان ئەگەر لەسەر ڕێیەکی هەڵەبن، دەبێ ڕەخنە لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بگیرێ، کە ئێوە لە ڕێی هەڵە بگێڕنەوەو بتانخەنە سەر ڕاستە ڕێ؟! قسەکەیان زۆر نامەنتیقیی‌و بێ جێیە، ئنجا تۆمەتەکەش ڕاست بووە: پێغەمبەران ویستوویانە ئەوان لەو ڕێچکەو کوێرە ڕێیانە دەرباز بکەن، کە باب‌و باپیرانیان لەسەریان بوون، لەلایەکەوە تۆمەتەکە ڕاستەو، لەلایەکی دیکەشەوە قسەکەی هێندە بێ جێیەو هێندە نامەنتیقییە، کە بە پێویستیان نەزانیوەو بگرە هەر شایانی باسیان نەزانیوە، تاکو بەرپەرچی بدەنەوە .

<u>مەسەلەی پێنجەم</u> : هەڕەشەکردنی بێ بڕوایان لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بە دەرکران لە وڵات، یاخود هەڵگەڕانەوە :

ئەمەش لە بەشێکی ئایەتی ژمارە (١٣)دا هاتوە :

خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە ، لە دوو برگەدا:**

**برگەی یەکەم :** - ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِرُسُلِهِمْ ﴾، ئەوانەی بێبڕوا بوون، بە پێغەمبەرەکانی خۆیانیان گوت، چییان پێگوتن ؟ لە برگەی دووەم دا هاتوە :

**برگەی دووەم :** - ﴿ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ﴾، یان لەسەر زەمینی خۆمان دەرتاندەکەین، یان دەبێ بگەڕێنەوە نێو ڕێبازەکەی ئێمە .

لێرەدا، وەك لە سوورەتی (الكهف)یشدا هاتوە، کە هاوەڵانی ئەشکەوت لە بەینی خۆیاندا ڕاوێژ دەکەن، دوای ئەوەی کە لە خەوی سێ سەدو نۆ (٣٠٩) ساڵە بێداریان دەبێتەوەو، یەکێکیان دەنێرن کە خواردنیان بۆ بێنێ، نازانن کە ماوەی سێ سەدو نۆ (٣٠٩) ساڵە خەوتوون، ئنجا لە نێو خۆیاندا دەڵێن: ﴿ إِنَّهُمْ إِن يَظْهَرُواْ عَلَيْكُمْ يَرْجُمُوكُمْ أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِى مِلَّتِهِمْ ﴿٢٠﴾ ﴾، واتە: ئەو خەڵکە، ئەو کۆمەڵگایەی خۆتان، ئەگەر بێتو پێتان بزانن، یان بەرد بارانتان دەکەن، یاخود دەتانگێڕنەوە نێو ئایین و ڕێبازەکەی خۆیان، کە ئێوەش لەدەست ئەو ئایین و ڕێبازە چەوتو هەڵەیە، کە بریتیە لە پەرستنی غەیری خوا، ڕاتانکردووەو، پەناتان بۆ ئەشکەوت بردوە !

هەروەها لە سوورەتی (الأعراف)یشدا خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ مِن قَوْمِهِۦ لَنُخْرِجَنَّكَ يَٰشُعَيْبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ﴿٨٨﴾ ﴾، واتە: دەستڕۆیشتووە خۆ بە زلگرەکانی گەلەکەی، (واتە: گەلی شوعەیب عليه السلام کە خەڵکی مەدیەن بوون)، گوتیان: ئەی شوعەیب! خۆتو ئەوانەی کە بڕوایان بە تۆ هێناوە، لە سەرزەمینی خۆمان دەرتاندەکەین، یاخود دەبێ بگەڕێنەوە نێو ڕێبازەکەی ئێمە .

کەواتە: ئەمە لۆژیکێکی لە مێژینەی ئەهلی کوفر بووە لە بەرانبەر پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)داو، لە بەرانبەر ئەهلی ئیمانیشدا بەگشتی

ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە کە هەمیشە ئەهلی کوفر دەڵێن: ﴿ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ ﴾، لە سەرزەمینی خۆمانو لە وڵاتی خۆمان دەرتاندەکەین! وەك ئەو پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)و ئەو بڕوادارانە، بەشیان بەو وڵاتو خاکەوە نەبێت! ئەدی هەموویان خەڵکی نیشتیمانێكو هاووڵاتییانی وڵاتێك نین؟ بۆچی دەبێ وێك هەڵنەکەن؟ بۆچی دەبێ یەکدی تەحەممول نەکەن؟ وەك شوعەیب ﷺ – کە پێشتر لە سووڕەتی (الأعراف)دا باسمان کرد – فەرموویەتی: ﴿ وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمْ ءَامَنُواْ بِالَّذِىٓ أُرْسِلْتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٌ لَّمْ يُؤْمِنُواْ فَاصْبِرُواْ حَتَّىٰ يَحْكُمَ اللَّهُ بَيْنَنَا وَهُوَ خَيْرُ الْحَٰكِمِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾، واتە: ئەگەر کۆمەڵێك لە ئێوە بڕوایان بەوە هێنا کە من هێناومەو، کۆمەڵێکیش بڕوایان پێ نەهێنا، خۆڕاگر بن، واتە: یەکدی تەحەممول بکەن، تاکو خوا دادوەریی دەکات .

واتە: یان ئەوانەی بێبڕوان، بەرچاویان ڕۆشن دەبێتەوەو، قەناعەتیان دێ کە بڕوابێنن، یان گۆڕانکارییەك دەبێ، یانی: دەبێ یەکدی تەحەممول بکەینو، پێکەوە بسازێینو پێکەوە مەدار بکەین، نابێ یەکێکیان ئەوی دیکە ناچار بکات، بار بکات، بەڵکو (دەبێ پێکەوە مەدار بکەن، نەك بە یەکدی بار بکەن).

لێرەدا کە خوا ﷻ لەسەر زمانی کافرەکان دەفەرموێ: ﴿ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ﴾، هەندێك لە زانایانی لێکۆڵەرەوەی قورئان، پرسیارێکیان وروژاندوە، گوتوویانە: وشەی (عَود) بریتیە لە گەڕانەوەی کەسێك بۆ شتێك دوای ئەوەی لێی جیابۆتەوە، ئنجا دەڵێن: خۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) هەرگیز لەسەر ڕێچکەی کافرەکان نەبوون، ئەدی بۆچی دەڵێن: دەبێ بگەڕێنەوە ؟

وەڵامەکەی ئەوەیە کە ئەوانە خۆیان لە هاوبەش دانەرو کافرەکان دوورە پەرێز گرتوە، بەڵام لەگەڵیاندا مەداریان کردوە، ئنجا کافرو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، وایانزانیوە کە پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) هاوڕان لەگەڵیاندا، واتە: ئەوەندە تەباو گونجاو بوون، ئەوەندە بە زەوقو سەلیقە بوون لەگەڵ کۆمەڵگاکەیاندا، گومانیان پێ بردوون، کە ئەوانیش هەمان بیرو

بڕوای وانیان هەبێت، دوایی کە تێکگیراون، گوتوویانە: دەبێ بگەڕێنەوە! وایانزانیوە کە پێشتریش هەر لەسەر ڕێچکەو ڕێبازی ئەوان بوون.

**مەسەلەی شەشەم :** تەدەخخول کردنی خوا ﷻ و سروشکردنی بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) کە: بە دڵنیایی کافرانی ستەمکار دەفەوتێنێ و، لەوانیان لە شوێن دادەمەزرێنێ :

کە ئەمەش لە بەشێکی ئایەتی ژمارە (١٣)و ئایەتی ژمارە(١٤)دا هاتوە :

خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٣﴾ وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِى وَخَافَ وَعِيدِ ﴿١٤﴾ ﴾.

**تـوێـژینـەوەی ئـەم دوو ئـایـەتە بەپێـی ، لە چوار بڕگـەدا :**

**بڕگەی یەکەم :** - ﴿ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ ﴾، پەروەردگاریان سروشی بۆ کردن، بۆ کێ ؟ بە دڵنیایی بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) پێشتر لە تەفسیری سوورەتی (یونس)دا، لێکۆڵینەوەیەکی تێرو تەسەلمان کردوە، دەربارەی وەحیی، کە وەحیی لە ئەصڵدا بە قسەیەکی پەنهان دەگوترێ، ﴿ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ ﴾، واتە: بە شێوەیەکی پەنهان پەروەردگاریان پەیامی بۆ ناردن، ئایا پەیامەکەی چی بوو ؟

**بڕگەی دووەم :** - ﴿ لَنُهْلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، ئەو (ل)ە بۆ تەئکیدەو بۆ جەخت کردنەوەیە، واتە: بە جەختکردنەوەو بە دڵنیاییەوە، ئێمە ستەمکاران دەفەوتێنین، واتە: ئەو ستەمکارانەی کە دەیانەوێ ئێوە لە وڵاتو نیشتمان دەربکەن، دەیانەوێ شاربەدەرتان بکەن، دەیانفەوتێنین .

خوا ﷻ بە ئیرادەی قەدەریی‌و تەکوینیی خۆی، ڕێی کوفرو ڕێی ستەم (ظلم)یشی داوە، بەڵام لە شەریعەتەکەی دا تەنیا ڕێی کوفری داوەو، ڕێی ستەم (ظُلم)ی نەداوە، بۆ وێنە: خوا ﷻ لە سووڕەتی (الكهف)دا دەفەرموێ : ﴿ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴾، واتە: کێ حەز دەکات با ئیمان بێنێ‌و کێ حەز دەکات با کافر بێ، هەڵبەتە خوا حەز بە ئیمان دەکات‌و ڕقی لە کوفرە، بەڵام بۆ تاقیکردنەوە، ڕێ دەدا بە بەندەکان کوفر هەڵبژێرن، بەڵام شەریعەتی خوا ڕێی بە ستەم (ظُلم) نەداوە، چونکە ستەم (ظُلم) وڵات تێکدەدات، بە کوفرو ئیمان خەڵك پێکەوە دەژین، بەڵام بە ستەم، پێکەوە ناژین، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ لَنُهْلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٣﴾ ﴾، بە تەنکید ئێمە ستەمکاران دەفەوتێنین .

**بڕگەی سێیەم :** - ﴿ وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ﴾، ئێوە لە دوای وان لە زەمیندا نیشتەجێ دەکەین .

ئەم (أل) سەر وشەی (ٱلْأَرْضَ)، (أل)ی (عهد)ی پێ دەڵێن ، کە بۆ ناساندن (تَعريف)ە، واتە: لەو سەرزەمینەدا کە ئەوان هەڕەشەی پێ لە ئێوە دەکەن، کە لەوێدا دەربەدەرتانکەن‌و شار بەدەرتان بکەن، ئا لەو سەرزەمینەدا، دوای فەوتاندنی ئەوان، ئێوە باڵادەست دەکەین‌و ئێوە نیشتەجێ دەکەین .

**بڕگەی چوارەم :** - ﴿ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِى وَخَافَ وَعِيدِ ﴾، ئەوەش بۆ کەسێکە لە پایەو پێگەی من بترسێ‌و، لە هەڕەشەو ترساندنی من، بیمی هەبێت .

وشەی: (مَقَام): (مَكانُ القِيام، وَيُرَادُ بِهِ مُطلَقُ الوُجُود)، کە دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِى ﴾، واتە: لە پێگەی من، لە پلەو پایەی من، یاخود لەمن بترسێ، وشەی (وَعِيدِ)یش، یانی: هەڕەشە، (وَعِيدِ)، خوێندراویشەتەوە : (وَعيدي)، واتە: ئەگەر (ي)ەکەشی نەبێت، بە تەنکید ژێرەکە (كسرة ـِ)، لە جێی (ي) دانیشتوەو جێگای گرتۆتەوە، یانی: کەسێك کە لە من بترسێ‌و

لە هەڕەشەی من بترسێ، نەك لە هەڕەشەی دوژمنانو ناحەزانم، ئەوە شایستەی ئەوە دەبێ، من ئاوا لە فریای بێمو، پشتی بگرمو هاوكاری بم .

ئنجا خوا ﷻ کە دەفەرموێ : ﴿ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ ﴿١٤﴾ ﴾، واتە: ئەوەم بۆیە بۆ ئێوە کرد، ئەی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، چونکە ئێوە ئاوا بوون، تەنیا لە پێگەو پایەی من دەترسانو، تەنیا لە هەڕەشەی من دەترسانو، بێ منەتو بێ باك بوون لە هەڕەشەی كافرەكان، کەواتە: لە دوای پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) هەر کەسێك بەو شێوەیە بێ، خوای كارزانو پەروەردگار هەر ئاوای بۆ دەكات .

**مەسەلەی حەوتەم :** داوای یارمەتی کردنی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)و، بێمرادبوونی ملهوڕانو، گیرۆدەبوونیان بە دۆزەخو، خواردنەوەی کێمو زووخاو، پەلاماردرانیان بە مەرگ، لە هەموو لایەکەوە :

خوا دەفەرموێ : ﴿ وَٱسْتَفْتَحُوا۟ وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿١٥﴾ مِّن وَرَآئِهِۦ جَهَنَّمُ وَيُسْقَىٰ مِن مَّآءٍ صَدِيدٍ ﴿١٦﴾ يَتَجَرَّعُهُۥ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُۥ وَيَأْتِيهِ ٱلْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ ۖ وَمِن وَرَآئِهِۦ عَذَابٌ غَلِيظٌ ﴿١٧﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم سێ ئایەتە بەپێزە، لە حەوت بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم :** ﴿ وَٱسْتَفْتَحُوا۟ ﴾، (الإستِفتاحُ: طَلَبُ الفَتحِ وهُوَ النَّصرُ)، (إستِفتاحُ) بریتیە لە: داواکردنی (فَتح) کە بریتیە لە: سەرکەوتنو یارمەتیی، کێ داوای یارمەتیی کرد؟ بە پێی سیاق دیارە کە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) داوای یارمەتییان کردوە، ئنجا ئەمە هەرچەندە خوا ﷻ دوایی باسی دەكات، بەلام واپێدەچێ پێش ئەوەی خوا ﷻ وەحییان بۆ بنێرێ، کە ستەمکاران دەفەوتێنینو، ئێوەیان لە شوێندا نیشتەجێ دەکەین، پێغەمبەران

(عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلَام) ئەو داوایەیان لە خوای میهرەبان کرد بێ، داوای یارمەتیی‌و کۆمەکییان لێ کردبێ .

دەشگونجێ دوای ئەوەی خوا ﷻ وەحیی بۆ ناردوون‌و ئاگاداری کردوونەوە، ئنجا ئەوان دەستیان کرد بێ بە پاڕانەوە، چونکە زانیویانە کە کاتی ئەوە هاتووە خوا ئەو ستەمکارانە لەبەین بەرێ، خواش هەواڵی پێداون کە لە بەینیان دەبات، بەڵام کەنگێ لە بەینیان دەبات، لە چ کاتێکدا؟ ئەوە یەکی لەسەر ئەوە کەوتووە کە پێغەمبەران دەبێ داوا لە خوا بکەن‌و، لە خوا بپاڕێنەوە بۆئەوەی کە خوا ﷻ کات‌و چۆنیەتییەکەیان پێ بڵێ‌و، ئاگاداریان بکاتەوە لێی .

**بڕگەی دووەم :** - ﴿ وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿١٥﴾ ﴾، (الخَيبة: فَوتُ الطَّلَب) واتە: (خَيْبَة) بریتیە لە: لەدەستچوونی ئامانج، لەدەستچوونی شتێك کە ئینسان بەدوایدا چووە، واتە: بێمرادبوون‌و بێ ئاکام بوون، ﴿ وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴾، هەر ملهوڕێکی نەسەلمێن، پەشێمان بوو، بێمراد بوو .

پێشتر هەر کام لە وشەی: (جَبَّارٍ)و (عَنِيدٍ)مان شی کردوونەوە، کە (جَبَّارٍ) بە مانای : بابای ملهوڕو خۆسەپێن‌و خۆ فەرزکەر دێ، (عَنِيدٍ)یش بە مانای : بابای کەللەڕەق‌و نەسەلمێن دێ، کە هەرچەندە هەق دەزانێ، بەڵام لە بەرانبەریدا تەسلیم نابێ‌و نایسەلمێنێ‌و بۆی ملکەچ نابێ .

**بڕگەی سێیەم :** - ﴿ مِّن وَرَآئِهِۦ جَهَنَّمُ ﴾، لە پشت ئەو کەسە ملهوڕە نەسەلمێنەوە، دۆزەخ هەیە، لە پشتیەوە یانی چی؟! ئینسان ئەگەر شتێك لە پشتیەوە بێ، نایبینێ، ئنجا ئەوانەش چونکە حیساب بۆ دۆزەخ ناکەن‌و بڕوایان پێی نیە، وەك ئەوە وایە لە پشتیانەوە بێ‌و نەیبینن، ئەوە واتایەکی .

واتایەکی دیکەی ئەوەیە، کە لە زمانی عەرەبییدا (وَرَاء) یانی : لای پشتەوەی مرۆڤ، بەڵام بەو ئیعتیبارەی لە پێشیەوەیەو، بەرەو ڕووی دەچێت، وەك لە سووڕەتی (الكهف)دا، هاتووە: ﴿ وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا ﴿٧٩﴾ ﴾، واتە: لە پشتیانەوە پادشایەك هەبوو، کە هەر کەشتییەکی تازەو نوێی دەست بەسەردا دەگرت.

کە بە تەئکید لەسەر ئەو ڕێیە بووە، کە پێیدا ڕۆیشتوون، کەواتە: دەبێ لە پێشیانەوە بوو بێ، بەڵام بە ئیعتیبارێکی دیکە ئەو وشەیە بەکارهاتوە: (الوَراءُ مُستَعمَلٌ في مَعنى ما يَنتَظِرُهُ، وَيَحِلُّ بِهِ مِن بَعدُ، فَاستُعيرَ لِذلِكَ بِجَامِعِ الغَفلَةِ عَنِ الحُصولِ، كَالشَّيءِ الذي يَكونُ مِن وَراءِ المَرءِ، لا يَشعُرُ بِهِ، لأَنَّهُ لا يَراهُ)، واتە: وشەی (وَرَاء)، بەکارهێنراوە لە مانای شتێکدا کە چاوەڕێی دەکات دوایی بەسەری بێ، ئنجا لێرەدا خوازراوەتەوە، لەبەرئەوەی بێئاگایی هەردووکیان کۆدەکاتەوە، وەك شتێك کە لە پشتەوەی مرۆڤە، لێی بێئاگایە (شتێکیش کە دوایی بەرەو ڕووی دێ‌و، چاوەڕێ دەکات بەسەری بێ، لەویش بێئاگایە)، کەسێك هەست بە شتێك نەکات، لێی بێئاگایە، (بۆیە وەك ئەوە وایە: ئەو شتە لە پشتیەوە بێ، چونکە شتێك کە لە پشتیەوە بوو، نایبینی) .

<u>بڕگەی چوارەم</u> : - ﴿ وَيُسْقَىٰ مِن مَّآءٍ صَدِيدٍ ﴾، لە ئاوێکی زووخاو پێی دەخورێتەوە، بە گەرووی دادەگرێ، واتە: بە ناچاریی پێی دەخورێتەوەو، بە زۆر بە گەرووی دا دەگرێ، ئەگەرنا وانیە کە بۆخۆی ئارەزووی بۆی بچێ‌و بیخواتەوە !

(صَدِيدٍ )، واتە: کێم‌و زووخاو، ئەوەی کە لە برین پەیدا دەبێ، ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿ مِن مَّآءٍ صَدِيدٍ ﴾، واتە: شلەمەنییەك کە بریتیە لە : کێم‌و زووخاو، یاخود بە ڕواڵەت ئاوە، بەڵام لەڕاستییدا کێم‌و زووخاوە .

<u>بڕگەی پێنجەم</u> : - ﴿ يَتَجَرَّعُهُۥ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُۥ ﴾، زۆر بە زەحمەت قووتی دەداو، نزیك نیە کە بە گەروویدا بچێت بە ئاسانیی .

(التَّجَرُّعُ: بَلْعُ المَرءِ الماءَ بِصُعُوبة)، واتە: (تجَرُّع) بریتیە لەوەی ئینسان ئاو بە زەحمەت قووت بدات، ئنجا خوا دەفەرموێ: ئەو کێم‌و زووخاوە کە بە گەروویدا دەگرێ‌و پێی دەخورێتەوە، زۆر بە زەحمەت قووتی دەدا، ﴿ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُۥ ﴾، هەر نزیکیش نیە بە ئاسانیی بە گەروویدا بچێ، بەڵکو بە قورسیی‌و بە زەحمەت بۆی قووت دەچێ، چونکە (سَاغَ، يَسيغُ، فَهو

سائِغٌ)، (سائغ) ئەوەیە كە شتێك بە ئاسانیی بە گەرووی ئینساندا بچێت، بەبێ ئەوەی گرفتی هەبێت و لە قوڕگی بگیرێ .

**بڕگەی شەشەم :** - ﴿وَيَأْتِيهِ الْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ﴾، لە هەموو لایەكەوە مردنی بۆ دێ، بەڵام ناشمرێ .

واتە: هۆكارەكانی مەرگ هەموویانی لە دەورن، هەموویان ئابڵووقەیان داوە، وەك كەسێك كە زۆر نەخۆشە، دەڵێن: كوێت دێشێ؟ دەڵێ: هەموو بەدەنم دێشێ، هەموو ئەندامەكانم دێشن، ئەو كەسەش كە ئاوا دووچاری ئەو سزایەی دۆزەخ دەبێ، هەموو هۆكارەكانی مردن ئابڵووقەیان داوەو، لە هەموو لایەكەوە مردنی بۆ دێ، ئەگەر مردن هەبێ، بەڵام بە تەئكید لە نێو دۆزەخدا مردن نیە، هەروەك لە بەهەشتیشدا مردن نیە .

**بڕگەی حەوتەم :** - ﴿وَمِن وَرَآئِهِ عَذَابٌ غَلِيظٌ﴾، لە پشتیەوەش ئازارێكی بێ ڕەزاو قورس و زبر هەیە، وشەی (غَلیظ)، بۆ هەر شتێكە كە زبرو قورس و بێ ڕەزاو سەخت بێ .

**مەسەلەی هەشتەم و كۆتایی :** وێناكردنی كردەوەی كافران، بە خۆڵەمێشی بەر بایەكی بەهێز لە ڕۆژێكی ڕەشەباویدا، (ڕۆژێك كە ڕەشەبای تێدا بێ)، ئنجا بایەكی بەهێز كە لە خۆڵەمێشێك دەدا، چۆن تەفرو تونای دەكاو پەرژو بڵاوی دەكات، ئەوانەی بێ بڕواشن، لە ڕۆژی دواییدا، كردەوەكانیان ئاوایان لێدێ ! :

خوا دەفەرموێ : ﴿مَّثَلُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ أَعْمَالُهُمْ كَرَمَادٍ اشْتَدَّتْ بِهِ الرِّيحُ فِي يَوْمٍ عَاصِفٍ لَّا يَقْدِرُونَ مِمَّا كَسَبُوا عَلَى شَيْءٍ ذَلِكَ هُوَ الضَّلَالُ الْبَعِيدُ ﴿١٨﴾﴾ .

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە ، لە پێنج برگەدا:**

**برگەی یەکەم :** - ﴿ مَّثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ ۖ أَعْمَـٰلُهُمْ ﴾، وێنەی کردەوەی ئەوانەی بێبڕوا بوون بە پەروەردگاریان .

وشەی (مَثَل) بە واتای سیفەت دێ، بە واتای وەسف دێ، هەروەها بە واتای حاڵەتێکی سەرسوڕهێنەر، دێ، (المَثَلُ: الحالةُ العَجيبة)، واتە: حاڵەتی سەرسوڕهێنەری کردەوەی ئەوانەی کە بە پەروەردگاریان بێبڕوان، بەو شێوەیە :

**برگەی دووەم :** - ﴿ كَرَمَادٍ ٱشْتَدَّتْ بِهِ ٱلرِّيحُ ﴾، وەك خۆڵەمێشێکە بایەکی توند لێی بدات .

هەڵبەتە خۆڵەمێش، بای توندیش لێی نەدا، هەر با لێی بدات، رایدەماڵێ، چ جای بایەکی توند لێی بدات !

(رَماد)، بە کوردیی دەڵێین: خۆڵەمێش، دارو خەڵووزو هەر شتێك کە دەسووتێنرێ، پاشماوەکەی کە لێی دەمێنێتەوە، پێی دەگوترێ: خۆڵەمێش .

**برگەی سێیەم :** - ﴿ فِى يَوْمٍ عَاصِفٍ ﴾، (یانی: ئەو بایەی کە لێشی دەدا، بایەکەش) لە رۆژێك دایە کە بایەکی رامالەری زۆر بەهێزی تێدایە، واتە: ئەوە نیە بایەك بێ و کتوپڕ بێ، بەڵکو هەر رۆژەکە بۆخۆی بایەکی بەهێزی تێدایە .

(عَاصِفٍ)، (وَصفُ اليَومِ بالعاصِفِ مَجازٌ عَقليٌ، أي: عاصِفٌ رِيحُهُ، مِثلَ يَومٌ ماطِرٌ، أي: سَحابُهُ)، واتە: ﴿ يَوْمٍ عَاصِفٍ ﴾، لێرەدا مەجازێکی عەقلییە، بەو واتایەی ئەو بایەی هەڵیکردوە، ئەگەرنا رۆژەکە بۆخۆی هەڵناکات .

کەواتە: ﴿ يَوۡمٍ عَاصِفٍ ﴾، (يَعني: يومٍ عَاصِفٍ رِيحُهُ)، ڕۆژێکە بایەکەی بە توندیی هەڵیکردوە، واتە: ڕۆژەکە بۆخۆی، ڕۆژێك بووە هەر لە سەرەتاوە بای تێدا هەبووە، ئنجا بایەکی بەهێز، لەو ڕەشەبایەی لە سەرتاپای ئەو ڕۆژەدا هەڵیکردوە، لە خۆڵەمێشێك بدا، بە تەئکید وەك کوردەواریی گوتوویانە: (دەبێتە بە تۆزی بەر با)! واتە: تۆز، یان خۆڵەمێش کە دەخرێتە بەر با، بێگومان تەفرو تونا دەبێ‌و، پرژو بڵاو دەبێ .

<u>**برگەی چوارەم**</u> : ﴿ لَّا يَقۡدِرُونَ مِمَّا كَسَبُواْ عَلَىٰ شَيۡءٖۚ ﴾، لەوەی کە وەدەستیان هێناوە دەستیان بە هیچی ناگا، بە هیچی ڕاناگەن، هیچی لە ژێر ڕکێفیاندا نامێنێتەوەو هەمووی دەڕوا .

بێبڕوایەکانیش – ئینسان بێبڕوا بێ، یان بڕوادار بێ، کەم‌و زۆر کردەوەی باشی هەر هەن – ئنجا ئەوانە کردەوە باشەکانیان، وەك خۆڵەمێش‌و تۆزی بەر بایان لێدێ‌و، دەستیان بە هیچی ڕا ناگات .

<u>**برگەی پێنجەم**</u> : ﴿ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلۡبَعِيدُ ﴾، ئا ئەو حاڵەتەی کە بۆ بێبڕوایەکان دێتە پێش، ئا ئەوە گومڕاییەکی دوورە، لە ڕێ دوور کەوتنەوەیەکی زۆر دوورەو، زۆر دوور ڕۆیشتوون‌و، بە زەحمەت دێنەوە سەر ڕێ.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بکەم، بە دوو فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەگەر بێت‌و ئینسان کردەوەکانی بۆ خوا نەبن‌و، لە کردەوەکانی دا نیەتی بۆ خوا بوون‌و، تەنیا خوا پێ مەبەست بوونی، نەبێ، نابێتە خاوەنیان لە دواڕۆژدا، با ئیمانداریش بێ‌و با مسوڵمانیش بێ، هەڵبەتە لێرەدا خوا باسی کافرەکان دەکات، بەڵام ئەو سیفەتە کە کردەوەیەك دەکەی‌و مەبەستت پێی خوا نەبێ، ئەوە سیفەتی کافرانە، بەڵام جاری وایە ئینسان مسوڵمانە، بەڵام سیفەتێك یاخود زیاتر لە سیفەتێکی کافرانی تێدایەو، جاری وایە کەسێك کافرە، بەڵام سیفەتێك یان زیاتر لە سیفەتێکی بڕوادارانی تێدایە .

دوو فەرمایشتەکەش ئەمانەن :

فەرمایشتی یەکەم : پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {مَنْ تَعَلَّمَ الْعِلْمَ لِيُبَاهِيَ بِهِ الْعُلَمَاءَ، وَيُجَارِيَ بِهِ السُّفَهَاءَ، وَيَصْرِفَ بِهِ وُجُوهَ النَّاسِ إِلَيْهِ، أَدْخَلَهُ اللَّهُ جَهَنَّمَ} (أخرجه ابن ماجة برقم: ٢٦٠، عَن أبي هُرَيْرَة، حسنه الألباني في (صحيح ابن ماجة) برقم: ٢٠٩).

واتە: هەر کەسێك زانیاریی فێربێت، تاکو خۆی پێ بەسەر زانایاندا هەڵکێشێ، یاخود مشتومڕو دەمبەدەمەی پێ لەگەڵ خەڵکی نەفامدا بکات،و، بۆئەوەی ڕووی خەڵکی بەرەو لای خۆی پێ وەچەرخێنێ، خوا دەیخاتە دۆزەخەوە.

چونکە زانیاریی شتێکی پیرۆزەو دەبێ بۆیە پەیدا بکرێ کە لە خوات نزیك بکاتەوەو، خۆت و خەڵکی پێ چاك بکەی، نەك خۆی پێ بەسەر خەڵکدا هەڵکێشیو، مشتومڕی لەگەڵ نەفاماندا پێ بکەیو، سەرنجی خەڵکی پێ بەلای خۆتدا ڕابکێشی .

فەرمایشتی دووەم: کە ماناکەی بە کورتیی دێنمو لە (صحيح مسلم)دا، هاتوە :

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {إِنَّ أَوَّلَ النَّاسِ يُقْضَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَيْهِ، رَجُلٌ اسْتُشْهِدَ، فَأُتِيَ بِهِ، فَعَرَّفَهُ نِعْمَتَهُ، فَعَرَفَهَا، قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا؟ قَالَ: قَاتَلْتُ فِيكَ حَتَّى اسْتُشْهِدْتُ، قَالَ: كَذَبْتَ، وَلَكِنَّكَ قَاتَلْتَ لأَنْ يُقَالَ: جَرِيءٌ! فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ، وَرَجُلٌ تَعَلَّمَ الْعِلْمَ وَعَلَّمَهُ، وَقَرَأَ الْقُرآنَ، فَأُتِيَ بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا، قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا؟ قَالَ: تَعَلَّمْتُ الْعِلْمَ وَعَلَّمْتُهُ، وَقَرَأْتُ فِيكَ الْقُرآنَ، قَالَ: كَذَبْتَ، وَلَكِنَّكَ تَعَلَّمْتَ لِيُقَالَ: عَالِمٌ! وَقَرَأْتَ الْقُرْآنَ لِيُقَالَ: هُوَ قَارِئٌ! فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ، وَرَجُلٌ وَسَّعَ اللَّهُ عَلَيْهِ، وَأَعْطَاهُ مِنْ أَصْنَافِ الْمَالِ، فَأُتِيَ بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ، فَعَرَفَهَا، قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا؟ قَالَ: مَا تَرَكْتُ مِنْ سَبِيلٍ تُحِبُّ أَنْ يُنْفَقَ فِيهَا إِلاَّ أَنْفَقْتُ فِيهَا لَكَ، قَالَ: كَذَبْتَ، وَلَكِنَّكَ فَعَلْتَ لِيُقَالَ: جَوَادٌ! فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ}، أخرجه مسلم برقم: (٥٠٣٢) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ .

واتە :

١/ یەکەمین کەس کە لە ڕۆژی قیامەتدا سزای بەسەردا دەدرێ، پیاوێکە شەهید کراوە، دەهێنرێ، خوا چاکەی خۆی دەخاتەوە بیری و ئەویش دانی پێدادێنێ، ئەویش دەفەرموێ : ئایا چیت پێ کرد ؟

دەڵێ : لە پێناوتدا جەنگم کرد تاکو شەهید بووم .

دەفەرموێ: در دەکەی بۆیە جەنگای تاکو بڵێن: بوێرەو واشگوترا !

دوایی فەرمانکرا لەسەر ڕووی ڕاکێشراو فرێدرایە ئاگرەوە .

٢/ هەروەها پیاوێك کە زانیاریی فێربووەو فێری خەڵکی کردووەو قورئانی خوێندوە دەهێنرێ (خوا) چاکەکانی خۆی دێنێتەوە یادو ئەویش دانیان پێدادێنێ .

خوا دەفەرموێ: چیت پێکردن ؟

دەڵێ: زانیاریی فێربووم و فێری خەڵکیم کردو قورئانم خوێند، لە پێناوی تۆدا !

دەفەرموێ : درۆ دەکەی: زانیاریی فێربووی تاکو بڵێن: زانایەو، قورئانت خوێند تاکو بڵێن : قورئانخوێنەو واشگوترا !

ئنجا فەرمانکرا : لەسەر ڕووی ڕاکێشراو فرێدرایە ئاگرەوە .

٣/ هەروەها پیاوێك خوا ماڵ و سامانێکی فراوانی جۆراو جۆری پێداوە، دەهێنرێ و (خوا) چاکەکانی خۆی دەخاتەوە یادو، ئەویش دانیان پێدا دێنێ .

(خوا) دەفەرموێ : چیت پێکرد ؟

دەڵێ: هیچ ڕێیەك نەبووە کە تۆ حەز بکەی تێیدا ببەخشم لە پێناوتدا، مەگەر بەخشیو .

(خوا) دەفەرموێ: درۆ دەکەی بەڵکو بۆیە بەخشیت، تاکو بڵێن سەخییەو واشگوترا .

ئنجا فەرمانکرا لەسەر ڕوو ڕاکێشرا هەتا فڕێدرایە ئاگرەوە .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

# دەرسی سێیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان پێنج (٥) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (١٩ - ٢٣)، لەو پێنج ئایەتەدا ، پێنج مەبەستی گرنگ خراونە ڕوو:

یەکەم : دروستکردنی ئاسمانەکانو زەوی، بە هەق .

دووەم : ئەگەر خوا بیەوێت مرۆڤەکان لادەباو، هی دیکە دێنێتە شوێنیان .

سێیەم : وتووێژێکی نێوان بێهێزانو خۆبەزلگران، کە لەڕێی کوفرو بێبڕوایی دا، شوێنیان کەوتوون .

چوارەم : حاشاکردنی شەیتان لە شوێنکەوتووانی لە ڕۆژی دواییدا .

پێنجەم : خرانە بەهەشتی بڕوادارانی کردەوە باش .

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۚ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ
جَدِيدٍ ﴿١٩﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴿٢٠﴾ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ جَمِيعًا فَقَالَ ٱلضُّعَفَٰٓؤُا۟ لِلَّذِينَ
ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا مِنْ عَذَابِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ۚ قَالُوا۟ لَوْ
هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيْنَٰكُمْ ۖ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ أَجَزِعْنَآ أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ ﴿٢١﴾
وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا قُضِىَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ
وَمَا كَانَ لِىَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى ۖ فَلَا تَلُومُونِى وَلُومُوٓا۟
أَنفُسَكُم ۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِىَّ ۖ إِنِّى كَفَرْتُ بِمَآ
أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٢﴾ وَأُدْخِلَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ ۖ تَحِيَّتُهُمْ
فِيهَا سَلَٰمٌ ﴿٢٣﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئایا نابینی کە خوا ئاسمانەکان‌و زەوی بە هەق دروستکردوون، (ئەی خەڵکینە !) ئەگەر (خوا) بیەوێ لاتان دەبات‌و، دروستکراوێکی تازە دێنێ ﴿١٩﴾ ئەوەش لەسەر خوا قورس‌و زەحمەت نیە! ﴿٢٠﴾ (لە قیامەتدا) تێکڕایان بۆ خوا هاتنە گۆڕێ، ئنجا بێهێزەکان بەوانەیان گوت کە خۆیان بەزلگرتبوو: ئێمە (لە دنیادا) شوێنکەوتووی ئێوە بووین، ئنجا ئایا هیچ شتێکمان لە سزاو ئازاری خوا لە کۆڵ ناکەنەوە (لێ دوور ناخەنەوە)؟ خۆ بەزلگرەکان گوتیان: ئەگەر خوا خستباینیە سەر ڕێی ڕاست، ئێمەش ئێوەمان دەخستە سەر ڕێی ڕاست، یەکسانە بۆمان: هەڵپەو ناڕەحەتیی بکەین، یان خۆڕاگر بین، هیچ قوتاربوونمان نیە! ﴿٢١﴾ ئنجا کاتێک کارەکە کۆتایی هات، شەیتان گوتی: بێگومان خوا بەڵێنی ڕاستی پێدان‌و، منیش بەڵێنم پێدان‌و ڕاستم نەکرد، هیچ دەسەڵاتێکیشم بەسەرتاندا نەبوو، جگە لەوەی بانگم کردن، ئێوەش وەڵامتان دامەوە (بەدەنگمەوە هاتن)، بۆیە سەرکۆنەی من مەکەن‌و، سەرکۆنەی خۆتان بکەن، نە من بەهاناتانەوە دێم نە ئێوەش لە فریای من دێن، من بێبەڕوام بەوەی کە پێشتر کردبووتانم بە هاوبەش (ی خوا)، بە دڵنیاییی ستەمکاران ئازارێکی بە ئێشیان هەیە ﴿٢٢﴾ ئەوانەش کە بڕوایان هێنابووو، کردەوە چاکەکانیان دەکردن، خرانە بەهەشتانێکەوە کە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن بە مۆڵەتی پەروەردگاریان، سڵاویان لەوێ دا بریتیە لە : سەلام ﴿٢٣﴾} .

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَبَرَزُواْ لِلَّهِ): واتە: بۆ خوا ئاشکرا بوون، بۆ خوا هاتنە گۆڕێ، (البرُوز: الخروجُ فِي مَكانٍ حاجِبٍ مِن بَيتٍ أو قَريةٍ، بَرزَ فلانُ لِفلانٍ: ظَهرَ وحَضرَ)، (بروز)، هاتنەدەرە لە شوێنێك كە پۆشرا بێ لە ماڵێك، لە ئاوەدانییەكدا، بێتە دەرێ، دەگوترێ : (بَرزَ لِفلانٍ)، واتە: بۆی ئاشكرا بوو، بۆی ئامادە بوو.

(إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا ): (التَّبَعُ: إسمُ جَمعِ التَّابعِ، مِثلُ: الخَدَم، والخَول)، وشەی (تَبَع)، ناوی كۆیە، بۆ (تَابِع)، (تَابِع) تاكەكەسیەتی، (تَبَع) كۆیەكەسیەتی، (تَابِع)، یانی: شوێنكەوتوو، (تَبَع)، یانی: شوێنكەوتووان، وەك (خَدَم) كە كۆی (خادِم)ە، (خَوَلْ) كە كۆی (خائِلْ)ە .

( مُّغْنُونَ ): (أغنَى عَنْهُ أي: كَفَاهُ أو أبْعَدَهُ عَنْهُ)، ئایا ئێوە هیچ لە ئازاری خوامان لێ دوور دەخەنەوە، هیچمان لە كۆڵ دەكەنەوە ؟

( أَجَزِعْنَآ ): (الجَزَعُ: حُزْنُ مَشوبٌ باضطِرَابٍ)، (جَزَع)، بریتیە لە دڵتەنگییەكی ئاوێتە لەگەڵ هەڵپەو ناڕەحەتیی و لەرەلەردا .

( مَّحِيصٍ ): (مَصْدَرُ مِيمِيٌّ كَالمَغِيبِ والمَشِيبِ، وهوَ النَّجَاةُ، حَاصَ عَنْهُ: نَجَا)، (مَحِيص)، چاوگێكی میمییە، وەك (مَغِيبُ)و (مَشِيب)، كە بە مانای ئاوا بوون و، سپیی بوون دێن، ئنجا (مَّحِيصٍ )، بە مانای دەربازبوونە، دەگوترێ: (حَاصَ عَنْهُ، أي: نَجَا)، واتە: دەربازی بوو، (مَّحِيصٍ )، بە مانای شوێنی دەربازبوون (مكان النَجَاة)یش، دێ .

( فَأَخْلَفْتُكُمْ ): واتە: بەڵێنی خۆم لەگەڵتاندا پێچەوانە بردە سەر، یاخود بەڵێنەکەم، درۆ بوو، (الإِخْلاَفُ: ضِدُّ الوَفَاءِ، أَي: كَذَبْتُ مَوْعِدي)، (إِخْلاف)، پێچەوانەی (وَفاء)ە، (وَفاء)، واتە: بەڵێن هێنانە دی، بەڵام (إِخْلاف)، واتە: بەڵێن نەهێنانە دیو، بێ بەڵێنیی، واتە: درۆم کرد لە بەڵێنەکەمدا .

( وَلُومُوٓاْ ): واتە: سەرکۆنە بکەن، (اللَّوْمُ: عَذْلُ الإِنْسَانِ، بِنِسْبَتِهِ إِلَى مَا فِيهِ لَوْم، يُقَالُ لُمْتُهُ فَهُوَ مَلُومٌ)، (لَوْم)، بریتیە لەوە کە ئینسان سەرزەنشتی کەسێك بکات، بەوە کە پاڵی بداتە لای شتێك، کە نەدەبوو بیکات، (مَلُومٌ)، واتە: سەرزەنشتکراو .

( مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ ): واتە: من دەفریاتان نایەم، (الإِصْرَاخُ: الإِغَاثَةُ، تُشْتَقُّ مِنَ الصُّرَاخِ، لِأَنَّ الـمُسْتَغِيْثَ يَصْرَخُ بِأَعلَى صَوْتِهِ، أَصرَخَهُ: إِذَا أَجَابَ صُرَاخَهُ)، (إِصْرَاخ)، بریتیە لە لەفریا هاتن، کە لە وشەی (صُراخ)، وەرگیراوە (صُراخ) یانی: هاوارکردن، چونکە کەسێك کە پەنا بە کەسێك دەبات، بە دەنگی بەرز هاواری تێدا دەبەستێ .

ئنجا (أَصْرَخَهُ)، واتە: وەڵامی دایەوەو دەفریای هات، کە دەڵێ: ﴿ مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ ﴾، واتە: من دەفریاتان نایەم، بە هاوارتانەوە نایەم .

( تَحِيَّتُهُمْ ): واتە: سڵاوکردنیان، سڵاوکردنی ئەهلی بەهەشت، لە بەهەشتدا بریتیە لە سەلام، ئایا (تَحِية) لە چییەوە هاتوە؟ (فالتَحِيَّةُ: أَنْ يُقَالَ حَيَّاكَ اللهُ، أَي جَعَلَ لَكَ حَيَاةً، وَذَلِكَ إِخْبَارٌ، ثُمَّ يجعل دُعَاءً)، (تَحِية) ئەوەیە کە بگوترێ: خوا بتژێنێ، یان ژیانت بە نسیب بکات، ئنجا ئەمە بریتیە لە هەواڵدان، بەڵام بە مانای دوعا بەکاردێ، کەواتە: (حَيَّا فُلاَنٌ فُلاَنا تَحِيَّةً، إِذَا قَالَ لَهُ: ذَلِكَ)، (حَيَّا فُلاَنٌ فُلاَنا تَحِيَّة)، واتە: پێیگوت (حَيَّاكَ الله) خوا بتژێنێ، ئنجا ئەهلی بەهەشت سڵاوەکەیان لە بەهەشتدا، بریتیە لە سەلام کردن .

## مانای گشتی ئایەتەکان

کە خوا ﷻ دەفەرموێ : (أَلَمۡ تَرَ ...) ئایا نازانی! ئایا نابینی! لێرەدا ڕووی دواندن دەگونجێ لە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺبێ، کە یەکەمین مرۆڤەو یەکەمین دڵو دەروونە، ئەم کتێبەی خوای پەروەردگاری بۆ سەر دابەزێنراوە: ﴿ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلۡأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلۡبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ ﴾الشعراء، واتە: (ٱلرُّوحُ ٱلۡأَمِينُ )، (کە جبریلە) دایبەزاندۆتە سەر دڵی تۆ، بۆئەوەی تۆ لە ورياکەرەوان‌و ئاگادارکەرەوان‌و ترسێنەران بی .

دەشگونجێ مەبەست هەر کەسێك بێ، کە قورئان دەخوێنێ‌و هەر مرۆڤێك بێ کە خوا دەیدوێنێ، بەڵێ، خوا قورئانی بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ ناردوە، بەڵام ناردوویەتی بۆ ئەوەی بیگەیەنێ بە هەموو بەندەکانی، واتە: ئەم قورئانە فەرمایشتی خوایەو، ڕووی دواندن تێیدا لە هەموو مرۆڤەکانە، هەر کەسێك کە خۆی وا لێ بکات : شایستەی ئەوە بێ: خوا بیدوێنێ، چونکە خوای پەروەردگار بە پەیامی خۆی هەموو مرۆڤەکانی دواندوون .

﴿ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّ ﴾، ئایا نابینی کە خوا ئاسمانەکان‌و زەوی بە هەق هێناونە دی ؟!

بێگومان لێرەدا مەبەست لە بینین (رُؤية)، (أَلَمۡ تَرَ) بینینی عەقڵییە، (الرُّوية هنا عَقلِية، ولَيسَتْ بَصَرِية)، (دیتن) لێرەدا دیتنی عەقڵییەو بینینی چاو نیە چونکە ئێمە بە چاوی سەر بۆمان دەرناکەوێ، کە چۆن خوا ﷻ ئاسمانەکان‌و زەوی بە هەق هێناوەدی، بەڵام بە عەقڵ ئەوە دەرك دەکەین، بە چاوی عەقڵ‌و دڵ ئەوە دەبینین، بە چاوی سەر ڕێك و پێکیی (نظام) لە

دروستكراوەكانی خوادا دەبینین، ئەو حاڵەتە سیستماتیك‌و یاساداریيەی كە خوا دایناوە لە گەردوونی خۆیدا، دەیبینین، بەشێكی بە چاوی سەر دەبینین، بە پێنج هەستەكان، بەگشتیی هەستی پێدەكەین‌و، زانیاریی دەربارەی دروستكراوەكانی خوا كۆدەكەینەوە، بەڵام ئەوەی كە شی دەكاتەوەو، دوایی بینا لەسەر ئەو زانیارییە كۆكراوانە بە پێنج (٥) هەستەكان، دەگاتە ئەو قەناعەتە كە ئەم گەردوونە، ئەم ئاسمان‌و زەوییە، ئەم دروستكراو (خلق)ە بە سەرو خوارییەوە بە هەق، دروستكراوە، نەك بە گاڵتەو، نەك بۆ یاریی‌و، نەك بێ حیكمەت‌و، نەك بە پووچ‌و بەهەوەنتە، ئەوە عەقڵە كە دەگاتە ئەو حەقیقەتە .

هەڵبەتە ئێمە لە سوورەتی (یونس)دا بە تەفصیلْ باسمان كردو، بابەتێكمان لەوبارەوە هێنا، كە چۆن خوا ﷻ لە پازدە شازدە (١٥ - ١٦) شوێن لە قورئاندا، باسی ئەو ڕاستییە دەكات، كە خوا ئاسمانەكان‌و زەوی بە هەق خوڵقاندوون، هەقیش واتە: شتی چەسپاوو شتی نەگۆڕو، شتێك كە لەگەڵ واقیعدا پڕ بە پێست بێت، بەڵام بە پێی سیاقیش، جاری وایە هەق بە مانای ڕاستیی دێت‌و، جاری واشە هەق، بە مانای حیكمەت دێت‌و، جاری واش هەیە، هەق، بە مانای شتی جیددیی دێت‌و، لە بەرانبەری دا: یاریی (لعب) هەیە، وەك خوا لە ئایەتەكانی: (٣٨ و ٣٩)ی سوورەتی (الدخان)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿٣٨﴾ مَا خَلَقْنَٰهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴾، ئاسمانەكان‌و زەوییمان بە یاریی دروست نەكردوون، تەنیا بە هەق دروستمان كردوون .

كەواتە: هەق لێرەدا لە بەرانبەر گەمەو یاریی (لعب) دایەو، یانی: جیددیی، یانی: حیكمەت لە دروستكرانی گەردوون (كون)دا هەیەو، ئەوە نیە كارێكی بێ حیكمەت بێ، وەك گەمەی منداڵان .

یان وەك لە سوورەتی (المؤمنون)دا دەفەرموێ : ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ ﴾، واتە: ئایا پێتان وایە بەهەوەنتەو بێ ئامانج دروستمان كردوون‌و، ناگێڕڕێنەوە بۆ لامان ؟!

(عَبَث) ئەوەیە: کە ئینسان شتێك بکا، هیچ ئامانجێکی نەبێ لە کردنی دا، (عَبَث) واتە: شتی پووچو، هەوەنتەو بێ حیکمەتو بێ ئامانج، بەڵام گەردوونێك کە خوا هێناویەتە دی، ئامانجی لە پشتەوەیە، ئامانجەکەش ئەوەی بۆ ئێمە دیارە، دیارترین ئامانج لە دروستکرانی گەردوون دا، بریتیە لە تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی، وەك لەو بابەتەدا کە لە سوورەتی (یونس)دا، ئاماژەم پێدا، بە تەفصیلێ باسمان کردوە .

ئنجا خوا دەفەرموێ : ﴿ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴾، ئەگەر (خوا) بیەوێ لاتان دەباتو دروستکراوی، تازە دێنێ، واتە: خوا یەکی لەسەر ئێوە نەکەوتوە ئەی مرۆڤەکان! خوا پەکی لەسەر مرۆڤان نەکەوتوە خوا دەتوانێ چەندان جۆرە دروستکراو دروست بکات، ئەوەتا فریشتەی دروست کردوە، ئەوەتا جینێی دروست کردوە، ئەوەتا مرۆڤی دروست کردوە، ئنجا ڕووەکی دروست کردوە، ماددەی بێ ژیانی دروست کردوە، ئاژەڵی دروست کردوە، لە ئاژەڵانیش دا: دڕندەی دروست کردوون، زیندەوەری دروست کردوون، پەلەوەری دروست کردوون، ژیاندارو زیندەوەری هەوایی دروست کردوون، کە لە هەوادا دەفڕن، هەروەها ژیاندارو ئاژەڵی ئاویی دروست کردوونو، هی بن زەوی، دروستکردوون، خوا ﷻ میکرۆبی دروست کردوە، ڤایرۆسی دروست کردوە، خوا دەتوانێ ئێوە لاباتو دروستکراوی دیکە بێنێ بۆ شوێنی ئێوە، یاخود ئێوە ئەی خەڵکینە! ئەگەر بەدەم بانگی خواوە نەیەن، ئێوە لادەباو خەڵکی دیکە دێنێ، خوا ﷻ دەستی کراوەیە، سیفەتەکانی خوا بێ سنوورن، دەسەڵاتی خوا، زانیاریی خوا، ڕەحمەتی خوا، هەموو سیفەتەکانی خوا، ڕەهاو بێ سنوورن .

﴿ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴾، ئەوە لەسەر خوا قورسو زەحمەت نیە .

وشەی (عَزیز)، بە مانای زاڵ دێو، بە مانای پتەو دێو، بە مانای (مَنیعُ الجانب) دێ، واتە: کەسێك خەڵك پێی نەوێرێ، دەرۆستی نەیەتو پێی نەوەستێ، دەڵێ: (العَزیز: الغَالِبُ الّذي يَغلِبُ، وَلا يُغلَب)، بێگومان خواش باڵادەستەو هیچ شتێك لەسەر خوا قورسو بەزەحمەت نیە .

ئنجا خوا ﷻ دیمەنێکی ڕۆژی دوایی، دەخاتە بەرچاوی ئێمەو بە کرداری ڕابردووش دەیهێنێ، وەك پێشینان گوتوویانە: (ئەمڕۆ دنیایە، سبەینێ قیامەتە)، ئایەتەکە وایە کە: ئێستا قیامەت هاتۆتە گۆڕێ‌و ڕۆژی دوایی هاتۆتە گۆڕێ، دنیا تێکچووەو ئاخیر زەمان (ساعة)و بگرە قیامەتیش هاتوە، ئەوە هیچ ئاخیر زەمان (ساعَة) هاتوە، پێچرانەوەی تۆماری ئەم ژیانەی ئێستا، ئەوە تێپەڕیوەو قۆناغێکی دیکە لە ژیان هاتۆتە گۆڕێ، کە بریتییە لە قیامەت‌و هەڵسانەوەی مرۆڤەکان‌و زیندووبونەوەیان‌و، دەست پێکردنی سزاو پاداشت‌و لێپرسینەوە !

بەڕێزان !

بۆ ئێمە کات (زَمَن) دەبێتە سێ بەش:

١/ بەشێکی تێپەڕیوە .

٢/ بەشێکی ئێستا تێیداین .

٣/ بەشێکی نەهاتوە، یانی: سێ کاتەکەی: (الماضي، والمُضارِع، والمُستَقبَل) بۆ ئێمەیە، بۆیە خوا ﷻ هەندێك لە کارەکانی، کە جارێ ئێستا نەهاتوون‌و، هی داهاتوون، بەڵام وەك ڕابردوو دەیانهێنێ، چونکە خوا ﷻ لە دەرەوەی سنووری کات‌و شوێنە! بۆ ئێمە کە مەحکوومی کات‌و شوێن (زَمان وَمَكان)ین، کات دەکەین بە سێ بەش: بەشێکی تێپەڕیوەو، بەشێکی ئێستایەو، بەشێکیشی نەهاتوە، بەڵام بۆ خوا ﷻ: لە دەرەوەی کات‌و شوێنەو بۆ وی ئەوە نییە .

لەلایەکی دیکەشەوە: ئەو شتانەی کە نەشهاتوون، چونکە خوا ﷻ خاوەنی هەموو شتێکەو، بەدیهێنەری هەموو شتێکەو، باڵادەستە بەسەر هەموو شتێکدا، ئەوەی نەشهاتوە، وەك ئەوەیە کە هاتبێ، ﴿ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴾، هەموویان تێکڕا بۆ خوا هاتنە گۆڕێ‌و ئاشکرا بوون، واتە: تێکڕای مرۆڤەکان، ﴿ فَقَالَ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ ﴾، بێهێزەکان بەوانەیان گوت کە خۆیان بە زل گرتبوو: ﴿ إِنَّا كُنَّا لَكُمۡ تَبَعٗا ﴾، ئێمە لە ڕابردوودا شوێنکەوتووی ئێوە بووین، واتە: لە دنیادا .

بە تەئکید لێرەدا مەبەست لە (ٱلضُّعَفَٰٓؤُا۟ )، واتە: ئەو کەسانەی کە بێ دەسەڵات بوون‌و، کەوتوونە شوێن حوکمڕانە ملهوڕو خۆ بەزلگرو کافرەکان، پێیان دەڵێن: ئێمە شوێنکەوتووی ئێوە بووین: ﴿فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا مِنْ عَذَابِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ﴾، ئایا ئێوە هیچ بەشێك لە ئازارو سزای خوا، لە ئێمە دوور دەخەنەوە؟ لە کۆڵ ئێمەی دەکەنەوە؟ ڕەنگە بە جیددییان بێت، هەندێك خەڵك وا هەڵدەخەڵەتێ بەو حوکمڕانە ملهوڕو خۆسەپێنانە، وا سەرسام دەبێ بە دەسەڵاتیان (بە دەسەڵاتی ڕووکەشیان) ڕەنگە ئەو قەناعەتەیان لا قیامەتیش لە مێشکدا بێ‌و، پێیان وابێ کە دەتوانن شتێکیان بۆ بکەن! چونکە لە دنیادا بۆیە شوێنیان کەوتوون بە حیساب تەمایەکیان پێ هەبوون، لە دنیادا هەندێك لە بەرماوی خۆیانیان بۆ فڕێ داون، هەندێك لە ڕۆنیی خۆیانیان، لەسەریان داوەتەوە لە هەندێك لەو ئیمتیازە ناشەرعییانەی کە لەبەردەستیان دابوون، بەهرەمەندیان کردوون، بۆیە وادەزانن ڕۆژی دواییش، وەك دنیایە، پێیان دەڵێن: ئایا لێرەش : دەتوانن شتێك لە سزای خوامان لێ کەم بکەنەوەو لێ دووربخەنەوە !

﴿قَالُوا۟ لَوْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيْنَٰكُمْ﴾، حوکمڕانە خۆ بەزلگرو ملهوڕەکان دەڵێن: ئەگەر خوا ئێمەی خستبایە سەر ڕێی ڕاست، ئێمەش ئێوەمان دەخستە سەر ڕێی ڕاست، واتە: ئەم سەرەنجامەی کە تووشی بووین، لەبەرئەوە بوو کە ئێمە ڕێی ڕاستی خوامان نەگرتوە، نە ئێمەش‌و نە ئێوەش، ئنجا ئەگەر ئێمە لەسەر ڕێی ڕاستی خوا باین، ئێوەش کە هەر بە دوای ئێمەوە بوون، وەك قانگەلۆشك‌و پووش‌و پەلاش، چۆن با ڕای دەماڵێ بە دوای خۆیدا، ئاوا ئێوەش هەر لەگەڵ ئێمە دەبوون بەڵام لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئێمە لەسەر ڕێی ڕاست نەبووین، ئێوەش بە دوای ئێمەدا هاتن‌و، لەسەر ڕێی ڕاست نەبوون، ئەوەی لەسەر ڕێی ڕاستیش نەبوو بێ، سەرەنجامەکەی ئەم دۆزەخیە، کەواتە: هیچمان بۆ ئێوە پێ ناکرێ .

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿لَوْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيْنَٰكُمْ﴾، زۆربەی هەرەزۆری تەفسیرەکان ئەگەر نەڵێم : هەموویان بەمجۆرە تەفسیریان کردوە : یانی: ئەگەر خوا ڕێنمایی ئێمەی کردبایە، ئێمەش ڕێنمایی ئێوەمان دەکرد .

بەڵام بێگومان ئەو لێکدانەوەیە ڕاست نیەو . مەبەست ئەوە نیە، چونکە خوا ڕێنمایی خەڵکی کردوە خوا پێغەمبەرانی (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ناردوە کە ڕێنمایی خەڵك بکەن، ئەوەتا خوا ﷻ لە سوورەتی (فاطر)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە: هیچ کۆمەڵگایەك نەبووە وریاکەرەوەیەکی تێدا نەنێررابێ، خوا کتێبەکانی خۆی ناردوون و ڕێنمایی خەڵکی کردوە، بەو واتایەی ڕێیان پێشان بدات، بەڵام خوا ﷻ هەموو خەڵك ناخاتە سەر ڕێی ڕاستو، هەموو کەس شایستەی ئەوە نیە، بەڵکو دەبێ مرۆڤ بێنێ ڕێنمایی خوا قبووڵ بکات، ئامۆژگاریی خوا قبووڵ بکات، ئنجا لە بەرەکەتی ئەوەدا، خوا دەستی دەگرێ و دڵی وەدەرچەرخێنێ بەرەو تاعەتو ڕێی ڕاست، بەڵام ئەی مرۆڤ ! تۆ هەر لە ڕێوە ڕێنماییەکەی خوا ڕەفز بکەی، خوا چیت لێ بکات ؟! تۆ پشت لە هیدایەتی خوا بکەی، خوا بە زۆر ملت با نادات ؟!

دەشگونجێ لێرەدا کافرە ملهوڕەکان و حوکمڕانە خۆسەپێنەکان، درۆیەك بکەن بۆ شوێنکەوتووانی خۆیان و بڵێن: ئێمە لە دنیاشدا خوا ڕێنمایی نەکردبووین و، ڕێی ڕاستی نەخستبووە پێش چاومان، بۆیە ئێمەش بە ڕێی ڕاستمان نەدەزانیو ئێوەشمان بەهرەمەند نەکرد، بەڵام ئەو واتایە بە دوور دەزانم، کە ئەوان بتوانن لەوێ ئەو درۆیە بکەن، چونکە لەوێ هەموو نهێنییەکان ئاشکرا دەبن، کە خوا ﷻ لە دنیادا بیانووی کەسی نەهێشتۆتەوەو، کەسانێکیش دەچنە دۆزەخ، کە دەستیان لە هیدایەتی خوا گیر بووبێ و، بە ڕێی ڕاستیان زانیبێ و، شوێنی نەکەوتبن، ئەگەرنا کەسێك کە هەر نەیزانیبێ خوا هیدایەتی ناردوەو، ڕێیان لە هیدایەتی خوا نەکەوتبێ و، بە هیدایەتی خوایان نەزانیبێ و، لێی ئاگادار نەبوون، پاساویان هەیە، چونکە خوا ﷻ لە سوورەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ ﴾، واتە: ئێمە خەڵك سزا نادەین، تاکو پێغەمبەر نەنێرین، واتە، پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) کە هاتن، ئنجا بیانووی خەڵك دەبڕێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ ﴿١٦٥﴾ ﴾النساء، واتە، پێغەمبەرانێکی موژدەدەرو ترسێنەر، تاکو لە دوای (نێررانی) پێغەمبەران، خەڵك بەڵگەی نەبێ لەسەر خوا.

کەواتە: ئەگەر کەسانێك هەبن، پەیامی خوایان پێ نەگەیبێ، ڕێنمایی خوایان پێ نەگەیشتبێ، ئەوانە بەڵگەیان هەیە، چونکە نازانن خوای پەروەردگار چی لێ داواکردوون، بۆیە: ئەگەر بە دەم بانگی خواوە نەچوو بن، بەڵام بە مەرجێك کەمتەرخەم نەبووبن، لەوەدا کە بە هیدایەتی خوا بزانن، کەمتەرخەم نەبووبن لە بە دواداگەڕان، دۆزینەوەی هیدایەتی خوادا، ئەوانە بەپێی ئایەتەکەی سوورەتی (الإسراء) کە دەفەرموێ : ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾﴾، واتە: ئێمە خەڵك سزا نادەین، تاکو پێغەمبەر نەنێرین .

نابێ سزا بدرێن .

ئنجا ئەگەر یەکێ هەبێ بڵێ: ئەوە نیە خوا پێغەمبەرانی ناردوون‌و براوەتەوەو، هیچ پێغەمبەری دیکە نایەن؟ دەڵێین: ڕاستە، بەڵام کەسێك پەیامی پێغەمبەری خاتەم (محمد)ی (عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ)، پێ نەگەیشتبێ، بەنسبەت ئەوەوە، وەك پێغەمبەری خاتەم هەر ڕەوان نەکرا بێت، وایە، کەسێك پەیامی خوای پێ نەگەیبێ‌و لێی حاڵی نەبوو بێ‌و، بەرچاوی ڕوون نەبووبێتەوە بەنسبەت ئەوەوە ڕەوانەکرانی پێغەمبەری خاتەم‌و، ڕەوانەنەکرانی، وەك یەکن .

ئنجا دوایی خۆبەزلگرەکان دەڵێن: ﴿سَوَآءٌ عَلَيْنَآ أَجَزِعْنَآ أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ﴾، یەکسانە لەسەرمان هەڵپە بکەین‌و نارەحەتیی بکەین، یاخود خۆڕاگر بین‌و نارەحەتیی دەرنەبڕین، ﴿مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ﴾، هیچ ڕێی دەربازبوونمان نیە، یاخود دەربازبوون بۆ ئێمە نیە، یاخود شوێنی دەربازبوونمان نیە، ئەوە بەنسبەت ستەمکارانی خۆسەپێن‌و، حوکمڕانانی خۆسەپێن‌و، خۆفەرزکەر بەسەر خەڵکی چەوساوەو بێهێزداو، ئەو خەڵکە بێهێزەی کە شوێنیان دەکەون بە ڕێی هەڵەدا، ئەوە سەرەنجامیانە.

ئنجا دێتە سەر باسی شەیتان: ﴿وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا قُضِيَ ٱلْأَمْرُ﴾، ئنجا کاتێك کە کار تێپەڕی، واتە: دادوەریی کرا لە نێوان مرۆڤەکانداو خەڵك‌و جند، دادگایی کران‌و لێپرسینەوە کراو، هەر کەسە چووە شوێنی خۆی، لەو کاتەدا شەیتان گوتی:

کە ئەمە تاکە شوێنێکە کە بەو شێوە لە قورئاندا هاتبێ، کە شەیتان وتاری خۆی دەدات لە دۆزەخدا، بۆ شوێنکەوتووانی خۆی، بۆ ئەوانەی هەڵیخەڵەتاندوون لە دنیادا، ئنجا با بزانین وتارەکەی شەیتان چۆنە؟ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمۡ وَعۡدَ ٱلۡحَقِّ وَوَعَدتُّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُكُمۡ﴾، خوا بەڵێنی پێدان بەڵێنی ڕاستو، منیش بەڵێنم پێدان، بەڵام بەڵێنی خۆم لەگەڵ ئێوەدا نەبردەسەر .

ئایا بەڵێنی شەیتان چی بووە ؟

خوا فەرموویەتی: ﴿ٱلشَّيۡطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلۡفَقۡرَ وَيَأۡمُرُكُم بِٱلۡفَحۡشَآءِ﴾البقرة واتە: شەیتان بەڵێنی هەژارییتان پێدەدا (یان هەڕەشەی هەژارییتان لێ دەکات) و فەرمانتان پێدەکات بە چرووکیی، بەڵێنەکانی شەیتان هەر وان :

١) ئەی مرۆڤ ئیمان بە ڕۆژی دوایی مەهێنە ! هیچ لە گۆڕێ دانیە ! کێ دەڵێ لێپرسینەوە هەیە !

٢) کێ دەڵێ ئەسڵەن ئەو کەونو کائیناتە خاوەنێکی هەیە !

٣) خوا زۆر بە بەزەییەو ڕەحمەتی خوا سنووری نیە !

٤) خوا ﷻ پێویستیی بە نوێژو ڕۆژووی تۆیە !

ئەوانە هەموویان قسەی شەیتانن، ئەوە هەمووی بەڵێنی شەیتانە، وەك ئایەتەکەی سوورەتی (البقرة) دەفەرموێ: ﴿ٱلشَّيۡطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلۡفَقۡرَ وَيَأۡمُرُكُم بِٱلۡفَحۡشَآءِ ﴿٢٦٨﴾﴾، شەیتان بەڵێنی هەژارییتان پێدەدا: ئەگەر ببەخشن هەژار دەبن، (وَيَأۡمُرُكُم بِٱلۡفَحۡشَآءِ) هەروەها فەرمانتان پێدەکات بە چرووکیی: مەبەخشە، بۆ ماڵو منداڵی خۆت باشترە بۆ خۆت بیهێڵەوە، بە ئارەقەی نیوچەوانت ماڵت پەیداکردوە بۆ دەیدەیە خەڵك؟ ئەوە هەمووی بەڵێنی شەیتانە بەڵێنەکانی شەیتان لەو جۆرە بوون، بۆیە دەڵێ: ﴿وَوَعَدتُّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُكُمۡ﴾، بەڵێنم پێدان، بەڵام بەڵێنەکەم نەبردەسەر، وەعدەکەم درۆ بوو، ﴿وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيۡكُم مِّن

سُلْطَٰنٍ ﴾، من هیچ دەسەڵاتێکم بەسەر ئێوەدا نەبوو. ﴿ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى ﴾، تەنیا ئەوە کە من بانگم کردن، ئێوەش وەڵامتان دامەوە، واتە: من هیچ دەسەڵاتێکم نەبوو، هەر ئەوەندە دەسەڵاتم هەبوو، کە بانگتان بکەمو، بانگم کردن، یەکسەر وەڵامتان دامەوە بە دەنگمەوە هاتن، بە قسەتان کردم. ﴿ فَلَا تَلُومُونِى وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم ﴾، ئێستاش سەر کۆنەی من مەکەنو سەر کۆنەی خۆتان بکەن، خەتای من مەگرنو خەتای خۆتان بگرن، ڕەخنە لە من مەگرنو ڕەخنە لە خۆتان بگرن .

بێگومان ئەوەی هەتا ئێرە شەیتان گوتوویەتی، هەمووی ڕاستە، ئنجا دەڵێ: ﴿ مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِىَّ ﴾، ئەوەشی هەر ڕاستە :

نە من لە فریای ئێوە دێمو بە هانای ئێوەوە دێمو، هیچم بۆ ئێوە پێ دەکرێ، نە ئێوەش هیچتان بۆ من پێ دەکرێ، ئێوەش دەفریای من نایەن .

قسەکانیشی ڕاستن لێرەدا، شەیتان لە دنیادا هەر درۆی کردوون، بەڵام لە قیامەتێ قسەکانی ڕاستن! ﴿ إِنِّى كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ﴾، ئەوەشی هەر ڕاستە، دەڵێ: من بێبڕوام بەوەی کە لەمەو پێش منتان دەکردە هاوبەشی خوا، یانی : شتێکتان دەکرد بۆ خوا، بەشی منیشتان تێدەخست، بەشی هاوبەشەکانتان تێدەخست، بە جوانکردنی شەیتان، بە خوتخوتەو دنەدانی شەیتان، ئەوە هەمووی بەشی شەیتانە، من ئێستا بێبڕوام بەوەی کە منتان دەکردە هاوبەشی خوا، من هاوبەشی خوا نیم، من دروستکراوی خوام! ئەوەشی هەر ڕاستە، شەیتان دروستکراوی خوایەو هاوبەشی خوا نیە، ئنجا کە پێیان بێبڕواش دەبێ، ئەوەشی هەر شتێکی باشە، بەڵام ئەو شتە باشە لە شوێنێك دەکات، کە بە کەڵکی نایەت، ئەگەر لە دنیادا کردبای، حاشای لە شوێنکەوتووانی کردبایە، بە کەڵکی دەهات. ﴿ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، بێگومان ستەمکاران ئازارێکی بە ئێشیان هەیە، ئەمەش قسەیەکی ڕاستەو دەگونجێ هەر قسەی شەیتان بێ، واتە: ئێوە ستەمکار بوونو، منیش هەر ستەمکار بووم، بۆیە ئازارێکی بە ئێش چاوەڕێمان دەکات، دەبێ ملی بۆ ڕاکێشین .

دەشگونجێ ئەمە فەرمایشتی خوای دادگەر بێ، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، ستەمکاران ئازاری بەئێش ژانیان هەیە، (واتە: شەیتان کە خەڵکی هەڵخەڵەتاندوەو، ئەو خەڵکەش کە بەدوای کەوتوەو، بە دوای پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلَام)، پێغەمبەرانی پاكو چاكو پێغەمبەرانی دڵسۆز، هەروەها شوێنکەوتووانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلَام) سەر ڕاستانەو دڵسۆزانەو جوامێرانە، هاتوون دەستیان بگرن‌و، نیشی خۆیانیان پێیانە، نەك نیشی خۆیان، واتە: گەیەنەرانی پەیامی خوا، نیشی خەڵکیان بە خەڵکە، نەك بیانەوێ مەداری خۆیانیان پێ ساز بکەن، کەچی ئەو خەڵکە لادەرە، بە دەم شەیتان‌و، ڕێچکە شەیتانییەکان‌و، بە دەم دەست‌و پێوەندەکانی شەیتانەوە دەچن، بەڵام بەدەم پێغەمبەران‌و شوێنکەوتووانی پێغەمبەرانەوە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلَام) ناچن.

لە کۆتایی دا خوا، باسی سەرەنجامی بڕواداران دەکات، دەفەرموێ : ﴿ وَأُدْخِلَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ ﴾، ئەوانەش کە بڕوایان هێنابووو، کردەوە باشەکانیان ئەنجام دەدەن، خرانە چەند باخ‌و بێستانێکەوە، ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، بە هەمیشەیی تێیان دا دەمێننەوە، بە مۆڵەتی پەروەردگاریان، ﴿ تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ ﴾، لەوێدا سڵاوکردنیان بریتییە لە: سەلام، یانی: ئاشتییتان لەسەر بێ، سەلامەتیی لەسەر ئێوە بێ، ئایا ئەو سەلامە لەلایەن کێ وەیە ؟! :

١/ ئەو سڵاوە دەگونجێ ، لەلایەن خواوە لێیان بکرێ، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ سَلَٰمٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ ۝٥٨ ﴾ يس .

٢/ دەشگونجێ ، لەلایەن فریشتەکانەوە بێ، فریشتەکان لێیان وە ژوور دەکەون‌و پێیان دەڵێن : ﴿ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَٱدْخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ۝٧٣ ﴾ الزمر .

٣/ دەشگونجێ لە نێوان خۆیاندا، سڵاو لە یەکدی بکەن: ﴿ تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ ۝٢٣ ﴾ یونس .

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم :** خوا ئاسمانەکان‌و زەوی بە هەق دروست کردوون‌و، هەر کات بیەوێ بە ئاسانیی خەڵکی لادەبات‌و، خەڵکێکی تازە دێنێتە شوێنیان :

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۚ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٩﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴿٢٠﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە بەپیرۆزە، لە سێ بڕگەدا :**

**بڕگەی یەکەم :** ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ﴾، ئایا نابینی! واتە: بە چاوی عەقڵ‌و دڵ نابینی! تێناگەی! سەرنج نادەی! کە خوا ئاسمانەکان‌و زەوی بە هەق دروست کردوون! یانی: دەبوو ئەو ڕاستییە ببینی، کە ئەم گەردوونە، ئەم دروستکراوە، بە سەرو خوارییەوە، بە ئاسمانەکان‌و زەوییەوە، بە هەق دروستکراوە، هێندەی نووکی دەرزییەك کەموکوڕیی تێدا نیەو، هیچ شتێك دروست نەکراوە، بە شێوەیەك زانایەك بتوانێ ڕەخنەی لێ بگرێ‌و، بڵێ: ئەو شتە نەدەبوو ئاوا بووایە .

چ ئەو هەلومەرجەی کە بۆ ژیانی مرۆڤ ، لەسەر زەوی ڕەخساوە !

١) ئەم زەوییەی ئێمە بە بەرگێکی ئاویی (غلاف مائي) دەورەدراوەو، سێ لەسەر چوار (٤/٣)ی ڕووی زەوی : ئاوە .

٢) هەروەها بە بەرگێکی هەوایی دەورە دراوە، بە بەرزیی (١٠٠٠ – ١٥٠٠کلم) زەمین بە بەرگە هەوا پێچراوەتەوە.

٣) ئەو چیایانە کە تێیدا داکوتراون، وەك گوڵمیخێك[1] لەنگەریان بۆ ڕاگرتوە .

٤) هەرچی پێداویستی ئێمە هەیە، لەم سەر زەوییە دابینکراوە .

٥) تەماشای جۆرەکانی تیشك دەکەی، هەرچی تیشکی زیان بەخشە، چینی ئۆزۆن دەیگرێتەوەو، ناهێڵێ بێتە نێو مەودای زەوییەوە .

٦) ئنجا هەرچی ئێمە پێویستمانە لەم سەرزەوییە هەیە، ئاوی شیرینی ئاسمان، کە لە ئاوی سوێرو تاڵی زەریاکان دەپاڵێوریّ، لە ڕێی باران و تەزرەو بەفرەوە دەبارێ‌و، لە زەویدا کۆدەبێتەوەو، هەموو جۆرە ڕووەك سەوزەو میوەو دانەوێڵەو پێداویستییەکی ئێمەی پێ سەوز دەبێ، هەموو جۆرە ئاژەڵ‌و بەڕەوورو ژیاندارێکی پێ دروست دەبێ، کە ژیانی ئێمە پێویستیی پێیەتی، چ لە دەریادا، چ لە وشکانییدا، چ لە هەوادا .

٧) ئنجا کە تەماشای ئەم گەردوونە دەکەی : هەمووی سیستماتیکەو هەمووی یاسادارە، هەمووی لە جێی خۆیی دایە:

١ - خوا ﷻ لە ئایەتی (٧)ی سوورەتی (السجدة) فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِيٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥ ﴾، واتە: خوا هەرچی دروستیکردوە، چاکی دروستکردوە .

٢ - هەروەها لە ئایەتی (٨٨)ی سوورەتی (النمل)دا دەفەرموێ : ﴿ صُنۡعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ أَتۡقَنَ كُلَّ شَيۡءٍ ﴾، واتە: دروستکراوی خوا، کە هەموو شتێکی زۆر بە وردەکاریی دروستکردوە.

٣ – دیسان لە سوورەتی (الملك)دا، دەفەرموێ : ﴿ مَّا تَرَىٰ فِي خَلۡقِ ٱلرَّحۡمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٖ ۖ ﴾، واتە: لە دروستکراوی خوای خاوەنی بەزەییدا، ناڕێکیی

---

١) گوڵمیخ ، سینگ (وَتَدْ) ئەوەی خێوەت و ڕەشماڵی پێ ڕادەگیرێ‌و بە چواردەوریەوە دادەکوترێن .

ئابینی، بێ یاسایی نابینی، هیچ شتێك نابینی بڵێی : ئەوە نەدەبوو وا بووایە، بەڵكو دەبوو ئاوا بووایە ، بۆ نموونە :

أ - دووریی مانگو زەوی، سووڕانەوەی مانگ بە دەوری زەوی دا، لە ماوەی مانگێکدا.

ب - سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا لە ماوەی ساڵێکدا .

ج - زەوی بە خێرایی سی کیلۆمەتر (٣٠ کلم) بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە .

د - بەڵام بە دەوری خۆردا لە هەر چرکەیەك دا بە خێرایی سی (٣٠) کیلۆمەتر، واتە: شەست (٦٠) ئەوەندەی خێرایی دەوری خۆی، بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە .

هـ - لەگەڵ خۆردا خێراییەکی زۆر زیاتر: دووسەدو شەش (٢٠٦) هەزار کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا دەبڕێ[1]، لەگەڵ ئەوەش تەماشا دەکەی ئەو سووڕانەوانەو ئەو ڕێژانەی باسمان کردن، هەموویان لە جێی خۆیاندان، کەواتە: گۆی دروستکراوەکانی خواو، گۆی ئەو گەردوونەش کە خوا خولقاندوویەتی، بە هەق دروستکراوە، هەقەکەش ئەوەیە کە مرۆڤی تێدا تاقی بکرێتەوە، کەواتە: (الخِطابُ عامٌ لكِلِّ مَن يَصلُحُ للخِطاب)، واتە: ڕووی دواندن لە هەر کەسێکە کە شایستە بێ بۆ ئەوەی بدوێنرێ .

کە دەفەرموێ : ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ﴾، جۆرە خوێندنەوەیەکی دیکەشی هەیە: (أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللهَ خَالِقُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْ )، ئاواش خوێنراوەتەوە، واتە: ئایا نابینی کە خوا بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوییە !

کە دەفەرموێ: ﴿ بِٱلْحَقِّ ﴾، واتە: بە حیکمەت کە پێچەوانەی: (عَبَث)ەو (عَبَث)یش، واتە: پووچو بێ حیکمەتو بێ ئامانج، وەك لە سووڕەتی

---

١) هەروەها لەگەڵ کاکێشان (درب التَّبّان) دا بە خێرایی (٩٨٠) کم لە چرکەیەك دا دەبڕێ . بۆ سووڕانەوە بە دەوری چەقی کاکێشان دا ! بڕوانە مەوسووعەی : (ئیمان و ئیلحاد) لاپەڕە (٤٧١) چاپی یەکەم ، ٢٠١٩ ز .

(الدخـان)دا خـوا ﷻ دەفـەرموێ : ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿٣٨﴾ مَا خَلَقْنَٰهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾ ئێمە ئاسمانەكانو زەویو ئەوەی نێوانیانمان بە گاڵتەو یاریی دروست نەكردوون، بە هەق نەبێ دروستمان نەكردوون، بەڵام زۆربەیان نازانن، زۆربەی خەڵكی ئەو حیكمەتە نازانن، كە خوا ﷻ ئامانجو حیكمەتێكی هەبوو لە دروستكرانی ئەم گەردوونەدا .

ئنجا وەك پێشتر باسمان كرد: لە سوورەتی (یونس)دا، باسێكی سەربەخۆمان لەوبارەوە كردوەو، زیاتر لە پازدە (١٥) شوێن لە قورئانمان، هێناوەتەوە لەوبارەوە كە: خوا ﷻ ئەم گەردوونەو ئەم دروستكراوانەی بە هەق دروستكردوونو، لە سوورەتی (الجاثیة)دا، خوا زۆر بە ڕوونیی دەفەرموێ: ﴿ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾، واتە: خوا ئاسمانەكانو زەوی بە هەق دروستكردوونو، بۆ ئەوەی هەموو كەسێك بە پێی ئەوە كە كردوویەتی، سزاو پاداشتی بدرێتەوەو، ستەمیان لێ ناكرێ .

كەواتە: هەقەكە بریتیە لەوە: كە مرۆڤەكان تاقی بكرێنەوە، ئەوە دیارترین هەقێكەو دیارترین حیكمەتو ئامانجێكە كە ئێمە دەیزانین، بەڵام مەرج نیە - وەك لەو باسەش دا كە لە تەفسیری سوورەتی (یونس)دا كردوومە، گوتوومە - تەنیا ئەو حیكمەتە هەبێ، هەر خوا دەزانی لەم گەردوونە فراوانەدا، چەند دروستكراوی دیكە هەن، چی دیكە هەیە، چەند حیكمەتی دیكە هەن، بەڵام بە نسبەت ئێمەی مرۆڤی دانیشتووی سەر زەوییەوە، حیكمەتو هەقێك كە خوا لە دروستكرانی ئەم گەردوونەدا ڕەچاوی كردوە، ئەوەیە: كە ئێمە تاقی بكاتەوەو، پاشان سزاو پاداشتی پڕ بە پێستمان بداتەوە .

<u>**بڕگەی دووەم**</u> : - ﴿ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴾، (خوا) ئەگەر بیەوێ، ئێوە لادەبا و دروستكراوێكی تازە دێنێ، خوا پەكی لەسەر كەس نەكەوتوە، بیەوێ ئەو مرۆڤانە لادەبا و مرۆڤانی دیكە دێنێ، یان هەر ئەسڵەن مرۆڤان لادەباو، جۆرە دروستكراوی دیكە دێنێ !

**برگەی سێیەم :** - ﴿ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴾، ئەوەش لەسەر خوا، قورس نیەو، بە زەحمەت نیە، خوا لە بەرانبەری دا دەستەوسانو بێ توانا نیە.

**مەسەلەی دووەم :** هاتنە گۆڕی هەموو لایەک و، داواکردنی شوێنکەوتووە بێ هێزەکان لە خۆ بەزلگرەکان، کە ئازاری خۆیانیان لێ کەم بکەنەوەو، وەڵامدانەوەی نائومێدکەرانەی خۆ بەزلگرەکان :

هەڵبەتە ئێمە لە مانای گشتییەکەشدا، تیشکێکی باشمان خستە سەر، بۆیە بە خێرایی بەسەری دا دەڕۆین .

خوا فەرموویەتی: ﴿ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ جَمِيعًا فَقَالَ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا مِنْ عَذَابِ ٱللَّهِ مِن شَيْءٍ ۚ قَالُواْ لَوْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيْنَٰكُمْ ۖ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ أَجَزِعْنَآ أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ ﴿٢١﴾ ﴾.

شیکردنەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە ، لە شەش برگەدا :

**برگەی یەکەم :** - ﴿ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴾، (بَرَزُوا أي: ظَهَرُوا وَحَضَرُوا)، واتە: ئاشکرابوونو ئامادەبوون، هەموویان تێکڕا بۆ خوا ئامادەبوون، کە ئەمە مەبەست پێی قۆناغی قیامەتە .

**برگەی دووەم :** - ﴿ فَقَالَ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا ﴾، بێهێزەکان بەوانەی کە خۆیان بە زلگرتبوو، گوتیان: ئێمە شوێنکەوتووی ئێوە بووین، (تَبَعَ) ناوی کۆیە بۆ (تابع)، (تابع) واتە: شوێنکەوتوو، (تَبَعَ) یانی: شوێنکەوتووان .

**برگەی سێیەم :** - ﴿ فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا مِنْ عَذَابِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ﴾، ئایا ئێوە هیچ شتێك لە سزای خوا لە ئێمە دوور دەخەنەوەو لە کۆڵمان دەکەنەوە؟ پرسیار دەکەن‌و داوایان لێ دەکەن .

**برگەی چوارەم :** - ﴿ قَالُواْ لَوْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيْنَـٰكُمْ ﴾، خۆ بە زلگرەکان گوتیان: ئەگەر خوا ئێمەی خستبایە سەر ڕێی ڕاست، ئێمەش ئێوەمان دەخستە سەر ڕێی ڕاست، ئەگەر خوا ئێمەی لەسەر ڕێی هەق دانابایە ئێمەش ئێوەمان دەخستە سەر ڕێی هەق، واتە: ئەوەمان بە قسمەت نەبوو، لە ئەنجامی ئەوەدا کە هیدایەتی خوامان ڕەفز کرد، بۆیە نەکەوتینە سەر ئەو ڕاستە شەقامەی کە بە ئێرەمان نەگەیەنێ، کە دۆزەخە، بەڵکو بە بەهەشتمان بگەیەنێ !

مرۆڤ بە ڕاستە شەقامی خوادا دەچێتە بە هەشت، بەلام بە کوێرە ڕێیانداو بە ڕێچکەی شەیتانییدا ، دەچێتە ئەو شوێنەی کە بۆ شەیتان‌و شەیتانییەکان ئامادە کراوە، کە دۆزەخە .

ئەم مانایە زیاتر پێدەچێ، دەنا دەشگونجێ مەبەستیان ئەوە بێ کە: خوا ئێمەی ڕێنمایی نەکرد، بۆیە ئێمەش نەمانتوانی ئێوە ڕێنمایی بکەین، بەلام ئەوە درۆیەکی گەورەیە دەیکەن! پێم وانیە لە قیامەتدا بتوانن ئەو درۆیە بکەن، بڵێن: خوا ئێمەی ڕێنمایی نەکرد، کە خوا ئەو هەموو پێغەمبەرانەی (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ناردوون‌و، ئەو هەموو کتێبانەی دابەزاندوون، خوا ڕێنمایی خۆی بۆ خەڵك خستۆتە گۆڕێ، بەلام ئەگەر ئەوان لە جیاتی ئەوەی پێشوازیی لێ بکەن، پشتی تێبکەن، خوا بە تۆبزیی نایانخاتە سەر ڕێ، وەك دەفەرموێ : ﴿ وَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ ٩ ﴾النحل، واتە: ئەگەر خوا ویستبای، هەمووتانی دەخستە سەر ڕێ، (لَهَدَىٰكُمْ) لێرەدا بە مانای ڕێنمایی کردن نیە، چونکە: خوا ڕێی پێشانی هەموویان داوەو ویستوویەتی، بەلام لێرەدا دەیبەستێتەوە بە ویستی (مَشِيئَة)ی خۆیەوە: ﴿ وَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ

﴿ ٩ ﴾، واتە: ئەگەر خوا ویستبای هەمووتانی دەخستە سەر ڕاستە ڕێ، ئەگەر ویستبای زۆرتان لێ بکات، بەڵام نەیویستوە زۆرتان لێ بکات و ویستوویەتی خۆتان ئازادانە ڕێی ڕاست بگرن، یان نەیگرن، بەڵام بەداخەوە ئێوە ڕێی ڕاستتان نەگرت و ڕێی چەوتتان گرت، خوای پەروەردگاریش ڕێی لێ نەگرتن بۆچی ڕێی لێ نەگرتن؟ چونکە ئەسڵەن ئێوەی بۆ تاقیکردنەوە خوڵقاندبوو، کەسێك بۆ تاقیکردنەوە دابنرێ، دەبێ ڕێی بدرێ، ڕێی ڕاست بگرێ، یان ڕێی چەوت، ئنجا ئێوەش کە بە ویستی ئازادانەی خۆتان ڕێی چەوتتان گرت، خوا بە تۆبزیی نەیهێنانەوە سەر ڕێ، دەنا ئەگەر ویستبای دەیتوانی بە تۆبزیی بتانهێنێتەوە سەر ڕێی ڕاست، بەڵام ئەو کاتە مانایەك بۆ تاقیکردنەوەی ئێوە نەدەما .

بۆیە کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ ﴾، واتە: ئەگەر ویستبای زۆرتان لێ بکات، (وَلَو شَاءَ مَشِيئَةَ إِجبَارٍ ومَشِيئَةَ إِكرَاهٍ)، بەڵام نەیویستوە زۆرتان لێ بکات و ناچارتان بکات، بەڵکو ویستوویەتی ئازادتان بکاو، کە ئازادیشی کردوون: هەندێکتان ڕێی ڕاستتان گرتوەو هەندێکیشتان ڕێی چەوت .

<u>برگەی پێنجەم</u> : - ﴿ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ أَجَزِعْنَآ أَمْ صَبَرْنَا ﴾، خۆ بەزلگرەکان و خۆسەپێنەکان و حوکمڕانەکان، کە ئەو خەڵکەیان هەڵخەڵەتاندوە لە دنیادا، دەڵێن: یەکسانە لەسەرمان: هەڵپەو نارەحەتیی دەربڕین، یاخود خۆڕاگر بین، وا دیارە ئەوانە هەردووك لایان تاقیکردوونەوە، نارەحەتیی و هاوارو بێزارو دادو فیغانیان زۆر کردوە، سوودی نەبووە، دوایی ماوەیەك دانیان بە خۆیاندا گرتوە گوتوویانە: با دان بە خۆماندا بگرین، بەڵکو لە ئەنجامی ئەوەدا بەهرە وەربگرین و سوودێك بکەین، کەچی تەماشا دەکەن، بێ سوودە، بۆیە دەڵێن: ئێمە هەردوو لامان ئەزموون کردوون، هەم نارەحەتیی دەربڕین، هەم دان بەخۆداگرتن، بێ سوودە، تازە لە دۆزەخ داین !

<u>برگەی شەشەم</u> : - ﴿ مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ ﴾، (مَحِيصٍ) دەگونجێ چاوگی میمیی (مصدر میمي) بێ، واتە: دەربازبوون، یانی: دەربازبوون و ڕزگاربوونمان بۆ نیە

(ما لَنا مِن نَّجاة)، دەشگونجێ (مَّحِيصٍ) ناوی شوێن (إسمِ مَكان) بێ، واتە: شوێنی ڕاکردن کە بۆی دەرباز بین و، پەنای پێ بەرین، شوێنێکی وامان نیە .

**مەسەلەی سێیەم** : دان بە هەق داهێنانی شەیتان و حاشاکردنی لە شوێنکەوتووانیی و سەرکۆنەکردنی بۆیان :

کە لە ئایەتی (٢٢)دا خراوەتە ڕوو، لە مانای گشتیی ئەم ئایەتەشدا هەڵوەستەی باشمان لەسەر کرد .

خوا دەفەرموێ : ﴿ وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا قُضِىَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِىَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى ۖ فَلَا تَلُومُونِى وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم ۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِىَّ ۖ إِنِّى كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٢﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە، لە یازدە (١١) برگەدا :**

**برگەی یەکەم** : - ﴿ وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا قُضِىَ ٱلْأَمْرُ ﴾، شەیتان دوای ئەوەی کە کارەکە تێپەڕی، گوتی :

(قُضِيَ الأمْرُ: تُمِّمَ الشَّأْنُ وَحُسِمَ الأمْرُ بِتَمييزِ أهْلِ الضَّلالَةِ وَأهْلِ الهِدايَةِ)، (قُضِيَ الأمْرُ) .

واتە: کارەکە تەواو بووو هەڵبڕاو، دادوەریکراو، بڕیاردرا بە لێک جیاکردنەوەی ئەوانەی کە گومڕا بوون، لە ئەوانەی کە ڕێی ڕاستیان گرتوە .

شەیتان چی گوت ؟!

**بڕگەی دووەم :** - ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ ﴾، بێگومان خوا بەڵێنی پێدان، بەڵێنی ڕاست .

(الحَقُّ: الصِّدْقُ وَالوَفَاء)، هەق بریتیە لە: ڕاستیی‌و لە شتی چەسپاو، شتێك كە پڕ بە پێستی واقیع بێ، خوا بەڵێنێكی ڕاست‌و دروستی پێدان‌و، بەڵێنی ڕاست دەبرێتە سەر، ئەوەتا بەڵێنەكەشی هاتۆتە دی، كە فەرمووی: ژیانی دنیا شوێنی تاقیكردنەوەیەو، دوایی زیندوو دەكرێنەوەو، لێتان دەپرسرێتەوەو، سزاو پاداشت هەیە، خوا ئەو بەڵێنەی پێداون‌و، ئەوەتا بەڵێنەكەشی ڕاستەو هێناویشیەتە دی .

**بڕگەی سێیەم :** - ﴿ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ﴾، منیش بەڵێنم پێدان، بەڵام لە بەڵێنەكەم دا، درۆم لەگەڵ كردن، بەڵێنی خۆم لەگەڵ ئێوەدا نەبردە سەر، بێ بەڵێن بووم .

بەڵێنی شەیتانیش بریتیە لە: هەموو ئەو شتانەی كە پێچەوانەی ئایین‌و بەرنامەی خواو هیدایەتی خوان، وەك لە فەرمایشتێكی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {شەیتان لە سەرەتاوە دێ، ڕێ بە ئینسان دەگرێ كە ئیمان نەهێنێ، دەڵێ: ئیمان مەهێنەو، هیچ شتێك لە گۆڕێدا نیە، بەڵام كە ئیمانی هێنا، ئنجا ڕێی لێ دەگرێ كە كۆچ بكات، دوایی ڕێی لێ دەگرێ كە جەنگ‌و جیهاد بكات‌و فیداكاریی بكات لە پێناوی خوادا}[1]، ئنجا ڕێی لێ دەگرێ كە ببەخشێ‌و، تاعەت بكات‌و چاكە بكات، ئەگەر ئەوانەی هیچ پێ نەكرا، ئنجا دێنێت خوتخوتەی خراپ‌و خەیاڵی خراپ‌و دنەدانی خراپ دەخاتە دڵی مرۆڤەوە، ئەوانە بەڵێنەكانی شەیتانن، بەڵێنەكانی شەیتانیش هەموویان درۆن، ئەوەی شەیتان دەیڵێ، هیچی وانیە :

١/ شەیتان چۆتە دڵی ئەهلی كوفرەوەو گوتوویەتی : ئەم دنیایە بێ خاوەنە بەڵام بەڵێنەكەی درۆیەو گەردوون خاوەنی هەیە !

---

١) اخرجه احمد في المسند: ١٦٠٠٠، والنسائي: ٣١٣٤، وابن حبان: ٤٥٩٣، والطبراني: ٦٥٥٨، والبيهقي في شعب الإيمان: ٤٢٤٦ وصَحّحه الألباني.

٢/ هەروەها چۆتە دڵیانەوەو گوتوویەتی: لێپرسینەوە نیە، وەك یەكێك لە مولحیدەكان گوتوویەتی: (أَرْحَامٌ تَدْفَعُ وَقُبُورٌ تَبْلَعُ)، واتە: منداڵدانەكان دەردەهاوێن‌و، قەبرەكان قووت دەدەن، هەڵدەلووشن، هیچی دیكە لە گۆڕێ نیە! كەچی وا نیەو لێپرسینەوەو سزاو پاداشت هەیە .

٣/ دیسان شەیتان بەڵێنی بە خەڵك داوە، كە خوا ڕەحم‌و میهرەبانیی‌و سۆزی زۆر زۆرە، ئەگەر بێت‌و نوێژیش نەكەن‌و ڕۆژووش نەگرن‌و خۆشتان لە حەرام نەپارێزن‌و، گوناهانیش بكەن، ئەوە كێشە نیە، چونكە خوا ڕەحمی زۆرە ! بەلام بەڵێنەكەی درۆیە! خوا بەڵێ ڕەحمی زۆرە، بەلام ﴿ إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٦﴾ ﴾الأعراف، واتە: بەزەیی خوا، لە چاكەكارانەوە نزیكە، ئەدی توورەیی‌و سزاو جەزرەبەكەی بۆ كێیە؟ ئەگەر بۆ ئەوانە نەبێ، كە بێبڕوان‌و، بۆ ئەوانە نەبێ كە لە ڕێی خوا، لا دەدەن، بۆ ئەوانە نەبێ كە ستەم‌و خراپە دەكەن‌و، گوناهـ‌و تاوان دەكەن، كەواتە: بەڵێنەكانی شەیتان هەموویان درۆ دەرچوون .

<u>**برگەی چوارەم :**</u> ﴿ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ ﴾، من هیچ دەسەڵاتێكم بەسەر ئێوەدا نەبوو، (السُّلْطَانُ: إِسْمُ مَصْدَرٍ)، (تَسَلَّطَ عَلَيْهِ) واتە: خستیە ژێر ڕكێفی خۆی‌و، توانای بەسەری دا شكا، (سُلْطَان) ناوی چاوگە، (سُلْطَان) واتە: بالادەستیی، من هیچ بالادەستییەكم بەسەرتان دا نەبوو، وەك لە سوورەتی (الحجر)دا خوا دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾.

واتە: بێگومان بەندەكانی من تۆ دەستەڵاتت بەسەریاندا ناشكێ، مەگەر ئەوانەی كە لە بێ مرادان‌و لە بێ ئاكامان، شوێنت دەكەون، ئنجا شەیتان ڕاستی كردوە، وەك لە مانا گشتییەكەشدا باسمان كردوە، ئەو قسانەی شەیتان هەموویان ڕاستن، دەڵێ: من هیچ دەستەڵاتێكم بەسەر ئێوەدا نەبوو .

بڕگەی پێنجەم : - ﴿إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى﴾، ئەوە نەبێ كە من بانگم كردن، ئێوەش یەكسەر وەڵامتان دامەوەو، بە دەنگمەوە هاتن، یەكسەر بانگێشتنەكەی منتان قبووڵ كردو، فەرمانەكەی منتان جێبەجێ كرد .

بڕگەی شەشەم وحەوتەم : - ﴿فَلَا تَلُومُونِى وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم﴾، سەركۆنەی من مەكەن‌و، سەركۆنەی خۆتان بكەن، واتە: تەنیا سەركۆنەی خۆتان بكەن، تەنیا ڕووی ڕەخنە لە خۆتان بكەن‌و ڕەخنە لە خۆتان بگرن، تەنیا سەرزەنشتی خۆتان بكەن، كە خۆتان تووشی ئەو حاڵەتە كردوە، بەو دەردو مەرەدە چوون، كە ئێستا دەیبینن، چونكە: بەڵێ من بانگم كردن، بەڵام هیچ دەستەڵاتێكم بەسەرتاندا نەبوو، بە تۆبزیی ڕاتان بكێشم، خۆتان پێتان خۆش بوو بە قسەی من بكەن! لە حاڵێكدا كە من بانگم كردبوون، خواش بانگی كردبوون، ئەدی بۆچی بە دەم بانگی خوای پەروەردگارتانەوە نەچوون! بۆچی بە دەم بانگی منەوە هاتن، كە خواش ئاگاداری كردبوون: من دوژمنتانم، ﴿إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٠٨﴾﴾البقرة، واتە: بەڕاستیی (شەیتان) دوژمنێكی ئاشكرایە بۆ ئێوە ؟!

بڕگەی هەشتەم و نۆیەم : - ﴿مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِىَّ﴾، نە من لە فریای ئێوە دێم، نە ئێوەش بە هانای من دێن، (الإِصْرَاخُ: الإِغَاثَةُ مُشْتَقٌّ مِنَ الصُّرَاخِ، لِأَنَّ المُسْتَغِيثَ يَصْرُخُ بِأَعْلَى صَوْتِهِ، أَصْرَخَهُ، إِذَا أَجَابَ صُرَاخَهُ)، وشەی (إِصْرَاخ) واتە: لە فریا هاتن‌و بە هاناوە هاتن، لە وشەی (صُرَاخ)ەوە وەرگیراوە، چونكە (مُسْتَغِيث) واتە: كەسێك كە هاوارو هانا بۆ كەسێك دەبا، بە دەنگی بەرز دەڵێ: هۆ فلان كەس! لە فریام وەرە ئنجا (أَصرَخَهُ) واتە: (أَجَابَ صُراخَهُ) وەڵامی هاوارەكەی دایەوە، وەڵامی هانا پێ بردنەكەی، دایەوە .

ئەمە لێرەدا، وەك چۆن خوێنراوەتەوە: ﴿مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِىَّ﴾، خوێنراویشەتەوە: (مـا أَنـا بمُصْرِخِكُمْ وَمـا أَنْـتُم بمُصْرِخِي)،

ئەمە (حمزة) و (خَلَفْ) وایان خوێندۆتەوە، کە دوو لە قورئان خوێنە ناودارەکانن، واتە: هەردوو جۆرە خوێندنەوەکان هەن، ئێمە جارجار ئاماژە دەکەین بە خوێندنەوەکان، چونکە جاری وا هەیە کاریگەریی لەسەر مانا هەیەو مانایەکان جۆراو جۆر دەکات .

**بڕگەی دەیەم :** - ﴿ إِنِّي كَفَرْتُ بِمَا أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ﴾، (ئیبلیس دەڵێ:) من بێبڕوام بەوەی کە پێشتر منتان کردبووە هاوبەشی، واتە: منتان کردبووە هاوبەشی خوا، وەك لە سووڕەتی (یس)دا، خوا دەفەرموێ : ﴿ أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا۟ ٱلشَّيْطَٰنَ ۖ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٠﴾ ﴾، واتە: ئەی وەچەی ئادەم! ئایا پێم ڕانەگەیاندن، فەرمانم پێ نەکردن، کە شەیتان مەپەرستن، شەیتان دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ ئێوە، واتە: شەیتان لەوێ حاشایان لێ دەکات، یەخەیان لەبەر دادەدڕێ، دەڵێ: ئێوە کە پێشتر لە دنیادا منتان کردبووە هاوبەشی خوا، ئەوە من بێبڕوام بەو هاوبەشی دانانەی منو ڕاستتان نەکردوە .

شەیتان ئەو هەڵوێستەشی هەر ڕاستە، چونکە: هاوبەشی خوا نەبووە، هەر خوا خوایە، هەرچی دیکە کە هەیە هەمووی هەر دروستکراوی خوایەو، هیچیان هاوبەشی خوا نین .

**بڕگەی یازدەیەم :** - ﴿ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، بێگومان ستەمکاران سزایەکی بە ئێشیان هەیە .

ئەمە دەگونجێ قسەی شەیتان بێ، دەشگونجێ قسەی خوای بەرز بێ، هەردوو ماناکەش وەك یەکن، سەرەنجامەکەیان هەر یەکە، چ شەیتان گوتبێتی: ستەمکاران ئازارێکی بە ئێشیان هەیە، هەر وایە، چ خوا فەرموویێتی: ستەمکاران ئازارێکی بە ئێشیان هەیە، هەر وایە، چونکە شەیتانیش لەوێ چاك دان بەو ڕاستییانەدا دادەنێ، خۆزگە لە دنیادا دانی پێ داهێنابان، خۆشی دەرباز دەکردو، ئەو خەڵکەش ئاوا دەستخەڕۆو ماڵوێران نەدەبوون، بەڵام دیارە خۆی بەو دەردە بردوەو، ئەو خەڵکەش کە بەدوای کەوتوون، بەو مەرەدو دەردەچوون، کە ئەو پێی چووە .

ئەمە وەك ئایەتەکانی: (١٦ و ١٧)یە لە سووڕەتی (الحشر)دا، کە خوا دەفەرمووێ : ﴿ كَمَثَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَٰنِ ٱكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ فَكَانَ عَٰقِبَتَهُمَآ أَنَّهُمَا فِى ٱلنَّارِ خَٰلِدَيْنِ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُا۟ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٧﴾ ﴾، باسی جوولەکەکانو مونافیقەکان دەکاتو دەفەرمووێ: وێنەی وان لەگەڵ یەکدیدا، وەك وێنەی شەیتانە، کە بە ئینسانی گوت: کافر بە، (بە مرۆڤی بێبڕوای گوت: بێبڕوا بە)، کاتێك بێبڕوا بوو (لە دنیادا)، لە قیامەتێ گوتی: من لە تۆ بەرییەو دوورم، من لە خوای پەروەردگاری جیهانییان دەترسێم، سەرەنجامی شەیتانو، کەسێك کە بە قسەی شەیتان کافر دەبێو، بە دوای دەکەوێ)، ئەوەیە کە لە ئاگردانو، هەردووکیان تێیدا بە هەمیشەیی دەمێننەو■ ئا ئەوەش سزای ستەمکارانە .

لێرەدا ئەوەی سەرەنج دەدرێ: ئەگەر قسەی کۆتاییش قسەی شەیتان نەبێو، قسەی خوای پەروەردگار بێ، دەبینین: شەیتان وتاریکی ■■ (١٠) بڕگەیی بۆ شوێنکەوتووەکانی خۆی دەدا، لە دۆزەخدا، لە هەندێك کتێباندا هاتو■ کە خەڵکی دۆزەخ لە شەیتان کۆدەبنەوە، دەڵێن: ئەی ئیبلیس! ئێمە هەمووومان کۆمەڵی تۆ بووین، وەك خوا دەفەرمووێ : ﴿ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ ﴾ فاطر، واتە: شەیتان دوژمنە بۆ ئێو■ ئێوەش بە دوژمنی بگرن، کۆمەڵەکەی خۆی بانگ دەکات، تاکو بیانکاتە هاوەڵی دۆزەخ، یاخود بیانکاتە خاوەنی دۆزەخ .

خەڵکی دۆزەخ هەموویان لە شەیتان کۆدەبنەوەو دەڵێن: تۆ ئێمەت بەو دەردە برد، ئێمە هەمووومان شوێنکەوتووی تۆ بووین، ئێستا بزانە داخۆ ■ چارەسەرێکمان دەکەی؟ ئیبلیسیش دێت ئەم وتارەیان بۆ دەدات، ئەم وتارە ■■ (١٠) بڕگەییە، کە لێرە خوا ﷻ دەیخاتە ڕوو، ئنجا لە هەندێك کتێباندا هاتووە کە: شەیتان لە تەختی بنی دۆزەخ دایە، چونکە وەك چۆن بەهەشت پلە پلەیە، بەرەو سەر (دَرَجات)، دۆزەخیش پلە پلەیە بەرەو خوار (دَرَكات)، لە کوردەواریی خۆشمان، یەك لە یەکێ تووڕە دەبێ، پێی دەڵێ: دەبڕۆ بە دەرەك بی، دەرەك (دَرَك) چوونە خوارە بە پەیژەدا، بەرەو خوار، واتە: بە

قادرمان دا بچیە خوار، پێی دەگوترێ: (دَرَکات)، بەڵام (دَرَج) ئەوەیە بەرەو سەر بڕۆی، قادرمەی بەرەو سەر، بۆ بەرزبوونەوەیە .

دەڵێن: شەیتان کورسییەکی بۆ دادەنێن لە تەختی بنی دۆزەخدا، لەسەر کورسییەکەی دادەنیشێ، ئنجا ئەو وتارە دەداتو ئەو قسانەیان بۆ دەکا، کە بێگومان قسەکانی شەیتان کە لە دۆزەخداو لە قیامەت دا دەیانکات، هەموویان ڕاستن :

١ / دەڵێ: خوا بەڵێنی ڕاستی پێدانو ڕاست بوو، قسەکەی وایە، خوا بەڵێنی ڕاستی پێدانو بەڵێنەکەی خوا هاتە دی .

٢ / دەڵێ: من بەڵێنم پێدانو درۆم کرد، ڕاست دەکات .

٣ / دەڵێ: من دەسەڵاتم بەسەرتاندا نەبوو، کە بە زۆر بتانخەمە سەر ڕێی خۆمو بتانکەمە شوێنکەوتووی خۆم، لە ڕێی خوا لاتان بدەم، ڕاستی کردوە .

٤ / دەڵێ: تەنیا ئەوە بوو کە من بانگم کردنو وەڵامتان دامەوە، ئەوەش ڕاست دەکات .

٥ و ٦ / کە دەڵێ: لۆمەی من مەکەنو لۆمەی خۆتان بکەن، فیعلەن دەبێ خەڵك لۆمەو سەرکۆنەی خۆیان بکەن، چونکە شەیتان ئەرکی خۆی ئەنجام داوە، شەیتان ئەرکی شەیتانیی خۆی ئەنجام دەدا، دووپشك ئەگەر پێوە نەدات، دووپشك نیە، سروشتی شەیتان وایە .

٧ و ٨ / کە دەڵێ: نە من لە فریای ئێوە دێم، نە ئێوە لە فریای من دێن، لەوەشدا ڕاست دەکات .

٩ / کە دەڵێ: من بێبڕوام بەوەی کە منتان کردە هاوبەشی خوا، چونکە خوا هاوبەشی نیە، لەوەشدا ڕاست دەکات .

١٠ / ئەگەر ئەوەش قسەی ئەو بێ کە دەڵێ: ستەمکاران سزای بە ئێشیان هەیە، لەوەشدا هەر ڕاست دەکات .

گوتراوە: دوایی شەیتان دەڵێ: کامەشتان لە شوێنی خۆی ناڕازییە، با بێ شوێنەکەمی لەگەڵدا دەگۆڕمەوە! شەیتان لە تەختی بنی دۆزەخ دایە، شوێنی

لە هی هەموو کەس ناخۆشترە دەڵێ: کێ لە شوێنی خۆی نارازییە، هەر ئەوەندەم پێ دەکرێ، شوێنەکەی خۆمی لەگەڵ بگۆڕمەوە! هەرچەندە ئەمە لە ئایەتەکاندا نەهاتووەو، لە فەرمایشتیشدا نەهاتوە، بەڵام قسەیەکی زۆر مەعقووڵەو ڕەنگە شەیتان ئەوەشیان پێ بڵێ، ئەو هەموو قسانەی پێ گوتوون، دوور نیە ئەوەشیان پێ بڵێ .

**مەسەلەی چوارەمو کۆتایی** : خرانە نێو بەهەشتی بڕوادارانی کردەوە باش بە مۆڵەتی پەروەردگاریان :

خوا دەفەرموێ : ﴿ وَأُدْخِلَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ ۖ تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ ﴿٢٣﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە ، لە سێ برگەدا :**

**برگەی یەکەم :** - ﴿ وَأُدْخِلَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾، ئەوانەی بڕوایان هێنا بووو، کردەوە باشەکانیان ئەنجام دابوون، خرانە نێو چەند باخو بێستانێکەوە کە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن .

هەڵبەتە ئەوە نیە یەکسەر بچنە نێو باخەکەوە، وەك لە شوێنی دیکەدا باس دەکات: کۆشكو تەلارو هەموو هۆکارەکانی خۆشگوزەرانیی، هەن، بەڵام دیمەنەکە لە دوورەوە، هەمووی باخو گوڵو گوڵزارو کانیو سەرچاوەو ڕووبارە .

**برگەی دووەم :** - ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ ﴾، بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە بە مۆڵەتی پەروەردگاریان، کە دەفەرموێ: بە مۆڵەتی پەروەردگاریان، ئەمە ئاماژەیە بەوەی کە خوا گرنگییان پێ دەداو بایەخیان پێ دەداتو، مشووری لێ خواردوون .

**بڕگەی سێیەم :** - ﴿ تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ ﴾، سڵاوکردنیان لەوێدا، بریتیە لە : سەلام، یانی: ئاشتیی، سەلامەتیی‌و بێ بەڵایی‌و، بێ گرفتاریی .

ئنجا ئەمە وەك پێشتر باسمان کرد :

١) دەگونجێ مەبەست پێی سەلامی خوا بێ، وەك لە سوورەتی (یس)دا خوا دەفەرموێ : ﴿ سَلَٰمٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ ﴿٥٨﴾ ﴾، واتە: سەلامێکە دەگوترێ، لەلایەن پەروەردگارێکی میهرەبانەوە .

٢) دەگونجێ لە فریشتەکانەوە بێ : ﴿ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيْكُم ﴿٢٤﴾ ﴾الرعد، واتە: فریشتەکان لە هەموو دەرگاکانەوە لێیان دەچنە ژوور دەڵێن : سڵاوتان لێ بێ .

٣) دەشگونجێ هەندێکیان بەو شێوەیە سڵاو لە یەکدی بکەن، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ : ﴿ دَعْوَىٰهُمْ فِيهَا سُبْحَٰنَكَ ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ ۚ وَءَاخِرُ دَعْوَىٰهُمْ أَنِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠﴾ ﴾یونس، واتە: پاڕانەوەیان هەر بریتیە لە (پاکیی بۆ تۆ ئەی خوایە!)و سڵاوکردنیان بریتیە لە : سەلام‌و دوا قسەشیان بریتیە لە : ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکان .

خوا بە لوتف‌و کەرەمی خۆی ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ، کە دەیانخاتە نێو باخ‌و بێستانەکانی خۆی‌و گوڵ‌و گوڵزارەکانی خۆیەوە، ئەو شوێنەی خوا بۆ دۆستەکانی خۆی ئامادەی کردوە، خوا بە لوتف‌و کەرەمی خۆی ئێمە لە دۆستانی خۆی بگێڕێ، بەهۆی شوێنکەوتنی پێغەمبەری خاتەمەوە ﷺ، کە ئەویش تەواوکەرو شوێنکەوتووی هەموو پێغەمبەرانی خوایە، خوا بە لوتف‌و کەرەمی خۆی ئێمەش لەو کاروانە نوورینەدا حیساب بکات، تاکو بەو سەرەنجامە خێرە بگەین .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چوارەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان یازدە (١١) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (٢٤ – ٣٤)، لەو (١١) ئایەتەدا، پێنج مەبەستی سەرەکیی خراونەتە ڕوو:

١/ وێنە هێنانەوە بۆ وشەی پاکو چاکو، وشەی پیسو خراپ، بە درەختێکی چاکو پاکو بەردارو، پنجە ڕووەکێکی پیسو زیانبەخش .

٢/ خستنە ڕووی کاریگەریی و شوێنەواری وشەی پاکو چاکو، وشەی خراپو زیانبەخش، لە ژیانی مرۆڤەکاندا .

٣/ باسی ئەوانەی کە لە جیاتی سوپاسگوزاریی خوا ﷻ، سپڵەیی دەکەنە پیشەیانو، سەرەنجامی شوومیان لە دنیاو دواڕۆژدا .

٤/ ئامۆژگاریی و ڕێنمایی خوا ﷻ بۆ پێغەمبەر ﷺ کە بە بڕواداران بفەرموێ: نوێژ بەرپا بکەنو، بە ئاشکراو بە پەنهان لە ماڵو سامانێک کە خوا پێی داون، لە پێناوی خوادا ببەخشن .

٥/ باسو پێناسەی خوای بەرزو مەزن ﷻ، لە میانی خستنە ڕووی [redacted] (١٠) لە چاکەو نیعمەتە زۆرو نەژمێراوەکانیدا .

﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا
فِي ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾ تُؤْتِيٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينِۭ بِإِذْنِ رَبِّهَاۗ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ
لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٥﴾ وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ ٱجْتُثَّتْ مِن فَوْقِ
ٱلْأَرْضِ مَا لَهَا مِن قَرَارٍ ﴿٢٦﴾ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ
ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْءَاخِرَةِۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴿٢٧﴾ ۞ أَلَمْ تَرَ إِلَى
ٱلَّذِينَ بَدَّلُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ كُفْرًا وَأَحَلُّوا۟ قَوْمَهُمْ دَارَ ٱلْبَوَارِ ﴿٢٨﴾ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَاۖ وَبِئْسَ
ٱلْقَرَارُ ﴿٢٩﴾ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِهِۦۗ قُلْ تَمَتَّعُوا۟ فَإِنَّ مَصِيرَكُمْ إِلَى
ٱلنَّارِ ﴿٣٠﴾ قُل لِّعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً
مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خِلَٰلٌ ﴿٣١﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ
مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْفُلْكَ لِتَجْرِيَ
فِي ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْأَنْهَٰرَ ﴿٣٢﴾ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ دَآئِبَيْنِۖ
وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ﴿٣٣﴾ وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُۚ وَإِن تَعُدُّوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ
لَا تُحْصُوهَآۗ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ﴿٣٤﴾ ﴾.

# مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئایا نابینی (بە چاوی عەقڵ و دڵ) چۆن خوا وێنەیەکی هێناوەتەوە: وشەیەکی ڕاست و چاك، وەك درەختێکی چاك و بەرهەمدارە، کە ڕیشەو بنکەکەی چەسپاوەو، لق و پۆپەکانی بەرزن ﴿٢٤﴾ بە مۆڵەتی پەروەردگاری، هەموو کاتێك میوەکەی دەدات و، خوا وێنان بۆ خەڵکی دێنێتەوە، بەڵکو بیریان بکەوێتەوە ﴿٢٥﴾ وێنەی وشەیەکی پیس و زیان بەخشیش، وەك پنجە ڕووەکێکی زیانبەخشە، کە لە زەوی هەڵکەنرابێ و، چەسپاویی نەبێ ﴿٢٦﴾ خوا لە ژیانی دنیاو لە دواڕۆژیشدا، بە وشەی ڕاست و چەسپاو، ئەوانەی بڕوایان هێناوە، دەچەسپێنێ (دامەزراو دەکات)، ستەمکارانیش (بەهۆی وشەی ناڕاست و خراپ)ەوە گومڕا دەکات و، خوا هەرچی بیەوێ دەیکات ﴿٢٧﴾ ئایا سەرنجی ئەوانەت نەداوە، کە لە جێی سوپاسگوزاریی، ناسوپاسییان لە بەرانبەر چاکەی خوادا داناوەو، خەڵکەکەی خۆیان تووشی ماڵ وێرانیی کردوە! ﴿٢٨﴾ دەچنە دۆزەخەوەو خراپترین نشینگەشە (دۆزەخ) ﴿٢٩﴾ بۆ ئەوەی خەڵك لە ڕێی خوا گومڕا بکەن، هاوتایانی بۆ دادەنێن، بڵێ: ڕابوێرن بێگومان سەرەنجامتان بەرەو ئاگرە ﴿٣٠﴾ بەو بەندانەم کە بڕوایان هێناوە بڵێ: نوێژ بەرپا بکەن و، لەوەی پێماندان، بە پەنهانیی و بە ئاشکرا ببەخشن، بەرلەوەی ڕۆژێك بێ، نە کڕین و فرۆشتنی تێدایەو، نە دۆستایەتیی ﴿٣١﴾ خوا کەسێکە ئاسمانەکان و زەوی دروستکردوون و، لەسەرێوە ئاوی دابەزاندوە، لە بەروبوومەو میوە (جۆراو جۆر)ەکانی لە زەوی دەرهێناوە کە بژێوتان بێ و، کەشتییەکانی ڕامکردوون، کە بە فەرمانی وی لە دەریادا دێن و دەچن و، ڕووبارەکانیشی بۆ ڕامکردوون، خۆرو مانگیشی بە بەردەوامی بۆ ڕامکردوون و، شەوگارو ڕۆژگاریشی بۆ ڕام و دەستەمۆ کردوون ﴿٣٢﴾ لە هەرچی داواتان کردوە (بە زمانی حاڵ) پێی داون و، ئەگەر چاکەکانی خوا بژمێرن، بۆتان سەرژمێر ناکرێن، بە دڵنیایی مرۆڤی بێبڕوا، یەکجار بڵێی ستەمکارو سپڵەیە (بەرانبەر بە خوا) ﴿٣٤﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

( مَثَلًا ): (المَثَلُ: عِبارَةٌ عَنْ قَولٍ فِي شَيءٍ يُشْبِهُ قَولاً فِي شَيءٍ آخر، بَيْنَهُما مُشَابَهة لِيُبَيِّنَ أحَدُهُما الآخرَ ويُصَوِّرَهُ، نَحْوَ قَولِهِم: الصَّيْفَ ضَيَّعْتِ اللَّبَن، أي: أهْمَلْتِ وَقْتَ الإمْكانِ أمْرَكِ) .

وشەی (مَثَلْ) لە قورئانداو، لە زمانی عەرەبییدا، بە مانای سیفەتو وێنەو حاڵ دێ، بەڵام لێرەدا ئەم (مَثَلْ)ە، (ضَربُ المَثَل): پەندو وێنە هێنانەوە، بریتیە لەوە کە قسەیەك لەبارەی شتێکەوە کرابێ، بە قسەیەك بچێ، کە دەربارەی شتێکی دیکە کراوە، کە لە نێوانیاندا وێکچوون هەیە، تاکو یەکێکیان ئەوی دیکە ڕوون بکاتەوە، بۆ وێنە: ئەو پەندە کە لە عەرەبییدا هەیە: (الصَّيْفَ ضَيَّعْتِ اللَّبن) لە هاوینێدا شیرەکەت زایە کردوە، یانی: کاتێك کە گونجاو بوو، کاری خۆتت پشتگوێ خست .

ئەمە قسەی پیاوێکە بە ئافرەتێکی گوتوە، کە دیارە لە هاوینێدا دەبێ داوایەکی لێی بووبێ، شووی پێ بکات، ئەویش وەڵامی نەدابێتەوە، دوایی لە زستاندا، یاخود لە وەرزێکی دیکەی غەیری هاویندا، ئەو ئافرەتە چووبێتە بەر دەرگای ئەو پیاوەو داوایەکی لێ کردبێ، بەو واتایە کە هاوکاریی بکات، ئەویش ئەو قسەیەی پێ گوتوە: (الصَّيْفَ ضَيَّعْتِ اللَّبن) لە هاوینێدا شیرەکەت زایە کرد، دیارە داوایەکەی ئەوە بووە، کە شیری پێ بدات، سپیەمەنیی پێ بدات، وا دیارە هەژار بووە، ئەویش پێی دەڵێ: لە هاوینێدا شیرەکەت زایە کرد، واتە: ئەگەر لە هاوینێدا وەڵامی منت دابایەوە، ئێستا شیرت دەبوو، یانی: لە کاتێکدا کە من کارێکم بە تۆ بوو، تۆ کاری منت جێبەجێ نەکرد، منیش ئێستا کاری تۆ جێبەجێ ناکەم .

( كَلِمَةً ): وشەی (كَلِمَة) بە کوردیی دەڵێین: وشە، بەڵام لە بەکارهێنانی قورئاندا، وێڕای خودی وشە، مانای بڕیاریش دەگەیەنێ‌و، مانای بەرنامەش

دەگەیەنێ‌و، مانای ئیرادەو ئیزنی خوای پەروەردگاریش دەگەیەنێ‌و، مانای قورئانیش دەگەیەنێ، وەك لە ئایەتی (١١٥)ی سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ﴾، وشەی (كَلِمَة) لەوێدا مەبەست پێی قورئانە، واتە: فەرمایشتی خوا، تەواوی کردوە لە ڕاستیی‌و لە دادگەرییدا .

( طَيِّبَةً ): (الطَّيِّبة: أصْلُ الطَّيِّبِ ما تَسْتَلِذّهُ الحَواسُّ، وَما تَسْتَلِذّهُ النَّفْسُ)، وشەی (طَيِّب) هەر شتێك هەستەوەرەکان چێژی لێوەردەگرن‌و، نەفس چێژی لێ دەکات‌و، پێی شتێکی چاکە، بۆیە بە بۆنی خۆش دەگوترێ: (طيب)و، بە زەوییەکی بە پیت دەگوترێ: (أرض طَيِّبة)و بە مرۆڤێکی باش ئەگەر پیاو بێت، دەگوترێ: (طَيِّب)و ئەگەر ئافرەت بێ پێی دەگوترێ: (طَيِّبة) وەك لە سوورەتی (النور)دا، خوای پەروەردگار بەکاریهێناوە .

( أَصْلُهَا ثَابِتٌ ) : واتە: بنکەکەی چەسپاوە، (أَصْلُ الشيءِ: قَاعِدَتُهُ) وشەی (أَصْل) واتە: ڕیشە‌و بنك، بریتیە لەو بنچینەیەی کە ئەو شتە لەسەری دەوەستێ .

( وَفَرْعُهَا ) : (فَرْعُ الشيءِ: غُصْنُهُ، جَمعُهُ فُرُوع)، (فَرْع) واتە: لق‌و پۆپ، بە (فروع) کۆ دەکرێتەوەو بە مانای (غُصن)ەو (غُصن)یش بە (اغصان) کۆ دەکرێتەوە، واتە: لق‌و پۆپەکانی درەخت.

( ٱلسَّمَآءِ ) : (سماء) لێرەدا بە مانای بەرزیی دێ، (وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ) لق‌و پۆپەکانی لە بەرزییدان، بەرز بوونەتەوە .

( أُكُلَهَا ) : (الأُكُلُ وَالأُكْلُ: ما يُؤْكَلُ) (أُكُل) و (أُكْل) هەردووکیان بە مانای شتێکن کە دەخورێ، ئنجا بە تەئکید لێرەدا مادام پاڵدراوەتە لای درەختەکە، مەبەست پێی میوەو بەری ئەو درەختەیە .

( كُلَّ حِينٍ ): (الحِيْنُ: وَقْتُ بُلُوغُ الشيءِ وَحُصُولِهِ، وَهُوَ مُبْهَمُ المَعْنَى وَيَتَخَصَّصُ بِالمُضَافِ إِلَيْهِ) وشەی (حِيْن) کاتی گەیشتنی شتێك‌و پەیدا بوونی شتێکە، کە لە ئەسڵدا وشەی (حين) ماناکەی نادیارە، بەڵام بەهۆی ئەو شتەوە کە

دەدرێتە پاڵی، ماناکەی تایبەت دەبێ‌و دیار دەبێ، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (الواقعة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾، ئێوە لەو کاتەدا، واتە: لە کاتی گیانەڵادا، تەماشا دەکەن، تەماشای مردووەکە دەکەن، کە خەریکە گیان بدات، خەریکە ڕووحی لە جەستەی جیابێتەوە، تەماشای دەکەن‌و هیچیشتان بۆ پێ ناکرێ .

( خَبِيثَةٍ ): (الخُبْثُ والخَبيثُ: ما يُكْرَهُ رَدَاءَةً وَخَسَاسَةً)، وشەی (خُبْث) و (خَبيث) هەر شتێکە کە نەویستری، لەبەر خراپییان‌و لەبەر بێ بایەخیانی .

( ٱجْتُثَّتْ ): (جَثَثْتُهُ فَانجَثَّ، وجَثَثْتُهُ فَاجْتُثَّ: إقْتَلَعْتُ جُثَّتَها)، (جَثَثْتُ) واتە: لە ڕیشەوە هەڵمکێشا (فانجَثَّ) هەڵقەندرا، (وجَثَثْتُهُ فاجْتُثَّ) واتە: لە ڕیشەوە هات، یانی : (جُثَّة)ەکەیم هەڵکەند، (جُثَّة)ی هەر شتێك ، کەلەشەکەیەتی.

( وَأَحَلُّوا ): (حَلَّ : نَزَلَ، وَأَصْلُهُ مِنْ حَلِّ الأَحْمَالِ عِنْدَ النُّزُولِ)، وشەی (حَلَّ) واتە: دابەزی، لە شوێنێك نیشتەجێ بوو، ڕیشەکەشی لەوە هاتوە کە کاتێك کاروانێك چووە بۆ شوێنێك بارەکانیان کردوونەوە، لە کاتێکدا ویستوویانە لەوێ بارگەو بنە بخەن، (حَلِّ الأَحْمَال) واتە: کردنەوەی بارەکان (أَحْمَال) کۆی (حِمْل)ە، (حِمْل) واتە: بار .

( دَارَ ٱلْبَوَارِ ): (دار) واتە: مەنزڵگا (بَوَار)یش واتە: وێرانە، یاخود زیانمەندیی، دەگوترێ: (البَوَارُ: فَرْطُ الكَسَادِ، وَكَسَدَ: فَسَدَ، وَعُبِّرَ بِالبَوَارِ عَنِ الهَلاَكِ، بَارَ الشيءُ يَبُورُ بَوْرًا وَ بَوَارًا)، (بَوَار) بریتیە لەوەی شتێك زۆر بێ ڕەمێن بێ، زۆر بێ ڕەواج بێ، وشەی (كَسَدَ) بە (فَسَدَ) لێك دراوەتەوە، واتە: تێکچوو، خراپ بوو، لێرەدا وشەی (بَوار) تەعبیر کراوە بە لەبەین چوون، دەگوترێ: (بَارَ الشيءُ يَبُورُ بَوْرًا وَبَوَارًا) واتە: ئەو شتە لەبەین چوو، فەوتا، نەما .

( دَآئِبَيْنِ ): واتە: هەردووکیان بەردەوامن (الدَّأْبُ: إدامَةُ السَّيْرِ)، (دَأْب) بریتیە لە بەردەوام بوون لەسەر ڕۆیشتن‌و. وشەی (دَأْب) بە: (العَادَةُ المُستَمِرَّة) نەریتێکی بەردەوامیش هاتوە .

(لَا تُحْصُوهَآ ): واتە: بۆتان سەرژمێر ناکرێ، (الإِحْصَاءُ: التَّحْصِيلُ بالعَدَدِ) ئەوەیە کە ژمارەکەی بزانی، خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ ﴾، ئەگەر چاکەکانی خوا بژمێرن، بۆتان سەرژمێر ناکرێن، دەتوانن بڵێن: یەکو دوو سێو چوار، بەڵام ناتوانن ئەندازەکەیو ژمارەکەی چەندە، سەرژمێریی بکەنو دیاریی بکەن، (يُقَالُ أَحْصَيْتُ كَذَا وَذَلِكَ مِنْ لَفْظِ الحَصَى، إِذْ كَانُوا يَعْتَمِدُونَهُ فِي العَدِّ، كَاعتِمَادِنَا فِيهِ عَلَى الأَصَابِعِ) کە دەگوترێ: (أَحْصَيْتُ كَذَا) ئەو شتەم سەرژمێر کرد، لەبەرئەوە وایانگوتوە، کە کاتی خۆی، پشتیان بە دەنکە چەو بەستوە، {(حَصَى) ناوی کۆیە، تاکەکەی (حَصَاة)ە، دەنکە چەوو بەردی بچووك}، وەك چۆن ئێمە بۆ شت ژماردن، پشت بە ئەنگوستەکەکان (پەنجەو قامکەکان) دەبەستین .

## مانای گشتی ئایەتەکان

سەرەتا دەڵێین: خوا ﷻ لە زۆر شوێنی لە قورئاندا وێنەی هێناونەوە، ئنجا لەوبارەوە کە خوا وێنەی هێناوەتەوە بە هێندێ شت، کافرەکان ڕەخنەیان گرتوە، مێش چییە، وێنەی پێ بهێنرێتەوە؟! جاڵجاڵۆکە چییە، وێنەی پێ بهێنرێتەوە؟!

خواش ﷻ لە سوورەتی (البقرة)دا کە سوورەتێکی مەدینەییە، لە ئایەتی ژمارە (٢٦)دا، وەك وەڵامێکی قسەی بێبڕوایان، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْىِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا ﴾، واتە: بێگومان خوا شەرم ناکات وێنە بهێنێتەوە بە مێشوولەو بچووکتر لە مێشوولەش .

﴿ فَمَا فَوْقَهَا ﴾، (أي: في الصِّغَرِ) واتە: لە سەرووی مێشوولەشەوە بێ، لە بچووکییدا، یاخود مێشوولەو لە مێشوولەش گەورەتر .

بۆچی خوا شەرم ناکات وێنە بهێنێتەوە ؟!

چونکە لە ڕاستییدا ئەو ئیعجازو نهێنییەی کە لە مێشوولەدا هەیە، هەر ئەوەش لە فیل و ئاژەڵ و دروستکراوە گەورەکانی دیکەی خوای پەروەردگاردا، هەیەو، گرنگ ئەوەیە مرۆڤ لە بەرانبەر هەموویاندا، هەر دەستە پاچەیەو، ناتوانێ وێنەی وان بهێنێ .

لێرەشدا خوا ﷻ دوو وێنان دێنێتەوە :

١ - وێنەیەکیان بۆ وشەی پاك و چاك، وێنە بە درەختێکی بەرهەمدارو پاك و چاك دێنێتەوە.

٢ - وێنەی وشەی پیس و زیان بەخشیش، بە پنجە ڕووەکێك دێنێتەوە، کە زیانبەخشەو بەرێکی خراپی هەیەو، زۆر بە بێهێزیی لەسەر زەوی ڕواوەو بە دوو پەنجان هەڵدەقەنرێ .

خوا دەفەرمویْ : ﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ ﴾، ئایا نابینی چۆن خوا وێنەی هێناوەتەوە: وشەیەکی پاکو چاك، وەك درەختێکی پاکو چاکو بەرهەمدارە.

(طَيِّبة) وەك پێشتر گوتمان: (طَيِّب): هەر شتێکە کە هەستەوەرەکان چێژی لێ بکەنو نەفسی ئینسان بۆی ئارەزوو بێ‌و، چێژی لێ بکات، لە شتە بەرهەستەکان، هەروەها لە شتە مەعنەوییەکانیش، بە هەمان شێوە، (طَيِّب) واتە: پاکو چاك، سوود بەخشو بە کەڵك.

<u>وێنەی یەکەم</u> : خوا وێنەی هێناوەتەوە، بۆ وشەیەکی پاکو چاکو سوود بەخشو بە کەڵك، بە درەختێکی پاکو چاکو بەرهەمدارو سوود بەخش .

ئنجا خوا ﷻ وێنای درەختەکەمان بۆ دەکاتو دەیکات بە سێ بەشەوە: (أَصل)و (فَرع)و (أُكُلْ) دەفەرموێ :

١- ﴿ أَصْلُهَا ثَابِتٌ ﴾، بنکەکەی چەسپاوە .

٢- ﴿ وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴾، لقو چڵو پۆپەکانی بەرز بوونەوە .

٣- ﴿ تُؤْتِىٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا ﴾، بە مۆڵەتی پەروەردگاری، هەمیشە میوە دەر دەکات .

هەمیشە واتە: چوار وەرزەو، هەموو ڕۆژێ‌و، هەموو شەوێ، کە درەختی وا لە دنیادا نیە، بەڵام خوا دەفەرموێ: ئەگەر درەختێك هەبێ لە دنیادا بەو شێوەیە بێ، ئەوە وێنەی: وشەی باشو چاکە، کە بریتیە لە: خوا بە یەکگرتن (توحید الله)، یاخود بریتیە لە: کۆی بەرنامەو شەریعەتی خوای پەروەردگار.

یاخود وشەی: (كُلَّ حِينٍۭ) واتە: هەر کاتێك کە کاتی بەرگرتنی بێ، کاتی میوە دانی بێ، میوەی خۆی دەر دەکاتو دوا ناکەوێ .

﴿ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴾، خوا وێنان بۆ خەڵکی دێنێتەوە، بەڵکو بیر بکەنەوە، بەڵکو وەبیریان بێتەوە .

وشەی (تَذَكُر): بریتیە لەوە كە ئینسان شتێكی زانیبێت و لەبیری چووبێتەوە دوایی وەبیری بێتەوە ئەو ڕاستییانەی كە شەریعەتی خوا دەیانفەرموێ، ئایین و بەرنامەی خوا هێناونی، سروشتی مرۆڤ و عەقڵی سەلیم و فیطرەتی ساغی، پێیان نا ئاشنا نیە، بەڵكو هۆگریانە، بەڵام ئەوەی دەوێ، كە بیری بكەونەوە، ئنجا خوا ﷻ لە ڕێی وێنە هێنانەوە، وا دەكات ئەو خەڵكە ئەو ڕاستییانەی بیر بكەوێتەوە، كە عەقڵی و سروشتی پێیان ئاشنایەو، هۆگریانە.

**وێنەی دووەم :** ئنجا دێتە سەر وێنەی دووەم و دەفەرموێ : ﴿ وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ ٱجْتُثَّتْ مِن فَوْقِ ٱلْأَرْضِ مَا لَهَا مِن قَرَارٍ ﴾، وێنەی وشەیەكی پیسی زیان بەخش، وەك ڕووەكێكی پیس و زیان بەخشە، كە لەسەر پشتی زەوی هەڵكەندراوە، سەقامگیریی و چەسپاویی نیە.

(شَجَرَة) تاكە، (شَجَر) ناوی كۆیەكەیەتی، بە هەر شتێك دەگوترێ: كە لەسەر زەوی بڕوێ، چ بەرز بێتەوە، وەك: دارو درەخت، كە میوە دەردەكەن، چ زۆر لە زەوی بەرز نەبێتەوەو بچووك بێ، وەك: تەڕەكار و سەوزەو ڕووەك، زۆر لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: مەبەست لە (شَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ) لێرەدا (حَنظَلَة)یە واتە: گوژاڵك، كە بەرێك دەر دەكات، پێی دەڵێن: قەلەفسە، شتێكی تاڵ و بە كەڵك نەهاتوویە، ئنجا ئایا ئەو درەختە، ئەو ڕووەكە پیسە زیانبەخشە چۆنە؟ ﴿ ٱجْتُثَّتْ مِن فَوْقِ ٱلْأَرْضِ ﴾، لەسەر زەوی هەڵقەنراوە، واتە: هەروا بە ئاستەم بە زەوییەوە نووساوەو زۆر بە ئاسانیی هەڵدەقەنرێ بە دوو پێتكان، ﴿ مَا لَهَا مِن قَرَارٍ ﴾، هیچ چەسپاویی نیە، بە پێچەوانەی درەختە پاك و چاكەكەوە، كە ڕەگ و ڕیشەكەی بە زەویدا چۆتە خوارو، قەدو لق و پۆپەكەی بەرز بۆتەوەو، هەمیشەش میوە دەر دەكات، ئەو ڕووەكە پیسە، نە بنكەكەی چەسپاوەو نە لق و پۆپیشی هەیە، بەرز بێتەوە، نە میوەیەكیشی هەیە بە كەڵك بێ، واتە: بیرو بڕوای ڕاست كە ئیسلامە، وەك ئەو درەختە پاكەیە: بووناسیی و ئیمان و عەقیدەكەی دەچەسپێ لە عەقڵ و دڵداو، كردەوەكانی كە مسوڵمان پێیان هەڵدەستێ، وەك لق و پۆپەكانی درەختەكە وان، كە بەرز دەبنەوەو دەبینرێن و

ئاشکران، ڕەوشت و بەها بەرزەکانیش، کە ئینسانی مسوڵمانو، ئینسانی پابەند بە ئیسلامەوەو، تێگەیشتوو پێگەیشتوو لە ئیسلامدا، لە خۆی دا دەیانهێنێتە دی، وەك ئەو میوەیە وایە کە ئەو درەختە پاكو چاکە، دەری دەکات.

دوایی خوا ﷻ باسی شوێنەوارو کاریگەریی هەر کام لە: قسەی باش، یاخود بیرو بڕوای ڕاستو، بە پێچەوانەشەوە: بیرو بڕوای چەوتو زیانبەخشو پووچ، لە ژیانی خەڵکدا ڕوون دەکاتەوەو، دەفەرموێ : ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأٓخِرَةِ ﴾، خوا ﷻ بە هۆی قسەی چەسپاوەوە، کە ئەو وشە پاكو چاکە (كَلِمَة طَيِّبَة)ەکەیە، کە {وشە (كلمة)ش جاری وایە لە زمانی عەرەبیدا، تەعبیری پێ دەکرێ لە کۆی ئیسلام، یان لە کۆی قورئان، یان لە کۆی ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی}، خوا بە هۆی وشەی چەسپاوو ڕیشەدارەوە بڕواداران دەچەسپێنێ لە ژیانی دنیاو، لە دواڕۆژیشدا، ڕاگیریان دەکات، چەسپاوو دامەزراویان دەکات، نەلەخشاویان دەکات .

﴿ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، هەروەها خوا ستەمکاران گومڕا دەکات، ستەمکارانیش ئەوانەن کە لە ژێر کاریگەریی وشەی پیسو زیانبەخشو، بیرو بڕوای پووچو زیان بەخشدان، بەرنامەی پووچو ڕێچکەی شەیتانییو کوێرە ڕێ، خوا ستەمکاران گومڕا دەکات، بە هۆی ئەو کوێرە ڕێو ڕێچکەو بەرنامە پووچانەوە کە لە هەواو ئارەزووی مرۆڤەکانەوە سەرچاوە دەگرن، ﴿ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴾، خوا هەرچی بیەوێ دەیکات، واتە: دەستەڵاتی خواو، ویستی خوا، ڕەهایە هیچ شتێکی لەبەر عاسێ نابێ، بەڵام بە تەئکید خوا ﷻ هەرچی دەیکات، بەجێییە چونکە بەڵێ دەستەڵاتی خوا بێسنوورەو، ویستی خوا بێسنوورە، زانیاریی خوا بێسنوورە بەڵام حیکمەتی خواش بێسنوورە خوا هیچ شتێکی بێجێ ناکاتو لێشی ناوەشێتەوە بیکات .

ئنجا خوا ﷻ باسی کەسانێك دەکات، کە لە ئەنجامی شوێنکەوتنی بیرو بڕوای پووچو، ڕێبازی چەوتو کوێرە ڕێو ڕێچکە شەیتانییەکاندا، خۆیانو خەڵكو کۆمەڵگاکەیانو شوێن کەوتووەکانیان، ماڵ وێرانو زیانبار دەکەن، خوا ﷻ باسی ئەوان دەکات، دەفەرموێ : ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ كُفْرًا ﴾، ئایا

سەرنجی ئەوانەت نەداوە کە لە بەرانبەر چاکەی خوادا، سپڵەیی دەکەنە پیشە، لە جیاتی سوپاسگوزاریی پێشکەش بکەن بە خوا، لە بەرانبەر چاکەکانیدا، بە پێچەوانەوە سپڵەیی و نا سوپاسیی و بێ ئەمەگیی لێ دەپشکوێتەوە، لە بەرانبەر چاکەکانی خوادا؟ ﴿وَأَحَلُّواْ قَوْمَهُمْ دَارَ ٱلْبَوَارِ﴾، خەڵکەکەی خۆشیان دەبەنە مەنزڵگای وێران، دووچاری زیانبارییان دەکەن، دووچاری ماڵ وێرانییان دەکەن، ﴿جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا﴾، لە دنیادا ماڵ وێرانیان دەکەن، بەدبەختیان دەکەن، لە دوا ڕۆژیشدا دەچنە دۆزەخەوە، ﴿وَبِئْسَ ٱلْقَرَارُ﴾، خراپترین شوێنی نیشتەجێبوونیش، دۆزەخە، ﴿وَجَعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلُّواْ عَن سَبِيلِهِۦ﴾ هاوتایان بۆ خوا دانان، بۆ ئەوەی خەڵك لە ڕێبازی خوا لا بدەن، بەهۆی ئەوەوە کە خەڵك شتانێك بپەرستن، دەیانهێننە ڕیزی خواو دەیانکەن بە هاوتای خوا، وەك خوا مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەن و لە ڕاستە شەقامی خوا، کە بریتیە لە: تەنیا بەندایەتیی بۆ خواو تەنیا پەرستنی خوا، گومڕایان دەکەن، ﴿قُلْ تَمَتَّعُواْ فَإِنَّ مَصِيرَكُمْ إِلَى ٱلنَّارِ﴾، پێیان بڵێ: ڕابوێرن، واتە: ژیانی دنیاتان بگوزەرێنن، ئەو ژیانە پێنج و دوو ڕۆژە کەم و کورتە بەسەر بەرن، بەو شێوەیە کە بۆ خۆتان دەتانەوێ، ﴿فَإِنَّ مَصِيرَكُمْ إِلَى ٱلنَّارِ﴾، بێگومان سەرەنجامتان بەرەو ئاگرە، ئاگری دۆزەخ .

ئنجا خوا ﷻ ڕوو لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات، دەفەرموێ : ﴿قُل لِّعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، بەو بەندانەم بڵێ: کە بڕوایان هێناوە، واتە: شوێن وشەی پاك و چاك کەوتوون، شوێن بەرنامەی ڕاستی خوا کەوتوون : ﴿يُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾، با نوێژ بەرپا بکەن، پێشێ پەیوەندییان لەگەڵ خوادا، مەحکەم و گەرم و گوڕ ڕابگرن، ﴿وَيُنفِقُواْ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً﴾، ئنجا با پەیوەندییشیان لەگەڵ بەندەکانی خوادا، چاك بکەن، ئەویش بەهۆی ئەوەوە، کە لەوەی پێمان داون، بە ئاشکرا و بە پەنهانیی، ببەخشن بە مرۆڤەکان و هاوکاریان بن، چاکەیان

لەگەڵ بكەن‌و سوودیان پێ بگەیەنن، چونكە دینداریی‌و مسوڵمانەتیی، وەك دراوێك وایە، دوو ڕووی هەن: ڕووێكیان خواپەرستیی‌و، ڕووێكی دیكەی، خەڵك دۆستیی، ڕووێكی بەندایەتیی بۆ خواو، ڕووێكیشی چاكە لەگەڵ دروستكراوان‌و بەندەكانی خوا، كەواتە: با نوێژ بەرپا بكەن‌و، لەوەی پێمان داون، بە پەنهانیی‌و ئاشكرا، ببەخشن، ﴿ مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ لَّا بَيۡعٞ فِيهِ وَلَا خِلَٰلٌ ﴾، بەرلەوەی ڕۆژێك بێ، كە نە كڕین‌و فرۆشتنی تێدایەو، نە دۆستایەتیشی تێدایە، واتە: نە كڕین‌و فرۆشتنی تێدایە، پارەو دراوو سەروەت‌و سامانێكی تێدا هەبێ، بابای گوناهبارو تاوانبار بیكاتە فەرەبوو، بیكاتە بەلاگێڕەوەی خۆی، نە دۆستایەتیی‌و خاتر گرتن‌و واستە كردنیشی تێدا هەیەو، كەس بە فریای كەس نایەت، هەر كەسەو كردەوەی خۆی .

ئنجا خوا ﷻ لەو سێ ئایەتەی كۆتاییدا، سەرنجمان ڕادەكێشێ بۆ (١٠) لە چاكە بنەڕەتیی‌و نیعمەتە سەرەكییەكانی خۆی، كە بەبێ ئەوان نە ئێمە دەبووین، نە ژیانمان بەردەوام دەبوو، دەفەرموێ : ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزۡقٗا لَّكُمۡۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلۡفُلۡكَ لِتَجۡرِيَ فِي ٱلۡبَحۡرِ بِأَمۡرِهِۦۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلۡأَنۡهَٰرَ ﴾، دیارە ئەم ئایەتە موبارەكە شەش لە چاكەو نیعمەتەكانی خوا دەگرێتە خۆی، دەفەرموێ :

١ و ٢/ خوا ئەو زاتەیە كە ئاسمانەكان‌و زەوی هێناونە دی‌و، پەیدای كردوون .

٣ / ﴿ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ ﴾، لە سەرێوە ئاوی دابەزاندوە، زۆر جاری دیكە گوتوومانە: مەگەر چۆن، دەنا خوا ﷻ ئەوەی كە لە ئاسمان دایدەبەزێنێ، هەر بە وشەی ئاو ﴿ مَآءٗ ﴾ تەعبیری دەكات، چونكە ئەگەر فەرموویای : (مَطَر) هەر بارانی دەگرتەوەو، ئەگەر فەرموویای: (ثَلج) هەر بەفری دەگرتەوەو، ئەگەر فەرموویای : (بَرَد) هەر تەرزەی دەگرتەوە، بەلام (ماء) ئەو ئاوە: لە شێوەی باراندایەو، لە شێوەی بەفردایەو، لە شێوەی تەرزەدایە یاخود لە شێوەی ئاونگ دایە، یان لە شێوەی هەڵم دایە .

٤ / ﴿ فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ﴾، بەو ئاوە لە بەروبوومو میوە (جۆراو جۆر)ەکانی لە زەوی دەرهێناوە، کە بژیوتان بن. ﴿ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾ کە بە (ثِمار)یش هەر کۆ کراوەتەوە، کۆی (ثَمَرة)یە، هەندێك لە زانایان دەڵێن: وێڕای بەری درەختەکانو میوەکان، وەك: خۆخو قەیسیو سێوو هەرمێو هەنارو ئەوانە بەروبوومی دانەوێڵەکانیش دەگرێتەوە: ﴿ وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٌ فَقَالَ لِصَٰحِبِهِۦ ﴿٣٤﴾ ﴾ الكهف. بەهەر حاڵ: چ تەنیا بەروبوومی درەختەکان بێ، واتە: میوەکان، چ وێڕای میوەی دارو درختەکان، دانەوێڵەکانیش بگرێتەوە، هەموو ئەوە: ﴿ رِزْقًا لَّكُمْ ﴾ دەبێتە بژیو بۆ ئێوە.

٥ / ئنجا بۆ نیعمەتی پێنجەم، دەفەرموێ : ﴿ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْفُلْكَ لِتَجْرِىَ فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ ﴾، کەشتیشی بۆ ڕامکردوون. ﴿ ٱلْفُلْكَ ﴾ هەم بە یەك کەشتییش دەگوترێ، واتە: (سَفينة)و هەم بە کۆمەڵێك کەشتییش دەگوترێ، لە یەك کاتدا، واتە: (سُفُن)، کە وا پێدەچێ لێرەدا مەبەست کۆ (جمع) بێ، کەشتییەکانیشی بۆ ڕامو دەستەمۆ کردوون ﴿ لِتَجْرِىَ فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ ﴾، تاکو بە فەرمانی خوا، واتە: بە پێی یاسای خوا، کە دایناوە، بە پێی یاسا گەردوونییەکانی، ئاوی وا هەڵخستوە، کەشتیی بتوانێ پێیدا بڕوات، ﴿ بِأَمْرِهِۦ ﴾، لێرەدا مەبەست لە (أَمر) ئەمری تەکوینیی خوایە، نەك ئەمری تەشریعیی .

٦ / نیعمەتی شەشەم ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْأَنْهَٰرَ ﴾ ڕووبارەکانیشی بۆ ئێوە ڕامو دەستەمۆ کردوون، دەتوانن بە ویستی خۆتان تەصەڕووفیان تێدا بکەن، دەتوانن ڕوویان پێ وەربسووڕێنن، دابەشیان بکەنو ئاودێرییان پێ بکەن، کەڵەكو بەلەمیان تێدا کار پێ بکەن، ڕاویان تێدا بکەن، بەنداویان بۆ دروست بکەنو ئاوەکە پەزمەندە بکەن، دوایی بۆ ئاودێریی بەکاری بێننەوە، بۆ وزەی کارەبا، بەکاری بهێننەوە، وەك سەرچاوەیەك بۆ سامانی ئاژەڵی ماسییو جگە لە ماسیی، بەکاری بێننو... هتد.

٧و٨/ ئنجا بۆ نیعمەتی حەوتەمو هەشتەم، دەفەرموێ : ﴿ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ دَآئِبَيْنِ ﴾، هەروەها خۆرو مانگی بۆ دەستەمۆ کردوون، بۆ ڕامو ملکەچ کردوون، هەردووکیان بەردەوامن، دوا کەوتنیان نیە، ڕۆژێك خۆر یان شەوێك مانگ، پڵتە پڵتێك ناکات، خەفە نابێ، شۆقەکەیان کەم نابێو بەردەوامن .

٩و١٠/ پاشان بۆ نیعمەتی نۆیەمو دەیەم، دەفەرموێ : ﴿ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ﴾، هەروەها شەوگارو ڕۆژگاری بۆ دەستەمۆو ڕام کردوون، ئەوانیش بە دوای یەکدا دێن بە بەردەوامیی .

لە کۆتایی دا دەفەرموێ : ﴿ وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ ﴾، هەروەها لە هەرچی داواتان کردوە پێی داون، واتە: لە هەرچی داواتان کردوە بە زمانی حاڵ، پێی بەخشیون، ﴿ وَإِن تَعُدُّوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ ﴾، ئەگەر نیعمەتەکانی خوا بژمێرن، بۆتان سەرژمێر ناکرێن، ﴿ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ﴾ بێگومان مرۆڤ زۆر ستەمکارەو، زۆریش سپڵەیە، زۆر ستەمکارە، کە ڕێی خوای پەروەردگار ناگرێتە بەر، ستەم لە خۆی دەکات، ﴿ كَفَّارٌ ﴾ لێرەدا صیغەی موبالەغەی (کافر)ە، یانی: بە مانای : زۆر سپڵەیە، زۆر بێ نەزانە، زۆر بێ ئەمەگە، لە بەرانبەر چاکەو نیعمەتەکانی خوای پەروەردگاردا .

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم :** وشەی ڕاست و چاک، وێنەی درەختی ساغ و بەرهەمدارە، لە بەهرەمەندکردنی مرۆڤ و بەختەوەرکردنیدا :

خوا فەرموویەتی : ﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾ تُؤْتِىٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا ۗ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾.

شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە ، لە حەوت برگەدا :

**برگەی یەکەم :** - ﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا ﴾، ئایا سەرنج نادەی؟ نەتبینیوەو تەماشات نەکردوە ؟ چۆن خوا وێنەیەکی هێناوەتەوە !

بە تەئکید لێرەدا مەبەست لە: ﴿ أَلَمْ تَرَ ﴾ ئایا نەتبینی؟ بینینی عەقڵ و دڵە، نەك بینینی چاوی سەر، ئنجا پێشتر ئێمە پێناسەی وێنە (مثل)مان کرد، کە بریتیە لەوە: شتێك بە شتێك بچوێنرێ، لەبەر ئەوەی خاڵی وێکچوویان هەیە، بۆ ئەوەی بە هۆی ئەو شتەوە، کە بەوی دیکە دەچوێنرێ، مانایەکەی ڕۆشنتر بێت و وێنا بکرێ و، چاکتر لێی تێبگەین .

**برگەی دووەم :** - ﴿ كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ ﴾، وشەیەکی پاکی چاك، وەك درەختێکی پاکی چاکە، لەبارەی ( كَلِمَةً طَيِّبَةً ) وە کە مەبەست پێی چییە ؟ چەند ڕایەك هەن :

أ/ زۆرێك لە زانایان گوتوویانە: ﴿ كَلِمَةً طَيِّبَةً ﴾، مەبەست پێی: وشەی خوا بەیەكگرتن (كَلِمَةُ التَوحِيد)ە: (لاَ إِلَهَ إِلاّ الله) یاخود شایەتمان: (لاَ إِلَهِ إِلاَّ الله، مُحَمَّدٌ رَسولُ الله) .

ب/ هەندێکیشیان گوتوویانە : مەبەست لە: ﴿ كَلِمَةً طَيِّبَةً ﴾، وشەی پاكو چاك : قورئانە .

ج/ هەندێکیشیان گوتوویانە : مەبەست پێی : ئیسلامە .

منیش پێم وایە :

ئەگەر بە قورئان لێك بدرێتەوە، یاخود بە گۆی ئیسلام لێك بدرێتەوە، ماناكەی ڕاستتر دەرچێ، چونكە ئەو دابەشكردنەی خوای زانا دەیكات بۆ درەختەكە، كە وشەكەش دەبێ هەمان ئەو سێ بە شانەی هەبن، لەگەڵ گۆی ئیسلامو قورئاندا، دەگونجێ .

**برگەی سێیەم :-** ﴿ أَصْلُهَا ثَابِتٌ ﴾، ئەو درەختە بنكەكەی چەسپاوە، یانی: ڕەگو ڕیشەكەی بلاّوبۆتەوە، مەحكەم بە زەویدا چۆتەخوار، ئەوەش نیشانەی ئەوەیە درەختێكی چاكە، درەختێكی بەرهەمدارە، درەختێكی ساغو بەهێزەو، ڕەگو ڕیشەكانی باش لە زەویدا بلاّودەبنەوەو دەچەسپن .

**برگەی چوارەم :-** ﴿ وَفَرْعُهَا فِي ٱلسَّمَآءِ ﴾، لقو پۆپەكانیشی بەرز بوونەوە بەرەو سەرێ، (فَرع) بە مانای (غُصن) دێ، (غُصن) واتە: لقو پۆپ، (سَماء)یش بە مانای (سەرێ) دێ، كۆی (فَرع)یش (فُروع)ە، یانی: ئەو درەختە، وەك چۆن بنكو ڕەگو ڕیشەكەی بە زەویدا چەسپاوە، لقو پۆپو چڵەكانیشی بەرزبوونەتەوە .

**برگەی پێنجەم :-** ﴿ تُؤْتِيٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا ﴾، هەموو كاتێك میوەی خۆی دەردەكا، بە مۆڵەتی پەروەردگاری .

چونكە (أُكُل)و (أُكْل) هەردووكیان بە مانای ئەوە دێن، كە دەخورێو مەبەست پێی میوەیە، یانی : میوەو بەرەكەی دەر دەكات هەمیشە، لە هەر

کاتێکدا، واتە: لە هەر کاتێکدا کە کاتی بەر دەرکردنی بێ، لە وەرزی خۆیداو لە کاتی خۆیدا ﴿ كُلَّ حِينٍ ﴾، واتە: هەمیشەو بەردەوام، کە ئەگەر مەبەست پێی هەمیشەو بەردەوام بێ، بە تەئکید خوا ﷻ وێنەی بۆ ئیسلام هێناوەتەوە بە درەختێك، کە لە دنیادا بوونی نیە، درەختی وا تەنیا لە بەهەشتدا هەیە، کە هەمیشە، چوار وەرزەو بەردەوام، میوە دەربکات، درەختی وامان بێ شك نایەت لە دنیادا .

<u>برگەی شەشەم</u> : - ﴿ بِإِذْنِ رَبِّهَا ﴾، بە مۆڵەتی پەروەردگاری، لێرەدا مەبەست لە (إذن) (إذن)ی تەکوینییە، واتە: خوای خاوەن‌و پەروەردگاری ئەو درەختە ، وای دروستکردوە، کە هەمیشە میوە دەربکات .

<u>برگەی حەوتەم</u> : - ﴿ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴾، خوا وێنان بۆ خەڵکی دێنێتەوە بەڵکو بیریان بکەوێتەوە .

کەواتە: وێنە هێنانەوە مایەی بیرکەوتنەوەی ڕاستییەکان‌و پەند وەرگرتنە مەبەستم ئەوەیە کە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴾، یانی: بە هۆی ئەو وێنانەوە، مرۆڤەکان ڕاستییەکانیان بیر دەکەونەوە، ئەو ڕاستییانەی کە سروشت‌و فیترەتیان‌و عەقڵیان، پێیان ئاشنایەو هۆگریانە، بەڵام لە ئەنجامی لەبیرچوونەوەو سەرگەرم بووناو لە ئەنجامی خوتخوتەی شەیتانەکان‌و، لاساییکردنەوەی کوێرانەو کاریگەرییە خراپەکانی خێزان‌و ژینگەو دەوروبەرو کۆمەڵگاو ستەمکاران‌و.... هتددا، ئەو ڕاستییانەیان لە عەقڵ‌و دڵدا نامێنن، یان لەبیریان دەچنەوە، یاخود کاڵ دەبنەوە، بەڵام خوای پەروەردگار لە ڕێی وێنە هێنانەوەکانەوە، ئەو ڕاستییانەیان بیردەخاتەوە .

کەواتە: خوای کاربەجێ، درەختەکە کە پێ چوێنراو (مُشَبه به)ە، دەکات بە سێ بەش :

١- (أَصل) . ٢- (فَرع) . ٣- (أُكُل) .

ئنجا بەو پێیە بێ، ئەو وشە پاكو چاكەش، كە چوێنراو (مُشَبَّه)ەكەیە ئەویش سێ بەشە :

یەكەم : (أَصل): ئەو بووناسییو ئیمانو عەقیدەیە، كە لە عەقڵو دڵدا دەچەسپێ، لە جێی ڕەگو ڕیشەو بنكی درەختەكەیە .

دووەم : (فَرْع): لە ئەنجامی ئەو ئیمانو عەقیدەیەدا كە لە دڵدا چەسپاوە: ئەو كردەوە باشانە پەیدا دەبن، تاعەتو فەرمانبەریی پەیدا دەبێ، كە وەك چۆن لقو پۆپەكان بەرز دەبنو دیارنو بەرچاون، كردەوەكانی مرۆڤەكانیش، كە لە بووناسییو ئیمانو عەقیدە پەنهانەكەیانەوە كە لە عەقڵو دڵیاندا چەسپاوە پەیدا دەبن، ئەو كردەوانەو ئەو پابەندییەش دیارە، ئنجا نوێژە، ڕۆژوویە، ماڵ بەخشینە، فیداكارییە لە پێناوی ئایینو بەرنامەی خوادا، گەیاندنی پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكانە، خۆ ڕازاندنەوەیە بە ڕەوشتی بەرزو جوان، هەڵوێستی چاكو پاكە لە ژیانی تاكییو خێزانییو كۆمەڵایەتییو سیاسییو ... هتددا، هەمووی دەگرێتەوە .

سێیەم : (أُكُـل): ﴿ تُؤْتِىٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا ﴾، ئەوەی كە دەكەوێتە بەرانبەر میوەی ئەو درەختە، بریتییە لەو: ڕەوشتو ئاكارو هەڵوێستو خووخدە جوانو شیرینانەی، كە ئینسانی مسوڵمان خۆی پێیان دەڕازێنێتەوە، كە وەك چۆن درەختەكە هەمیشە میوە دەر دەكات، ئینسانی بڕوادارو هەڵگری ئەو وشە پاكو چاكە، هەڵگری ئەو بووناسییو ئیمانو عەقیدەو، ئەو بەرنامە ڕاستو چاكەش، هەمیشەو بەردەوام ڕەوشتو ئاكارە جوانەكان لە خۆیدا دەردەخاتو بەرجەستەیان دەكات، ئەوە نییە كاتێك ڕاستگۆ بێتو، كاتێكی دیكە، پەنا بەرێتە بەر درۆ ! كاتێك ئەهلی ئەمانەت بێو، كاتێكی دیكە خیانەت بكات ! كاتێك خۆ بە كەمزان بێو، كاتێكی دیكە خۆبەزلگریی لە خۆیدا پێشان بدات ! بەڵكو هەمیشە لەگەڵ هەموو ڕەوشتو ئاكارو چاكو باشەكاندایە .

**مەسەلەی دووەم : وێنەی وشەی پیس و زیانبەخش، وەك ڕووەكێكی بێخێری نەچەسپاوە :**

خوا عز و جل دەفەرموێ: ﴿ وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ ٱجْتُثَّتْ مِن فَوْقِ ٱلْأَرْضِ مَا لَهَا مِن قَرَارٍ ﴿٢٦﴾ ﴾.

**توێژینەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە ، لە سێ بڕگەدا :**

**بڕگەی یەکەم :** - ﴿ وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ ﴾، وێنەی وشەیەکی پیس و زیانبەخش، وەك درەختێکی پیس و زیان بەخشە، وشەی: (شَجَرَة) لە بەکارهێنانی عورف و باوی ئێستای زمانی عەرەبییدا، زیاتر درەخت دەگرێتەوە، ئەوەی کە بەرز دەبێتەوە بەڵام لە ئەسڵی زمانی عەرەبییدا، وشەی (شَجَر) و لێرەدا: (شَجَرَة): ﴿ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ ﴾، زۆربەی زانایان دەڵێن: مەبەست پێی ڕووەکە، چونکە دوایی کە دەفەرموێ :

**بڕگەی دووەم :** - ﴿ ٱجْتُثَّتْ مِن فَوْقِ ٱلْأَرْضِ ﴾، لەسەر ڕووی زەوی هەڵقەنراوە، واتە: بە دوو سێ ڕەگی بێهێز بە زەوییەوە بەستراوە، ئنجا ئەوە لەگەڵ درەختدا ناگونجێ، بەڵکو لەگەڵ ئەو ڕووەکانە دەگونجێ کە بە دوو پێتکان هەڵدەقەنرێن، وەك ڕووەکی گوژاڵك (حَنظَلَة) کە بەرێك دەگرێ، لە هەندێك ناوچان پێی دەگوترێ: قەلەفسە، بە عەرەبیی: (حَنْظَلَة)ی پێ دەڵێن و، بە کوردیی: گوژاڵکی پێ دەڵێن، ڕووەکێکە لە شێوە ترۆزی و خەیاردا، بەزەویدا بڵاو دەبێتەوە، بەڵام بە تەنکید بە دوو پەنجان هەڵدەقەنرێ .

**بڕگەی سێیەم :** - ﴿ مَا لَهَا مِن قَرَارٍ ﴾، هیچ چەسپاویی نیە، ﴿ قَرَارٍ ﴾ واتە: (ثَبَات): چەسپاویی و دامەزراویی .

بێگومان بیروبڕوای قڕیۆك و پووچی ڕێچکەو بەرنامە پووچەکان، لە عەقڵ و دڵی خاوەنەکانیاندا، ناوان، کە بە پشوو[illegible] بایەك هەڵدەقەنرێ، یەکێك

تەماشا دەکەی: ■ دوێنێ لەگەڵ حیزبێك بووە، ئەمڕۆ یەکسەر دەچێتە گەڵ حیزبێکی دیکە، تا دوێنێ ڕووی لە ڕۆژهەڵات بووە: مارکسیزم و کۆمۆنیزم و ماویزم و چی و چی ....، سبەینێ یەکسەر ڕوودەکاتە ڕۆژئاوا: سیکۆلاریزم و کاپیتالیزم و لیبرالیزم و ئەوانە، ڕۆژێکی دیکە ڕوو دەکاتە شتێکی دیکە هیچ هەست بە سەغڵەتییش ناکات! بەڵام کەسێك بووناسیی و ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لە دڵ و دەروونیدا چەسپا بێ، کەسێك هۆگری قورئان بێ و، هەڵگری قورئان بێ و، شوێنکەوتووی ئیسلام بێ، ئەوە نیە هەر ڕۆژە ڕەنگێك بنوێنێ و، هەر ڕۆژە ڕوو لە ڕووگەیەك بکات و، هەر ڕۆژە ڕوو لە شتێك بکات، بەڵکو چەسپاوو دامەزراوە .

<u>مەسەلەی سێیەم</u> : خوا ﷻ بڕوادارانی لە دنیاو دوا ڕۆژدا ، بەهۆی بەرنامەی چەسپاوی خۆیەوە، ڕاگیرو دامەزراو دەکات و، ستەمکارانیش بەهۆی ڕێچکە کوێرە ڕێیەکانیانەوە گومڕاو سەرگەردان دەکات :

خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْـَٔاخِرَةِۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّـٰلِمِينَۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴿٢٧﴾ ﴾.

شیکردنەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە ، لە چوار بڕگەدا :

<u>بڕگەی یەکەم</u> : - ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ ﴾، خوا ﷻ ئەوانەی بڕوایان هێناوە بە قسەی چەسپاو، دامەزراو دەکات.

ئایا لە کوێ و کەی ، دامەزراویان دەکات ؟

<u>بڕگەی دووەم</u> : - ﴿ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْـَٔاخِرَةِ ﴾، لە ژیانی دنیاداو لە دواڕۆژیشدا .

جەسپاویی لە ژیانی دنیادا ئەوەیە: کە مرۆڤی مسوڵمان پابەندە بە بەرنامەی خواوە، پابەندە بە حەڵاڵ و حەرامی خواوە، پابەندە بە ئیمان و عەقیدەی خۆیەوە، پابەندە بە پەرستشەکانیەوە، پابەندە بە ڕەوشتەکانیەوە، پابەندە بە هەڵوێستەکانیەوە، لە دنیادا بە ملاولادا ناچێ، وەك گوڵەبەڕۆژە نیە هەر ڕۆژە ڕوو لە لایەك بکات، بەڵکو ئەلەخشاوو بەرچاو ڕوونە.

بەنسبەت دوارۆژیشەوە ، دیارە کە خوا ﷻ برواداران پێ جەسپاو دەکات، لە کاتی پەڕینەوەیان بەسەر پردی سەرپشتی دۆزەخداو، لە سەرجەم وێستگەکانی دیکەدا .

**بڕگەی سێیەم :** - ﴿ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، خوا ستەمکاران گومڕا دەکات، کەواتە: بەهۆی ستەمەکەیانەوە گومڕاو سەرگەردان دەبن، گومڕایان بەهۆی ستەمەکەیانەوە گومڕا دەبن، ئەو ستەمەیان کە لە ڕێچکەو بەرنامە پووچەکانیانەوە، لە هەواو ئارەزووی خۆیانەوە، یاخود خەڵکی وەك خۆیانەوە سەرچاوەی گرتووەو پەیدا دەبێ .

**بڕگەی چوارەم :** - ﴿ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴾، خوا هەرچی بیەوێ دەیکات، واتە: ویستی خوا ڕەهایە، بەڵام وەك پێشتریش گوتمان: ویستی ڕەهای خوا: جووتە لەگەڵ زانیاریی و کارزانیی خوادا، بەڵێ خوا هەموو شتێك دەتوانێ و، هەموو شتێك دەزانێ و، هیچ شتێکی لەبەر عاسێ نابێ و، ویستی خوا ڕەهایە، بەڵام ویستی خوا، لەگەڵ حیکمەت و شارەزاییەکەی دایە، لەوبارەوە ئاماژە بە چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ دەکەین :

أ) { إنَّ العَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بالكَلِمَةِ مِنْ رِضْوَانِ الله تَعَالَى ما يُلْقِي لَهَا بَالاً، يَرْفَعُهُ اللهُ بها دَرَجاتٍ، وإنَّ العَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بالكَلِمَةِ مِنْ سَخَطِ الله تَعَالَى، لا يُلْقِي لَهَا بَالاً يَهْوِي بها في جَهَنَّمَ} {أخرجَهُ أحْمَد برقم: (٨٣٩٢)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦١١٣)} .

واتە: بەندە وشەیەك دەڵێ لە ڕەزامەندیی خوادا، گرنگییشی پێ نادات، خوا بەهۆی ئەو وشەیەوە چەندان پلە بەرزی دەکاتەوەو، جاری وایە بەندە قسەیەك دەکات، وشەیەك دەڵێ لە تووڕەیی خوادا (مایەی تووڕەیی

خوایە)و گوێی پێ نادات، بەڵام بە هۆی ئەو وشەیەوە، دەچێتە قووڵایی دۆزەخەوە .

کەواتە: وشە کەم نیە، بە وشەی پاكو ڕاستو چاك، کە جێی ڕەزامەندیی خوایە، مرۆڤ بەرز دەبێتەوەو، بە وشەی پیسو زیان بەخشو خراپ، کە مایەی تووڕەیی خوایە، مرۆڤ نزم دەبێتەوە لە دنیاو دوا ڕۆژدا.

ب) هەروەها لەبارەی ئەو ئایەتە موبارەکەوە کە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ ءَامَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ ﴾، ئەم فەرموودەیە هاتوە : {الْمُسْلِمُ إِذَا سُئِلَ فِي الْقَبْرِ، يَشْهَدُ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ سُبْحَانَهُ : ﴿ يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ ءَامَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَوٰةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ ﴾} {مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البخاري برقم : (١٣٦٩)، ومسلم برقم : (٢٨٧١)}.

واتە: مسوڵمان کاتێك کە لە گۆڕدایە {واتە: دوای مردنی، ئنجا چ گۆڕی بە نسیب بوو بێ، چ نەبوو بێ، بەڵام تەعبیرەکە بۆیە واهاتوە، چونکە بەزۆریی وایە، خەڵك دەنێژرێ، دەخرێتە گۆڕەوە، ئەگەرنا واتە: دوای مردنی} کە لێی دەپرسێتەوە {دەربارەی ئەوە: کێی پەرستوەو چ ڕێبازێکی بووە ؟} شایەدیی دەدا کە بێجگە لە خوا، هیچ پەرستراوێك نیەو، موحەممەد ﷺ ڕەوانەکراوی خوایە، ئەوە مەبەستە لە فەرموودەی خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ ءَامَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَوٰةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ ﴾، خوا ئەوانەی بڕوایان هێناوە، بەهۆی قسەی چەسپاوو ڕیشەدارەوە (کە وشەی هەقە، بەرنامەی هەقو ڕاستی و خۆیەتی)، لە ژیانی دنیاداو لە دوارۆژدا، چەسپاو دەکات، (کە دەزانن چۆن وەڵامی خۆیان دەدەنەوە) .

ج) هەروەها هەر لەو بارەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك بە هاوەڵانی بەڕێزی خۆی فەرموو: {أَخْبِرُونِي بِشَجَرَةٍ شِبْهِ أَوْ كَالرَّجُلِ الْمُسْلِمِ لاَ يَتَحَاتُّ وَرَقُهَا، وَلاَ وَلاَ وَلاَ، تُؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ} {أخرجه البخاري برقم: (٤٦٩٨)}.

واتە: پێغەمبەر ﷺ لە مەجلیسێکدا فەرمووی: هەوالّم پێ بدەن، دەربارەی درەختێك، وەك پیاوی مسولّمان وایە، (گۆڕەکە کوڕی پیاوان بووە، بۆیە وای فەرمووە، ئەگەرنا ئافرەتی مسولّمانیش هەر وایە) گەلاکانی ناوەرن، (وَلا وَلا وَلا) واتە: ئەو کەمو کورییەی بەسەر دانایەو، ئەوەی بەسەر دانایەو، ئەوەشی بەسەر دانایەت، هەمیشە میوەی خۆی دەردەکات، ئەو درەختە چییە؟! هاوەلان دەلّێن: چوونە نێو دارو درەختو جەنگەلّستانی بیابانو فلانە فلانە فلانە، فەرمووی: نەخێر! دوایی بۆخۆی فەرمووی: مەبەست لەو درەختە، درەختی خورمایە .

ئاشکراشە درەختی خورما، گەلاکەی ناوەریّو ، لە کاتی خۆشیدا میوەی خۆی دەردەخات .

**مەسەلەی چوارەم : پێناسەی بێبڕوایانی ناسوپاسو هاوبەش دانەرو سەرەنجامی شوومیان :**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ كُفْرًا وَأَحَلُّوا۟ قَوْمَهُمْ دَارَ ٱلْبَوَارِ ﴿٢٨﴾ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا ۖ وَبِئْسَ ٱلْقَرَارُ ﴿٢٩﴾ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِهِۦ ۗ قُلْ تَمَتَّعُوا۟ فَإِنَّ مَصِيرَكُمْ إِلَى ٱلنَّارِ ﴿٣٠﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم سێ ئایەتە موبارەکە ، لە حەوت بڕگەدا :**

**بڕگەی یەکەم :-** ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ كُفْرًا ﴾، ئایا سەرنجی ئەوانەت نەداوە کە چاکەی خوایان بە ناسوپاسیی‌و سپلّەیی گۆڕیوە واتە: لەجیاتی ئەوەی سوپاسگوزاریی بکەن لە بەرانبەر چاکەکانی خوادا، سپلّەیی‌و ناسوپاسییان کردۆتە پیشە، ئایا سەرنجت نەداون بە چاوی عەقڵو دڵو تێیان نەفکریوی‌و تێیانەوە ڕا نەماوی؟ کە چ هەڵوێستێکی خراپو، رەفتارێکی خراپو ناشایستیان لە خۆیان وەشاندۆتەوە ؟!

کە دەفەرموێ: ﴿بَدَّلُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ كُفۡرًا﴾، (أُستُعيرَ التَّبديل لِوَضعُ الشَّيءِ في المَوضِعُ الذِّي يَستَحِقُهُ شَيءٌ آخر) لێرەدا وشەی (تبديل) : خوازراوەتەوە بۆ دانانی شتێك لەو شوێنەی کە دەبووایە شتێکی دیکەی لە شوێن دابنرێ، ئەوانە کوفرانیان لە شوێنی سوپاسگوزاریی داناوە، سپڵەییان لە شوێنی سوپاسگوزاریی و بە ئەمەگیی و بە وەفایی داناوە، لە بەرانبەر چاکەکانی خوادا.

ئنجا ئەمە دوو واتای هەن :

یەکەم : لە بەرانبەر چاکەی خوادا، ناسوپاسییان کردوە، سپڵەیی و بێ وەفاییان کردوە.

دووەم : چاکەی خوا کە ئیمانە، بە کوفریان گۆڕیوەتەوە، ئەو نیعمەت و چاکەیەی خوا، کە لە ئایین و بەرنامەکەیدا خۆی دەنوێنێ، لە جیاتی ئەوەی کە بە ئیمان پێشوازیی لەو بەرنامەیە و لە چاکەیەی خوا بکەن، بە بێبڕوایی پێشوازییان لێکردوەو، گۆڕیویانە بە بێبڕوایی و بە سپڵەیی .

بڕگەی دووەم : ﴿وَأَحَلُّواْ قَوۡمَهُمۡ دَارَ ٱلۡبَوَارِ﴾، خەڵکەکەی خۆیان دابەزاندوە لە شوێنێك کە وێرانەیە، ئنجا کەسێك پێش کۆمەڵگاو خەڵکی خۆی بکەوێ و، دوایی بیانبات بۆ وێرانەیەك، لە جیاتی ئەوەی بیانبات بۆ ئاوەدانیی و، بۆ سەر کانیی و سەرچاوەیەك، بۆ شوێنێك کە لێی بەهرەمەند بن، بیانبات بۆ شوێنێك کە لێی زەرەرمەند بن، مانای وایە شتێکی زۆر خراپی کردوە، دەڵێ: (الإحلال: الإنزالُ والمُرادُ بهِ: التَسَبُّبُ فيهِ، والبَوَارُ: الهَلاكُ وَالخُسْرَان) .

کە دەفەرموێ: ﴿وَأَحَلُّواْ قَوۡمَهُمۡ دَارَ ٱلۡبَوَارِ﴾، واتە: خەڵکەکەی خۆیانیان دابەزاندوە، واتە: بوونە هۆکاری ئەوەی کە ماڵ وێرانیان بکەن، (البَوَارُ: الهَلاكُ وَالخُسْرَان) (بوار) بریتیە لە فەوتان و لە زیانباریی .

کە بێگومان ئەمەش زۆر بە بەرجەستەکراویی و، بە ڕوونیی دیارە هەموو سەرانی ئەو حیزب و ڕێچکەو کوێرە ڕێیانەی، کە پێش خەڵکەکەی خۆیان کەوتوون، بەو کوێرە ڕێیانەدا، بەو ڕێچکەو بەرنامە پووچانەدا، کە هەر جارە ڕوویان بە خەڵك کردۆتە شوێنێك و ڕووگەیەك، جارێك ڕوو لە مۆسکۆ

بکەن، جارێك ڕوو لە یەکگین بکەن، جارێك ڕوو لە واشنتۆن بکەن، جارێك ڕوو لە لەندەن بکەن، جارێك ڕوو لە شوێنێکی دیکە بکەن، هەر جارە ڕوویان بە خەڵك کردۆتە شوێنێك، سەرەنجام خەڵکەکەیان ماڵ وێران کردوەو، تووشی زیانبارییو سەربەفەتارەت چوونیان کردوون، ئەوە بە نسبەت دنیاوە.

**برگەی سێیەم :** - ﴿ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا ﴾، بە نسبەت دوارۆژیشەوە: دەخرێنە دۆزەخەوە، دەگوترێ : (صَلَيْتُ الشَّاةَ: شَوَيْتُها، وَهِيَ مَصْلِيَّةٌ)، دەڵێ : ﴿ يَصْلَوْنَهَا ﴾ (صَلي) تەنیا ئەوە نیە بخرێنە نێوی، بەڵکو دەگوترێ : {(صَلَيتُ الشّاةَ) أي : (شَوَيْتُها)}، واتە: مەڕەکەم برژاند، شتێك لە هەموو لایەکەوە ئاگری لێبدات، پێی دەگوترێ: (مَصْلِيَّة) یانی: لە هەر چوار لاوە ئاگری دراوەتەبەر، واتە: ئەوانەش کە دەچنە دۆزەخەوە، لە هەموو لاوە ئاگر ئابڵووقەیان دەدا .

**برگەی چوارەم :** - ﴿ وَبِئْسَ ٱلْقَرَارُ ﴾، دۆزەخیش خراپترین شوێنی نیشتەجێبوونە، دەڵێ : (قَرَّ فِي مَكانِهِ يَقَرُّ قَراراً: ثَبَتَ وَجَمَدَ، والقَرارُ: المُسْتَقَر)، (قَرَّ فِي مَكانِهِ) واتە: لەو شوێنەدا چەسپا (يَقَرُّ قَراراً)، (قَرَار) وەك چۆن بە مانای چەسپانو نیشتەجێبوون دێ، بە مانای شوێنی تێدا نیشتەجێبوونیش دێ .

لێرەدا ﴿ وَبِئْسَ ٱلْقَرَارُ ﴾، یانی: خراپترین شوێنی تێدا نیشتەجێبوون، دۆزەخە، یان خراپترین نیشتەجێبوون، بریتیە لە : نیشتەجێبوونو سەقامگیربوون لە دۆزەخدا .

**برگەی پێنجەم :** - ﴿ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِهِۦ ﴾، ئەوانە هاوتایان بۆ خوا دانان، تاکو خەڵك لە ڕێی خوا گومڕاو سەرگەردان بکەن، ونیان بکەن لە ڕێی خوا، (الأَنْدادُ: جَمْعُ نِدّ، وَهُوَ المُماثِلُ والكُفْؤُ)، (أَنْداد) کۆی (نِدّ)ە، واتە: وێنە، هاوتا، واتە: هاوتایان بۆ خوا داناون، تاکو خەڵك گومڕا بکەن .

کەواتە: لە ڕێی هاوبەش بۆ خوا دانانەوە خەڵك گومڕا دەبێ لە ڕاستە شەقامی خوا، ڕاستە شەقامی خوا بریتیە لە: تەنیا بەندایەتیی بۆ خواو، تەنیا خواپەرستیی، شیرك بریتیە لە: جگە لە خواپەرستیی، هەمیشە ئەو حوکمڕانە خۆ بەزلگرو خۆ فەرزکەرو خۆ سەپێنانەی، چاویان لەوەیە خەڵك کۆیلایەتییان بۆ بکات، خەڵك بەندایەتییان بۆ بکات، ڕەواج بە بیرۆکەی غەیری یەکتاپەرستیی دەدەن، ڕەواج بە نەفسانە دەدەن، ڕەواج بەوە دەدەن کە خەڵك لەگەڵ غەیری خواش، وەك خوا مامەڵە بکاتو، بە پیرۆزو بەرزو مەزنی بگرێ، تاکو زەمینە خۆشبێ بۆ ئەوانیش کە بڵێن: ئنجا مادام ئەو دارو بەردە دەپەرستنو ئەو مانگو خۆرە دەپەرستن، ئێمەش بپەرستن، شتێکی زیادەتان نەکردوە !!

هەمیشە شیرك، بازاڕی فیرعەونو تاغووتو خۆ سەپێنەکانی، ڕەواج پێداوە، بەڵام خوا بەیەکگرتنو تەنیا خواپەرستیی، هەمیشە تەنگی بە فیرعەونو بە حوکمڕانە خۆ سەپێنو بە زەبرو زۆرەکان هەڵچنیوە بۆچی؟ چونکە دەبێ تەنیا خوا بپەرسترێ، (هەر خوا خوایە، ئەوی دیکە هەمووی گاو بایە!)، هەر خوا شایستەی پەرسترانەو ئەوی دیکە، یان وەك خۆتە یان لە خوار خۆتەوەیە .

وشەی : ﴿لِّيُضِلُّواْ﴾ خوێنراویشتەوە: (لِيَضِلُّوا) کە هەر یەك لە (إبن كثير و أبو عَمرو أُوَيس) وایان خوێندۆتەوە، (لِيَضِلُّوا عَن سَبِيلِهِ) بۆ ئەوەی خۆیان لە ڕێ گومڕا بن، بەڵام ﴿لِّيُضِلُّواْ﴾ واتە: غەیری خۆیان لە ڕێی خوا گومڕا بکەن .

<u>بڕگەی شەشەم :</u> - ﴿قُلۡ تَمَتَّعُواْ﴾، بڵێ: ڕابوێرن، ئەمە هەڕەشەیە، وەك لە سوورەتی (الحجر)دا دەفەرموێ: ﴿ذَرۡهُمۡ يَأۡكُلُواْ وَيَتَمَتَّعُواْ وَيُلۡهِهِمُ ٱلۡأَمَلُۖ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ۝٣﴾، واتە: لێیانگەڕێ، با بخۆنو ڕابوێرن، با هیواو ئاوات، بێئاگایان بکات، لەمەودوا دەزانن کە چ ڕێیەکی هەڵەیان گرتوە !

<u>بڕگەی حەوتەم</u> : - ﴿ فَإِنَّ مَصِيرَكُمْ إِلَى ٱلنَّارِ ﴾، بێگومان سەرەنجامتان بەرەو ئاگرە، دیارە کەسێك بە ڕێی غەیری خوادا بڕوا، بێگومان سەرەنجامەکەی هەر ئاگرە کەسێك لە دنیادا شوێن ڕێچکە شەیتانییەکان بکەوێ، لە دواڕۆژدا، هەر قسمەتی دەچێتە لای شەیتان .

لەوبارەوە ئەم فەرموودەیە هاتوە: {عِشْ مـا شِئْتَ، فَإِنَّكَ مَيِّتٌ، وَأَحْبِبْ مَنْ أَحْبَبْتَ، فَإِنَّكَ مُفَارِقُهُ، وَاعْمَلْ مـا شِئْتَ، فَإِنَّكَ مَجْزِيٌّ بِهِ}، {أَخْرَجَهُ الحاكم بِرَقَم: (٧٩٢١)، وَقَالَ: صَحِيحُ الإِسْنَاد، وَوَافَقَهُ الذَّهَبِي، وَالبَيْهَقِي فِي "شُعَب الإِيمان" بِرَقَم: (١٠٥٤١)}.

واتە: ئەوەندەی دەژیی بژی، دوایی هەر دەمری، کێت خۆشدەوێ، خۆشتبوێ هەر لێی جیادەبیەوە، چیت پێ چاکەو چیت حەز لێیە بیکە، بەڵام سەرەنجام سزاو پاداشتت لەسەری دەدرێتەوە (ئەگەر چاکە بێ پاداشت، ئەگەر خراپە بێ سزا).

<u>مەسەلەی پێنجەم</u> : فەرمان کردن بە بڕواداران کە: نوێژ بەرپا بکەن، بە پەنهانیی و ئاشکرا ببەخشن :

خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ قُل لِّعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُنفِقُواْ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خِلَٰلٌ ﴿٣١﴾ ﴾.

**ئوێژینەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە ، لە چوار بڕگەدا :**

<u>بڕگەی یەکەم</u> : - ﴿ قُل لِّعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، بەو بەندانەم بڵێ: کە بڕوایان هێناوە، بڕوایان بە چی هێناوە؟! بڕوایان بە هەموو ئەو شتانە هێناوە کە پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ، بڕوا بە خواو بە فریشتەکانی و بە کتێبەکانی و بە پێغەمبەرانی و بە ڕۆژی دوایی و بە قەدەر .

**برگەی دووەم :** - ﴿ يُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، نوێژ بەرپا بکەن .

**برگەی سێیەم :** - ﴿ وَيُنفِقُواْ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً ﴾، لەوەی پێمانداون، بە پەنهانو بە ئاشکرا ببەخشن .

**برگەی چوارەم :** - ﴿ مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خِلَٰلٌ ﴾، بەرلەوەی ڕۆژێک بێ، کە نە کڕینو فرۆشتنی تێدا هەیە، نە دۆستایەتییو ڕەفاقەتو واستەو واستەکاریی تێدا هەیە .

ئەمە وەك ئایەتەکەی سووڕەتی (الإسراء) وایە کە دەفەرموێ: ﴿ وَقُل لِّعِبَادِي يَقُولُواْ ٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ ﴾، واتە: بە بەندەکانم بڵێ: کام قسەی باشترە ئەوە بکەن، چونکە شەیتان بەینیان تێکدەدا .

هەروەها ئەمە وەك ئەو ئایەتەی سووڕەتی (البقرة) وایە، کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقْنَٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خُلَّةٌ وَلَا شَفَٰعَةٌۗ وَٱلْكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٥٤﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! لەوەی پێمانداون ببەخشن (لە پێناوی خوادا، بۆ هاوکاری خەڵك)، بەرلەوەی ڕۆژێك بێ، نە کڕینو فرۆشتنی تێدایە، نە دۆستایەتیی تێدایە، نە تکاکردنی تێدایەو ، هەر بێبڕوایەکانیش ستەمکارانن .

(الخُلَّة: المَوَدَّةُ ، خَالَلْتُهُ مُخَالَةً وَخِلالاً فَهُوَ خَلِيلٌ)، (خُلَّة) بە مانای خۆشەویستیی دێ، دەگوترێ: (خَالَلْتُهُ مُخَالَةً وَخِلالاً) هەموویان چاوگن، (فَهوَ خَلِيلٌ) ئەو دۆستو خۆشەویستە، (خِلاَل: مَصْدَرٌ مِنْ خَالَلْتُ) چاوگی (خَالَلْتُ)یە، واتە: دۆستایەتییم کرد، یاخود (خِلاَل) کۆی (خَلِيل)ە، (خَلِيل) بە (خِلاَل) کۆدەکرێتەوەو، بە (أَخِلَة)ش کۆدەکرێتەوە (أَخِلَة وَ خِلاَل) هەردووکیان کۆی (خَلِيل)ن، واتە: دۆستانو خۆشەویستان .

**مەسەلەی شەشەم و کۆتایی : ئاساندنی خوا ﷻ لەمیانی پێشاندانی [redacted] (١٠) لە چاکەو نیعمەتەکانیدا :**

خوا عزَّ وجلَّ فەرموویەتی : ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ
مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْفُلْكَ لِتَجْرِىَ
فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْأَنْهَٰرَ ﴿٣٢﴾ وَسَخَّر لَكُمُ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ دَآئِبَيْنِ ۖ وَسَخَّرَ
لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ﴿٣٣﴾ وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ ۚ وَإِن تَعُدُّوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا
تُحْصُوهَآ ۗ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ﴿٣٤﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم سێ ئایەتە موبارەکە لە [redacted] (١٠) بڕگەدا :**

# دە (١٠) لە چاکەو نیعمەتەکانی خوای بەخشەر لە ژیانی مرۆڤدا

**بڕگەی یەکەم :** - نیعمەتی یەکەم و دووەم : ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ﴾، خوا ئەو کەسەیە کە ئاسمانەکان و زەوی هێناونە دی .

هەندێك كەس تێبینییان هەبووە، کە لە مانای وشەی (ٱلَّذِى)دا ، نابێ بۆ خوا بڵێی : (ئەو کەسە)، بەڵام وا نیە، چونکە (ئەو کەسە)، یانی: ئەو زاتە واتە: ئەو خاوەن ژیان و ئیرادەیەی کە ئاماژ[redacted]ی پێ دەکرێ .

ئنجا دیارە بەنسبەت مرۆڤانەوە، ئەوە دیارە چۆنن، بەنسبەت جندەوە دیارە چۆنن، بەنسبەت فریشتانەوە دیارە چۆنن، چونکە کە دەگوترێ: فریشتەیەك هات، یان فریشتەیەك، وەحیی بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا، ئەو فریشتەیە کامە بوو ؟ کام کەسەیان بوو ؟ دەگوترێ : جبریل .

هەروەها خوای پەروەردگار وشەی (شَيْءٍ)ی بۆخۆی بەکارهێناوە، لە سوورەتی (الأنعام) ئایەتی (١٩)دا، دەفەرموێ : ﴿ قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَٰدَةً ﴾، (شَيْءٍ) واتە: شت .

هەروەها لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، فەرموویەتی: {ما شَخصٌ أَغْيَرُ مِنَ اللهِ}[1]، واتە: هیچ کەسێك لە خوا بوێرتر نیە، (شَخصٌ) واتە: (مُشَخَّص) شتێك کە بوونی هەیە .

بە هەر حاڵ بەکارهێنانی وشەی (کەسێك) بۆ خوا، هیچ ئیشکالێکی شەرعیی تێدا نیە .

لێرەدا خوا باسی چاکەی یەکەمو دووەمی خۆی دەکات: کە هێنرانە دی ئاسمانەکانو زەوی و، پەیدا کرانیانە لە نەبوون، کە ئەوە هەر بە قسە خۆشە! چونکە هەموو مرۆڤایەتیی کۆبێتەوە، دەنکە لمێکی پێ پەیدا ناکرێ، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ أَفَمَن يَخْلُقُ كَمَن لَّا يَخْلُقُ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٧﴾ ﴾النحل، واتە : ئایا ئەو کەسەی دەتوانێ شت دروست بکاتو بیهێنێتە دیو، لە نەبوون پەیدای بکات، وەك ئەو کەسە وایە کە ناتوانێ ! ئایا بۆچی بیرتان ناکەوێتەوە ؟

لە ڕاستییدا هێنرانە دی نەك ئاسمانەکانو زەوی، بەڵکو هێنرانە دی هەر شتێك، تەنیا بە خوا دەکرێ ﷻ، بۆیە لە زۆر شوێنی قورئاندا، خوا ئاماژەی بەوە داوەو خوا بەوە پێناسە دەکات، وەك لە سوورەتی (الزمر) ئایەتی (٦٢)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ ﴾، واتە: خوا بەدیهێنەرو پەیداکەری

---

١) أخرجه البخاري برقم (٦٩٨٠) في: ٩٧ كتاب التوحيد: ٢٠ باب قول النبي ﷺ: (لا شخص أغير من الله).

هەموو شتێکە، بەڵێ: پەیداکردنی ئەم بوونە لە نەبوونەوە، تەنیا کاری خوایە، جا ئەوە نیعمەتی یەکەمو دووەم : هێنرانەدی ئاسمانەکانو زەوی .

**برگەی دووەم :** - نیعمەتی سێیەم : ﴿وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾، لە سەرێوە ئاوی دابەزاندوە وەك پێشتریش گوتمان: وشەی ئاو، هەم بەفرو، هەم تەرزەو، هەم بارانو، هەم هەڵمو، هەم ئاوونگو، شەونم، هەمووی دەگرێتەوە .

**برگەی سێیەم :** - نیعمەتی چوارەم : ﴿فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ﴾، بەو ئاوە کە لە سەرێوە ناردوویەتە خوار، لە جۆری میوەگان پێی وەدەردێنێ‌و، پێی دەڕوێنێ، وەك: بژیو بۆتان .

(الـرِّزْقُ: القـوتُ) : بژیو، شتێك کە خەڵك پێی دەژی .

وشەی : (ثَمَـرات)یش دەگونجێ تەنیا بە میوە بگوترێ، بە میوەی درەختەکان، دەشگونجێ بە گۆی بەروبوومی ڕووەکەکان بگوترێ، ج ئەو ڕووەکانەی کە بەرزدەبنەوەو دارو درەختنو هەڵگری میوەجاتن، چ ئەو ڕووەکانەی وەك سەوزە، ج ئەوانەی وەك دانەوێڵە: گەنمە، نیسکە، نۆکە هەرزنە، جۆیە، برنجە .... هتد .

**برگەی چوارەم :** - نیعمەتی پێنجەم: ﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْفُلْكَ لِتَجْرِيَ فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ﴾، کەشتییەکانی بۆ دەستەمۆو ملکەچو ڕام کردوون، تاکو بە نێو دەریادا بڕۆن، بە مۆڵەتی خوا .

(التَّسخيرُ: التَّذْلِيلُ وَالتَّطوِيعُ، وَهُوَ مَجَازٌ فِي جَعْلِ الشَّيءِ قَابِلاً لِتَصَرُّفِ غَيرِهِ فِيهِ)، واتە: (تَسخير) بریتییە لە: مل پێکەچکردنو گوێڕایەڵ کردن، ئەمیش مەجازە لەوەدا کە بە بەکاردێ، بۆ شتێك کە وای لێبکەی غەیری خۆی تەصەڕڕوفی تێدا بکاو، دەستی تێوەرداو بەکاریبێنێ .

بۆ نموونە: کەشتییەکان بە نێو دەریادا دەڕۆن بە فەرمانی تەکوینیی خوا، تۆ تەماشا بکە! ئایا کەشتیی دەتوانێ لەسەر وشکانیی بڕوات!؟ بە تەئکید نەخێر، (إِنَّ السَّفِينَةَ لاَ تَجرِي عَلَى اليَبَسِ) بەڵام خوا ﷻ ئاوی وا لێکردوە کە

وەك گڵ نیە، نەتواندرێ ببڕدرێ، وەك هەواش نیە کە هێندە ڕوون بێ، شت ڕانەگرێ، ئاو لە ڕووی چڕیی (کثافة)یەوە، نێوان گڵو هەوادایە، کەشتییەکان پێیدا دەڕۆنو دەیبڕن .

**برگەی پێنجەم :** - نیعمەتی شەشەم: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْأَنْهَٰرَ ﴾، ڕووبارەکانیشی بۆ ئێوە دەستەمۆو بەردەست کردوون .

ڕووبارەکانیش کە لە سەرچاوەو کانییەکانەوە پەیدادەبن، لە ئاوی بارانو، تەرزەو بەفر کە دەتوێتەوە ئەوەش زۆر جێی سەرنجە: کە هەمیشە شوێنی ئاوی شیرین بەرزترە لە شوێنی ئاوی سوێر، چونکە ئەگەر هاتباو، ئاوی سوێر - کە زۆربەی هەرە زۆری ئاو ، سوێرە ئاوی دەریاو ئۆقیانووسەکان سوێرو تاڵو تفتەو ناخورێتەوە - بەرزتر بووایەو، بەسەر ئاوی شیریندا هاتبایەوە، ئێمە ئاوی شیرینمان دەست نەدەکەوت، بەڵام خوا ﷻ وایکردوە کە ئەو ئاوە تاڵو سوێرە، لە ڕێی ئەوەوە کە تیشکی خۆر لە دەریاکان دەداو، بەشێکی ئاوەکەیان دەکاتە هەڵم، هەڵمەکە تاڵیی‌و تفتیی‌و سوێرییەکەی بەجێدێڵێ‌و، دوای چەند پرۆسەیەك دەبێتە هەور، دوایی ئەو هەورە لە شێوەی بارانو بەفرو تەزرەدا، وەك ئاوێکی شیرینو زوڵاڵ، دێتەوە سەر زەوی بەڵام بەزۆریی لە شوێنە بەرزەکانە، تاکو ئەو ئاوە شیرینە ، لە شوێنی بەرزەوە، بێتەوە بۆ نزمایییەکانو بێ دەشتەکانو، مرۆڤەکان چی پێداویستییان هەیە، بەو ئاوە شیرینو زوڵاڵە جێبەجێی بکەن: ئاودێرییە خواردنو خواردنەوەییە، شۆردنە، کۆکردنەوەیە... هتد، هەموو کاری خۆیانی پێ جێبەجێ بکەنو، ئەوەی لێیان زیاد بوو، بچێتەوە نێو دەریاکان .

**برگەی شەشەم :** - نیعمەتی حەوتەمو هەشتەم: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ دَآئِبَيْنِ ﴾، خۆرو مانگی بۆ دەستەمۆو ڕامو ملکەچ کردوون، کە هەردووکیان بەردەوامن، واتە: بەردەوامە لەسەر ئەو حاڵەتەی کە لە سەرینیی‌و ناگۆڕێن، ڕۆژێ لە ڕۆژان خۆر دوا ناکەوێو پێش ناکەوێ، هەروەها مانگ، وەك لە سوورەتی (یس)دا دەفەرموێ : ﴿ لَا ٱلشَّمْسُ يَنۢبَغِى لَهَآ أَن تُدْرِكَ

ٱلْقَمَرَ وَلَا ٱلَّيْلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِ ۚ وَكُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٤٠﴾﴾، واتە: نە خۆر بۆی هەیە پێش مانگ بکەوێتەوەو، نە شەوگار پێش ڕۆژگار دەکەوێتەوەو، هەرکامێکیان لە سووڕگەیەکی تایبەت بە خۆیدا دەخولێتەوە .

**بڕگەی حەوتەم :** - نیعمەتی نۆیەمو دەیەم: ﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ﴾، شەوگارو ڕۆژگاریشی بۆ ڕامو ملکەچ کردوون .

**بڕگەی هەشتەم :** - ﴿وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ﴾، لە هەرچی ئێوە داواتان کردوە، خوا پێی داون، ئنجا ئایا خەڵك داوای کردوە: خوایە! فڵان شتەمان بدەیەو، فڵان شتەمان بدەیە، بەنسبەت خۆیانەوە، ئایا گوتوویانە: خوایە! با دوو دەستمان هەبنو، دوو پێمان هەبنو، دوو چاومان هەبنو، دوو گوێمان هەبنو، زمانێکمان هەبێو... [redacted] ؟، یان ئایا خەڵك داوای لە خوا کردوە، کە: ئاوی شیرینو زوڵاڵمان پێ بدەو، ئاوی دەریاکانمان بۆ وا لێبکە، کەشتی پێیدا بڕواو، هەوامان بۆ وا لێبکە، فڕۆکە پێیدا بڕواو، زەوییمان بۆ وا لێبکە، بتوانین تەصەڕڕوفی تێدا بکەین!؟ نەخێر کەس داوای لێ نەکردوە .

کەواتە: مانای وایە: هەرچی کە داواتان کردوە بە زمانی حاڵ، نەك بە زمانی وتار، پێمان بەخشیون .

**بڕگەی نۆیەم :** - ﴿وَإِن تَعُدُّوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ﴾، ئەگەر بتانەوێ چاکەکانی خوا بژمێرن، بۆتان سەرژمێر ناکرێن .

یانی: ژماردنەکە دەگونجێ، بەڵام سەرژمێرییەکە، نا، ئەوە کە بزانی ژمارەکەیان چەندە ؟ ئەوە ناژمێردرێ، واتە: (العَدُّ مُمكِنٌ، ولَكِنَّ الإحْصَاءَ غَيرُ مُمكِنٍ)، وشەی (إحصاء)، یانی: سەرژمێری: ژماردن گونجاوە، بەڵام سەرژمێریی ناگونجێ .

**بڕگەی دەیەم :** - ﴿إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ﴾، بێگومان مرۆڤ زۆر ستەمکارەو زۆریش سپڵەیەو، ناسوپاسە .

( كَفَّارٌ ) دەگونجێ صیغەی موبالەغەی (كافِر) بێ، بە مانای بێبڕواو دەشگونجێ صیغەی موبالەغەی (كافِر)بێ، بە مانای (كُفْرَان): سپڵەیی ناسوپاسیی .

لێرە پێویستە ئاماژە بەوە بكەم ، كە ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (یونس)دا سەبارەت بە بوونەوەر بە گشتیی ، لەبارەی خۆرو زەویو مانگەوە، بە تایبەت، لە دوو بابەتدا بە درێژیی قسەمان كردوە، زۆر وردەكارییمان باسكردوون، بۆیە لێرە هەر بەو باسكردنە گشتییە، بەو ئاماژە گشتییە وازی لێ دێنین، بەڵام بە پێویستیی دەزانم، ئاماژە بكەم بە چەند زانیارییەك كە پەیوەندییان بە مرۆڤەوە هەیە :

# چەند زانیاریەك

# كە زانستی مرۆڤناسی تازە پێیان گەیشتووە

١/ سەری هەر مرۆڤێك بەگشتی سێ سەد هەزار (٣٠٠.٠٠٠) مووی لێ دەڕوێ !
هەر كام لەو موانە:

أ) خوێن هێنەرەوە (وَرِید)ی هەیە . ب) خوێنبەر (شریان)ی هەیە .

ج) دەماری هەیە . د) ماسوولكەی هەیە .

هـ) ڕژێنی چەوریی هەیە . و) ڕژێنی ڕەنگیشی هەیە .

٢/ زاكیرەی مرۆڤ (ئەو بەشەی مێشك كە زانیاریی‌و زانراوەكانی تێدا كۆدەكاتەوە)، جێگای (٧٠) ملیار وێنەی تێدا دەبێتەوە قەبارەكەشی بە ئەندازەی دەنكە نیسكێكە !

٣/ لە خوێندا خڕۆكە سوورەكان هەن‌و، خڕۆكە سپییەكان هەن‌و، خڕۆكەی دیكەش هەن كە پێیان دەگوترێ : خەپلەكان (صَفائِح) كۆی (صَفیحَة)یە. لە هەر میللیمەتر سێجا (املم[٢])یەكدا، حەوت سەد هەزار (٧٠٠.٠٠٠) خەپلەی خوێنیی هەیە، كاتێك كە ئینسان شوێنێكی بریندار دەبێ، ئەو خەپلە (صَفیحَة)انە، دێن ئەو شوێنە دەگرن، ئەگەرنا هەر كاتێك ئینسان شوێنێكی بریندار دەبوو، ئەگەر ئەوانە نەبوونایە لە نێو خوێندا، ئەو خوێنە هەر دەهات، تاكو مرۆڤ یەك تنۆكە خوێنی تێدا نەدەما !

٤/ لە هەر میللیمەتر دووجا (١ ملم$^2$)یەکدا لە تۆڕی چاودا، سەد ملیۆن (١٠٠,٠٠٠,٠٠٠) پێشولزییکەری تیشك هەن، بەڵام لە پێشکەوتووترین ئامێری وێنەگرتندا، تەنیا دە هەزار (١٠,٠٠٠) هەیە کە بتوانێ وێنەکان و تیشکەکان وەربگرێ [١].

ئەو وردەکاریانەی کە لە جەستەی مرۆڤدا هەن، هەروەها لە گەردووندا هەن[٢]، زۆر زۆر لەوە زیاترن، کە ئێمە بتوانین لە دەرسێکدا، یاخود لە چەند خولەکێکدا ئاماژەیان پێ بدەین .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ ■ إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

١) تفسير النابلسي ، ج٤، ص٦٣٣، د. محمد راتب النّابلسي .

٢) بەڵام لێکۆڵینەوەی تێرو تەسەل لەبارەی گەردوونەوە بەگشتییو، ئاسمانو کەهکەشانو خۆرو زەوییو مانگو، جەستەی مرۆڤ ■ کۆئەندامەکانیەوە، بەتایبەت ، لە مەوسووعەی: (ئیمانو ئیلحاد)دا، هاتوە {دەروشاوەیی ئیمانو پووچەڵیی ئیلحاد، لەبەر تیشکی زگماك و عەقڵ ■ زانست و وەحیی دا}، چاپی یەکەم/ ٢٠١٩ ز .

# دەرسی پێنجەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە ئایەتەکانی : (٣٥ - ٤١) واتە: حەوت (٧) ئایەت پێکدێ، لەو حەوت ئایەتەدا، خوا ﷻ باسی پاڕانەوەیەکی درێژی ئیبراهیم ﷺ دەکات، ئەویش لە کاتێکدا کە (هاجەر)ی هاوسەری‌و، ئیسماعیلی کوڕی، لە شوێنی ئێستای شاری مەککە لە (حیجاز) بە فەرمانی خوا، نیشتەجێ دەکات .

پاڕانەوەکەی بە داواکردنی: هێمن بوونی ئەو سەرزەمینە، ئەو وڵاتە، کە خوا هێمنیی تێدا بەرقەرار بکات، دەست پێ دەکات .

پاشان بۆ پاراستنی وەچەکەی لە بت پەرستیی‌و، دوایی بۆ بەردەوام بوونیان لەسەر نوێژو خواپەرستیی، پاشان دابینکردنی خواردن‌و بژێو بۆیان، بەو شێوەیە پاڕانەوەکانی دەکات .

﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا وَٱجْنُبْنِى وَبَنِىَّ أَن نَّعْبُدَ
ٱلْأَصْنَامَ ﴿٣٥﴾ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ فَمَن تَبِعَنِى فَإِنَّهُۥ مِنِّى ۖ وَمَنْ عَصَانِى
فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٦﴾ رَّبَّنَآ إِنِّىٓ أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِى بِوَادٍ غَيْرِ ذِى زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ
ٱلْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجْعَلْ أَفْـِٔدَةً مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهْوِىٓ إِلَيْهِمْ وَٱرْزُقْهُم مِّنَ
ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ ﴿٣٧﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعْلَمُ مَا نُخْفِى وَمَا نُعْلِنُ ۗ وَمَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ
مِن شَىْءٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٣٨﴾ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى وَهَبَ لِى عَلَى ٱلْكِبَرِ
إِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ ۚ إِنَّ رَبِّى لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴿٣٩﴾ رَبِّ ٱجْعَلْنِى مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن
ذُرِّيَّتِى ۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَآءِ ﴿٤٠﴾ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لِى وَلِوَٰلِدَىَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ
ٱلْحِسَابُ ﴿٤١﴾ ﴾.

# مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{یاد بکەوە! کاتێك کە ئیبراهیم گوتی: پەروەردگارم! ئەم وڵاتە (شوێنی ئێستای شاری مەککەو دەوروبەری) هێمن‌و بێ ترس‌و بیم بکەو، خۆم‌و کوڕەکانم (ڕۆڵەکانم) لەوە بە دوور بگرە کە بتان بپەرستین (٣٥) پەروەردگارم! ئەو بتانە زۆرێك لە خەڵکیان گومڕا کردوە، ئنجا هەر کەس شوێنم کەوت، ئەوە لە منەو، هەرکەسێکیش سەرپێچیی کردم، بێگومان تۆ لێبووردەی میهرەبانی (٣٦) پەروەردگارمان! من بەشێك لە وەچەی خۆمم، لە شیوێکی بێ ڕووەك کشتوکاڵدا لە لای ماڵی قەدەغەکراوی خۆتدا، نیشتەجێ کردوون، پەروەردگارمان! تاکو نوێژ بەرپا بکەن، ئینجا وا بکە خەڵکێك عەقڵ‌و دڵیان بە لایاندا بچێ‌و، لە بەروبوومەکانیش بژیویان بۆ برەخسێنە، بەڵکو سوپاسگوزاریی بکەن (٣٧) پەروەردگارمان! بە دڵنیایی تۆ دەزانی چی پەنهان دەکەین‌و چی ئاشکرا دەکەین‌و، هیچ شتێك نە لە زەمین‌و، نە لە ئاسماندا، لە خوا پەنهان نابێ (٣٨) ستایش بۆ ئەو خوایەی کە لە کاتی گەورەیی (بە تەمەنیی)دا، ئیسماعیل‌و ئیسحاقی پێ بەخشیم، بە دڵنیایی پەروەردگارم بیسەری پاڕانەوەیە (٣٩) پەروەردگارم ! بمگێڕە بە بەرپاکەری نوێژ، هەروەها وەچەکەیشم (با نوێژکەر بن)، پەروەردگارمان ! پاڕانەوەشمان گیرا بکە (٤٠) پەروەردگارمان! لە خۆم‌و باب‌و دایکم‌و لە بڕواداران ببوورە، لە ڕۆژێکدا کە لێپرسینەوە دێتە گۆڕێ (٤١)}.

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

( ٱلْبَلَدَ ): (المكانُ المُحيطُ المَحدودُ المُتأثِّرُ باجتماع قُطّانهِ وإقامتِهم فيهِ، الجَمْعُ: بلاد وبُلدان)، (بَلَد) بەو شوێنە دەگوترێ: كە چوارچێوەیەكی هەبێ دیاریكراو بێ‌و كارتێكراو بێ، بە كۆبوونەوەی دانیشتووانی‌و نیشتەجێبوونیان تێیدا، بە (بلاد و بُلدان) كۆدەكرێتەوە.

( ءَامِنًا ): (أَصْلُ الأَمْنِ: طُمَأْنِينة النَّفْسِ، وَزَوَالُ الخوف) وشەی (أَمْن) لە ڕیشەدا ئارامگرتنی مرۆڤەو لاچوونی ترس‌و بیمە .

( وَٱجْنُبْنِى ): واتە: بمپارێزە، ﴿ وَٱجْنُبْنِى وَبَنِىَّ ﴾ خۆم‌و كوڕەكانم (یان ڕۆڵەكانم) بپارێزە بە دوورمان بگرە (جَنَبْتُهُ من كَذَا ، أَبْعَدْتُهُ) (جَنَّبَ وَأَجْنَبَ وَجَنَبَ) هەرسێكیان هاتوون (جَنَبْتُهُ من كَذَا) واتە: لەو شتە دوورم خستەوە، هەروەها دەگوترێ: (جَنَّبَهُ وَأَجْنَبَهُ) یانی: دووریخستەوە .

( ٱلْأَصْنَامَ ): كۆی (صَنَم)ە (الصَنَمُ: جُثَّةٌ مُتَّخَذَةٌ مِنْ فِضَّةٍ أَوْ نُحَاسٍ أَوْ خَشَبٍ، وكُلُّ مَعْبُودٍ سوى الله)، (صَنَم) هەر كەلەشێكە كە لە زیو، یاخود لە مس، یاخود لە تەختە، یاخود لە هەر شتێكی دیكە دروست دەكرێ، هەروەها وشەی صەنەم بۆ هەر پەرستراوێكی دیكەی غەیری خواش بەكارهاتوە .

( ٱلْمُحَرَّمِ ): (الحَرَام والمُحَرَّم : المَمْنوعُ مِنْهُ بتَسْخيرٍ، أَوْ مَنْعٍ بَشَريٍّ أَوْ شَرْعيٍّ)، (حَرَام و مُحَرَّم) واتە: پارێزراو قەدەغەكراو ڕێتەدراو، ئەویش چ بەوە كە خوا سبحانە وتعالی وەك یاسایەكی گەردوونیی خۆی، وای لێ كردبێ، یاخود بەشەر ڕێی لێ بگرێ، یاخود لە ڕووی شەرعییەوە، ئەو شتە ڕێی لێ گیرا بێ .

( أَفْئِدَةً ): كـۆی (فُؤاد)ە، (الفُؤَادُ: كَالقَلْبِ إذَا اعتُبِرَ فِيهِ مَعْنَى التَفَوُّدِ أي: التَوَقُّدِ)، (أفْئِدَة) بە (فُؤاد) كۆدەكرێتەوە، لە جیاتی دڵ بەكاردێ، لە حاڵێكدا كە مانای (تَفَوُّد)و (تَوَقُّد) واتە: بڵێسەدار بوون، یاخود گەرمیی هەبوونی تێدا ڕەچاو بكرێ، بەڵام وەك زۆر جاری دیكەش گوتوومە: وشەی (فُؤاد) زیاتر بە مانای عەقڵ بەكارهاتووە، جارجار بە مانای دڵیش بەكاردێ.

( تَهْوِىٓ إِلَيْهِمْ ): (تميلُ) یانی: بە لایاندا دادەچێ، دەگوترێ: (هَوِيتُهُ: أحْبَبْتُهُ، أهْوِيهِ هَوَىً)، (هَوِيتُهُ) یانی: خۆشمویست (أهْوِيهِ هَوَىً)، (تَهْوِىٓ إِلَيْهِمْ ) یانی: (تَميلُ إلَيْهم) بەلایاندا بچێ، كەمەندكێش بكرێ .

( ٱلثَّمَرَٰتِ ): (الثَمَرُ: إسْمٌ لِكُلِّ ما يُتَطَعَّمُ مِنْ أحْمالِ الشَّجَرِ، الوَاحِدَةُ: ثَمَرَة، وَجَمْعُهُ ثِمار وَثَمَرَات) (ثَمَرُ) ناوە بۆ هەر شتێك كە لە بەری درەختەكان بخورێ، كە تاكەكەی (ثَمَرَة)یەو، بە (ثِمارو ثَمَرَات) كۆدەكرێتەوە، ئەوە واتایەكی، بەڵام وەك پێشتر گوتمان: وشەی (ثَمَر) و (ثَمَرات) هەندێك لە زانایانیش بە كۆی بەروبوومی شیناورد، چ ڕووەك بێ، و سەوزە بێ، و دانەوێڵە بێ، چ دارو درەخت بێ، بەكاری دێنن .

( ٱلْكِبَرِ ): واتە: لە كاتی تەمەنی گەورەیی‌و بەساڵدا چوویيدا، (فُلانٌ كَبِيرٌ أي، مُسِنٌ) (الكِبَرُ: التَقَدُّمُ وَالطَّعْنُ فِي السِّنِ)، (كِبَر) ئەوەیە كە مرۆڤ چووبێتە نێو تەمەنەوەو بەساڵدا چووبێ، ئیبراهیم ﷺ وەك دوایی باسی دەكەین: تەمەنی لە سەد (١٠٠) ساڵ نزیك بووە، یاخود زیاتریش بووە، كە خوا سبحانە وتعالى ئیسماعیل‌و ئیسحاقی سەلامی خوایان لێ بێ، پێبەخشیون .

# مانای گشتی ئایەتەکان

ئەم دوعایەی ئیبراهیم ﷺ کاتێك بووە، کە هاجەری هاوسەریو، ئیسماعیلی کوڕی، لەو شوێنەی کە دوایی کەعبەی لێ دروستکردوە، بەجێهێشتنو لەوێدا نیشتەجێی کردن، کە دوایی ئێمە لە ژیانو بەسەرهاتی ئیبراهیمدا ﷺ باسی دەکەینو، لە (صحیح البخاري)دا بە تەفصیلێ هاتوە .

مانای گشتی ئەم ئایەتانەش بە خێرایی دەکەین، چونکە دوایی ئێمە بە درێژیی باسی بەسەرهاتی ئیبراهیم ﷺ دەکەینو، باسی ئەو کاتو حاڵەتەش دەکەین، کە ئەو پاڕانەوەیەی تێدا کردوە، دەفەرموێ : ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا ﴾، یاد بکەوە! کاتێك ئیبراهیم گوتی: پەروەردگارم ! ئەم شوێنە، ئەم وڵاتە پڕ لە هێمنییو ئاسایش بکە، با ترسو بیمی تێدا نەبێو هێمنو ئارام بێ، ﴿ وَٱجْنُبْنِى وَبَنِىَّ أَن نَّعْبُدَ ٱلْأَصْنَامَ ﴾، خۆمو کوڕەکانم بە دوور بگرە، لەوەی بتان بپەرستین، لە بت پەرستیی بمانپارێزەو بە دوورمان بگرە، ﴿ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ ﴾، پەروەردگارم! ئەو بتانە خەڵکێکی زۆریان گومڕا کردوە، ئەو بتانەو ئەوانەش کە لە پشت بتەکانیشەوەن، ﴿ فَمَن تَبِعَنِى فَإِنَّهُۥ مِنِّى وَمَنْ عَصَانِى فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، ئنجا هەر کەسێك شوێنم بکەوێ، بە ڕێی تەنیا خواپەرستییو خوا بە یەکگرتندا، ئەوە لە منەو، هەر کەسێکیش سەرپێچییم لێ بکات، ئەوە تۆ لێبوردەی میهرەبانی، سەرپێچییم لێ بکات واتە:

١) ئەسڵەن ڕێبازی خوا بەیەکگرتن (توحید) نەگرێ .

٢) یاخود: بە گشتیی ڕێبازی خوا پەرستیی بگرێ، بەڵام تووشی گوناحو لادان ببێ، کە دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر قسەی لێ دەکەین، لەبەر

ئەوەی ئیبراهیم ﷺ دەفەرموێ : ﴿ فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، ئنجا ئایا: کەسێك بە رێی خوا بەیەکگرتندا ئەرواو سەرپێچیی لە ئیبراهیم ﷺ بکات، دەگونجێ داوای لێبوردنو بەزەیی خوای بۆ بکەین ؟ لەوبارەوە ئەو ئیشکالە هەیە، دوایی باسی دەکەین، وەلامەکەی چۆنە !

﴿ رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ ﴾، پەروەردگارمان! من بەشێك لە وەچەو رۆڵەی خۆمم نیشتەجێ کردوە، لە دۆڵێکدا کە رووەكو کشتوکاڵی تێدانیە، لە لای ماڵە قەدەغەکراوەکەی تۆ .

واتە: لە لای ئەو شوێنەی کە دوایی بە فەرمانی تۆ ، ئەو ماڵەی تۆی تێدا بنیات دەنێم، کە ئەو ماڵەی تۆ قەدەغە دەکرێ، کە کەس بتوانێ دەستی لێ بدات، کەس ناتوانێ دەستی لێ بدات: چ وەك قەدەغەکردنی خوایی ﷻ کە خوا بیپارێزێ، چ وەك قەدەغەکردنی شەرعیی، کە نابێ هیچ کەس لەوێدا خراپە بکات، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يُرِدۡ فِيهِ بِإِلۡحَادِۭ بِظُلۡمٖ نُّذِقۡهُ مِنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿٢٥﴾ ﴾الحج، واتە: هەر کەسێك لەوێدا لادان بکاتو، ستەمو خراپە بکات، سزاو ئازارێکی بە ئێشی پێ دەچێژین .

ئنجا ئایا بۆچی ئیبراهیم ﷺ بەشێك لە وەچەکەی خۆی، کە بریتی بوون لە هاجەرو، ئیسماعیلی کوڕی، لەوێدا نیشتەجێی کردوون، لەو شوێنەی کە دوایی ئەو ماڵەی خوای تێدا بنیات دەنێ ؟

﴿ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، پەروەردگارمان! بۆ ئەوە، لەوێدا نیشتەجێم کردوون، کە نوێژ بەرپا بکەن، واتە: بەندایەتیی بۆتۆ بکەنو، ببنە چاوساغی خەڵك، ببنە پێشرەوو سەرمەشقی خەڵك، بۆ بەندایەتیی کردن بۆ تۆ، ﴿ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ ﴾، ئنجا وا بکە دڵی کەسانێك لە خەڵك بەلایاندا کەمەندکێش بێو، بە لایاندا بچێ، واتە: دڵیان لێ بدات بۆ سەردانو زیارەتی ئەو شوێنە، کە ئەو ماڵەی تۆی تێدا بنیات دەنێم، ﴿ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾، هەروەها ئەو وەچەیەم کە لەوێ نیشتەجێی دەکەمو، ئەوانەی کە لێشیان پەیدا دەبنو، لێیان

كۆدەبنەوە، بژیویان بدە لە میوەكانو لە بەروبوومەكان ﴿ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ ﴾، بەڵكو سوپاسگوزاریی بكەن .

﴿ رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعْلَمُ مَا نُخْفِي وَمَا نُعْلِنُ ﴾، پەروەردگارمان ! بێگومان تۆ دەزانی ئێمە چی پەنهان دەكەین‌و، چی ئاشكرا دەكەین ؟ ﴿ وَمَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِن شَيْءٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ﴾، هیچ شتێك لە خوا پەنهان نابێ، نە لە زەویداو، نە لە ئاسماندا، نە لە خوارێ‌و، نە لە سەرێ، هیچ شتێك لە خوا پەنهان نابێ، خوا هەموو شتێكی لێ دیارەو لێ عەیانەو، هەموو شتێ بۆ خوا ئاشكرایە .

﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي وَهَبَ لِي عَلَى ٱلْكِبَرِ إِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ ﴾، ستایش بۆ ئەو خوایەی كە لە كاتێكدا كەوتوومە تەمەنەوەو بەساڵدا چووم، ئیسماعیل‌و ئیسحاقی پێ بەخشیم .

ستایش بۆ خوا ، ئەوە هەر بە خوا دەكرێ، پیاوێكی تەمەن سەد (١٠٠) ساڵە یاخود زیاتر لە سەد ساڵ‌و، ئافرەتێكی تەمەن نەوەد (٩٠) ساڵ یان زیاتر، - بەنسبەت سارا خانەوە كە ئیسحاقی بووە - ئەوە بە تەئكید هەر بە خوا دەكرێ، ﴿ إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴾، بێگومان پەروەردگاری من، زۆر بیسەری پاڕانەوانە .

﴿ رَبِّ ٱجْعَلْنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِي ﴾، پەروەردگارم ! بمگێڕە بە بەرپاكەری نوێژو لە وەچەكەشم (با بەرپاكەری نوێژیان تێدا هەبن) .

دەشگونجێ : ﴿ وَمِن ذُرِّيَّتِي ﴾ ئەم (مَنْ)ە بۆ بەیان بێ، (مِن)ی (بَيانِيّة) بێ، نەك (مِن)ی (تَبعيضيَّة)، واتە: با وەچەكەشم هەموویان وا بن كە بەرپاكەری نوێژ بن .

دوایی لە مەسەلە گرنگەكانیشدا باسی دەكەین: كە ئایا ئیبراهیم ﷺ بۆ هەموو وەچەكەی پاڕاوەتەوە ؟ یاخود تەنیا ئیكتیفای بەوە كردوە، كە لە وەچەكەی ئەودا نوێژكەران‌و خواپەرستان هەبن !

﴿ رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَآءِ ﴾، پەروەردگارمان! پاڕانەوەشمان لێ وەربگرە .

﴿ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لِى وَلِوَٰلِدَىَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ ٱلْحِسَابُ ﴾، پەروەردگارمان! لە من ببوورەو لە بابو دایکمو، لە بڕواداران، ڕۆژێك کە لێپرسینەوەو سزاو پاداشت دێتە گۆڕێ .

لێرەش ئیبراهیم ﷺ کە بۆ بابو دایکی پاڕاوەتەوە، بە تایبەتیی بۆ بابی ئازەر، وەك دوایی باسی دەکەین، کاتێك بووە کە جارێ دڵنیا نەبووە، خوا لە بابی خۆش نابێ، ئەگەرنا دوایی لەو هەڵوێستەی خۆی پەشێمان بۆتەوە، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٌ ﴿١١٤﴾ ﴾التوبة، واتە: داوای لێبوردن کردنی ئیبراهیم بۆ بابی، تەنیا بەهۆی بەڵێنێکەوە بوو، کە پێی دابوو، بەڵام دوای ئەوەی کە بۆی دەرکەوت دوژمنی خوایە، دووریی لێ گرت، بێگومان ئیبراهیمیش زۆر بە بەزەییو بە پەرۆشو دڵسووتاو بوو، زۆریش هێدیی مەندو ئارام بووە .

بۆیە ئەو پاڕانەوەیەی بۆ بابی کرد، لە حاڵێکدا کە بابی هەڵوێستێکی زۆر نەرێنییانەی لەگەڵیدا هەبوو .

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**<u>مەسەلەی یەکەم</u> : پارانەوەی ئیبراهیم ﷺ بۆ گێڕانی مەککە بە ولاتێکی هێمن و، دوورخستنەوەی وەچەکەی لە بت پەرستیی :**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا وَٱجْنُبْنِى وَبَنِىَّ أَن نَّعْبُدَ ٱلْأَصْنَامَ ﴿٣٥﴾ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ فَمَن تَبِعَنِى فَإِنَّهُۥ مِنِّى ۖ وَمَنْ عَصَانِى فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٦﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە موبارەکە ، لە چوار برگەدا :**

**<u>برگەی یەکەم</u> : - ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا ﴾، یاد بکەوە! کاتێک ئیبراهیم ﷺ گوتی: پەروەردگارم! ئەم ولاتە هێمن و ئارام بکە، با ترس و بیمی تێدا نەبێ .**

لە ئایەتی (١٢٦)ی سوورەتی (البقرة)دا، هەمان دوعا ئاوا هاتوە: ﴿ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا ﴾، واتە: پەروەردگارم ! ئەم ولاتە بکە بە ولاتێکی هێمن و ئارام، بەلام لێرە لە سوورەتی (ابراهیم)دا دەفەرموێ : ﴿ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا ﴾.

ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿ ٱجْعَلْ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا ﴾، واتە: ئەم ولاتە بکە بە ولاتێک لە ولاتە هێمن و ئارامەکان .

بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿ ٱجۡعَلۡ هَٰذَا ٱلۡبَلَدَ ءَامِنٗا ﴾، بە (ال)ی تەعریف، واتە: ئا ئەم وڵاتە بە دیاریکراویی، بکە بە وڵاتێکی هێمن و ئارام .

ئەم دووانەش تێکناگیرێن، چونکە: ئیبراهیم عليه السلام بە گشتی دوعای کردوە: وڵاتەکان ئارام بن، بەڵام ئەو شوێنەی کە کەعبەی تێدا بنیات ناوە، دوعای تایبەتی بۆ کردوە .

جێی سەرنجە کە ئیبراهیم عليه السلام بەر لە هەر شتێك داوای هێمنیی و ئاسایشی کردوە، چونکە ئەگەر هێمنیی و ئاسایش هەبوو لە شوێنێکدا: پێشکەوتن دەبێ، کارو کەسابەت دەبێ، دەگونجێ ئاژەڵداریی و کشتوکاڵ و پیشەسازیی و ئاوەدانیی هەبێ و، خەڵك بە تەبایی پێکەوە دەژین، بەڵام کە شەڕو شۆڕو ئاژاوەو ناکۆکیی و دووبەرەکیی بوو، لەو شوێنەدا، هیچ شتێك لە جێی خۆیدا نابێ، هەر بۆیەش خوا ﷻ لە سوورەتی قورەیشیشدا ئەو نیعمەتی هێمنیی و ئاسایش و ئارامییە، وەك چاکەیەکی گەورەی خۆی، لە دوو چاکەکانی، دێنێتەوە بیر هۆزی قورەیش :

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ لِإِيلَٰفِ قُرَيۡشٍ ١ إِۦلَٰفِهِمۡ رِحۡلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيۡفِ ٢ فَلۡيَعۡبُدُواْ رَبَّ هَٰذَا ٱلۡبَيۡتِ ٣ ٱلَّذِيٓ أَطۡعَمَهُم مِّن جُوعٖ وَءَامَنَهُم مِّنۡ خَوۡفِۭ ٤ ﴾ القريش.

واتە: بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، بەهۆی هۆگرتنی قورەیشەوە، هۆگرتنیان بە کاروانی زستانەو هاوینە (زستانان بەرەو یەمەن و، هاوینان بەرەو شام یاخود بە پێچەوانەوە)، با خاوەن و پەروەردگاری ئەم ماڵە بپەرستن، کە لە برسیەتیی دا، خواردنی بۆ ڕەخساندوون و، لە ترسیشدا، هێمنیی و ئاسایشی بۆ ڕەخساندوون .

واتە: برسیەتییەکەی بۆ گۆڕیون بە تێریی و، بە خواردن و ڕزق و ڕۆزیی هاتنە دەست، بەهۆی کەعبەوە، بەهۆی بەیتەوە کە پێش ئیسلامیش خەڵك دەچوو بۆ سەردانی کەعبە، ئەو کەعبەیەی، بۆیە ئیبراهیم بنیاتی ناوە کە: تەنیا خوا بپەرسترێ و، خەڵك لە چوار لای دنیاوە دەچوون، ئنجا بەهۆی

ئەوەشەوە، بازرگانیی لێ دەبووو ڕزق و ڕۆزیی بۆ دەچوو، بە پێی دوعاکەی ئیبراهیم، ﴿ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾، پاشان لە ئەنجامی ئەوەدا، ئەو بەیتە لە هەموو لایەکەوە جێی ڕێزو حورمەت بوو: کە ئیبراهیم ﷺ پێغەمبەرێکی کۆ دەنگیی لەسەرکراوو، ئیتفاق لەسەرکراو بوو، لە نێوان هەموو ئەوانەدا کە خۆیان بە شوێنکەوتووی بەرنامە ئاسمانییەکان دەزانن، بۆیە هێمنیی و ئاسایشیشی تێدا هەبوو .

**برگەی دووەم :** - ﴿ وَٱجۡنُبۡنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعۡبُدَ ٱلۡأَصۡنَامَ ﴾، خۆم و کوڕەکانم بە دوور بگرە لەوەی کە بتان بپەرستین .

(وَٱجۡنُبۡنِي ) یانی: (بَعِّدْنِي) (جَنِّبْنِي وَأَجنِبْنِي)، (بَنِيَّ) واتە: کوڕەکانم کە تەنیا دوو کوڕی هەبوون: ئیسماعیل و ئیسحاق، بەڵام زانایان گوتوویانە: دووان (مُثَنَّى)ش، هەر بە کۆ (جمع) دێ، یاخود مەبەست: ئیسماعیل و ئیسحاق و ئەو وەچەیەش بووە کە لەوانیش پەیدا دەبێ، بۆیە فەرمووی: (وَبَنِيَّ ): ئەوەکانم، هەندێکیش دەڵێن: (میدیان)یش هەر کوڕی پێغەمبەر ئیبراهیم ﷺ بووەو، دوعای بۆ هەموویان کردوە .

**برگەی سێیەم :** - ﴿ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضۡلَلۡنَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ ﴾، پەروەردگارم ! ئا ئەو بت و صەنەمانە، خەڵکێکی زۆریان گومڕا کردوە .

(أي: كُنَّ سَبَبَ ذَلِكَ) بوونە هۆکاری ئەوەی کە خەڵکێکی زۆر گومڕا بێ و لە ڕێی خوا، دووربکەوێتەوە .

**برگەی چوارەم :** - ﴿ فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُۥ مِنِّيۖ وَمَنۡ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، هەر کەسێ شوێنم بکەوێ، ئەوە لە منەو هەر کەسێ سەرپێچییم لێ بکات، بێگومان تۆ لێبوردەی میهرەبانی.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَنۡ عَصَانِي ﴾، دەبێ مەبەست ئەوە بێ: (فِيما دُونَ الشِّرْكِ وَالكُفر) واتە: کەسانێك کە سەرپێچییم لێ دەکەن، لە شتانێکدا کە لە خوار شیرك و کوفرەوەن، چونکە شیرك و کوفر، بواری لێبوردنیان تێدا نیە .

یاخود واتایەکەی ئەوەیە: ﴿ وَمَنْ عَصَانِي ﴾، واتە: هەرکەسێ سەرپێچییم لێ بکات بە پەرستنی غەیری تۆ، ئەوە حەوالەی خۆتی دەکەمەوە بێگومان تۆش لێبوردەی میهرەبانی، لێبوردەی و میهرەبانی، بەو واتایە نا، کە وێڕای کوفرو شیرکیشی تۆ لێی دەبووری و بەزەییت پێیدا دێ، بەڵکو بەو واتایە کە پەروەردگار لێبوردەیەو میهرەبانەو، دەبینی کەسانێك هەن: هەرچەندە سەرپێچیی لە فەرمانی ئیبراهیم دەکەن. بەلام لەبەرئەوەی باش پەیامی ئیبراهیمیان پێ نەگەیشتوە، ڕەحمەتی خوا بیانگرێتەوە، لێبوردنی خوا بیانگرێتەوە، لەبەرئەوەی کە پۆزشدار (مَعذور)ن بە نەزانیی (جَهل)، نەزانینێك کە تێیدا کەمتەرخەم نین، یاخود بەهۆی لاسایی کردنەوەوە، یان: بەهۆی لەبیرچوونەوە، یان: بەهۆی بەهەڵەداچوون، یان: ناچارکرانەوە، پۆزشدار (معذور)ن و، ئەوانەش هەموویان هۆکارن، بۆ ئەوەی خوا ﷻ لەگەڵیاندا لێبوردەو بە بەزەیی بێ، بەلام کەسێك بە ئەنقەستو بەبێ بیانوو، هاوبەش بۆ خوا دادەنێ، بێگومان ئەوە لێبوردنو بەزەیی خوا نایگرێتەوە، ئنجا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە: هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، ڕێزی بابیان ئیبراهیمیان ﷺ نەگرتو لەگەڵیدا باش نەبوون و، بە قسەیان نەکردو ڕێبازی ئەویان نەگرت .

<u>مەسەلەی دووەم</u> : داواکردنی ئیبراهیم ﷺ لە خوا، کە لەو بەشە لە وەچەی خۆی کە لە لای ماڵی حەرامی خوادا، نیشتەجێی کردوون بۆ خواپەرستیی، دڵی خەڵکێکی بەلادا کەمەندکێش بکاو، بژێویشیان بۆ برەخسێنێ، بۆ ئەوەی سوپاسگوزار بن :

خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾.

## ئوێژینەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە، لە شەش بڕگەدا

**بڕگەی یەکەم :** - ﴿ رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ ﴾، پەروەردگارمان! من بەشێك لە وەچەی خۆمم نیشتەجێ كرد لە شیوێك، لە دۆڵێكدا كە ڕووەك و كشتوكاڵی تێدا نیە .

(الوَادي: الأَرْضُ بَيْنَ الجِبَال)، (وَادِي) بە زەوییەك دەگوترێ: كە لە نێوان دوو چیایاندا بێ، بە كوردیی: شیو یان دۆڵ .

**بڕگەی دووەم :** - ﴿ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ ﴾، لە لای ماڵە قەدەغەكەی خۆت، (المُحَرَّم) واتە: (المُمَنَّع) پارێزراو، لە چی؟ لەوە كە دەستەكان بیگەنێ و خراپی بكەن، یاخود زیان بەو خەڵكە بگەیەنن، كە لە لای نیشتەجێن .

دەگونجێ مەبەست لە: (المُحَرَّم) قەدەغەكراو بێ، بە پێی یاسا گەردوونییەكانی خوا، دیارە خوا چی بەسەر سوپایەكەی ئەبرەهە هێنا !

یاخود قەدەغە كراو، بە پێی یاسا شەرعییەكانی خوا، كە بە تەئكید لە دوای هاتنی ئیسلامەوە، هەر ئەو مانایەیان مەبەستە، چونكە وەك بینیمان لە سەردەمی حەججاجی كوڕی یوسفی سەقەفییدا، هەروەها لە سەردەمی قەرامیتەدا، كەعبە ڕووخێنراوەو، بەردە ڕەشەكەش دزراوە .

كەواتە: یانی: لە ڕووی شەرعییەوە قەدەغەیەو گوناهە، نابێ خەڵك دەستكاریی بكاتو، زیانی پێ بگەیەنێ، یان زیان بە خەڵكەكەی بگەیەنێ .

**بڕگەی سێیەم :** - ﴿ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، پەروەردگارمان بۆیەش نیشتەجێم كردوون، تاكو نوێژ بەرپا بكەن، واتە: ئەمە هۆكاری نیشتەجێبوونیانە لەوێ .

**بڕگەی چوارەم :** - ﴿ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ ﴾، دڵانێك لە خەڵكی والێبكە، كە بە لایاندا بچن و، بە لایاندا كەمەندكێش بن، دڵیان بۆ وێ بچێ .

**برگەی پێنجەم :** - ﴿وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ﴾، لە بەروبوومەکانیش بژیویان بدە، بۆ ئەوەی سوپاسگوزار بن، کە دەفەرموێ: ﴿فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةً مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ﴾، دڵانی کەسانێکیان بەلادا مەیل بکەو کەمەندکێش بکە، واتە: بۆ ئەوەی بچن لەوێ بازرگانیی بکەن، یان بچن بۆ ئەوێو نیشتەجێ بن، یاخود لەوێ خواپەرستیی و پەرستشەکان ئەنجام بدەنو، سەرەنجام ئەوێ هەڵسو وێڵسو مامەڵەو بازرگانیی بکەوێتێو، ئەو خەڵکەی کە لەوێن، کە هیچ کشتوکاڵو بەروبوومێکیان نیە بەهۆی ئەو بازرگانییو بەهۆی ئەو هاموشۆی ئەو خەڵکەوە، لەوێ ژیانیان بسووڕێو، سەرەنجام سوپاسگوزاریی بۆ تۆ بکەن .

**مەسەلەی سێیەم :** ئیبراهیم ﷺ لە میانی پاڕانەوەکەیدا، زانیاریی خوا ، بە پەنهانو ئاشکرا دەخاتە ڕوو :

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعۡلَمُ مَا نُخۡفِي وَمَا نُعۡلِنُۗ وَمَا يَخۡفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ٣٨﴾.

شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە ، لە دوو برگەدا

**برگەی یەکەم :** - ﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعۡلَمُ مَا نُخۡفِي وَمَا نُعۡلِنُ﴾ ئیبراهیم ﷺ لە درێژەی پاڕانەوەکەیدا دەفەرموێ : پەروەردگارمان! بە دڵنیایی تۆ ئەوەی کە پەنهانی دەکەینو، ئەوەی کە ئاشکرای دەکەین، دەیزانی، واتە: هیچ شتێکت لێ ون نابێت، هەموو شتێك دەزانی، بەڵکو هەموو شتێك دەبینیو هەموو شتێك دەبیستی، چ پەنهان بێ، چ ئاشکراو عەیان بێت .

**بڕگـــــەی دووەم :** - ﴿ وَمَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِن شَيْءٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ﴾،
**هیچ شتێك نە لە زەمینداو نە لە ئاسماندا، لە خوا پەنهان نابێ، واتە: نە لە خوارەوەی دروستکراوەکانداو، نە لە سەرەوەیاندا، نە لە دروستکراوەکانی خوارێ دا، کە بە نسبەت مرۆڤەکانەوە زەوییەو، نە لە دروستکراوەکانی سەرێ دا، وشەی ﴿ ٱلسَّمَآءِ ﴾یش جگە لە زەوی، هەموو ئەوەی خوا دروستیکردوە، دەیگرێتەوە .**

**لێرەدا خوا ﷻ وشەی: ﴿ ٱلسَّمَآءِ ﴾ی بەکارهێناوە، هەندێك جاریش وشەی: ﴿ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ ﴾ی بەکارهێناوەو، جاری واشە کە وشەی: ﴿ سَمَٰوَٰتٍ ﴾ی بەکارهێناوە کە مەبەست پێیان: ﴿ ٱلسَّمَآءِ ﴾ و ﴿ سَمَٰوَٰتٍ ﴾ ، ﴿ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ ﴾ تێکڕای ئەوەیە کە خوا دروستی کردوە، جگە لە عەرشی خواو، لە درەختی کۆتایی (سدْرَةُ المُنْتَهَى)و واپێدەچێ: جگە لە بەهەشتو دۆزەخیش، چونکە خوا ﷻ - وەك دوایی دەیگەینێ - باسی ئەوە دەکات: کە لە ڕۆژی دواییدا، هەم زەوی‌و، هەم ئاسمانەکانیش دەگۆڕێن، ئنجا بەهەشتو دۆزەخیش، ڕای بەهێزترو پتەوتر، ئەوەیە کە ئێستا هەن‌و، نابێ ئەوان گۆڕانیان بەسەردابێ، کەواتە: دەبێ لە دەرەوەی سنووری ئاسمانەکان بن، کە دەگوترێ: ئاسمان ﴿ ٱلسَّمَآءِ ﴾ یان: ئاسمانەکان ﴿ سَمَٰوَٰتٍ ﴾ یان: حەوت ئاسمانەکان ﴿ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ ﴾ بێگومان زەوی شتێکی بچووکە لە نێو چەمكو واتای وشەی: ئاسمان‌و ئاسمانەکان‌و حەوت ئاسمانەکاندا، چونکە زەوی خۆی یەکێکە لە نۆ خڕۆکە کە بەدەوری خۆردا دەخولێتەوە، خۆریش بۆخۆی یەکێکە لە ئەستێرەکانی کەهکەشانی کاکێشان، کە بە مەزەندەی زانایان: دەوری: تریلیۆنێك (١ ١٢) ئەستێرەی تێدان، وەك خۆی‌و لە خۆی بچووکترو گەورەتر .**

**لێرەدا قسەیەك لە زەمەخشەریی خاوەنی تەفسیری (الكَشَّاف) دەخوازینەوە، کە (جمال الدين القاسمي) لە تەفسیری (مَحاسِنُ التَّأويل) لێیەوە نەقڵ**

کردوە: (قالَ الزَّمَخشَرِيُّ: المَعنى إنَّكَ أعلَمُ بِأحوالِنا وَما يُصلِحُنا وَما يُفسِدُنا، وَأنتَ أرحَمُ بِأنفُسِنا مِنّا وَلَها، فَلا حاجَةَ إلى الدُّعاءِ وَالطَّلَبِ، وَإنَّما نَدعُوكَ إظهاراً لِلعُبُودِيةِ لَكَ، وَتَخَشُّعاً لِعَظَمَتِكَ، وَتَذَلُّلاً لِعِزَّتِكَ وافتِقاراً إلى ما عِندَكَ)[1].

واتە: تۆ لە خۆمان بە حاڵو باڵمان زاناتری. بەوەی کە چاکمان دەکاو، بەوەی کە تێکمان دەدا، لە خۆمان بە حاڵو باڵمان بە کاروبارمان زاناتریو، تۆ لە خۆمان بەرانبەر بە ئێمە بە بەزەییتری، بۆیە پێویست بە پاڕانەوەو داواکردن ناکات، بەڵام ئێمە لێت دەپاڕێینەوە، وەك: دەرخستنی بەندایەتیی بۆ تۆو، وەك ملکەچیی بۆ مەزنی تۆو، وەك ژێردەستیی بۆ عیزەتو باڵادەستیی تۆو، وەك دەرخستنی ئاتاجییو پێویستیی بۆ ئەوەی کە لەلای تۆیە .

<u>مەسەلەی چوارەم :</u> ستایشکردنی ئیبراهیم ﷺ بۆ خوا کە بە بە ساڵاداچوویی : هەر کام لە ئیسحاقو ئیسماعیلی پێ بەخشیون .

خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي وَهَبَ لِي عَلَى ٱلۡكِبَرِ إِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَۚ إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴿٣٩﴾ ﴾.

شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە ، لە دوو بڕگەدا:

<u>بڕگەی یەکەم :</u> ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي وَهَبَ لِي عَلَى ٱلۡكِبَرِ إِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ ﴾، ستاییش بۆ ئەو خوایەی کە بە پیریی (لە کاتی کەوتنە تەمەنەوەدا) ئیسماعیلو ئیسحاقی پێ بەخشیوم .

---

[1] ج ١٠، ص ٣٤.

چونکە بە پێی ئەوەی کە زانراوەو عادەتە، لە ژیانی بەشەردا، پیاوان و ئافرەتان لە کاتێکدا زۆر پیر دەبن و دەگەونە تەمەنی زۆرەوەو، تەمەنیان زۆر هەڵدەکشێ، وەچەیان پەیدا نابێ، بەڵام ئیبراهیم ﷺ وەك دوایی باسی دەکەین لە کاتی کەوتنە تەمەنی زۆردا، هەر کام لە ئیسماعیل و ئیسحاقی پەیدا بوون .

**بڕگەی دووەم :** - ﴿إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ الدُّعَاءِ﴾، بێگومان پەروەردگارم زۆر بیسەری پاڕانەوەیە، ئنجا وەك دواتریش باسی دەکەین، لە سەرچاوە مێژووییەکاندا هاتووە، کە ئیبراهیم ﷺ کاتێك لەگەڵ هاجەر، ئیسماعیلیان پەیدابوو، ئیبراهیم تەمەنی (٨٦) ساڵ بووەو، لە ڕیوایەتێکدا دەڵێ: (٩٩) ساڵ بووە، بەڵام بێگومان هاجەر تەمەنی هێندە نەبووەو، کە ئیسحاقیان پەیدا بووە ئیبراهیم: تەمەنی (١٠٠) ساڵ بووە، لە ڕیوایەتێك دا دەڵێ: (١١٢) ساڵ و، خاتوون (سارا)ش تەمەنی (٩٠) ساڵ بووە، یاخود نەوەدو شتێك ساڵ بووە .

ئنجا بێگومان لە کاتێکدا کە ئینسان لە شتێك نائومێد دەبێ و بە تەمای نیە، دوایی ئەو داواکاریی و ئامانجەی بۆ دێتە دی، لە دڵیدا زۆر خۆشەویست و شیرینە .

**مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی :** پاڕانەوەی ئیبراهیم ﷺ لە خوا ﷻ بۆخۆی و وەچەکەی کە بیانکاتە خواپەرست و، لە خۆی و باب و دایك و بڕواداران بەگشتی ببووری :

خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلَاةِ وَمِن ذُرِّيَّتِي رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَاءِ ﴿٤٠﴾ رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ الْحِسَابُ ﴿٤١﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە موبارەکە . لە چوار بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم :** - ﴿رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلَاةِ وَمِن ذُرِّيَّتِي﴾، پەروەردگارم ! بمکە بە بەرپاکەری نوێژ، هەروەها لە وەچەکەشم.

زانایان لێرەدا ئیشکالێکیان بۆ دروست بووە، گوتوویانە: چۆن ئیبراهیم ﷺ لە خوا دەپارێتەوە کە تەنیا بەشێك لە وەچەکەی نوێژکەر بن، بۆچی بۆ هەموو وەچەکەی نەپاراوەتەوە ؟

لە وەڵامی ئەو ئیشکالەدا :

١/ هەندێکیان گوتوویانە: وشەی (مِن) لێرەدا (من الإبتدائية)یە، واتە: بۆ دەستپێکردنە .

٢/ هەندێکیش گوتوویانە: (من)، (من البيانية)یەو بۆ ڕوونکردنەوەیەو، (من التبعيضية) نیە .

٣/ هەندێکیش گوتوویانە: ئەگەر بۆ بەشێکیش بێ، لەبەرئەوەیە کە ئیبراهیم ﷺ زانیویەتی وەچەکەی هەموویان خواپەرستو ڕوو لە خوا نابن بۆیە داوایەکی نەکردوە کە بزانێ پێچەوانەی واقیع دەبێ، یان پێچەوانەی یاساو سوننەتی خوا دەبێ .

کەواتە: وشەی (مِنْ) یان بۆ ڕوونکردنەوەیە، یان بۆ: دەستپێکردنە، ئەو کاتە هەموو وەچەکەی دەگرێتەوە، یان بۆ بەشێکە بەو تەئویلو واتایەی کە گوتمان، بەڵام مانای یەکەمیانم لە دڵدا بەهێزترە، کە بۆ هەموو وەچەکەی پاڕابێتەوە .

بڕگەی دووەم : - ﴿رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَآءِ﴾ پەروەردگارمان! پاڕانەوەمان لێوەربگرە ئەمە وەك لە تەفسیرەکاندا هاتوە دەڵێ: (ضَرَاعَةً بَعْدَ ضَرَاعَة)، واتە: کڕووزانەوە لە دوای کڕووزانەوەیە، لالانەوە دوای لالانەوەیە .

وشەی (دُعَآءِ)یش لە هەندێك خوێندنەوە (قِرَاءة)دا، بە (دُعَائِي) خوێنراوەتەوە، واتە: بە (ي) خوێنراوەتەوەو لەوانی دیکەشدا بە ژێر (كَسْرة) خوێنراوەتەوە، کە هەر یەك مانایان هەیە .

بڕگەی سێیەم : - ﴿رَبَّنَا ٱغْفِرْ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ﴾ پەروەردگارمان! لێم ببوورەو لە باب و دایکیشمو لە بڕوادارانیش .

وشەی: ﴿ وَلِوَٰلِدَيَّ ﴾ خوێنراویشەتەوە: (وَلِوالِدِيْ) واتە: لە بابم، بەلام ﴿ وَلِوَٰلِدَيَّ ﴾ واتە: بابو دایکم، پێشتریش باسمان کرد، کە ئیبراهیم عليه السلام دەبێ کاتێك ئەو پاڕانەوەی کردوە، بەنسبەت بابیەوە جارێ بۆی دەرنەکەوتبێ کە بابی دوژمنی خوایەو، بێ بڕوایەو ڕێی خوا، ناگرێتە بەر، دەبێ لە کاتێکدا بوو بێ، ئومێدێکی هەر پێی بووبێ‌و لێی تەماو بڕوا نەبووبێ، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (التوبة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ ٱسۡتِغۡفَارُ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوۡعِدَةٖ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوّٞ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنۡهُۚ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٞ ﴿١١٤﴾ ﴾. واتە: داوای لێبوردن (لە خوا) کردنی ئیبراهیم بۆ بابی، تەنیا بەهۆی ئەوەوە بوو کە بەڵێنێکی پێدابوو، بەلام دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت، کە دوژمنی خوایە، دووریی لێ دەربڕی، بێگومان ئیبراهیم زۆر هێدیی‌و مەندو زۆر بە بەزەیی‌و پەرۆش بوو .

<u>برگەی چوارەم</u> : - ﴿ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡحِسَابُ ﴾، واتە: لە ڕۆژێکدا کە لێپرسینەوە دێتە گۆڕێ، وشەی: ﴿ يَقُومُ ﴾ واتە: ڕادەوەستێ، دەڵێ: (يَقُومُ: يَثْبُتُ، شُبِّهَ الحِسَابُ بِإنْسَانٍ قَائِمٍ، لأنَّ حَالَةَ القِيَامِ أقوى أحْوَالُ الإنْسَانِ)، واتە: (يقوم) یانی: دەچەسپێ، لێپرسینەوە، چوێنراوە بە مرۆڤێکی وەستاوەوە (کە ڕادەوەستێ)، چونکە حاڵەتی وەستان، بەهێزترین حاڵەتی مرۆڤە .

یانی: لەو ڕۆژەدا، کە لێپرسینەوەو سزاو پاداشت دێتە گۆڕێ، ئەی پەروەردگارمان! لە خۆم‌و بابو دایکم‌و لە بڕواداران ببوورە .

ئێمەش دوعاکەی ئیبراهیم عليه السلام دووبارە دەکەینەوەو دەڵێین: ﴿ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡحِسَابُ ﴾، بێگومان کە دەفەرموێ: ﴿ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ مەبەست ئەوە نەبووە کە نافرەتانیش نەگرێتەوە، بەڵکو ئەوە، لە پاڵ نێرینەاندا باسکردنی مێینان (تَغْلِيب الذكور عَلَى الإناث)ە، کە

لە زمانی عەرەبییدا، وەك زۆرجاران باسمان كردوە: كاتێك پیاوان و ئافرەتان پێكەوە دێن، بنچینە وایە كە وشەكە بۆ نێرینان بەكارهات، مێینەكانیش دەگرێتەوە، وەك: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، لە هەموو قورئاندا هەروایە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ﴿ ٱلَّذِينَ ﴾ لە زمانی عەرەبییدا بۆ نێرینانە، بەلام بەتەئكید مێینانیش دەگرێتەوە، بەلام خوا بە پێویستی نەزانیوە بفەرموێ : (یا أَیُّها الَّذِیْنَ آمَنوا، وَ یا أَیُّها اللاَّتِي آمَنَّ) .

لێرەشدا كۆتایی بەم دەرسەمان دێنین .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی شەشەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان کە کۆتا دەرسی سوورەتی (إبراهیم)ە، پێکهاتوە لە ئایەتەکانی: (٤٢ – ٥٢)، واتە: یازدە (١١) ئایەتی کۆتایی سوورەتی ئیبراهیم ﷺ دەگرێتە خۆی، لەو (١١) ئایەتەدا، خوا باسی یەك بابەتی سەرەکیی کردوە، هەرچەندە ئەو بابەتە سەرەکییە، لق و پۆپی لێبوونەوە، بەڵام یەك بابەتی سەرەکییە، ئەویش ئەوەیە: کە خوا ﷻ لە ستەمکاران بێئاگا نیەو، سزادانیان هەڵدەگرێ بۆ ڕۆژی دوایی .

هەروەها بە پێغەمبەر خاتەم موحەممەد ﷺ دەفەرموێ: کە خەڵك وریا بکاتەوە لە هاتنی ڕۆژی دوایی، کە ستەمکارەکان لەو ڕۆژەدا، داوای دواخرانی ڕۆژی دوایی دەکەن! بەڵام بە تەمنیکد بێ سوودە .

پاشان خوا ﷻ دووبارە دەفەرموێ: کەس وا نەزانێ کە خوا بەڵێنی خۆی کە بە پێغەمبەرانی داوە، نایباتە سەر، دوایی باسی چەند دیمەنێکی ڕۆژی دوایی دەکات .

لە کۆتایی دا ڕایدەگەیەنێ کە : ئەوە پەیامی خوایە بۆ تێکڕای خەڵکی، کە بزانن، بێجگە لە خوا ﷻ هیچ پەرستراوێکی دیکەی ڕاست نیە .

﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ
تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٤٢﴾ مُهْطِعِينَ مُقْنِعِى رُءُوسِهِمْ لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ ۖ وَأَفْـِٔدَتُهُمْ
هَوَآءٌ ﴿٤٣﴾ وَأَنذِرِ ٱلنَّاسَ يَوْمَ يَأْتِيهِمُ ٱلْعَذَابُ فَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رَبَّنَآ أَخِّرْنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ
قَرِيبٍ نُّجِبْ دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعِ ٱلرُّسُلَ ۗ أَوَلَمْ تَكُونُوٓا۟ أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ مَا لَكُم
مِّن زَوَالٍ ﴿٤٤﴾ وَسَكَنتُمْ فِى مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ
كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ وَضَرَبْنَا لَكُمُ ٱلْأَمْثَالَ ﴿٤٥﴾ وَقَدْ مَكَرُوا۟ مَكْرَهُمْ وَعِندَ ٱللَّهِ
مَكْرُهُمْ وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ ٱلْجِبَالُ ﴿٤٦﴾ فَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ مُخْلِفَ
وَعْدِهِۦ رُسُلَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٤٧﴾ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ۖ
وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ وَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُّقَرَّنِينَ فِى ٱلْأَصْفَادِ ﴿٤٩﴾
سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ وَتَغْشَىٰ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ ﴿٥٠﴾ لِيَجْزِىَ ٱللَّهُ كُلَّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ ۚ
إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٥١﴾ هَٰذَا بَلَٰغٌ لِّلنَّاسِ وَلِيُنذَرُوا۟ بِهِۦ وَلِيَعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ
وَلِيَذَّكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٥٢﴾ ﴾.

# مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{وا مەزانە خوا بێ ئاگایە لەوەی ستەمکاران دەیکەن، بەڵکو (بۆ سزادانیان) دوایان دەخات بۆ ڕۆژێك کە چاوەکانی تێدا ئەبڵەق دەبن ﴿٤٢﴾ (کافرەکان) بە خێرایی دەڕۆن (بەرەو گۆڕەپانی کۆبوونەوە)، سەریان بەرزکردۆتەوە، چاویان ناتروکێنن‌و، عەقڵ‌و دڵیان بۆشە ﴿٤٣﴾ هەروەها (ئەی موحەممەد) خەڵکی بترسێنە لە ڕۆژێك کە تێیدا سزایان بۆ دێ، ئنجا ئەوانەی کە ستەمیان کردوە دەڵێن: پەروەردگارمان! بۆ ماوەیەکی نزیك دوامان بخە، با وەڵامی بانگەوازەکەت بدەینەوەو، شوێن پێغەمبەران بکەوین، (پێیان دەگوترێ:) ئەدی ئەوە نەبوو لەمەو پێش سوێندتان دەخوارد: کە هەرگیز لاناچن (نافەوتێن)؟! ﴿٤٤﴾ (دوایی ئێوە) لە جێگاو ڕێگای ئەوانەدا کە ستەمیان لە خۆیان کردبوو، نیشتەجێ بوون‌و بۆشتان دەرکەوتبوو چیمان پێکردوون‌و، وێنەمان بۆتان هێنانەوە! ﴿٤٥﴾ بە دڵنیایی ئەوان (پێش ئێوە) پیلانیان گێڕاو پیلانەکەشیان لە ژێر ڕکێفی خوادا بوو، هەرچەندە پیلانەکەشیان وابوو بێ، چیایان لابەرێ! ﴿٤٦﴾ ئنجا پێتان وانەبێ: خوا بەڵێنی خۆی لەگەڵ پێغەمبەرانی دا نایباتە سەر، بەدڵنیایی خوا زاڵی تۆڵەستێنە (بۆ دوژمنان‌و ناحەزانی پێغەمبەران) ﴿٤٧﴾ (ڕۆژی دوایی) ڕۆژێکە زەوی‌و ئاسمانەکان بە حاڵەتی جگە لە ئێستایان دەگۆڕێن‌و، (مرۆڤەکانیش) تێکڕا بۆ خوای تاکی مل پێکەچکەر دێنە گۆڕێ ﴿٤٨﴾ لەو ڕۆژەدا : تاوانباران دەبینی: لە کەلەپچاندا پێکەوە جووت کراون (دوو دوو پێکەوە کەلەپچە کراون) ﴿٤٩﴾ پۆشاکیان لە قەترانەو، ئاگر ڕوومەکانیان دادەپۆشێ ﴿٥٠﴾ (بۆیە ڕۆژی دوایی هەیە) تاکو خوا هەر کەسە بە پێی ئەوەی کە کردوویەتی، سزاو پاداشت بدات، بێگومان خوا لێپرسینەوەی خێرایە ﴿٥١﴾ ئەمە ڕاگەیاندن (ی پەیامی خوای)ە، بۆ خەڵکی، بۆ ئەوەی پێی وریا بکرێنەوەو، تاکو بزانن کە تەنها یەك پەرستراو هەیەو، بۆ ئەوەی خاوەن عەقڵانیش بیریان بکەوێتەوەو پەند وەربگرن ﴿٥٢﴾} .

# شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(تَشۡخَصُ فِيهِ ٱلۡأَبۡصَٰرُ): (شَخَصَ شخوصاً: إرْتَفَعَ، شَخَصَ الرَّجُلُ بَصَرَهُ، إذا فَتَحَ عَيْنَيْهِ لايَطْرِف)، کە دەفەرموێ: ﴿تَشۡخَصُ فِيهِ ٱلۡأَبۡصَٰرُ﴾ بە (چاویان ئەبلەق بوو) تەرجەمەم کردوە. چونکە: (شَخَصَ شخوصاً) واتە: بەرزبۆوە، (شَخَصَ الرَّجُلُ بَصَرَهُ) ئەگەر چاوی بکاتەوەو چاوی نەترووکێنێ ، دەڵێن: (شَخَصَ بَصَرَهُ) بە کوردیی پێی دەڵێن: چاو ئەبلەق بوون .

( مُهۡطِعِينَ ): (هَطَعَ الرَّجُلُ ببَصَرِهِ، إذَا صَوَّبَهُ، وَبَعِير مُهْطِعٌ، إذَا صَوَّبَ عُنُقَهُ) دەگوترێ: (هَطَعَ الرَّجُلُ ببَصَرِهِ) پیاوەکە چاوی ناڕاستەی شتێك کردو نەیجووڵاند، دەگوترێ: (بَعِيرٌ مُهْطِعٌ) لە حاڵێکدا کە حوشتر ملی خۆی ڕێك ڕاست بگرێ، بەملاولادا، ملی بانەدا، دەگوترێ : (بَعِيرٌ مُهْطِعٌ)، کەواتە: ﴿مُهۡطِعِينَ﴾ بەو کەسانەش دەگوترێ کە : سەریان ڕێك ڕادەگرن و بەلای ڕاست و چەپدا ئاوڕ نادەنەوەو، سەر نانووشتێننەوە لە ترسان .

( مُقۡنِعِي رُءُوسِهِمۡ ): واتە: سەریان بەرز دەکەنەوە (أقْنَعَ رَأْسَهُ: رَفَعَهُ) واتە: سەری ڕاست کرد .

( لَا يَرۡتَدُّ إِلَيۡهِمۡ طَرۡفُهُمۡ ): (طَرْفُ العَيْنِ: جَفْنُهُ، وَالطَّرْفُ تحْرِيكُ الجفْنِ، وَعُبِّرَ بِهِ عَنِ النَّظَرِ)، (طَرْفُ العَيْنِ) واتە: پێڵووی چاو، ئنجا (طَرْف) بریتییە لە جووڵاندنی پێڵووی چاو، کە مەبەست لێرەدا بینینە، ﴿لَا يَرۡتَدُّ إِلَيۡهِمۡ طَرۡفُهُمۡ﴾، چاویان ناترووکێنن، واتە: چاویان لەسەر ئەو دیمەنانەیە کە لە ڕۆژی دواییدا دێنە بەرچاویان و، لەبەر ترس و لە هەژمەتان، نە سەریان دەجووڵێنن، نە چاویان دەترووکێنن .

(وَأَفْئِدَتُهُمْ هَوَآءٌ ): (أَفْئِدَة) كۆی (فُؤَاد)، (فُؤاد) لێرەدا بە مانای عەقڵو هۆش دێ، دەشگونجێ بە مانای دڵ بێت، واتە: عەقڵو دڵەكانیان بۆشن، (هَوَاء) واتە: بۆش (فَارِغ) وەك چۆن كەسێك بە یەكێكی دیكە بڵێ: لە ترسان ئاگام لەخۆم نەماو، یاخود هۆشم لەسەرم دانەماوە .

(مُقَرَّنِينَ ): واتە: پێكەوە جووت كراون، دەگوترێ: (قَرَنْتُ البَعِيرَ بالبَعِيرِ: جَمَعْتُ بَيْنَهُما وَقَرَّنْت، على التكثير) .

(قَرَنْتُ البَعِيرَ بالبَعِيرِ) یانی: حوشترەكانم پێكەوە جووت كردن، واتە: بە پەتێك پێكەوەم بەستن كە نەتوانن لێك بترازێن، (وَقَرَّنْتُهُ) ئەویش بۆ حاڵەتی زۆرییە، لێرەدا مەبەست ئەوەیە: دوو دوو پێكەوە كەلەپچە دەكرێن .

(فِي الْأَصْفَادِ ): (أَصْفَاد) كۆی (صَفَد) یان (صِفَاد)ە، (صَفَد)و (صِفَاد) هەردووكیان بە مانای (غُلّ) دێن، (غُلّ) واتە: كەلەپچە، شتێكە دەكرێتە گەردنی مرۆڤەوە، دەشگونجێ مەبەست پێی ئەوە بێ، كە دەخرێتە دەستیانەوە، كە كۆی (غُلْ) (أَغْلاَل)ەو، كۆی (صَفَد)و (صِفَاد)یش، (أَصْفَاد)ە .

( سَرَابِيلُهُم ): (سَرَابيل) كۆی (سِرْبَال)ە، (السربال: القَمِيصُ مِنْ أَيِّ جِنْسٍ كان)، (سِرْبَال) بریتیە لە كراس لە هەر جۆرێكو بە هەر شێوەیەك بێ .

( قَطِرَانٍ ): (ما يُتَقَطَّرُ مِنَ الهِناءِ)، (قطران) جۆرە ماددەیەكی سووتێنەرە، بۆ حاڵەتی (خروو) كە تووشی وشتر دێ، بەكاردەهێنرێ، ماددەیەكی سووتێنەرە كە خرووەكەی پێ لا دەبرێ .

( بَلَٰغٌ ): واتە: گەیشتن، (البَلاغُ: الإِنْتِهاءُ إِلى أَقْصَى المَقْصَدِ، والمُنْتَهَى مَكاناً كانَ، أَوْ زَماناً، أَوْ أَمْراً مِنَ الأُمُورِ المُقَدَّرَة)، مانای (بلوغ) و (بلاغ) بریتیە لە گەیشتن بە كۆتایی ئامانجێك، یاخود مەبەستێك، چ لە ڕووی شوێنەوە، چ لە ڕووی كاتەوە، یاخود كارێك لە كارەكان كە ئەندازەگیری كراوە .

واتایەکی دیکەی (بَلاَغ) بریتییە لە گەیاندن، وەك گەیاندنی پەیام، هەروەها وشەی: (بَلاَغ) بە مانای شتێك كە تەواو بێ و بەس (كافي) بێ، بەو واتایەش هاتووە، ﴿ إِنَّ فِى هَٰذَا لَبَلَٰغًا لِّقَوْمٍ عَٰبِدِينَ ﴿١٠٦﴾ ﴾الأنبياء، واتە : لەوەدا كە باسكرا، كیفایەت هەیە، بۆ كۆمەڵێك كە بیانەوێ بەندایەتیی بۆ خوا بكەن .

## مانای گشتی ئایەتەکان

ئەم یازدە (١١) ئایەتە، هەموویان باسی سەرەنجامی شوومی ستەمکارانن سەرەنجامی شوومیان لە ڕۆژی دوایی دا، خوا دەفەرموێ : ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾، وا مەزانە خوا بێئاگایە لەوەی ستەمکاران دەیکەن .

وشەی (ظُلم) لە زمانی عەرەبییدا بە مانای گوناح (إثم) دێ، بە (گوناهکردن)و (تاوان کردن) بە ڕەهایی دەگوترێ: (ظُلمُ)، هەروەها بە مانای دەستدرێژیی کردن بۆ سەر مافی ئەوانەی دیکەش، دێ، دیسان بە مانای شیرك و کوفریش دێ، ئنجا ئایا لێرەدا مەبەست پێی کامیانە ؟

وا پێدەچێ زیاتر مەبەستی پێ ئەوانە بێ، کە ستەم لە خەڵکی دەکەن، ئنجا کە ستەمیان لێ دەکەن: ڕێی هیدایەتیان لێ دەگرن؟ ئازادییان لێ زەوت دەکەن؟ موڵك و ماڵیان لێ داگیر دەکەن؟ دەیانچەوسێننەوە؟ ئەوانە هەموویان دەگرێتەوە، هەڵبەتە ئەگەر بشڵێین (ظالِمون) لێرەدا مەبەست پێی ئەوانەیە کە کوفرو شیرکیان هەڵگرتوە، یان ئەوانەن کە گوناح و تاوان دەکەن و، لە نێو گوناهو تاوانەکاندا: مافی خەڵکی دیکە پێشێل دەکەن و، خەڵك دەچەوسێننەوە، ئەوەش هەر واتایەکی گونجاوە، گرنگ ئەوەیە خوا دەفەرموێ : وا مەزانە کە خوا بێ ئاگایە لەوەی ستەمکاران دەیکەن، ﴿ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴾، بێگومان تەنیا دوایان دەخات بۆ کاتێك کە چاوەکان تێیدا ئەبڵەق دەبن .

کە مەبەست پێی ڕۆژی دوایی یە، بە دڵنیایی .

ئنجا وەسفی حاڵەتی ئەوان دەکات لەو ڕۆژەدا، دەفەرمویٚ : ﴿ مُهْطِعِينَ ﴾ واتە: بە خێرایی دەڕۆن‌و سەریان ڕێك ڕاگرتوە بەرەو پێش، ﴿ مُقْنِعِي رُءُوسِهِمْ ﴾ سەری خۆشیان بەرز کردۆتەوە، ﴿ لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ ﴾ چاویان ناگەڕێتەوە بۆ لایان، واتە: چاو ناترووکێنن، سەرنجیان بەملاولادا ناچیٚ، ﴿ وَأَفْئِدَتُهُمْ هَوَاءٌ ﴾ هۆشیان بەتاڵە، هۆشیان خاڵییە لە عەقڵ، لەو کاتەدا هیچ ئاگایان لە خۆیان نیە، لە کاتی ترس‌و حەزمەت‌و سامی گەورەدا، مرۆڤ ئەو حاڵەتەی بۆ دروست دەبیٚ، کەسێك کە لە شوێنێك لە نەکاو دەنگێك دەبیستیٚ، وەك گوتراوە: هەموو گیانی دەبێتە چاوو گویٚ‌و بەرەو ئەو شوێنە چاوی ئەبڵەق دەکاو، هەست ڕادەگریٚ‌و، مل ڕادەگریٚ، بەملاولادا ئاوڕ ناداتەوەو چاو ناترووکێنیٚ، ئەوانیش لە ڕۆژی دواییدا بەو شێوەیان لیٚ دیٚ، چونکە زۆر دەترسێن .

﴿ وَأَنذِرِ النَّاسَ يَوْمَ يَأْتِيهِمُ الْعَذَابُ فَيَقُولُ الَّذِينَ ظَلَمُوا رَبَّنَا أَخِّرْنَا إِلَىٰ أَجَلٍ قَرِيبٍ ﴾، (ئەی موحەممەد!) خەڵك بترسێنە لە ڕۆژێك کە ئازارو سزای خوایان بۆ دیٚ، ئەوانەی کە ستەمیان کردوە دەڵێن: پەروەردگارمان! دوامان بخە بۆ کاتێکی نزیك، بۆ ماوەیەکی کەم .

ئنجا بۆچی دوایان بخات؟ ﴿ نُّجِبْ دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعِ الرُّسُلَ ﴾، تاکو وەڵامی پەیامەکەی تۆ بدەینەوەو شوێن پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بکەوین، واتە: ئێستا تەصفیە حیسابمان لەگەڵ مەکە، ئێستا لێپرسینەوەمان لەگەڵ مەکە، چونکە دەزانن کە بە تەئکید شایستەی سزادانن، بۆیە دەڵێن: دوامان بخەو مۆڵەتمان بدە، با بە دوای پەیامی تۆ بکەوین‌و، پەیڕەویی لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بکەین !

خوا ﷻ بۆخۆی، یاخود لە ڕیٚی فریشتەکانەوە، وەڵامیان دەداتەوە: ﴿ أَوَلَمْ تَكُونُوا أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٍ ﴾، ئایا ئێوە نەبوون پێشتر سوێندتان دەخوارد: هەرگیز ئێوە نافەوتێن، لە نێو ناچن، لەو سەڵتەنەت‌و

دەسەڵاتەی خۆتاندا هەر دەمێننەوە ؟ ﴿ وَسَكَنتُمْ فِي مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ﴾، لە جێگاو ڕێگاو خانووبەرەی ئەوانەش دا کە ستەمیان لە خۆیان کردبوو، نیشتەجێ بوون !

لێرەدا مەرج نیە مەبەست تەنیا ئەوە بێ کە لە خانووبەرەو جێگاو ڕێگای ئەواندا بوون، بەڵکو واتە: وەك ئەوانتان کردو، بوونە میراتگری ستەمکارەکانی پێش خۆتان لە هەموو ڕوویێکەوە، ئەوان چییان کردبوو، ئێوەش واتانکرد، ئەوان لە کوێ نیشتەجێ بوون ئێوەش واتانکرد، ڕەفتاری وان چۆن بوو، ئێوەش بەو شێوەیە، ﴿ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ ﴾، بۆشتان دەرکەوتبوو کە چیمان پێکردبوون، ﴿ وَضَرَبْنَا لَكُمُ ٱلْأَمْثَالَ ﴾، زۆر وێنەشمان بۆ هێنابوونەوە، واتە: زۆر بەسەرهاتمان بۆ گێڕابوونەوە، کە دەبوو وەك پەند تەماشایان بکەن و، عیبرەتیان لێ وەربگرن، چونکە ئەوەی کە پەند لە خەڵکی وەرنەگرێ، دوایی خەڵك پەندی لێ وەردەگرێ .

﴿ وَقَدْ مَكَرُواْ مَكْرَهُمْ وَعِندَ ٱللَّهِ مَكْرُهُمْ وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ ٱلْجِبَالُ ﴾، ئەوانەی پێش ئێوە پیلانی خۆیانیان گێڕا، بەڵام پیلان و فێڵەکەشیان هەر لە ژێر ڕکێفو دەستەڵاتی خوا دابوو، ئەگەر پیلان و فێڵەکانیشیان وابوو بێ، کە چیاکان بەهۆیەوە لابچن لە شوێنی خۆیان! واتە: ئەگەر پیلانەکەیان وابووبێ، کە بەهۆیەوە چیاش هەڵقەنرێ، بەڵام هەر چۆنێك بێ، پیلانی دروستکراو (كيد المخلوق) هەر لەبەردەستی بەدیهێنەرو خاوەن و پەروەردگاری دایە .

﴿ فَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ مُخْلِفَ وَعْدِهِۦ رُسُلَهُۥٓ ﴾، کەواتە: پێت وانەبێ کە خوا بەڵێنی خۆی لەگەڵ پێغەمبەرانیدا (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ناباتە سەر، وامەزانەو گومانت وانەبێ: خوا ﷻ بێ بەڵێن و پەیمانشکێن دەبێ، لەو بەڵێنەدا کە بە پێغەمبەرانی خۆی دابوو، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴾، بێگومان

خوا زاڵی تۆڵەستێنەو خاوەن تۆڵەیە، بەڵام دیارە بەرانبەر بە کێ ئەو تۆڵەستێنییەی بەکاردەهێنێ؟ لە بەرانبەر ئەو کەسانەدا کە شایستەی بن، ئەگەر نا بەزەیی و میهرەبانیی و لوتف و کەرەمیشی هەیە، ئەویش دیسان بۆ خەڵکی خۆی، کە شایستەی بن .

﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ﴾، ئەو ڕۆژەی کە نە زەوی و نە ئاسمانەکان، وەك خۆیان نامێنن، بەڵکو بۆ حاڵەتێکی دیکە دەگۆڕێن، ﴿ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴾، هەروەها بۆ خوای تاکی مل پێکەچکەر، دێنە گۆڕێ، هەموویان دێنە ئاراوە، هەموویان لەو گۆڕەپانە کە خوا دیاریی کردوە، ئامادە دەبن .

﴿ وَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُّقَرَّنِينَ فِى ٱلْأَصْفَادِ ﴾، لەو ڕۆژەدا تاوانباران دەبینی: پێکەوە جووت جووت کراون لە کۆت و پێوەندا .

لە کۆت و پێوەندەکاندا دوو دوو پێکەوە جووت کراون، ﴿ سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ ﴾، پۆشاکەکانیان لە قەترانن .

(قطران) کە ماددەیەکی زۆر گەرمەو سووتێنەرە، پۆشاکەکانیان لەوەن : ﴿ وَتَغْشَىٰ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ ﴾، ڕووەکانیان ئاگر دایاندەپۆشێ، بڵێسەی ئاگر لە دەم و چاویان دەدا، وەك لە سووڕەتی (المؤمنون)دا، دەفەرموێ : ﴿ تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ وَهُمْ فِيهَا كَٰلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾، واتە: بڵێسەی ئاگر لە دەم و چاویان دەدات و، لەوێدا دەم و چاویان ڕەش داگەڕاون، کەسێك کە بڵێسەی ئاگر لە دەم و چاوی بدات، دەم و چاوی ڕەش دادەگەڕێ و دەسووتێ، ﴿ لِيَجْزِىَ ٱللَّهُ كُلَّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴾، (بۆیە ڕۆژی دوایی هەیە)، تاکو خوا ﷻ سزاو پاداشتی هەر کەسێك بداتەوە بە پێی ئەوەی کە کردوویەتی، ئنجا خراپەکارە، یان چاکەکار، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴾، بێگومان خوا لێپرسینەوەی زۆر خێرایە .

لە قورئاندا لە ژمارەیەك ئایەتاندا، ئەم ڕستە موبارەکە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ﴾، هاتوە، چونکە خوا ﷻ دەزانێ کە خەڵك بیر دەکاتەوە، بۆ وێنە: ئێستا حەوت ملیارو نیو یانی: حەوت هەزار ملیۆن و پێنج سەد ملیۆن (٧,٥٠٠,٠٠٠,٠٠٠) بەشەر لەسەر زەوی هەیە، بەڵکو تێشیپەڕاندوە، ئنجا هەر خوا دەزانێ چەند مرۆڤی دیکە ڕابردوون و، هەر خواش دەزانێ داخۆ چەندی دیکەیان بەدوا دێ !

ئنجا ئەو هەموو خەڵکە، ئەو هەموو ملیار ملیار مرۆڤانە، هەروەها جینتیش لەوێ ڕابوەستن !

ئایا خوا ﷻ چۆن لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکات ؟

هەر بۆیە خوا دەفەرموێ: بێگومان خوا لێپرسینەوەی خێرایە، وا مەزانە کە وەك لێپرسینەوەی دنیایە، ئەگەرنا دەبێ بە چەندان هەزار ساڵ ئەو هەموو خەڵکە نۆرەی بگاتێ، ئەگەر ئەو خەڵکە یەك یەك لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکرێ، بەڵام لێپرسینەوەی خوا، بەس خوا بۆخۆی دەزانێ، چۆنە ؟!

﴿هَٰذَا بَلَٰغٌ لِّلنَّاسِ وَلِيُنذَرُواْ بِهِۦ﴾، ئا ئەمە پەیامو گەیاندنە بۆ خەڵك، بۆ ئەوەی کە پێی بترسێنرێن و پێی وریا بکرێنەوە، ﴿وَلِيَعْلَمُوٓاْ أَنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ﴾، هەروەها بۆ ئەوەی بزانن : کە تەنیا یەك پەرستراو هەیە، ئەویش خوایە ﷻ، بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنە، ﴿وَلِيَذَّكَّرَ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ﴾، بۆ ئەوەش کە ئەوانەی خاوەن عەقڵن، ■ بیریان بێتەوە .

خوا ﷻ زۆر باسی وەبیر هاتنەوە (تذکر) دەکات، لەبەرئەوەی ئەو ڕاستییانەی وەحیی خوا دەیانفەرموێ، خوا ﷻ وەك حاڵەتێکی ڕیشەیی (بالقوة) لە عەقڵ و سروشتی ساغی مرۆڤەکاندا، دایناون، بەڵام پێویستییان بەوە هەیە بیریان بکەونەوە، ئنجا پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) هاتوون کە ئەو ڕاستییانەیان، بیر بخەنەوە، لە ڕێی وەحییەوە، ئەگەرنا ئەو فیطرەتەی کە خوا مرۆڤی لەسەر خوڵقاندوە، لەگەڵ ئەو شەریعەتەی کە خوا بە پێغەمبەراندا ناردوویەتی، وەك دوو ڕووی دراوێك وان و، دوو ڕووی ڕاستییەکن .

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم :** خوا لە ستەمکارەکان و کردەوەکانیان بێ ئاگا نیەو، بۆ رۆژی دوایی دوایان دەخات، کە تیایدا چاویان لەبلەق دەبن و، سەریان بەرز رادەوەستێن و، چاو ناترووکێنن و، هۆشیان لەلای خۆیان نامینێ :

خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٤٢﴾ مُهْطِعِينَ مُقْنِعِى رُءُوسِهِمْ لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ ۖ وَأَفْـِٔدَتُهُمْ هَوَآءٌ ﴿٤٣﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە بەپێیوە ، لە پێنج برگەدا :**

**برگەی یەکەم :** ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾، پێت وانەبێ خوا بێ ئاگایە لەوەی کە ستەمکاران دەکەین .

وەك گوتمان: ستەمکاران، یانی: کەسانێك کە گوناح دەکەن، یاخود کەسانێك کە کافرو موشریکن، یاخود کەسانێکن دەستدرێژیی دەکەنە سەر مافی ئەوانەی دیکە .

وشەی (ظُلْم) وەك زۆرجار گوتوومانە: (الظُّلْمُ: وَضْعُ الشَّيءِ فِي غَيْرِ مَوْضِعِهِ)، واتە: (ظُلْم): بریتیە لە دانانی شتێك لە شوێنێکدا، کە شوێنی شایستەی خۆی نەبێ، واتە: کاری بێجێ .

**بڕگەی دووەم :** - ﴿ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴾، (ئنجا ئەگەر خوا بێ ئاگا نیە، ئەدی کەنگێ لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکات؟) بێگومان دوایان دەخا بۆ ڕۆژێك، کە چاوەکان تێیدا نەبڵەق دەبن، چاویان بۆ مۆڵەق ڕادەوەستن، چاویان ناترووکێنن .

**بڕگەی سێیەم :** - ﴿ مُهْطِعِينَ مُقْنِعِي رُءُوسِهِمْ ﴾، زۆر بە خێرایی دەڕۆن سەریشیان ڕێك ڕاگرتوە .

(الإهْطَاعُ: إِسْرَاعُ الْمَشْيِ مَعَ مَدِّ العُنُقِ، وَهِيَ هَيْئَةُ الخَائِفِ)، واتە: (إهْطاع): بریتیە لە بە خێرایی ڕۆیشتن، لەگەڵ مل ڕاکێشان و مل درێژ کردن، ئەوەش حاڵەتی بابای ترساوە، کەسێك کە زۆر بترسێ، بە ئەملاولادا ئاوڕ ناداتەوەو مل بەرەو پێشەوە بەرەو ئەو شتەی کە مەترسیی لێ هەیە، ئاڕاستە دەکات، ﴿ مُقْنِعِي رُءُوسِهِمْ ﴾، سەریشیان ڕێك ڕاگرتوەو سەریان نە نزم دەکەن و، نە بەلای ڕاست و چەپدا بای دەدەن و، نە ئاوڕ دەدەنەوە بۆ دواوە .

**بڕگەی چوارەم :** - ﴿ لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ ﴾، وشەی (طَرْف) بە مانای (جَفْن) پێڵووی چاو، دێ، لێرەدا واتە: چاو ناترووکێنن، چونکە کاتێك کە ئینسان مەترسییەکی لە پێشدا هەیە، چاوی تێ دەبڕێ و، چاوی لەسەر هەڵناگرێ، لە ترسی ئەوەی ئەوەك ئەو چاو بترووکێنێ و، ئەوەی کە لێی دەترسێ بەسەری بێ .

**بڕگەی پێنجەم :** - ﴿ وَأَفْـِٔدَتُهُمْ هَوَآءٌ ﴾، عەقڵەکانیشیان خاڵیین، واتە: هۆشیان لەلا نامێنێ، بەو واتایە کە هەموو بوون و هەستیان چڕ دەبێتەوە لەسەر ئەو مەترسییەی کە لە پێشیانەوە هەیەو، بیر لە هیچی دیکە ناکەنەوە .

کە بە حەقیقەت هیچ کەس بێجگە لە خوای پەروەردگار، ناتوانێ ئەو حاڵەتەی ترس و حەزمەت و بیم و سامەی، کە لە ڕۆژی دواییدا بۆ تاوانباران و ستەمکاران و خراپەکاران دێتە پێشێ، بەم شێوەیە وێنا بکات، لە چەند وشەیەکی کەمدا .

**مەسەلەی دووەم :** خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: خەڵک بترسێنە لە ڕۆژێک کە سزای خوا دێ‌و، ستەمکاران داوای مۆڵەت دەکەن، بەڵام سەرزەنشت دەکرێن، لەسەر ئەوەی پەندیان لەوانەی پێش خۆیان وەرنەگرتوە:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَأَنذِرِ ٱلنَّاسَ يَوۡمَ يَأۡتِيهِمُ ٱلۡعَذَابُ فَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ رَبَّنَآ أَخِّرۡنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٖ قَرِيبٖ نُّجِبۡ دَعۡوَتَكَ وَنَتَّبِعِ ٱلرُّسُلَۗ أَوَلَمۡ تَكُونُوٓاْ أَقۡسَمۡتُم مِّن قَبۡلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٖ ﴿٤٤﴾ وَسَكَنتُمۡ فِي مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَتَبَيَّنَ لَكُمۡ كَيۡفَ فَعَلۡنَا بِهِمۡ وَضَرَبۡنَا لَكُمُ ٱلۡأَمۡثَالَ ﴿٤٥﴾ وَقَدۡ مَكَرُواْ مَكۡرَهُمۡ وَعِندَ ٱللَّهِ مَكۡرُهُمۡ وَإِن كَانَ مَكۡرُهُمۡ لِتَزُولَ مِنۡهُ ٱلۡجِبَالُ ﴿٤٦﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم سێ ئایەتە موبارەکە ، لە دە (١٠) بڕگەدا :**

**بڕگەی یەکەم :-** ﴿ وَأَنذِرِ ٱلنَّاسَ يَوۡمَ يَأۡتِيهِمُ ٱلۡعَذَابُ ﴾، خەڵک بترسێنەو هۆشیار بکەوە، لە ڕۆژێک کە ئازارو سزایان بۆ دێ .

دەگونجێ مەبەست لە: (عَذاب)، (عَذابُ الدُّنيا) سزای دنیا بێ، یاخود: (عَذابُ الآخرة) سزای دوارۆژ بێ، هەردووکیان گونجاون، بەڵام وابێدەچێ زیاتر مەبەست پێی سزای ڕۆژی دوایی بێ .

**بڕگەی دووەم :-** ﴿ فَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ رَبَّنَآ أَخِّرۡنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٖ قَرِيبٖ ﴾، ئەوانەی ستەمیان کردوە، (واتە: ستەمیان لە خۆیان کردوە، ستەمیان لە خەڵک کردوە، ستەمیان لە پێغەمبەران کردوە، ستەمیان لە ئایین‌و لە بەرنامەی خوا کردوە، یاخود هەموو جۆرە ستەمەکانیان کردوە، مادام بە ڕەهایی خوا

هێناویەتی، هەموویان دەگرێتەوە، ئەوانەی ستەمیان کردوە)، دەڵێن: پەروەردگارمان! دوامان بخە بۆ کاتێکی نزیك .

کاتی نزیك (شُبِّهَ بِالْمَسَافَةِ) لە نەسڵدا شوێن نزیکە، نەك کات، بەڵام لێرەدا ئەو کاتە کەمە چوێنراوە بە شوێن، شوێنێك کە نزیکە، بە کاتێکی کەم دەیگەیە، واتە: بۆ کاتێکی کەم دوامان بخە، مۆڵەتێکی کەممان بدە، بۆچی ؟

<u>برگەی سێیەم</u> :- ﴿نُّجِبْ دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعِ ٱلرُّسُلَ﴾، وەلامی بانگەوازەکەتو پەیامەکەت دەدەینەوەو، شوێن پێغەمبەرانیش دەکەوین .

هەردووکیان جێبەجێ دەکەین، هەم وەلامی پەیامی تۆ دەدەینەوە هەم شوێن پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) دەکەوین، بەڵام ئایا وەلامی ئەومیان دەدرێتەوە؟ بێگومان نەخێر.

<u>برگەی چوارەم</u> :- خوا دەفەرموێ : ﴿أَوَلَمْ تَكُونُوٓاْ أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٍ﴾، ئایا ئێوە پێشتر سوێندتان نە دەخوارد، کە لاناچن، لەبەین ناچن !

یانی : هەروەك حاڵەتی خۆتان دەمێننەوە، هەر ستەمکارێكو هەر حکومڕانێك، بگرە : پێی وایە لەبەین ناچێو دنیا بەجێ ناهێڵێ، بە تیۆری (نَظَري) دەزانێ دەمرێ، بەڵام بە کردەوە، تەماشای حاڵو هەڵوێستی دەکەی، حاڵو هەڵوێستو کردەوەکانی، هی کەسێکن کە بڕوای بە مردن نەبێ ! چونکە لەسەر خراپە بەردەوامە !

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿مَا لَكُم مِّن زَوَالٍ﴾، واتە: ئێوە هیچ جۆرە فەوتانێکتان بۆ نیە، یاخود: ئێوە پێتان وابوو، زیندوو ناگرێنەوە واتە: لەم ژیانی دنیایە ناگوازرێنەوە بۆ قۆناغێکی دیکەو، بۆ جیهانێکی دیکە، کە جیهانی بەرزەخو پاشان قیامەتە .

<u>برگەی پێنجەم</u> :- ﴿وَسَكَنتُمْ فِى مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ﴾، لە جێگاو ڕێگای ئەوانەدا کە ستەمیان لە خۆیان کردبوو، نیشتەجێ بوون .

واتە: وەك ئەوانتان کرد، ئەگەرنا مەرج نیە لە هەمان خانووبەرەی ئەواندا نیشتەجێ بووبن، هەرچەندە جاری واش هەیە ستەمکاران لە جێگاو خانووبەرەی پێشووانیاندا نیشتەجێ دەبن و، بە میراتی دەگرن، بەڵام مەرج نیە تەنیا مەبەست جێگاو ڕێگاکانیان بێ، چونکە حوکمڕانی وا هەیە، بە جێگاو ڕێگای حوکمڕانە ستەمکارەکەی پێش خۆی، ڕازی نیە، بەڵکو هی ئەوان دەکات بە مۆزەخانە یاخود لای دەباو جێگاو ڕێگاو کۆشكو تەلاری زۆر چاکتر لەو، دروست دەکات، وەك لە ژیانی ستەمکارانی زۆر لەم ڕۆژگارانەی خۆماندا، ئەوە دەبینین و، من لە کتێبی: (ڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان) هەروەها لە کتێبی : (قورئان و پاکسازیی و چاکسازیی لە هەرێمی کوردستان دا) لەبەر ڕۆشنایی ئەم ئایەتە موبارەکەدا، باسی حاڵەتی زۆرێك لە حوکمڕانانی هەرێمی کوردستان و عێراقیشم کردوە، کە ئەم ئایەتەیان بەسەردا دەچەسپێ، ▪ مانا ڕواڵەتییەکەی: نیشتەجێ بوون لە خانووبەرەو کۆشكو تەلاری ستەمکارانی پێش خۆیاندا، ▪ مانا مەعنەوییەکەی: کە ڕەچاوکردنی ڕەفتاری وەك هی ستەمکارانی پێش خۆیانە .

**بڕگەی شەشەم :** - ﴿ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ ﴾، بۆتان ڕوونبۆوە: چیمان پێکردوون، چونکە ئێوە بەدوای ئەواندا هاتبوون، دەبوو ئەوان بۆ ئێوە ببنە پەندو، پەندیان لێ وەربگرن .

**بڕگەی حەوتەم :** - ﴿ وَضَرَبْنَا لَكُمُ ٱلْأَمْثَالَ ﴾، لەسەر زمانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ) بەسەرهاتی وامان بۆ گێڕانەوە، کە وەك پەند وابن وەك پەندو عیبرەت، دەبوایە لێیان بەهرەمەند بن .

**بڕگەی هەشتەم :** - ﴿ وَقَدْ مَكَرُوا۟ مَكْرَهُمْ ﴾، ئەو ستەمکارانەی پێش ئێوە، پیلانی خۆیانیان گێڕا، فێڵیان کردو نەخشەو پلانیان دانا .

(الْمَكر: تَبييتُ فِعْلِ السوءِ بِالغَيرِ وَإِضْمارُهُ)، واتە: (مَکر): بریتییە لەوە کە کردەوەیەکی خراپ بەرانبەر بە غەیر ڕەچاو بکرێ و، بە پەنهانیی ئەنجام بدرێ، ﴿ وَقَدْ مَكَرُوا۟ مَكْرَهُمْ ﴾، (مَكرهُمْ: مَفْعُولٌ مُطْلَق)، ئەمە بۆ تۆخکردنەوەی مانای پیلانگێڕیی ▪ فێڵکردنە، واتە: پیلانێکیان گێڕاو فێڵێکیان کرد، مەگەر هەر ئەوان کردبیان، پیلانێکی زۆری بێڕەزا !

**برگەی نۆیەم :** - ﴿ وَعِندَ ٱللَّهِ مَكۡرُهُمۡ ﴾، بەڵام پیلان و فێڵەکەیان هەرچی بێ، هەر لەلای خوایە، واتە: لەبەردەستی خوادایەو، لە ژێر ڕکێفی خوا دایەو خوا دەیزانێ .

**برگەی دەیەم :** - ﴿ وَإِن كَانَ مَكۡرُهُمۡ لِتَزُولَ مِنۡهُ ٱلۡجِبَالُ ﴾، ئەگەر پیلانەکەشیان وابوو بێ، کە چیایەکان لەبەری بڕۆن، چیایەکان بە هۆیەوە لە جێی خۆیان لابچن، ئەمە دوو واتای هەن :

**یەکەم** : ئەم (إن)ە دەگونجێ: (إن الشَّرْطية)بێ، واتە: ئەگەر پیلانەکەشیان وابووبێ کە چیایەکان بەهۆیەوە لە شوێنی خۆیان لابچن، هەر چۆن بێ، ئەو پیلانە هەرچەندە گەورەش بێ و، چیایانیش لە شوێنی خۆیان لابەرێ و هەڵکەنێ، بەڵام هەر لەبەردەستی خوا دایە .

**دووەم** : دەشگونجێ ئەو (إن)ە، بریتی بێ لە: (إن المُخَفَّفَة)، بۆ دڵنیایی و تەئکید بێ، واتە: بە دڵنیایی پیلانەکەشیان وابوو، کە چیایەکان بەهۆیەوە لە شوێنی خۆیان لابچن .

دیارە (الكِسَائي) خوێندوویەتەوە : (لَتَزُولُ مِنْهُ الجِبَالُ)، یانی: بێگومان فێڵەکەیان وابوو کە بەهۆیەوە چیایەکان لە شوێنی خۆیان، لابچن .

**مەسەلەی سێیەم و کۆتایی :** خوا ﷻ ڕایدەگەیەنێت : بەڵێنێک کە بە پێغەمبەرانی داوە، دەیباتە سەر، لە ڕۆژی دواییدا تۆڵە لە تاوانباران دەستێنێ و، دوو دوو، یاخود بە کۆمەڵ کەلەپچە دەکرێن و، پۆشاکی قەترانیان لەبەردەکرێ :

خوا عزّ و جلّ دەفەرموێ : ﴿ فَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱللَّهَ مُخۡلِفَ وَعۡدِهِۦ رُسُلَهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٞ ذُو ٱنتِقَامٖ ﴿٤٧﴾ يَوۡمَ تُبَدَّلُ ٱلۡأَرۡضُ غَيۡرَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُۖ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ

ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ وَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُّقَرَّنِينَ فِى ٱلْأَصْفَادِ ﴿٤٩﴾ سَرَابِيلُهُم مِّن
قَطِرَانٍ وَتَغْشَىٰ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ ﴿٥٠﴾ لِيَجْزِىَ ٱللَّهُ كُلَّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ
سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٥١﴾ هَٰذَا بَلَٰغٌ لِّلنَّاسِ وَلِيُنذَرُوا۟ بِهِۦ وَلِيَعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ
وَلِيَذَّكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٥٢﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم شەش ئایەتە موبارەکە ، لە دوازدە (١٢) بڕگەدا :**

**بڕگەی یەکەم :** - ﴿ فَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ مُخْلِفَ وَعْدِهِۦ رُسُلَهُۥٓ ﴾، پێت وانەبێ : خوا بەڵێنێك كە بە پێغەمبەرەكانی خۆی (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) داوە، نایباتە سەر، پێت وانەبێ خوا پەیمانو بەڵێن شكێنە، لە بەڵێنو پەیمانێكدا كە بە پێغەمبەرانی خۆیداوە، بەڵكو بەڵێنو پەیمانەكەی دەباتە سەر، كە بریتییە لە: دادگایی خۆیانو، شوێن كەوتووانیانو، نەیارانیانو ناحەزانیان بە بەسەر كردایەتیی تاغووتو فیرعەونەكان .

**بڕگەی دووەم :** - ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴾، بێگومان خوا زاڵی تۆڵەستێنە ئنجا مادام زاڵو تۆڵەستێنە، دەبێ كاتێ هەبێ، كە ئەو باڵادەستییەی خواو، ئەو تۆڵەیەی خوا، لە دوژمنانو ناحەزانی پێغەمبەرانی، تێدا بەرجەستە ببێ .

**بڕگەی سێیەم :** - ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ﴾، ئەو ڕۆژە كە نە زەوی وەك خۆی دەمێنێو، نە ئاسمانەكان وەك خۆیان دەمێنن، هەردووكیان دەگۆڕێنو، وەك حاڵەتی ئێستایان نامێنن، لەو ڕۆژەدا دادگاییو لێپرسینەوەی خواو، سزادانو تۆڵەستاندنەوەی لە ستەمكاران، بەرجەستە دەبێ .

زاناو توێژەرەوان لەوبارەوە زۆر قسەیان کردووەو ئەوەی کە دەتوانین بە دڵنیاییەوە بیڵێین، ئەوەیە کە: بێگومان ئەم بارودۆخەی ئێستا کە بۆ ژیانی دنیا هەڵخراوەو ئینسانی تێدا تاقی دەکرێتەوە، قۆناغی ڕۆژی دوایی‌و قیامەت کە دێتە پێش، شێوەی پێکهاتەی زەوی‌و ئاسمان‌و بوون‌و گەردوون، هەمووی تێیدا دەگۆڕێ‌و، بەو شێوەیە هەڵدەخرێ، کە لەگەڵ ئەو کاتەدا بگونجێ .

لەوبارەوەش پێغەمبەر ﷺ فەرموودەیەکی هەیە، دەفەرموێ :

{يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى أَرْضٍ بَيْضَاءَ عَفْرَاءَ كَقُرْصَةِ نَقِيٍّ، لَيْسَ فِيهَا مَعْلَمٌ لأَحَدٍ}، (رواه البخاري برقم: (٦٥٢١).

واتە: لە ڕۆژی دواییدا خەڵك لەسەر زەوییەکی سپی کۆدەکرێنەوە، کە وەك نانێکی سپیی وایە، (گوناهی لەسەر نەکراوە)، هیچ کەسێك هیچ نیشانەیەکی نیە لەوێدا .

(کە بێگومان ئەو زەوییە، ئەم زەوییەی ئێستامان نیە).

<u>بڕگەی چوارەم</u> :- ﴿ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴾، بۆ خوای تاکی مل پێ کەچکەر، دێنە گۆڕێ‌و، دێنە ئەو مەیدانەوە کە خوا بۆی داناون .

<u>بڕگەی پێنجەم</u> :- ﴿ وَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُّقَرَّنِينَ فِي ٱلْأَصْفَادِ ﴾، تاوانباران لەو ڕۆژەدا دەبینی ، کە لە کەلەپچاندا پێکەوە جووت کراون .

(التَّقْرِينُ: وَضْعُ اثْنَيْنِ فِي قَرْنٍ أَيْ: حَبْلٍ)، واتە: وشەی (تَقْرِين): ئەوەیە کە دوو کەس پێکەوە، بە پەتێك یان بە کەلەپچەیەك ببەسترێن، (الأَصفاد) کۆی (صَفَد)ە، یان کۆی (صِفاد)ەو، هەردووکیان بە مانای کەلەپچە، دێن‌و، هەندێکیان بە مانای (غُلّ)یان لێکداوەتەوە، واتە: ئەو کۆت‌و پێوەندەی کە دەکرێتە گەردنەوە، (مُقَرَّنِين)یش مەرج نیە تەنیا دوودوو بن، دەگونجێ بە کۆمەڵ بن، وەك چۆن کۆمەڵە گایەك پێکەوەن، کاتی خۆی گا گێرەیان پێ دەکردن هەموویان پێکەوە دەبەسترێن بە جووت، ئەوانیش بەم شێوەیە پێکەوە دەبەسترێن، هەرچەندە توێژەرەوان باسی ئەو شێوەیان نەکردوە: بەڵکو تەنیا باسی دوو دوویان کردوە، بەڵام پێم وایە، مەرج نیە تەنیا دوودوو بن .

**برگەی شەشەم :** - ﴿ سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ ﴾، پۆشاکەکانیان لە قەترانن (القَطِرَانُ: مادَّةٌ شَدِيدَةُ الحَرَارَةِ تُسْتَخْدَمُ لِجَرَبِ الإبِلِ)، حوشتر کە تووشی نەخۆشیی خروو (حِكَّة) دێ، کە جۆرە نەخۆشییەکە لە پێستیان دەدا، بە ماددەی (قطران) چارەسەر دەکرێ، کە ماددەیەکی سووتێنەرەو خرووەکەیان دەشکێنێ .

**برگەی حەوتەم :** - ﴿ وَتَغْشَىٰ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ ﴾، ئاگر دەموچاوەکانیان دادەپۆشێ.

**برگەی هەشتەم :** - ﴿ لِيَجْزِيَ ٱللَّهُ كُلَّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ ﴾، (خوا ﷻ ڕۆژی دوایی دێنێتە پێشێ)، تاکو سزا، یان پاداشتی هەر کەسێك بداتەوە، بە پێی ئەوەی کە کردوویەتی .

**برگەی نۆیەم :** - ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴾، بێگومان خوا لێپرسینەوەی زۆر خێرایە، وا مەزانن کە زۆری پێ دەوەخرێ، کارەکانی قیامەت، لەگەڵ قیامەتدا دەگونجێن، نابێ قیاسیان بکەیە سەر کاروباری دنیا !

**برگەی دەیەم :** - ﴿ هَٰذَا بَلَٰغٌ لِّلنَّاسِ وَلِيُنذَرُوا۟ بِهِۦ ﴾، ئەمەش گەیاندنی پەیامێکە بۆ خەڵك، بۆ ئەوەی پێی ئاگادار بکرێنەوەو پێی بترسێنرێن .

**برگەی یازدەیەم :** - ﴿ وَلِيَعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ﴾، بۆ ئەوەش کە بزانن: پەرستراوی ڕاستەقینە، تەنیا یەکێکە (کە خوای بێ وێنەیە) .

**برگەی دوازدەیەم :** - ﴿ وَلِيَذَّكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾، هەروەها بۆ ئەوەش کە خاوەن عەقڵان پەند وەربگرن، یاخود بیریان بکەوێتەوەو تێبفکرن .

ئەگەر تێبفکرن‌و بیریان بکەوێتەوە: دەزانن ئەوەی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) گوتوویانە، ڕاستەو لەوەی کە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) گوتوویانە، بەهرەمەند دەبن‌و، هەر کەسێك لە پەیام‌و بانگەوازی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) بەهرەمەند ببێ، بێگومان لە دوارۆژدا زەرەرمەند نابێ‌و، تووشی ئەو چارەنووسە تاڵ‌و ڕەشە نابێ، کە ئەو ئایەتە موبارەکانە باسی دەکەن .

# کورتەیەک لە بەسەرهاتی ئیبراهیم عليه السلام و هەڵوێستەکانی

بەڕێزان !

ئێمە وەك عادەتی خۆمان، هەر سوورەتێك کە بە ناوی هەر پێغەمبەرێکەوە ناونرابێ، بەسەرهاتەکەی لەوێدا دەتوێژینەوە، هەروەك بۆ سوورەتەکانی: (یونس، هود، یوسف)ەوە وامان کرد، بۆ سوورەتی (إبراهیم)یش وا دەکەین، هەروەها دواتر بۆ سوورەتی (الحجر)یش هەر وا دەکەین، کە باسی گەلی صالحە، هەروەها لە سوورەتەکانی دیکەشدا، هەر بە پێی ئەم بنچینەیە مامەڵە دەکەین .

باسی بەسەرهاتی ئیبراهیم ، لە شەش بڕگەدا

بڕگەی یەکەم : ناوو ڕەچەڵەکی، ئیبراهیم عليه السلام و شوێنی لە دایکبوونی .

بڕگەی دووەم : ژمارەی ناوهێنانی ئیبراهیم لە قورئاندا !

بڕگەی سێیەم : کورتەی بەسەرهاتو ژیانی ئیبراهیم .

بڕگەی چوارەم : ناوو ژمارەی هاوسەرو کوڕەکانی ئیبراهیم .

بڕگەی پێنجەم : هەڵوێستەکانی ئیبراهیم عليه السلام .

بڕگەی شەشەمو کۆتایی : پلەو پایەو پێگەی ئیبراهیم عليه السلام .

## برگەی یەکەم: ناوو ڕەچەڵەکی ئیبراهیم ﷺ و شوێنی لە دایکبوونی ﷺ

شایانی باسە: لە (پەیمانی کۆن)دا هاتوە کە نووح ﷺ لە ڕێی سێ لە کوڕەکانیەوە وەچەی بڵاوبۆتەوە، کە: (سام و حام و یافث)ن، ئنجا باسکراوە کە ئیبراهیم لە وەچەی (سام)ەو، لە پەیمانی کۆندا، بەم شێوەیە باسی ڕەچەڵەکەکەی کراوە :

(سام) کوڕێکی بووە بە ناوی (ئەرفەکشاد)، ئەویش کوڕێکی بووە بە ناوی (شالح)، ئەویش کوڕێکی بووە بە ناوی (عابیر)، ئەویش کوڕێکی بووە بەناوی (فالەج)، ئەویش کوڕێکی بووە بە ناوی (ڕەعو)، ئەویش کوڕێکی بووە بە ناوی (سەرووج)، ئەویش کوڕێکی بووە بە ناوی (ناحوور)، ئەویش کوڕێکی بووە بە ناوی (تارح)، بە حیساب (تارح) ناوی بابی ئیبراهیمە ﷺ، کە لە قورئاندا ناوی بە (ئازەر) هاتوە .

ئنجا (تارح)یش سێ کوڕی بوون :

١) (ئەبرام) مەبەست ئیبراهیمە .

٢) ناحوور .

٣) هاران .

ئنجا لە (پەیمانی کۆن)دا هاتوە کە ئەبرام سارای (یان سارە)ی کردە هاوسەری خۆی‌و، هەر لەوێدا هاتوە کە هاران بابی لووطە ﷺ، بەڵام (هاران) پێش (تارح)ی بابی، لە (أُور الكلدَانيين) وەفاتی کردوە، (ناحور)یش کە کوڕێکی دیکەی (تارح)ی بابی ئیبراهیمە، بە حیساب دەبێ برای ئیبراهیم بێ، ئەویش ئافرەتێکی هێنا بە ناوی (مِلْكة بنتِ هارَان)[1].

هەڵبەتە ئێمە چ لێرەو چ لە هەر جێیەکی دیکە، کە هەندێ شت لە پەیمانی کۆن، یان لە پەیمانی نوێ دێنین، تەنیا بۆ ئەوەیە بزانرێ : لەوێشدا ئەو

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين الإصحاح ١١، ص ٣١، ٣٢.

زانیارییانە بەو شێوەیە هاتوون، ئەگەرنا بێگومان ئەوەی جێی پشت پێبەستن و لێ دڵنیابوونە، تەنیا ئەوەیە کە لە وەحیی پارێزراوی خوادا هاتوە، کە ئەویش قورئانەو سوننەتی صەحیح و ڕاست و دروستی پێغەمبەری خوایە ﷺ، واتە: ئەو بەشەی سوننەت کە بە سەنەدێکی صەحیح دەچێتەوە سەر پێغەمبەر ﷺ، هەر ئەوە پشتی پێ دەبەسترێ .

ئازەر (تارح) کە وەك گوتم : خوا لە قورئاندا ناوی بابی ئیبراهیمی بە ئازەر هێناوە، وەك لە سووڕەتی (الأنعام) هاتوەو دەفەرموێ : ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ ﴿٧٤﴾ ﴾، واتە: کاتێك ئیبراهیم بە بابی خۆی ئازەری گوت ...

ئنجا لە (پەیمانی کۆن)یشدا دەڵێ: ناوی بابی ئیبراهیم (تارح) بووە، بەڵام ئایا کامیان ناوی بابی ئیبراهیمە ؟

زانایان مشتومڕی زۆریان بووەو، زۆربەیان وایان چارەسەر کردوە کە یەکێکیان ناو (إسْم)ەو، ئەوەی دیکەیان نازناو (لَقَب)ە، یاخود هەردووکیان ناوی بابی ئیبراهیمن، بۆ وێنە :

١/ (إبن کثیر) لە (قِصَصُ الأنبیاء)دا، دەڵێ: (وَجُمهُورُ أَهْلِ النَّسَبِ، مِنْهُم ابن عَبَّاسٍ، عَلَى أَنَّ اسْمَ أَبِيهِ تَارح)[1]، واتە: زۆرینەی ڕەچەڵەك ناسان لە نێویاندا عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، لەسەر ئەوەن کە ناوی بابی ئیبراهیم تارح بووە .

هەر لەوێدا (إبن کثیر) دەڵێ: (وَقَالَ ابن جَرِير: وَالصَّوَابُ أَنَّ اسْمَهُ آزَر، وَلَعَلَّ لَهُ اسْمَانِ عَلَمَانِ، أَوْ أَحَدُهُمَا لَقَبٌ، وَالآخر عَلَمٌ، وَهَذَا الَّذِي قَالَهُ مُحْتَمَلٌ)، واتە: (إبن جریر) گوتوویەتی: ڕاست ئەوەیە کە ناوی بابی ئیبراهیم ئازەر بووە، دەشگونجێ دوو ناوی بووبن پێیان ناسرابێ، یاخود یەکێکیان نازناوی بووە، ئەوی دیکەیان ناوی بووە، (إبن کثیر) گوتویەتی: ئەوەی کە (إبن جریر) گوتوویەتی: ئەگەری هەیەو ڕێی تێدەچێ .

---

١) ص ١٢٠ – ١٢٣.

٢/ (عبدالوهاب النجار) لە (قِصَصُ الأَنبِياء)ی خۆیدا[1]، ئەویش باسی بەسەرهاتی ئیبراهیم دەکات، و باسی ناوەکەشی دەکات .

٣/ (محمد عيد عبدالله يعقوب الحسيني) لە كتێبی (سيرة النبيين والمرسلين)دا[2]، ئەویش بەهەمان شێوە .

٤/ (د. شوقي أبو خليل) لە كتێبی (أَطلَسُ القُرآن)دا[3]، ئەویش بە درێژیی باس دەكات .

وەك گوتم: هەموو ئەوانە زیاتر ڕایان وایە ناوی بابی ئیبراهیم تارح بووە، وەك لە (پەیمانی کۆن)دا هاتوە .

## ڕاو هەڵوێستی بەندە :

بەڕاستیی پێم سەیرە! کە لەسەر قسەی کتێبە پێشووەکان، ئنجا (پەیمانی کۆن) بێ، یان (پەیمانی نوێ) بێ، یان هەر کتێبێکی دیکە بێ، ئێمە بکەوینە ئەو مشتومڕەوە، مادام قورئان فەرموویەتی: ناوی بابی ئیبراهیم ئازەرە، ئیدی تەواو! ئایا ئێمە چ سەرچاوەیەکمان لەبەردەست دایە، وەك قورئان دڵنیابین کە فەرمایشتی خوایە؟! بێگومان هیچ شتێکی دیکەمان لە دەستدا نیە، لە دوای قورئانیش سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ .

ئنجا بە نسبەت شوێنی لە دایکبوونی (ئیبراهیم)ەوە، زۆربەی هەرەزۆری سەرچاوەکان دەڵێن: (وُلِدَ بجُنوبي العِراق وَاسْتَقَرَّ في مَدينة أُورِ الكِلدَانية)، واتە: ئیبراهیم لە باشووری عێراق لەدایکبووەو لە شاری ئوور کە هی کلدانییەکان بووە، لەوێ نیشتەجێ بووە. زۆربەی هەرەزۆری توێژەرەوان هەر ئەوە دووبارە دەکەنەوە .

---

١) ص ٧٠ –٧٥.

٢) ج ١، ص٢٠٠ .

٣) ص ٤١ –٤٢.

## بڕگەی دووەم: ژمارەی ناوهێنرانی ئیبراهیم ﷺ لە قورئاندا

سەرجەم شەستو هەشت (٦٨) جاران ناوی ئیبراهیم ﷺ لە قورئاندا هاتوە، ئەویش لە بیستو پێنج (٢٥) سوورەتاندا، دیارە لەو بیستو پێنج سوورەتانەدا، جاری وا هەیە ناوەکەی لە چەند ئایەتێکدا هاتوە جاری واش هەیە لە یەك ئایەتدا، ناوەکەی لە جارێك زیاتر هاتوە، وەك لەم خشتەیەدا دیارە :

| ژ | ناوی سوورەت | ژمارەی ڕیزبەندیی سوورەت | ژمارەی ئایەتەکان |
|---|---|---|---|
| ١ | البقرة | ٢ | ١٢٤، ١٢٥ (دووجار)، ١٢٦، ١٢٧، ١٣٠، ١٣٢، ١٣٣، ١٣٥، ١٣٦، ١٤٠، [illegible] (دووجار) ، ٢٦٠ |
| ٢ | آل عمران | ٣ | ٣٣، ٦٥، ٦٧، ٦٨، ٨٤، ٩٥، ٩٧ |
| ٣ | النساء | ٤ | ٥٤، ١٢٥ (دووجار)، ١٦٤ |
| ٤ | الأنعام | ٦ | ٧٤، ٧٥، ٨٣، ١٦١ |
| ٥ | التوبة | ٩ | ٧٠، ١١٤ (دووجار) |
| ٦ | هود | ١١ | ٦٩، ٧٤، ٧٥، ٧٦ |
| ٧ | يوسف | ١٢ | ٦، ٣٨ |
| ٨ | إبراهيم | ١٤ | ٣٥ |
| ٩ | الحجر | ١٥ | ٥١ |
| ١٠ | النحل | ١٦ | ١٢٠، ١٢٣ |
| ١١ | مريم | ١٩ | ٤٦، ٤٩، ٥٨ |
| ١٢ | الأنبياء | ٢١ | ٥١، ٦٠، ٦٢، ٦٩ |
| ١٣ | الحج | ٢٢ | ٢٦، ٤٣، ٧٨ |
| ١٤ | الشعراء | ٢٦ | ٦٩ |
| ١٥ | العنكبوت | ٢٩ | ١٦، ٣١ |
| ١٦ | الأحزاب | ٣٣ | ٧ |

| ژ | ناوی سوورەت | ژمارەی ڕیزبەندیی سوورەت | ژمارەی ئایەتەکان |
|---|---|---|---|
| ١٧ | الصافات | ٣٧ | ٨٣، ١٠٤، ١٠٩ |
| ١٨ | ص | ٣٨ | ٤٥ |
| ١٩ | الشورى | ٤٢ | ١٣ |
| ٢٠ | الزخرف | ٤٣ | ٢٦ |
| ٢١ | الذاريات | ٥١ | ٢٤ |
| ٢٢ | النجم | ٥٣ | ٣٧ |
| ٢٣ | الحديد | ٥٧ | ٢٦ |
| ٢٤ | الممتحنة | ٦٠ | ٤ (دووجار) |
| ٢٥ | الأعلى | ٨٧ | ١٩ |

لە سوورەتی (البقرة) کە سوورەتی ژمارە (٢)یە، لە ئایەتەکانی: {١٢٤ و ١٢٥ (دوو جار)و ١٢٦ و ١٢٧ و ١٣٠ و١٣٢ و ١٣٣ و ١٣٥ و ١٣٦ و ١٤٠ و ٢٥٨ (دوو جار)و ٢٦٠}دا، هاتوە واتە: (١٤) جاران ناوی ئیبراهیم لە سوورەتی (البقرة)دا، هاتوە .

لە سوورەتی ژمارە (٣)دا بەپێی ڕیزبەندیی (المصحف) کە سوورەتی (آل عمران)ە، لە ئایەتەکانی: (٣٣ و ٦٥ و ٦٧ و ٦٨ و ٨٤ و ٩٥ و ٩٧ )دا، ناوی ئیبراهیم هاتوە، واتە: لەو سوورەتەدا (٧) جاران ناوی ئیبراهیم هاتوە .

لە سوورەتی (النساء)دا، کە لە ڕیزبەندیی (المصحف)دا، ژمارە چوارە لە ئایەتەکانی: (٥٤ و ١٢٥ و ١٢٥ و ١٦٣)دا، واتە: چوار (٤) جاران ناوی هاتوە .

لە سوورەتی (الأنعام)دا، کە سوورەتی ژمارە (٦)ە، لە ئایەتەکانی : (٧٤ و ٧٥ و ٨٣ و ١٦١)دا، واتە: چوار (٤) جاران ناوی هاتوە .

لە سوورەتی (التوبة) کە سوورەتی ژمارە (٩)یە، لە ڕیزبەندیی (المصحف)دا لە ئایەتەکانی: (٧٠ و ١١٤)دا، (دووجار) واتە: سێ (٣) جاران ناوی هاتوە .

لە سوورەتی (هود)دا، کە سوورەتی ژمارە (١١)یە، لە ئایەتەکانی : (٦٩ و ٧١ و ٧٤ و ٧٦)دا، واتە: چوار (٤) جاران ناوی هاتوە .

لە سوورەتی (یوسف)دا کە ژمارە (١٢)یە، لە ئایەتەکانی : (٦ و ٣٨)دا، واتە: دوو (٢) جاران ناوی هاتوە .

لە سوورەتی (إبراهیم)دا کە سوورەتی ژمارە (١٤)یە، لە ئایەتی (٣٥)دا، واتە: یەك (١) جار ناوی هاتوە .

لە سوورەتی (الحجر)دا کە سوورەتی ژمارە (١٥)یە، لە ئایەتی (٥١)دا، واتە: یەك (١) جار ناوی هاتوە .

لە سوورەتی (النحل)دا کە سوورەتی ژمارە (١٦)یە، لە ئایەتەکانی : (١٢٠ و ١٢٣)دا، واتە: دوو (٢) جاران ناوی هاتوە .

لە سوورەتی (مریم)دا، کە سوورەتی ژمارە (١٩)یە، لە ئایەتەکانی : (٤٦ و ٤٩ و ٥٨)دا، واتە: سێ (٣) جاران ناوی هاتوە .

لە سوورەتی (الأنبیاء)دا، کە سوورەتی ژمارە (٢١)ە، لە ئایەتەکانی : (٥١ و ٦٠ و ٦٢ و ٦٤)دا، واتە: چوار (٤) جاران ناوی هاتوە .

لە سوورەتی (الحج)دا، کە سوورەتی (٢٢)ە، لە ئایەتەکانی: (٢٦و ٤٣ و ٧٨)دا، واتە: سێ (٣) جاران ناوی هاتوە .

لە سوورەتی (الشعراء)دا کە سوورەتی (٢٦)ە، لە ئایەتی (٦٩)دا، واتە: یەك (١) جار ناوی هاتوە .

لە سوورەتی (العنکبوت)دا کە سوورەتی (٢٩)ە، لە ئایەتەکانی: (١٦ و ٣١)دا، واتە: دوو (٢) جاران ناوی هاتوە .

لە سوورەتی (الأحزاب)دا، کە سوورەتی (٣٣)ە، لە ئایەتی (٧)دا، واتە: یەك (١) جار ناوی هاتوە .

لە سوورەتی (الصافات)دا کە سوورەتی (٣٧)ە، لە ئایەتەکانی: (٨٣ و ١٠٤ و ١٠٩)دا، واتە: سێ (٣) جار ناوی هاتوە .

لە سوورەتی (ص)دا کە سوورەتی (٣٨)ە، لە ئایەتی (٤٥)دا، واتە: یەك (١) جار ناوی هاتوە .

لە سوورەتی (الشورى)دا كە (٤٢)یە، لە ئایەتی (١٣)دا، واتە: یەك (١) جار ناوی هاتوە .

لە سوورەتی (الزخرف)دا كە سوورەتی (٤٣) یە، لە ئایەتی (٢٦)دا، واتە: یەك (١) جار ناوی هاتوە .

لە سوورەتی (الذاریات)دا كە سوورەتی (٥١)ە، لە ئایەتی (٢٤)دا، واتە: یەك (١) جار ناوی هاتوە .

لە سوورەتی (النجم)دا كە سوورەتی (٥٣)یە، لە ئایەتی (٣٧)دا، یەك (١) جار ناوی هاتوە .

لە سوورەتی (الحدید)دا كە سوورەتی (٥٧)ە، لە ئایەتی (٢٦)دا، یەك (١) جار ناوی هاتوە .

لە سوورەتی (الممتحنة)دا كە سوورەتی (٦٠)ە، لە ئایەتی (٤)دا، دوو (٢) جاران ناوی هاتوە .

لە سوورەتی (الأعلى) كە سوورەتی (٨٧)ە، لە ئایەتی (١٩)دا، یەك (١) جار ناوی هاتوە .

كۆی ناو هاتنەكانی ئیبراهیم ﷺ: شەستو هەشت (٦٨) جارە لە هەموو سوورەتەكانی قورئان دا .

**بڕگەی سێیەم : کورتەی بەسەرهاتو ژیانی ئیبراهیم ﷺ:**

ئەمە چاوپێداخشاندنێکی گۆی نەخشەی ژیانو بەسەرهاتی ئیبراهیم ﷺە، کە بە خێرایی لە حەوت کورتە خاڵدا، دەیخەینە ڕوو، چونکە لە بڕگەی پێنجەمدا بە درێژیی باسی هەڵوێستەکانی دەکەین :

١/ ئیبراهیم لە ئووری کلدانییەکان لە دایک بووەو، هەر بە گەنجیی خوا هیدایەتی داوە، بەر لەوەی ببێتە پێغەمبەر ﷺ، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (الأنبیاء)دا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ ﴿٥١﴾﴾، واتە: ئێمە پێشتر سەر ڕاستییمان بە ئیبراهیم دابوو، (پێش ئەوەی بیکەین بە پێغەمبەر)و ئێمە پێی زانابووین (کە شایستەیە).

پاشان ئیبراهیم ﷺ لەگەڵ بابیو گەلەکەیدا تێکدەگیرێو، بە مەنجەنیق فڕێی دەدەنە نێو ئاگر، (مەنجەنیق وەك مەدفەعی ئێستا وابووە)، بەڵام خوا دەیپارێزێ، وەك لە سوورەتی (الأنبیاء)دا، دەفەرموێ : ﴿قَالُوا۟ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓا۟ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿٦٨﴾ قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ وَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَخْسَرِينَ ﴿٧٠﴾﴾، واتە: گوتیان: ئیبراهیم بسووتێننو پەرستراوەکانتان سەربخەن، ئەگەر دەتانەوێ شتێك بکەن، (دوای ئەوەی کە ئیبراهیمیان فڕێدا بە مەنجەنیق بۆ نێو ئاگر) ئێمەش گوتمان: ئەی ئاگر! ساردبەوەو سەلامەتبە لەسەر ئیبراهیم، (کافرەکان) پیلانیان لە دژ گێڕا، بەڵام ئێمە ئەوانمان زیانبارکرد، واتە: فێڵو پیلانەکەیانمان پووچەڵ کردەوە .

٢/ دوایی ئیبراهیم ﷺ لەگەڵ لووطی برازایدا ﷺ، بەرەو شام بۆ ناوچەی حەڕڕان، کۆچ دەکەن، وەك لە سوورەتی (الأنبیاء)دا، دەفەرموێ: ﴿وَنَجَّيْنَٰهُ وَلُوطًا إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا لِلْعَٰلَمِينَ ﴿٧١﴾﴾، واتە: خۆیو لووطمان دەربازکردن، بەرەو ئەو سەرزەمینەی کە پیتو پێزمان تێخستوە بۆ جیهانییان.

کە مەبەست پێی شامە، بەلاّم لە شامیش چوونە ناوچەی حەڕڕان، ئەوە لە کتێبە مێژووییەکاندا هاتوە، بەتایبەت لە پەیمانی کۆندا، گرنگ ئەوەیە لە بازنەی سەرزەمینی شامدا بووە، وەك ئایەتەکە دەفەرموێ .

٣/ پاشان لە حەڕڕانەوە ئیبراهیم ﷺو لووط ﷺ کە لە قورئاندا نەهاتوە برازای بێ، ئەوە لە (پەیمانی کۆن)دا هاتوە، بەلاّم زۆر پێدەچێت برازای بوو بێ، لە هەموو هەلّوێستەکاندا لەگەلّیدا بووە، هەردووکیان دەچن بۆ (فلسطین)، دوایی لەبەر گرانیی‌و وشکە سالّیی، ئیبراهیم ماوەیەك دەچێت بۆ (مصر)، لە پەیمانی کۆندا دەلێ: لووطیش لەگەلّی چووەو، سارا خانی خێزانیشی لەگەلّدا بووە، وەك دوایی فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ دێنین لەوبارەوە ئەو چوونەی ئیبراهیم لە سەردەمی (الهكسوس)دا بووە، کە پێیان گوتراوە: (الملوك الرُّعَاة) پادشا شوانەکان‌و، لەوێ پادشای میسر (هاجەر)ی پێدەدات‌و، پێی خەلاّت دەکات، کە بەسەرهاتێکی هەیە دوایی باسی دەکەین.

٤/ دوایی جارێکی دیکە ئیبراهیم ﷺو سارا خان‌و، هاجەر خانیشی لەگەلّدا دەبن، ئەوە بەپێی دەقی فەرموودەیەکی سەرومرمان ﷺ، بەلاّم بە پێی قسەی پەیمانی کۆن: لووطیشیان لەگەلّ دا دەبێ، دەگەڕێنەوە بۆ فەلەستین، ئەو کاتە ئیبراهیم لە ناوچەی ؛ (بئر السبع)و، لووطیش لە ناوچەی خوارووی ؛ (البحر الميت) دەریای مردوودا، نیشتەجێ دەبن، کە دوایی بووە بە دەریای لووط، یاخود دەریای مردوو .

٥/ ئنجا کە خاتوون (هاجەر) دراوە بە خاتوون (سارا) خوا لێیان ڕازی بێ‌و لەلایەن پاشای میسرەوە پێی خەلاّت کراوە، دوایی (ساراخان) دەیبەخشێ بە ئیبراهیم، کە بیکات بە هاوسەری خۆی، بەلّکو مندالّی ببێ، چونکە خۆی کەوتۆتە تەمەنەوەو، نائومێد بووە لەوەی کە مندالّی ببێ، ئنجا (هاجەری قیبتیی) کە دەبێتە هاوسەری ئیبراهیم، ئیسماعیلی دەبێ، وەك لە فەرموودەکان‌و لە پەیمانی کۆنیشدا هاتوە دوایی (سارا خان) هەستی هەوێداریێتیی زۆر دەجوولێ‌و، ڕازی نابێ (هاجەر) لەوێ بێ، بۆیە ئیبراهیم ﷺ هاجەرو ئیسماعیلی کوڕی دەباتە شوێنی شاری مەککە - کە دوایی

دەبێتە شاری مەککە، دوایی ماڵی خوا (كَعْبَة) لەوێ بنیات دەنرێ - ئیدی لەوێ نیشتەجێیان دەکات بە فەرمانی خوا، وەك لە سووڕەتی (ابراهیم)دا هاتوە : ﴿ رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾.

کە پێشتر ئێمە ئەم ئایەتەمان تەفسیر کرد .

٦/ پاشان ئیبراهیم لە ساراخانیش ئیسحاقی دەبێ، وەك لە سووڕەتی (الأنبیاء)دا هاتوە : ﴿ وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ نَافِلَةٗۖ وَكُلّٗا جَعَلۡنَا صَٰلِحِينَ ﴿٧٢﴾ ﴾، واتە: ئێمە ئیسحاقمان پێی بەخشی، دوایی یەعقووبیشمان بە دوای ئەودا بە زیادە پێی بەخشی، هەر کامێك لە ئیسحاقو یەعقووبیشمان لە صاڵحان گێڕان (مرۆڤی باش بوون).

کە هەردووکیشیان دوایی کراونە پێغەمبەر.

٧/ ئنجا ئیبراهیم ﷺ لە تەمەنی سەدو نەوەدو پێنج (١٩٥) ساڵیی، یاخود دوو سەد (٢٠٠) ساڵیی‌و، بە پێی قسەی پەیمانی کۆن بێ: لە تەمەنی: سەدو حەفتاو پێنج (١٧٥) ساڵییدا کۆچی دوایی دەکات‌و، لە شاری خەلیل لە (حبرون) لە فەلەستین دەنێژرێ، لە پەیمانی کۆن لە (سفر التکوین، الإصحاح: ٢٥، ص ٦٦)دا، دەڵێ: لە (حقل حضرون مغارة المكتفلة) لەوێدا بە خاك سپێردراوە، کە بێگومان ئەوە بۆ ئێمە جێی پشت پێ بەستن‌و دڵنیایی نیە بەڵام با هەر بزانین ئەوانیش چیانگوتوە ! .

**بڕگەی چوارەم : ژمارەی هاوسەرو کوڕەکانی ئیبراهیم ﷺ:**

ئایا ئیبراهیم چەند هاوسەرو کوڕی هەبوون؟ باسی کچەکانی نەکراوە، ئایا کچی هەبوون، یان نا ؟ باس نەکراوە، لە قورئاندا تەنیا باسی دایکی ئیسماعیل (هاجەر)و دایکی ئیسحاق (سارا) کراوە، ئەوە بەنسبەت هاوسەرەکانیەوە، ئەویش بەبێ ئەوەی ناویان بهێنرێ، بەلام کە خوا ﷻ لەسەر زمانی ئیبراهیم دەفەرموێ : ﴿رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ ٣٧﴾إبراهيم، دەزانین کە ئەوە کوڕێکی ئیبراهیم لەوێیە، هەڵبەتە باسی هاوسەری ناکات، بەلام لە (صحيح البخاري)دا، هاتوە کە ئیسماعیل بە تەنها نەبووەو بچووك بووە، بەڵکو لەگەڵ دایکیدا بووە، ئەو کاتە شیرەخۆرە بووە، هەروەها دایکی ئیسحاق دیسان لە قورئاندا ناوی نەهاتوە بەلام هەم لە پەیمانی کۆنداو، هەم لە کتێبەکانی ئێمەدا، ناوی هاتوە، کە (سارا) یان (سارة) یان (سارای) بووە .

بەلام لە پەیمانی کۆندا دەڵێ: ئیبراهیم جگە لە ئیسماعیلو ئیسحاق، کوڕی دیکەشی هەبوون، کە دەبێ ئیسماعیل بە تەمەنی هەشتاو شەش ساڵیی ئیبراهیم لە هاجەری بووبێ‌و، ئیسحاقیشی بە سەد ساڵیی پێدرابێ، هەڵبەتە لە هەندێك لە کتێبەکانیشدا جیاوازیی کراوە لەو تەمەنانەدا، بەڵێ لە قورئانو سوننەتدا، جگە لە ئیسماعیلو ئیسحاق، باسی هیچ کوڕی دیکەی ئیبراهیم نەکراوە، بەلام لە تەوراتدا، چەند کوڕێکی دیکەی ئیبراهیم ﷺ باسکراون، وەك:

{وَعَادَ إِبْرَاهِيمُ فَاتَّخَذَ لِنَفْسِهِ زَوْجَةً تُدْعَى (قَطُورَةَ) فَأَنجَبَت لَهُ زِمْرَان، وَيَقْشَان، وَمَدَان، وَمِديَان، وَيَشْبَاق، وَشُوحًا)[1]، کەواتە: بەو پێیە بێ، دەبێ ئیبراهیم ﷺ جگە لە ساراو هاجەر هاوسەرێکی دیکەشی بووبێ، بە ناوی (قَطُورَة)، کە شەش کوڕی بوون، لەو هاوسەرەی بە ناوەکانی: زیمرانو یەقشانو مەدانو میدیانو

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح: ٢٥، ص ٦٦، (سفر التكوين) یەکێکە لە سیفرەکان (اسفار)ی تەورات، کە تەوراتیش یەکێکە لە کتێبەکانی پەیمانی کۆنو سەرجەم، (٣٩) کتێبو بە سەرژمێرێکی دیکە: (٤٩) کتێبن .

یەشباق‌و شووحا، ئەوە لە پەیمانی کۆندا هاتوە، ئنجا ئایا وایە، یان وانیە؟ هەر خوا دەزانێ.

فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوا ﷺ هەیە، کە دەفەرموێ: {حَدِّثُوا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلا حَرَجَ} ، (أَخرجَهُ أحْمَد برقم: (٦٤٨٦)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣٢٧٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٨٤١)، وَالتِّرمذيُّ برقم: (٢٦٦٩)، وَابن حِبَّانَ برقم: (٦٢٥٦) عَنْ عَبْدَ اللهِ بن عَمْرو ﷺ).

واتە: قسان لە بەنی ئیسرائیل بگێڕنەوەو، سەغڵەتییتان لەسەر نیە. بەڵام پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکیدا فەرموویەتی: {لاَ تُصَدِّقُوا أَهْلَ الكِتَابِ وَلاَ تُكَذِّبُوهُم} ، {رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٤٤٨٥)، عَنْ ابي هُرَيرَةَ ﷺ} ، واتە: بە خاوەنی کتێبەکان، نە بڵێن ڕاست دەکەن‌و، نە بڵێن درۆ دەکەن .

هەر بۆیەش هەم ئێمە وامانکردوەو، هەم زۆربەی تەفسیرەکان، هەندێك زانیاریی کە بەرچاوڕوونیی زیاتر دەخەنە سەر هەندێك لەو شتانەی، کە لە ئۆممەتانی پێشوودا بوون، بەهەرەیان لێوەرگرتوون، بەڵام بێگومان جگە لەوەی کە لە قورئاندا هاتوەو فەرمووده ڕاستەکانی پێغەمبەر ﷺ ڕایانگەیاندوە، هیچ شتێکی دیکە بۆ ئێمە جێی پشت بەستن‌و لێ دڵنیابوون نیە .

## بڕگەی پێنجەم: هەڵوێستەکانی ئیبراهیم ﷺ:

خوا پشتیوان بێ ئێمە دوازدە (١٢) هەڵوێست لە ئیبراهیمەوە دێنین، کە ئەم بڕگەیە زۆرترین پانتایی لە ژیانی ئیبراهیم ﷺ دادەگرێو، خوای زاناو شارەزا، باسی گەلێك هەڵوێستی ئیبراهیمی کردوە لە قورئاندا.

من بە بۆچوونی خۆم ئاوا ڕیزم کردوون، بە پێی ڕیزبەندیی کاتیی (الترتیب الزمني)، کە لە تەفسیرەکانو، لەو کتێبانەدا کە باسی ژیانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) بە گشتیو ئیبراهیم ﷺ بە تایبەتی دەکەن، نەمبینیوە ئاوا بەم شێوەیە ڕیز کرابن، بەڵام بەپێی سەرنجدانی من لە ئایەتەکانو، لە کۆی ژیانو بەسەرهاتی ئیبراهیم ﷺ، وام دێتە بەرچاو کە هەڵوێستەکانی ئیبراهیم، بەم ڕیزبەندییە بووبن :

**هەڵوێستی یەکەم : وتووێژی لەبەر خۆیەوە، لە بارەی خوای پەروەردگارەوە، کە کێیەو چۆنە؟!**

ئەمە لە ئایەتەکانی: (٧٥ – ٧٩)ی سوورەتی (الأنعام)دا، خوا ﷻ باسی کردوە، کە ئەمە دەقی ئایەتەکانە:

﴿ وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا
جَنَّ عَلَيۡهِ ٱلَّيۡلُ رَءَا كَوۡكَبٗاۖ قَالَ هَٰذَا رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلۡأٓفِلِينَ ﴿٧٦﴾ فَلَمَّا رَءَا
ٱلۡقَمَرَ بَازِغٗا قَالَ هَٰذَا رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمۡ يَهۡدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلضَّآلِّينَ
﴿٧٧﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمۡسَ بَازِغَةٗ قَالَ هَٰذَا رَبِّي هَٰذَآ أَكۡبَرُۖ فَلَمَّآ أَفَلَتۡ قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي بَرِيٓءٞ
مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ﴿٧٨﴾ إِنِّي وَجَّهۡتُ وَجۡهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ حَنِيفٗاۖ وَمَآ أَنَا۠
مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٧٩﴾ ﴾.

واتە: ئاوا بەوجۆرە موڵکی فراوانی ئاسمانەکان و زەوییمان پیشانی ئیبراهیم دان، تاکو لە بڕوا پتەوان بێ ﴿٧٥﴾ ئنجا کاتێك شەوگار دایپۆشیی ئەستێرەیەکی دی گوتی: ئەوە پەروەردگارمە، بەڵام کاتێك ئاوا بوو گوتی: من ئاوابووانم خۆشناوێن ﴿٧٦﴾ ئنجا کاتێك مانگی بە شەوقی (دڕ بە تاریکی شەوی دەری) بینی، گوتی: ئەمە پەروەردگارمە، بەڵام کاتێك ئاوا بوو، گوتی: ئەگەر بێتو پەروەردگارم (کە بە فیطرەتم دەیناسم) ڕێنماییم نەکات، بە دڵنیاییی یەوە لە کۆمەڵی سەرگەردانان دەبم ﴿٧٧﴾ ئنجا کاتێك خۆری پڕشنگداری بینی، گوتی: ئەمە پەروەردگارمە، ئەمە (لە هەموویان) گەورەترە، بەڵام کاتێك (ئەویش) ئاوا بوو، گوتی: ئەی گەلەکەم ! من دوورو بەریم لەو شتانەی ئێوە دەیانکەنە هاوبەش (بۆ خوا) ﴿٧٨﴾ بێگومان من بە پاکیی و چاکیی، ڕووی (دڵی) خۆمم کردە ئەو کەسەی کە ئاسمانەکان و زەوی وەدیهێناون و، من لە هاوبەش (بۆ خوا) دانەران نیم ﴿٧٩﴾ .

کە ئێمە ماناو مەبەستی ئەم ئایەتانەمان بە تەفصیلْ لە تەفسیری سووڕەتی (الأنعام)دا، خستۆتە ڕوو، بۆیە لێرە باسی ناکەینەوەو، پێموایە ئەوە یەکەمین هەڵوێستی ئیبراهیمە، ئنجا وەك لە تەفسیری سووڕەتی (الأنعام)یش لە بەرگی پێنجەمی ئەم تەفسیرە کوردییە (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز)دا، باسم کردوە، وا پێدەچێ ئا ئەو قسانە کە خوا ﷻ لە ئیبراهیمەوە دەیانگێڕێتەوە، وتووێژ بووبن لەگەڵ خۆیداو، لەبەرخۆیەوە، لەبارەی خوای پەروەردگارەوە، بەرلەوەی ببێتە پێغەمبەرو، شتێکی زۆر ئاساییە کە ئیبراهیم ﷺ بەرلەوەی ببێتە پێغەمبەر، خوای بەرزو مەزنی بەو شێوەیە نەناسیبێ، کە دوایی لە ڕێی وەحییەوە دەیناسی، چونکە خوا ﷻ دەربارەی پێغەمبەری خاتەمیش دەفەرموێ :

﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ ﴿٥٢﴾ ﴾الشورى

ئنجا ئەگەر بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ وابێ، کە پێش ئەوەی وەحیی خوای بۆ بێ، نەیزانیبێ: بەرنامە چییەو ئیمان چییە؟ ئەو هەڵوێستەی ئیبراهیمیش ﷺ شتێکی گونجاوە کە زانیویەتی: گەردوون و خۆی و دەوروبەری، پەروەردگارو بەدیهێنەر و خاوەنێکی هەیە، بەڵام ئەگەر نەزانێت پەروەردگارو بەدیهێنەرو

خاوەنەکەی چییەو، چۆنەو، سیفەتەکانی چین؟ پێش ئەوەی وەحیی بۆ بێت، شتێکی ئاساییو سروشتییو چاوەڕوانکراوە .

**هەڵوێستی دووەم : وتووێژی لەگەڵ بابیدا ، لە بارەی خوای بەرزو مەزنەوە :**

کە ئەوە لە سوورەتی (الأنعام) لە ئایەتی ژمارە (٧٤)دا هاتووە، دەفەرموێ:
﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً إِنِّيٓ أَرَىٰكَ وَقَوْمَكَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٧٤﴾ ﴾، واتە: کاتێك ئیبراهیم بە ئازەری بابی گوت: ئایا بتان دەکەیە پەرستراو! من خۆتو گەلەکەت لە گومڕاییەکی ڕووندا دەبینم .

کە لێرەدا بە کورتیی باسی دەکات، بەڵام لە سوورەتی (مریم)دا، لە ئایەتەکانی: (٤١ – ٥٠)دا، بە تەفصیلێ ئەو مشتومڕو وتووێژەی نێوان ئیبراهیمو بابی، باسکراوە، کە دەفەرموێ :

﴿ وَٱذْكُرْ فِي ٱلْكِتَٰبِ إِبْرَٰهِيمَ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا ﴿٤١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِي عَنكَ شَيْـًٔا ﴿٤٢﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي قَدْ جَآءَنِي مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَمْ يَأْتِكَ فَٱتَّبِعْنِيٓ أَهْدِكَ صِرَٰطًا سَوِيًّا ﴿٤٣﴾ يَٰٓأَبَتِ لَا تَعْبُدِ ٱلشَّيْطَٰنَ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ عَصِيًّا ﴿٤٤﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ فَتَكُونَ لِلشَّيْطَٰنِ وَلِيًّا ﴿٤٥﴾ قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنْ ءَالِهَتِي يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ وَٱهْجُرْنِي مَلِيًّا ﴿٤٦﴾ قَالَ سَلَٰمٌ عَلَيْكَ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّيٓ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيًّا ﴿٤٧﴾ وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدْعُوا۟ رَبِّي عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّي شَقِيًّا ﴿٤٨﴾ فَلَمَّا ٱعْتَزَلَهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَكُلًّا جَعَلْنَا نَبِيًّا ﴿٤٩﴾ وَوَهَبْنَا لَهُم مِّن رَّحْمَتِنَا وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيًّا ﴿٥٠﴾ ﴾.

واتە: (خوا ﷻ دەفەرموێ:) لە کتێبدا یادی ئیبراهیم بکەوە، بێگومان ئەو هەم صیددیق بوو، هەم پێغەمبەر بوو، {(صِدِّیق)، واتە: زۆر بە ڕاستدانەر،

یاخود زۆر ڕاستگۆ، (نبي) واتە: هەواڵ پێدراوو پێغەمبەر کە وەحیی بۆ دێت} کاتێك بە بابی گوت: ئەی بابە! بۆچی شتێك دەپەرستی کە نە دەبیستیو نە دەبینیو هیچ سوودێکت پێناگەیەنیێ ؟ ئەی بابە ! من زانیارییەکم بۆ هاتوە، کە تۆ بۆت نەهاتوە شوێنم بکەوە، ڕێیەکی ڕێكو ڕاستت پێشاندەدەم، ئەی بابە! شەیتان مەپەرستە، بێگومان شەیتان سەرپێچییکار بوو بۆ خوای خاوەن بەزەیی، ئەی بابە! من مەترسییم هەیە کە لەلایەن خوای خاوەن بەزەییەوە ئازارو سزات تووش ببیو ببیە دۆستی شەیتان، (ئنجا) بابی گوتی: ئەی ئیبراهیم ! ئایا تۆ دەستبەرداری پەرستراوەکانی من دەبی؟ ئەگەر دەست هەڵنەگری، بەرد بارانت دەکەم، بڕۆ زۆر دووربکەوەوە لێم، ئیبراهیم گوتی: سەلامەت لێبێ، داوای لێبوردنت بۆ لە پەروەردگارم دەکەم، بێگومان ئەو بۆ من مشوورخۆرەو، لەگەڵم بەخشندەو خاوەن کەرەمە، من دووریی لە ئێوە دەگرمو لەوەی کە لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوەو، لە پەروەردگاریشم دەپاڕێمەوە، ئومێدم وایە کە بەدبەخت نەبم، لەمەڕ ئەو پاڕانەوەی کە لە خزمەت پەروەردگارمدا دەیکەم، (واتە: ئومێدم وایە وەڵامم بداتەوە)، ئنجا کاتێك ئیبراهیم کەناری لێگرتنو، لێیان دوورکەوتەوە، لەوەی کە دەیانپەرست لە جیاتی خوا، ئێمە ئیسحاقو دواتر یەعقووبیشمان پێدا (دیارە یەعقووب کوڕی ئیسحاق بووە)، هەر کامێکیشیانمان کردە پێغەمبەرو، لە بەزەیی خۆمان پێمان بەخشینو، مەدحو ناوێکی بەرزمان بۆ پەیدا کردن (واتە: لە نێو خەڵکی ڕۆژگاری خۆیانو، هی دوای خۆیاندا) .

## هەڵوێستی سێیەم : وتووێژی ئیبراهیم لەگەڵ بابیو گەلەکەیدا، لە ئووری کلدانییەکاندا :

ئەم وتووێژەی ئیبراهیم ﷺ بە تایبەت لەگەڵ بابیو، بەگشتیی لەگەڵ گەلەکەیدا، لەم سوورەتانەی خوارەوەدا هاتوە :

١/ سوورەتی (الأنبياء) (٥١ - ٧٣) .

٢/ سوورەتی (الشعراء) (٦٩ - ٨٩) .

٣/ سوورەتی (الصافات) (٨٣ - ١١٣) .

٤/ سوورەتی (الزخرف) (٢٦ – ٢٨).

٥/ سوورەتی (العنكبوت) (١٦ – ٢٧).

٦/ سوورەتی (الأنعام) (٨٠ – ٨٣).

ئنجا ئێمە وەك نموونەیەك، بە كورتیی سەرنجێك لە ئایەتەكانی : (٥١ – ٧٣)ی سوورەتی (الأنبیاء)، دەدەین كە خوا ﷻ دەفەرموێ :

﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا
هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِىٓ أَنتُمْ لَهَا عَٰكِفُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا۟ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ ﴿٥٣﴾ قَالَ لَقَدْ
كُنتُمْ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٥٤﴾ قَالُوٓا۟ أَجِئْتَنَا بِٱلْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ
بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلَّذِى فَطَرَهُنَّ وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٦﴾
وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَٰمَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّوا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٥٧﴾ فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ
لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ ﴿٥٨﴾ قَالُوا۟ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٩﴾ قَالُوا۟
سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ ﴿٦٠﴾ قَالُوا۟ فَأْتُوا۟ بِهِۦ عَلَىٰٓ أَعْيُنِ ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ
﴿٦١﴾ قَالُوٓا۟ ءَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴿٦٢﴾ قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا
فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُوا۟ يَنطِقُونَ ﴿٦٣﴾ فَرَجَعُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ فَقَالُوٓا۟ إِنَّكُمْ أَنتُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ
﴿٦٤﴾ ثُمَّ نُكِسُوا۟ عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰٓؤُلَآءِ يَنطِقُونَ ﴿٦٥﴾ قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ
مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا وَلَا يَضُرُّكُمْ ﴿٦٦﴾ أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن
دُونِ ٱللَّهِ ۖ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ قَالُوا۟ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓا۟ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿٦٨﴾ قُلْنَا
يَٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ وَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَخْسَرِينَ ﴿٧٠﴾
وَنَجَّيْنَٰهُ وَلُوطًا إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا لِلْعَٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ

نَافِلَةً وَكُلًّا جَعَلْنَا صَالِحِينَ ﴿٧٢﴾ وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا وَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِمْ فِعْلَ الْخَيْرَاتِ وَإِقَامَ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءَ الزَّكَاةِ وَكَانُوا لَنَا عَابِدِينَ ﴿٧٣﴾ ﴾.

ئەم وتوویژەی نێوان ئیبراهیم ﷺ لەگەڵ بابی دا بە تایبەتیی‌و، لە بەرانبەر گەلەکەی دا بەگشتیی، نموونەیەکە لەو وتوویژانەی کە خوا ﷻ لەو شەش سوورەتەدا کە ئاماژەم پێدان، هێناویەتی، خوا ﷻ دەفەرمووێ :

ئێمە پێشتر ئیبراهیممان سەر ڕاست کردبوو، سەر ڕاستییمان پێبەخشیبووو، ئێمە پێی زانابووین، کاتێك کە بە بابی‌و گەلەکەی خۆی گوت: ئەو بتانە چین، ئێوە دەمێننەوە لەسەر پەرستنیان؟ گوتیان: بابو باپیرانمان‌و پێشینانمان وا بینیون، کە هەر پەرستەری ئەوان بوون، فەرمووی: خۆتان‌و باو باپیرانتان لە گومڕاییەکی ئاشکرادا بوون، گوتیان: قسەی هەقت بۆ هێناوین (بە جیددیی وا دەڵێی)، یان تۆ لە گاڵتەکەرانی‌و گاڵتەمان لەگەڵ دەکەی؟ فەرمووی: بەڵکو پەروەردگارتان پەروەردگاری ئاسمانەکان‌و زەوییە، کە پەیدای کردوون‌و، من لەسەر ئەو ڕاستییەتان ، لە شایەدانم (شایەدیی دەدەم)، سوێندیش بە خوا، دوای ئەوەی کە ئێوە دەڕۆن، من فێڵێك لە بتەکانتان دەکەم‌و چاریان دەکەم (دەیانشکێنم)، (لە دڵی خۆیدا وایگوتوە)، ئنجا هەموویانی وردو خاش کردن، جگە لە گەورەکەیان، بۆ ئەوەی بۆ لای بگەڕێنەوە، (بە حیسابی خۆیان لێی بپرسن کێ وای لەو پەرستراوانەی دیکە کردوە ؟). (کە گەڕانەوە) گوتیان: کێ وای لە پەرستراوەکانمان کردوە، بێگومان ئەو لە ستەمکارانە؟ گوتیان: گوێمان لە گەنجێك بوو (گوێبیستی گەنجێك بووین) باسی دەکردن، ئەو گەنجەش پێی دەگوترێ: ئیبراهیم، (دیارە ئەو کاتە ئیبراهیم، ناوی زۆر نەڕۆیشتوە واش پێدەچێ پێش پێغەمبەرایەتیی بووبێ)، گوتیان: بیهێنن بە بەرچاوی خەڵکەوە، بۆ ئەوەی خەڵکیش ببینن (کە ئێمە سزای دەدەین‌و لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکەین)، گوتیان: ئەی ئیبراهیم! تۆ وات لە پەرستراوەکانی ئێمە کردوە ؟ گوتی: بەڵکو گەورەکەیان وایکردوە، لێیان بپرسن، ئەگەر قسە دەکەن ! (لێرەدا ئیبراهیم شتێکی ناڕاستی نەگوتوە، بەڵکو مەبەستی ئەوە بووە: ئەگەر قسە بکەن، دیارە گەورەکەیان کردوویەتی‌و ڕازی نەبووە، ئەوانی دیکە لەگەڵی

بپەرستریّن، ئەدی خوا ﷻ چۆن ڕازی دەبیّ پەرستراوەکانی دیکە ببریّنە ئاستیو بکریّنە هاوبەشی؟)، ئەوان گەڕانەوە بۆ لای خۆیان گوتیان: ئیّوە ستەمکارن، (بیریان کردەوەو چاویان بە خۆیاندا گیّڕایەوەو گوتیان: ئیّوە ستەمکارن، ڕاست دەکات: ئەوانە قسە ناکەن!)، دوایی هەڵگەڕانەوە سەر سەریان، (پیّشیّ خەریك بوو ڕاست ببنەوەو، وەك بەشەر بیربکەنەوە، کە سەرکۆنەی خۆیانیان کرد، بەڵام دووبارە جاریّکی دیکە سەراوبن بوونەوە، چوونەوە سەر سەریانو هەڵگەڕانەوە)و گوتیان: تۆ دەزانی: ئەوانە قسە ناکەن! گوتی: ئەدی چۆن لە جیاتی خوا، شتانیّك دەپەرستن کە نە سوودتان پیّدەگەیەننو نە زیانیشتان لیّ دەدەن (نە قسە دەکەن)؟ ئۆف بۆ ئیّوە (حەیف بۆ ئیّوە! هاوار بۆ ئیّوە!) لەسەر ئەوەی دەیپەرستن لە جیاتی خوا، ئایا نافامن؟ گوتیان: بیسووتیّننو پەرستراوەکانتان سەربخەن، ئەگەر دەتانەویّ شتیّك بکەن، (دیارە خوا ﷻ ئەوەی هەمموو پیّچاوەتەوە، کە: خراوەتە نیّو مەنجەنیقەوەو، هەڵدراوەتە نیّو ئاگرو، ئاگریان بۆ کردۆتەوەو، چەند ڕۆژان بڵیّسەی بەرزبۆتەوە، ئەوەی هەمموو پیّچاوەتەوە). گوتمان: ئەی ئاگر! سارد بەو سەلامەتبە لەسەر ئیبراهیمو، پیلانیّکیان لە دژ گیّڕا، بەڵام ئیّمە ئەوانمان وا لیّکردن، کە زیانبارو دۆڕاو بنو ئیبراهیم دەرباز بکەین، خۆیو لووطمان بۆ ئەو سەرزەمینەی کە پیتو پیّزمان تیّخستبوو، بۆ جیهانییان دەرباز کردن (کۆچیان کرد)، ئیسحاقو یەعقووبیش بە دوایدا، پیّمان بەخشینو، هەر کامیّکیشیانمان لە صالحان گیّڕانو کردمانن بە پیّشەوا، کە بە فەرمانی ئیّمە، خەڵك ڕیّنمایی بکەن بەرەو ڕیّی خواو، سروشمان بۆ کردن: کە چاکان ئەنجام بدەنو، نویّژ بەرپابکەنو، زەکات بدەنو، ئەوان بەندەی باش بوون بۆ ئیّمە (تەنیا بەندایەتییان بۆ خوای بەرز دەکرد) .

## هەڵوێستی چوارەم : وتووێژێکی ئیبراهیم لەگەڵ حوکمڕانێکی خۆ بە پەروەردگارزاندا، لە بارەی یەکتایی خواوە :

ئەم بەسەرهاتەی ئیبراهیم ﷺ لە سوورەتی (البقرة) لە ئایەتی (٢٥٨)دا هاتووە، کتیّبە میّژووییەکانیش دەڵیّن : ئەو حوکمڕانە خۆ بەزلگرە ناوی (نمرود

بن كنعان) بووە، وەك (إبن كثير) لە (قِصَصُ الأنبياء)دا، دەڵێ: (قَالَ الـمُفَسِّرون وَغَيرَهُم مِنَ عُلَماء النَّسَبِ وَالأَخْبَار: وَهَـذَا الـمَلِكُ هُوَ مَلِكُ بابِل وَاسْمُهُ: النمرود بن كنعان بن كوش بن سام بن نوح، وَاسْتَمَرَّ فِي مُلْكِهِ أَرْبَعَ مِئَة سَنَة)[1]، واتە: مانا ڕوونكەرەوەكانی قورئانو جگە لەوان: زانایانی ڕەچەڵەكو هەواڵەكانیش گوتوویانە: ئەو پادشایە، پادشای شاری بابل بووە، ناوی نەمروودی كوڕی كەنعانی كوڕی كووشی كوڕی سامی كوڕی نووح بووەو، چوار سەد (٤٠٠)ساڵ لە حوكمڕانییدا بەردەوام بووە .

ئەو ئایەتەی سووڕەتی (البقرة)ش كە ئاماژەی بەو بەسەرهاتە كردوە، دەفەرمووێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِي حَاجَّ إِبْرَاهِيمَ فِي رَبِّهِ أَنْ آتَاهُ اللَّهُ الْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّيَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا أُحْيِي وَأُمِيتُ ۖ قَالَ إِبْرَاهِيمُ فَإِنَّ اللَّهَ يَأْتِي بِالشَّمْسِ مِنَ الْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ الْمَغْرِبِ فَبُهِتَ الَّذِي كَفَرَ ۗ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿٢٥٨﴾ ﴾.

واتە: ئایا سەرنج نادەیە ئەو كەسەی كە دەربارەی پەروەردگاری، لەگەڵ ئیبراهیمدا مشتومڕو موجادەلەی كرد؟ كاتێك كە ئیبراهیم فەرمووی: پەروەردگاری من ئەو كەسەیە كە دەژیەنێو دەمرێنێ، (ژیان بە خەڵك دەداتو مەرگیشیان بەسەردا دێنێ)، ئەو پادشاو حوكمڕانەش كە خوا موڵكو حوكمڕانیی پێدابووو، دەسەڵاتداری كردبوو (بۆ تاقیكردنەوەی) گوتی: منیش دەژیەنمو دەمرێنم ! {لە كتێبەكاندا هاتوە: نەمروود كابرایەكی هێنا كە مەحكووم كرابوو بە لەسێدارەدان، گوتی: ئەمە لە حوكمی مردوو دایە، بڕۆ ئازادم كردو، زیندووم كردەوە، كابرایەكی بێ خەتا (و تاوان)شی هێنا، گوتی: ئەمەش زیندوو نیە؟ ئنجا فەرمانیدا: لە ملیانداو كوشتیان، گوتی: ئەمەش زیندوو بوو، ئەوە مراندم، كەواتە: منیش دەژیەنمو دەمرێنم، كە بێگومان ئەوەی حوكمڕانە خۆ بەزلگرە كردوویەتی، سەفسەتەو چەواشەكاریی بووە، چونكە

---

١) ص ١٣٥.

ئیبراهیم ﷺ مەبەستی ئەوە بووە کە خوا ژیان بە مرۆڤەکان دەبەخشێ، پاشان مردنیان بەسەردا دێنێت، نەك بە ناهەق خەڵك بکوژێ‌و، کەسێك کە زیندانیی کراوە، ئازادی بکات، ئەوە ژیان پێدان نیە، بە هەرحاڵ، ئیبراهیم دەیگوێزێتەوە بۆ بەڵگەیەکی ڕوونتر، کە نەتوانێ ئەو چەواشەکاریی‌و سەفسەتەیەی تێدا بکات﴾ و، ئیبراهیم گوتی: پەروەردگاری من هەموو ڕۆژێك خۆر لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدێنێ، تۆ (یەك جار) لە خۆرئاواوە ڕۆژ بێنە (پێچەوانەی ئەوەی کە خوا دایناوە)، یەکسەر ئەوەی کە بێبڕوا بوو سەرسام بوو، دەستەوسان بوو، (زاری بوو بەتەلەی تەقیو)و خوا کۆمەڵی ستەمکاران ناخاتە سەر ڕاستە ڕێ، (لەبەر زوڵم‌و ستەم‌و خراپەکەیان).

## هەڵوێستی پێنجەم: کۆچکردنی ئیبراهیم لە عێراقەوە بۆ شام، لەگەڵ لووطدا:

کە لە (پەیمانی کۆن)دا دەڵێ لووط ﷺ برازای (کوڕی برای) ئیبراهیم بووە، ئەم هەڵوێستەش لە چەند شوێنێك ■ ئاماژەی پێکراوە، بۆ وێنە:

لە سووڕەتی (العنکبوت)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌ وَقَالَ إِنِّى مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّىٓ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٦﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَـٰقَ وَيَعْقُوبَ وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِ ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَـٰبَ وَءَاتَيْنَـٰهُ أَجْرَهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾.

واتە: لووط بڕوای پێهێنا (بە ئیبراهیم)و ئیبراهیم گوتی: من بەرەو پەروەردگارم کۆچ دەکەم، بێگومان هەر ئەو زاڵی کارزانە، ئێمەش ئیسحاق‌و یەعقوویمان پێدان (بە ئیبراهیممان بەخشین)و لە وەچەی ئەودا پێغەمبەرایەتیی‌و کتێب‌و شەریعەتمان هێشتەوە (وامانکرد ئەوانەی کە لە وەچەی ئەون، هەم پێغەمبەرایەتییان هەبێ، هەم شارەزایی کتێب‌و شەریعەتی خوایان هەبێ)و پاداشتی دنیامان پێداو، لە دواڕۆژیشدا لە چاکانە.

هەروەها لە سوورەتی (الأنبياء)دا، خوا ﷻ دەفەرمووێ : ﴿ وَنَجَّيْنَٰهُ وَلُوطًا إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِي بَٰرَكْنَا فِيهَا لِلْعَٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً وَكُلًّا جَعَلْنَا صَٰلِحِينَ ﴿٧٢﴾ وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا ...﴿٧٣﴾ ﴾.

واتە: خۆیو لووطمان دەربازکردن بەرەو ئەو سەرزەمینەی کە بۆ جیهانییان بەرەکەتدارو بەرهەمدار کردوە، ئیسحاقو یەعقووبیشمان بە زیادە پێدانو، هەر کامێکیشیانمان لە صالحان گێڕانو، کردمانن بە پێشەوا، کە بە فەرمانی ئێمە خەڵکی ڕێنمایی بکەن ... .

(إبن كثير) دەڵێ[1]: (سَارَة، سَارَاي، سَارَا: إبنة مَلِكِ حَرَّان وَاسْمُهُ: هَارَان، والمَشْهُورُ أَنَّهَا ابنة عَمِّهِ هَارَان الَّتِي تُنْسَبُ إِلَيْهِ حَرَّان، وَمَنْ زَعَمَ أَنَّهَا ابنة أَخِيهِ هَارَان أُخْتُ لُوط، فَقَدْ أَبْعَدَ النُّجْعَةَ، وَقَالَ بِلا عِلْمٍ، وَمَنِ ادَّعَى أَنَّ تَزْوِيجَ بِنْتِ أَخِيهِ كَانَ انذَاكَ مَشْرُوعاً، فَلَيْسَ لَهُ عَلَى ذَلِكَ دَلِيل).

واتە: سارە، سارای، یان سارا: کچی پادشای حەڕان بووە، ئەو پادشایە ناوی هاران بووەو، ئەوەی کە باوە ئەوەیە کە سارا کچی مامی بووە، کە مامی ناوی هاران بووەو ناوچەی حەڕان بە ناو هارانەوە کراوە، بەڵام هەر کەسێك کە پێی وابێ کە سارا برازای بووە، {کچی برایەکەی بووە، کە ناوی هاران بووەو خوشکی لووط بووە، وەك چۆن لووط برازای بووە، ساراش خوشکی لووط بووەو هەردووکیان کچو کوڕی هاران بوون، کە دەکاتەوە برای ئیبراهیم ؈، دەڵێ: هەر کەسێك وا بزانێ}، ئەوە لە ڕاستیی دوورکەوتۆتەوەو قسەیەکی کردوە کە هیچ زانیاریی لەبارەیەوە نیەو، هەر کەسێك ئیدیعای ئەوە بکات، کە ئەو کاتە بە هاوسەرگرتنی برازا (کچی برا) لەوکاتەدا ڕەوا بووە، ئەوە هیچ بەڵگەیەکی لەوبارەوە نیە .

شایانی باسە لە (پەیمانی کۆن)دا نەهاتوە، کە سارا کچی کێیە؟ زۆرم تەماشا کرد، هەر دەڵێ: سارای هێنا، بەڵێ ئەوە لە سەرچاوە مێژووییە ئیسلامییەکاندا هاتوە بەڵام بە تەئکید ئەویش دیسان نەبراوەتەوە سەر هیچ فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ، لەبەرئەوە جێی لێ دڵنیابوونو پشت پێ بەستن نیە .

---

١) قصص الأنبياء، ص ١٣٥و ١٣٦.

هەڵوێستی شەشەم : کۆچکردنی ئیبراهیم ﷺ بۆ میسر !

ئەم کۆچکردنە (چوونی بۆ میسر) لە قورئاندا باس نەکراوە، بەلام لە پەیمانی کۆن (تەورات)دا هاتووە، لە ژێر ناوونیشانی: (أبرام في ديار مصر)[1]، واتە: ئیبراهیم لە وڵاتی میسر، ئنجا لە پەیمانی کۆندا دەڵێ: لەو سەفەرەیدا لووطیشی لەگەڵ چووە بۆ میسر، بەڵام ئەوەی کە ئێمە لەوبارەوە پشتی پێدەبەستین و لێی دڵنیاین، ئەوەیە کە ئەو بەسەرهاتە لە فەرمایشتی پێغەمبەریشدا ﷺ هاتووە کە ئەمە دەقەکەیەتی :

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی :

{لَمْ يَكْذِبْ إِبْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلاَمُ، إِلاَّ ثَلاَثَ كَذَبَاتٍ: ثِنْتَيْنِ مِنْهُنَّ فِي ذَاتِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ: قَوْلُهُ: ﴿فَقَالَ إِنِّي سَقِيمٌ ﴿٨٩﴾﴾ الصافات، وَقَوْلُهُ: ﴿قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ...﴿٦٣﴾﴾ الأنبياء، وَقَالَ: بَيْنَا هُوَ ذَاتَ يَوْمٍ وَسَارَةُ، إِذْ أَتَى عَلَى جَبَّارٍ مِنَ الْجَبَابِرَةِ فَقِيلَ لَهُ: إِنَّ هَهُنَا رَجُلاً مَعَهُ امْرَأَةٌ مِنْ أَحْسَنِ النَّاسِ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ، فَسَأَلَهُ عَنْهَا، فَقَالَ: مَنْ هَذِهِ قَالَ: أُخْتِي، فَأَتَى سَارَةَ، قَالَ: يَا سَارَةُ! لَيْسَ عَلَى وَجْهِ الأَرْضِ مُؤْمِنٌ غَيْرِي وَغَيْرُكِ، وَإِنَّ هَذَا سَأَلَنِي فَأَخْبَرْتُهُ أَنَّكِ أُخْتِي، فَلاَ تُكَذِّبِينِي فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا، فَلَمَّا دَخَلَتْ عَلَيْهِ، ذَهَبَ يَتَنَاوَلُهَا بِيَدِهِ، فَأُخِذَ فَقَالَ: ادْعِي اللهَ لِي، وَلاَ أَضُرُّكِ فَدَعَتِ اللهَ، فَأُطْلِقَ ثُمَّ تَنَاوَلَهَا الثَّانِيَةَ، فَأُخِذَ مِثْلَهَا أَوْ أَشَدَّ فَقَالَ: ادْعِي اللهَ لِي وَلاَ أَضُرُّكِ فَدَعَتْ، فَأُطْلِقَ فَدَعَا بَعْضَ حَجَبَتِهِ، فَقَالَ: إِنَّكُمْ لَمْ تَأْتُونِي بِإِنْسَانٍ، إِنَّمَا أَتَيْتُمُونِي بِشَيْطَانٍ فَأَخْدَمَهَا هَاجَرَ فَأَتَتْهُ، وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي فَأَوْمَأَ بِيَدِهِ، مَهْيَا ؟! قَالَتْ: رَدَّ اللهُ كَيْدَ الْكَافِرِ (أَوِ الْفَاجِرِ) فِي نَحْرِهِ، وَأَخْدَمَ هَاجَرَ، قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: تِلْكَ أُمُّكُمْ يَا بَنِي مَاءِ السَّمَاءِ}[2].

١) سفر التكوين، الإصْحَاح ١٢، ص ٣٤ و ٣٥.

٢) أخرجه البخاري ، برقم (٣٣٥٨) واللفظ له ،و مسلم برقم ( ٢٣٧١ ).

ئێمە دەزانین کە ئەمە لە کاتی چوونو سەفەری ئیبراهیمدا ﷺ بووە بۆ میسر، چونکە ئاشکرایە هاجەر میسرییە، هەروەك لە فەرمایشتی ڕاستو بێ پێچو پەنای پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، کە لە صەحیحی بوخاریی دا هاتوە لێرەدا باسی ئەوەی تێدا نیە کە لووطیشی لەگەڵدا بووبێ، بەڵام باسی ئەوە کراوە کە ساراشی لەگەڵدا بووە، فەرموودەکە ئاوا دەست پێدەکاتو دەفەرموێ :

ئیبراهیم هەرگیز درۆی نەکردوە، مەگەر سێ درۆ، دوویان لەو سێیانە لەپێناوی خوادا بوون :

١/ کە گوتی: ﴿فَقَالَ إِنِّي سَقِيمٌ ﴿٨٩﴾﴾ الصافات، واتە: (ئیبراهیم) گوتی: من نەخۆشم، کاتێك گەلەکەی دەچوون بۆ دەرێ، (دەبێ ئەو ڕۆژە بۆنەو یادێك بووبێ)، ئیدی بەو بیانووە خۆی هێشتەوەو، دوایی ئەوە بوو کە بتەکانی شکاندن، وەك لە سوورەتی (الأنبیاء)دا باسکراوە .

٢/ ئەو قسەیەی کە گوتی: ﴿قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُوا۟ يَنطِقُونَ ﴿٦٣﴾﴾ الأنبیاء، کە لێیان پرسی ئەی ئیبراهیم! ئایا تۆ ئەو بتانەت شکاندوون؟ ئەویش گوتی: بەڵکو بتە گەورەکەیان وایکردوە (شکاندوونی)، لێیان بپرسن، ئەگەر قسە دەکەن ؟.

٣/ سێیەمیان لە کاتێکدا بوو، ڕۆژێك خۆیو سارا بوون، چوو بۆ لای ملهوڕێك لە ملهوڕەکان (مەبەست پێی حوکمڕانێکی بە زەبرو زۆرو خۆسەپێنە)، بەو حوکمڕانە ملهوڕە گوترا: پیاوێك هاتوە ئافرەتێکی لەگەڵدایە لە جوانترین خەڵکە، (لێرەدا نەیگوتوە: کە ئەو حوکمڕانە ملهوڕە خەڵکی کوێ بووە؟ بەڵام لە دوایی دا بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە خەڵکی میسر بووە)، ئەو حوکمڕانە ملهوڕە بە دوای ئیبراهیمیدا ناردو، دەربارەی سارا (ی هاوسەری) لە ئیبراهیمی پرسی: ئەوە کێیە؟ ئەویش گوتی: خوشکمە (درۆیەکەی ئیبراهیم لێرەدایە)، دوایی کە ئیبراهیم چۆوە لای سارا گوتی: ئەی سارا! لەسەر ڕووی زەوی هیچ بڕوادارێك نیە، جگە لە خۆمو خۆت، (واتە: با تۆ هاوسەریشم بی، بەڵام لەڕووی ئیمانەوە: منو تۆ خوشكو برای ئیمانیی یەکین، ئەگەر مەسەلەی هاوسەرایەتیی لێ بەریە دەرێ)، ئەو

حوکمڕانەش لەبارەی تۆوە پرسیاری لێکردم، منیش هەواڵم پێدا کە تۆ خوشکمی، ئنجا بە درۆم مەخەوە، (درۆم مەدە پاڵو مەڵێ ڕاست نیە)، حوکمڕانەکە لە دوای سارای نارد، کاتێك سارا چووە ژووری ئەو شوێنەی کە حوکمڕانەکە لێی بوو، دەستی بۆ برد (ویستی دەستی بگەیەنێتێ)، بەلام دەستی گیراو ڕەق بوو، حوکمڕانەکە بە سارای گوت: لە خوا بپارێوەو زیانت پێ ناگەیەنم، ئەویش لە خوا پاڕایەوەو دەستی بەربوو (چاك بۆوە)، دووبارە جاری دووەم دەستی بۆ برد، دیسان وەك پێشوو (یاخود توندتریش) دەستی گیرا، دووبارە حوکمڕانەکە بە سارای گوت: داوا بکە لە خوا دەستم بەربێو چاك بێتەوە، زیانت پێ ناگەیەنم، ئەویش لە خوا پاڕایەوەو دەستی بەربوو (چاك بۆوە)، دوایی ئەو حوکمڕانە هەندێك لە پاسەوانەکانی خۆی بانگکردن، گوتی: ئێوە ئینسانێکتان بۆ لای من نەهێناوە، بەڵکو شەیتانێکتان هێناوە! بیبەنە دەرێو هاجەریشی پێدا، کە وەك کارەکەر لەگەڵیدا بێتو خزمەتی بکات، سارا هاتەوە بۆ لای ئیبراهیم، لەو کاتەدا ئیبراهیم نوێژی دەکرد، ئیبراهیم بە دەست ئاماژەی پێدا (گوتی: هەواڵ چییە؟)، گوتی: خوا فێڵی ئەو کافرو تاوانبارەی گێڕایەوە بۆ خۆیو هاجەریشی بە من بەخشی وەك کارەکەر، وەك کەسێك کە خزمەتم بکات .

ئەبو هورەیرە کە ئەوەی گێڕایەوە، گوتی: ئا ئەوە دایکتانە ئەی (بَني ماءِ السَّماءِ).

(بنو ماء السَّماءِ) ناوێك بووە بۆ عەرەب بە گشتی، واتە: ئەو ئافرەتە هەڵکەوتوە بووە کە ئیسماعیلی لێ بووەو، دواتریش ئیسماعیل گەلی عەرەبی لێ وەپاش کەوتوە بە تایبەت عەرەبی موستەعرەبە .

لێرەدا هەرچەندە پێغەمبەری خوا ﷺ وشەی درۆی بۆ ئیبراهیم بەکارهێناوە، بەلام لە ڕاستییدا هەر کامێك لەو سێ قسەیەی ئیبراهیم، تەئویل هەڵدەگرنو، تەنیا ڕواڵەتیان درۆیە، ئەگەرنا درۆ نین :

١) کاتێك کە گەلەکەی بۆنەیەکیان هەبووە، بچنە دەرێ، دەبێ بۆنەیەکی ئینداریانەی بتپەرستانەی خۆیان هەبوو بێ، ئنجا داوایان لە ئیبراهیم

کـــردوه لـــەگەڵیـــان بچێتـــە دەرێ، کـــە گـوتوویـــەتی: ﴿إِنِّي سَقِيمٌ ﴿٨٩﴾﴾، مـــن نـــەخۆشـم، واتـــە: دڵـم نـــەخۆشـەو نـاڕەحەتـــە، بەهـۆی ئـــەوەوە کـــە ئێـوە بتـان دەپەرســتن .

٢- کە گوتوویـەتی : ﴿بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُوا۟ يَنطِقُونَ ﴿٦٣﴾﴾ الأنبیـاء، بـەڵکـو گەورەکـەیـان کـردوویـەتی، لێیـان بپرسـن: ئـەگـەر قسـە دەکەن !

لێرەدا هـەنـدێك لـە زانـایـان دەڵـێن: ئیبـراهیم گـوتوویــەتی: ئـەگەر قسـە بکەن، ڕاستە گەورەکەیـان کـردوویـەتی، ئنجـا بـە ئـاشکرا دیـارە مەبـەستی ئـەوە بـووە کـە ئـەو بتـە گەورەیـە ڕازیـی ئـەبـووە، ئـەو بتـە گچکانـە لـەگەڵـیدا بپەرسترێن، ئـەدی خـوای بێ هـاوتـا چـۆن ڕازییـە جگـە لـە خـۆی، لـەگەڵیدا بپەرسترێ، کەواتـە: ئـەویش دیسان بـە تـەئویـل ڕێی تێـدەچێ کـە: بـە تـوانجو بـە تـەوسـەوە وای پێگـوتبـن .

٣) کاتێك گوتووشیـەتی : سـارا خـوشـکـمە، وەك بـۆخۆشـی دەڵـێ : لـەو کاتـەدا لـەسـەر ڕووی زەوی هـەر خـۆیو سـارای هـاوسـەری بـڕوادار بـوون، بـۆیـە کـە گـوتوویـەتی : خـوشـکمە، واتـە : لـە ڕووی ئیمانـەوە، بـەس مـنو ئـەو ئـافرەتـە هـەیـن، کـە ئـەگـەر مەسـەلـەی نیکاحو هـاوسـەرگیـریی لـێ بچێتـە دەرێ، مـانـای وایـە: خـوشكو برای ئیمانیی یـەکـدین .

کەواتـە: لێـرەدا پێغـەمبـەر ﷺ ڕواڵـەتـی قسـەکـەی ئیبـراهیم بـاس دەکـات، کـە لـە ڕواڵـەتـدا قسـەکـان پێچـەوانـەی واقیـع بـوون، بـەڵام وەك گـوتم: ئـەگـەر لـە نێوەرۆکـەکـەیـان بفکرین بـە تـەئویـل، قسـەکانی قسەی ڕاسـت بوون .

لێرەدا بـە پێویسـتی دەزانـم: ئـامـاژە بـەوە بکـەم کـە لـە (پەیمـانـی کـۆن)دا، (سفر التکـوین، الإصحاح ١٢)دا[١]. چەند قسـەیـەکی نـاشـایستـە لـەبارەی ئیبـراهیمـەوە هـاتوون، ئنجـا بـۆ ئـەوەی ئـەگـەر کـەسـێك ویستی لـەو مەسـەلـەیـەدا لـە پەیمـانـی کـۆن بکـۆڵێتـەوە، ئـەوە ئـاگاداری دەکـەمـەوە :

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، ص٣٤.

لەوێدا هاتوە ، گوایە ئیبراهیم ﷺ بۆیە گوتوویەتی: سارا خوشکمە، تاکو سارا بکاتە بەلاگێڕەوەی خۆیو ئەو کافرە تەماعی تێبکاو، بەهۆی ئەوەوە ئیبراهیم سەلامەت بێو ئازار نەدرێ! کە ئەوە مسولمانێکی ئاسایی لە خۆی ناوەشێنێتەوە، بەلام بە داخەوە (پەیمانی کۆن) لەو جۆرە شتانەی تێدا هەن، دەربارەی ئیبراهیمو ﷺ دەربارەی پێغەمبەرانی دیکەش (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، واش پێدەچێ ئەو کەسانەی ئەو شتانەیان نووسیونەوەو ڕێکخستوون، لە هەمبانەی خۆیاندا گوێزیان ژماردوونو، هەندێک شتیان پالداوەتە لای پێغەمبەران، کە لە خۆیانیان وەشاوەتەوەو، پێیان وابوە لەوانیش دەوەشێتەوە .

## هەلوێستی حەوتەم : نیشتەجێکردنی هاجەرو ئیسماعیلی کوڕی لە شوێنی شاری مەککەی ئێستا :

وەك لە ئایەتی (٣٧)ی سوورەتی (إبراهیم)دا هاتوە کە خوا ﷻ دەفەرموێ:
﴿رَبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةً مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ ٣٧﴾.

ئیبراهیم ﷺ لە خوا دەپاڕێتەوەو دەفەرموێ: من بەشێك لە وەچەی خۆم لە شوێنێکی بێ کشتوکالو دەرامەت، لەلای مالی قەدەغەکراوی تۆدا، نیشتەجێ کردوە، (واتە: لەو شوێنەی کە مالی قەدەغەکراوی تۆی، بە فەرمانی تۆ لێ بنیات دەنێم) .

ئەم بەسەرهاتە لە (صحيح البخاري)دا، بە درێژیی هاتوە بوخاریی بە دوو ڕیوایەتیش هێناویەتی، بە ژمارە: (٣٣٦٤)و، بە ژمارە: (٣٣٦٥) هێناویەتی، ئەمەش دەقی ڕیوایەتی یەکەم :

{عَنْ سَعِيدِ بنِ جُبَيْرٍ قَالَ ابنِ عَبَّاسٍ: أَوَّلَ مَا اتَّخَذَ النِّسَاءُ الْمِنْطَقَ مِنْ قِبَلِ أُمِّ إِسْمَاعِيلَ، اتَّخَذَتْ مِنْطَقًا لَتُعَفِّيَ أَثَرَهَا عَلَى سَارَةَ، ثُمَّ جَاءَ بِهَا إِبْرَاهِيمُ، وَبِابْنِهَا إِسْمَاعِيلَ وَهِيَ تُرْضِعُهُ حَتَّى وَضَعَهُمَا عِنْدَ الْبَيْتِ عِنْدَ دَوْحَةٍ، فَوْقَ زَمْزَمَ فِي أَعْلَى الْمَسْجِدِ، وَلَيْسَ بِمَكَّةَ يَوْمَئِذٍ أَحَدٌ، وَلَيْسَ بِهَا مَاءٌ، فَوَضَعَهُمَا هُنَالِكَ، وَ وَضَعَ

عِنْدَهُما جِراباً فِيهِ تَمْرٌ وَسِقاءً فِيهِ ماءٌ، ثُمَّ قَفَّى إِبْرَاهِيمُ مُنْطَلِقاً، فَتَبِعَتْهُ أُمُّ إِسْماعِيلَ فَقَالَتْ: يا إِبْرَاهِيمُ أَيْنَ تَذْهَبُ وَتَتْرُكُنا بِهذَا الْوادِي الَّذِي لَيْسَ فِيهِ إِنْسٌ وَلاَ شَيءٌ، فَقَالَتْ لَهُ ذَلِكَ مِراراً، وَجَعَلَ لا يَلْتَفِتُ إِلَيْها، فَقَالَتْ لَهُ: آللهُ الَّذِي أَمَرَكَ بِهذَا؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَتْ: إِذًا لا يُضَيِّعُنا .

ثُمَّ رَجَعَتْ، فَانْطَلَقَ إِبْرَاهِيمُ حَتَّى إِذَا كانَ عِنْدَ الثَّنِيةِ، حَيْثُ لا يَرَوْنَهُ، اسْتَقْبَلَ بِوَجْهِهِ الْبَيْتَ، ثُمَّ دَعَا بِهَؤُلاءِ الْكَلِماتِ وَرَفَعَ يَدَيْهِ، فَقَالَ: ﴿رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ ...﴿٣٧﴾﴾ حَتَّى بَلَغَ ﴿يَشۡكُرُونَ﴾، وَجَعَلَتْ أُمُّ إِسْماعِيلَ تُرْضِعُ إِسْماعِيلَ، وَتَشْرَبُ مِنْ ذَلِكَ الْماءِ، حَتَّى إِذَا نَفِدَ ما فِي السِّقاءِ عَطِشَتْ وَعَطِشَ ابنها، وَجَعَلَتْ تَنْظُرُ إِلَيْهِ يَتَلَوَّى أَوْ قَالَ يَتَلَبَّطُ، فَانْطَلَقَتْ كَراهِيَةَ أَنْ تَنْظُرَ إِلَيْهِ، فَوَجَدَتِ الصَّفا أَقْرَبَ جَبَلٍ فِي الأَرْضِ يَلِيها، فَقَامَتْ عَلَيْهِ، ثُمَّ اسْتَقْبَلَتِ الْوادِيَ تَنْظُرُ: هَلْ تَرَى أَحَدًا؟ فَلَمْ تَرَ أَحَداً، فَهَبَطَتْ مِنَ الصَّفا حَتَّى إِذَا بَلَغَتِ الْوادِي رَفَعَتْ طَرَفَ دِرْعِها، ثُمَّ سَعَتْ سَعْيَ الإِنْسانِ الْمَجْهُودِ، حَتَّى جاوَزَتِ الْوادِيَ، ثُمَّ أَتَتِ الْمَرْوَةَ، فَقَامَتْ عَلَيْها وَنَظَرَتْ: هَلْ تَرَى أَحَداً، فَلَمْ تَرَ أَحَداً، فَفَعَلَتْ ذَلِكَ سَبْعَ مَرَّاتٍ، قَالَ ابن عَبَّاسٍ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: فَذَلِكَ سَعْيُ الناس بَيْنَهُما، فَلَما أَشْرَفَتْ عَلَى الْمَرْوَةِ سَمِعَتْ صَوْتاً، فَقَالَتْ صَهٍ، تُرِيدُ نَفْسَها، ثُمَّ تَسَمَّعَتْ، فَسَمِعَتْ أَيْضاً، فَقَالَتْ: قَدْ أَسْمَعْتَ، إِنْ كانَ عِنْدَكَ غِواثٌ، فَإِذَا هِيَ بِالْمَلَكِ، عِنْدَ مَوْضِعِ زَمْزَمَ، فَبَحَثَ بِعَقِبِهِ أَوْ قَالَ بِجَناحِهِ، حَتَّى ظَهَرَ الْماءُ، فَجَعَلَتْ تُحَوِّضُهُ وَتَقُولُ بِيَدِها هَكَذَا، وَجَعَلَتْ تَغْرِفُ مِنَ الْماءِ فِي سِقائِها، وَهُوَ يَفُورُ بَعْدَ ما تَغْرِفُ قَالَ ابن عَبَّاسٍ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: يَرْحَمُ اللهُ أُمَّ إِسْماعِيلَ لَوْ تَرَكَتْ زَمْزَمَ أَوْ قَالَ لَوْ لَمْ تَغْرِفْ مِنَ الْماءِ، لَكانَتْ زَمْزَمُ عَيْناً مَعِيناً، قَالَ فَشَرِبَتْ وَأَرْضَعَتْ وَلَدَها، فَقَالَ لَها الْمَلَكُ، لا تَخافُوا الضَّيْعَةَ، فَإِنَّ ها هُنا بَيْتَ اللهِ، يَبْني هَذَا الْغُلامُ، وَأَبُوهُ، وَإِنَّ اللهَ لا يُضِيعُ أَهْلَهُ، وَكانَ الْبَيْتُ مُرْتَفِعاً مِنَ الأَرْضِ كَالرَّابِيَةِ، تَأْتِيهِ السُّيُولُ فَتَأْخُذُ عَنْ يَمِينِهِ وَشِمالِهِ، فَكانَتْ كَذَلِكَ، حَتَّى مَرَّتْ بِهِمْ رُفْقَةٌ مِنْ جُرْهُمَ، أَوْ أَهْلُ بَيْتٍ مِنْ جُرْهُمَ، مُقْبِلِينَ مِنْ طَرِيقِ كَدَاءٍ فَنَزَلُوا فِي أَسْفَلِ مَكةَ، فَرَأَوْا طائِراً عائِفاً، فَقَالُوا: إِنَّ هَذَا الطَّائِرَ لَيَدُورُ عَلَى ماءٍ، لَعَهْدُنا بِهذَا الْوادِي وَما فِيهِ ماءٌ، فَأَرْسَلُوا جَرِيّاً أَوْ جَرِيَّيْنِ، فَإِذَا هُمْ بِالْماءِ، فَرَجَعُوا فَأَخْبَرُوهُمْ بِالْماءِ، فَأَقْبَلُوا، قَالَ وَأُمُّ إِسْماعِيلَ عِنْدَ الْماءِ، فَقَالُوا:

أَتَأْذَنِينَ لَنَا أَنْ نَنْزِلَ عِنْدَكِ فَقَالَتْ: نَعَمْ، وَلَكِنْ لاَ حَقَّ لَكُمْ فِي الْمَاءِ، قَالُوا: نَعَمْ. قَالَ ابن عَبَّاسٍ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: فَأَلْفَى ذَلِكَ أُمَّ إِسْمَاعِيلَ، وَهْيَ تُحِبُّ الإِنْسَ، فَنَزَلُوا وَأَرْسَلُوا إِلَى أَهْلِيهِمْ، فَنَزَلُوا مَعَهُمْ حَتَّى إِذَا كَانَ بِهَا أَهْلُ أَبْيَاتٍ مِنْهُمْ، وَشَبَّ الْغُلاَمُ، وَتَعَلَّمَ الْعَرَبِيَّةَ مِنْهُمْ، وَأَنْفَسَهُمْ وَأَعْجَبَهُمْ حِينَ شَبَّ، فَلَمَّا أَدْرَكَ، زَوَّجُوهُ امْرَأَةً مِنْهُمْ، وَمَاتَتْ أُمُّ إِسْمَاعِيلَ، فَجَاءَ إِبْرَاهِيمُ، بَعْدَ مَا تَزَوَّجَ إِسْمَاعِيلُ يُطَالِعُ تَرِكَتَهُ، فَلَمْ يَجِدْ إِسْمَاعِيلَ، فَسَأَلَ امْرَأَتَهُ عَنْهُ، فَقَالَتْ: خَرَجَ يَبْتَغِي لَنَا، ثُمَّ سَأَلَهَا عَنْ عَيْشِهِمْ وَهَيْئَتِهِمْ، فَقَالَتْ: نَحْنُ بِشَرٍّ، نَحْنُ فِي ضِيقٍ وَشِدَّةٍ. فَشَكَتْ إِلَيْهِ، قَالَ: فَإِذَا جَاءَ زَوْجُكِ فَاقْرَئِي عَلَيْهِ السَّلاَمَ، وَقُولِي لَهُ يُغَيِّرْ عَتَبَةَ بَابِهِ، فَلَمَّا جَاءَ إِسْمَاعِيلُ، كَأَنَّهُ آنَسَ شَيْئًا، فَقَالَ: هَلْ جَاءَكُمْ مِنْ أَحَدٍ قَالَتْ: نَعَمْ، جَاءَنَا شَيْخٌ كَذَا وَكَذَا، فَسَأَلَنَا عَنْكَ فَأَخْبَرْتُهُ، وَسَأَلَنِي كَيْفَ عَيْشُنَا فَأَخْبَرْتُهُ أَنَّا فِي جَهْدٍ وَشِدَّةٍ، قَالَ: فَهَلْ أَوْصَاكِ بِشَيْءٍ قَالَتْ: نَعَمْ، أَمَرَنِي أَنْ أَقْرَأَ عَلَيْكَ السَّلاَمَ، وَيَقُولُ غَيِّرْ عَتَبَةَ بَابِكَ، قَالَ: ذَاكِ أَبِي، وَقَدْ أَمَرَنِي أَنْ أُفَارِقَكِ الْحَقِي بِأَهْلِكِ، فَطَلَّقَهَا، وَتَزَوَّجَ مِنْهُمْ أُخْرَى، فَلَبِثَ عَنْهُمْ إِبْرَاهِيمُ مَا شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ أَتَاهُمْ بَعْدُ، فَلَمْ يَجِدْهُ، فَدَخَلَ عَلَى امْرَأَتِهِ، فَسَأَلَهَا عَنْهُ، فَقَالَتْ: خَرَجَ يَبْتَغِي لَنَا، قَالَ: كَيْفَ أَنْتُمْ وَسَأَلَهَا عَنْ عَيْشِهِمْ، وَهَيْئَتِهِمْ؟ فَقَالَتْ: نَحْنُ بِخَيْرٍ وَسَعَةٍ، وَأَثْنَتْ عَلَى اللَّهِ، فَقَالَ: مَا طَعَامُكُمْ؟ قَالَتْ: اللَّحْمُ، قَالَ: فَمَا شَرَابُكُمْ؟ قَالَتْ: الْمَاءُ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمْ فِي اللَّحْمِ وَالْمَاءِ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ يَوْمَئِذٍ حَبٌّ، وَلَوْ كَانَ لَهُمْ دَعَا لَهُمْ فِيهِ، قَالَ فَهُمَا لاَ يَخْلُو عَلَيْهِمَا أَحَدٌ بِغَيْرِ مَكَّةَ إِلاَّ لَمْ يُوَافِقَاهُ، قَالَ: فَإِذَا جَاءَ زَوْجُكِ فَاقْرَئِي عَلَيْهِ السَّلاَمَ، وَمُرِيهِ يُثْبِتُ عَتَبَةَ بَابِهِ، فَلَمَّا جَاءَ إِسْمَاعِيلُ، قَالَ: هَلْ أَتَاكُمْ مِنْ أَحَدٍ؟ قَالَتْ: نَعَمْ أَتَانَا شَيْخٌ حَسَنُ الْهَيْئَةِ، وَأَثْنَتْ عَلَيْهِ، فَسَأَلَنِي عَنْكَ، فَأَخْبَرْتُهُ، فَسَأَلَنِي كَيْفَ عَيْشُنَا، فَأَخْبَرْتُهُ: أَنَّا بِخَيْرٍ، قَالَ: فَأَوْصَاكِ بِشَيْءٍ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، هُوَ يَقْرَأُ عَلَيْكَ السَّلاَمَ، وَيَأْمُرُكَ أَنْ تُثْبِتَ عَتَبَةَ بَابِكَ، قَالَ: ذَاكِ أَبِي، وَأَنْتِ الْعَتَبَةُ، أَمَرَنِي أَنْ أُمْسِكَكِ، ثُمَّ لَبِثَ عَنْهُمْ مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ جَاءَ بَعْدَ ذَلِكَ، وَإِسْمَاعِيلُ يَبْرِي نَبْلاً لَهُ تَحْتَ دَوْحَةٍ قَرِيبًا مِنْ زَمْزَمَ، فَلَمَّا رَآهُ قَامَ إِلَيْهِ، فَصَنَعَا كَمَا يَصْنَعُ الْوَالِدُ بِالْوَلَدِ، وَالْوَلَدُ بِالْوَالِدِ، ثُمَّ قَالَ: يَا إِسْمَاعِيلُ، إِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِي بِأَمْرٍ، قَالَ: فَاصْنَعْ مَا أَمَرَكَ رَبُّكَ، قَالَ: وَتُعِينُنِي؟ قَالَ: وَأُعِينُكَ، قَالَ: فَإِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِي أَنْ أَبْنِيَ هَا هُنَا بَيْتًا، وَأَشَارَ إِلَى أَكَمَةٍ مُرْتَفِعَةٍ عَلَى مَا حَوْلَهَا، قَالَ: فَعِنْدَ ذَلِكَ رَفَعَا الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ، فَجَعَلَ إِسْمَاعِيلُ يَأْتِي بِالْحِجَارَةِ، وَإِبْرَاهِيمُ يَبْنِي، حَتَّى إِذَا ارْتَفَعَ الْبِنَاءُ، جَاءَ

بِهَذَا الْحَجَرِ فَوَضَعَهُ لَهُ، فَقَامَ عَلَيْهِ وَهُوَ يَبْنِي، وَإِسْمَاعِيلُ يُنَاوِلُهُ الْحِجَارَةَ، وَهُمَا يَقُولاَنِ: ﴿ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ ﴾البقرة، قَالَ: فَجَعَلاَ يَبْنِيَانِ حَتَّى يَدُورَا حَوْلَ الْبَيْتِ، وَهُمَا يَقُولاَنِ: ﴿ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ ﴾البقرة}.

واتە : لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە هاتووە دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس گوتی: یەکەمین جار کە ئافرەتان دامێنی خۆیان درێژ کرد، (لە کراسی خۆیان درێژ کرد، کە لە دوایان بخشێ)، لەلایەن دایکی ئیسماعیلەوە بوو، ئەویش بۆیە دامێنی کراسەکەی درێژ کرد (بۆ ئەوەی لە دوای بخشێ)، تاکو ئەگەر بە شوێنێکدا ڕۆیی، سارا نەتوانێ بەدوایدا بچێو شوێن پێی هەڵبگرێو، دامێنی کراسەکەی شوێنەکەی ون بکاتو بیسڕێتەوە (دیارە شوێنەکەیان دەشتو سارا بووە)، لە حاڵێکدا کە دیارە پێکەوە هەوێ بوون، خوا لە هەردووکیان ڕازی بێ، دوای ئەوەی کە هاجەر ئیسماعیلی دەبێ، سارا زۆر هەستیاریی بەرانبەری پەیدا دەبێ، دواتر هەر لەسەر داواکاریی سارا دەبێ کە ئیبراهیم، ئیسماعیلو هاجەر دەباتو لە شوێنی ئێستای شاری مەککە، نیشتەجێیان دەکات، {لێرەدا عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، بەسەرهاتەکە کورت دەکاتەوەو دەڵێ:} دوایی ئیبراهیم ﷺ هاجەرو ئیسماعیلی کوڕی لە کاتێکدا کە شیرەخۆرە بوو، بردنی هەتاکو لەلای کەعبە دایانان (نیشتەجێی کردن)، لەلای درەختێك لە پشت ئەو شوێنەوە کە دوایی ئاوی زەمزەمی لێ پەیدا دەبێ، لە سەرووی مزگەوتەوە {کە دوایی مزگەوتی لێ پەیدا دەبێ، ئەگەرنا ئەوکاتە نە مزگەوت هەبووە، نە ئاوی زەمزەم هەبووە، نە شاری مەککەش هەبووە، هیچ ئاوەدانییەکی لێ نەبووە}. لەو کاتەدا مەککە هیچ کەسێکی لێ نەبووەو ئاویشی لێ نەبووەو لەوێ دایانان، جەواڵێك (یان توورەکەیەك) خورما لەگەڵ مەشکەیەك ئاویشی لەلا دانان، دوایی ئیبراهیم ﷺ پشتی تێکردنو گەڕایەوە، هاجەری دایکی ئیسماعیل شوێنی کەوتو گوتی: ئەی ئیبراهیم! بۆ کوێ دەچیو ئێمە لەو شیوە بەجێدێڵی، کە نە مرۆڤێکی لێیەو نە هیچی لێیە؟ چەند جارێك ئەوەی دووبارە کردەوە، بەڵام ئیبراهیم ئاوڕی لێ نەدایەوە، دوایی هاجەر گوتی: ئایا

خوا فەرمانی بەمە پێکردووی؟ ئیبراهیم گوتی: بەڵێ، گوتی: کەواتە: خوا ئێمە زایە ناکات، دوایی هاجەر گەڕایەوە، ئیبراهیمیش ڕۆیشت هەتا لای (ثَنِیة)، (کە شوێنێکە لە مەککە)، بە شێوەیەك کە هاجەر نەیدەبینی، لەوێ ڕووی کردە کەعبە، واتە: ئەو شوێنەی کە ئێستا کەعبەی لێ دروستکراوەو ئیبراهیم ﷺ دەستی بەرز کردەوەو بەو وشانە لە خوا پاڕایەوەو فەرمووی :

﴿رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ ۝٣٧﴾.

دایکی ئیسماعیلیش دەستی کرد بە شیر پێدانی ئیسماعیل‌و، بۆ خۆشی لە ئاوەکەی دەخواردەوە (هەڵبەتە لە خورماکەشی خواردوە)، هەتا کاتێك کە ئەو ئاوەی لە مەشکەکەدا بوو بڕا، دایکەکە تینووی بوو، منداڵەکەش تینووی بوو، ئنجا کاتێك کە هاجەر تەماشای ئیسماعیلی دەکرد، لە تینووان‌و لە برسان خۆی تێکباهەڵدەداو، لینگە فرتەی بوو، ئەویش ڕۆیشت بۆ ئەوەی کە بەو شێوەیە ئیسماعیل نەبینێ، (واتە: ڕۆیشت تەماشا بکات، بزانێ کەسێك نابینێ)، سەرنجی دا تەپۆلکەی سەفا نزیکترین جیا بوو، بە نسبەت ئەوەوە، بۆیە چووە سەر تەپۆلکەی سەفاو ڕووی کردە شیوەکە بزانێ هیچ کەس دەبینێ، کەسی نەبینی، دوایی لە تەپۆلکەی سەفا دابەزی، تا گەیشتە نێو شیوەکەو کراس‌و دامێنی خۆی هەڵکرد، تا بتوانێ چاك بڕوات‌و بە ئەرمە غار ڕۆیشت، وەك کەسێکی ماندووی بێ تاقەت، تاکو لە شیوەکە تێپەڕی‌و، گەیشتە سەر تەپۆلکەی مەروە، لەوێش لەسەر شاخۆلکەی مەڕوە، دووبارە لەوێشەوە سەرنجیدا بە ملاولادا، داخۆ کەسێك دەبینێ ! دووبارە کەسی نەبینی، ئیدی بەم شێوەیە حەوت جاران وایکرد، {واتە: لە سەفاوە چوو بۆ مەروەو لە مەرواوە هاتەوە سەفا}، عەبدوڵلای کوڕی عەبباس دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (فَذالِكَ سعيُ الناسِ بَينَهُما)، هاتن‌و چوونی ئێستای خەڵك لە نێوان سەفاو مەڕوەدا، بەهۆی ئەو هاتن‌و چوونەی هاجەرەوە بووە، لە نێوان ئەو دوو شاخۆلکەیەدا، {کە دیارە ئەو کاتە ئەو دوو شاخۆلکەیە بەرز بوون، بەڵام وردە وردە داڕووخاون‌و نزمبوونەوە}، تاکو پەیسەرێك‌و سۆراغێك بکات، بزانێ کەس

دەبینێ، یان نا؟ ئنجا کاتێك بۆ دواجار چوو بۆ سەر شاخۆلکەی مەروە، دەنگێکی بیست، بەخۆی گوت: بێ دەنگ بە (گوێ هەڵخە، هەناسەی خۆی بڕی، بۆ ئەوەی چاك گوێ بگرێ)، دوایی هاجەر بانگێکی کردو گوتی: ئەوە واتکرد کە من دەنگت ببیستم، ئەگەر هاوکارییەکت بۆ من پێ دەکرێ، با بزانم؟ تەماشای کرد: ئەوە فریشتەکە (مەبەست پێی جبریلە) لەو شوێنەیە کە دوایی سەرچاوەی زەمزەمی لێ پەیدا بووە، بە پاژنە پێی، یاخود بە باڵەکەی لە زەوییەوە دەژەنی و، عەرزی هەڵدەکەند، تاکو ئاوەکە دەرکەوت، کە ئاوەکە دەرکەوت هاجەریش چوو، ئەو ئاوەی کە هەڵقوڵی، لەوێ، بەدەستی ویستی ئاوەکە نەڕوا، حەوزێکی بۆ دروست کرد، پاشان دەستی کرد بەوە کە بە مست لەو ئاوەی کە لە حەوزەکەدا کۆببووەوە لە کاتێکدا کە دەردەقوڵی، مەشکەکەی (یاخود گوندەکەی) لێ پڕ کرد .

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوا بەزەیی بە دایکی ئیسماعیلدا بێتەوە، ئەگەر لە زەمزەم گەڕابایە، (ئەگەر بەدەستی مستی تێهەڵ نەدابایەو، لێی گەڕابایە)، ئەوە ئاوی زەمزەم دەبوو بە سەرچاوەیەکی گەورە، (واتە: گەورەتر لەوەی کە ئێستا هەیە)، ئنجا دەڵێ: هاجەر لە ئاوەکەی خواردەوەو شیری دا بە منداڵەکەیو، فریشتەکەش (جبریل کە بۆی چۆتە سەر شێوەی مرۆڤێك) پێی گوت: لە فەوتان مەترسێن، لێرەدا لەم شوێنە ماڵێك بۆ خوا دروست دەکرێ، ئەم کوڕە (ئیسماعیل)و باوکی ئەو ماڵە بۆ خوا دروست دەکەن (کەعبە)و هەر کەسێك عایدی خوابێ و لە خوا نزیك بێ، خوا زایەی ناکات، دەڵێ: کاتی خۆی کەعبە شوێنەکەی بەرزایی بوو لە زەوی {وەك تەپۆلکەیەك بوو}، بەڵام وردە وردە لافاو هاتن، لەلای ڕاستو لەلای چەپیان برد، (واتە: تا دوایی بەم شێوەیە شوێنەکەی نزم بۆوە} .

ئنجا هاجەرو ئیسماعیلی کوڕی بەو شێوەیە مانەوە، تاکو جارێك کاروانێك لە هۆزی جورهوم، یاخود بنەماڵەیەك لە جورهوم بەلایاندا تێپەڕین، کە لە ڕێی (کداء)ەوە دەگەڕانەوە (ناوی شوێنێکی ئەو ناوچەیەیە)و لە خوار ئەو شوێنەی کە مەککەی لێ دروستکراوە، لەوێ مەنزڵگەیان خست، باڵندەیەکیان بینی بە ئاسمانێوە بوو، گوتیان: ئەو باڵندەیە لە ئاو دەگەڕێو بەپێی

شارەزایی ئێمە، ئەم شیوە هەرگیز ئاوی تێدا نەبووە، دەلیلێکیان، یاخود دوو کەسیان ناردن، کە بگەڕێنو بپشکنن: ئایا ئاوی لێ پەیدا بووە؟ تەماشایان کرد، بەڵێ، ئاوی لێ هەیە، دەلیلەکان گەڕانەوەو هەواڵیان پێدان، کە: بەڵێ ئەو شوێنە ئاوی لێیە، ئەوانیش هاتن بۆ سەر ئاوەکە .

دایکی ئیسماعیلیش لەسەر ئاوەکە بوو، پێیان گوت: ئایا مۆڵەتمان دەدەی، ئێمەش لێرە بارگەو بنە بخەینو، ئێرە بکەین بە نشینگەی خۆمان؟ (لەبەر ئەوەی کە ئاوەکە هی ئەو بووە)، گوتی: بەڵێ، بەڵام مافتان بە ئاوەکەوە نیە (واتە: ئەو مەرجەی لێ گرتن)، گوتیان: باشە (ڕازیین)، عەبدوڵلای کوڕی عەبباس دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کاتێک ئەوە بوو، کە دایکی ئیسماعیلیش خوای پوو کە هۆگرێكو ئاوەدانییەکی لە دەور پەیدا بێ، بۆخۆی بە تاقی تەنیا لەگەڵ ئەو منداڵە بووە، ئیدی لەوێ دابەزین (هۆزی جورهوم)، لەو شوێنە بارگەیان خست، دواتر بە دوای کەسوکاری خۆیاندا نارد، ئەوانیش هاتنو، ئەوێیان قەرەباڵغ کرد، هەتا وای لێهات چەند ماڵێك لەوێ کۆبوونەوە .

دواتر ئیسماعیل گەورە بوو (بوو بە گەنج)، زمانی عەرەبییش لەوانەوە فێر بوو، {ئەگەرنا ئیسماعیل دایکی قیبتیی بووە، بە زمانی خەڵکی میسری ئەو کاتە قسەی کردووەو باوکیشی ئیبراهیم عەرەب نەبووە، چونکە هەر بەپێی ڕێزمانی زمانی عەرەبیی، وشەی: (ئیبراهیمو ئیسماعیل) ناوی ئەعجەمیینو عەرەبیی نین}، ئەوانیش پێی سەرسام بوونو بە مرۆڤێکی باشیان هاتە بەرچاو، بۆیە کاتێک کە بالغ بوو (گەورە بوو)، ئافرەتێك لە خۆیانیان پێداو، هەر لەو سەرو حەددەدا، ماوەیەك دواتر دایکی ئیسماعیلیش وەفاتی کرد .

ئنجا دوای ئەوەی کە ئیسماعیل هاوسەرگیریی کرد، ئیبراهیم ﷺ هات بۆ ئەوەی سۆراغی ماڵو منداڵی بکاتو، بزانێ داخۆ چییان لێهاتوە؟ کە چوو بۆ ماڵی ئیسماعیلی کوڕی، ئیسماعیلی نەبینی {دیارە لە ماڵەکانی دیکەی پرسیوەو، ماڵی ئیسماعیلی بینیوەتەوە}، لە هاوسەرەکەی پرسی: ئیسماعیل لە کوێیە؟ هاوسەرەکەی گوتی: چۆتە دەرێ بۆ ڕاوو شکار، تاکو نێچیرێك، یاخود خۆراکێك شتێکمان بۆ بهێنێتەوە، ئیبراهیم دەربارەی ژیانو گوزەرانیان

لێی پرسی: وەزعتان چۆنەو بارودۆختان چۆنە؟ ئەویش گوتی: گوزەران‌و بارودۆخمان زۆر خراپەو، ئێمە لە تەنگ دەستیی‌و سەغڵەتیی داین، (سکاڵای خۆی لەلا کرد)، ئیبراهیم پێی گوت: ئەگەر هاوسەرەکەت هاتەوە، سەلامی پێ منی بگەیەنەو پێشی بڵێ: با شیپانەی (چوارچێوە)ی دەرگاکەی بگۆڕێ .

کاتێك ئیسماعیل هاتەوە، وەك بڵێی: بۆنێکی کرد، یاخود هەستیکرد کەسێك هاتبێ، گوتی: کەس هاتوە بۆ لاتان؟ خێزانەکەی گوتی: بەڵێ، پیاوێکی بەتەمەن هات، حاڵ‌و حیسابی ئاواو ئاوا بوو، لەبارەی تۆوە پرسیاری لێکردم، منیش هەواڵم پێدا، دەربارەی ژیان‌و گوزەرانمان پرسیاری کرد، هەواڵم پێدا، کە ئێمە لە تەنگ دەستیی‌و سەغڵەتیی داین، ئیسماعیل پێی گوت: ئایا هیچ ئامۆژگاریی نەکردی؟ هیچ پێشنیاری بۆ نەکردی؟ ئافرەتەکە گوتی: با، فەرمانی پێکردم کە سەلامت پێ بگەیەنم، گوتیشی: با شیپانەو چوارچێوەی دەرگاکەی بگۆڕێ! ئیسماعیل گوتی: ئەوە بابم بووەو فەرمانیشی پێکردووم کە لە تۆ جیاببمەوە، تۆ بچۆرەوە لای کەسوکارت‌و، ئیسماعیل دەستی لێ هەڵگرت (تەڵاقی دا) .

ئنجا ئافرەتێکی دیکەی لێهێنان، ماوەیەك ئیبراهیم عليه السلام نەچوو بۆ لایان، (ئەوەندەی کە خوا حەز بکات، ماوەیەکی پێ چوو)، دوایی جارێکی دیکە هاتەوە بۆ سەردانیان، دیسان ئیسماعیلی لەوێ نەبینی، چوو بوو بۆ ڕاوو شکار (ژیانیان لەسەر ڕاوو شکار بووە)، چوو بۆ لای هاوسەرەکەی‌و دەربارەی ئیسماعیل لێی پرسی، ئەویش {ئافرەتەکە} وەڵامی دایەوەو گوتی: چووە بژیوێکمان بۆ پەیدا بکات، ئیبراهیم عليه السلام دەربارەی حاڵ‌و گوزەرانیان پرسیاری لێکردو گوتی: حاڵ‌و بارودۆختان چۆنە؟ ئەویش گوتی: وەزعمان باشە، ژیان‌و گوزەرانمان لە فراوانیی‌و خۆشییدایەو سوپاس‌و ستایشی خوای کرد، گوتی: خواردنتان چییە؟ ئەویش گوتی: خواردنمان گۆشتە، ئیبراهیم عليه السلام گوتی: ئەی خواردنەوەتان چییە؟ ئەویش گوتی: خواردنەوەشمان ئاوە، ئیبراهیم عليه السلام گوتی: (أَللّهُمَّ بَارِك لَهُم فِي اللَّحْمِ وَالْمَاءِ)، خوایە! پیت‌و پێزیان بۆ بخە گۆشت‌و ئاوەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو کاتە دانەوێڵەیان نەبووە، ئەگەر دانەوێڵەیان هەبووایە، ئیبراهیم دوعای بۆ دانەوێڵەش بۆ دەکردن کە پیت‌و

بەرەکەتی بکەوێتێ، (ئنجا عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێ:) تەنیا لە مەککە خەڵك دەتوانێ بە گۆشتو ئاو بژی، بەڵام لە جگە لە مەککە، هیچ کەسێك بە تەنیا بە گۆشتو ئاو مەدار ناکات، {یانی: لەبەر بەرەکەتی دوعاکەی ئیبراهیم ﷺ، هەڵبەتە ژینگەکەش بۆ خۆی وایە} .

ئنجا ئیبراهیم بە هاوسەری ئیسماعیلی گوت: هەر کات هاوسەرت هاتەوە، سڵاوی پێ بگەیەنەو پێشی بڵێ: با شیپانەو چوارچێوەی دەرگاکەی بچەسپێنێ .

کاتێك ئیسماعیل هاتەوە گوتی: هیچ کەس هاتوە بۆ لاتان؟ هاوسەرەکەی گوتی: بەڵێ، پیاوێکی بەتەمەنی زۆر شکڵو شێوە جوان هاتو زۆر مەدحی کرد، (کە پیاوێکی ئەوەندە نوورانییو جوانو تاواو ناوا بوو)، دەربارەی تۆش پرسیاری لێکردم، منیش هەواڵم پێداو، دەربارەی ژیانو گوزەرانمان پرسیاری لێکردم، منیش هەواڵم پێدا کە ئێمە ژیانمان باشە، بارو گوزەرانمان خۆشە ئیسماعیل پێی گوت: هیچ ئامۆژگاریی نەکردی؟ (هیچ پێشنیاری بۆ نەکردی؟) ئەویش گوتی، بەڵێ، سڵاوی لێکردیو فەرمانیشی پێکردی کە شیپانەو چوارچێوەی دەرگاکەت بچەسپێنی، ئیسماعیل گوتی: ئەوە بابم بووە، تۆ چوارچێوەی دەرگاکەمی (شیپانە تەعبیرێکی ڕەمزییە بۆ ژن)، فەرمانی پێکردووم: تۆ بهێڵمەوە لە لای خۆم، دوای ماوەیەك ئیبراهیم نەچۆوە بۆ لایان، ئەوەندەی کە خوا حەز بکات (هەر بەین بەین، سەردانی کردوون)، دواتر جارێکی دیکە هاتەوە بۆ لایان، لەو کاتەدا ئیسماعیل تیری چاك دەکرد، {لقی درەختی بڕیوەو چاکی کردوە بۆ تیرو دواتر نووکێکی ئاسنی تێخستوە، تاکو بۆ ڕاوو شکار بەکاری بهێنێ}، ئیسماعیل لە ژێر درەختێك دا کە لە نزیك ئاوی زەمزەمەوە بوو، دانیشتبوو، کاتێك ئیسماعیل ئیبراهیمی بابی بینی، هەڵسا بۆی (بەرەو پێشوازیی چوو)و هەروەك باب لەگەڵ کوڕو کوڕ لەگەڵ باب چی دەکات، ئەوانیش ئاوایان کرد {ئیسماعیل دەستی بابی ماچ کردوەو ئیبراهیمیش ئەوی ماچ کردوەو، لە باوەشی گرتوە}، دواتر ئیبراهیم فەرمووی: ئەی ئیسماعیل! خوا فەرمانێکی پێ کردووم، ئیسماعیل گوتی: پەروەردگارت بەچی فەرمانی پێ کردووی، ئەنجامی بدە، ئیبراهیم فەرمووی: هاوکاریم دەکەی؟

گوتی: بەڵێ، هاوکارییت دەکەم، فەرمووی: خوا فەرمانی پێکردووم کە ئا لێرە ماڵێك دروست بکەم، ئاماژەی بۆ گردێك کرد کە بەرزتر بوو لە دەوروبەری خۆی، {پێشتر باسمان کرد کە ئەو شوێنەی کە کەعبەی لێ دروستکراوە، بەرزتر بووە، بەلام دواتر لافاوو لێزماو هاتوەو خوراندوویەتی، تاکو لەگەڵ زەوی دەوروبەریدا تەخت بووە} .

لەوێ ئیبراهیم ﷺ دەستی کرد بە دانانی بناغەی کەعبە (ماڵی خوا)، ئیبراهیم بینای دەکردو، ئیسماعیلیش بەردی بۆ دەهێنا، تاکو دیوارەکە بەرزبۆوە، لەو کاتەدا کە دیوار بەرزبۆوە، دەستی نەیدەگەیشتێ، ئیسماعیل بەردێکی بۆ هێنا کە ئیبراهیم لەسەری بوەستێ، {ئەو بەردەی ئێستا پێی دەڵێن: مەقامی ئیبراهیم، بەردێکی گەورەو بەرز بووە، بۆ ئەوە بووە کە ئیبراهیم بچێتە سەری، دەستی بگاتە دیوارە بەرزەکانو، ئیسماعیل بەردەکانی پێبدات}، ئنجا لەو کاتەدا کە ئیبراهیم بەیتی دروست دەکردو ئیسماعیلیش بەردی بۆ دەهێنا، هەردووکیان دەیانگوت :

﴿ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ ﴾ البقرة، واتە: پەروەردگارمان! لێمان وەربگرە بێگومان تۆ بیسەری زانای .

ئەمە باسی بەسەرهاتی نیشتەجێکردنی هاجەرو ئیسماعیلی کوڕی بوو، لە شوێنی ئێستای شاری مەککە.

__هەڵوێستی هەشتەم__ : ئامادەیی دەربڕینی ئیبراهیم بۆ سەربڕینی تاقە کوڕەکەی ئیسماعیل (عَلَيْهِمَا الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) :

کە ئەمە لە سوورەتی (الصافات) ئایەتەکانی: (٩٩ - ١١١)دا خوا ﷻ بە تەفصیل باسی کردوە، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ :

﴿ وَقَالَ إِنِّى ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّى سَيَهْدِينِ ﴿٩٩﴾ رَبِّ هَبْ لِى مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠٠﴾ فَبَشَّرْنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ ﴿١٠١﴾ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ قَالَ يَٰبُنَىَّ إِنِّىٓ أَرَىٰ فِى ٱلْمَنَامِ أَنِّىٓ أَذْبَحُكَ فَٱنظُرْ مَاذَا

تَرَىٰۚ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفۡعَلۡ مَا تُؤۡمَرُۖ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٠٢﴾ فَلَمَّآ أَسۡلَمَا وَتَلَّهُۥ
لِلۡجَبِينِ ﴿١٠٣﴾ وَنَٰدَيۡنَٰهُ أَن يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ ﴿١٠٤﴾ قَدۡ صَدَّقۡتَ ٱلرُّءۡيَآۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٠٥﴾
إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡبَلَٰٓؤُاْ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٠٦﴾ وَفَدَيۡنَٰهُ بِذِبۡحٍ عَظِيمٖ ﴿١٠٧﴾ وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿١٠٨﴾
سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ ﴿١٠٩﴾ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١١٠﴾ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١١١﴾ ﴾.

ئەم ئایەتە موبارەکانە باسی ئەو بەسەرهاتە دەکەن، کە ئیبراهیم ﵇ ئیسماعیلی کوڕی هێناوەتە سەر سەربڕین بە فەرمانی خوا، دوای ئەوەی کە خوا ﷻ لە خەونـدا ئەو فەرمانەی پێکردوە، دەفەرموێ :

(ئیبراهیم) گوتی: من بەرەو پەروەردگارم دەچم، ڕێنماییم دەکات، {واپێدەچێ ئەو کاتە بێ کە لە عێراقەوە کۆچی کردوە بۆ شام}، ئەی پەروەردگارم! لە صالحانم پێ ببەخشە (منداڵی صالحم پێ ببەخشە)، ئێمەش موژدەی کوڕێکی هێدیی و مەندمان پێدا، کاتێك ئەو کوڕەی لەگەڵیدا گەیشتە حاڵەتی وەرگێرکەیی کە هاوکاری بێ، پێی گوت: ئەی کوڕەکەم! من لە خەونمدا بینیم کە تۆم سەردەبڕی، ئنجا بزانە ڕات چییە؟ گوتی: ئەی بابە! ئەوەی کە فەرمانت پێکراوە ئەنجامی بدە، ئەگەر خوا بیەوێ لەخۆ ڕاگران دەبم، کاتێك کە ملکەچ بوون بۆ خواو لەپەوڕوو {یان لەسەر لاجاینگی} خستی (ڕووی پێ لە زەوی کرد، بۆئەوەی لە پشتە ملیەوە سەری ببڕێ)، لەو کاتەدا بانگمان کرد: ئەی ئیبراهیم! خەونەکەت ڕاست هێنایە دی، (ئەو فەرمانەی کە پێت کرا بوو، هێناتە سەر جێبەجێکردن)، ئێمە بەو شێوەیە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە، ئەوە تاقیکردنەوەیەکی ئاشکرا بووو ، ئێمە فەرموومان بۆ ئیسماعیل ڕەخساند لە سەربڕاوێکی مەزن، (مەبەست پێی بەرانێکی گەورە بووە) و، مەدحی ئیبراهیممان لە نێو خەڵکدا بڵاو کردوە : سڵاو لە ئیبراهیم، ئاوا پاداشتی بەندە چاکەکارەکان دەدەینەوە، بێگومان ئەو لە بەندە بڕوادارەکانی ئێمە بوو .

هەڵبەتە لێرەدا کە خوا ﷻ بەو شێوەیە مەدحی ئیبراهیم دەکات :

(لە بەندە بڕوادارەکانمان بوو، ئاوا پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە، ئیبراهیم خەونەکەی بە ڕاست دانا... هتد)، ئەو قسەو قاڵانەی هەندێك لە خەڵکی کە

لە ژێر کاریگەریی تەوژمی عەلمانییدان‌و، بە دوای هەندێ قسەو قاڵی بێجێ دەکەون، کە گوایە ئەوە سیناریۆ بووەو ئیبراهیم بە جیددیی نەبووە! هەر ڕواڵەتی ئایەتەکان تەماشا بکەی، ئەو قسەو قاڵانە بە درۆ دەخاتەوە، چونکە خوا ﷻ لەسەر نواندن سیناریۆ، ئەو [redacted] گەورانەی ئیبراهیم ﷺ ناکات !

پاشان ئەو مەدحە گەورەیەی خوای کاربەجێ کە ستایشی ئیسماعیل‌و ئیبراهیم دەکات، لەبەر ئەوە بووە کە عەزمیان جەزم بووە لەسەر ئەو کارە، بەڵام خوا ﷻ نەیویستوە ئیبراهیم، ئیسماعیلی کوڕی سەر ببڕێ، بەڵکو ویستوویەتی هەردووکیان تاقی بکاتەوە، ئایا ئیبراهیم ئامادەیە تاقە جگەرگۆشەکەی خۆی سەرببڕێ ؟ ئایا ئیسماعیلیش ئامادەیە کە بە قسەی بابی بکات ، ئەگەر سەربڕینیش بێ ؟ کە هەردووکیان لە تاقیکردنەوەکە دەرچوون، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْبَلَٰٓؤُا۟ ٱلْمُبِينُ ﴿١٠٦﴾ ﴾، ئنجا ئایا ئەوە کەی دەبێ بە تاقیکردنەوە، کە ئیبراهیم‌و ئیسماعیل هەر لە سەرەتاوە بزانن، ئەوە نواندنەو بەڕاستیی نیە؟ ئەو کاتە بە تاقیکردنەوە لە قەڵەم نادرێ .

## هەڵوێستی نۆیەم : بەرگرییکردنی ئیبراهیم لە لووط ﷺ لە کاتی سزادرانی گەلەکەیدا :

کاتێك خوا ﷻ فریشتەکان دەنێرێ بۆ سزادانی گەلی لووط، ئیبراهیم ﷺ بەرگریی لێ دەکات‌و، ئەو باسە لە قورئاندا، لە دوو جێگادا هاتوە :

١) لە ئایەتەکانی : (٧٤ – ٧٦)ی سوورەتی (هود)، کە خوا ﷻ دەفەرموێ :

﴿ فَلَمَّا ذَهَبَ عَنْ إِبْرَٰهِيمَ ٱلرَّوْعُ وَجَآءَتْهُ ٱلْبُشْرَىٰ يُجَٰدِلُنَا فِى قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٤﴾ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّٰهٌ مُّنِيبٌ ﴿٧٥﴾ يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَآ ۖ إِنَّهُۥ قَدْ جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَإِنَّهُمْ ءَاتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ ﴿٧٦﴾ ﴾.

واتە: دوای ئەوەی کە ئیبراهیم ترس‌و دڵە ڕاوکەکەی نەماو موژدەی بۆ هات (موژدەی ئەوە کە خوا ئیسحاقی پێ دەبەخشێ لە سارا خان‌و

ئیسحاقیش یەعقووبی دەبێ)، دەستیکرد بە مشتومڕ لەگەڵ کردنمان (لەگەڵ فریشتەکانمان) دەربارەی گەلی لووط، بێگومان ئیبراهیم زۆر هێمنیی‌و، زۆر بەپەرۆش‌و زۆریش گەڕاوە بوو بۆ لای خوا، بەڵام فریشتەکان پێیان گوت: ئەی ئیبراهیم! واز لەوە بێنە (بەرگرییان لێمەکە)، چونکە فەرمانی پەروەردگارت هاتوەو ئەوانە سزایەکیان بۆ دێ، کە ئەو سزایە ناگونجێ بەرپەرچ بدرێتەوە (ڕەت بکرێتەوە) .

٢)- لە هەردوو ئایەتی: (٣١و ٣٢)ی سووڕەتی (العنكبوت)دا، کە خوا ﷻ دەفەرمووێ : ﴿ وَلَمَّا جَآءَتْ رُسُلُنَآ إِبْرَٰهِيمَ بِٱلْبُشْرَىٰ قَالُوٓاْ إِنَّا مُهْلِكُوٓاْ أَهْلِ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ۖ إِنَّ أَهْلَهَا كَانُواْ ظَٰلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطًا ۚ قَالُواْ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَن فِيهَا ۖ لَنُنَجِّيَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾

واتە: کاتێك کە فریشتەکانمان هاتنە لای ئیبراهیم بە مژدەوە، (مەبەست پێی مژدە پێدرانیەتی بەوە ، کە ئیسحاقی دەبێ‌و پاش ئەویش یەعقووب)، فریشتەکان پێیان گوت : ئێمە خەڵکی ئەم شارە (ئاوەدانییە) لەبەین دەبەین، چونکە خەڵکەکە ستەمکار بوو (خراپەکاریی‌و ستەمکارییان کردوە)، ئیبراهیم گوتی: ئاخر لەم شارەدا (لووط)یش هەیە، گوتیان: ئێمە زاناترین بەوەی کە تێیدا هەیە، خۆی‌و ماڵ‌و خێزانەکەی دەرباز دەکەین، جگە لە ژنەکەی، ئەو دەبێ لە فەوتاوان بێ .

(ژنەکەیشی بڕیاری فەوتانی بۆ دراوە، لەبەر ئەوەی لە هەموو شتێکدا لەگەڵ گەلە خراپەکەی (لووط)دا بووەو ، لەگەڵ (لووط)دا ﷺ نەبووە) .

<u>هەڵوێستی دەیەم</u> : داواکردنی ئیبراهیم لە خوا کە چۆنیەتی زیندووکردنەوەی مردووانی پێشان بدات :

ئەمیش لە ئایەتی (٢٦٠)ی سووڕەتی (البقرة)دا هاتوە کە خوا ﷻ دەفەرمووێ :

﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِى كَيْفَ تُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن ۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن

لِيَطْمَئِنَّ قَلْبِي ۖ قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ الطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ اجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ادْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا ۚ وَاعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦٠﴾ ﴾.

واتە: یاد بکەوە! کاتێك ئیبراهیم گوتی: پەروەردگارم! پێشانم بدە چۆن مردووان زیندوو دەکەیەوە! فەرمووی: ئایا بڕوات نیە، گوتی: با، بەلام بۆ ئەوەی دڵم ئارام بگرێ، (واتە: دوای ئەوەی بە (عِلمُ الیَقین) بڕوام هەیە، با بە (عَینُ الیَقین) چاوی دڵنیایش بڕوام هەبێ، بۆ ئەوەی ئیمانەکەم پتەوتر بێت)، (خوا) فەرمووی: چوار باڵندان بگرە، بەلای خۆت دا ڕایانبکێشە (وایان لێ بکە لێت بێنە پێش)، دوایی سەریان ببڕەو هەر پارچەی لەسەر کێوێك دابنێ، دوایی بانگیان بکە، بە ڕاکردن دێن بۆ لاتو، بزانە کە خوا زاڵی کارزانە .

## هەڵوێستی یازدەیەم : بنیاتنانی کەعبە لەگەڵ ئیسماعیلی کوڕیدا :

ئەوەش لە سووڕەتی (البقرة) لە ئایەتەکانی: (١٢٧ – ١٢٩)دا هاتوە، خوا ﷻ دەفەرمویّ: ﴿ وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا ۖ إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ رَبَّنَا وَاجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَا أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَا ۖ إِنَّكَ أَنتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴿١٢٨﴾ ﴾.

واتە: یاد بکەوە! کاتێك کە ئیبراهیم دیوارەکانی ماڵی خوای بەرز دەکردنەوە لەگەڵ ئیسماعیلدا، لە پەروەردگاریان پاڕانەوە: پەروەردگارمان! لێمان وەربگرە، بێگومان تۆ بیسەری زانای، پەروەردگارمان! وامان لێبکە کە ملکەچ بین بۆ تۆو، لە وەچەی ئێمەش گۆمەڵێك (بەرەخسێنە) ملکەچ بن بۆ تۆو، خواپەرستییەکانی خۆمانمان پێشان بدەو، لێمان ببوورەو تۆبەکانمان قبووڵ بکە، بێگومان تۆ زۆر تەوبە قبووڵکەری میهرەبانی .

دەربارەی بنیاتنانی کەعبە (المَسْجِدُ الحَرَام)یش، لەگەڵ (المَسْجِدُ الأقْصَى)دا، ئەم فەرموودەیە هەیە :

{عَنْ أبي ذَرٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قُلْتُ: يا رَسولَ اللهِ! أيُّ مَسْجِدٍ وُضِعَ فِي الأرْضِ أوَّلُ؟ قَالَ: المَسْجِدُ الحَرَامُ، قَالَ: قُلْتُ: ثُمَّ أيٌّ؟ قَالَ: ثُمَّ المَسْجِدُ الأقْصَى، قَالَ: قُلْتُ: كَمْ بَيْنَهُمَا ؟ قَالَ: أرْبَعُونَ سَنَةً ، وَأيْنَمَا أدْرَكَتْكَ الصَّلاةُ فَصَلِّ فَإنَّهُ مَسْجِدٌ} {أخرَجَهُ عَبْدُ الرزاق برقم: ١٥٧٨، وَأحْمَد: ٢١٥٠٦، وَالبُخَارِيُّ: ٣١٨٦، وَمُسْلِمٌ: ٥٢٠، وَالنَّسائي في الكُبْرَى: ٧٦٩، وَابن ماجَةُ: ٧٥٣}.

واتە: ئەبو زەڕ خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ : گوتم : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! چ مزگەوتێك پێشتر لەسەر زەوی بنیات نرا ؟ فەرمووی : مزگەوتی حەرام، گوتم: ئەدی دوای ئەو کامە بوو؟ فەرمووی : مزگەوتی ئەقصا (ئەو مزگەوتەی کە لە قودسە لە فەڵەستین)، گوتم : چەندیان ماوە لە بەینیدا هەبوو؟ فەرمووی: چل (٤٠) ساڵ لە هەر جێیەکیش کاتی نوێژت لێ داهات، نوێژ بکە، ئەو شوێنە نوێژگەیە .

کەواتە: مزگەوتی ئەقصا چل (٤٠) ساڵ لە دوای مزگەوتی حەرامەوە بنیات نراوە، بەلام لێرە لەم فەرموودەیەدا، ئاماژەی بەوە نەکردوە، کە ئایا مزگەوتی ئەقصاش ئیبراهیم ﷺ بنیاتی ناوە، یان لەلایەن ئیسحاقی کوڕیەوە دروست کراوە ؟!

<u>هەڵوێستەی دوازدەیەم</u> : داوای لێبوردنکردنی ئیبراهیم لە خوا بۆ بابیو، پاشان حاشا لێکردنی، پاش ئەوەی بۆی دەرکەوت، کە ئازەری بابی دوژمنی خوایە :

ئەمەش لە چەند شوێنێکی قورئان دا ئاماژەی پێکراوە :

١/ لە سووڕەتی (الشعراء) ئایەتی (٨٦)دا، کە دەفەرموێ : ﴿ وَٱغْفِرْ لِأَبِيٓ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٨٦﴾ ﴾، ئیبراهیم دەفەرموێ : (پەروەردگارم!) لە بابم ببوورە چونکە لە گومڕایانە .

٢/ لە سوورەتی (مریم) لە هەردوو ئایەتی : (٤٦و ٤٧)دا، کە دەفەرمووێ : ﴿ قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنْ ءَالِهَتِى يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ وَٱهْجُرْنِى مَلِيًّا ﴿٤٦﴾ قَالَ سَلَٰمٌ عَلَيْكَ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّىٓ إِنَّهُۥ كَانَ بِى حَفِيًّا ﴿٤٧﴾ ﴾، واتە: بابی ئیبراهیم بە ئیبراهیمی گوت: ئەی ئیبراهیم! ئایا تۆ مەیلت بۆ پەرستراوەکانی من نیە، (پشتیان تێ دەکەی)؟ ئەگەر دەست هەڵنەگری لەو ئایینەی کە هێناوتە، بەرد بارانت دەکەمو برۆ زۆر لێم دوور بکەوەوە، ئەویش فەرمووی: سڵاوت لێبێ، داوای لێبوردنت بۆ لە پەروەردگارم دەکەم، بێگومان پەروەردگارم لەگەڵ من زۆر بەمشوورو بە بەزەیی‌و بە لوتفە .

ئیبراهیم ئەو بەڵێنەی پێداو بەڵێنی خۆشی بردە سەرو پاڕانەوەی بۆ کرد، بەڵام هەر تاکو ئەو کاتە ئیبراهیم ﷺ لەسەر ئەوە بەردەوام بوو، کە بۆی دەرکەوت بابی دوژمنی خوایەو لێی نائومێد بوو .

٣/ هەروەها خوا لە ئایەتی (١١٤)ی سوورەتی (التوبة)دا، دەفەرمووێ : ﴿ وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٌ ﴿١١٤﴾ ﴾، واتە: داوای لێبوردنکردنی ئیبراهیم بۆ بابی، هەر بەهۆی بەڵێنێکەوە بوو، کە پێشتر پێی دابوو، بەڵام دوای ئەوەی کە بۆی دەرکەوت دوژمنی خوایە، دووریی لێکرد (حاشای لێکرد)، بێگومان ئیبراهیم زۆر بە پەرۆش‌و بە بەزەیی‌و دڵنەرم بووو، زۆر هێدیی‌و مەند بوو .

## برگەی شەشەم و کۆتایی: پلەو پایەو پێگەی ئیبراهیم ﷺ:

دەتوانین دەربارەی پلەو پایەی بەرزو ناوازەی ئیبراهیم ﷺ، زۆر شتان باس بکەین، چونکە بەڕاستیی ئیبراهیم ﷺ پێگەیەکی بەرزو پلەو پایەیەکی زۆر ناوازەی هەبووە، زۆر لە زانایان دەڵێن: جگە لە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ ئیبراهیم پلەو پایەی لە هی هەموو پێغەمبەرانی دیکە بەرزترەو، هەرواش دێتە بەرچاو، بە تایبەت کە لە شەورۆو بەرزبوونەوە (الإسراء والمعراج)دا کە پێغەمبەر ﷺ سەرەتا سەفەری فەلەستین و (بیت المقدس)و مزگەوتی (أقصى) دەکات، دواتر بەرزدەبێتەوە بە ئاسمانەکاندا، ئیبراهیم ﷺ لە ئاسمانی حەوتەم دەبینێ، کە بەرزترین ئاسمانە.

ئێمە لە یازدە (١١) خاڵدا، باسی پێگەو پلەو پایەی بەرزو ناوازەی ئیبراهیم ﷺ دەکەین :

### ١) ئیبراهیم (خلیلُ الله) یە :

وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (النساء) دەفەرموێ: ﴿وَاتَّخَذَ اللَّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلًا ﴿١٢٥﴾﴾، واتە: خوا ئیبراهیمی کردە خەلیل، واتە: کردی بە دۆست و خۆشەویستی تایبەتیی خۆی، (خلیل): بریتیە لە کەسێك کە ئەوپەڕی خۆشویستنت بۆی هەبێ و، ئەوپەڕی هۆگرییت بۆی هەبێ .

کەواتە: خوا ﷻ ئیبراهیمی بەو پلەو پایە گەیاندووە کە ئەوپەڕی خۆشەویستیی بۆی هەبێ و دۆستایەتیی تایبەتیی لەگەڵیدا هەبێت، هەڵبەتە ئیبراهیم بۆ خوا ﷻ وا بووە، خوای پەروەردگاریش هەر کەسێك لە بەندەکانی چەندە خوای خۆشبوێ، چەندە خوای لەلا گەورەو بەرزو بەرێز بێ، خواش ﷻ لە بەرانبەردا، هەر بەو شێوەیە، مامەڵە لەگەڵ ئەو بەندەیەی خۆی دا دەکات .

ئنجا لە قورئاندا نەهاتوە: خوا ﷻ جگە لە ئیبراهیم، یەکی دیکە لە پێغەمبەرانی خۆی کردبێ بە دۆست و زۆر خۆشەویستی تایبەتیی خۆی، بێگومان

خوا هەموو پێغەمبەرانی خۆشویستوون، بەڵام پلەی (خُلَّة) تەنیا بۆ ئیبراهیم باسکراوە، هەروەك چۆن پلەی دواندن (تَكْلِيم) تەنیا بۆ مووسا ﷺ باسکراوە:
﴿ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ﴿١٦٤﴾ ﴾ النساء، واتە: خوا فەرمایشتی لەگەڵ مووسادا کرد، بە فەرمایشتکردن .

هەروەها هەر کام لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) تایبەتمەندییەکی خۆی هەیە، بەڵام لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە، کە پێغەمبەری خاتەمیش (محمد ﷺ) پلەی (خُلَّة)ی هەبووە، ئەویش هەر (خَلِيلُ الله) بووە، وەك ئیبراهیمی باپیرە گەورەی .

لەبارەی ئەوەوە کە پلەو پێگەی (خُلَّة)، وێڕای ئیبراهیم ﷺ، پێغەمبەری خاتەمیش ﷺ ئەو پلەو پایەی هەبووە، لەو بارەوە دوو فەرموودە دەهێنین:

<u>فەرموودەی یەکەم</u> : پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ : { إِنَّ اللهَ تَعَالَى قَدِ اتَّخَذَنِي خَلِيلاً كَمَا اتَّخَذَ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلاً } { أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ١٢١٦، وَابْن حِبَّان: ٦٤٢٥، قَالَ شُعَيْب الأَرْنَؤُوط: حَدِيثٌ صَحِيحٌ } .

واتە: بێگومان خوای بەرز منی کردوە بە خەلیلی خۆی (واتە: دۆستو نیزیکی خۆی) وەك چۆن ئیبراهیمیشی کردوە بە دۆستو نیزیکی خۆی .

<u>فەرموودەی دووەم</u>: پێغەمبەر دەفەرموێ: { لَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ خَلِيلاً لاَتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ خَلِيلاً، إِنَّ صَاحِبَكُمْ خَلِيلُ اللهِ } { أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٦٣٢٦، وَأَبِي يَعْلَى: ٥١٤٩، وغيرهما } .

واتە: ئەگەر لە خەڵکی سەر زەوی خەلیلێکم گرتبایە، (یانی: دۆستو خۆشەویستێکی هەرە نزیك)، ئەبووبەکرم دەکردە خەلیلی خۆم، بەڵام هاوەڵی ئێوە (واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆخۆی) هاوەڵو دۆستو نزیکی هەرە خۆشەویستی خوایە .

**٢) هەر کەسێك شوێن ئیبراهیم و ڕێبازەکەی بکەوێت، باشترین دینداری دەبێ !**

وەك لە سوورەتی (النساء)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَاتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۗ وَاتَّخَذَ اللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا ﴿١٢٥﴾ ﴾.

واتە: دینداریی کێ لە هی کەسێك باشترە کە رووی خۆی بە خوا سپاردووەو چاکەکاریشە؟ (واتە: خۆی بۆ خوا ساغ کردۆتەوەو چاکەکاریشە لە خوا پەرستییەکەیدا، یان بۆ خوا ساغ و یەکلایەو، لەگەڵ بەندەکانی خواشدا چاکەکارە)، بە دوای ڕێبازی ئیبراهیمیش کەوتوە بە ساغیی و پاکیی و چاکیی، خواش ئیبراهیمی بە دۆستی خۆی گرتوە.

ئنجا کە خوا ﷻ دەفەرموێ: دینداریی کێ لە هی کەسێك چاکترە کە رووی خۆی بە خوا سپاردووەو، چاکەکارەو، بە دوای ڕێبازی ئیبراهیم کەوتوە بە ساغیی ؟

کەواتە: شوێنکەوتنی ڕێبازی ئیبراهیم ﷺ وا لە مرۆڤ دەکات، باشترین دینداریی و بەندایەتیی بۆ خوا هەبێ، دیارە ئیبراهیمیش باشترین دینداریی و ملکەچیی بۆ خوا هەبووە، هەر بۆیەش خوا ﷻ کردوویەتی بە دۆستی هەرە نزیك و خۆشەویستی خۆی .

**٣) ئیبراهیم ﷺ هەر ئەرکێکی پێی سپێردراوە، بە تەواویی ئەنجامی داوە :**

وەك لە سوورەتی (البقرة)دا خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ وَإِذِ ابْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٍ فَأَتَمَّهُنَّ ۖ قَالَ إِنِّى جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِى ۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِى الظَّٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾ ﴾.

واتە: یاد بکەوە کاتێك پەروەردگاری ئیبراهیم، ئیبراهیمی بە چەند وشەیەك تاقیکردەوەو تەواوی کردن، خوا فەرمووی: من دەتگێرم بە پێشەوا بۆ خەڵك،

(ئیبراهیم) گوتی : ئەدی لە وەچەکەم؟ خوا فەرمووی: ستەمکاران پەیمانی من نایانگرێتەوە .

جێی سەرنج ئەوەیە کە هەندێك لە توێژەرەوان، لە بارەی ماناو مەبەستەکانی قورئانەوە، وەك لە تەفسیری سوورەتی (البقرة)شدا، کە بەرگی یەکەمی ئەم تەفسیرەیە، باسمان کرد، مانەیەکی زۆر ڕواڵەتیی‌و ڕووکەشییان لەم ئایەتە موبارەکە گرتوە، گوتوویانە :

خوا ﷻ چەند وشەیەکی فێری ئیبراهیم کردوون، کە دەبوو دووبارەیان بکاتەوە، ئەویش ئەو وشانەی لەبەرکردوون‌و، دووبارەی کردوونەوە وەك زیکرو ویرد، ئەوانیش: (سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ للهِ، وَلاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ)!! بەلام بەڕاستیی ئەوە مانا لێکدانەوەیەکی زۆر سادەو ڕووکەشییەو، هەموو کەس دەتوانێ ئەو وشانە بکات بە ویردو چەندان جار دووبارەیان بکاتەوە، هەرچەندە نێوەڕۆك بەخشین بەو وشانە لە ژیانداو، بەرجەستەکردنی ماناو چەمکی ئەو وشانە زۆر گەورەیەو بە تەواوترین شێوە، تەنیا بە پێغەمبەران کراوەو دەکرێ، بەلام هەرچۆنێك بێ، لێرەدا مەبەست ئەوە نیە، کە خوا چەند وشەیەکی فێری ئیبراهیم کردبن‌و، ئەویش تەواوی کردبن، بەڵکو: ﴿وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَـٰتٍ فَأَتَمَّهُنَّ ۖ قَالَ إِنِّى جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِى ۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾﴾ البقرة، واتە: پەروەردگاری ئیبراهیم، ئیبراهیمی تاقیکردەوە بە چەند فەرمان‌و ئەرکێك‌و، ئەویش ئەرکەکانی هەموو تەواوکردن :

١ - ئەرکی سەرەکیی ئەوە بووە کە لە گژ هەموو ئەوانە ڕابچێت‌و بە گژیاندا بێتەوەو، بەرەنگاریان بێتەوە کە غەیری خوایان دەپەرست، هەر لە مانگ‌و خۆر پەرستان‌و دارو بەردو بت پەرستانەوە، تاکو ئەوانەی حوکمڕان‌و زۆردارانیان پەرستوە، وەك نەمروود، بەگژ هەموو ئەوانەدا چۆتەوە، ئەوەش ئەرکێکی زۆر گەورە بووە، کە خوا بە ئیبراهیمی سپاردوە، کە لە ڕۆژگاری خۆیدا بە گژ هەموو ئەوانەدا چۆتەوە، کە جگە لە خوایان پەرستوەو هاوبەشیان بۆ خوا داناوە .

٢- ئیبراهیم ﷺ وەك كوردەواریی خۆمان دەڵێن: لە پێناوی خوادا (باری هەر لەسەر پشتی کەرێ بووە)، لە ئووری كلدانییەكانەوە كۆچ دەكات، دوای ئەوەی لە بابی و لە گەلەكەی تووڕە دەبێ و، زویر دەبێ لەسەر خوا، دوای ئەوەی دەیخەنە نێو ئاگری سوورەوەو ناسووتێ و خوا دەفریای دێ، لەوێوە كۆچ دەكات بۆ شام، دەچێ بۆ حەڕڕان، دوایی لەوێ كۆچ دەكات هەر لە چوارچێوەی شامدا، بەڵام بۆ فەلەستین، بە پێی پەیمانی كۆن دەڵێ، بۆ (بِئْرُ السَّبع)، ئنجا دوای ئەوەی گرانیی و قات و قڕیی، ڕوو لە وڵاتی شام دەكات، وەك لە پەیمانی كۆندا هاتوە، كۆچ دەكات بۆ میسر، دوایی دێتەوە بۆ شام .

ئنجا دوای ئەوە بەشێك لە ماڵ و منداڵەكەی كە هاجەرو ئیسماعیلی كوڕی بوون، دەیانبات لە شیوێكی بێ دەرامەت بێ كشتوكاڵی بێ ئاوەدانیی دا، نیشتەجێیان دەكات بە فەرمانی خوا، بۆ ئەوەی لەو شوێنە كەعبە دروست بكات .

٣- یەكێكی دی لە ئەركەكانی: دوای ئەوەی ئیبراهیم ﷺ دەكەوێتە تەمەنەوەو، یەك تاقە جگەرگۆشەی پەیدا دەبێ، كە ئیسماعیلە لە هاجەری خێزانی، كە قیبتیی بووەو میسریی بووە، خوا فەرمانی پێدەكات: دەبێ سەری ببڕێ، چەند فەرمان و ئەركێكی قورس و گران بووە ! هەم بۆ ئیبراهیم، هەم بۆ ئیسماعیل، هەم بۆ هاجەر، خوا لە هاجەر ڕازی بێت و، صەڵات و سەلامی خواش لە ئیبراهیم و ئیسماعیل بێ .

هەروەها هەموو ئەو ئەركانەی خوا بە ئیبراهیمی ﷺ سپاردوون، دوای ئەوەی كە كەعبە دروست دەكات، هەموو ئەركەكانی بە تەواویی ئەنجامداوە ئەوە مەبەستی ئەو ئایەتەیە .

ئنجا لە سوورەتی (النجم)یشدا، خوا ﷻ دەربارەی ئیبراهیم دەفەرموێ: ﴿ وَإِبْرَٰهِيمَ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ ﴿٣٧﴾ ﴾، واتە: ئەو ئیبراهیمەی كە بە تەواویی ئەركەكانی ئەنجامدا، بە تەواویی هەرچی خوا پێی سپاردبوو، جێبەجێی كرد.

كەواتە ، لێرەشدا كە دەفەرموێ : پەروەردگار ئیبراهیمی بە چەند وشەیەك تاقیكردەوەو، ئەویش تەواوی كردن، واتە: بە چەند فەرمانێك و بە چەند ئەركێك، كە بێژەی: (كَلِمَة) بە ئەرك لێكدەدرێتەوە، چونكە ئەو ئەركەش بە وشەی بەرزو پیرۆزی خوا ﷻ ئاراستەی مرۆڤ دەكرێ .

**٤) ئیبراهیم بە تەنها بۆخۆی ئوممەتێك بووە :**

وەك لە سوورەتی (النحل) دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٠﴾ شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ ٱجْتَبَٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٢١﴾ وَءَاتَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٢٢﴾ ﴾.

واتە: بێگومان ئیبراهیم ئوممەتێك (گۆمەڵێك) بوو، ملكەچ بوو بۆ خوا، خۆی ساغ كردبۆوە بۆ خواو لە هاوبەشدانەران نەبووە، سوپاسگوزار بوو بۆ چاكەكانی خواو خوا هەڵیبژارد، بەرەو ڕاستە شەقامی خۆی ڕێنمایی كرد (خستیە سەر ڕاستە شەقامی خۆی)، ئێمەش لە دنیادا چاكەمان پێی بەخشیو لە دواڕۆژیشدا ئەو لە بەندە چاكەكانە .

كەواتە: ئیبراهیم بۆخۆی بە تەنیا ئوممەتێك بووە، واتە: هەموو ئەو سیفەتو ئاكارە بەرزو پەسندانەی، كە ئوممەتێك لەخۆیدا بەرجەستەیان دەكات، ئیبراهیم هەموو ئەوانەی بەتەنها لەخۆیدا بەرجەستە كردبوون .

وشەی (أُمّة) وێڕای ئەوەی كە بە مانای گۆمەڵێك خەڵكو كۆمەڵگایەك دێ، بە مانای ڕێبازێك دێ، بە مانای كەسێكیش دێ كە سەرمەشقەو، ڕێبازێك لەخۆیدا بەرجەستە دەكات[1].

**٥) پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ فەرمانی پێكراوە، كە شوێن ڕێبازی ئیبراهیم ﷺ بكەوێ :**

وەك لە سوورەتی (النحل)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ أَنِ ٱتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٣﴾ ﴾.

واتە: دوایی سروشمان بۆ تۆ كرد (ئەی موحەممەد ﷺ) كە بە دوای ڕێبازی ئیبراهیم بكەوە، بە ساغیی، ئیبراهیم لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نەبوو، (بەڵكو تەنیا خواپەرست بووو خوا بەیەكگر بوو) .

---

١) مفردات ألفاظ القرآن، ص٣١ -٣٣، المطبعة العصرية/ ٢٠١٢م .

هەروەها لە سوورەتی (الأنعام) خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ قُلْ إِنَّنِي هَدَانِي رَبِّي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا ۚ وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿١٦١﴾ ﴾.

خوا بە پێغەمبەری خاتەم دەفەرموێ : تۆ بڵێ: من پەروەردگارم خستوومیە سەر شەقامێك، بەرنامەیەکی ڕێكو ڕاستە، ڕێبازی ئیبراهیمەو، ئەو لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نەبوو .

٦) <u>خوا لە زۆر شوێنی قورئاندا، مەدحی ئیبراهیمی کردوەو سیفەتی بەرزو پەسندو گەورەی لە ئیبراهیمدا خستونە ڕوو :</u>

بۆ وێنە :

أ/ لە سوورەتی (هود)دا خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّاهٌ مُّنِيبٌ ﴿٧٥﴾ ﴾.

واتە: بێگومان ئیبراهیم زۆر هێدیی‌و مەند بوو، زۆر بە ڕەحم‌و بەزەیی‌و بە پەرۆش بوو، زۆریش لە ناخەوە بۆ لای خوا گەڕاوە بوو .

ب/ لە سوورەتی (النجم)دا، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَإِبْرَاهِيمَ الَّذِي وَفَّىٰ ﴿٣٧﴾ ﴾.

واتە: ئیبراهیم ئەو کەسەی کە بە تەواویی ئەرکەکانی سەرشانی خۆی‌و، بەندایەتیی بۆ خوا ئەنجامداوە .

ج/ لە سوورەتی (آل عمران)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ مَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿٦٧﴾ ﴾.

واتە: ئیبراهیم نە جوولەکە بوو، نە نەصرانیی بوو، بەڵکو مسوڵمانێکی ڕاستو ساغ بوو (حَنیف: ئەوەیە کە وازی لە ڕێی چەوتو لە کاری ناڕەوا هێنابی‌و، هاتبێتەوە بۆ ڕاستە شەقام‌و، بۆ ئەو ئاکارو سیفەتە بەرزو پەسندانەی کە ڕاستە شەقامی خوا فەرمانیان پێدەکات)، هەروەها ئیبراهیم لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نەبوو .

ئنجا خوا ﷻ کە ئەوەندە ئەو ڕاستییە دووبارە دەکاتەوە، لەبەر ئەوەیە کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ و، ئێستاش لەگەڵ دابیّ و، جوولەکەو صابیئەو نەصرانییەکانیش ئیددیعای ئەوە دەکەن و، لافی ئەوە لێدەدەن کە شوێنکەوتووی ئیبراهیمن، بۆیە هەمیشە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئیبراهیم مسوڵمانێکی حەنیف بووەو هاوبەش بۆ خوا دانەر نەبووە .

کەواتە: ئەوانەی کە هاوبەش بۆ خوا دادەنێن، چ جوولەکەو صابیئەو نەصرانیی، چ بت پەرستەکان، ناتوانن لافی ئەوە لێبدەن، کە شوێنکەوتووی ئیبراهیمن ﷺ، لەبەر ئەوەی ئیبراهیم خواپەرستێکی پاك و چاك بووەو ئیبراهیم تەنها بەندایەتیی بۆ خوا کردووەو، خوا بەیەکگرێکی ڕاست و تەواو بووە .

## ٧) پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ مەدحێکی گەورەی ئیبراهیمی کردوە :

وەك فەرموویەتی : {يُحْشَرُ النـاسُ عُـراةً حُفَـاةً غُـرلاً، فَأَوَّلُ مـنْ يُكْسَـى إبْـرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلام، ثُمَّ قرَأ: ﴿كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ﴿١٠٤﴾﴾الأنبياء} {أخرجه أحمد برقم : (٢٠٢٧) تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين} .

واتە: خەڵك لە ڕۆژی دواییدا کۆدەکرێنەوە بە ڕووتیی و، پێخواسیی و، بە خەتەنە نەکراویی، (واتە: خوا چۆنی دروستکردوون ئاوا)، یەکەمین کەسێك کە پۆشتە دەکرێ، ئیبراهیمە، دوایی پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ﴿١٠٤﴾﴾.

واتە: وەك چۆن یەکەمجار دروستکراوەکانمان وەدیهێناون، ئاواش دروستیان دەکەینەوەو دەیانگێڕینەوە .

واتە: خوا مرۆڤی چۆن دروستکردوە، ئاوا بەو شێوەیە دروست دەبێتەوە، هەر بۆیە ڕووتیش و پێخواسیش و خەتەنە نەکراویش دەبیّ و، یەکەم کەس کە پۆشتە دەکرێت، ئیبراهیمە ﷺ، ئەوەش بەڵگەو نیشانەیەکی دیکەیە بۆ پلەو پایەی بەرزی ئیبراهیم ﷺ .

٨) **ئیبراهیم شێوەی پێغەمبەری خاتەمی هەبووە :**

واتە: پێغەمبەری خۆمان ﷺ لەگەڵ ئیبراهیمدا شکڵو شێوەو دیمەنیان وەك یەك بووە، لە فەرمایشتێکدا پێغەمبەر ﷺ باسی ژمارەیەك لە پێغەمبەران دەکات، دەربارەی شکڵو شێوەو دیمەنو جەستەیان، کە چۆن بووە، دوایی دەفەرموێ : {أما إبراهيمُ فانظُروا إلى صاحِبِكُم} {أخرجَهُ أحمَد برقم: (٢٥٠١)، وَالبُخاريُّ برقم: (٣١٧٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٦٦)} .

واتە: دەربارەی شێوەو شکڵی ئیبراهیم دەڵێ : تەماشای هاوەڵەکەتان بکەن، واتە: تەماشای من بکەن، من کە هاوەڵتانمو برادەرتانم، چۆنم! ئیبراهیمیش شکڵو دیمەنو شێوەو قەدو قیافەی بەو شێوەیە بووە .

٩) **ئیبراهیم (صُحُف)ی پێدراوەو، ئەو کتێبەی کە بە ئیبراهیم دراوە ناوی (صُحُف) بووە :**

وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الأعلى)دا دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَفِي الصُّحُفِ الْأُولَىٰ ﴿١٨﴾ صُحُفِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ ﴿١٩﴾ ﴾.

واتە: ئەو {ڕاستییانەی کە لە سوورەتی (الأعلى)دا باسکراون} ئەمە لە لاپەڕە یەکەمەکانو، لە کتێبە پێشووەکاندایە، لە پەڕاوی ئیبراهیمو مووسا.

واش پێدەچێ مەبەست لە (صُحُف)ی مووسا تەوراتو، (صُحُف)ی ئیبراهیمیش، پەڕاوو کتێبێك بووە، بەرنامەیەك بووە کە ئیبراهیم عليه السلام پێدراوە .

# ئایا ئێوە رۆكی (صُحُف)ی ئیبراهیم، چۆن بووەو چی تێدا بووە؟

لەوبارەوە ئەم دەقە دێنین، کە (إبن حبان) لە صەحیحی خۆیدا هێناویەتیو حاکمیش بە صەحیحی داناوە : {عَنْ أَبي ذَرٍّ عَنِ النَّبي ﷺ قالَ: وَأُنْزِلَ عَلى إبْرَاهِيمَ عَشْرُ صَحَائِفَ قُلْتُ: يا رَسولَ اللهِ! ما كانَتْ صَحِيفَةُ إبْراهِيمَ؟ قالَ: كانَتْ أَمْثالاً كُلُّها: أَيُّها الْمَلِكُ الْمُسَلَّطُ الْمُبْتَلى الْمَغْرُورُ، إنّي لَمْ أَبْعَثْكَ لِتَجْمَعَ الدُّنْيا بَعْضَها عَلى بَعْضٍ، وَلكِنّي بَعَثْتُكَ لِتَرُدَّ عَنّي دَعْوَةَ الْمَظْلُوم، فَإنّي لا أَرُدُّها وَلَوْ كانَتْ مِنْ كافِرٍ، وَعَلى الْعاقِلِ ما لَمْ يَكُنْ مَغْلُوباً عَلى عَقْلِهِ، أَنْ تَكُونَ لَهُ ساعاتٌ: ساعَةٌ يُناجي فِيها رَبَّهُ، وَساعَةٌ يُحاسِبُ فِيها نَفْسَهُ، وَساعَةٌ يَتَفَكَّرُ فِيها في صُنْعِ اللهِ، وَساعَةٌ يَخْلُو فِيها لِحاجَتِهِ مِنَ الْمَطْعَمِ وَالْمَشْرَبِ، وَعَلى الْعاقِلِ أَنْ لا يَكُونَ ظَاعِناً إلاّ لِثَلاثٍ: تَزَوُّدٍ لِمَعادٍ، أَوْ مَرَمَّةٍ لِمَعاشٍ، أَوْ لَذَّةٍ في غَيْرِ مُحَرَّمٍ، وَعَلى الْعاقِلِ أَنْ يَكُونَ بَصِيراً بِزَمانِهِ، مُقْبِلاً عَلى شَأْنِهِ، حافِظاً لِلِسانِهِ، وَمَنْ حَسَبَ كَلامَهُ مِنْ عَمَلِهِ، قَلَّ كَلامُهُ إلاّ فِيما يَعْنِيهِ} {أَخْرَجَهُ إبن حِبّانَ بِرقم: (٣٦١)، وَضَعَّفَهُ الألباني في ضعيف الترغيب: برقم (١٣٥٢)}.

ئەمە نموونەیەکە کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ لە (صُحُف)ی ئیبراهیم دەیهێنێ.

واتە: پێغەمبەر ﷺ ئەبو زەڕی غیفاری لێی دەگێڕێتەوە خوا لێی ڕازی بێ، فەرمووی: خوا دە (١٠) پەڕاوی دابەزاندنە سەر ئیبراهیم ﷺ، {وشەی (صَحائِف) کۆی (صَحِيفَة)یە}، ئەبو زەڕ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئەو لاپەڕو پەڕاوانەی ئیبراهیم چی بوون؟ چییان تێدابوو! فەرمووی: هەموویان پەندو قسەی نەستەق بوون، (ئنجا چەند وێنەیەکی لەو پەندو قسە نەستەقانە بۆ دێنێتەوە)،

یەکێك لەوانە: ئەی پادشای خاوەن دەسەڵات! کە تاقیدەکرێیەوەو لە خۆتبایی، من تۆم نەناردوە کە دنیا هەندێکی بخەیە پاڵ هەندێکی، بەڵکو ناردوومی کە پاڕانەوەی ستەملێکراوان لە من دوور بخەیەوە (واتە: کەس ستەمی لێ نەکرێت و، لە من بپاڕێتەوە)، چونکە من پاڕانەوەی ستەملێکراو بەرپەرچ نادەمەوە، ئەگەر ئەو کەسە کە ستەملێکراوە کافریش بێ (کافریش داوام لێبکات، مادام مەزڵووم بێت، دوعاکەی گیرادەکەم) .

(پەندێکی دیکە دەڵێ:) بابای ژیر مادام عەقڵی لە دەست نەدابێ، دەبێ چەند کاتێکی هەبن، کاتێکی هەبێت کە تێیدا ڕازو نیاز لەگەڵ پەروەردگاری دا بکات و، کاتێکی هەبێ کە تێیدا لێپرسینەوە لەگەڵ خۆیدا بکات و، کاتێکی هەبێ کە تێیدا بیر لە دروستکراوەکانی خوا بکاتەوەو، کاتێکیشی هەبێ کە پێداویستیی لە خواردن و خواردنەوە بۆخۆی، تێدا دابین بکات .

(پەندێکی دیکە دەڵێ :) بابای ژیرو عاقڵ نابێ سەرگەرم بێ، مەگەر بە یەکێك لەم سێ شتانەوە (ئەگەر نا نابێ کاتی خۆی بەفیرۆ بدات): یان بۆ ڕۆژی دوایی توێشوو هەڵبگرێ، (خەریکی عیبادەت و تاعەت و بەندایەتیی بێ بۆ خوا)، یان دابینکردنی پێداویستییەکانی ژیان و گوزەرانی دنیای، یاخود خەریکی چێژ وەرگرتن بێ، بەڵام لە شتێکدا کە حەرام نەبێت و حەڵاڵ بێت .

(پەندێکی دیکە دەڵێ :) بابای ژیرو عاقڵ دەبێ ڕۆژگاری خۆی بزانێ، (بینەری ڕۆژگاری خۆی بێ، واتە: ببینێ چی دەگوزەرێ) و، ئاگای لە خۆی بێ و، زمانی خۆی بپارێزێ .

(دوا پەند ئەوەیە دەڵێ :) هەر کەسێك قسەکەشی لە کردەوەکەی بزانێ، (واتە: قسەکەی بە بەشێك لە کردەوەی بزانێ)، ئەوە قسەکانی کەم دەبن مەگەر لە شتێکدا کە پێویست بێ !

## ١٠- ئیبراهیم ﷵ صەڵات و سەلام بۆ ناردنی لە نوێژدا، بۆ پێویست کراوە !

واتە: لەسەر مسوڵمانان پێویست کراوە کە لە تەحییاتی نوێژدا، صەڵات و سەلامی بۆ بنێرن :

{عَنْ كَعْبِ بنِ عُجْرَةَ، قَالَ قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ! هَذَا السَّلامُ عَلَيْكَ قَدْ عَلِمْنَا، فَكَيْفَ الصَّلاةُ عَلَيْكَ؟ قَالَ: قُولُوا: اَللّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، اَللّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ}، {أَخرجَهُ عَبْد الرَّزاق برقم: (٣١٠٦)، وَأَحْمَد برقم: (١٨١٥٨)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٤٥١٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٠٦)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٩٧٦)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٤٨٣)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (١٢٨٩)، وَابن مَاجَهْ برقم: (٩٠٤)}.

واتە: كەعبی كوڕی عوجرە دەڵێ: گوتمان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئەوە سەلامكردن لەسەر تۆمان زانی، بەڵام چۆن صەڵاتت لەسەر لێ بدەین (بۆت بنێرین)؟ فەرمووی: بڵێن: ئەی خوایە! صەلات لە موحەممەدو لەسەر شوێنكەوتووانی موحەممەد بدە، وەك چۆن صەڵاتت ناردوە بۆ ئیبراهیمو شوێنكەوتوانی ئیبراهیم، هەروەها پیتو پێز بۆ سەر موحەممەدو شوێنكەوتووانی موحەممەد بنێرە، وەك چۆن پیتو پێزت ناردوە بۆ سەر ئیبراهیمو شوێنكەوتووانی ئیبراهیم، بێگومان تۆ ستایشكراویو پایە بەرزی.

لێرەدا دەمەوێ ئەوە ڕوون بكەمەوە كە هەرچەندە زۆر كەس وادەزانێ: (آل) لەگەڵ (أهل) یەكن، بەڵام وانیە، بەڵكو (أهل) لە بەكارهێنانی قورئانداو، لە زمانی عەرەبییشدا، بە مانای ماڵو خێزان دێ، بە تایبەتی هاوسەری پیاو (ژنو منداڵ)، بەڵام (آل) واتە: شوێنكەوتوان، بۆ وێنە: خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓا۟ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٦﴾ ﴾غافر، كاتێك كە ڕۆژی دوایی (ساعة) دێ، شوێنكەوتووانی فیرعەون بخەنە نێو سزایەكی زۆر توندەوە.

كەواتە بەتەئكید (آلِ فِرعَون) واتە: ئەوانەی كە شوێنی كەوتوون، نەك ماڵو خێزانەكەی، چونكە ئێمە دەقی ئایەتمان هەیە، كە خوای پەروەردگار، وێنە بۆ بڕواداران دێنێتەوە، بە هاوسەری فیرعەون، كە دەفەرموێ: ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱمْرَأَتَ فِرْعَوْنَ ﴿١١﴾ ﴾التحريم، واتە: خوا وێنەی هێناوەتەوە

بۆ بڕواداران، بە ژنەکەی فیرعەون، کە هەرچەندە خێزانی فیرعەونیش بوو، بەڵام لەبەرئەوەی خۆی بڕواداربوو، هاوسەر بوونی فیرعەون ڕێگر نەبوو لەوەی کە خوای بەخشندە وێنەی پێ بێنێتەوە بۆ ئافرەتانی ئیمانـدار، کە دەبێ سەرمەشقی ئیمانداران بن .

کەواتە: (اَللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ)، واتە: ئەی خوایە! بەزەیی تایبەتی خۆتو پلەو پایە بەرزکردنەوە بە موحەممەد ببەخشەو، بە شوێنکەوتووانی موحەممەد.

نەك خزمانی موحەممەد ﷺ! ئنجا لە نێو خزمەکانیداو، لە نێو ئەهلو بەیتیدا، ئەوانەی کە شوێنکەوتووی بووبن، ئەوانیش (آل)ن، بەڵام (آلِ مُحَمَّد) ﷺ بە پێچەوانەی ئەوەوە کە شیعە بانگەشەی بۆ دەکەن، لە ڕاستییدا بریتی نین لە: عەلیو فاتیمەو حەسەنو حوسێن، بە تەنیا، بەڵکو ئالی موحەممەد، هەموو ئەوانەن کە بە ڕاستیی شوێنی دەکەون، وەك لە شوێنی دیکەشدا بە تەفصیلْ ئەوەمان باس کردووە، شاعیرێکیش لەوبارەوە زۆر جوانیی گوتومو دەڵێ :

آلُ النَّبِيِّ هُمُ أَتْبَاعُ مِلَّتِهِ
مِنَ السُّودَانِ والعُجْمِ وَالْعَرَبِ
لَوْ لَمْ يَكُنْ آلُهُ إلاَّ قَرَابَتَهُ
لَصَلَّى الْمُصَلِّي عَلَى الطَّاغِي أَبِي لَهَبِ

واتە :

ئالی پێغەمبەر نیزیکانیو شوێنکەوتوانی ڕێبازەکەینی
لە عەجەمو ڕەش پێستەکانو لە عەرەب
ئەگەر ئالی ئەو تەنیا خزمە نزیکەکانی بان
کەسی صەڵەواتدەر، صەڵەواتی بۆ ئەبولەهەبی یاخیش دەنارد !

بەڵام نەخێر (آل)ی موحەممەدو ئیبراهیم، یانی: شوێنکەوتووانیان، ئەو کەسانە کە بە ڕاستیی شوێنیان کەوتوون، جاری وا هەیە ئەهلی کەسێك، واتە: هاوسەرەکەی‌و وەچەکەی‌و خزمەکانی، دەبن بە ئالی، واتە: دەبن بە شوێنکەوتووی، جاری واش هەیە نەخێر هاوسەرو ڕۆڵەو خزمەکانی، نابن بە ئالی بۆ نموونە : پێغەمبەر ﷺ، (أبو لهب)ی، مامی ئالی نەبووە، هەروەك ئەبو تاڵیبیش ئالی نەبووە، چونکە بڕوای پێی نەهێناوە .

هەروەها ئیبراهیم ئازەری بابی، ئالی نەبووە، دیسان نووح‌و لووط، خێزانەکانیان ئالیان نەبوونە، بەڵام ئەهلیان بوونە .

١١) <u>هەموو خاوەن بەرنامە ئاسمانییەکان‌و بەرنامە خواییەکان، لەسەر ئیبراهیم یەك دەنگن: جوولەکەو نەصرانیی‌و صابیئە، هەموویان ڕێزیان بۆ ئیبراهیم عليه السلام هەیە :</u>

ئیبراهیم خاڵی هاوبەشی تێکڕای ئەو کەسانەیە کە خۆیان بە شوێنکەوتووی بەرنامەکانی خوا دەزانن‌و، خۆیان بە شوێنکەوتووی کتێبەکانی خوا دەزانن .

هەر بۆیەش خوا ﷻ زۆرترین هەڵوێستی پێغەمبەرێکی کە باسکردبێ، هەڵوێستەکانی ئیبراهیمن، بەڵێ، پانتایی بەسەرهاتی مووسا عليه السلام‌و گەلەکەی‌و، لە بەرانبەریاندا فیرعەون‌و دارو دەستەکەی، زۆرترین پانتایی گرتوە، لە قورئاندا، بەڵام زۆرترین هەڵوێست کە لە پێغەمبەرێکەوە گێڕدرابنەوە هەڵوێستەکانی ئیبراهیمن عليه السلام، وەك ئێمە ئاماژەمان بە هەڵوێستە سەرەکییەکانی کرد .

لێرەشدا دێینە کۆتایی تەفسیری سووڕەتی (ئیبراهیم)، صەلات‌و بەرەکەت‌و سەلامی خوای لەسەر .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

# دەستپێك

بەڕێزان !

ئەمڕۆ كە (١٥)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٤٣٨)ی كۆچییە، بەرانبەر (١٠/ ٦/ ٢٠١٧)ی زاینیی، خوا پشتیوان بێ، دەست دەكەین بە توێژینەوەمان لە بارەی سوورەتی (الحجر)، سەرەتاش پێناسەی سوورەتی (الحجر) دەكەین :

# پێناسەی سوورەتی (الحجر) و تیشك خستنە سەر بابەتەكانی

١/ ئەم سوورەتە سوورەتێكی مەككییە، زانایان لە ڕیزبەندیی هاتنە خوارەوەی (ترتيب النزول)دا، ژمارە: پەنجاو دوو (٥٢)یان بۆ داناوە، هەندێكیشیان ژمارە پەنجاو چوار(٥٤)یان بۆ داناوەو، گوتوویانە: لە پێش سوورەتی (الأنعام) هاتۆتە خوارو، لە دوای سوورەتی (يوسف)، لە ڕیزبەندیی ئەو موصحەفەش دا كە لەبەردەستمانە، ژمارە: پازدە (١٥)یە .

٢/ ژمارەی ئایەتەكانی سوورەتی (الحجر) نەوەدو نۆ (٩٩)یەو، ئەم سوورەتە تەنیا یەك ناوی هەیە، ئەویش بریتییە لە: (الحجر)، (حجر)یش بەو دەڤەرو ناوچەیە دەگوترێ: كە گەلی (ثمود)ی لێبووە، تەنیا لەم سوورەتەشدا گەلی (ثمود) بە (أَصْحَابُ الحِجْرِ) ناویان هاتووە، نەگەرنا لە هەموو شوێنەكانی

دیکەدا، کە باسی گەلی (ثمود) کراوە، هەر بە گەلی (ثمود)، یان بە قەومی صالّح ناوهێنراون .

٣/ نێوەرۆکی ئەم سوورەتە، وەك هی سەرجەم سوورەتە مەککەییەکان، لەم چوار سوورگەیەدا دەخولێتەوە :

١) خوناسیی‌و بەندایەتیی بۆ خواکردنی .

٢) وەحیی‌و پێغەمبەرایەتیی .

٣) ڕۆژی دوایی‌و هاتنی کاتی سزاو پاداشت .

٤) بەسەرهاتی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، لەم سوورەتەدا، بێجگە لە ئادەم، باسی بەشێك لە بەسەرهاتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)و، بەسەرهاتی لووط ﷺ، کراوە، ئاماژەیەك بە گەلی شوعەیبیش ﷺ کراوە، کە گەلی (مەدیەنە)و بە (أَصْحَابُ الأَيْكَة)ش (خاوەنانی باخەکە)، یان (خاوەنانی درەختەکە) ناویان هاتوە هەروەها باسی صالّحیش (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) کراوە، یان گەلی صالّح، کە گەلی (ثمود)ن، کە وەك گوتمان لەم سوورەتەدا بە (أَصْحَابُ الحِجْر)، هاوەڵانی حیجر یان، واتە: ئەو کەسانەی خەڵکی ناوچەیەك بوون بە ناوی حیجر، باسی ئەویش کراوە .

# نەخشەیەکی خێرای پانتایی بابەتەکان

یەکەم : سەرەتا ئاماژەیەکی خێرا بە دابەزاندنی قورئانو هەڵوێستی کەللەڕەقانەی کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ کراوە، کە لەسەر ڕچەی کافرانی پێشوو، دەڕۆن، لە ئایەتەکانی: (١ – ١٥)دا، خوا ﷻ ئەو بابەتەی خستۆتە ڕوو .

دووەم : دوایی باسی خستنە ڕووی باڵادەستیو زانایيو میهرەبانیی خوا، کراوە لەمیانی چەند دیاردەیەکی گەردوونییدا، کە ئەمیش لە ئایەتەکانی: (١٦ – ٢٥)ی گرتۆتەوە .

سێیەم : پاشان بەسەرهاتی دروستکرانی ئادەمو، پێشتریش دروستکرانی جانن، دوایی باسی بەسەرهاتی: کڕنووش نەبردنی ئیبلیس بۆ ئادەم، کراوە، ئنجا باسی ئەوە کراوە کە خوا ﷻ دوای ئەوەی جەستەی ئادەمی ڕێکخستو، لەو ڕووحە، کە دروستکراوێکی تایبەتی خۆیەتی، فووی بە بەردا کرد، فەرمانی کرد بە فریشتەکان کە کڕنووشی ڕێزگرتن بۆ ئادەم بەرن، هەموویان کڕنووشیان بردوە، جگە لە ئیبلیسو، لەوبارەوە وتووێژێك لە نێوان خوای بەرزی بێ وێنەو، ئیبلیسی بێخێردا کراوە، کە ئەمە ئایەتەکانی: (٢٦ – ٤٨)ی گرتۆتەوە .

چوارەم : دوایی بەسەرهاتەکانی : ئیبراهیمو نووحو لووطو شوعەیبو صالح (علیهم السلام)و گەلەکانیان خراونەتە ڕوو، کە ئایەتەکانی: (٤٩ – ٨٤)یان گرتۆتەوە .

پێنجەم : چەند ئامۆژگاریيو ڕێنماییەکی خوای کارزان بۆ پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ، لە بواری گەیاندنی پەیامی خواو مامەڵەی لەگەڵ دەوروبەریدا، خراوەتە ڕوو، کە ئەویش ئایەتەکانی : (٨٥ – ٩٩) دەگرێتە خۆی، واتە: پازدە (١٥) ئایەت .

شایانی باسە : ئێمە کۆی ئایەتەکانی سوورەتی (الحجر) لە پێنج (٥) دەرسدا، شی دەکەینەوە:

**دەرسی یەکەم** : ئایەتەکانی : (١ – ٢٥) دەگرێتەوە، واتە : (٢٥) ئایەت .

**دەرسی دووەم** : ئایەتەکانی : (٢٦ – ٥٠) دەگرێتەوە، واتە : ئەمیش هەر (٢٥) ئایەت .

**دەرسی سێیەم** : ئایەتەکانی : (٥١ – ٧٩) دەگرێتەوە، واتە : (٢٩) ئایەت .

**دەرسی چوارەم** : ئایەتەکانی : (٨٠ – ٨٤) دەگرێتەوە، واتە : (٥) ئایەت، ئنجا ئێمە لە ئایەتەکانی : (٨٠ – ٨٤)دا، بەسەرهاتی (أَصْحَابُ الحِجْر) گەلی (ثمود) باس دەکەین .

**دەرسی پێنجەم** : ئایەتەکانی : (٨٥ – ٩٩) دەگرێتەوە، واتە : (١٥) ئایەت، کە ئەوە ئەو ڕێنمایی‌و ئامۆژگاریيانەی خوای پەروەردگارن، کە بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ خستوونیە ڕوو، بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردنی لەگەڵ کۆمەڵگاو دەوروبەریدا .

شایانی باسە: کە لە میانی دەرسی چوارەمدا، واتە: ئەو پێنج ئایەتەی: (٨٠ – ٨٤)دا، ئێمە لێکۆڵینەوەیەك لە بارەی ژیان‌و بەسەرهاتی صالح پێغەمبەرەوە (عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم)و گەلەکەی (ثمود) دەکەین، چونکە ئەم سوورەتە بە ناوی ناوچەی تێدا نیشتەجێبوونی گەلی (ثمود)ەوە ناونراوە، کە بریتیە لە (الحجر)، ئێمە ئەوەشمان کردوە بە بنچینەیەك لەم تەفسیرەماندا، کە هەر سوورەتێك، بە ناوی هەر یەکێك لە پێغەمبەرانەوە (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم)، یان گەلەکەیانەوە، یان شوێنەکەیانەوە ناونرابێ، لە کاتی تەفسیرکردنی ئایەتەکاندا، بەسەرهاتی ئەو پێغەمبەرە (عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم)و گەلەکەی دەتوێژینەوە .

شایانی باسیشە : ئەم سوورەتی (الحجر)، کە وەك گوتمان: سوورەتێکی مەککەییە، ئەگەر ژمارەی ڕیزبەندیی دابەزینی (٥٢) بێ، یان (٥٤) بێ، مانای وایە لە پێش سوورەتی (الحجر)دا، (٥١) سوورەتی دیکە، یان (٥٣) سوورەتی دیکە، دابەزێنراون .

کەواتە: هەموو سوورەتە مەککەییەکان، کە بە ڕای زۆربەی زانایان، ژمارەیان: هەشتاو شەش (٨٦)ە، مانای وایە دوو لەسەر سێی قورئانی مەککەیی لە پێش ئەم سوورەتەدا، دابەزێنراوە، بۆیەش خوا بەسەرهاتی پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، کە لەم سوورەتی (الحجر)دا هاتوون، بەسەرهاتەکەی ئیبراهیم، ئەو بەشەی کە پەیوەندیی هەیە بە بەسەرهاتی (گەلی لووط)ەوە، چ بەسەرهاتەکەی گەلی لووط، چ بەسەرهاتی شوعەیب، کە دیارە بۆ گەلی مەدیەن و هاوەڵانی باخەکە، یاخود درەختەکە (أَصْحَابُ الأَيْكَة)ە، نێرراوە، چ بەسەرهاتی صالح و گەلەکەی گەلی (ثمود)، هەموو ئەو بەسەرهاتانە، زۆر بە کورتیی لێرەدا هاتوون .

هەڵبەتە بەسەرهاتەکەی ئیبراهیم ﷺ و لووط ﷺ تا ڕادەیەك درێژترن، بەڵام ئەوانیش بە بەراورد لەگەڵ بەسەرهاتی ئیبراهیم ﷺو بەسەرهاتی لووط ﷺ، بۆ وێنە: کە لە سوورەتی (هود)دا هاتوون، کە پێشتر تەفسیرمان کردووە، دیسان هەر کورتن، لەبەر ئەوەی کاتێك خوا ﷻ شتێکی پێشتر باسکرد بێ، دوایی لە سوورەتەکانی دواتردا، بە کورتیی باسی دەکات، چونکە پێشتر لە سوورەتێکی دیکەدا درێژەکەی هاتوە .

بۆیە تەماشا دەکەین لە سوورەتی (البقرة)دا، خوا ﷻ لە ئایەتی سی‌و نۆ (٣٩) بە دواوە کە دێت، هەمووی باسی بەنو ئیسرائیلە، باسی گەلی مووسایە (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، کە خوا ﷻ هەمووی بە ئاماژە فەرمووە، هەمووی کورت کورت دەفەرموێ :

بۆ وێنە:

١/ ﴿ وَإِذْ نَجَّيْنَٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ ﴿٤٩﴾ ﴾ البقرة .

٢/ ﴿ وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ ٱلْبَحْرَ ﴿٥٠﴾ ﴾ البقرة .

٣/ ﴿ وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَٰحِدٍ ﴿٦١﴾ ﴾ البقرة .

٤/ ﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ ﴿٨٣﴾ ﴾البقـــــــــرة،
هـەموویـان بـە کـورتیـی دێـنــێ، بۆچـی ؟

چونکـە: لـە سوورەتەکـانی: (الأعراف)و (طـه)و (الشعراء)و (القصص)دا، بـە تەفصیلێ ئەو بەسەرهاتانە هاتوون، بۆیە لە سوورەتی (البقرة)دا، کە سوورەتێکی مەدینەییە، خوای کاربەجێ بە پێویستی نەزانیوە کە ئەو بەسەرهاتانەو ئەو هەڵوێستانەی کە لەو سوورەتانەی پێشوودا هاتوون، دووبارەیان بکاتەوە، بەڵکو وەك ئاماژە پێکردن، ئاماژەی پێکردوونە، واتە: بگەڕێنەوە بۆ ئەو سوورەتانەی دیکە، ئەگەر درێژەو تەفصیلی ئەو بەسەرهاتانەتان دەوێ .

شتێکی دیکەش هەبوو ویستم لێرەدا ئاماژەی پێبدەم، ئەویش ئەوەیە کە خوای بەرزو مەزن ، ئەو بەسەرهاتانە کە دەیانهێنێ، تەماشا دەکەین: بەسەرهاتی وا هەیە، لە ـ (١٠) سوورەتدا ئاماژەی پێکراوە، هەیە لە شەش سوورەتو، هەیە لە پێنج سوورەت، یان کەمتردا هاتوە ئنجا بۆ کەسێك کە شارەزا نەبێ‌و ورد نەبێتەوەو، ڕانەمێنێ، لەوانەیە بڵێ: ئەوە بۆچی ئەو بەسەرهاتە لەو چەند شوێنەدا هاتوە؟ بەڵام ئێمە لە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوەدا کە دەیکەین، دەربارەی بەسەرهاتی هەر کام لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، لە هەر شوێنێك کە بمانەوێ بە تەفصیلێ باسی بکەین، بۆمان دەرکەوتوە، کە لە ڕاستییدا دووبارەکردنەوەی ئەو بەسەرهاتانە، هیچی ئەو دووبارە کردنەوەیە نیە، بە مانا باوەکەی، کە بریتی بێ لەوەی خوا شتێکی لێرە فەرموو بێ‌و، لە شوێنێکی دیکەش، هەمان شت دووبارە بکاتەوە بەڵکو وەك بۆمان دەرکەوتوە، زۆر بە ڕوونیی بۆ کەسێك کە لێبکۆڵێتەوە دەزانێ : کە دەکات هەر جارە خوای زاناو شارەزا گۆشەیەك‌و لایەکی دیکە، لەو بەسەرهاتە، باس دەکات‌و بە تەعبیرێکی دیکە دەیهێنێ‌و، هەندێك نهێنیی دیکەی تێدا دەردەخات، کە بە کۆی باسکردنەکان، لە هەموو سوورەتەکاندا، ئنجا وێنەیەکی تەواومان دەکەوێتە بەردەست، دەربارەی ئەو بەسەرهاتە کە خوای بەرز گێڕاویەتەوە، وەك لە تەفسیری سوورەتی (یونس) دا، کە تێیدا باسی بەسەرهاتی (یونس) پێغەمبەرمان ﷺ کرد، یەك ئایەت دەربارەی بەسەرهاتی

(یونس) هاتوە، كە دەفەرموێ : ﴿ فَلَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ ءَامَنَتْ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُوا۟ كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْىِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٩٨﴾ ﴾ یونس، تەنیا ئەوەندە هاتوە بەلام درێژەی بەسەرهاتی (یونس): لە سووڕەتی (الصافات)دا هاتوە هەروەها لە سووڕەتی (الأنبیاء)یشدا، بەلام لەوێدا كورتتر، هەروەها لە سووڕەتی (القلم)یشدا بە شێوەی كورتتر هاتووەو، لە چەند شوێنێكدا خوا ﷻ بەسەرهاتی (یونس) دێنێ، بەلام لە سووڕەتی (یونس)دا، تەنیا یەك ئایەت دێنێ، بەلام ئێمە چونكە سووڕەتەكە بەناوی ئەوەوە ناونراوە بۆیە هەموو ئایەتەكانی دیكە كە لەبارەی بەسەرهاتی (یونس)ەوە هاتوون، لەوێدا هێناومانن و كۆمان كردوونەوە ئنجا خوای كاربەجێ لە شوێنێك بە یونوس دەفەرموێ: (یونس)و، لە شوێنێك پێی دەفەرموێ : (ذا النون)و، لە شوێنێك پێی دەفەرموێ: (صاحب الحوت)، هەموو ئەو ناوانە بۆ (یونس عليه السلام) بەكارهێنراون و لە هەر شوێنێك، گۆشەیەك لەو بەسەرهاتە دێنێ، هەروەها بەسەرهاتی هەموو پێغەمبەرانی دیكەش (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) هەر بەو شێوەیە .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی یەکەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان ئایەتەکانی: (١ - ٢٥) لە سەرتای سوورەتی (الحجر) دەگرێتەوە، لەم بیست و پێنج (٢٥) ئایەتەی سەرەتای سوورەتی (الحجر)دا، پێناسەی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە کراوە، پاشان سەرەنجامی شووم و پەشێمانیی کێشانی بێبڕوایان، لە ڕۆژی دواییدا، باسکراوە .

هەروەها دڵی پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ دراوەتەوە، لەسەر هەڵوێستی خراپ و نەرێنیی بێبڕوایەکان، بەرانبەر بە خۆی و پەیامەکەی .

پاشان باسی داواکردنی چەندەمین جارەی بێجێی بێبڕوایان، کراوە، کە بریتیە لەوەی فریشتەکان دابەزن، دوایی باسی پارێزراویی قورئان کراوە، لەلایەن خوای پارێزەرەوە .

ئنجا باسی هەڵوێستی کافرانی ئۆممەتانی پێشوو کراوە، کە هەر ئاوا وەك کافرانی ڕۆژگاری پێغەمبەری کۆتایی ﷺ، گاڵتەیان بە پێغەمبەران کردووە و سەرەنجام یاسای سزادانی خوای دادگەریان بەسەردا چەسپیوە .

پاشان باسی ئەوە کراوە کە: ئەگەر گریمان کافرەکان دەروازەیەکیشیان بەرەو ئاسمان لێبکرێتەوە و، پێیدا سەربکەون، دیسان بیانوو دەگرن و، بڕوا ناهێنن، دوایی خوای توانا و زانا باسی ژمارەیەك لە نیشانەکانی خۆی دەکات، لە دەوروبەروبوونەوەردا، کە میهرەبانیی و کەرەم و بەخششی بێ سنووری خوایان، بەرانبەر بە مرۆڤەکان، تێدا دەدرەوشێتەوە .

هەروەها باسی ڕێ لێگرتنی شەیتانەکان لە گوێ هەڵخستن لە قسەی فریشتان کراوە .

لە کۆتاییشدا: خوا ئەو ڕاستییە دەخاتە ڕوو کە خوای پەنهانزان سەرجەم مرۆڤەکان بە پێشین و دواینەوە دەناسێ و، هەمووشیان لە ڕۆژی دواییدا کۆ دەکاتەوە، بۆ سزاو پاداشت، وەرگرتنەوە .

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ وَقُرۡءَانٖ مُّبِينٖ ﴿١﴾ رُّبَمَا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡ كَانُواْ
مُسۡلِمِينَ ﴿٢﴾ ذَرۡهُمۡ يَأۡكُلُواْ وَيَتَمَتَّعُواْ وَيُلۡهِهِمُ ٱلۡأَمَلُۖ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ﴿٣﴾ وَمَآ أَهۡلَكۡنَا
مِن قَرۡيَةٍ إِلَّا وَلَهَا كِتَابٞ مَّعۡلُومٞ ﴿٤﴾ مَّا تَسۡبِقُ مِنۡ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ ﴿٥﴾
وَقَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِي نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ إِنَّكَ لَمَجۡنُونٞ ﴿٦﴾ لَّوۡ مَا تَأۡتِينَا بِٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِن كُنتَ
مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٧﴾ مَا نُنَزِّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَمَا كَانُوٓاْ إِذٗا مُّنظَرِينَ ﴿٨﴾ إِنَّا نَحۡنُ
نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ فِي شِيَعِ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٠﴾ وَمَا يَأۡتِيهِم
مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿١١﴾ كَذَٰلِكَ نَسۡلُكُهُۥ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿١٢﴾
لَا يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۖ وَقَدۡ خَلَتۡ سُنَّةُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ وَلَوۡ فَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَابٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَظَلُّواْ فِيهِ
يَعۡرُجُونَ ﴿١٤﴾ لَقَالُوٓاْ إِنَّمَا سُكِّرَتۡ أَبۡصَٰرُنَا بَلۡ نَحۡنُ قَوۡمٞ مَّسۡحُورُونَ ﴿١٥﴾ وَلَقَدۡ جَعَلۡنَا فِي ٱلسَّمَآءِ
بُرُوجٗا وَزَيَّنَّٰهَا لِلنَّٰظِرِينَ ﴿١٦﴾ وَحَفِظۡنَٰهَا مِن كُلِّ شَيۡطَٰنٖ رَّجِيمٍ ﴿١٧﴾ إِلَّا مَنِ ٱسۡتَرَقَ
ٱلسَّمۡعَ فَأَتۡبَعَهُۥ شِهَابٞ مُّبِينٞ ﴿١٨﴾ وَٱلۡأَرۡضَ مَدَدۡنَٰهَا وَأَلۡقَيۡنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن
كُلِّ شَيۡءٖ مَّوۡزُونٖ ﴿١٩﴾ وَجَعَلۡنَا لَكُمۡ فِيهَا مَعَٰيِشَ وَمَن لَّسۡتُمۡ لَهُۥ بِرَٰزِقِينَ ﴿٢٠﴾ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا
عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ وَمَا نُنَزِّلُهُۥٓ إِلَّا بِقَدَرٖ مَّعۡلُومٖ ﴿٢١﴾ وَأَرۡسَلۡنَا ٱلرِّيَٰحَ لَوَٰقِحَ فَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ
مَآءٗ فَأَسۡقَيۡنَٰكُمُوهُ وَمَآ أَنتُمۡ لَهُۥ بِخَٰزِنِينَ ﴿٢٢﴾ وَإِنَّا لَنَحۡنُ نُحۡيِۦ وَنُمِيتُ وَنَحۡنُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ﴿٢٣﴾
وَلَقَدۡ عَلِمۡنَا ٱلۡمُسۡتَقۡدِمِينَ مِنكُمۡ وَلَقَدۡ عَلِمۡنَا ٱلۡمُسۡتَـٔۡخِرِينَ ﴿٢٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَحۡشُرُهُمۡۚ إِنَّهُۥ
حَكِيمٌ عَلِيمٞ ﴿٢٥﴾ ﴾.

# مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. ئەلیف لام ڕا، ئەوانە ئایەتەکانی کتێبو قورئانێکی ڕوونن (١) پێدەچێ ئەوانەی بێبڕوان (ڕۆژێك بێ) خۆزگە بخوازن کە ملکەچ بوونایە {بۆ خوا} (٢) لێیانگەڕێ با بخۆنو ڕابوێرنو ئاوات بیانخافڵێنێ، لەمەودوا دەزانن (چەندە بەهەڵەداچوون!) (٣) هیچ ئاوەدانییەکیشمان نەفەوتاندوە، مەگەر کاتێکی زانراوی هەبووە (٤) هیچ کۆمەڵگایەك نە پێش کاتی دیاریکراوی دەکەوێ، نە دواش دەکەوێ (٥) (بێبڕوایەکان) گوتیشیان: ئەی ئەو کەسەی زیکری دابەزێنراوەتە سەرا بە دڵنیایی تۆ شێتی (٦) ئەگەر لە ڕاستانی بۆچی فریشتانمان بۆ ناهێنی (شایەدییت بۆ بدەن) (٧) ئێمە بە هەق نەبێ فریشتان دانابەزێنین، ئنجا لە حاڵێکی واشدا (کە فریشتان بۆ سزادانیان بنێرین) مۆڵەتیان نادرێ (تەوبە بکەن) (٨) بە دڵنیایی ئێمە خۆمان زیکر (قورئان)مان دابەزاندوەو، مسۆگەر هەر خۆشمان پارێزەرینی (٩) بە دڵنیایی لە پێش تۆش دا، لە نێو کۆمەڵگا پێشووەکاندا، ڕەوانەکراوانمان ناردوون (١٠) ئنجا هیچ ڕەوانەکراوێکیشیان بۆ نەدەچوو، مەگەر گاڵتەیان پێدەکرد (١١) هەر بەو شێوەیەش (کە لە ڕابردوودا مامەڵەمان پێ لەگەڵ بێبڕوایاندا کردوە) دەیخەینە دڵی تاوانبارانەوە (١٢) کە بڕوای پێ ناهێنن‌و، بێگومان یاسای (خوا لە مامەڵەی لەگەڵ) گەلە پێشووەکاندا ڕابردوە (١٣) ئەگەر دەروازەیەکیشمان لە ئاسمانێ بەسەردا کردبانەوەو پێیدا هەڵاچووبان (١٤) دەیانگوت: چاومان بەستراون، بەڵکو ئێمە کۆمەڵێکین جادوومان لێکراوە (١٥) بە دڵنیایی ئێمە چەندان بورجمان لە ئاسمانێدا دانـاون‌و، بۆ تەماشاکەرانمان ڕازاندۆتەوە (١٦) لە هەر شەیتانێکی

ڕەتێنراویشمان پاراستوە (١٧) مەگەر کەسێکیان بە دزیی گوێ هەڵبخات، ئەویش بڵێسەیەکی ئاشکرای شوێن دەکەوێ (١٨) زەویشمان لێك کێشاوەتەوەو چیایە (لەنگەر ئاسا)کانمان تێفڕێداون‌و، هەموو شتێکی ئەندازەگیریی کراومان تێدا ڕواندوە (١٩) هەروەها لەوێدا (لە زەمیندا) هۆکارەکانی ژیان‌و گوزەرانی خۆتان‌و، ئەوانەی ئێوە بژێودەریان نین، ڕەخساندوومانن (٢٠) هیچ شتێکیش نیە مەگەر عەمبارەکانی لەلای ئێمەن‌و، تەنیا بە ئەندازەی زانراویش دایدەبەزێنین (٢١) بایەکانیشمان ناردوون، پیتێنەرن (بۆ هەورەکان‌و شیناورد)و لەسەرێوە ئاومان دابەزاندوەو، پێتانمان نۆش کردوەو، ئێوەش کۆگەرەوەو پارێزەری نین (٢٢) بە دڵنیاییش ئێمە هەر خۆمان دەژیەنین‌و دەمرێنین‌و، هەر خۆشمان میراتگرین (٢٣) بێگومانیش پێشووەکانتانمان زانیوەو، بە مسۆگەریش دواخراوەکانیشتمان زانیوە (٢٤) بە مسۆگەریش تەنیا پەروەردگارت کۆیان دەکاتەوە، بێگومان ئەو کارزانی زانایە (٢٥)﴾ .

# شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

( رُبَمَا ): خوێنراویشەتەوە: (رُبَّمَا)، بە گیرە (شَدَّة)، (رُبَّ: لإسْتِقلالِ الشَّيءِ)، ئەگەر شتێك بتەوێ بە کەمی دابنێی، دەڵێی: (رُبَّ)، وەك پەندی عەرەبیی دەڵێ: (رُبَّ أخٍ لَمْ تَلِدْهُ أُمُّكَ) دەگونجێ برایەکت هەبێ کە دایکت ئەوی نەبوو بێ، واتە: کەسێك هەبێ، کە هەرچەندە لە ڕووی ڕەچەڵەکەوە برات نیە، بەڵام بۆت وەك برا بێ، یان لە براش باشتر بێ، دەڵێ: (رُبَّ: لاستِقلالِ الشَّيءِ وَلِمَا يَكُونُ وَقتاً بَعْدَ الوَقتِ)، (رُبَّ): بۆ شتێکە کە کەم بێ‌و، بۆ شتێکە کاتێك ببێ‌و دوایی ماوەیەکی پێ بچێ، ئنجا کاتێکی دیکە ببێ .

( ذَرْهُمْ ): (دَعْهُم، أتْرُكهمْ) لێیانگەڕێ، وازیان لێبێنە .

(وَيُلْهِهِمُ ): (ألْهاهُ كذا: شَغَلَهُ عَمَّا هُوَ أهَمُّ إلَيْهِ)، (ألْهاهُ)، واتە: سەرقاڵی کرد، بێئاگای کرد لە شتێك کە بۆ ئەو گرنگترە.

(الأَمَلُ): (الرَّجاء، وأكْثَرُ استِعْمَالِهِ فِيمَا يُسْتَبْعَدُ حُصُولُهُ)، ئێمە وشەی (أمَل) و (رَجَاء) لە زمانی کوردییدا هەر بە: هیواو ئومێدو ئاوات، لێك دەدەینەوە، بەڵام من وشەی (أمَل)م بە ئاوات لێکداوەتەوە چونکە: وشەی (أمَل) بە زۆریی بەکارهێنرانی لە شتێکدایە، کە بە دوور بزانرێ پەیدا ببێ .

( لَّوْ مَا ): (كَلِمَةٌ بِمَنْزِلَةِ لَوْلا، تَدْخُلُ عَلَى الجُمْلَةِ الفِعْلِيَةِ فَتُفِيدُ التَّحْضِيضَ)، (لَوما): وشەیەکە لە جێی (لَولا)، (لَولا) لە زمانی کوردییدا دەبێتەوە بە ئەگەر، ئەگەر وابا، ئنجا دەچێتە سەر ڕستەی کرداریی‌و، مانای: هاندان دەگەیەنێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ لَّوْلَا جَآءُو عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ ﴿١٣﴾ ﴾النور، واتە: دەبووایە چوار شایەدان لەسەر ئەو مەسەلەیە بێنن .

(مُّنظَرِينَ ): (نَظَرتُهُ وَانْتَظَرتُهُ وَأَنْظَرتُهُ: أَخَّرتُهُ)، هەرسێكیان بە مانای: دواخست، دێن، (مُنْظَرِينَ) یانی: چاوەڕێ كراوان، دواخراوان، مۆڵەت دراوان .

(شِيَعِ ): (جَمْعُ شِيْعَة: مَنْ يَتَقَوَّى بِهِمُ الإنْسَانُ وَيَنْتَشِرُونَ عَنْهُ، جَمْعُهُ أَشْيَاع)، (شِيَع) و (أَشْيَاعْ) كۆی (شِيعَة)ن، (شِيعَة) ئەو كۆمەڵە خەڵكەن، كە مرۆڤ بەهۆی وانەوە، بەهێز دەبێ‌و لەوەوە بڵاودەبنەوە .

(نَسْلُكُهُ ): (السُّلُوكُ: النَّفَاذُ فِي الطَّرِيقِ: سَلَكْتُ الطَّرِيقَ، وَسَلَكْتُ كَذَا فِي طَرِيقِهِ)، (سلُوك) بە مانای ڕۆیشتنە بە ڕێیەكدا، دەگوترێ: (سَلَكْتُ الطَّرِيق) ڕێیەكەم گرت، پێیدا ڕۆیشتم، دەگوترێ: (سَلَكْتُ كَذَا فِي طَرِيقِهِ) فلاَن شتەم خستە سەر ڕێیەكەی، یاخود فلاَن شتەم بەڕێكرد بە ڕێدا، ئنجا نَسلُكه) بە مانای دەیخەینە نێوی، (نُدخِلُهُ) .

سُنَّةُ ): یانی: (طَرِيقَة)، (سُنَّةُ اللهِ: طَرِيقَةُ حِكْمَتِهِ)، (سُنَّة) بە مانای یاسا دێ، بە مانای ڕێباز دێ، واتە: ئەو ڕێبازو یاسایەی كە خوا ﷻ مامەڵەی پێ لەگەڵ دروستكراوەكانیدا دەكات .

(فَظَلُّواْ ): واتە: بەردەوام بوون، (ظَلْتُ وَظِلْتُ: بِحَذْفِ إِحْدَى اللاَمَيْنِ يُعَبَّرُ بِهِ عَمَّا يُفْعَلُ فِي النَّهَارِ)، وشەی (ظَلْتُ وَظِلْتُ) بە فڕتاندنی یەكێك لە دوو (ل)كان، چونكە خۆی (ظَلَّ)یەو، دوو (ل)ن، یەكێك لە دوو(ل)كان، دەفڕتێنرێ، تەعبیری پێدەكرێ لەو شتەی بە ڕۆژێ دەكرێ، ئەگەر بگوترێ: (ظَلَّ يُقِيمُ الصَّلاَة)، واتە: لە ڕۆژێدا نوێژی بەرپاكرد، بەلاّم ئەگەر بڵێ : (بَاتَ يُقِيمُ الصَّلاَة)، یانی: لە شەوێدا نوێژی بەرپاكرد .

(يَعْرُجُونَ ): (العُرُوجُ: ذَهَابٌ فِي الصُّعُودِ)، (عُرُوج) بریتیە: لەوە كە ئینسان بەرەو سەرێ بڕوات .

(سُكِّرَتْ) : (السَّكر: حَبْسُ المَاءِ، وَالسِّكر: المَوْضِعُ المَسْدُودُ، سُكِّرَتْ أَبْصَارُنَا: مِنَ السُّكر أَوِ السُّكْر)، (سُكرتْ أَبْصَارُنا)، واتە: چاوەكانمان بەستراون، دەڵێ: وشەی (سَكر) بریتیە: لە ڕاگرتنی ئاو، بەڵام (سِكر) ئەو شوێنەیە كە بەسترابێ، شوێنێك كە بەسترابێ، پێی دەگوترێ: (سِكْر)، (سُكرتْ أَبْصَارُنا)، دەگونجێ لە (سَكر)ەوە بێ، واتە: چاومان بەستراون، یاخود لە (سُكر)ەوە بێ، واتە: بێهۆش و سەرخۆش كراوین .

(مَّسْحُورُونَ) : واتە: جادوومان لێكراوە، (مَنْ فُعِلَ ضِدُّهُ السِّحْرُ)، كەسێك كە جادووی لە دژ كرابێ .

(بُرُوجًا) : (جَمْعُ برج : القُصُورُ، وَ بِهِ سُمِّيَ بروجُ السَّمَاءِ لِمَنَازِلِها المُخْتَصَّةِ بِها)، (بروجُ) كۆی (برج)ە، بە مانای (قُصُور) كە كۆی (قَصْر)ە، واتە: كۆشكەكان، بورجەكانی ئاسمان، بەو ناوە ناونراون، ئەو مەنزڵگایانەی خۆر، یاخود مانگ هاموشۆیان پێدا دەكەن، بەپێی ڕواڵەتی بینینی مرۆڤەكان، وەك دوایی باسی دەكەین .

(رَّجِيمٍ) : (الرَّجيم: مَطْرُودٌ مِنَ الخَيْرَاتِ وَعَنْ مَنَازِلِ المَلأ الأَعْلَى)، (رَجيم)، واتە: دەركراو لە خێرو چاكەو، دوورخراوە لە پێگەو شوێنی ئەو فریشتانەی كە لە سەرێن .

(ٱسْتَرَقَ): (إسْتَرَقَ السَّمْعَ: تَسَمَّعَ مُسْتَخْفِياً)، واتە: بە پەنهانیی گوێی هەڵخست و گوێی گرت، قسەیەكی دزی، بە گوێ هەڵخستن .

(شِهَابٌ): (الشِّهَابُ: الشُّعْلَةُ السَّاطِعَةُ مِنَ النَارِ، مَوْقُودَةٌ مِنَ العَارِضِ فِي الجَوِّ)، (شِهاب) بەو بڵێسە تیشكدەرە دەگوترێ لە ئاگر، كە لە جەوی سەرێ دەیبینین لە شەودا، دەبینرێ .

(مَدَدْنَٰهَا): (أَصْلُ الْمَدِّ: الجَرُّ، وَمِنْهُ الْمُدَّةُ: الوَقْتُ الْمُمْتَدُّ)، وشەی (مَدَدْنَٰهَا)، واتە: درێژمان کردۆتەوە، پانمان ڕاخستوە، مەبەست لە زەوییە، لە ئەسڵدا مَدّ) بە مانای (جَرّ) ڕاکێشان، دێ، هەر بۆیە بە کاتێکی درێژکراوە، دەگوترێ : (مُدَّة) چونکە ئەو کاتە درێژ دەکرێتەوە .

رَوَٰسِيَ ): (رَسَى الشيءُ يَرْسُو رَسْواً: ثَبَتَ، وَأَرْسَاهُ غَيْرُهُ، الرَّواسي: الجبالُ الثَّابتة)، (رَوَٰسِيَ ) کۆی (رَاسي)یە، دەگوترێ: (رَسَى الشيءُ يَرْسُو رَسْواً)، واتە: ئەو شتە چەسپی، دەچەسپێ، چەسپان، (وَأَرْسَاهُ غَيْرُهُ) ئەگەر غەیری خۆی بیچەسپێنێ، کە لێرەدا مەبەست: چیایە چەسپاوەکانن لە زەویدا .

مَّوْزُونٍ): واتە: کێشراو، (الوَزْنُ: مَعْرِفَةُ قَدْرِ الشَيءِ)، (وزن) زانینی ئەندازەی شتێکە، (مَّوْزُونٍ) بە مانای کێشراو، دێ، بە مانای هاوسەنگیش دێ، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾ ﴾القمر، واتە: ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازە دروستکردوە، ئەندازەکەیمان زانیوەو دیاریمان کردوە .

مَعَٰيِشَ ): (جَمْعُ مَعِيشَة: مَا يُتَعَيَّشُ بِهِ، والعَيْشُ أَخَصُّ مِنَ الحَيَاةِ)، (معايش) کۆی (مَعيشَة)یە، (مَعيشَة) هەر شتێکە کە ئینسان پێی بژیو، (عَيْش) تایبەتترە لە (حیاة)، لە زمانی عەرەبییدا، چونکە (حَيَاة) بۆ خواش بەکاردێ، بۆ فریشتەکانیش بەکاردێ، بەڵام (عَيش) تەنیا بۆ ئەو دروستکراوانە بەکاردێ، کە پێویستییان بە شتێك هەیە پێی بژین .

(خَزَآئِنُهُ): (الخَزْنُ: حِفْظُ الشيءِ في الخِزَانَة)، (خزائن) کۆی (خِزَانَة)یە، خَزْن)یش، بریتیە: لە پاراستنی شتێك لە (خِزَانَة)دا، واتە: لە عەمباردا، لەو شوێنەدا کە شتی تێدا هەڵدەگیرێ .

(لَوَٰقِحَ ): (ذَوَاتُ لَقَاحٍ، أَلْقَحَ فُلانٌ النَّخْلَ وَلَقَّحَهَا، وَأَلْقَحَ فَحْلُ النَّاقَةَ، وَالرِّيحُ السَّحَابَ)، (لَوَاقِح) واتە: ئەوانەی کە خاوەن پیتاندنن، موتوربە کردنن،

(أَلْقَحَ فُلان النَّخْلَ) فلانکەس دارخورمایەکەی تەلقیح کرد، واتە: پیتاندی، یان موتوربەی کرد، (وَلَقَّحَها وَأَلقَحَها) هەردووکیان بەکاردێن، (وَألقَحَ فَحْلُ الناقَةَ) نێرە حوشترەکە، حوشترە مێیەکەی تەلقیح کرد، واتە: لەگەڵی جووت بووو، تۆوی نێرەو مێیەکە، پێکەوە کۆبۆوە، (وَألقَحَ الرِّيحُ السَّحَابَ) بایەکە هەورەکەی پیتاند، یان موتوربەی کرد .

ٱلْمُسْتَقْدِمِينَ ): (المُتقَدِّمين)، ئەوانەی پێشکەوتوون .

ٱلْمُسْتَـْٔخِرِينَ ): یانی: (المُتاخِّرين)، ئەوانەی دواکەوتوون .

# مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ لەم سوورەتی (الحجر)دا، کە وەك پێشتر گوتمان: لە ڕیزبەندیی مصْحَف)دا ژمارە (١٥)یە، بەڵام لە ڕیزبەندیی دابەزیندا، بە ڕای زۆربەی زانایان ژمارە (٥٢)ە، خوا ﷻ ئاوا دەست پێدەكات :

﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾ بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە: ئەم کارەم دەست پێدەکەم بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، بە ناوی خواو، بۆ ڕازیکردنی خواو، بە یارمەتییدانو هاوکاریی خوا ﷻ و بە پێی بەرنامەی خوا .

﴿ الٓر ﴾ ئەلیف، لام، ڕا، ئەم سێ پیتە، ئاوا دەخوێنرێنەوە کە پێشتر باسمان کردوە بە تایبەت لە سەرەتای سوورەتی (یونس)دا، لێکۆڵینەوەیەکی تێرو تەسەلمان لەبارەیانەوە کردوە، هەروەها لە سەرەتای سوورەتی (البقرة)شدا، ئنجا ئەو مانایەی لە هەموو مانایەکان، تاکو ئێستا بەلای منەوە پەسندترە، ئەوەیە کە خوا ﷻ، لە ڕێی ئەو پیتە پچڕ پچڕانەوە (الحُرُوف المُقطعة)، دەیەوێ بە بەندەکان بە مرۆڤەکان بفەرموێ: ئەو قورئانەی لەبەردەستتان دایە، فەرمایشتی خوایە، هەر لەو پیتانە پێکهاتوە کە ئێوە شتیان پێ دەنووسنو قسەیان پێ دەکەن، ئنجا ئەگەر لە دوو دڵییدان، کە ئەم قورئانە فەرمایشتی خوا نەبێ، یانی: موحەممەد ﷺ خۆی فەرموویێتی، یان وەك هەندێك لە بێبڕوایەکان ئێستاشی لەگەڵدا بێ، دەڵێن: غەیری خۆی فێری کردوە، ئەگەر شەیتانە، ئەگەر مرۆڤە، ئەگەر هەرچی هەیە، فەرموون مەیدان مشك نەیانکێڵاوە، ئەوە عەرزو ئەوە گەز، ئێوەش ئەو پیتانەتان لەبەردەستدان، فەرموون قورئانێکی وا بێنن .

دوایی دەفەرمویٚ: ﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ وَقُرْءَانٍ مُّبِينٍ ﴾ ئا ئەو ئایەتانە، ئایەتەكانی كتێبێك و قورئانێكی ڕوونن، بۆیەش بە ﴿ تِلْكَ ﴾ ئاماژە دەكات، چونكە: ﴿ تِلْكَ ﴾ بۆ دوورە، لەبەرئەوەی پێگەو پلەی ئەو ئایەتانە زۆر بەرزە، بۆیە خوا ﷻ بەناوی ئاماژەی دوور ئاماژەی پێ دەكات، وەك لە سەرەتای سووڕەتی (البقرة)شدا دەفەرمویٚ: ﴿ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ ﴾، ئەویش دیسان بە ئاماژەی دوورە نەیفەرمووە: (هَذَا الكِتَابُ)، لێرەش نافەرمویٚ: (هَذِهِ آياتُ كِتابٍ وَقُرانٍ مُبينٍ)، دەفەرمویٚ ﴿ تِلْكَ ﴾، كە ئەوە ئاماژەیە بۆ پلەوپایەی بەرزیان .

ئەم ئایەتانە، ئایەتەكانی كتێبێك و قورئانێكی ڕوونن، واتە: هەم كتێبەكە، هەم قورئانەكە ڕوونە، كتێب، واتە: نووسراو، قورئان، واتە: خوێنراو، ئەوەی كە خوا ﷻ، بۆ پێغەمبەری خاتەمی ﷺ، ناردوە، هەم بە حاڵەتی نووسراو هەیە، لە دوو توێی (مصحف)ێكداو، هەم بە حاڵەتی خوێنراویش هەیە، لە عەقڵ و سینەی: كاتی خۆی پێغەمبەر ﷺ دا، دوایی هاوەڵانی بەڕێزیدا، ئنجا جیلەكانی دوای وان، تاكو گەیشتۆتە ئێستا .

وشەی: ﴿ مُّبِينٍ ﴾، بێگومان لە فیعلی (أَبانَ)وەیە، (أَبانَ يُبِينُ، فَهُوَ مُبِين)، ئنجا (أَبانَ) هەم حاڵەتی (لازم)ی هاتووە، واتە: ڕوون، ڕۆشن، ئاشكرا، دەگوترێ: (أَبانَ القَمَرُ) مانگەكە دەركەوت.

هەم حاڵەتی (مُتَعَدّي)یشی هاتووە، (أَبانَ المُدَرِّسُ الدَّرْسَ) مامۆستایەكە دەرسەكەی ڕوون كردەوە .

كەواتە: دەگونجێ بۆ مانای: (مُبِين) هەم بڵێی: ڕوون، هەم بڵێی: ڕوونكەرەوە، بەڵام لێرە زیاتر مانای (ڕوون)ی لەگەڵ دەگونجێ، هەم كتێبەكە ڕوونە، هەم قورئانەكە ڕوونە، واتە: ماناو مەبەستەكانی ئاشكرانو، مرۆڤ دەتوانێ لێیان تێبگات .

دەشگونجێ بڵێی: ئەم قورئانە، ئەم كتێبە ڕوونكەرەوەیە بۆ ئەو ماناو مەبەستانەی، كە مرۆڤەكان پێویستییان پێیان هەیە .

دوایی دەفەرموێ: ﴿ رُّبَمَا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ كَانُواْ مُسْلِمِينَ ﴾، ﴿ رُّبَمَا ﴾ پێشتریش باسمان کرد، بۆ ئەوەیە کە شتێك بە کەمیی ڕوو بدات، واتە: ڕێی تێدەچێ، ڕەنگە ئەوانەی بێبڕوان، خۆزگە بخوازن، حەز بکەن، کە ملکەچ بوونایە، مسوڵمان بوونایە، بۆ خوا گەردنکەچ بوونایە .

ئەمە وەك لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین، جۆرێکە لە بە توانجو تەوسەوە قسەکردن، لەبارەی کافرەکانەوە، وەك چۆن یەکێك بە یەکێك دەڵێ: ڕەنگە کاتێك بێ پەشێمان بیەوە، دڵنیاشە کە پەشێمان دەبێتەوە، بەڵام بە وشەی ڕەنگەو لەوانەیە، دەیدوێنێ .

﴿ ذَرْهُمْ يَأْكُلُواْ وَيَتَمَتَّعُواْ وَيُلْهِهِمُ ٱلْأَمَلُ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴾ لێیانگەڕێ با بخۆنو ڕابوێرنو، با هیواو ئاواتی بێ نێوەڕۆك بێ ئاگایان بکات، لەمەودوا دەزانن .

واتە: لەمەودوا دەزانن، کە چەندە بە هەڵە داچووبوون !

﴿ وَمَآ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ إِلَّا وَلَهَا كِتَابٌ مَّعْلُومٌ ﴾ هیچ ئاوەدانییەکمان نەفەوتاندوە، مەگەر کاتێکی زانراوی هەبووە، کاتێکی دیاریکراوی هەبووە، کارەکانی خوا ﷻ، هەموویان بە پێی نەخشەن، بە پێی بەرنامەن، نەخشەو بەرنامەیەك کە هەر لە خۆی دەوەشێتەوە ﷻ، ئنجا بۆ مامەڵەی لەگەڵ مرۆڤەکانداو، بۆ مامەڵەی لەگەڵ دروستکراوەکانی دیکەدا، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ : ﴿ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾ ﴾القمر، واتە: ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازەگیریی دروست کردوە، هەڵبەتە ئەو ئەندازەگیریی و وردەکارییە، کە لە گەردیلەوە تا کەهکەشان، لە هەموو دروستکراوەکاندا هەیە، بە تەئکید لە ژیانی مرۆڤەکانیشداو، لە ژیانی گەلانو میللەتانیشدا هەر هەیە .

﴿ مَّا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا ﴾ هیچ کۆمەڵگایەك پێش کاتی دیاریکراوی خۆی ناکەوێ، ﴿ وَمَا يَسْتَـْٔخِرُونَ ﴾ لێشی دوا ناکەون، یانی: بە وردیی لەو کاتەدا، کە خوا دیاریی کردوە، لەو کاتەدا سزای خوا، دێ، کە کاتی خۆی هاتوە بۆ

کۆمەڵگاکان، ئێستاش بە پێی ئەو یاسایە کە خوا دایناوە، لە گەردووندا، شتەکان بە وردیی لە کاتی خۆیانداو، لە شوێنی خۆیانداو بەو شێوەیە کە خوا ﷻ لە زانیاریی بێسنووری خۆی دا دیاریی کردووەو هەیە، ڕوودەدەن و یاساکانی خوا جێبەجێ دەبن .

﴿ وَقَالُوا۟ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِى نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلذِّكْرُ إِنَّكَ لَمَجْنُونٌ ﴾ کافرەکان گوتیان: ئەی ئەو کەسەی کە (ذِکر)ی دابەزێنراوەتە سەرا بێگومان تۆ شێتی .

هەڵبەتە لێرەدا بە توانجەوە پێیان گوتوە: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِى نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلذِّكْرُ ﴾ چونکە، ئەگەر بڕوایان بەوە بێ کە (ذِکر)، واتە: قورئان بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ دابەزێنراوە، کەواتە: ئەو کاتە بە بڕوادار لە قەڵەم دەدرێن، بەڵام، نا، واتە: ئەی ئەو کەسەی وا باوەو وا بانگەشە دەکەی، کە (ذِکر)ت، بۆ دابەزێنراوە! بێگومان تۆ شێتی، واتە: ڕاست ناکەی، وەحیی و (ذِکر) و قورئانت بۆ سەر دانەبەزێنراوە .

﴿ لَّوْ مَا تَأْتِينَا بِٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴾، دەبووایە فریشتانمان بۆ بێنی، ئەگەر تۆ لە ڕاستانی، واتە: ئەگەر تۆ لە ڕاستگۆیانی، لە ڕاستانی، کە خوا وەحیی بۆ تۆ ناردووەو تۆی کردۆتە پێغەمبەر ﷺ، ئەدی بۆچی فریشتانمان بۆ ناهێنی! ئنجا یان مەبەستیان ئەوە بووە: فریشتانمان بۆ بێنە، شایەدییت بۆ بدەن، یان مەبەستیان ئەوە بووە: فریشتان بێنە پێشانمان بدە، یا سزای خوامان بۆ بێنن، هەردوو واتاکان هەڵدەگرێ .

خوا وەڵامیان دەداتەوە، دەفەرموێ: ﴿ مَا نُنَزِّلُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴾ ئێمە فریشتەکان بە هەق نەبێ دانابەزێنین، واتە: فریشتەکان بۆ ئەنجامدانی ئەرکێک دێن، ئەوانیش ئەگەر فریشتە دابەزێنرێن بۆ لایان، بۆ سزا دانیان دێن. ﴿ وَمَا كَانُوٓا۟ إِذًا مُّنظَرِينَ ﴾ ئەگەر فریشتەکانیش دابەزێنرێن بۆ سزا دانی ئەوان - کە ئەوە ئەو هەقەیە لێرەدا لەبەرچاوگیراوەو ڕەچاوکراوە – ئەو کاتە

ئەوان چاوەڕوان ناکرێن، دواناخرێن، مۆڵەت نادرێن، بگەڕێنەوەو تۆبە بکەنو پەشێمان بنەوە، بەڵکو لەگەڵ فریشتەکان دابەزێنران، یەکسەر سزا دەدرێن.

﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴾ بێگومان ئێمە خۆمان (ذِکر)مان دابەزاندووەو، هەر ئێمەش بۆی پارێزەرین، واتە: خۆمان دەیپارێزین، هەڵبەتە ئەوەی خوا فەرموویەتی، زۆر بە ڕاستو ڕێکو ڕوونو بەرجەستەکراویی، دیارە کە قورئان خوا پاراستوویەتی، نەك ئایەتێك بگرە وشەیەكو پیتێکیشی، لێ زایە نەبووە، وەك چۆن پێغەمبەری خاتەم ﷺ لە جیبریلی وەرگرتووە، جیبریل لە خواوە هێناویەتی، ئاوا بەو شێوەیە ئێستا ئەم قورئانە لەبەردەستی ئێمە دایە، بێ کەمو زیاد، کە تاکە کتێبێکی خوا لەبەردەستی مرۆڤایەتییدا هەبێ، لێی دڵنیا بێ، کە ئەوە فەرموودەی خوایەو پەیامی خوایەو خوا چۆنی فەرمووە، بە جیبریلدا ناردوویەتیو، ئەویش بە پێغەمبەری خاتەم (موحەممەد ﷺ)ی گەیاندووەو، ئەویش بە هاوەڵەکانی گەیاندووە، ئەوانیش بە شوێنکەووتووانو، ئەوانیش شوێنکەوتووانی شوێنکەوتووان، تا گەیشتۆتە دەستی ئێمە، تاکە کتێبێك مرۆڤ لەبەردەستیدا هەبێو لێی دڵنیابێ: فەرمایشتی خوایە، ئەم قورئانەیەو، ئەوی دیکە هەمووی: لەبیرچوونەوەی تێدا ئەنجام دراوەو، گۆڕدراوەو، دەستکاریی کراوە، وەك خوا فەرموویەتیو واقیعو عەیانو ئاشکراشە :

هەر کەسێك سەرنجی پەیمانی کۆنو نوێی جوولەکەو نەصرانییەکان بدات، هەروەها ئەو کتێبانەی دیکە، کە پاڵ دەدرێنە لای خواو ئاسمان، بۆ وێنە (کەنزا ربا)ی صابیئەکانو، کتێبەکانی دیکەی کە بە هی خوای پەروەردگارو بە بەشێك لە وەحیی دادەنرێن، وەك (ئاڤێستا) هەموو ئەو شتانەی دیکە، زۆر بە ڕوونیی دەزانێ، کە ئەوەی شایستە بێ، بە وشەو فەرمایشتی خوا لە قەڵەم بدرێ، تەنیا ئەم قورئانەیە، ئەوی دیکە ئەگەر کەمو زۆر وەحییشی تێدا مابێ، بە تایبەتی پەیمانی کۆنو پەیمانی نوێ، بەڵام دڵنیاش دەبێ، کە فیکرو بۆچوونو قسەی بەشەریشی ڕەگەڵ کەوتووە، چونکە کە تەماشای دەکات، دەبینێ: شتی ناڕاستی تێدایە، شتی هەڵەی تێدایە، شتی گۆڕدراوی تێدایەو، شتی ناشایستی تێدایە، بەرانبەر بە خواو، بەرانبەر بە پێغەمبەرانی خوا، وەك لەو مەوسووعەیەدا کە

لە زیندانی ئەمریکییەکاندا نووسیومە: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)، لە باسی {بڕواهێنان بە کتێبەکانی خوا}[١]. لەوێدا زۆر بە وردیی باسم کردووەو هەردووك پەیمانی کۆنو پەیمانی نوێم، لەوێ لە تەتەڵەو بێژینگ داونو، نموونەی زۆرم تێدا خستوونە ڕوو، کە ناگونجێ ئەو شتانەی بە نموونەم هێناونەوە، فەرمایشتی خوا بن .

ئنجا خوا دەفەرموێ : ﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ فِي شِيَعِ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ بە دڵنیایی لە پێش تۆدا، لە کۆمەڵگا پێشووەکاندا، پێغەمبەرانمان، ڕەوانەکراوانمان، ناردوون، ﴿وَمَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ﴾ هیچ ڕەوانەکراوێکیشیان بۆ نەدەهات، مەگەر گاڵتەیان پێ دەکرد .

﴿كَذَٰلِكَ نَسۡلُكُهُۥ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ﴾ ئاوا دەیخەینە دڵی تاوانبارانەوە، چییان دەخەینە دڵ؟ ﴿لَا يُؤۡمِنُونَ بِهِۦ﴾ ئەوە کە بڕوای پێ ناهێنن، بە وەحییو پەیامی خوا، لە ئەنجامی تاوانباریی و زوڵمو خراپەکارییاندا، تاوانباریی بۆتە پەرچ کۆسپێك لە بەردەمیاندا، بۆتە پەردەیەکو حەقی لێ شاردوونەوە بۆیە بڕوای پێ ناهێنن .

یاخود: ﴿كَذَٰلِكَ نَسۡلُكُهُۥ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ﴾ واتە: ئاوا بەو شێوەیە گاڵتەکردن بە پەیامەکانی خواو، پێ بێبڕوابوونیان، دەخەینە دڵی تاوانبارانەوە، بەهۆی تاوانەکانیانەوە شایستەیی ئەوەیان نابێت، بێنە ڕیزی ئیماندارانەوەو، بڕوا بە پەیامەکانی خوا بێنن .

دوایی دەفەرموێ: ﴿لَا يُؤۡمِنُونَ بِهِۦ﴾ بڕوای پێ ناهێنن، ﴿وَقَدۡ خَلَتۡ سُنَّةُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ بە دڵنیایی یاسای پێشووان، ڕابردوە، واتە: یاسای خوا لە مامەڵەکردنی لەگەڵ گەلە پێشووەکاندا، تێپەڕیوە، کە بریتی بووە لەوەی: لە ئەنجامی زوڵمو تاوانو خراپەدا، بڕوا بە پێغەمبەران ناهێننو سەرەنجام شایستەی سزادان دەبن .

---

١) الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله عزّ وجلّ ، ط ٢ / ٢٠١٧ م .

﴿ وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا مِّنَ السَّمَاءِ فَظَلُّوا فِيهِ يَعْرُجُونَ ﴾، ئەگەر دەروازەیەکیان لە سەریەوە، لە ئاسمانەوە بەسەردا کردبانەوەو بەردەوام بان لە پێهەڵچوونو سەرکەوتن، بەو دەروازەیەدا، بەرەو ئاسمان، ﴿ لَقَالُوا إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَارُنَا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورُونَ ﴾ ئەو کاتەش دەیانگوت: ئێمە چاومان بەستراون، بەڵکو ئێمە کۆمەڵێکین جادوومان لێکراوە، واتە: دیسان بیانوویان دەگرتو بڕوایان نەدەهێنا، ئەگەر ڕێگاشیان درابایە بەرەو ئاسمان، بەرەو سەرێ بچن .

ئنجا خوا ﷻ، کۆمەڵێك لە چاکەو نیعمەتەکانی خۆی دەخاتە ڕوو، دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِي السَّمَاءِ بُرُوجًا ﴾ بە دڵنیایی ئێمە لە ئاسماندا کۆمەڵێك بورجمان داناون .

بورج دەگونجێ بە مانای ئەستێرە بێ، ئەستێرەو خڕۆکەکانو، دەگونجێ بە مانای قەڵا بێ، واتە: ئەو ئەستێرانە وەك قەڵان، دەشگونجێ مەبەست پێی ئەو شوێنو جێگاو ڕێگایانە بن، کە خۆر لە هەر مانگێکدا پێیاندا تێدەپەڕێ، کە دوازدە بورجن، یاخود مانگ لە هەر شەوێکدا، پێیاندا ڕەت دەبن کە بیستو هەشت بورجن، بیستو هەشت مەوقیعو شوێنن، ﴿ وَزَيَّنَّاهَا لِلنَّاظِرِينَ ﴾ ئێمە ئاسمانمان بۆ تەماشاکەران ڕازاندۆتەوە، جوانمان کردوە، ﴿ وَحَفِظْنَاهَا مِن كُلِّ شَيْطَانٍ رَّجِيمٍ ﴾ هەروەها ئاسمانمان پاراستوە لە هەر شەیتانێکی دەرکراوو دورخراوە لە بەزەییو لە خێرو چاکە .

﴿ إِلَّا مَنِ اسْتَرَقَ السَّمْعَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ مُّبِينٌ ﴾ مەگەر کەسێك بە دزیی گوێ لە شەیتانەکان بگرێ، گوێ هەڵبخات، بە پەنامەکییو، پەنهانیی گوێ بگرێ، تاکو زانیارییەك لە فریشتەکانەوە وەربگرێ، ﴿ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ مُّبِينٌ ﴾ ئەویش بڵێسەیەکی ئاگری ڕوون، دوای دەکەوێ، بۆ ئەوەی نەتوانی ئەو زانیارییە بدزێو بیگەیەنێ بە جادووگەرەکانو کاهینو فاڵچییەکان، وەك دوایی لە باسێکی سەربەخۆدا باسی ئەو مەسەلەیە دەکەین، ﴿ وَالْأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا

رَوَٰسِيَ ﴾، هەروەها زەویشمان درێژ کردۆتەوە، لێکمان کێشاوەتەوە، ﴿ وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ ﴾ چەندان چیای دامەزراو داکوتراوو مەحکەممان تێ فڕێدراون، ﴿ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَيْءٍ مَّوْزُونٍ ﴾ لە هەر شتێکی کێشراو، یان کێش زانراومان، لە زەویدا رواندوە کە مەبەست پێی ئەو رووەکانەن، کە بەرهەمەکانیان دەکێشرێن، یاخود خۆشیان، هەموویان ئەندازەگیریی کراون، کەواتە: ﴿ مَّوْزُونٍ ﴾ بە مانای (مُقَدَّر)، واتە: ئەندازەگیریی کراو، دێ، [redacted] دەبێ چەند بێ و چۆن بێ؟ هەروەها بەرهەمەکەیان چەند دەبێ و چۆن دەبێ؟ بە پێی پێداویستییەکانی مرۆڤ لەسەر زەوی .

﴿ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَٰيِشَ ﴾ هەروەها لە زەویدا بۆ ئێوە ئەو شتانەی کە پێیان دەژین، واتە: هۆکارەکانی ژیان و گوزەرانی ئێوەمان لە زەویدا، داناون، ﴿ وَمَن لَّسْتُمْ لَهُۥ بِرَٰزِقِينَ ﴾، کەسانێکیش کە ئێوە بژێوەریان نین، واتە: هی خۆتان و هی ئەوانەش کە ئێوە بژێویان نادەن، ئنجا [redacted] لێرەدا مەبەست پێی ئاژەڵ و پەلەوەرو دروستکراوەکانی دیکە بێ، ج مەبەست مرۆڤەکان بن ئەو کەسانەی کە ئێوە بژێویان نادەن، بەڵام خوا دەیانژیەنێ و بژێویان دەدا، ﴿ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ ﴾ هیچ شتێك نیە مەگەر عەمبارەکانی لەلای ئێمەن، ﴿ وَمَا نُنَزِّلُهُۥٓ إِلَّا بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴾ بە ئەندازەی زانراو نەبێ، نایەنێرینە خوار، هەر شتە بە ئەندازەی خۆی دەنێرینە خوار، بە ئەندازەیەك کە بۆ ژیانی مرۆڤ پێویستەو، لەگەڵ بەرژەوەندیی مرۆڤدا دەگونجێ.

﴿ وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَٰحَ لَوَٰقِحَ ﴾ بایەکانیشمان ناردوون موتوربەکەرن، ﴿ فَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ﴾ ئنجا لە سەرێوە ئاومان دابەزاندۆتە خوار، وەك زۆر جار گوتوومانە : ﴿ مَآءً ﴾ ئاو: لە شێوەی باران و، لە شێوەی بەفرو، لە شێوەی تەرزەدا، خۆی دەبینێتەوە، ﴿ فَأَسْقَيْنَٰكُمُوهُ ﴾ ئنجا ئەو ئاوەمان بە ئێوەمان نۆش کردوە،

پێمان خواردوونەوە. ﴿ وَمَآ أَنتُمۡ لَهُۥ بِخَٰزِنِينَ ﴾ بێگومان ئێوەش کۆکەرەوەو پارێزەرو هەڵگری ئەو ئاوەنین، کە بیپارێزن و هەڵیگرن، بەڵکو خوا ﷻ، وایکردوە کە ئەو توێخەی سەرەوەی زەوی، وەك عەمبارێك، ئەو ئاوە لە خۆی دا هەڵبگرێ، نەك بە ناخی زەویدا بچێتە خوار، بەڵکو هەڵیبگرێ‌و، دوایی لە شێوەی کانیی‌و سەرچاوە، یاخود بیرو کارێزدا، دێتەوە دەر .

﴿ وَإِنَّا لَنَحۡنُ نُحۡيِۦ وَنُمِيتُ وَنَحۡنُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ﴾، بێگومان هەر ئێمە دەژێنین‌و، هەر ئێمەش دەمرێنین‌و، هەر ئێمەش میراتگرین، واتە: دوای ئەوەی کە ئەم تۆمارەی ژیانی مرۆڤەکان‌و جندەکان، لەم سەرزەوییە دەپێچرێتەوە، تەنیا خوا وەك میراتگرێك لە کۆتایی دا دەمێنێ، وەك دەفەرموێ: ﴿ كُلُّ مَنۡ عَلَيۡهَا فَانٖ ۝٢٦ وَيَبۡقَىٰ وَجۡهُ رَبِّكَ ذُو ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ ۝٢٧ ﴾الرحمن، واتە: هەرچی لەو سەرزەوییەیە، لەبەین دەچێ، تەنیا پەروەردگارت کە خاوەنی هەیبەت‌و پایەی بەرزو شکۆو رێزگرتنە، بەس ئەو دەمێنێتەوە .

دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ عَلِمۡنَا ٱلۡمُسۡتَقۡدِمِينَ مِنكُمۡ وَلَقَدۡ عَلِمۡنَا ٱلۡمُسۡتَـٔۡخِرِينَ ﴾ بێگومان ئێمە پێشووەکانتانمان زانیون‌و، دوایەکانیشتمان زانیون، واتە: ئەوانەی کە پێشکەوتوون، لە جیلەکانی مرۆڤایەتیی، بە هەموو نەتەوەو زمانەکانەوە هەموویان دەزانین، ﴿ وَلَقَدۡ عَلِمۡنَا ٱلۡمُسۡتَـٔۡخِرِينَ ﴾، ئەوانەش کە دوایی دێن، ئەوانەش هەموویان دەزانین، یاخود ئەوانەتان دەزانین کە پێشکەوتوون لە چاکانداو، ئەوانەشتان کە لە چاکان بەدوا کەوتوون، ئەوانەش دەزانین، ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَحۡشُرُهُمۡۚ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٞ ﴾ بێگومان بەس پەروەردگارت کۆیان دەکاتەوەو خڕیان دەکاتەوە، بێگومان ئەو کارزانی زانایە .

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم :** ئایەتەکانی خوا، کتێبو قورئانێکی رۆشن پێکدێنن:

خوا دەفەرموێ : ﴿الٓر تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ وَقُرْءَانٍ مُّبِينٍ ①﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە بە پێزە ، لە سێ برگەدا :**

**برگەی یەکەم :** - کە دەفەرموێ : ﴿الٓر﴾ ئێمە لە سەرەتای سوورەتی (یونس)دا، بە درێژیی قسەمان کردوە، لەبارەی ئەو پیتە پچڕ پچڕانەوە، کە لە سەرەتای (٢٩) لە سوورەتەکانی قورئاندا هاتوون، گوتیشمان: ڕای بەهێزترو پەسەندتر ئەوەیە کە خوا ﷻ، لە ڕێی بەکارهێنانی ئەو پیتانەوە، بە مرۆڤەکان دەفەرموێ: ئەو قورئانەی کە ئێوە دەیخوێننەوەو، لە بەرانبەریدا دەستەوسانو دەستەپاچەن، هەر لەو پیتو دەنگانە پێکدێ، کە خۆتان قسەیان پێدەکەن، ئنجا مادام ئێوە نەتانتوانی قورئانێك، بەڵکو دە (١٠) سوورەت، بەڵکو سوورەتێکی، وەك قورئان بێنن، کەواتە: دڵنیابن کە ئەوە خوای پەروەردگارو بەدیهێنەرو بێ وێنەیە، کە لەو پیتو دەنگانە، قورئانو فەرمایشتێکی وای پێکهێناوەو فەرمووە، کە ئێوە لە بەرانبەر ئەوەدا، کە وێنەی ئەو بێنن، دەستەپاچەو دەستەوسانن، بۆیە: بزانن کە ئەوە فەرمایشتی خوایە .

**برگەی دووەم :** - ﴿تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ﴾ وەك پێشتر باسمان کرد، ئەوە ئاماژەیە بۆ دوور، یاخود مەبەست ئەوەیە، کە هەموو ئەو ئایەتانەی لە

ڕابردوودا، دابەزێنراون، نەك تەنیا ئەو ئایەتانەی کە لەم سوورەتی (الحجر)دا هاتوون، بەڵکو هەموو ئەوانەی کە پێشتر دابەزێنراون، تا ئەو کاتەی کە سوورەتی (الحجر) دابەزیوە، ئەوانە هەموویان ئایەتەکانی کتێبێکی ڕۆشنن .

**بڕگەی سێیەم :** - ﴿ وَقُرْءَانٍ مُّبِينٍ ﴾، هەروەها ئایەتەکانی قورئانێکی ڕۆشنن .

ئنجا وەك گوتمان: ئەو دوا پەیامەی کە خوا بۆ پێغەمبەری خاتەمی ﷺ ناردوە، کە کۆتا پەیامە، وەك چۆن موحەممەدیش کۆتا پێغەمبەرە ﷺ: هەم بە شێوەی نووسراو هەیە : ﴿ ٱلْكِتَٰبِ ﴾، {(كتاب) یانی: نووسراو}، هەم بە شێوەی خوێنراویش هەیە : ﴿ وَقُرْءَانٍ ﴾، ئنجا ئەو وەحیی‌و پەیامەی خوا، چ بە شێوە نووسراوەکەی، چ بە شێوە خوێنراوەکەی: ﴿ مُّبِينٍ ﴾ ڕوون‌و ڕۆشنە، هەرچەندە وەك گوتمان وشەی : ﴿ مُّبِينٍ ﴾، کە لە (أبانَ)ەوە هاتوە :

١- دەگونجێ لە (أبانَ)ی (لازم)ەوە بێ .

٢- دەشگونجێ لە (أبانَ)ی (مُتَعَدِّي)یەوە بێ، ئنجا ئەگەر لە (أبانَ)ی (لازم)ەوە بێ، واتە: ڕوون‌و ڕۆشن‌و ئاشکرا، بەڵام ئەگەر لە (أبانَ)ی (متَعَدّي)یەوە هاتبێ، واتە: ڕوونکەرەوەو ڕۆشنکەرەوە، بەڵام لێرە واپێدەچێ زیاتر مەبەست ئەوە بێ کە ئەم قورئانە، ئەم کتێبە کۆتاییەی خوا، زۆر ڕۆشن‌و ئاشکرایە، کە فەرمایشتی خوایەو پەیامی خوایە ﷻ .

**مەسەلەی دووەم :** بێبڕوایان کاتێک دێ، بۆ مسوڵمانەتیی ژیوان ببنەوە :

خوا دەفەرموێ : ﴿ رُّبَمَا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ كَانُواْ مُسْلِمِينَ ﴿٢﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە ، لە سێ بڕگەدا :**

**بڕگەی یەکەم :** - ﴿ رُّبَمَا ﴾ کە بە (رُبَمَا)ش خوێنراوەتەوە، (رُبَّ: لِلتَقلیل) (رُبَّ) بۆ شتێکە کەم بێ، ئەم تەعبیرەش لێرەدا توانج و بە تەوسەوەیە: وەك تۆ بە یەکێك دەڵێی: (لَعَلَّكَ سَتَندَمُ عَلَی فِعْلِكَ) ڕەنگە لەسەر کردەوەکەی خۆت پەشیمان ببیەوە، کە لێرەدا تۆ مەبەستت پێ گاڵتە پێکردنە، یانی: دڵنیای کە پەشیمان دەبێتەوە، بەڵام ئەو شێوازە بەکاردەهێنرێ، یانی: عەقڵی تۆ، ئەو شتە بە کەم دەزانیێ، بە زەحمەت لە عەقڵی تۆوە دەچێ، کە تۆ پەشیمان ببیەوە !!

لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ رُّبَمَا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ كَانُواْ مُسْلِمِينَ ﴾ ڕێی تێدەچێ، ئەوانەی بێبڕوان کاتێك بێ حەز بکەن، ئاوات بخوازن کە: بۆ خوا گەردنکەچ بوونایە .

بێگومان خوا ﷻ زانیاریی تەواوی هەیەو دەزانێ کە ئەوان ئەوە بە ئاوات دەخوازنو، کاتێك دێ لە کوفرەکەیان پەشیمان دەبنەوەو بۆ ئیسلامو بۆ ئیمان، ژیوان دەبنەوە، بەڵام بۆیە بەو شێوازە دەیفەرموێ، واتە: ئەوانە عەقڵەکەیان هێندە کۆڵە، هێندە دواکەوتوویە، کە مەگەر بە زەحمەت، ئەوەیان لە عەقڵەوە بچێ، ئەگەری ئەوە دابنێن: کاتێك بێ پەشیمان ببنەوە .

**بڕگەی دووەم :** - ﴿ يَوَدُّ ﴾، یانی: (يَتَمَنَّی)، یانی: حەز بکەن، خۆزگە بخوازن .

**بڕگەی سێیەم :** - ﴿ لَوْ كَانُواْ مُسْلِمِينَ ﴾، لێرەدا وشەی (لَو) بۆ خۆزگە خواستن (تَمَنِّي) بەکارهێنراوە، یانی: خۆزگە دەخوازن کە ملکەچ بوونایە، لێرەدا ﴿ مُسْلِمِينَ ﴾ بە مانای: ملکەچ بووان بۆ خوایە، هەڵبەتە مسوڵمانانیش بۆیە ئەو ئاوەیان هەیە، چونکە بۆ خوا ملکەچن .

ئەو خۆزگە خواستنەی کافرانو، پەشێمان بوونەوەیان بۆ ئیمانو ئیسلام لە چەند شوێنێکی قورئاندا، هاتووە بۆ وێنە :

أ/ ﴿ وَيَوْمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَٰلَيْتَنِى ٱتَّخَذْتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلًا ﴿٢٧﴾ يَٰوَيْلَتَىٰ لَيْتَنِى لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ﴿٢٨﴾ ﴾الفرقان، واتە: ئەو ڕۆژەی کە ستەمکار هەردوو دەستی خۆی دەگەزێو، دەڵێ : خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەردا ڕێگام بگرتبایە بەر، ئەی هاوارا خۆزگە فلانکەسم بە دۆست نەگرتبایە (کە لە خواو پێغەمبەری خواو، لە ڕێی خوا دووری خستمەوە) .

ب/ هەروەها لە سووڕەتی (الأنعام)دا، دەفەرموێ : ﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ وُقِفُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُوا۟ يَٰلَيْتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾، واتە: ئەگەر تۆ بیانبینی (بێبڕوایەکان) کاتێك کە لەسەر قەراغی دۆزەخ ڕادەگیرێن، دەڵێن : خۆزگە بگێڕدرێینەوەو ئایەتەکانی پەروەردگارمان بە درۆ دانەنێینو لە بڕواداران بین (خۆزگە ئەوەمان بۆ بکرێ) .

ج/ هەروەها دەفەرموێ : ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ٱرْجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّىٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ﴿١٠٠﴾ ﴾المؤمنون، واتە: هەتا کاتێك یەکێکیان مردنی دەگاتە سەر، دەڵێ: پەروەردگارم بمگێڕنەوە، بەڵکو کردەوەی باش بکەم لەو ژیانی دنیایەدا کە بەجێمهێشتوە .

خوای پەروەردگاریش وەڵام دەداتەوەو دەفەرموێ : ﴿ كَلَّآ ۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا ۖ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴾، واتە: نەخێر بەڵکو ئەوە قسەیەکە هەر خۆی دەیکا (واتە: کەس گوێی پێنادا، قسەیەکی بێ سوودە، چونکە لە کاتێکدا دەیکاو لە شوێنێکدا دەیکا، کە نە کاتیەتیو نە شوێنیەتی)و، لە پشتیانەوەش پەردەیەك هەیە، هەتا ئەو ڕۆژەی تێیدا زیندوو دەکرێنەوە، {کە قۆناغی بەرزەخەو قۆناغێکی ڕاگوزەر(مرحلة آنتقالیة)ە، لە نێوان ژیانی دنیاو ڕۆژی دوایدا} .

**مەسەلەی سێیەم :** ئەوانەی لە ژیانیاندا ئامانجیان خواردن‌و خواردنەوەو چێژوەرگرتنی جەستەییە، ئومێدی گەڕانەوەیان كەم لێ دەكرێ :

خوا دەفەرمویٚ : ﴿ ذَرْهُمْ يَأْكُلُوا۟ وَيَتَمَتَّعُوا۟ وَيُلْهِهِمُ ٱلْأَمَلُ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ  ﴾

**شیكردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەكە ، لە چوار بڕگەدا :**

**بڕگەی یەكەم :** - ﴿ ذَرْهُمْ ﴾ واتە: لێیانگەڕێ، وازیان لێبێنە، (ذَرْ بِمَعْنَى: أُتْرُكْ، لَيْسَ لَهُ ماضٍ، وَالمَقْصُودُ لازِمُهُ، أي: قِلَّة الجَدْوَى)، (ذَرْ) بە مانای: لێبگەڕێ، وشەی (ذَرْ) كرداری فەرمانەو ڕابردووی نییە، بەلاّم (مضارع)ی هەیە، (يَذَرُهُمْ) لێیاندەگەڕێ، لێرەدا مەبەست لە: ﴿ ذَرْهُمْ ﴾ وازیان لێبێنە، واتە: گرنگییان پێ مەدە، سوودی نیە، لەگەڵ خەریك بوونیان‌و لەگەڵ هەوڵدانیان، سوودی نیە، ئەگەرنا مەبەست ئەوە نیە: كە هەر لێیانگەڕێ، چونكە پێغەمبەرﷺ، بۆ ئەوە نێردراوە كە ئەو خەڵكە ئاگادار بكاتەوە، تێیانبگەیەنێ و بەرچاو ڕوونیان بكاتەوە، بیانوویان نەهێڵێ .

**بڕگەی دووەم :** - ﴿ يَأْكُلُوا۟ وَيَتَمَتَّعُوا۟ ﴾ بخۆن‌و ڕابوێرن، واتە: لێیانگەڕێ با هەر خەریكی خواردن‌و خواردنەوە، خەریكی ڕابواردن‌و خزمەتی جەستەیان بن، چونكە عەقڵیان هەر ئەوەندە بڕ دەكات‌و، هەروا لە ژیان تێگەیشتوون .

ئەمە وەك لە شیعری عەرەبییدا هاتووە، یەكێك لە شاعیرەكان سەرزەنشتی ئەوی دیكە دەكات، دەڵێ :

المَكارِمَ لا تَنهضِ لبُغْيَتِهـا

واقعُدْ فإنَّكَ أنتَ الطَّاعِمُ الكاسي

واتە :

لە ئاکارە بەرزەکان گەڕێو، هەڵمەستە بۆ داواکردنیان

دانیشە بێگومان تۆ شایستەی ئەوەی هەر بخۆیو بەرگی جوان بپۆشی

هەروەها ئافرەتێك کە سەرزەنشتی برایەکەی دەکات، لە ئەنجامی ئەوەدا کە هەڵنەستاوە بە تۆڵەستاندنەوە بۆ کەسێکیان، کە بە حیساب بە ناهەق کوژراوە، دەڵێ :

وَدَعْ عَنْكَ عَمْراً إنَّ عَمْراً مُسَالِمٌ

وَهَلْ بَطْنُ عَمْرٍ غَيْرُ شِبْرٍ لِمَطْعَمِ

واتە :

لە عەمر بگەڕێن عەمر پیاوێکی ئاشتیخوازە

ئایا گەدەی عەمر، جگە لە بستێك کە خواردنی تێبکات، چیدیکەیە؟!

یانی ئەوە عادەتێکی لەمێژینەی گەلان بووە، کە ئەگەر کەسانێك، بەس خەریکی خواردن‌و خواردنەوەو عەیش‌و نۆش بووبن، زەم‌و سەرزەنشت کراون، خواش دەفەرموێ: لەوانە بگەڕێ با هەر بخۆن‌و بخۆنەوەو ڕابوێرن .

<u>بڕگەی سێیەم</u> : ﴿ وَيُلْهِهِمُ ٱلْأَمَلُ ﴾ با ئاوات‌و خۆزگەی بۆش بیانخافڵێنێ .

الأَمَلُ: مَصْدَرٌ، وَهُوَ ظَنُّ حصولِ أمرٍ مَرغوبٍ فيه مَعَ استبعادِ حصولِهِ) (أَمَلُ) چاوگە، بریتییە لە گومانی پەیدا بوونی شتێك، کە ئارەزووی بۆ دەکرێ، بەڵام لە واقیعدا بە دوور بزانرێ، ئەو شتە پەیدا ببێ، دەگوترێ : (آمل) : ئەمەلم هەیە، ئەوە لە کاتێکدایە ئەو شتە لە واقعدا دوور بێ پەیدابێ، هەرچەندە شتەکە خۆی لە خۆیدا شتێکی ئارەزوو بۆکراو بێ، بەڵام ئومێد (رَجَاء) بە پێچەوانەوە، ئەوەیە کە ئەگەری پەیدا بوونی ئەو شتە زیاتر بێ، ئەو کەسەش کردەوەو هەڵوێستی وا لە خۆی پێشان بدات، کە زەمینە خۆشکەر بێ بۆ هاتنەدی ئەو ئومێدە .

هەڵبەتە لە زمانی كوردیی دا هەم بۆ (رَجاء)، هەم بۆ (أمَل) هەر ئومێدو هیواو ئاوات بەكاردەهێنرێن، بەڵام من بۆ وشەی (أمَل) (ئاوات)م بەكارهێناوە چونكە دەگوترێ: ئەو شتە بە ئاوات دەخوازم، بەڵام بۆ (رَجاء) دەگونجێ لە زمانی كوردیی دا (هیوا) و (ئومێد) بەكاربێن .

**برگەی چوارەم :** - ﴿ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴾ واتە: لەمەودوا دەزانن، چی دەزانن؟ دەزانن كە چەندە بەهەڵەداچوون! چونكە مرۆڤ تەنیا بۆ ئەوە دروست نەكراوە: بخواو بخواتەوەو رابوێرێ، مرۆڤ تەنیا جەستە نیە، تاكو تەنیا سەرگەرمی تێركردنی جەستەو غەریزەكانی بێت، بەڵكو لە راستیی دا مرۆڤ بە رووحەوە مرۆڤە، ئەگەرنا وەك تێركردنی جەستەو غەریزەكانی، خاڵی هاوبەشی نێوان مرۆڤو سەرجەم دروستكراوەكانی دیكەی خوایە، لەسەر زەوی، بە پەرندەو ئاژەڵو درندەو زیندەوەرو هەموویانەوە، بەڵام ئەوەی كە مرۆڤ لە دروستكراوەكانی دیكە جیا دەكاتەوە، ئەو رووحەیە كە خوا ﷻ بەتایبەت دروستی كردوەو، بە بەرجەستەی مرۆڤی داكردوەو، بەو رووحە، مرۆڤ بۆتە مرۆڤ .

كەواتە: تەنیا بە تێركردنی ئەو رووحەو، شادكردنی ئەو رووحەو، خزمەتكردنی ئەو رووحەش، مرۆڤ ، مرۆڤ دەمێنێ، هەر بۆیەش خوا ﷻ، ئەوانەی بێبڕوان و ژیانی دنیا تەنیا لە رابواردن و خواردن و خواردنەوەو تێركردنی غەریزەكانیاندا دەبینن، وەك ئاژەڵ وێنای كردوون، بۆ وێنە :

١) خوا دەفەرموێ : ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ ٱلْأَنْعَٰمُ وَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ﴿١٢﴾ ﴾محمد، واتە: ئەوانەی بێبڕوان: رادەبوێرن و دەگوزەرێنن و چێژ وەردەگرن و دەخۆن، وەك چۆن ئاژەڵ دەخوات و، ئاگریش جێگاو رێگایانە .

ب) هەروەها خوا عز و جل لە سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿ وَذَرِ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمْ لَعِبًا وَلَهْوًا وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ﴿٧٠﴾ ﴾، واتە: واز لەوانە بێنە كە ئایینەكەی خۆیانیان، كردوە بە مایەی گەمەو خافڵان و، ژیانی دنیایان بێئاگای كردوون .

هەڵبەتە لێرەدا کە دەفەرمویٚ : لێیانگەڕیٚ، وەك پێشتر باسمان کرد، مەبەست لە لێگەڕان ئەوە نیە کە یەکجاریی وازیان لێبینیٚ، ئەدی خوای پەروەردگار پێغەمبەری ﷺ بۆچی ناردوە؟ بێگومان بۆ ئەوەی خەڵك ئاگادار بکاتەوەو بترسێنیٚو هۆشیاریان بکاتەوە، تاکو خەڵك بۆ لای خوا بانگ بکات، بەڵام لێرەدا مەبەست ئەوەیە، کە ئەوانە وا بە ڕابواردنو گوزەرانی ماددیی دا چوونە خوار، وا بە خزمەتکردنی جەستەو غەریزەکانیانەوە سەرقاڵ بوون، کە هەوڵدانی تۆ لەگەڵیاندا بێسوودە، واتە: ئەو تەعبیرە لێرەدا: بۆ وێناکردنی حاڵەتی ئومێد لێنەکراوو، خێر تێدا ڕەچاونەکراوی ئەوانە، نەك مەبەست ئەوە بیٚ کە پێغەمبەر ﷺ، لێیانگەڕیٚو پشتیان تێبکاتو وازیان لێبێنیٚ ! مەگەر کەسێك یان کۆمەڵێك کە پێغەمبەر ﷺ، تێیاندا گەیشتبێتە دڵنیایی، کە بێسوودە لەگەڵیان خەریك بیٚ، ئەو کاتە نابیٚ کاتی خۆییان لەگەڵ بەفیڕۆ بدات، وەك لە سوورەتی (النجم)دا خوا دەفەرمویٚ :

﴿ فَأَعۡرِضۡ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكۡرِنَا وَلَمۡ يُرِدۡ إِلَّا ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ﴿٢٩﴾ ﴾، واتە: واز لەو کەسە بێنە کە پشتی لە بەرنامەی ئێمە کردوەو، تەنیا ژیانی دنیای دەویٚ .

یانی: کاتی خۆت لەگەڵ ئەواندا بەفیڕۆ مەدەو، لەگەڵ کەسانێکی دیکەدا خەریك بە، کە ئومێدێك هەبیٚ لەوەدا کە بەهرە وەربگرن، سوود ببینن، بەڵام کەسێك کە بزانی تازە بێسوودە، وەك پێشینان گوتوویانە: (تۆز لە قوڕیٚ هەڵناستیٚ)، (ئاگر لە ئاویٚ پەیدا نابیٚ)، کەسێك تێیدا گەیشتیە دڵنیایی، وا باشە چیدیکە کاتی خۆتی لەگەڵ بەفیڕۆ نەدەیو، بگوازیەوە بۆ کەسانێکی دیکە، کە چاوەڕوانیی ئەوەیان لیٚ دەکریٚ، بەهرە وەربگرن .

**مەسەلەی چوارەم :** سزادانی خوا، بۆ هەر ئاوەدانییەکی یاخیی، کاتێکی دیاریکراوی هەیەو پێشو پاش ناکات :

خوا دەفەرمویٚ : ﴿ وَمَآ أَهۡلَكۡنَا مِن قَرۡيَةٍ إِلَّا وَلَهَا كِتَابٞ مَّعۡلُومٞ ﴿٤﴾ مَّا تَسۡبِقُ مِنۡ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ ﴿٥﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە بەپێزە، لە سێ بڕگەدا :**

**بڕگەی یەکەم :** ﴿ وَمَآ أَهۡلَكۡنَا مِن قَرۡيَةٍ إِلَّا وَلَهَا كِتَابٌ مَّعۡلُومٌ ﴾، هیچ ئاوەدانیی‌و شارێکی قەلەبالغمان نەفەوتاندووە لە ڕابردوودا، مەگەر بە پێی (نەخشەو) نووسراوێکی زانراو بووە.

واتە: خوا ﷻ، لە بەرنامەو نەخشەی خۆیدا لەبارەی دروستکراوەکانی‌و نەتەوەکانەوە، بۆ فەوتاندنی هەر ئاوەدانییەکی یاخی، کاتێکی دیاریکراوی داناوە، بەڵام بێگومان مەرج نیە، مەبەست ئەوە بێ، کتێبێك هەبێ‌و خوای پەروەردگار ئەو شتانەی تێدا نوسیبن، بەڵام لەبەرئەوەی ئێمە وا حاڵی دەبین، کە شتێك ئەگەر لە کتێبدا نووسیمان‌و تۆمارمان کرد، دەپارێزرێ لەوەی لەبیرمان بچێ‌و بفەوتێ، بۆیە خوای کاربەجێ بەپێی عەقڵی ئێمە، ئێمە دەدوێنێ، ئەگەرنا خوا ﷻ، نە پێویستیی بە لیستێکەو، نە پێویستی بە شتێکە زانیارییەکانی خۆی تێدا تۆمار بکات، هەر بۆیە وشەکانی: (اللَّوح المَحفوظ)و (كِتَابُ مُبِين)و (إمَام مُبِين)، بە ڕای زۆرێك لە زانایان زانیاریی بێ سنووری خوایە منیش هەر ئەوەم پێ ڕاستە، مەگەر دەقێك هەبێت، یەکێك لەو شتانە تەحدید بکات کە دروستکراوێکی خوایەو هەیە، ئەگەرنا زیاتر مەبەست لەو تەعبیرانە زانیاریی بێسنووری خوایە، کە گۆڕانی بەسەردا نایەت، وەك چۆن شتێك کە لە کتێبێکدا بنووسرێ، ئەو زانیارییە گۆڕانی بەسەردا نایەت‌و ڕەش نابێتەوەو لەبیر ناچێ، بۆیە خوا ﷻ، دەیچوێنێ بە (كِتاب)ەوە، کتێبێکەوە کە زانراوەو زانیارییەکانی تێدا تۆمارکراون .

**بڕگەی دووەم :** ﴿ مَّا تَسۡبِقُ مِنۡ أُمَّةٍ أَجَلَهَا ﴾ هیچ کۆمەڵگایەك پێش کاتی خۆی ناکەوێ، ئەو کاتەی کە بۆی دیاریکراوە بۆ فەوتاندنی، لە پێش ئەو کاتەدا نافەوتێ، هیچ کۆمەڵگایەك پێش کاتی لەبەین چوون (أجل)ی ناکەوێ .

**برگەی سێیەم :** ﴿وَمَا يَسْتَـْٔخِرُونَ﴾ هەروەها ئەو خەڵکە دواش ناکەون، لەو کاتەی کە بۆیان دیاریکراوە، یانی: ڕێك لەو کاتەدا کە خوا بۆی دیاریکردوون، لەبەین دەچن، نە لێی پێش دەکەونو نە لێی دوا دەکەون .

لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە کە خوا پێشێ دەفەرموێ : ﴿مَّا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا﴾، دوای ویش دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَسْتَـْٔخِرُونَ﴾، زانایان گوتوویانە: (أُنِّثَ مُفْرَداً ضَمِيرُ الأُمَّةِ مَرَّةً، مُرَاعَاةً لِلَّفْظِ ،وَجُعِلَ جَمْعَ مُذَكَّرٍ سَالِمٍ مُرَاعَاةً لِلْمَعْنَى)، واتە: جارێك ڕاناوی تاکی مێینە بۆ ئۆممەت بەکارهاتوە {﴿مَّا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ﴾ ڕاناوەکەش کە لە نێو ﴿تَسْبِقُ﴾دا هاتوە یانی: هیچ کۆمەڵگایەك پێش ناکەوێ لە ئەجەلی خۆی}، چونکە ڕەچاوی بێژەی ئۆممەت کراوە ئۆممەت لە ڕووی بێژەییەوە (المُؤَنَّث المجَازِي)یە، بەلام دوایی کە ڕاناوی: (جَمْع مُذَكَّرٍ سالم) بەکارهاتوە: ﴿وَمَا يَسْتَـْٔخِرُونَ﴾ لێرەدا ڕەچاوی واتاکەی کراوە، چونکە ئۆممەت کۆمەڵە خەڵکێکە، کە ڕاناوی کۆیان بۆ بەکاردێ، ﴿وَمَا يَسْتَـْٔخِرُونَ﴾، یانی: (وَمَا يَستَئخِرُون عَنْ أَجَلِهِم) لە کاتەکەیان دوا ناکەون، لە کاتی فەوتێنرانیان.

**مەسەلەی پێنجەم :** بێبڕوایان موحەممەد ﷺ یان، تۆمەتبار کردوە بە شێتییو، داوای دابەزینی فریشتانیان کردوە، خوواش هەڕەشەی لێکردوون، کە فریشتان تەنیا بۆ سزادان دەنێرێو، ئەو کاتەش مۆڵەتیان نادات تۆبە بکەنو بگەڕێنەوە :

خوا دەفەرموێ : ﴿وَقَالُوا۟ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِى نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلذِّكْرُ إِنَّكَ لَمَجْنُونٌ ﴿٦﴾ لَّوْ مَا تَأْتِينَا بِٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿٧﴾ مَا نُنَزِّلُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَمَا كَانُوٓا۟ إِذًا مُّنظَرِينَ ﴿٨﴾﴾.

**تــوێــژینــەوەی ئــەم ســێ ئــایــەتــە بــەپــێــزە ، لــە شــەش بــڕگــەدا:**

**بڕگەی یەكەم :** ﴿ وَقَالُوا۟ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِى نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلذِّكْرُ ﴾، واتە: گوتیان ئەی ئەو كەسەی (ذِكر)ی دابەزێنراوەتە سەر!

وەك پێشتر گوتمان: ئەمە جۆرێكە لە گاڵتە پێكردن، چونكە ئەگەر قەناعەتیان وا بووبێ كە موحەممەد ﷺ، قورئانی بۆ دابەزێنراوە ئەو كاتە دەبوونە بڕوادار، بەڵام لێرەدا واتە: ئەی ئەو كەسەی كە وا خەیاڵ دەكات، وا لە خۆی حاڵییە كە (ذِكر)و فەرمایشتو بەرنامەی خوای بۆ دابەزێنراوە !

**بڕگەی دووەم :** ﴿ إِنَّكَ لَمَجْنُونٌ ﴾، بە دڵنیاییی تۆ شێتی، هەڵبەتە تۆمەتباركردنی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ، بە شێتیی، شێتییە، شێتیی ئەوەیە كە موحەممەد ﷺ، بە شێتیی تۆمەتبار بكرێ .

وشەی (جُنُون)یش لە زمانی عەرەبییدا هەر لە (جُنَّ)ەوە دێ، واتە: هەرگیز بە بكەرزانراو (مَعلُوم الفاعل) نەهاتووەو هەر بە (مَجهُول الفاعل) هاتوە، چونكە ئەوان قەناعەتیان وابووە كەسێك كە شێت دەبێو عەقڵی تێكدەچێ، لەلایەن جندە شەیتانەكانەوە، دەستی لێ دەوەشێنرێو تێكدەچێ .

**بڕگەی سێیەم :** ﴿ لَّوْ مَا تَأْتِينَا بِٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ ﴾، [﴿ لَّوْ مَا ﴾ بە مانای (لولا)یە، یانی: دەبووایەو بۆ هاندان (تحضیض)ە]، واتە: دەبووایە فریشتانمان بۆ بێنی، هەڵبەتە ئەمە بیانوویەكی لەمێژینەی كافرەكانەو لە سەردەمی هەموو پێغەمبەراندا، بێبڕوایەكان ئەو بیانوویان هێناوەتەوە، بۆ وێنە : ﴿ وَقَالُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ مَلَكٌ ۖ وَلَوْ أَنزَلْنَا مَلَكًا لَّقُضِىَ ٱلْأَمْرُ ثُمَّ لَا يُنظَرُونَ ۝٨ وَلَوْ جَعَلْنَـٰهُ مَلَكًا لَّجَعَلْنَـٰهُ رَجُلًا وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ ۝٩ ﴾الأنعام ، وەك لە

بەرگی پێنجەمی ئەم تەفسیرە (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز)دا، لە ڕوونکردنەوەو شیکردنەوەی ماناو مەبەستەکانی ئایەتەکانی سووڕەتی (الأنعام)دا، بە تەفصیل باسمان کردوە.

واتە: کافرەکان گوتیان : دەبووایە فریشتە دابەزێتە سەری، (خوا دەفەرموێ :) ئەگەر ئێمە فریشتەمان دابەزاندبایە، کارەکە تەواو دەبوو، (واتە: سزادەدران)، دوایی مۆڵەتیش نەدەدران، ئنجا ئەگەر ئەو پێغەمبەرەمان ﷺ، کردبایە فریشتەش، دەبوو کردبامان بە پیاو، {واتە: دەبوو خستبامانە سەر شێوەی پیاوێك، چونکە هەمیشە فریشتەکان هەن، بەلام لەسەر شێوەی ڕاستەقینەی خۆیان نابینرێن، مەگەر خوا بیانباتە سەر شێوەی پیاوێك ، یاخود شێوەی دروستکراوێکی دیکە، کە لەگەڵ ناستی پاكو بەرزی فریشتاندا بگونجێ} ئەو کاتەش ئەوەی ئێستا ئەوان لە خۆیانی تێکەڵ دەکەن، دیسان لێیان تێکەڵ دەبوو .

واتە: ئەو کاتە ئەگەر ئەو فریشتەیەی دەچێتە سەر شێوەی پیاوێك، گوتبای: من فریشتەم، دەیانگوت: بۆچی قسەی وا دەکەی، بۆچی درۆ دەکەی؟ تۆش وەك ئێمە مرۆڤێکی پیاوی، ئەو کاتە هەر لێیان تێکەڵ دەبۆوە، واتە: هەتا نەچووبایە سەر شێوەی مرۆڤێك یان پیاوێك، نەیاندەتوانی بیبینن و، کە چووبایە سەر شێوەی مرۆڤیش، دیسان لێیان تێکەڵ دەبوو، نەیاندەتوانی بزانن کە ئەوە فریشتەیەو بۆتە مرۆڤ .

<u>**برگەی چوارەم :**</u> ﴿إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴾، واتە: ئەگەر تۆ لە ڕاستانی، فریشتەمان بۆ بێنە، یانی: ئەگەر فریشتان نەهێنی شایەدییت بۆ بدەن، یان فریشتان نەهێنی سزامان بدەن، تۆ ڕاست نیو، لە ڕاستان نی، ئەوە وەك لە کوردەواریی دا گوتراوە: (کەری دێزە حەز بە مەرگی خۆیو زەرەری خاوەنی دەکات)، گوتوویانە: با فریشتە بێن سزامان بدەن، ئەو کاتە بۆمان دەردەکەوێ، کە تۆ ڕاستی! ئاخر ئەگەر فریشتە نێردران، ئەو کاتە ئێوە لەبەین دەچن، وەك دەفەرموێ :

**برگەی پێنجەم :** ﴿ مَا نُنَزِّلُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴾، فریشتان دانابەزێنین، مەگەر بە هەق، واتە: بۆ ئەنجامدانی ئەرکێکی هەقو ڕاست، کە ئەویش بریتییە لە لەبەینبردنی تاوانباران .

﴿ مَا نُنَزِّلُ ﴾، بە چوار شێوە خوێندراوەتەوە :

١/ خوێنراوەتەوە : ﴿ مَا نُنَزِّلُ ﴾.

٢/ هەروەها خوێنراوەتەوە: ﴿ مَا تَنَزَّلُ المَلائِكَةُ ﴾، کە ئەو کاتە ﴿ المَلائِكَة ﴾، دەبێتە (فاعل): ﴿ مَا تَنَزَّلُ المَلائِكَةُ ﴾، فریشتەکان دانابەزن .

٣/ هەروەها خوێنراویشەتەوە : ﴿ مَا تُنْزَلُ ﴾، یانی: فریشتە دانابەزێنرێن .

٤/ هەروەها خوێنراویشەتەوە : ﴿ مَا نُنْزِلُ ﴾ یانی: فریشتان دانابەزێنین .

کە دەفەرموێ : ﴿ مَا نُنَزِّلُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴾، (وَالمُرَادُ بـ الحَقّ هُنا الشيءُ الحَاقّ ، أي المَقْضِيُّ، مثل إطْلاقِ القَضَاء بمَعْنَى المقضيّ، وَهُوَ هُنا صِفَةٌ لِمَحْذُوفٍ يُعْلَمُ مِنَ المَقَام ، أي العَذَابِ الحَاقّ)، ﴿ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴾ واتە: شتێك كە بچەسپێ، ئەویش بریتییە لە بڕیار لەسەردراو، ئەمە لێرەدا وەك بەكارهێنانی وشەی (قضاء)ە، بۆ (مَقْضِي)، (قَضَاء) واتە: بڕیار، (مَقْضِي) واتە: بڕیار لەسەردراو، وشەی (حَق)یش لێرەدا سیفەتە بۆ شتێك، كە فڕتێنراوە، بەڵام بەپێی مەقامو سیاق دەزانرێ، واتە: (عَذَاب)، (أي: العَذَابِ الحَاقّ)، یانی: سزایەکی چەسپاو، وەك خوا ﷻ، لە شوێنی دیکە، دەفەرموێ: ﴿ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ ﴿١٨﴾ ﴾الحج، واتە: زۆریش (لە کافران) سزایان لەسەر چەسپاوە، واتە: بڕیاری سزادانیان لەسەر چەسپاوە .

بڕگەی شەشەم : ﴿ وَمَا كَانُوٓاْ إِذٗا مُّنظَرِينَ ﴾، ئەو کاتەش ئەوان دوا نەدەخران، (الإنْظَارُ: التَّاخِيرُ)، (إنْظَارُ) بە مانای دواخستن دێ، واتە: مۆڵەت دران، بۆچی دوابخرێن ؟ بۆ ئەوەی: بگەڕێنەوەو پەشێمان بنەوە .

مەسەلەی شەشەم : خوا خۆی قورئانی بیرخەرەوەی دابەزاندووە، هەر خۆشی پارێزەریەتی :

خوا عزّ وجلّ فەرموویەتی : ﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ٩ ﴾.

شیکردنەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە ، لە سێ بڕگەدا:

بڕگەی یەکەم : - ﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ ﴾ ئێمە خۆمان یادخەرەوە، (ذکر)مان دابەزاندوە .

ئەمە بەرپەرچدانەوەی گاڵتە پێکردن و تۆمەتبارکردنی کافرەکانە، گاڵتە پێکردن و تۆمەتبارکردنیان، بۆ پێغەمبەر ﷺ.

واتە: نەخێر، موحەممەد ﷺ، نە وایە کە لەخۆوە قورئانی فەرموو بێ و هی خوا نەبێ و، نە واشە کە شێت بێ، واتە: هەم گاڵتە پێکردنەکەتان و، هەم تۆمەتبار کردنەکەتان، هەردووکیان بێجێن، بەڵکو ئێمە خۆمان (ذکر)مان دابەزاندوە .

بڕگەی دووەم : - ﴿ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴾، هەروەها تەنیا خۆشمان پارێزەرینی .

ئەگەر بگوترێ: بۆچی خوا ﷻ، بەرپەرچی ئەوەی نەداوەتەوە، کە گوتوویانە: با فریشتان دابەزن، فریشتان بێنە ؟

وەڵام: لەبەرئەوەی لە زۆر شوێنی دیکەدا خوا ﷻ، بەرپەرچی داوەتەوە وەك پێشتر ئایەتەکانی سوورەتی (الأنعام)مان بە نموونە هێنانەوە .

هەروەها لە سووڕەتی (الإسراء)یشدا، خوا دەفەرموێ : ﴿ قُل لَّوْ كَانَ فِي الْأَرْضِ مَلَائِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ السَّمَاءِ مَلَكًا رَّسُولًا ﴿٩٥﴾ ﴾، واتە: بڵێ: ئەگەر لەسەر زەوی فریشتە ببوونایە، بە ئارامیی ڕۆیشتبان، ئەوە پێغەمبەرێکی فریشتەمان لە ئاسمانەوە بۆ دەناردن .

واتە: بەڵام فریشتە ژیانیان لەسەر زەوی نیە، مەگەر ئەوەندەی کە پەیوەندیی بە مرۆڤەکانەوە هەبێ، ئەگەرنا فریشتەکان لە ئاسمانن‌و بە کەڵکی ژیانی سەر زەوی نایەن، بۆیە ئێمە پێغەمبەران لە مرۆڤەکان دەنێرین، نەك لە فریشتان .

ئنجا بێگومان حیکمەتی ئەوەش کە پێغەمبەران لە مرۆڤەکانن، ئەوەیە کە: هەست‌و نەستیان وەك وان بێ، هەست بە ئازار بکەن، هەست بە خۆشیی بکەن، هەست بە ناخۆشیی بکەن، پێداویستییەکانیان وەك هی ئەوان بن، وەك ئەوان خاوەنی جەستەو غەریزەکان بن، خاوەنی ڕووح (نەفس) بن، ئەگەرنا ئەگەر خوا ﷻ، پێغەمبەرانی لە جۆری دیکەی دروستکراوەکانی ناردبانایە، بۆیان هەبوو بیانوو بگرن، بڵێن: ئێمە مرۆڤین‌و هەست بە ئازار دەکەین‌و، برسییمان دەبێ‌و تێنوومان دەبێ، تووڕە دەبین، خەومان دێ ....هتد، بەڵام ئێوە وا نین، بۆیان هەبوو ئەوکات ئەو بیانووانە بێننەوە .

لێرەدا بەسەرهاتێك دێنم کە (القرطبي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا، بە سەنەدی خۆی هێناویەتی‌و زنجیرەی گێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتە، دەباتەوە سەر ئافرەتێك کە بە: (الشيخة العالمة: فَخرُ النساء شَهْدَةُ بِنْتِ أبي نَصر أحمَد بن أبي الفَرَج الدينَوَري)[1]، لە ماڵی ئەو ئافرەتە، لە (دار السلام)، واتە: لە بەغدا، لە ساڵی (٥٦٤)ی کۆچیی دا، ئەوەی گێڕاوەتەوەو سەنەدەکەی دەباتەوە سەر (المأمون)، یەکێك لە حوکمڕانانی عەبباسییەکان، دەڵێ:

---

١) الجامع لأحكام القرآن، ج ١٠، ص ٦.

مەئموون کابرایەکی جوولەکە دەبینێ، کە بەرگو پۆشاکێکی جوانو بۆنخۆشو شێوەیەکی ڕێکو پێکو عاقڵانەی هەبووەو، لە مەجلیسەکەیدا دادەنیشت، ڕۆژێك مەئموون پێی دەڵێ: فڵانکەس بۆچی مسوڵمان نابی؟

ئەویش دەڵێ: ئێمەش هەر بە دوای کتێبی خوا کەوتووینو، بە دوای کتێبی ئاسمانیی کەوتووین، بە هەرحاڵ مسوڵمان نابێ... دوایی ماوەیەکی پێدەچێ، ئەو کابرایە کە یەکێك بووە لە زانایانی جوولەکە، دێتە مەجلیسی مەئموونو تەماشا دەکات، مسوڵمان بووە، مەئموون لێی دەپرسێ :

هۆی مسوڵمان بوونی تۆ چییە؟ کاتی خۆی پێم گوتی، گوتت: ئێمەش لەسەر کتێبی ئاسمانیین !

دەڵێ: هەڵسام سێ نوسخەم نووسین، نوسخەیەك لە قورئان، نوسخەیەك لە تەورات (لە پەیمانی کۆن)، نوسخەیەکیش لە ئینجیلەکان (لە پەیمانی نوێ) .

ئنجا قورئانەکەم بردە نێو مسوڵمانانو، پەیمانی کۆن بۆ نێو جوولەکەکانو، پەیمانی نوێش بۆ نێو نەصرانییەکان، لە حاڵێکدا هەرسێکیان: هەم قورئان (مصحف)ەکەو، هەم تەوراتەکەو، هەم ئینجیلەکان، لە هەندێ جێیان دەستکارییم کردبوون .

ئنجا ئەوەی بردم بۆ نێو مسوڵمانان، یەکسەر دوای ماوەیەکی کەم، گوتیان: ئەو موصحەفە هەڵەی تێدایە، فڵان شوێنو، فڵان شوێنو، فڵان شوێن، بەڵام ئەوانەی بردبوومن بۆ نێو جوولەکەکانو نەصرانییەکان، کەس باسی نەکرد، کە هەڵەیان تێدایە! لەوەوە بۆم دەرکەوت کە تەنیا قورئان پارێزراوە لە هەڵەو، تەنیا قورئان هەڵەی تێدا نیەو تێدا پەیدا نەبووە، بەڵام کتێبەکانی دیکە هەڵەیان تێدایەو، ئەگەر ئێستاش دەستکاریی بکرێن، خەڵك پێی نازانێ، لەبەرئەوەی کاتی خۆیشی زۆر دەستکاریی کراون .

کە بێگومان زۆر ڕاست دەکات: منیش لە (پەیمانی کۆن) سێ نوسخەم لەلان، نالێم: هەمووی، بەڵام لە چەند شوێنێکدا هەر نوسخەیەی بە شێوەیەکە، یەکێکیان نیزیکەی سەد (١٠٠) ساڵ دەبێ چاپکراوەو، ئەوەی دیکە دواترو، ئەوەی دیکە دواتر، هەر سێکیشیان هەر پەیمانی کۆنن !!

بۆیە ئەو زانایەی جوولەکەش، دەڵێ: ئەوە هۆکاری مسوڵمان بوونی منە .

ئنجا ئێمە پێویستە حیکمەتی ئەوە بزانین کە بۆچی قورئان دەستکاریی نەکراوە، بەڵام تەورات و ئینجیل و زەبوورو صوحوف و ... هتد، گۆڕدراون و دەستکاریی کراون، خۆ ئەوانیش هەر فەرمایشتی خوان ؟!

حیکمەتەکەی ئەوەیە کە خوا ﷻ، قورئانی ناردوە بۆ موحەممەد ﷺ، کە دوا کتێب و دوا پەیامی خوا بێ، وەك چۆن موحەممەد ﷺ، دوا پێغەمبەری خوایە، بۆ هەموو مرۆڤایەتیی، تاکو مرۆڤێك لەسەر ئەم سەر زەوییە مابێ، پێویستیی بە قورئان هەیە، پێویستیی بەو کتێب و بەرنامەیەی خوا، هەیە، بەڵام کتێبەکانی دیکە، خوای پەروەردگار بۆ کۆمەڵگایەکی دیاریکراو، بۆ هۆزێك، بۆ عەشیرەتێك و، بۆ قۆناغێکی دیاریکراوی ناردوون، بۆیە بە پێویستیی نەزانیوە بیانپارێزێ، ئەوە حیکمەتەکەیە .

ئنجا خوا ﷻ، پارێزگاریی لێکردنی قورئانی، عایدی خۆی کردوە، فەرموویەتی: ﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴾، ئێمە خۆمان (ذکر)مان دابەزاندوەو، خۆشمان پارێزەرینی، بەڵام هی کتێبەکانی دیکە، پاراستنیان عایدی مرۆڤەکان کردوە، عایدی زانایانی کردوە، وەك لە سوورەی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَا ٱلتَّوۡرَىٰةَ فِيهَا هُدٗى وَنُورٞۚ يَحۡكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسۡلَمُواْ لِلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلۡأَحۡبَارُ بِمَا ٱسۡتُحۡفِظُواْ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُواْ عَلَيۡهِ شُهَدَآءَ ﴿٤٤﴾ ﴾ واتە: ئێمە تەوراتمان ناردوە، ڕێنمایی و ڕووناکیی تێدایە، پێغەمبەرانێك عليهم السلام کە ملکەچ بوون بۆ خوا، حوکمی پێدەکەن بۆ جوولەکەکان، هەروەها زانا ڕەببانییەکان، هەروەها ئەحبارەکان {﴿ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ ﴾، واتە: حوکمڕانانێك کە زانان، ﴿ وَٱلۡأَحۡبَارُ ﴾یش، واتە: زانایان} ئەوانەش حوکمی پێدەکەن بۆ جوولەکەکان، ﴿ بِمَا ٱسۡتُحۡفِظُواْ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ ﴾، بەهۆی ئەوەوە کە پاراستنی کتێبی خوایان پێ سپێردرا بوو، ﴿ ٱسۡتُحۡفِظُواْ ﴾، واتە: پاراستنییان پێ سپێردرا بوو، ﴿ وَكَانُواْ عَلَيۡهِ شُهَدَآءَ ﴾، شایەدیش بوون و

چاودێر بوون بەسەر کتێبی خواوە، هەڵبەتە شتێك خوا بیپارێزێ‌و پاراستنەکەی عایدی خوا بێ، دەپارێزرێ‌و سەلامەت دەبێ، بەڵام شتێك پاراستنەکەی عایدی عەبدان کرابێ، بەو دەردە دەچێ کە بینیومانە، کە (پەیمانی کۆن)و (پەیمانی نوێ) پێی چوون، وەك دەبینین زۆر شوێنیان دەستکاریی کراون، ئنجا وەك پێشتر ئاماژەم پێدا: لەو مەوسووعەیەدا کە لە زیندانی ئەمریکییەکاندا نووسیومە، باسی پەیمانی کۆن‌و نوێم کردوەو کۆمەڵێك نموونەم لێ هێناونەوە کە ناگونجێ - ئەو شوێنانەی بە نموونەم هێناونەوە - ئەوانە فەرمایشتی خوای پەروەردگار بن .

<u>مەسەلەی حەوتەم</u> : عادەتی گەلە پێشووەکانیش بە زۆریی هەر وابووە، گاڵتەیان بە پێغەمبەرانیان کردوەو پێیان بێبڕوا بوون، ئەمانەش، واتە: کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ، لەسەر ڕچەی ولن دەڕۆن‌و، ئەگەر دەروازەی ئاسمانیشیان لێ بکرێتەوەو پێیدا سەربکەون، دیسان بیانوویەك دەدۆزنەوە بۆ بڕوا نەهێنانیان :

خوا فەرموویەتی : ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِي شِيَعِ الْأَوَّلِينَ ﴿١٠﴾ وَمَا يَأْتِيهِم
مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴿١١﴾ كَذَٰلِكَ نَسْلُكُهُ فِي قُلُوبِ الْمُجْرِمِينَ ﴿١٢﴾
لَا يُؤْمِنُونَ بِهِ ۖ وَقَدْ خَلَتْ سُنَّةُ الْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا مِّنَ السَّمَاءِ فَظَلُّوا فِيهِ
يَعْرُجُونَ ﴿١٤﴾ لَقَالُوا إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَارُنَا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورُونَ ﴿١٥﴾﴾.

شیکردنەوەی ئەم شەش ئایەتە بەپێزە ، لە هەشت بڕگەدا:

<u>بڕگەی یەکەم</u> : ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِي شِيَعِ الْأَوَّلِينَ﴾، (ئەی موحەممەد !) بە دڵنیایی لە پێش تۆدا، پێغەمبەرانمان لە کۆمەڵە پێشووەکاندا، ناردوون .

(شِيَع: جَمْعُ شِيْعَة)، (شِيَع) كۆی (شيعة)يە، (الفِرْقَةُ الَّتِي أَمْرُهَا وَاحِدٌ) ئەو كۆمەڵەی لەسەر شتێك كۆدەبێتەوە، هەم (شِيَع)، هەم (أَشْيَاع) تاكەكەیان بریتیە لە (شِيْعَة)، واتە: كۆمەڵە خەڵكێك كە لەسەر مەبەستێكو ئامانجێك كۆبوونەتەوە، واتە: لەو كۆمەڵگا پێشووانەدا، پێشتر پێغەمبەرانمان ڕەوان كردوونو تۆ شتێكی بێ پێشینەو دەگمەن و ڕیزپەڕ (شاذ)نی .

<u>**بڕگەی دووەم**</u> : ﴿ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴾، بەڵام هیچ پێغەمبەرێكیان بۆ نەچووە، مەگەر گاڵتەیان پێ دەكردن .

سبحان الله! ئەوەی كە عەقڵەكەی بچووك بێ، عەقڵەكەی كرچو كاڵ بێ، زۆرجار گاڵتە دەكات، بە شتێك كە كەسانێكی عاقڵ، كەسانێكی بلیمەت، كەسانێكی شارەزا، دەیڵێن، بەڵكو جاری وا هەیە، نەزانو سادەكان، عاقڵو بلیمەتەكان بە شێت دەزانن، یان بە جادووگەریان دەزانن، یان بە حاڵ تێكچوویان دەزانن ! ئەوە نەك هەر لە نێو مسوڵمانانندا، بەڵكو لە نێو هەموو گەلو كۆمەڵگاكانداو، ئێستاش هەر وایەو، بە زۆریی وایە گاڵتەكردن عادەتی ئینسانی نەفامە، عادەتی ئینسانی نەزانە، هیچ پێغەمبەرێك نابینی، گاڵتەی بە خەڵك كردبێ، كە خوا دەفەرموێ : ﴿ ٱللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ ﴿١٥﴾ ﴾ البقرة، واتە: خوا بە جۆرێك مامەڵەیان لەگەڵدا دەكات، وەك مامەڵەی گاڵتە پێكردن، چونكە: خوا دەشزانێ بێبڕوایەكان بەهۆی ئەو كوفرەوە دەچنە دۆزەخو لێشیان دەگەڕێ بژینو، بەردەوام بن لەسەر كوفرەكەشیان، ئنجا ئا ئەوە دەچێتە شێوەی مامەڵەی كەسێكەوە، كە گاڵتە بە كەسێك دەكات .

یاخود: یانی: سزای گاڵتە پێكردنەكەیان دەداتەوە .

بەڵێ خوای كارزان كە ﴿ يَسْتَهْزِئُ ﴾ بۆخۆی بەكاری هێناوە، بە یەكێك لەو دوو واتایەیە، بەڵام هیچ كات پێغەمبەران نابینی، گاڵتەیان بە غەیری خۆیان كردبێ، هەرچەندە بە تەئكید ئەوانەی نەیارو ناحەزیشیان بوون، زۆر بێ عەقڵو كەودەنو نەفام بوون، زۆر دواكەوتوو بوون: دارو بەردیان پەرستوە، گوتوویانە: بە دوای ڕچەی بابو باپیرانمان دەكەوین، پێغەمبەران گوتوویانە:

ئایا ئەگەر ئەوان لەسەر هەڵەش بوون، دەبێ لەسەر هەڵەکەشیان هەر بەدوایان بکەون؟ کەچی هەر لاسایی ئەوانیان کردۆتەوە، کوێر کوێرانە، واتە: لە زۆر ڕووەوە شایستەی ئەوە بوون گاڵتەیان پێ بکرێ، بەلام پێغەمبەران، لە خۆیان نەوەشاندۆتەوە گاڵتە بە خەڵك بکەن، با ئەو خەڵکە گاڵتەجارپش بووبن و، شایستەی گاڵتە پێکردنیش بووبن، ئێستاش شوێنکەوتووانی پێغەمبەران، هەر دەبێ وا بن، هەیە شایستەی ئەوەیە قسەی خراپ و ناشیرینی پێ بگوترێ، قسەی بێجێ دەکات، شایستەی ئەوەیە قسەی بێجێی پێ بگوترێ، بەلام نابێ خۆت بە شایستەی ئەوە بزانی قسەی بێجێ بکەی، وەك خوا ﷻ لە سووڕەتی (الفرقان)دا، دەفەرموێ : ﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ ﴾.

واتە: بەندەکانی خوای خاوەن بەزەیی ئەوانەن، بە هێمنیی و ئارامیی بە ڕێ دادەڕۆن و، کاتێك نەفامەکان دەیاندوێنن، دەڵێن : سەلام .

ا - ﴿ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴾ یانی: قسەیەکی سەلامەت دەکەن .

ب - یاخود: ﴿ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴾ دەڵێن: سەلامەتان لێبێ، یانی: بڕۆن، لەگەڵتان ناچینە تەرازووەوە، بە ڕێی خۆتان دابڕۆن، ئێمە وەك ئێوە ناکەین .

<u>بڕگەی سێیەم :</u> ﴿ كَذَٰلِكَ نَسْلُكُهُۥ فِى قُلُوبِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴾ بەو شێوەیە دەیخەینە دڵی تاوانبارانەوە (کە بێبڕوابن) .

(سَلَکه يَسلُکه، وَأسلَکه يُسلِکه: أدْخَلَهُ)، وشەی (سَلَکه) واتە: خستیە نێوی، (يَسلُکه) دەیخاتە نێو، ئنجا ئەم (فعل)ە، وەك (ثُلاثي)یەکەی هاتووە (سَلَكَ، يَسلُكُ)، (رباعي)یەکەشی هاتووە: (أسلَكَ، يُسْلِكُ)، خستیە نێوی، دەیخاتە نێوی .

لێرەدا مەبەست ئەوەیە: ئاوا دەیخەینە دڵی تاوانبارانەوە (بەهۆی ئەوەوە کە تاوانبارن)، بێبڕوایی دەخەینە نێو دڵیانەوە .

ئەمە لێی وەردەگیرێ کە ئینسان لە ئەنجامی تاوان و لادان و خراپەدا، بێبڕوایی دەچێتە نێو دڵی، هەروەك لە ئەنجامی طاعەت و چاکەدا، ئیمان زیاتر لە دڵیدا دەچەسپێ .

**بڕگەی چوارەم :** چییان دەخەینە نێو دڵ !

١/ ﴿ لَا يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ﴾ ئەوەیان دەخەینە نێو دڵ، کە بڕوای پێ ناهێنن، بڕواناهێنن بە پێغەمبەران (علیهم السلام)، بە پەیامی خوا .

٢/ یاخود : ﴿ كَذَٰلِكَ نَسْلُكُهُۥ فِى قُلُوبِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴾ ئەوەی دەخرێتە دڵیانەوە بەپێی سیاق دەزانرێ، واتە: بێبڕوایی، کەللە ڕەقیی، خۆبەزلگریی، عینادیی، دەخەینە دڵی تاوانبارانەوە، دوایش بۆ جەختکردنەوە، دەفەرموێ :

﴿ لَا يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ﴾ بڕوای پێ ناهێنن، واتە: بە قورئان، بە پەیامی خوا .

﴿ وَقَدْ خَلَتْ سُنَّةُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾ یاسای پێشووانیش تێپەڕیوە، یاسای پێشووان، واتە: یاسای خوا لە مامەڵەکردنی لەگەڵ گەلە پێشووەکاندا، تێپەڕیوە، کە بریتی بووە لەوەی: ئەوانەی لە ئەنجامی تاوان و خراپەدا، بەربەستیان لەبەردەم خۆیاندا دروست کردوە، ئیمان بێنن، لە ئەنجامی ئەوەدا خوا سزای داون .

زانایان بۆ وشەی : ﴿ نَسْلُكُهُۥ ﴾ جگە لەو دوو واتایەی کە من هێنامن، واتایەکی دیکەشیان هێناوە : (أَي: نَسلُكُ القُرآنَ فِي قُلُوبِهِم وَنُفهِمُهُم إِياهُ)، قورئانیان دەخەینە نێو دڵ، تێیان دەگەیەنین، بەو واتایەش هێناویانە، هەروەك چۆن بەو واتایە هێناویانە: (أَي نَسلُكُ فِي قُلوبِهِم عَدَمَ الإِيمانِ بِسَبَبِ إِجرامِهِم)، بێبڕوایی دەخەینە نێو دڵیان، بەهۆی تاوانباریانەوە .

بەڵام پێم وایە: مانای ڕاست، یەکێك لەو مانایەیە کە ئێمە هەڵمانبژاردن، واتە:

١) بێبڕوایی دەخەینە دڵیانەوە .

٢) یان : عینادیی و کەللەڕەقیی و خۆبەزلگریی ، چونکە ئەگەر خوا بڕواهێنان بە قورئان بخاتە نێو دڵیانو تێیان بگەیەنێ، ئەو کاتە ئیمانی پێ دەهێننو، ئەوەش پێچەوانەی سیاقو ڕواڵەتی مانای ئایەتەکانە .

**بڕگەی پێنجەم :** ﴿ وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾ ئەگەر دەروازەیەکمان بەرەو سەرێ، بەرەو ئاسمان، بەسەردا کردبانەوە .

**بڕگەی شەشەم :** ﴿ فَظَلُّوا۟ فِيهِ يَعْرُجُونَ ﴾، ئنجا بەردەوام بەڕۆژێ لێیەوە پێهەڵچووبان، بۆ سەرێ چووبان .

(ظَلَّ تَدلُّ على الكونِ في النَّهارِ)، (ظَلَّ) بۆ بەردەوام بوون لەسەر کارێك بەکاردێ، کە لە ڕۆژێدا ئەنجام دەدرێ .

(يَعرُجُون: العرُوجُ: الصعود) یانی: سەرکەوتن، پێهەڵچوون، ئەگەر دەروازەیەکمان بەسەرداکردبانەوە لە ئاسمانێو، بە ڕۆژێ تێیدا پێ هەڵچووبان، سەرکەوتبان .

**بڕگەی حەوتەم :** ﴿ لَقَالُوٓا۟ إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَٰرُنَا ﴾ ئەو کاتەش دەیانگوت: ئێمە چاوەکانمان بەستراون، ﴿ سُكِّرَتْ ﴾ خوێندراویشەتەوە: ﴿ سُكِرَتْ ﴾، یانی : (سُدَّت) بەستراون، دەگوترێ: (سَكَرَ البابَ، وَسَكَرَ البابَ) هەردووکیان بە مانای: دەرگاکەی پێوەدا، دایخست، گاڵەی دا، دێن، ئەوانەش دەڵێن: ئێمە چاومان داخراون، چاومان بەستراون .

**بڕگەی هەشتەم :** ﴿ بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورُونَ ﴾، بەڵکو ئێمە کۆمەڵێکین جادوومان لێکراوە، واتە: ئەوەی کە دەیبینین تەنیا خەیاڵێکە، ڕەشکەو پێشکەیەکە، دێتە بەرچاوی کەسێك کە جادووی لێکراوە، واتە: یان چاومان نابینێ، یان ئەوەی دەیبینین کاریگەریی ئەو جادوومیە کە لێمان کراوە .

ئاشکرایە دەگونجا بفەرموێ: (بَلْ نَحنُ مَسحُورُون) ئێمە جادوومان لێکراوە، بەلام کە دەفەرموێ: ﴿ بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورُونَ ﴾، واتە: ئێمە کۆمەڵێکین،

جادووگەران، لە ئێمەدا چەسپاوەو، هەمووومان کۆمەڵێکین، خەڵکێکین، جادوولێکراناو چاوبەسترانمان، بۆتە سیفەتێکی ڕیشەیی تێماندا، کە پێی دەناسرێینەوە .

**مەسەلەی هەشتەم :** خوا ئاسمانی پڕ کردوە لە بورجی ئەستێرەی جوان و لە شەیتانەکانی پاراستوون، ئەگەر یەکێک بە دزیی گوێ هەڵبخات، ئەویش بڵێسەیەکی تێدەگیری بۆ دەرکرانی :

خوا ﷻ فەرموویەتی : ﴿ وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَزَيَّنَّـٰهَا لِلنَّـٰظِرِينَ ﴿١٦﴾ وَحَفِظْنَـٰهَا مِن كُلِّ شَيْطَـٰنٍ رَّجِيمٍ ﴿١٧﴾ إِلَّا مَنِ ٱسْتَرَقَ ٱلسَّمْعَ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ مُّبِينٌ ﴿١٨﴾ ﴾ .

**شیکردنەوەی ئەم سێ ئایەتە موبارەکە ، لە پێنج بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم :** ﴿ وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا ﴾، بێگومان ئێمە بورجەگەلمان لە ئاسماندا داناون .

(البـروجُ: جَمْـعُ بـرجٍ: البنـاءُ الكَبيرُ المُتَّخَـذُ للتَّحَصُّـنِ، وَيُـرادِفُ القَصْـرَ)، (بروج) کۆی (برجٌ)ە، بورجیش بە بیناو خانوویەکی گەورە دەگوترێ، کە بۆ خۆ تێدا پاراستن دروست دەکرێ، هاوواتای وشەی (قَصْـر)ە، واتە: کۆشك، ئێمە دوایی وردەکاریی زیاتر دەربارەی (بروج) باس دەکەین .

**بڕگەی دووەم :** ﴿ وَزَيَّنَّـٰهَا لِلنَّـٰظِرِينَ ﴾، بۆ تەماشاکەران ڕازاندوومانەتەوە، کە دەگونجێ ڕاناوەکە بچێتەوە بۆ ئاسمان، ئاسمانمان ڕازاندۆتەوە، دەشگونجێ بگەڕێتەوە بۆ بورجەکان، بورجەگەلمان ڕازاندوونەوە، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ بۆ ئاسمان بچێتەوە .

**برگەی سێیەم :** - ﴿ وَحَفِظْنَاهَا مِن كُلِّ شَيْطَانٍ رَّجِيمٍ ﴾: پاراستووشمانە لە هەر شەیتانێکی دەرکراو، دوورخراوە لە بەزەیی خوا .

بێگومان لێرەدا وشەی : ﴿ وَحَفِظْنَاهَا ﴾ ڕاناوەکەی دەچێتەوە بۆ ئاسمان، خوا ئاسمانی پاراستوە، نەك ئەستێرەکانی پاراستبن، یانی: ئاسمانی پاراستوە، لەوەی کە شەیتانەکان سنوورەکەی ببڕنو بەرەو سەرێ بچنو گوێ لە قسەی فریشتان بگرن .

ئایا (رَجیم) لە چییەوە هاتوە؟ (الرُّجَامُ: الحجارَة، وَالرَّجيمُ المُحَقَّرُ الَّذِي يُرْمَى بالحَصْباء)، (رُجام): بەرد، (رَجیم): بە کەم تەماشاکراوێکە کە وردە بەردی تێدەگیرێن .

**برگەی چوارەم :** - ﴿ إِلَّا مَنِ اسْتَرَقَ السَّمْعَ ﴾ مەگەر کەسێك بە دزیی گوێ هەڵبخات، کەسێك لە شەیتانەکان، بە دزیی گوێ هەڵبخات، بۆ قسەی فریشتان .

(إستَرَقَ : سَرَقَ، وَهو الإستماعُ بخُفيَةٍ)، (إستراق) بریتییە لە گوێ هەڵخستنی بە پەنهانیی .

**برگەی پێنجەم :** - ﴿ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ مُّبِينٌ ﴾ واتە: بڵێسەیەکی ئاگری ڕوونی شوێن دەکەوێ .

وشەی : (أَتبَعَهُ) بە زۆریی بۆ حاڵەتێکە شتێك شوێنی شتێك و بیگاتێو بیگرێ، بەلام (تَبِعَهُ) مەرج نیە پێی بگات .

# کورتە باسێک لەبارەی بورجەکانەوە

خاوەنی (التحرير والتنوير)[1]، هەندێك وردەکاریی دەربارەی مانای (بروج)و بورجەکان دەخاتە ڕوو، دەڵێ: {والبروج : جمع برج، النَّجم، الكوكب، وأُطْلِقَ البرج على بقعة معينة من سمت طائفة من النجوم غير السيارة (وتسمّى النجوم الثوابت) متجمع بعضها بقرب بعض ، على أبعاد بينها ■ تتغيَّر، فيما يُشاهدُ من الجو ، فتلك الطائفة تكون بشكل واحد يشابه نقطاً ، لو خططت بينها خطوطٌ لخرج منها شبه صورة حَيوان، أو آلة، سَمّوا باسمها ، تلك النجوم المشابهة لهيئتها، وهي واقعة في خط سير الشمس .

وقد سمَّاها الأقدمون من علماء التوقيت بما يرادف معنى الدار أو المكان، وسمّاها العرب بروجاً ودارات على سبيل الإستعارة المجعولة سبباً لوضع الإسم ؛ تخيّلوا أنها منازل للشمس، لأنهم وقّتوا بجهتها سمت موقع الشمس من قُبة الجو نهاراً، فيما يُخيَّل للناظر أن الشمس تسير في شبه قوس الدائرة، وجعلوها اثني عشر مكاناً ، بعدد شهور السنة الشمسية، وأول من رسم هذه الرسوم الكلدانيون، ثم انتقل علمهم إلى بقية الأمم، ومنهم العرب} .

واتە: (بروجُ) کە کۆی (برجُ)ە، بە سێ واتایان دێ، یان بە مانای ئەستێرەیە، یان بە مانای خڕۆکەیە، هەروەها (برج) بە شوێنێکی دیاریکراویش دەگوترێ، لە ئاست کۆمەڵێك لە ئەستێرەکان دا ، کە چەسپاون، (النجوم غير السَّيارَة)، واتە: ئەو ئەستێرانەی کە لەبەرچاوی مرۆڤ ناجووڵێن، پێیان دەگوترێ: (النجومُ الثَّوابت) ئەو ئەستێرانەی کە چەسپاون، واتە: ئەو ئەستێرانەی کە ناجووڵێن، ئەوانیش هەندێکیان لە نزیك هەندێکیان کۆدەبنەوە (کە ئینسان

---

١) ج ١٤، ص ٢٨.

تەماشای ئاسمان دەکات)، بەپێی مەسافەیەکی دیاریکراو، ئەو مەسافەیەش بۆ کەسێك کە تەماشای دەکات، لەبەرچاوی ئەو مەسافانە گۆڕانیان بەسەردا نایەت .

ئنجا ئەو کۆمەڵە ئەستێرەیە، ئەگەر بێت و ، هەر کامێکیان وەك خاڵێك دابنرێ و، بە چەند هێڵێك پێك بگەیەنرێن، هەر کۆمەڵە ئەستێرەیەك شێوەیەك پەیدا دەکات ، هەیە شێوەی حەیوانێك، یان شێوەی ئامرازێك پەیدا دەکات، ئنجا ئەو شێوە وەهمییە ، کە لە ئەنجامی پێکگەیاندنی ئەو کۆمەڵە ئەستێرانەدا بە چەند هێڵێك پەیدا دەبێ، ئەو ئەستێرانەیان پێ ناوناون، کە هەمووشیان دەکەونە سەر هێڵی هاووشۆی خۆر، پێشووان لە زانایان، کە لە دیارییکردنی (کات)یان کۆڵیوەتەوە، جۆرە ناوێکیان بۆ داناون کە مانای خانوو ، یان مانای شوێن دەگەیەنێ، بەلام عەرەب وشەی بورجیان بۆ بەکارهێناون، بورج، یانی: قەلا، ئنجا هەموویان دابەش کردوون بۆ دوازدە (١٢) بورج، یان شوێن، بە ئەندازەی مانگەکانی ساڵی خۆریی، یەکەمین گەلێکیش کە ئەو وێنانەی کێشاون، کلدانییەکان بوون، دوایی لەوانەوە ئەو زانیارییە بۆ باقی نەتەوەو گەلەکانی دیکە چووە، لە نێویشیاندا عەرەب .

ناوی ئەو دوازدە بورجانەش، لە زۆر شوێناندا هاتوە، بەلام من لە (تَفسيرُ الباليساني)[1] ڕەحمەتی خوای لێبێ: مامۆستا شیخ محمد طه بالیسانیی، وەرمگرتوون، کە ئەمانەن :

١ - الحَمَلُ : بەرخ .

٢ - الثَّور : گا .

٣ - الجوزاء : گوێز .

٤ - السرطان : قرژاڵ .

٥ - الأسد : شێر .

٦ - السُنبُلة: گوڵە گەنم، یان گوڵە جۆ .

---

١) ج ٣، ص ١٣٧٩.

٧ - الميزان : تەرازوو .

٨ - العقرَبُ : دووپشك .

٩ - القَوس : كەوان .

١٠- الجَدي : كاریلە .

١١- الدلو : دۆڵچە .

١٢- الحوت: ماسیی، یان نەهەنگ .

هەروەها مانگیش بیستو هەشت (٢٨) مەنزڵی هەیە، كە لە ماوەی مانگێكدا ئەو (٢٨) مەنزڵە دەبڕێ ، هەر شەوەی یەكێكیانو، لە هەمان كاتدا ئەو دوازدە (١٢) بورجەش دەبڕێ ، كەواتە : خۆر ئەو بورجانە لە ماوەی ساڵێكدا دەبڕێ ، لە ماوەی ساڵێكدا جارێك بەو دوازدە (١٢) شوێنەدا تێدەپەڕێ ، لەبەرچاوی ئێمە، بەڵام مانگ لە ماوەی هەر مانگێكدا، ئەو (١٢) بورجە دەبڕێ ، وێڕای ئەوەی كە خۆشی دوازدە (١٢) شوێنی هەنو، هەر شەوە، یەكێك لەو دوازدە شوێنە، شوێنی مانگە .

# کورتە باسێک دەربارەی: گوێگرتنی شەیتانەکان لە هەواڵی ئاسمانەکان و بەردبارانکردنیان، بە بڵێسەی ئەستێران

ئەم بابەتە بە لای کەمەوە لە حەوت (٧) سوورەت، لە سوورەتە موبارەکەکانی قورئاندا ، باسکراوە، کە ئێمە هەموو ئەو ئایەتانە دێنین، هەروەها لە چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەریشدا ﷺ، باسکراوەو، ئەم بابەتە بابەتێکی موشتومڕ هەڵگرە، بۆیە بە پێویستم زانی کە لێرەدا بەتایبەت لە چوار (٤) بڕگەدا بیتوێژمەوە .

١/ لە بڕگەی یەکەمدا ، ئەو ئایەتانەی کە لەوبارەوە هاتوون، دەیانهێنین .

٢/ لە بڕگەی دووەمدا ، فەرمایشتەکان، دێنین ، ئەوانەی بە پێویستیان بزانین ، لەوبارەوە .

٣/ لە بڕگەی سێیەمیشدا ، پێناسەی (شهاب)و (نیزك) دەكەین .

٤/ لە بڕگەی چوارەمیش دا ، دێینە سەر ئەنجامگیری .

**برگەی یەکەم : چەند ئایەتێك كە لەوبارەوە هاتوون :**

١) لە سوورەتی (الصافات)دا، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِنَّا زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِزِينَةٍ ٱلْكَوَاكِبِ ۝٦ وَحِفْظًا مِّن كُلِّ شَيْطَٰنٍ مَّارِدٍ ۝٧ لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلْمَلَإِ ٱلْأَعْلَىٰ وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ ۝٨ دُحُورًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ ۝٩ إِلَّا مَنْ خَطِفَ ٱلْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ ثَاقِبٌ ۝١٠ ﴾الصافات .

واتە: ئێمە ئاسمانی نزیكمان، (كە مەبەستی پێی ئاسمانی یەكەمە)، بە جوانیی ئەستێرەكان ڕازاندۆتەوەو[١]. بۆ پاراستنی ئاسمانیشن، لە هەر شەیتانێكی هەڵگەڕاوە، گوێ بۆ دانیشتووانی سەرێ ناگرن، {كە مەبەست فریشتەكانن، (المَلأ) بە كۆمەڵە خەڵكێك دەگوترێت، (الأعْلَى) واتە: بەرزتر، كە ئەوان لە ئاسمانن}، لە هەموو لایەكەوە تیرباران دەكرێن، پێیاندا دەدرێ، {مەبەست پێیان ئەو پارچانەن كە لە ئەستێرەكانن‌و، دوایی زیاتر ڕوونی دەكەینەوە}، ئەوە دەبێتە مایەی دەركرانیان‌و سزایەكی بەردەوامیشیان بۆ هەیە، {واتە: لە دوارۆژدا، لەسەر ئەو كردەوەیەی پێی هەڵدەستن}، مەگەر یەكێكیان كە زانیارییەك بڕفێنێ، بە ڕفاندن، (واتە: بیدزێ)، ئەویش بڵێسەیەكی كونكەری سووتێنەری شوێن دەكەوێ .

٢) لە سوورەتی (الجن)دا، خوا ﷻ لەسەر زمانی جندەكان دەفەرموێ : ﴿ وَأَنَّا لَمَسْنَا ٱلسَّمَآءَ فَوَجَدْنَٰهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا ۝٨ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَٰعِدَ لِلسَّمْعِ ۖ فَمَن يَسْتَمِعِ ٱلْءَانَ يَجِدْ لَهُۥ شِهَابًا رَّصَدًا ۝٩ ﴾.

١) لە بەكارهێنانی قورئاندا وشەی (نَجْم)و (كَوْكَب)، هەردووكیان بەو تەنانە دەگوترێن، كە ئێمە دەیانبینین، تیشك دەدەنەوە، ئێمە بە كوردیی بۆ (نجم) دەڵێین: ئەستێرە، بۆ (كوكب)یش دەڵێین: خڕۆكە، كە یەكەمیان تیشكدەر [redacted] دووەمیان بێ تیشكە.

واتە: ئێمە ئاسمانمان پشکنی، تەماشامان کرد: پڕکراوە لە پاسەوانی بەهێزو لە بڵێسە، ئێمە پێشتر بۆ گوێگرتن لێی دا دەنیشتین، بەڵام هەر کەسێك ئێستا گوێی لێبگرێ، ئەوە بڵێسەیەکی ئاگر بۆی لە بۆسەدایە .

٣) لە سووڕەتی (المُلک)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلْنَٰهَا رُجُومًا لِّلشَّيَٰطِينِ ۖ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ ﴿٥﴾ ﴾.

واتە: بە دڵنیایی ئێمە ئاسمانی نیزیکمان، (ئاسمانی خوارەوەمان)، ڕازاندۆتەوە بە چرایان، (مەبەست پێیان ئەستێرەکانن). ئەو چرایانەشمان، ئەو ئەستێرانەشمان کردوون بە مایەی بەردبارانکردنی شەیتانەکانو، سزای بڵێسەداری دۆزەخیشمان بۆیان ئامادە کردوە .

٤) لە سووڕەتی (فُصِّلَت)دا : دەفەرموێ : ﴿ فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ فِى يَوْمَيْنِ وَأَوْحَىٰ فِى كُلِّ سَمَآءٍ أَمْرَهَا ۚ وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفْظًا ۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿١٢﴾ ﴾

واتە: (خوا) حەوت ئاسمانەکانی لە دوو ڕۆژدا، (واتە: لە دوو قۆناغاندا تەواو کردن)، هەر ئاسمانێك کاروباری خۆی پێڕاگەیاند، (مەبەست پێی ئەوەیە کاروباری ڕێکخست)و ئاسمانی نیزیکمان بە چرایانو بۆ پاراستنی، ڕازاندۆتەوە، {واتە: بە چرایان ڕازاندوومانەتەوەو ئەو چرایانەش کە ئەستێرەکانن، بۆ پاراستنی ئاسمانیشن، واتە: پاراستنی ئاسمان لەوە کە شەیتانەکان پێیهەڵبچنو لەوێ گوێ لە قسەی فریشتان بگرن}، ئا ئەوەش ئەندازەگیریی کردنی (خوای) زاڵی زانایە .

٥) لە سووڕەتی (الحجر) ئایەتەکانی: (١٦و ١٧و ١٨)دا، کە ئێمە خەریکی تویژینەوەینی، خوا دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَزَيَّنَّٰهَا لِلنَّٰظِرِينَ ﴿١٦﴾ وَحَفِظْنَٰهَا مِن كُلِّ شَيْطَٰنٍ رَّجِيمٍ ﴿١٧﴾ إِلَّا مَنِ ٱسْتَرَقَ ٱلسَّمْعَ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ مُّبِينٌ ﴿١٨﴾ ﴾.

واتە: ئێمە لە ئاسماندا بورجەکانمان داناون و، بۆ تەماشاکەران (ئەو ئاسمانەمان) لە هەر شەیتانێکی دەرکراو پاراستوومانە، مەگەر کەسێکیان بە دزیی گوێ هەڵبخات، ئەویش بڵێسەیەکی ڕوون و ئاشکرا شوێنی دەکەوێ .

٦) لە سوورەتی (الرحمن)دا، دەفەرموێ : ﴿ يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ إِنِ ٱسۡتَطَعۡتُمۡ أَن تَنفُذُواْ مِنۡ أَقۡطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ فَٱنفُذُواْۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلۡطَٰنٖ ﴿٣٣﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٤﴾ يُرۡسَلُ عَلَيۡكُمَا شُوَاظٞ مِّن نَّارٖ وَنُحَاسٞ فَلَا تَنتَصِرَانِ ﴿٣٥﴾ ﴾.

واتە: ئەی کۆمەڵەی جند و مرۆڤ ! ئەگەر توانیتان لە سنوورەکانی ئاسمان و زەوی دەربچن، دەربچن، ناتوانن دەربچن، مەگەر دەسەڵاتێکتان هەبێ، ئنجا ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ ! بە کام لە چاکەکانی خوا بێبڕوان؟ (ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ ئەگەر بتانەوێ دەربچن لە سنووری ئاسمانەکان و زەوی)، ئاگرێك، کە دووکەڵی تێدانیە، بەسەرتاندا دەبارێنرێ، هەروەها مسی تواوەش و، هەرگیز سەرکەوتوونابن .

٧) کۆتا سوورەت، کە ئێستا لە زەینمدا ئامادەیە، کە ئاماژە بەو مەسەلەیە کراوە، سوورەتی (الشُعَرَاء)یە، وەك خوای بەرز دەفەرموێ : ﴿ وَمَا تَنَزَّلَتۡ بِهِ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢١٠﴾ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُمۡ وَمَا يَسۡتَطِيعُونَ ﴿٢١١﴾ إِنَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّمۡعِ لَمَعۡزُولُونَ ﴿٢١٢﴾ ﴾.

واتە: شەیتانەکان ئەم قورئانەیان دانەبەزاندوە بۆیان نیەو، ناشتوانن، چونکە ئەوان لە گوێگرتن کەنارگیر کراون .

واتە: دەرفەتیان نادرێ، گوێبگرن تاکو ئەم قورئانە کاتێك خوا دەیفەرموێ و جبریل دەیهێنێ بۆ پێغەمبەر ﷺ، بتوانن گوێی لێبگرن و، دەستی تێوەربدەن .

**بڕگەی دووەم : چەند فەرموودەیەك كە لەوبارەوە هاتوون:**

١) {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: مَا قَرَأَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى الْجِنِّ وَلاَ رَآهُمْ، انْطَلَقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي طَائِفَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ عَامِدِينَ إِلَى سُوقِ عُكَاظٍ، وَقَدْ حِيلَ بَيْنَ الشَّيَاطِينِ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ، وَأُرْسِلَتْ عَلَيْهِمُ الشُّهُبُ، فَرَجَعَتِ الشَّيَاطِينُ إِلَى قَوْمِهِمْ ، فَقَالُوا: مَا لَكُمْ؟ قَالُوا: حِيلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ، وَأُرْسِلَتْ عَلَيْنَا الشُّهُبُ. قَالُوا: مَا حَالَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ إِلاَّ شَيْءٌ حَدَثَ ، فَاضْرِبُوا مَشَارِقَ الأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا ، وَانْظُرُوا مَا هَذَا الَّذِي حَالَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ. فَانْصَرَفَ أُولَئِكَ الَّذِينَ تَوَجَّهُوا نَحْوَ تِهَامَةَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ بِنَخْلَةَ عَامِدِينَ إِلَى سُوقِ عُكَاظٍ ، وَهُوَ يُصَلِّي بِأَصْحَابِهِ صَلاَةَ الْفَجْرِ ، فَلَمَّا سَمِعُوا الْقُرْآنَ اسْتَمَعُوا لَهُ وَقَالُوا: وَاللهِ هَذَا الَّذِي حَالَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ. فَهُنَالِكَ حِينَ رَجَعُوا إِلَى قَوْمِهِمْ قَالُوا: يَا قَوْمَنَا ﴿إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ۝ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلرُّشْدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدًا ۝٢﴾ الجن ، فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى نَبِيِّهِ ﷺ: ﴿قُلْ أُوحِىَ إِلَىَّ ۝١﴾ الجن، وَإِنَّمَا أُوحِيَ إِلَيْهِ قَوْلُ الْجِنِّ} {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرَقَمِ: (٤٩٢١)} .

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، دەڵێ : پێغەمبەری خوا نە قورئانی بەسەر جندا خوێندۆتەوەو نەبینیونی، پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ كۆمەڵێك لە هاوەڵانی دەرچوو، بەرەو بازاڕی (عُكاظ)، ئەویش لە حاڵێك دابوو، كە شەیتانەكان ڕێیان لێگیرابوو: گوێ لە هەواڵی ئاسمان بگرن و بڵێسە ئاگرەكانیان بۆ نێردرابوون، شەیتانەكان گەڕانەوە، پێیان گوتن : چیتانە ؟ (واتە: ئەوانەی كە چووبوون، گوێ لە هەواڵان بگرن، گەڕانەوەی لای ئەوانەی كە ناردبوویانن، گوتیان: چیتانە؟) گوتیان: ڕێمان لێگیراوە، پەردەیەك خراوەتە بەینی ئێمەو ئاسمان و بڵێسەی ئاگرمان بۆ دەنێردرێ، ئەگەر توختی ئاسمان بكەوین .

گوتیان: هیچ شتێك هەواڵی ئاسمانی لێنەگرتوونەتەوەو، نەبۆتە پەردە لە بەینی ئێوەو ئاسماندا، مەگەر شتێك ڕوویدابێ، بۆیە بە ڕۆژهەڵاتی زەویی و ڕۆژئاوایەكانیدا بگەڕێن و سەرنج بدەن، بزانن داخۆ چ شتێك ڕوویداوە ؟

ڕۆیشتن، بە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوایەکانی زەویدا، {واتە: گۆشەو کەناری زەوییان ڕاو کرد، تاکو سەرنج بدەن، چ شتێك ڕوویداوە کە بۆتە هۆی ئەوەی هەواڵی ئاسمان ڕێی لێ بگیرێ، بە نسبەت شەیتانەکانەوە}، ئەوانەیان کە بەرەو تیهامە چووبوون، چوون بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، کە لە (نَخْلَة) بوو، {ناوی شوێنێکە}بەرەو بازاڕی (عوکاظ) چوون، لەو کاتەدا نوێژی بەیانی بە هاوەڵانی دەکرد، کاتێك شەیتانەکان گوێیان لە قورئان بووو، گوێیان بۆ هەڵخست، گوتیان: ئا ئەوەیە کە ڕێی هەواڵی ئاسمانی لە ئێوە گرتووە لەوێوە گەڕانەوە بۆ لای خەڵکەکەیان، (واتە: شەیتانەکان) گوتیان: ئەی خەڵکەکەمان! ﴿إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا يَهْدِىٓ إِلَى ٱلرُّشْدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدًا ﴿٢﴾﴾ الجن، واتە: ئێمە گوێمان لە قورئانێکی سەرسوڕهێنەر بووە، کە بەرەو سەر ڕاستیی ڕێنمایی دەکات، ئێمەش بڕوامان پێهێناو، هیچ شتێك ناکەینە هاوبەش بۆ پەروەردگارمان .

ئنجا ئەوەی خوا فەرموویەتی، لەسەر زمانی ئەو جندانە بووە، {کە پێشتر شەیتان بوون، بەڵام دوایی کە گوێیان لە قورئان بووە، بوونە بڕوادار}، خوای زاڵی مەزنیش، ئەم سوورەتەی بۆ پێغەمبەری خوای ﷺ نارد : ﴿قُلْ أُوحِىَ إِلَىَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ ﴿١﴾﴾الجن، واتە: بڵێ: سروشم بۆ کراوە، کە کۆمەڵێك لە جند گوێیان هەڵخستوە .

کە بێگومان ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ سروش کرابوو، قسەی جندان بوو .

٢) {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ إِذَا قَضَى اللهُ الأَمْرَ فِي السَّمَاءِ، ضَرَبَتْ الْمَلاَئِكَةُ بِأَجْنِحَتِهَا خُضْعَانًا لِقَوْلِهِ، كَالسِّلْسِلَةِ عَلَى صَفْوَانٍ، قَالَ عَلِيٌّ وَقَالَ غَيْرُهُ: صَفْوَانٍ يَنْفُذُهُمْ ذَلِكَ، فَإِذَا: { فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ قَالُوا مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ قَالُوا } لِلَّذِي قَالَ : {الْحَقَّ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ} فَيَسْمَعُهَا مُسْتَرِقُو السَّمْعِ، وَمُسْتَرِقُو السَّمْعِ هَكَذَا، وَاحِدٌ فَوْقَ آخَرَ ، وَوَصَفَ سُفْيَانُ بِيَدِهِ، وَفَرَّجَ بَيْنَ أَصَابِعِ يَدِهِ الْيُمْنَى نَصَبَهَا بَعْضَهَا فَوْقَ بَعْضٍ، فَرُبَّمَا أَدْرَكَ الشِّهَابُ الْمُسْتَمِعَ قَبْلَ أَنْ

يَرْمِيَ بِهَا إِلَى صَاحِبِهِ، فَيُحْرِقَهُ، وَرُبَّمَا لَمْ يُدْرِكْهُ حَتَّى يَرْمِيَ بِهَا إِلَى الَّذِي يَلِيهِ إِلَى الَّذِي هُوَ أَسْفَلَ مِنْهُ، حَتَّى يُلْقُوهَا إِلَى الأَرْضِ، وَ رُبَّمَا قَالَ سُفْيَانُ: حَتَّى تَنْتَهِيَ إِلَى الأَرْضِ، فَتُلْقَى عَلَى فَمِ السَّاحِرِ، فَيَكْذِبُ مَعَهَا مِائَةَ كَذْبَةٍ، فَيُصَدَّقُ فَيَقُولُونَ: أَلَمْ يُخْبِرْنَا يَوْمَ كَذَا وَكَذَا، فَوَجَدْنَاهُ حَقًّا لِلْكَلِمَةِ الَّتِي سُمِعَتْ مِنَ السَّمَاءِ} {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرَقْم: (٤٧٠١)}.

واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕێتەوە، کە فەرموویەتی: هەر کاتێك خوا بڕیارێکی دا لە ئاسمان، (واتە: خوا کە بڕیارێك دەردەکات بۆ فریشتەکان، بە شێوەیەك لە شێوەکان، کە ئێمە نازانین چۆن فریشتەکان دەیبیستن!) فریشتەکان باڵیان لێك دەدەن، وەك ملکەچیی دەربڕین بۆ ئەو فەرمایشتەی خوا، وەك چۆن زنجیرێکی ئاسن فڕێ دەدرێتە سەر بەردێکی تەخت، (عەلیو جگە لەویش گوتوویانە: ئەو زنجیرە کە فڕێ دەدرێتە سەر ئەو بەردە تەختە، دەنگەکە بە هەموویان دەگاتو لە هەموویان تێدەپەڕێ). ئنجا کاتێك کە فەرمایشتەکەی خوا تەواو دەبێ، فریشتەکان ترسەکەیان دەڕەوێتەوە، دەڵێن: پەروەردگارتان چی فەرموو؟ ئەوانیش ئەو فەرمایشتەی کە خوا فەرموویەتی، دەڵێن: خوا هەقی فەرمووەو خوا بەرزی گەورەیە، لەو کاتەدا، ئەوانەی کە گوێ هەڵدەخەن، لە شەیتانەکان، ئەوە دەبیستن، ئەوانەش کە گوێ هەڵدەخەن، بەو شێوەیەن‌و، هەندێکیان لە سەرووی هەندێکیانەوەن، سوفیان کە یەکێکە لە گێڕەرەوانی ئەم فەرمایشتە، پەنجەکانی دەستی ڕاستی لێك کردنەوەو هەندێکیانی لەسەر هەندێکیان ڕاگرت)، ئەوەیان دەیبیستێ، دەیدا بەوەی دیکەیانو... هەتا خوارێ .

ئنجا جاری وایە ئەو بڵێسە ئاگرە، ئەوەی کە یەکەمجار گوێی لێبووە، بەر لەوەی فریا بکەوێ قسەکە بگەیەنێ بە هاوەڵەکەی خوار خۆی، ئەو بڵێسە ئاگرە، ئەو دەسووتێنێ، {واتە: ناتوانێ هەواڵەکە بگەیەنێ بە خوار خۆیو ئەوەی دیکەش بە خوار خۆی، هەتا کۆتایی}، جاری واش هەیە بڵێسە ئاگرەکە نایگرێ، بەر لەوەی هەواڵەکە بگەیەنێ بە هی خوار خۆیو بڵێسە ئاگرەکەی پێناکەوێو دەیگەیەنێ، ئەوەی دیکەش دەیگەیەنێ بە ئەوەی خوار خۆی، بەو شێوەیە هەتا دەگاتە سەر زەوی، وا پێدەچێ: سوفیان گوتبێتی:

تاکو کۆتاییەکەی دێ بۆ زەوی، {واتە: ئەو شەیتانەی لە خواری خوارەوەیە}، ئنجا لەوێ دەخرێتە سەر دەمی جادووگەرەکە، {واتە: ئەو جادووگەرەی، یاخود ئەو فاڵچییەی کە بە حیساب هەواڵ دەدا بە نادیار}، ئەویش سەد درۆی لەگەڵ تێکەڵ دەکاتو لە یەکێکیاندا ڕاست دەکا، ئنجا خەڵك دەڵێن: فلان ڕۆژەو فلان ڕۆژە، فلان هەواڵەی پێنەداین، تەماشامان کرد قسەکەی ڕاستە! مەبەست ئەو وشەیە، کە لە ئاسمان بیستراوە .

یانی : بەهۆی ئەو قسە ڕاستەوە، کە یەك لەسەر سەد (١/١٠٠)ە، خەڵك بروا بە نەوەدو نۆ (٩٩)یەکەش دەکات !!.

٣) {قَالَتْ عَائِشَةُ : سَأَلَ أُنَاسٌ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ الْكُهَّانِ؟ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَيْسُوا بِشَيْءٍ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَإِنَّهُمْ يُحَدِّثُونَ أَحْيَانًا بِالشَّيْءِ يَكُونُ حَقًّا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : تِلْكَ الْكَلِمَةُ مِنَ الْحَقِّ يَخْطَفُهَا الْجِنِّيُّ فَيَقُرُّهَا فِي أُذُنِ وَلِيِّهِ قَرَّ الدَّجَاجَةِ فَيَخْلِطُونَ فِيهَا أَكْثَرَ مِنْ مِائَةِ كَذْبَةٍ} {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرَقْم: (٦٢١٣)}.

واتە: دایکی بڕواداران عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: خەڵکێك لە پێغەمبەری خوا ﷺ یان پرسی دەربارەی کاهینەکان، {کاهین ئەوانە بوون، کە دەربارەی نادیار قسەیان کردوە واتە: فاڵچیی}، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : هیچ نین، {واتە: قسەکانیان ڕاست نین}، پێی گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! جاری وا هەیە قسەیەك دەکەنو ڕاستیش دەردەچێ ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە ئەو وشەیە لە هەق، کە جینێی ئەو قسەیە لە ئاسمان لە فریشتەکان دەدزێو، ئەو قسەیە دەخاتە گوێی دۆستەکەی خۆیەوە، {واتە: مرۆڤ کە بە تەئکید جادووگەرو کاهینەکانن}، وەك چۆن مریشك گورکە گورك دەکا، بە دەنگی، ئاوا دەیخاتە گوێی ئەو جادووگەرەوە، ئەوانیش سەد (١٠٠) درۆی لەگەڵ تێکەڵ دەکەن .

فەرموودەی دیکەش لەوبارەوە هەن، بەڵام ئێمە ئیکتیفا بەو سێ فەرموودەیە دەکەین .

## بڕگەی سێیەم : پێناسەی (شهاب)و (نیزك) :

**پێناسەی (شهاب) و (نیزك) :**

وشەی (شهاب) كۆیەكەی (شهُب)ە، خاوەنی (المعجم الوسیط) دەڵێ :

(الشهاب: الشعلة الساطعة من النار، وفي التنزيل العزيز: ﴿ أَوْ ءَاتِيكُم بِشِهَابٍ قَبَسٍ لَّعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ ﴿٧﴾ ﴾النمل، والشهاب: النجم المضيء اللامع، والشهاب جرم سماويٌّ يَسْبَحُ في الفضاء ، فإذا دخل في جوِّ الأرض ، اشتعل وصار رماداً، وفي التنزيل العزيز: ﴿ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ ثَاقِبٌ ﴿١٠﴾ ﴾الصافات)[1].

واتە: (شهاب) بریتییە: لە بڵێسەیەك كە دەبریقێتەوە لە ئاگر، لەو وەحییەش دا كە خوای زاڵ ناردوویەتە خوار، {ئەو قسەیەی مووسا، كە بە ماڵو خێزانی دەفەرموێ :) ﴿ أَوْ ءَاتِيكُم بِشِهَابٍ قَبَسٍ لَّعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ ﴿٧﴾ ﴾ النمل، {واتە: دەچم بەڵكو هەواڵێك بزانم، یاخود بزووتێكتان بۆ بێنم، (واتە: دارێك كە سەرێكی ئاگر بێ)، بەڵكو خۆتانی پێ گەرم بكەنەوە، یانی : ئاگری پێبكەنەوەو، خۆتانی پێ گەرم بكەنەوە .

هەروەها (شهاب) بە ئەستێرەیەكی تیشكدەری خاوەن ڕووناكیی دەگوترێ .

هەروەها (شهاب) بەو تەنە ئاسمانییە دەگوترێ، كە لە جەو (فضاء)دا مەلە دەكات، هەر كاتێك هاتە نێو مەودای هەوای زەوییەوە، گڕ دەگرێ و دوایی دەبێتە خۆڵەمێش، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ ثَاقِبٌ ﴿١٠﴾ ﴾ الصافات، واتە: بڵێسەیەكی كونكەر، بڵێسەیەكی سووتێنەر شوێنی كەوت.

( . محمد راتب نابلسي) لە تەفسیرەكەی خۆی، تەفسیری (نابلسي)دا[2]، پێناسەیەكی جوانی (شهاب) دەكات، دەڵێ :

---

١) ص ٤٩٧

٢) ج ٥، ص ١٦ و١٧.

وَالشُّهُبُ لَهَا تَفْسِيرٌ عِلْمِيٌّ، لاَ يَتَنَاقَضُ مَعَ التَّفْسِيرِ القُرْآنِي، فَالشِّهَابُ كَوْكَبٌ هَشٌّ انْتَهَتْ حَيَاتُهُ، وَخَرَجَ عَنْ مَدَارِهِ وَوَصَلَ إِلَى جَوِّ الأَرْضِ، فَاحْتِكَاكُه بِطَبَقَةِ الهَوَاءِ جَعَلَهُ يَتَشَهَّبُ، ثُمَّ يَتَلاشَى، وَثَمَّةَ فرق بين الشهب والنيازك، فإن النيزك تصل كتلتهُ إلى الأرض، أما الشهاب فيتشهب ويتلاشى في جوِّ السَّمَاء) .

واتە: (شهُب) كە كۆی (شهاب)ە، لێكدانەوەیەكی زانستیی هەیە، كە لەگەڵ لێكدانەوەكەی قورئاندا تێكناگیرێ، ئەویش بەو شێوەیە: (شهاب) {واتە: ئەو بڵێسە ئاگرە كە خوا شەیتانەكانی پێ تیرباران دەكات}، بریتییە: لە پارچەی ئەستێرەیەك، یاخود خڕۆكەیەك، كە كۆتایی بە ژیانی هاتوە {خڕۆكەكان، ئەوانەن كە تیشكیان نیە، وەك مانگو زەوی‌و، ئەستێرەكانیش ئەوانەن كە تیشكیان هەیە، هەموویان كاتێكی دیاریكراویان هەیە لەبەین دەچن، دەتەقنەوەو، كۆتاییان دێ}، لە سوورگەی خۆی دەردەچێ، (واتە: ئەو پارچەیە)و دەگاتە نێو مەودای هەوای زەوی، ئنجا كاتێك بە هەوای زەوی دەكەوێ، {زۆر بە خێرایی دێ‌و زەویش رایدەكێشێ}، پارچە پارچە دەبێ‌و گڕ دەگرێ‌و، لەبەین دەچێ .

جیاوازییش لە نێوان (شهب)و (نیزك) هەر ئەوەیە كە نەیزەك كوتلەكەی دەگاتە زەوی، بەڵام (شهاب) گڕ دەگرێ‌و، لەبەین دەچێ‌و، دەبێتە خۆڵەمێش لە نێو هەوای زەویدا .

كەواتە: (شهب)و (نیزك) هەریەكن بەڵام هەندێك جاران ئەو بڵێسەیە كە دێ، ئەو پارچە ئەستێرەیە، یان ئەو پارچە خڕۆكەیە، قەبارەكەی گەورەیەو فریا ناكەوێ هەمووی بسووتێ، لە نێو هەوای زەویداو، بەشێكی دەگاتە زەوی، كە جاری وا هەیە، بە قەبارەی زۆر گەورەش، كەوتۆتە نێو دەریا، یان كەوتۆتە سەر زەوی‌و شوێنەكەی زۆر قووڵ‌و گەورە كردوە، جیاوازییەكەیان ئەوەیە، هەر ئەوەیە نەیزەك قەبارەكەی گەورەترەو ئەوەی دیكەیان بچووكترە، ئنجا ئەوەی كە قەبارەكەی بچووكە، یەكسەر كە هاتە نێو مەجالی هەوای زەوی، دەسووتێ‌و، لەبەین دەچێ، بەڵام ئەوەی دیكە ئەندازەیەكی لێ دەمێنێتەوەو دەگاتە سەر زەوی .

## پرسیارێکی گرنگ :

**ئایا ئەو پارچە ئەستێرەو، خڕۆکانەی کە شەیتانەکانیان پێ بەردباران دەکرێن، هەر ئەوانەن کە لە خڕۆکەو ئەستێرەکان دەبنەوە، یاخود شتێکی دیکەش هەیەو، ئێمە نایزانین ؟**

لە وەڵامدا دەڵێم: بە پێی ڕواڵەتی ئایەتەکان، بەڵێ هەر ئەو پارچە خڕۆکەو، ئەستێرانەن کە خوا ﷻ کە باسی ئەستێرەکان دەکاو، دەفەرموێ: کردوومانن بە جوانیی بۆ ئاسمانی نزیك، هەروەها دەفەرموێ: (وحِفظًا)، واتە: ئەوان وەك چۆن جوانیین بۆ ئاسمانی نزیك، پارێزەریشن بۆ ئەو ئاسمانە لە شەیتانەکان، کە گوێ لە فریشتەکان بگرن، واتە: خوا ﷻ بۆ ئەو ئەستێرانە دوو ئامانج دیاریی دەکات :

١) جوانیین بۆ ئاسمان .

٢) پارێزەرن بۆ ئاسمان، وەك بڵێسەیەك، کە تیربارانی شەیتانەکانیان پێدەکرێ .

بەڵام لە سوورەتی (الجن)دا، کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّا لَمَسْنَا ٱلسَّمَآءَ فَوَجَدْنَٰهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا ﴿٨﴾ ﴾، واتە: ئێمە لە ئاسمان خەفتاین، تەماشامان کرد، پڕکراوە لە پاسەوانی سەختو، بەهێزو، پڕکراوە لە بڵێسان .

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، کە وێڕای ئەو پارچە خڕۆکەو، ئەستێرانە، فریشتەکانیش ئەو شەیتانانە تیرباران دەکەن .

کەواتە: دەگونجێ جۆری دیکەی دەرگرانیش هەبێ، بۆ شەیتانەکان، جگە لەوەی کە بە ڕواڵەت دەبینرێ، کە ئەو پارچانەن لە خڕۆکەو ئەستێرەکان، جیادەبنەوە .

**بڕگەی چوارەم : ئەنجامگیریی :**

بەڕێزان ! ئێمە لەم ئەنجامگیرییەشدا هەندێك بابەتی دیکە، ڕوون دەکەینەوە کە پێویست بە ڕوونکردنەوە دەکەن :

**لە کۆی ئەو ئایەت و فەرموودانە، ئەم یازدە ڕاستییە وەردەگیرێن :**

**یەکەم** : ئەوەی بە چرایان {(مَصَابیح)، کۆی (مِصْبَاحٌ)ە، واتە: چرا، کە مەبەست پێیان ئەستێرەکانن}، ڕازێنراوەتەوەو شەیتانەکانیش دەرفەتی گوێ تێدا هەڵخستنیان هەیە، ئاسمانی یەکەمە، وەك لە سووڕەتی (الصَّافَّات)، ئایەتی (٦)و، سووڕەتی (الملك) ئایەتی (٥)و، سووڕەتی (فُصِّلت)، ئایەتی (١٢)دا، هاتوە، چونکە (السماء الدنیا)، (دُنیا): (مُؤَنَّثِ)ی (أَدْنَی)یە، یانی: نزیکتر، ئەو ئاسمانەی کە لێتانەوە نزیکترە، ئنجا ئەو ئاسمانەی کە لە ئێمەوە نزیکترە ئاسمانی یەکەمە، لە سەرووی ئەوەوە: ئاسمانەکانی دووەم و سێیەم و چوارەم و پێنجەم و شەشەم و حەوتەم، هەن، تاکو دەگاتە سەرێ و دەگاتە درەختی کۆتایی (سِدْرَةُ المُنتهی)و، دەگاتە عەرشی خوای پەروەردگار .

**دووەم** : مەبەست لە پاراستنی ئاسمان، ئاسمانی یەکەم، پاراستنیەتی لەوەی کە شەیتانەکان گوێی تێدا هەڵبخەن، لە قسەی فریشتەکان، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا دەفەرموێ : ﴿ لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلۡمَلَإِ ٱلۡأَعۡلَىٰ وَيُقۡذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٖ ﴿٨﴾ ﴾ الصافات، واتە: ناتوانن گوێ بگرن بۆ کۆمەڵی سەرێ، (کۆڕی باڵا)، {کە مەبەست پێیان فریشتەکانن} و لە هەموو لایەکەوە تیر باران دەکرێن .

**سێیەم** : لە نێوان فەرمایشتی خوا، کە دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلۡمَلَإِ ٱلۡأَعۡلَىٰ وَيُقۡذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٖ ﴿٨﴾ ﴾، ئەوەدا کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا مَنِ ٱسۡتَرَقَ ٱلسَّمۡعَ ﴿١٨﴾ ﴾ الحجر، (مەگەر کەسێك گوێ هەڵبخاو، قسەیەك بە پەنهانیی وەرگرێ) .

هیچ تێکگیرانێك نیە، چونکە ئەوەی پێشی دەفەرموێ: گوێ ئاگرن، واتە: بە کەیفی خۆیانو، بە شێوەیەکی ئاسایی، بە ئاسانیی گوێ ئاگرن، ئەوەی دیکەش دەفەرموێ: گوێ هەڵدەخەنو بە پەنهانیی وشەیەك دەدزن، مانای وایە حاڵەتێکی نائاساییە.

چـوارەم: پاش هاتنی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ، ئەو ڕێ لێگرتنەی شەیتانان، قورستر بووە، بە بەڵگەی: ﴿ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَن يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَابًا رَّصَدًا ﴿٩﴾ ﴾الجن، جندەکان دەڵێن: ئێمە پێشتر لە ئاسمان دادەنیشتین، گوێمان هەڵدەخست، بەلام هەر کەس ئێستا گوێ هەڵبخات، بڵێسەیەکی ئاگر بۆی لە بۆسە دایە .

ئنجا مەرج نیە تەنیا بە هاتنی پێغەمبەری خاتەم (محمد) ﷺ ئەو ڕێیە بەسترابێ، بەڵکو دەگونجێ بە نسبەت هەموو پێغەمبەرانەوە هەروا بووبێ، بەلام لە نێوان هاتنی پێغەمبەر عیسادا، تاکو هاتنی پێغەمبەری خاتەم ﷺ، لەو ماوەیەدا، ئەو ڕێیە کراوەتەوە، چونکە وەحیی نەهاتووە، بۆ پێغەمبەران (علیهم السلام) بۆیە ئەو پاسەوانیی کردنو ئێشکگرتنەی فریشتەکانو بڵێسە ئاگرەکان، لە ئاسمان، کە شەیتانەکان نەچن، گوێ نەگرن، ئەو پارێزگارییکردنە، بەو شێوەیە نەماوە، چونکە کە وەحیی نەیەت، مەترسیی ئەوە نیە، شەیتانەکان بیدزنو، دوایی بیگەیەنن بە کاهینو جادووگەرەکان .

هەرچەندە دەشگونجێ تایبەت بووبێ، بە پێغەمبەری خاتەم (محمد)ەوە ﷺ، بەلام من وای تێدەگەم بۆ هەموو پێغەمبەران وا بووە، بەلام ئەم ماوەی پێنج سەدو ئەوەندە ساڵە[1]، لە نێوان پێغەمبەری خاتەمو عیسادا (علیهما الصلاة والسلام)، کە ئەو ڕێیە تا ڕادەیەك ئاسایی کراوەتەوە، جندەکان وایانزانیوە هەروا بووە، چونکە ماوەیەکی زۆر بووەو، چەند سەدەی پێچوون .

---

١) ئەگەر عیسا (علیه السلام) لە ساڵی یەکەمی (١)ی زایینی لەدایك بووبێو، پێغەمبەری کۆتایی (محمد) ﷺ ئاشکرایە لە ساڵی (٥٧٠)دا لەدایك بووەو، لە ساڵی (٦١٠)ی زایینی ﷺ وەحیی بۆ هاتووە، کەواتە: (٥٧٠) ساڵ کەوتۆتە نێوان لەدایك بوونی عیسا ﷺ موحەممەدەوە . علیهما الصلاة والسلام .

ئەمە بۆچوونی خۆمەو لە هیچ كتێبێكدا نەمبینیوە بەڵام وای تێدەگەم .

**پێنجەم**: بە پێی مانای زانراوو ڕواڵەتیی ئایەتەكان: مەبەست لە بەردباران، یان: تیربارانكردن - كە چەند وشەیەك لەوبارەوە هاتوون، وەك:

١/ (قَذْف) . ٢/ (رُجُوم) . ٣/ ﴿ شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ وَنُحَاسٌ ﴿٣٥﴾ ﴾الرحمن .

٤/ (حِفْظًا) . ٥/ (شِهابا رصَدا) . ٦/ (شِهابٌ ثَاقِب) .

مەبەست لەو حاڵەتە كە ئەو وشانەی بۆ بەكارهاتوون: هاویشترانی پارچە وردە جیابووەوەكانن لە ئەستێرەو خڕۆكەكان، دوای ئەوەی ئەو ئەستێرەو خڕۆكانە لەبەین دەچن، وەك پێشتریش لە ڕووی زانستییەوە باسمان كرد .

**شەشەم**: بە پێی فەرموودەی ژمارە: (٤٩٢١) لە (صحيح البخاري)، ڕێی ئاسمان لە شەیتانەكان گیراوە، بەڵام بە پێی ئایەتەكان تەنیا ڕێیان لێ تەنگو زەحمەت كراوە نەك یەكجاریی بەستراب‌ێ، چونكە ئایەتەكان كە دەفەرموون : ﴿ إِلَّا مَنِ ٱسْتَرَقَ ٱلسَّمْعَ ﴿١٨﴾ ﴾الحجر، یان دەفەرموێ : ﴿ إِلَّا مَنْ خَطِفَ ٱلْخَطْفَةَ ﴿١٠﴾ ﴾الصافات، مانای وایە: بواری ڕفاندنی وشەیەك، گوێ هەڵخستنێكی بە پەنهانیی، ماوە، بەڵام لەگەڵ مەترسیی فەوتانی ئەو شەیتانەدا .

**حەوتەم**: بە پێی فەرموودەی ژمارە: (٤٧٠١) لە (صحيح البخاري)، شەیتانەكان پێكەوە هاوكاریی دەكەن لە گەیاندنی ئەو هەواڵەدا كە لە فریشتانی دەدزن، چونكە (سوفیان) وای وێنا كردوە، كە ئەویش گوێی لە هی پێش خۆیو، ئەویش لە هی پێش خۆی بووەو، دیارە كە پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بۆ وێنا كردوون، كە پەنجەكانی دەستی ڕاستی بەو شێوەیە لێكردوونو لەسەریەك ڕایگرتوون، كە یەكەمیان دەیگەیەنێ بە دووەمو دووەم بە سێیەم... هەتا دەگاتە خواری خوارەوە .

**هەشتەم**: بە پێی فەرموودەی ژمارە: (٤٧٠١) لە (صحيح البخاري)، ئەوە جادووگەرەكانن، كە شەیتانەكان ئەو جۆرە هەواڵانەیان بۆ دەبەن، جادووگەرانو ئەوانەی لەگەڵ شەیتانەكاندا سەروكاریان هەیە، ئنجا ئەگەر جادووگەریان

پێ بگوترێ، ئەگەر فاڵچییان پێ بگوترێ، ئەگەر كاهینیان پێ بگوترێ، عەڕڕافیان پێ بگوترێ ... هتد .

**نۆیەم**: هەروەها هەر بە پێی فەرمودەكانی ژمارە (٤٧٠١)و (٦٢١٣)، جادووگەرەكان درۆی زۆر دەخەنەگەڵ هەواڵە دزراوە ڕاستەكانو، زۆر پەنهانكارانە هەواڵەكە دەگەیەنن، بە جادووگەرەكانو، ئەوانەی سەروكاریان لەگەڵ شەیتانەكاندا هەیە .

**دەیەم**: بە پێی ئایەتەكانو بە پێی فەرموودەكانیش، ئەو شەیتانانەی ئەو هەواڵانە دەدەن ، كە هەواڵی ئاسمان بدزن، بەردباران دەكرێنو دەسووتێنرێنو دەردەكرێن، چونكە خوا ئەو وشانەی بۆ بەكارهێناون :

أ/ ﴿ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ ثَاقِبٌ ﴿١٠﴾ ﴾الصافات، واتە: بڵێسەیەكی كونكەر، یان سووتێنەر، شوێنی كەوتو پێی كەوت .

ب/ ﴿ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ مُّبِينٌ ﴿١٨﴾ ﴾الحجر، بڵێسەیەكی ڕوون، شوێنی كەوتو پێی كەوت .

ج/ ﴿ وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ ﴿٨﴾ ﴾الصافات، لە هەموو لایەكەوە تیرباران دەكرێن.

**یازدەیەم**: ئەو هەواڵانەی شەیتانەكان دزیویانو دەیاندزن، هیچ پەیوەندییان بە وەحییەوە نیە، بە بەڵگەی ئەوە كە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ إِنَّهُمْ عَنِ ٱلسَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ ﴿٢١٢﴾ ﴾الشعراء، واتە: شەیتانەكان كەنارگیر كراون، لەوە كە گوێ بگرن بۆ وەحیی .

كەواتە: شەیتانەكان دەرفەتی ئەوەیان نەبووە، گوێ بۆ ئەو وەحییە بگرن، كە خوا بە جیبریل دا ناردوویەتی بۆ پێغەمبەران، بەڵكو گوێ لە فەرمایشتو ڕێنمایی دیكەی خوا ﷻ دەگرن، كە بۆ فریشتەكانی دەنێرێو، ئەوە ئێستاش هەر هەیە، چونكە خوا بەردەوام خوا ﷻ فەرمانكردنو ڕێنماییكردنی هەیە بۆ فریشتەكان، بۆیە ئێستاش شەیتانەكان ئەو هەواڵانە هەر دەدەن .

**مەسەلەی نۆیەم** : هەر کام لە زەمین‌و، چیایەکان‌و ڕووەکەکان‌و، بایە موتوربەکەرەکان‌و، هۆکارەکانی دیکەی ژیان‌و گوزەران، چاکەو نیعمەتی خوان‌و، بەزەیی‌و میهرەبانیی خوایان تێدا دەدرەوشێتەوە :

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡأَرۡضَ مَدَدۡنَٰهَا وَأَلۡقَيۡنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَيۡءٖ مَّوۡزُونٖ ١٩ وَجَعَلۡنَا لَكُمۡ فِيهَا مَعَٰيِشَ وَمَن لَّسۡتُمۡ لَهُۥ بِرَٰزِقِينَ ٢٠ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە موبارەکە ، لە یازدە (١١) بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم :** ﴿ وَٱلۡأَرۡضَ مَدَدۡنَٰهَا ﴾، ئێمە زەمینمان لێک کێشاوەتەوە .

(المَدُّ : هو الجَرُّ)، یانی: ڕاکێشانی شتێک‌و لێک کێشانەوەی، کە لێرەدا مەبەست لە (لێک کێشانەوە)، واتە: مەودای زەویمان فراوان کردوەو زەویمان پان ڕاخستوە، ئەمەش بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنێ : کە زەوی خڕو هێلکەییە، چونکە ئەگەر چوارگۆشە، یان لاکێشە، یان سێگۆشە، یان شەش گۆشە، یان هەر شێوەیەکی دیکە بووایە، جگە لە حاڵەتی خڕیی‌و، هێلکەیی نەدەگونجا ئەم تەعبیرەی بۆ بەکاربێ، کە خوای زاناو توانا فەرموویەتی، ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە کە زەوی (خڕ) هەڵکەوتوە لە هەر لایەکی زەوی بڕۆی، ناگەیە قەراغ‌و سووچ‌و گۆشەیەك، کەواتە کە دەفەرموێ: زەویمان لێك کێشاوەتەوە ئەوە تەنیا لەگەڵ حاڵەتی بازنەیی‌و، هێلکەیی زەویدا، دەگونجێ‌و ئەگەر گریمان چوارگۆشە، لاکێشە، یان هەر شێوەیەکی دیکە بووایە، دەگەیشتیە کەنارەکەی، بەڵام ئێستا ناگەیە کەناری، چونکە هەمووی وەك یەکەو، سێ لەسەر چواری ڕووبەرەکەیشی بە ئاو داپۆشراوە .

**بڕگەی دووەم :** - ﴿وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ﴾، چیایەكانیشمان تێفڕێداون، خوا ﷻ لە چەند شوێنێكی قورئاندا، بۆ چیایەكان هەر وشەی (ألقی) بەكاردێنێ، واتە: تێفڕێدان، فڕێماندانە نێوی، تێمان هاویشتوون، ئنجا ناشفەرموێ: (وألقینا علیها)، چیاكانمان فڕێداونە سەری، بەڵكو دەفەرموێ: تێفڕێداون، فڕێداونە نێوی، ئەمەش لەبەرئەوەیە كە ئەو چیایانە ، لە ئەنجامی ئاگر پڕژێنەكاندا پەیدابوون، ئەو ئاگر پڕژێنانەی كە بریتین : لە دەردانی گەرمایی نێو ناخی زەوی، كە - وەك پێشتر لە سوورەتی (یونس)دا باسمان كرد - نێو ناخی زەوی هەمووی ئاگرو، ئاسنی تواوەیە، ئنجا جار جار كە لە شوێنێكەوە توێكڵی زەوی دەتەقێ و، ئەو ئاگرو، ئاسنە، دەردەقوڵێ، زۆر بەرز دەبێتەوە دوایی دێتەوە سەری، پێشێ بەرز دەبێتەوە ئنجا دوایی بەرەوخوار دێتەوە، كەواتە: فڕێدراوەتە نێوی، دوایی هاتۆتەوە، ئەوە بە نسبەت ئەوە كە لە بارەی چیایەكانەوە دەفەرموێ: هەڵماندراونە نێو زەوی .

بەڵام ئایا بۆچی دەفەرموێ: ﴿وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ﴾؟ واتە: چیایە چەسپاوەكانمان خستوونە نێوی ؟لەبەرئەوەی وەك زانایانی جیۆلۆجیا دەڵێن: هەر چیایەك كە تۆ دەیبینی، چەندەی بە دەرەوەیە، دە پازدە (١٠ - ١٥) هێندەی بە ناخی زەویدا چۆتە خوار، یانی: چیایەك ئەگەر پێنج (٥) كیلۆمەتر بەرز بێ، دەبێ (٥) جارانی (١٠ - ١٥) بكەی، واتە: (٥٠ - ٧٥) كیلۆمەتری بە ناخی زەوییدا چۆتە خوارێ، بۆیە خوا دەفەرموێ: چیاكانمان خستوونە نێوی، نەك هەر لەسەری بن !

**بڕگەی سێیەم :** - ﴿وَأَنْبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَيْءٍ مَّوْزُونٍ﴾، هەروەها لە زەویدا، هەموو شتێكی كێشراومان ڕواندوە، هەموو شتێكی كێشراو ( كُلِّ شَيْءٍ مَّوْزُونٍ)، واتە: هەموو ڕووەكێك: كێشەكەی و ئەندازەكەی دیارە، هەم لە ڕووی چۆنیەتییەوە، هەم لە ڕووی چەندیەتیەوە، ئەو ڕووەكانەی دەڕوێن، هەركامیان : هەمووی لەلایەن خوای كاربەجێ وە ئەندازەگیریی كراوە، بۆ وێنە: زانایانی كشتوكاڵناس دەڵێن: سێزدە هەزار (١٣) جۆر گەنم هەیە،

چەند هەزار جۆری دار خورما هەیە، سێ سەد (٣٠٠) جۆرە ترێ هەیە، هەروەها، هەموو ئەو میوەو دانەوێڵانە، چەندان جۆریان هەن، ئنجا هەر کامێکیان: قەبارەکەی، (هی دانەکەی، یاخود میوەکەی)، ڕەنگەکەی، تامەکەی، شێوەکەی، ئەندازەگیریی کراوەو، جیایە لەوی دیکە.

ئنجا مرۆڤ ئەگەر تەماشا بکات ! زۆر وردەکاریی سەرسوڕهێنەر دەبینێ، بۆ وێنە: دانەوێڵەو، میوە وەك یەك پێناگەن، بەڵکو دانەوێڵە هەمووی پێکەوە پێدەگات، ئنجا جۆیە، برنجە، گەنمە، هەموو جۆرەکانی گەنم، هەرزنە، گەنمەشامییە، زوڕاتە، نیسکە، نۆکە، ماشە..هتد، ئەوانە هەموویان پێکەوە پێدەگەن، بەڵام میوە، وەجبە وەجبە پێدەگات! ئنجا تۆ هەر تەماشا ئەوە بکە! ئەگەر هاتباو دانەوێڵەش، وەك میوە پێگەیشتبایە، یانی: ئەمرۆ هەندێکی پێبگات، سبەینێ هەندێکی پێبگات، دوو سبەی هەندێکیو، مانگێکی دیکە هەندێك، بۆ وێنە: هەنجیری وا هەیە، چەندان جار بەردەدا، هەروەها ترێ، ئەو کاتە خەڵك چۆن دانەوێڵەی بۆ هەڵدەگیرا، چۆن درەوی بۆ دەکرا؟ ئەمرۆ هەندێکی پێبگات، سبەینێ هەندێکیو، دووسبەی هەندێکیو، مانگێکی دیکە، هەندێك! نەخێر بەڵکو دانەوێڵە هەمووی پێکەوە پێدەگات، تاکو هەمووی پێکەوە بدروێتەوەو ڕەنێو بهێنرێ .

بەڵام میوە هەمووی پێکەوە پێناگات، ئەگەر هەمووی پێکەوە پێگەیبایە، تەنیا لە چەند ڕۆژێکی دیاریکراودا، مرۆڤەکان لێی بەهرەمەند دەبوون، ئنجا فریاش نەدەکەوتن بیخۆنو بەکاریبێنن، هەروەها هەمووی لە یەك کاتدا: ترێ، هەنجیر، هەرمێ، خورما، خۆخ، هەنار... هەمووی لە یەك کاتدا دەهاتە بازاڕو ، ئەندازەیەکی زۆری خەڵك لێی زیاد دەبوو، یان دەبوو هەڵگیرێو کاتی خۆی هەڵگرتن نەبووە، چونکە شوێنیان نەبووە تێیدا هەڵیبگرن، بۆیە هەمووی خەسار دەبوو .

<u>برگەی چوارەم</u> : ﴿ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَايِشَ ﴾، هەروەها لە زەویدا، هۆکارەکانی ژیانو گوزەرانمان بۆ ئێوە ڕەخساندوون .

مَعِیشَة) کە بە (مَعَایِش) کۆدەکرێتەوە، واتە: ئەو شتەی کە ئینسان پێیان دەژی، هۆکارەکانی ژیان‌و گوزەران .

**بڕگەی پێنجەم :** - ﴿ وَمَن لَّسْتُمْ لَهُۥ بِرَٰزِقِينَ ﴾، هەروەها هۆکارەکانی ژیان‌و گوزەرانی کەسانێکیش کە ئێوە بژیودەرو، ڕزیێدەریان نین، هی ئەوانیشمان ڕەخساندوە، هی خۆشتان‌و، هی ئەوانەش کە بژیوو ڕۆزییان لەسەر ئێوە نیە.

**بڕگەی شەشەم :** - ﴿ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ ﴾، هیچ شتێك نیە، مەگەر عەمبارەکانی لە لای ئێمەن، هەمووی لای خوایە ﷻ‌و بە پێی ئەو یاسایانەی دایناون، ئەو شتانە بەرهەم دێن .

**بڕگەی حەوتەم :** - ﴿ وَمَا نُنَزِّلُهُۥٓ إِلَّا بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴾، بە ئەندازەی زانراوو دیاریکراویش نەبێ، نایێنرینە خوار .

ئەمە ئاماژەیە بە هاوسەنگیی لە گەردووندا، ئەم گەردوونە، تەوبەری هاوسەنگیی تێدایە، هیچ شتێك لە ئەندازەی پێویست، زیاد ناکا، ئێستا (با)، جار جار کە لە ئەندازەی خۆی تێدەپەڕێنێ، تەماشا دەکەی دەبێتە هۆی کاولکاریی، ئەو بەیەنەی پێشوو لە (مۆسکۆ)، بایەك هەڵیکردبوو، چوار هەزار (٤٠٠٠) درەختی هەڵتەکەندبوو، هەروەها لە ئەمریکا، لە وڵاتانی دیکە (با) کە هەڵدەکا، دەبێتە هۆی تسوونامیی، واتە: دەبێتە هۆی ئەوەی دەریاش هەڵدەستێ، ئەوە تەنیا جار جارێك ئەوە ڕوودەداو، ئەگەر بەردەوام وابووایە، ژیانی سەر زەوی تێکدەچوو، خوای پەروەردگار جارجارێك ئەوە پێشانی خەڵك دەدا، تاکو بزانن ئەم زەوییەی کە بەم شێوەیە ژیانێکی ئارامی تێدا دەگوزەرێنن‌و، هیچ کام لە دروستکراوەکان: با، ئاو، باران، هەورە تریشقە، بوومە لەرزە، ئاگرپژێن، ڤایرۆس‌و میکرۆبەکان، لە سنووری خۆیان دەرناچن‌و، لە سنووری خۆیان ڕادەگیرێن، ئەوە پەروەردگارو، خاوەنێکیان هەیە، ڕایگرتوون، ئەگەرنا، کاتێك جار جارێك ڕێشمەیان بۆ درێژ دەکات، جار جارێك مۆڵەتیان دەدا، دەبینین چۆن کاولکارییان لێدەکەوێتەوە ؟

**بڕگەی هەشتەم :** - ﴿ وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَـٰحَ لَوَٰقِحَ ﴾، بایەكانیشمان ناردوون، پیتێنەرن، موتوربەكەرن .

بەهۆی بایەكانەوە، هەم هەورەكان موتوربە دەبن، كە لێرەدا بە پێی سیاقەكە دیارە . زیاتر مەبەستی پێ هەورەكانە، چونكە دوایی دەفەرموێ: ﴿ فَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ﴾، دوای ئەوەی كە بایەكان دەنێرین و موتوربە دەكەن، دەپیتێنن، (واتە: هەورەكان دەپیتێنن)، لەسەرێوە ئاوتان بۆ دەنێرینە خوار .

هەروەها بایەكان دارو درەختیشو، گوڵو گوڵزاریش، دەپیتێنن، موتوربە دەكەن، تۆوی نێرەكە دەبەن بۆ مێیەكە، هەروەك لە ڕێی هەنگو پەپوولەو زیندەوەرەكانی دیكەو، باڵندەكانیشەوە، پرۆسەی پیتاندنو موتوربەی دارو درەخت هەر دەبێ، بەڵام لە ڕێگای بایەكانیشەوە دەبێ، با لێیان دەداو تۆوی نێرەكە دەبات بۆ مێیەكە .

وشەی (لواقح) كۆی (لا قح)ە، كە بە مانای پیتێنەر، جاری واش هەیە (لاقح) بە مانای حوشترێكی ئاوس دێ، كە لێرە خوازراوەتەوە بۆ بایەك كە شێی تێدایە، هەڵمی ئاوی تێدایە، واتە: بایەكان دەنێرین، وەك ئاوس بن، چونكە شێدارن، خوا بەهۆی بایەكانەوە ؛ هەڵمی ئاویان هەڵگرتوە، چونكە دوایی ئەو بایانەن ، كە هەوران پەیدا دەكەن: هەڵمی ئاوی سەر دەریاكان كۆ دەكاتەوەو، دەیكاتە هەورو، دەبێتە ئاوو لە ئاسمانەوە دێتە خوار .

دەشگونجێ (لواقح) كۆی (مُلْقِحة) بێ، یانی: ئەوەی كە غەیری خۆی دەپیتێنێو، موتوربەی دەكات .

**بڕگەی نۆیەم :** - ﴿ فَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ﴾، لە سەرێوە ئاومان دابەزاندۆتە خوارێ .

لە قورئاندا بە زۆریی باسی ئاو (ماء) دەكات، چونكە ئەگەر فەرموویای: مَطَر)، هەر بارانی دەگرتەوەو، فەرموویای: (ثلج) تەنیا بەفری دەگرتەوەو فەرموویای (بَرَدْ) بەس تەرزەی دەگرتەوە، بەڵام خوا ﷻ وشەیەكی بەكارهێناوە،

کە هەر سێکیان بگرێتەوە : ئاومان ناردۆتە خوارێ، بە شێوەی بەفرو، تەرزەو، باران !

**برگەی دەیەم :** - ﴿ فَأَسْقَيْنَٰكُمُوهُ ﴾، بە ئێوەمان نۆش کردوە، واتە: وامان کردوە ئێوە بینۆشن، بیخۆنەوە .

**برگەی یازدەیەم :** - ﴿ وَمَآ أَنتُمْ لَهُۥ بِخَٰزِنِينَ ﴾، بێگومان ئێوەش کۆکەرەوەو هەڵگری ئەو ئاوە نین، خوا دەیپارێزێو، هەڵیدەگرێ، یانی : ئەگەر خوا ﷻ ئاوی شیرینی ناردبایە خوارێ، بەلام مرۆڤەکان بۆ خۆیان ئاویان پاشەکەوت کردباو هەڵگرتبایە، چۆنیان بۆ هەڵدەگیرا؟ ئەو هەموو ئاوە زۆرە، بەلام خوا ﷻ لە ناخی زەویدا، هەڵیدەگرێ، زەویی دەمار دەمار دروست کردوە، وای دروست کردوە ئەو ئاوە هێندە ناچێتە خوار بە ناخی زەویدا، کە مرۆڤەکان دەستیان نەیگاتێ، بەڵکو وایکردوە کە لە ڕووبەری نزیکی زەوی، سەرەوەی زەویدا، هەڵبگیرێ، بە شێوەی عەمباراو، دوایی بە شێوەی کانیی‌و سەرچاوە، یاخود بیرو کارێز، مرۆڤەکان ئاوی لێ بهێننە دەرێ‌و، لێی بەهرەمەند ببن .

**مەسەلەی دەیەم‌و کۆتایی :** بەس خوا ژیێنەرو مرێنەرە میراتگرەو هەر بۆخۆی زانایە بە ڕابردووان‌و بە دواکەوتووان‌و، هەر ئەویش کۆکەرەوەی هەموو لایەکە، لە ڕۆژی دواییدا :

خوا ﷻ دەفەرمووێ : ﴿ وَإِنَّا لَنَحْنُ نُحْيِۦ وَنُمِيتُ وَنَحْنُ ٱلْوَٰرِثُونَ ﴿٢٣﴾ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَقْدِمِينَ مِنكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَـْٔخِرِينَ ﴿٢٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَحْشُرُهُمْ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم سێ ئایەتە موبارەکە ، لە چوار برگەدا:**

**برگەی یەکەم :** - ﴿ وَإِنَّا لَنَحْنُ نُحْيِۦ وَنُمِيتُ ﴾، هەروەها تەنیا هەر ئێمەین بە دڵنیاییی کە دەژیەنین‌و دەمرێنین .

واتە: هیچ کەسی دیکە ئەوەی لە دەست نایەت، نە ژیانلنی لە دەست دێ، نە مراندنیشی لە دەست دێ، بەو شێوەیە کە خوا ﷻ مەبەستیەتی، هۆکارەگانی مردن، تەنیا بە دەست خوان، تەنانەت ئەگەر مرۆڤەکانیش هەندێك لەو هۆکارانە برەخسێنن، بەلام گرنگ ئەوەیە بە ویستی خوان، ئەگەرنا خوا ﷻ وایکردوە کە لە ڕۆژیی دواییدا، هیچکەس نەمرێ، نە خەڵکی بەهەشت، نە خەڵکی دۆزەخ، بە تایبەت خەڵکی دۆزەخ، کە خوا لە سوورەتی (إبراهیم) ئایەتی (١٧) دەربارەیان دەفەرموێ : ﴿ وَيَأْتِيهِ ٱلْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ ﴾، واتە: مردنی لە هەموو لایەکەوە بۆ دێ، کەچی ناشمرێ، یان وەك لە سوورەتی (الأعلی)دا دەفەرموێ : ﴿ ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴿١٣﴾ ﴾، واتە: دوایی نە تێیدا دەمرێ، (ئەو مردنە کە دەیزانین)و، نە تێشیدا دەژیەن (ژیانێك کە پێی بگوترێ : ژیان)، کەواتە: ژیاندن‌و مراندن تەنیا بە دەست خوان .

**برگەی دووەم :** - ﴿ وَنَحْنُ ٱلْوَٰرِثُونَ ﴾، هەر ئێمەش میراتگرین.

واتە: هەموو شتێك هی ئێمەیەو ، سەرەنجام مرۆڤەکان هەموو ئەم سەر زەوییە بەجێدێڵن، ئەم سەر زەوییە خاڵی دەبێ لە دانیشتووانی‌و هەموو شتێك بەس بۆ خوا دەمێنێتەوە، وەك چۆن لە ئەسڵدا هەر هی خوا بووەو بۆ تاقیکردنەوە خستوویەتە بەردەستی مرۆڤەکان، دواییش هەموو شتەکان تەنیا بۆ خوا دەمێننەوەو، خوا دەبێتە میراتگری ئەو مرۆڤانەی کە لەسەر زەوی بوون‌و، هەموو شتەکان بەجێدەمێنن .

<u>برگەی سێیەم :</u> - ﴿ وَلَقَدۡ عَلِمۡنَا ٱلۡمُسۡتَقۡدِمِينَ مِنكُمۡ وَلَقَدۡ عَلِمۡنَا ٱلۡمُسۡتَـٔۡخِرِينَ ﴾، بێگومان ئێمە ئەوانەی پێش ئێوەمان زانیوە، پێشکەوتووەکانتان، ئەوانەی کە ڕابردوون ﴿ وَلَقَدۡ عَلِمۡنَا ٱلۡمُسۡتَـٔۡخِرِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەشمان زانیوە کە لە ئێوە دواکەوتوون، واتە: ئەوانەی کە جارێ نەهاتوون .

ئەوانەی لە پێشەوە ڕۆیشتوونو، ئەوانەش کە دوایی دێن .

یاخود ئەوانەتان کە پێشکەوتوون، لە بڕواهێنانو لە هاتنە نێو ئیسلامداو، ئەوانەتان کە دواکەوتوون، لە ئیمان هێنانو لە مسوڵمانەتیو تاعەت، ئنجا دواکەوتوون، واتە: هەر دێنە نێو ئیسلامەوە، یاخود دوایی دێن، هەردوو واتاکە دەگرێتەوە .

<u>برگەی چوارەم :</u> - ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَحۡشُرُهُمۡۚ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٞ ﴾، بێگومان هەر پەروەردگارت کۆیان دەکاتەوە، بە دڵنیایی ئەو کاربەجێو زانایە .

بەڵێ لە ڕۆژی دوایی دا، ئەو خەڵکە، بەس بە خوا کۆدەکرێتەوە، بۆ نموونە: ئێستا کە دەوری هەشت ملیار (٨،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) مرۆڤ لەسەر زەوی دەژینو بەردەوام ڕوو لە هەڵکشینیشن، جگە لە خوای خاوەنیان ، بەکێ کۆدەکرێنەوە ؟!

لێرەدا هەندێك لە زانایان وشەی (ٱلۡمُسۡتَقۡدِمِينَ )یان بە مردووان لێکداوەتەوە، واتە: ئەوانەی کە تێپەڕیون، واتە: مردووەکانو، (ٱلۡمُسۡتَـٔۡخِرِينَ ) واتە: زیندووەکان .

یاخود (ٱلۡمُسۡتَقۡدِمِينَ ) واتە: گەلانی پێشووو، (ٱلۡمُسۡتَـٔۡخِرِينَ ) واتە: گەلانی داهاتوو .

یاخود وەك گوتم : (ٱلۡمُسۡتَقۡدِمِينَ ) واتە: ئەوانەی کە لە چاکەدا پێشکەوتوون، (ٱلۡمُسۡتَـٔۡخِرِينَ ) واتە: ئەوانەی لە چاکەدا دواکەوتوون .

هەندێك لە تەفسیرەكان هەندێك شتیان هێناوە، كە بەڕاستی لەگەڵ تەفسیری ئایەتەكانداو، لەگەڵ مانا و مەبەستی ئایەتە موبارەكەكاندا ناگونجێ، بۆ وێنە:

أ/ هەندێكیان گوتوویانە: مەبەست لە (ٱلۡمُسۡتَقۡدِمِينَ) ئەوانەن كە لە ڕیزەكانی جەنگو جیهاددا لە پێشەوەن، لە سەنگەرەكانی پێشەوەن، (ٱلۡمُسۡتَـٔۡخِرِينَ) ئەوانەن كە خۆ وەدوادەدەن!

بەڵام ئەم سوورەتە سوورەتێكی مەككەییە! جارێ قورئانی مەدینەیی هەر دانەبەزیوە، جارێ جەنگو جیهاد نەهاتۆتە پێشێ، جەنگو جیهاد لە قۆناغی مەدینەدا هاتوە، لە سوورەتی مەدینەییەكاندا باسكراوە .

ب/ هەروەها هەندێكی دیكە گوتوویانە : مەبەست لە (ٱلۡمُسۡتَقۡدِمِينَ) ئەوانەی كە لە ڕیزەكانی نوێژێ دەچنە پێشێ، (ٱلۡمُسۡتَـٔۡخِرِينَ) ئەوانەی كە خۆ وەدوادەدەن ، بە مەبەستی سەرنجدانی ئافرەتێكی جوان، كە ئەو كاتە هەبووە ! كە پارێزەكارەكان تاكو نەیبینن چوونە پێشەوەو، ئەوانی دیكەش بە مەبەستی دیتنی ، چوونە ڕیزەكانی دواوە، كە لە ڕیزەكانی ئافرەتانەوە نیزیك بوون !! [1] .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

١) وادیارە بیریان لەوە نەكردۆتەوە، كە ئەم سوورەتە مەككەییەو، نوێژی بە كۆمەڵ (جماعة)یش لە مەدینە دانراوە .

# دەرسی دووەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەشمان بیستو پێنج (٢٥) ئایەت دەگرێتە خۆی، وەك دەرسی پێشوو، ئایەتەكانی : (٢٦ – ٥٠)، ئێوەڕۆكی ئەم (٢٥) ئایەتەش هەمووی باسی یەك بابەتە، كە بریتیە لە دروستكردنی مرۆڤ ، كە مەبەست ئادەمە، بابی مرۆڤان .

پاشان فەرمانكردن بە ئیبلیس كە بابی جیننە، كە لەگەڵ فریشتاندا، كڕنووشی ڕێزگرتن بۆ ئادەم بەرێ، بەڵام ئیبلیس سەرپێچیی لە فەرمانی خوا دەكاتو، خواش نەفرینی لێ دەكات، پاشان سەرەنجامی شوومی شوێنكەوتووانی ئیبلیسو، سەرەنجامی سەرفرازانەی شوێنكەوتووانی هیدایەتی خوا، ڕوون كراوەتەوە .

﴿ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ﴿٢٦﴾ وَٱلۡجَآنَّ خَلَقۡنَٰهُ مِن قَبۡلُ مِن نَّارِ
ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرٗا مِّن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ
﴿٢٨﴾ فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾ فَسَجَدَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ
كُلُّهُمۡ أَجۡمَعُونَ ﴿٣٠﴾ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰٓ أَن يَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا
لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ لَمۡ أَكُن لِّأَسۡجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقۡتَهُۥ مِن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ
حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ﴿٣٣﴾ قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٞ ﴿٣٤﴾ وَإِنَّ عَلَيۡكَ ٱللَّعۡنَةَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلدِّينِ
﴿٣٥﴾ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴿٣٦﴾ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ﴿٣٧﴾ إِلَىٰ يَوۡمِ
ٱلۡوَقۡتِ ٱلۡمَعۡلُومِ ﴿٣٨﴾ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ
﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنۡهُمُ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٤٠﴾ قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَيَّ مُسۡتَقِيمٌ ﴿٤١﴾ إِنَّ
عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴿٤٢﴾ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوۡعِدُهُمۡ
أَجۡمَعِينَ ﴿٤٣﴾ لَهَا سَبۡعَةُ أَبۡوَٰبٖ لِّكُلِّ بَابٖ مِّنۡهُمۡ جُزۡءٞ مَّقۡسُومٌ ﴿٤٤﴾ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي
جَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ ﴿٤٥﴾ ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ ﴿٤٦﴾ وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ إِخۡوَٰنًا
عَلَىٰ سُرُرٖ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٧﴾ لَا يَمَسُّهُمۡ فِيهَا نَصَبٞ وَمَا هُم مِّنۡهَا بِمُخۡرَجِينَ ﴿٤٨﴾ نَبِّئۡ
عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلۡعَذَابُ ٱلۡأَلِيمُ ﴿٥٠﴾ ﴾

# مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی مرۆڤ (ئادەم)مان لە قوڕێکی ڕەشی گۆڕاوی ڕەقهەڵاتوو دروستکردوە ﴿٢٦﴾ جند (ئیبلیس)یشمان پێشتر لە گڕە ئاگر دروستکرد بوو ﴿٢٧﴾ یادیش بکەوە! کاتێك پەروەردگارت بە فریشتانی فەرموو: من بەدیهێنەری بەشەرێکم لە قوڕێکی ڕەشی گۆڕاوی ڕەقهەڵاتوو ﴿٢٨﴾ ئنجا هەر کات ڕێکمخست و، لە رووحی خۆم فووم بەبەردا کرد، بۆی بە کڕنووش دا بکەون ﴿٢٩﴾ یەکسەر فریشتەکان هەموویان وێکڕا کڕنووشیان برد ﴿٣٠﴾ جگە لە ئیبلیس، ئامادە نەبوو کە لەگەڵ کڕنووش بردووان بێ ﴿٣١﴾ (خوا) فەرمووی: ئەی ئیبلیس! ئەوە چیتە کە لەگەڵ کڕنووش بردووان دا نی؟ ﴿٣٢﴾ (ئیبلیس) گوتی: ناگونجێ کڕنووش بۆ بەشەرێك ببەم، کە لە قوڕێکی ڕەشی گۆڕاوی ڕەقهەڵاتوو دروستت کردوە! ﴿٣٣﴾ (خوا) فەرمووی: کەواتە: لێی بچۆ دەرێ، بێگومان تۆ دەرکراوی ﴿٣٤﴾ بە دڵنیاییش هەتا ڕۆژی سزاو پاداشت نەفرینت لێ بێ ﴿٣٥﴾ (ئیبلیس) گوتی: پەروەردگارم! هەتا ئەو ڕۆژەی (مرۆڤەکان) زیندوو دەکرێنەوە بمهێڵەوە ﴿٣٦﴾ (خوا) فەرمووی: مسۆگەر تۆ لە هێڵراوانی ﴿٣٧﴾ هەتا ڕۆژی کاتی زانراو، ﴿٣٨﴾ (ئیبلیس) گوتی: پەروەردگارم! بەهۆی ئەوەوە کە بێمرادت کردم، بە دڵنیایی (بۆ مرۆڤەکان) خراپەکارییان لە زەویدا بۆ دەڕازێنمەوەو، تێکڕایان گومڕا دەکەم ﴿٣٩﴾ جگە لە بەندە هەڵبژاردەو ساغەکانت ﴿٤٠﴾ (خوا) فەرمووی: ئەوە ڕێیەکی ڕاستە لەسەر من ﴿٤١﴾ کە بەندەکانم جگە لەو بێمرادانەی شوێنت دەکەون، تۆ دەسەڵاتت

بەسەریاندا ناشکێ (٤٢) بێگومان دۆزەخیش ژوانگەی تێکڕایانە (٤٣) حەوت دەروازەی هەن، بۆ هەر دەروازەیەکیان بەشێکی لەوان بۆ دیاریکراوە (کە پێیدا بچنە ژوورێ) (٤٤) بە دڵنیایی پارێزکاران لە نێو باخو سەرچاوان دان (٤٥) پێیان دەگوترێ: بە سەلامەتیو دڵنیایی بچنە نێوی (٤٦) هەرچی کینەی لە سینەکانیان دابوو، لێمان داڕنین (وپاکمان کردنەوە) برایانە لەسەر تەختو کورسییان، ڕوو بە ڕووی یەکدی دانیشتوون (٤٧) لەوێدا ماندوێتییان تووش نابێو، لێشی ناچنە دەرێ (٤٨) هەواڵ بدە بە بەندەکانم کە: بێگومان من لێبوردەی بە بەزەییم (٤٩) تەنیا سزای منیش سزای بە ئێشو ژانە (٥٠) }.

# شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

صَلْصَالٍ ) : (أصلُ الصلصالِ : تردّدُ الصوتِ مِنَ الشيءِ اليابسِ، وسُمّيَ الطّينُ الجافُّ صلصالاً)، ڕیشەی وشەی (صَلْصَالٍ) بریتییە لە شتێك کە وشك بێ، دەنگ بداتەوە، قوڕی وشکهەڵاتوو، یان ڕەقهەڵاتووش پێی دەگوترێ: (صَلْصَالٍ)، چونکە ئەگەر سەری پەنجە (پت)ی لێ بدەی، یان شتێکی لێ بدەی، دەزرینگێتەوەو دەنگی دێ .

حَمَإٍ ): (الحمأُ والحمأةُ: طينٌ أسودُ منتنٌ)، وشەی (حَمَأ) و (حَمْأة) بە قوڕێکی ڕەشی بۆنکردوو، دەگوترێ .

مَّسْنُونٍ ): (أي: مُتَغيِّر) واتە: گۆڕاو، هەندێکیش گوتوویانە: واتە: بۆنکردو، (مُنْتِن) .

سَوَّيْتُهُۥ ): واتە: ڕێکمخست، (تسويةُ الشيءِ : جَعْلُه سواءً، إستوى الطّعامُ: نَضَجَ، واستوى المكانُ : اعتدَلَ)، کە دەگوترێ : ئەو شتە تەسویە کرا، (تَسويةُ الشيءِ) شتێك کە تەسویە دەکرێ، واتە : وەك یەکی لێ بکەی‌و ڕێکی بخەی، دەگوترێ : (إستوى الطّعامُ)، واتە : چێشتەکە پێ گەیشت، کوڵی، هەروەها دەگوترێ : (استوى المكانُ)، واتە: شوێنەکە ڕێك بوو، یانی: بەرزیی‌و نزمیی تێدا نەما .

وَنَفَخْتُ ): واتە: فووم پێدا کرد، (النَّفخُ: نفخُ الريحِ في الشيءِ، ومنهُ نفخُ الرُّوحِ)، واتە: فوو بریتییە لە فووکردن لە شتێك، ڕووح بە بەرداکردنیش، تەشبیە کراوە بە (فوو) کاتێك کە فوو لە شتێك دەکرێ، ئەو ڕووحە لەبەر ئەوەی کە ئێمە نازانین چۆنە، ئاوا دەخرێتە نێو ئەو جەستەیەوە .

فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ): بۆی بە کڕنووش دابکەون، (عِبارةٌ عن مُبادَرَتِهِم إلى السَّجُود) مەبەست پێی ئەوەیە کە دەست پێشخەریی بکەن لە کڕنوش بردندا، دەگوترێ: (وَقَعَ أي سَقَطَ)، کەوت، بۆیە من وام لێکداوەتەوە: ﴿ فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴾، بۆی بە کڕنووش دا بکەون .

رَجِيمٌ ): (الرَّجْمُ: الرَّمْيُ بالحِجَارَةِ، وَيُستَعَارُ الرَّجْمُ لِلرَمي بالظَّنِّ والتوهُّمِ، والشَّتْمِ والطَّرْدِ)، وشەی (رَجْم) بریتیە لەوە کە بەرد بهاویشترێتە شتێك، بەلاّم دوایی خوازراوەتەوە بۆ گومان پێبردن‌و، خەیاڵ کردن‌و، قسە پێگوتن‌و، جنێو پێگوتن‌و، دەرکردن .

ٱللَّعۡنَةَ ): (اللَّعْنُ: الطَّرْدُ والإبْعَادُ عَلَى سَبيلِ السُّخطِ)، (لَعْن) بریتیە لە دەرکردن‌و دوورخستنەوە، لە ئەنجامی لێ تووڕە بووندا .

أَغۡوَيۡتَنِي ): واتە : منت بێمراد کرد، دەگوترێ : (غَوِيَ الفَصِيلُ غَوَىً : فَسَدَ جَوْفُهُ مِنْ شُرْبِ اللَّبَنِ، غَوَى غَيّاً : خِلاَفُ الرُّشْدِ، وَالإسْمُ الغَوَايَة: أي خابَ)، هەندێك لە زانایان تاکو ئێستاش مانای وشەی (غَيٌّ) و (ضَلال) یان، لێ تێکەڵ بووە، کە لە ڕاستیی دا لێك جیان، چونکە خوا ﷻ کە دەفەرموێ : ﴿ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمۡ وَمَا غَوَىٰ ۝٢ ﴾النجم، واتە: هاوەڵەکەتان {کە پێغەمبەرە} نە (ضَلال)ی هەیەو، نە (غَوایة)، (ضَلال) واتە: گومڕایی، بەلاّم (غَوایة)، واتە : بێمرادیی، (غَوَایة) لە ئەنجامی گومڕایی دا پەیدا دەبێ، هەروەها : (ضَلال)و (غَوایة)، پێچەوانەی (هُدى)و (رُشد)ن، (هدى) بەرێ زانینەو، (رشد) بە ئامانج گەیشتن‌و سەرڕاستییە .

(رشد) لە ئەنجامی (هدى)دا، پەیدا دەبێ، هەروەك (غَيّ) لە ئەنجامی (ضَلال)دا پەیدا دەبێ، ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿ أَغۡوَيۡتَنِي ﴾، واتە: منت بێمراد کرد، منت بەدبەخت کرد، چارە ڕەشت کردم، وات لێکردم بێ ئاکام بم .

دەگوترێ : (غَوِيَ الفَصِيلُ غَوىً)، (فَصِيل) واتە: بەچکە حوشتر، ئەگەر ئەو وشەیەی بۆ بەکاربێ، واتە: نێو هەناوی تێکچوو، لە ئەنجامی ئەوەدا کە شیری خواردۆتەوە، ئەگەر شیرەکەی پێ نەکەوتبێ .

دەگوترێ : (غَوَىَ غَيّاً)، ئەوە پێچەوانەی (رَشَدَ رُشْداً)ە، (رُشْد) سەر ڕاستیی و بە ئامانج گەیشتنەو، (غَيّ) بێ ئاگامیی و بێمرادیی .

ٱلْمُخْلَصِينَ ): (خلَصَ الشيء مِنَ التَّلَفِ خلُوصاً: سَلِمَ وَنَجَا، وَخلَصَ الـمَاءُ مِنَ الكَدَرِ: صَفَا)، دەگوترێ : (خلَصَ الشيء مِنَ التَّلَفِ خلُوصاً)، واتە: ئەو شتە دەرباز بوو لە لەبەین چوون، یانی : قوتار بوو، رزگاری بوو، دەگوترێ : (خَلَصَ المَاءُ مِنَ الكَدَرِ)، ئاوەکە لە لێڵییەکە پاك بۆوە یانی : ساف بۆوەو لێڵیی پێوە نەما .

غِلٍّ ) : یانی : کینە (حِقْد)، کینەش ڕقێکی پەنگ خواردووەوەیە کە لە دڵدایەو، بریتییە لە تووڕەبوونێكو بوغزێك کە خاوەنەکەی نەتوانێ جێبەجێی بکات، لە دڵدا دەپەچنەرێو هەڵدەگیرێ .

نَصَبٌ ): (نَصِبَ، نَصَباً: تَعِبَ ، أَعْيا)، (نَصِبَ، نَصَباً)، واتە: ماندوو بوو، بێ تاقەت بوو، بێ وزە بوو .

# مانای گشتی ئایەتەکان

سەرەتا دەبێ ئەوە بڵێم: کە ئێمە لە سەرەتای سووڕەتی (الأعراف)دا، بە درێژیی باسی بەسەرهاتی ئادەمو حەووا (سەلامی خوایان لێ بێت)و ئیبلیسمان کردوەو، هەموو ئایەتەکانی کە لە هەموو سووڕەتەکاندا هاتوون لەوبارەوە، هەموویانمان بە یەکەوە هێناونو، سەرنجێکی وردمان لێ داون، بۆیە لێرەدا هەڵوەستەی زۆر لەبەردەم ئەو ئایەتانەدا ناکەین، چونکە لە سووڕەتی (الأعراف)دا، ئەم ئایەتانەو سەرجەم ئەو ئایەتانەی دیکە، کە لە بارەی بەسەرهاتی ئادەمو ئیبلیسەوە هاتوو ون، پێکەوە قسەمان لێکردوون، بۆیە لێرە بە خێرایی بەسەر مانای گشتی ئەم ئایەتانەدا دەڕۆین .

خوا ﷻ بەسەرهاتی ئادەم ﷺ: چۆن دروست بووەو، بەسەرهاتی ئیبلیس: چۆن یاخیی بوو لە فەرمانی خواو، ئامادە نەبوو کڕنووشی ڕێزگرتن بۆ ئادەم بەرێ؟ لە چەند شوێنێك لە قورئاندا، ئەو بەسەرهاتەی بۆ ئێمە گێڕاوەتەوە، تاکو مرۆڤ هەم بزانێ لە کوێوە هاتوەو، چۆن هاتوە؟ هەم بشزانین کە ئیبلیسو ئەوانەی شوێنکەوتووی ئیبلیسن لە وەچەی خۆی، لە شەیتانەکان، هەڵوێستیان بەرانبەر بە ئێمە چۆنەو، بۆچیش ئەو دوژمنایەتییەیان لەگەڵ مرۆڤاندا بەرپاکردوە ؟

خوا دەفەرمووێ : ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن صَلْصَـٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە مرۆڤمان لە قوڕێکی وشکهەڵاتوو، کە ئەویش لە قوڕێکی ڕەشی بۆنکردووی گۆڕاو، بوو، دروست کردوە .

وشەی (ٱلْإِنسَـٰنَ) لێرەدا مەبەست پێی ئادەمە، کە ئەویش بابی هەموو مرۆڤانە، بەڵێ لێرەدا مەبەست دروستبوونی جەستەی یەکەمین مرۆڤە، جەستەی ئادەم، کە لە قوڕێك کە کۆن دەبێو ماوەیەکی بەسەردا دەچێ، ڕەش هەڵدەگەڕێو بۆن دەکات،

دوایی کە ماوەیەکی دیکەی بەسەردا چوو، وشکهەڵدەگەڕێ و ڕەقهەڵدەگەڕێ، جەستەی مرۆڤ بەو قۆناغانەدا تێپەڕیوە، کاتی خۆیشی گوتمان: خوای زاناو شارەزا بە چەند شێوەیەك تەعبیر دەکات لە چۆنیەتی دروستبوونی جەستەی ئادەم :

أ/ لە شوێنێ دەفەرموێ : قوڕ (طين) .

ب/ لە شوێنێ دەفەرموێ : گڵ (التراب).

ج / لە جێیەك : قوڕی وشك هەڵاتوو (صَلْصَـٰلٍ).

د/ لە جێیەك : قوڕی ڕەشی بۆنکردوو (حَمَإٍ مَّسْنُونٍ).

هـ / لە جێیەك : قوڕی وشکی خەزەف ئاسا (صَلْصَـٰلٍ كَٱلْفَخَّارِ).

کە ئەوانە هەموویان قۆناغەکانی دروست بوونی جەستەی مرۆڤن، کە خوا پەروەردگار بە پێی یاسایەکی تایبەتی خۆی، جەستەی یەکەمین مرۆڤی دروست کردوە ، کە ئادەمە عليه السلام .

﴿ وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَـٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴾، جند (جَانّ)یشمان پێشتر لە بڵێسەی ئاگرێکی سووتێنەر، کە دەچێتە نێو شتانەوە، جەستەی جند (جان)یشمان لەوە دروست کرد .

زانایان دەڵێن : لێرەدا (جَانّ) مەبەست پێی ئیبلیسە، وەك چۆن (ٱلْإِنسَـٰنَ) مەبەست پێی ئادەمە، (جَانّ)یش، مەبەست پێی ئیبلیسە، ئنجا وەك چۆن ئادەم بابی مرۆڤە، ئیبلیسیش بابی جندە .

﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّى خَـٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن صَلْصَـٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴾، یاد بکەوە! کاتێك پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرموو: من بە دیهێنەری مرۆڤێکم لە قوڕێکی وشکهەڵاتوو، (کە پێشتریش) قوڕێکی ڕەشهەڵگەڕاوی بۆنکردووی گۆڕاو بووە .

﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴾، ئنجا هەر كاتێك رێكمخستو، لە ڕووحی خۆم فووم بە بەرداكرد، بۆی بە كڕنووش دا بكەون .

ڕێكمخست، واتە: جەستەكەی كەوتە قۆناغو حاڵەتێك، كە بگونجێ ڕووحی بە بەردا بكرێ، ئەو كاتە دوای ئەوەی لە ڕووحێك كە بە تایبەتیی دروستم كردوە، فووم بە بەردا كرد، كڕنووشی - ڕێزگرتنی بۆ بەرن - هەڵبەتە ڕووحیش هەر دروستكراوی خوایە، بەلام یانی : ئەو ڕووحە كە بە تایبەتیی دروستم كردوە، بۆیە پاڵی دەداتە لای خۆی، وەك چۆن خوا ﷻ حوشتر (ناقة)ەكەی صاڵحی پاڵداوەتە لای خۆی، وەك لە سووڕەتی (الأعراف) ئایەتی : (٧٣)دا دەفەرموێ :

﴿ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً ﴾، هەرچەندە حوشترەكان هەموویان حوشتری خوان، بەلام خوا حوشتری صاڵحی بە شێوەیەكی تایبەت دروست كرد بوو، هەروەها هەموو ئەو شتانەی دیكە كە خوا ﷻ بە تایبەت دروستیان دەكات، پاڵیان دەداتە لای خۆی .

﴿ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴾، فریشتەكان تێكڕا وێكڕا كڕنووشیان برد، پێشێ دەفەرموێ : (كُلُّهُمْ) واتە: هەموویان تێكڕا، دوایی دەفەرموێ: (أَجْمَعُونَ ) وێكڕا، یانی: تێكڕاو وێكڕا، نەك هەموویان كڕنووش بەبەن، بەلام هەندێكیان ئێستاو، هەندێكیان دوایی، بەڵكو هەموویان تێكڕاو وێكڕا، پێكەوە كڕنووشیان بۆ برد، ﴿ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰٓ أَن يَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴾، جگە لە ئیبلیس ئامادە نەبوو كە لەگەڵ كڕنووش بردووان بێ، (أَبَىٰ) یانی: (إمْتَنَعَ) ئامادە نەبووو سەرپێچیی كرد، لا ملیی كرد!

﴿ قَالَ يَٰٓإِبْلِيسُ مَا لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴾، (خوا) فەرمووی: ئەی ئیبلیس! ئەوە چیتە بۆچی لەگەڵ كڕنووش بردووان نابی، بۆچی لەگەڵیان نەبووی‌و لەگەڵ وان كڕنووشت نەبرد؟ كە بە تەئكید مەبەست پێی كڕنووش بردنی ڕێز لێگرتنە، خوا دروستكراوێكی ئاوازەی دروست كردوە، كە ئادەمە، بابی مرۆڤان،

کە پێشتر فریشتەکان بوون‌و، جنیش بوون، هەم بە فریشتەکان دەفەرموێ‌و، هەم بە بابی جنیش دەفەرموێ: کڕنووشی ڕێزگرتن بۆ ئەو دروستکراوەی سێیەم ببەن، کە ئەویش دروستکراوێکی دیکەیە، دێتە پاڵ ئەو دوو جۆرە دروستکراوەی دیکە ، فریشتەکان‌و جند، ئەوە هاوەڵێکی دیکەتان بۆ پەیدا بوو، بەڵام ئەو دروستکراوە جیایە لە ئێوە :

فریشتە لە ڕووناکیی دروستکراون‌و، جند لە ئاگر دروست کراوە، بەڵام ئەمە دروستکراوێکی دیکەیە لە قوڕ دروست کراوە (واتە: لە ئاو + گڵ)، دوای چەند قۆناغێك، لە گۆڕانکاریی بەسەرداهێنان، کڕنووشی ڕێزگرتنی بۆ بەرن، ئەویش دروستکراوی خوایەو خوا فەرمانتان پێدەکات ڕێزی لێ بگرن .

﴿ قَالَ لَمْ أَكُن لِّأَسْجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقْتَهُۥ مِن صَلْصَـٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴾، ئیبلیس گوتی : {نەك هەر کڕنووش نابەم}، هەر ناگونجێ من کڕنووش بەرم بۆ مرۆڤێك کە لە قوڕێکی وشکەهەڵاتوو، کە ئەویش لە قوڕێکی ڕەش هەڵگەڕاوی بۆنکردووی گۆڕاو، هاتۆتە دی، من ناگونجێ کڕنووش بۆ دروستکراوێکی وا بەرم !

﴿ قَالَ فَٱخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴾، خوا فەرمووی : لێی بچۆ دەرێ، ڕاناوی مێینە، هەم بۆ ئاسمان بەکاردێ‌و، هەم بۆ بەهەشتیش بەکاردێ، هەردووکیان دەگرێتەوە، واتە: لە بەهەشت بچۆ دەرێ، یان: لە ئاسمان بچۆ دەرێ، بێگومان تۆ نەفرین لێکراوو دوورخراوەی لە بەزەیی خوا .

﴿ وَإِنَّ عَلَيْكَ ٱللَّعْنَةَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴾، هەتا ڕۆژی سزاو پاداشت نەفرینی خوات لێ بێت، تۆ لە بەزەیی خوا دوورخراویەوەو دەرکراوی، ﴿ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴾، (ئیبلیس) گوتی : پەروەردگارم ! چاوەڕێم بکە، بمهێڵەوە، تاکو ئەو ڕۆژەی ئەو مرۆڤانەی تێدا زیندوو دەبنەوە .

﴿ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿٣٧﴾ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ﴿٣٨﴾ ﴾، (خوا) فەرمووی : بێگومان تۆ لە هێڵدراوانی‌و لە مۆڵەت دراوانی، تاکو ڕۆژی کاتی دیاریکراو، یانی: تاکو ئەو کاتە نا، کە تۆ دەڵێی: (کاتی زیندووبوونەوە)، بەڵکو تاکو ئەو کاتەی

کە دیاریکراوەو لە نەخشەی خوادا هەبووە کە دەبێ ئیبلیس بمێنێتەوە، تاکو ئەو کاتەی کە ئاخیر زەمان دێ، یانی : تاکو مرۆڤ لەسەر زەویی هەبن، تۆش ببە، چونکە ئیبلیس بەڵێنی داوەو هەڕەشەی کردوە لە مرۆڤەکان، کە گومڕایان بکات، واتە: مانەوەی تۆ تاکو ئەو کاتە کە مرۆڤ لەسەر زەویین، پێویست دەکات .

﴿ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾، (ئیبلیس) گوتی: پەروەردگارم! بەهۆی ئەوەوە کە بێمرادت کردم، لە زەویدا بۆیان دەرازێنمەوە، چییان بۆ دەرازێنێتەوە؟ بە سیاق دیارە یانی: هەرچی کە تۆ پێت ناخۆشەو، بۆ ئەوان خراپە لە دنیاو دوارۆژدا، بۆیان دەرازێنمەوە، کوفرو گوناهو شیرك‌و نیفاق‌و خراپە، هەموویان بۆ دەرازێنمەوە ﴿ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾، تێکڕایان بێمراد دەکەم، تێکڕایان بێئاگام‌و دەستخەڕۆ دەکەم .

﴿ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾، جگە لەو بەندانەت کە لە نێویاندا هەڵتبژاردوون، واتە: ئەو بەندانەی کە گوڵبژێرت کردوون لە نێویاندا، یاخود دەربازت کردوون، ئەمە خوێندراویشەتەوە: (مُخلصِین) واتە: ئەوانەی کە خۆیان دەرباز کردوەو، کردەوەکانی خۆیان ساغ کردۆتەوە بۆ تۆ، بەندایەتیی خۆیان بۆ تۆ ساغکردۆتەوە، ئەوانە من دەستەڵاتم بەسەریاندا ناشکێ .

بەڕێزان : سەرنج بدەن! درۆ هێندە شتێکی ناشیرینە، ئیبلیسیش ویستوویەتی درۆ نەکات، ویستوویەتی هەڕەشەیەك نەکات، بۆی نەچێتە سەر، کەچی مرۆڤی وا هەیە لەو ڕووەوە لە ئیبلیس خراپترە قسەیەك دەشزانێ درۆیەو، دەشیکات! گفتێکە بە خەڵکی دەدات، دەشزانێ درۆیەو بۆی جێبەجێ ناگرێ، بۆ وێنە: کاتی هەڵبژاردنە، یان کاتی پێش هەڵبژاردنە، یان دوای هەڵبژاردنە، دەچێ سەردانی ناوچەیەك دەکات، فەرسیلیان[1] تاکو پشتێنێ بۆ دێنێ، کەچی دەغڵیش نەڕواوەو، هیچ دەربەستیش نیە!! درۆ هێندە ناشیرینە، ئیبلیسیش حەزی نەکرد درۆ بکات، دەڵێ: هەموویان گومڕا دەکەم بێجگە لە بەندە هەڵبژاردەکانت، یاخود بەندە خۆ ساغکەرەوەکانت .

---

١) فەرسیل : دەغڵ و دانەوێڵەی تازەڕواو تازە چەکەرە کردوو .

﴿ قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَيَّ مُسۡتَقِيمٌ ﴾، (خوا) فەرمووی: ئەوە ڕێیەکی ڕاستە لەسەر من، واتە: ئەوە ڕێیەکی ڕاستە لەسەر من، کە تۆ دەسەڵاتت بەسەر بەندە چاکەکانمدا نەشکێ. ﴿ إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٌ ﴾، بێگومان بەندەکانی من تۆ دەسەلاتت بەسەریاندا ناشکێ، ﴿ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴾، مەگەر ئەوانەی کە لە بێمرادانو لە بێ ئاگامان شوێن تۆ دەکەونو پەیڕەویی لە تۆ دەکەن، ئەوانە موبارەکی خۆت بن !

﴿ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوۡعِدُهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴾، دۆزەخیش ژوانگەی هەموویانە، لەوێدا هەموو کۆدەبنەوە، ﴿ لَهَا سَبۡعَةُ أَبۡوَٰبٖ لِّكُلِّ بَابٖ مِّنۡهُمۡ جُزۡءٞ مَّقۡسُومٌ ﴾، حەوت دەروازەو دەرگای هەن، بۆ هەر دەرگاو دەروازەیەك، لەو شوێنکەوتووانەی تۆ، بەشێکی دابەشکراوو دیاریکراو هەیە، کە لەو دەروازەیەوە دەچنە نێو دۆزەخەوە .

وا دیارە :

ئەو حەوت دەروازانە بۆ حەوت جۆرە گوناهو تاوانن، هەر کەسێ زیاتر فلان گوناهی کردوە، لەو دەروازەوەو، ئەوی دیکە لەو دەروازەوەو، ئەوی دیکە لەو دەروازەوە، هەر وەك چۆن بەهەشتیش هەر وایە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: کە بەهەشت دەرگایەکی هەیە، دەروازەیەکی هەیە بە ناوی (ڕیّان) تەنیا ئەوانەی کە زیاتر عیبادەتی ڕۆژوویان ئەنجام داوە، لەو دەروازەوە دەچنە ژووری، {في الجنّة ثمانية أبواب، منها بابٌ يُسمّى (الرّيّان) لايدخلُهُ الاّ الصّائمون} {صحيح البخاري: ٣٢٥٧، صحيح مسلم: ١١٥٢ عن سهل بن سعد}، هەروەها لە (صحيح البخاري)و (صحيح مسلم)دا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەهەشت هەشت دەروازەی هەن، هی وا هەیە لە هەر هەشت دەروازانەوە بانگ دەکرێ، ئەبووبەکری صیدیق خوا لێی ڕازی بێ گوتی: کەس هەیە لە هەر هەشت دەروازەکەوە بانگ بکرێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : بەڵێ ! ئومێدم وایە تۆ یەکێکیان بی[1] !

---

١) {فَقَالَ أبُو بَكْرٍ رضي الله عنه: بِأبِي أنْتَ وَأمِّي، يَا رَسُولَ اللهِ مَا عَلَى مَنْ دُعِيَ مِنْ تِلْكَ الأبْوَابِ مِنْ ضَرُورَةٍ، فَهَلْ يُدْعَى أحَدٌ مِنْ تِلْكَ الأبْوَابِ كُلِّهَا ؟ قَالَ: نَعَمْ وَأرْجُو أنْ تَكُونَ مِنْهُمْ} اخرجه البخاري برقم: ١٧٩٨، ومسلم برقم: ١٠٢٧.

ئنجا دێتە سەر باسی سەرەنجامی پارێزکارانو دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴾، بێگومان پارێزکاران لە نێو باخو بێستانو گوڵو گوڵزارو، کانییو سەرچاوەکاندان، ﴿ ٱدْخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ ﴾، پێیان دەگوترێ: بە سەلامەتییو، بە دڵنیایی هێمنیی بچنە نێو باغەکانەوە، ﴿ وَنَزَعْنَا مَا فِى صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ ﴾، هەرچی کینەو بوغزی بە سینەکانیانەوە هەبوو، لە دڵەکانیاندا هەبوو، لێمان دارنین، سینەیانمان پاك کردوە.

﴿ إِخْوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴾، برایانە لەسەر کورسییو قەنەفان بەرانبەر یەکدی دانیشتوون (لە بەهەشتدا)، ﴿ لَا يَمَسُّهُمْ فِيهَا نَصَبٌ وَمَا هُم مِّنْهَا بِمُخْرَجِينَ ﴾، نە ماندوویەتییان دەگاتێو، نە لێشی دەکرێنە دەرێ، ﴿ نَبِّئْ عِبَادِىٓ أَنِّىٓ أَنَا ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، هەواڵبدە بە بەندەکانم، کە هەر من لێبوردەی میهرەبانو بە بەزەییم، ﴿ وَأَنَّ عَذَابِى هُوَ ٱلْعَذَابُ ٱلْأَلِيمُ ﴾، ئاگاداریشیان بکەوە: کە تەنیا سزای من، سزای بە ئێشە.

خوا بە لوتفو کەرەمی خۆی لە لێبوردنو بەزەییو میهرەبانیی خۆی بەهرەمەندمان بکاتو، لە ئازارو سزای بە ئێشی خۆی، چەپاڵەمان بداتو بمانپارێزێ .

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم :** مرۆڤ (ئادەم) لە قوڕێکی ڕەشهەڵگەڕاوی بۆنکردووی ڕەق بووو، جند (ئیبلیس)یش لە بڵێسەی ئاگر، دروست کراون :

خوا دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ٢٦ وَٱلۡجَآنَّ خَلَقۡنَٰهُ مِن قَبۡلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ٢٧ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە موبارەکە ، لە چوار بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم :-** ﴿ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە مرۆڤمان دروستکردوە .

ئایا جەختکردنەوەکە بۆ چییە؟ بۆ ئەوەیە کە مرۆڤ بزانێ، جەستەی بابی مرۆڤان کە ئادەمە، لە چی دروست بووە؟ لە گڵ‌و ئاوی تێکەڵ کە دەبێ بە قوڕ، قوڕەکەش کە کاتی بەسەردا دەچێ، بۆن دەکات‌و ڕەش هەڵدەگەڕێ‌و، دوایی ماوەیەکی بەسەردا دەچێ، تەڕاییەکەی پێوە نامێنێ‌و وشك دەبێ‌و ڕەق هەڵدەگەڕێ، جەستەی بابی مرۆڤان لەوە دروست بووە! کەواتە: ئەی مرۆڤەکان! بزانن لە کوێوە هاتوون؟ ئێوە لە خاکەوە هاتوون، کەواتە: خاکیی بن، یاخیی مەبن، بۆیە ئەهلی تەصەووف دەڵێن: (مَنْ عَرَفَ نَفْسَهُ عَرَفَ رَبَّهُ)، واتە: هەر کەسێك خۆی بناسێ، پەروەردگاریشی دەناسێ، ئەوەی خۆی بناسێ لە کوێوە هاتووەو چۆن دروستکراوە؟ لە خوای پەروەردگاریشی یاخی نابێ‌و دەیناسێ‌و، وەك ئاکە پەرستراوی، مامەڵەی لەگەڵدا دەکات .

**بڕگەی دووەم :** - مرۆڤ لە چی دروستکراوە؟ ﴿ مِن صَلْصَٰلٍ ﴾، (صلصال: طِينٌ جافٌّ يُصَوِّت)، واتە: قوڕێکی وشك بوو، کە دەنگ دەداتەوە، لە سووڕەتی (الرحمن)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ مِن صَلْصَٰلٍ كَٱلْفَخَّارِ ﴿١٤﴾ ﴾، لە قوڕێکی وشکبووی وەك : قوڕی سوورکراوە.

(الفَخَّار: مَا يَبِسَ بالطَّبْخِ بالنَّار)، (فَخَّار) بریتیە لە قوڕێك کە ئاگری دەدرێتە بەرێ و لەسەر ئاگر ڕەق دەبێ، وەك: دیزەو گۆزەو کووپەو شەربە، یاخود خشتی سوور، ئەوە (فَخَّار)ی پێ دەگوترێ، قوڕێك کە بە ئاگر سووتێنراوەو وەك خەڵووزی لێهاتوە بە شێوەیەك لە شێوەکان وشك بووە، نەك بسووتێنرێ ببێتە خۆڵەمێش، ئەویش شێوازێکی تایبەتیی خۆی هەیە، کە ئاوای لێدێ .

**بڕگەی سێیەم :** - ﴿ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٦﴾ ﴾، (حمَا) کۆی (حَمْأة)یە، ئەویش: (طينٌ أسودُ مُنْتِنٌ) قوڕێکی ڕەشی بۆنکردوو (بۆگەن)ە.

(مَّسْنُونٍ)یش بە مانای (متَغَيِّر) گۆڕاو، دێ، هەروەها بە مانای (مُنتِن) بۆگەن دێ، (لم يتسَنَّه) یانی : (لم يتغيَّرْ)، نەگۆڕاوە، یاخود (لم يَتعفَّنْ)، واتە: بۆنی نەکردوە .

ئەوە باسی قۆناغەکانی دروستبوونی جەستەی مرۆڤە، خوا ﷻ لێرەدا دەیانخاتە ڕوو، واتە : یەکەمین مرۆڤ (ئادەم ﷺ) .

**بڕگەی چوارەم :** - ﴿ وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴾، (جَانّ)یشمان پێشتر دروست کرد بوو لە ئاگری (سمُوم) .

(السَّمُوم: الحَرُّ الشَّدِيدُ النافِذُ في المَسَامِّ، والجمعُ: سَمَائِم)، (سَمُوم) واتە: گەرمایییەکی زۆر کە دەچێتە نێو کونەکانی پێستەوە، کۆی (سَمُوم) بریتیە لە (سَمَائِم)، (جَانّ)یش مەبەست پێی ئیبلیسە، بابی جینن .

کەواتە: پێش ئەوەی ئادەم دروست بێ، ئیبلیس لە بڵێسەی ئاگر دروست بووە، ئنجا وەك چۆن جەستەی مرۆڤان لە قوڕێ دروست بووە، بەلام ئێستا تۆ دەست بکەیە مرۆڤێك، دەستت بە قوڕ نابێ، بە هەمان شێوەش جیننیش لە ئاگر دروست بوون، بەلام مەرج نیە ئێستا کە دەستت کردە جنێك، یان جینێك کە دەچێتە نێو جەستەی مرۆڤێکەوە، یەکسەر بسووتێ! لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: کە یەکێك لە هاوەڵانی بینی تووڕە بوو بوو، دەماری ملی هەڵسا بوو، ڕەنگی سوور بوو بۆوە، زانی کە شەیتان بە جۆرێك لە جۆرەکان دەستی گەیاندۆتێ، یاخود چۆتە نێو جەستەیەوە، فەرمووی: وشەیەك دەزانم ئەگەر بیڵێت: ئەو حاڵەتەی نامێنێ، گوتیان: چییە؟ فەرمووی: بڵێ: (أَعوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)، پەنا بە خوا دەگرم لە شەیتانی ڕەجمکراو، بەلام کاتێك پێیان گوت: ئەوەندەی دیکە، تووڕە بوو، گوتی: خۆ شێت نەبووم[1]! لە حەقیقەتیش دا کەسێك شەیتان زەفەری پێ برد بێ، ئەگەر شێتیش نەبوو بێ، وەك شێتان مامەڵەو ڕەفتار دەکات، هەر بۆیە ئەویش ڕێنمایی و ئامۆژگارییەکەی پێغەمبەری ﷺ قبووڵ نەکردوە!

ئنجا ئایا وەك چۆن مرۆڤ، لە جەستەیەك کە لە خاك و قوڕ دروست بووەو، لە ڕووحێکی خوایی دروست بووە، جیننیش کە جەستەکەیان لە ئاگر دروست بووە، شتێکی دیکەشیان هەیە، غەیری ئەو جەستەیە وەك ڕووح ؟! دەڵێم: لەوبارەوە هیچم نەدیوە، بەلام بەڕای من وا پێدەچێ شتێکی دیکەشیان هەبێ، چونکە جەستەی مرۆڤ دوای ئەوەی کە ڕووحە خواییەکەی چووە بەری، بوو بە خاوەنی ژیان و زیندوو بوو، بوو بە مرۆڤ، ئنجا ئاگریش کە جەستەی جینی لێ دروستکراوە، دوای ئەوەی خوا ﷻ ویستوویەتی ژیانی پێ ببەخشێ، بە شێوەیەك لە شێوەکان، ئنجا بۆتە خاوەنی ژیان و ئەو کەسایەتییە، کە دوایی پێی گوتراوە: ئیبلیس و وەچەکەیشی پێیان دەگوترێ:

---

١) عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ صُرَدٍ، قَالَ: اسْتَبَّ رَجُلاَنِ عِنْدَ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم فَجَعَلَ أَحَدُهُمَا تَحْمَرُّ عَيْنَاهُ وَتَنْتَفِخُ أَوْدَاجُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم: إِنِّي لأَعْرِفُ كَلِمَةً لَوْ قَالَهَا هَذَا لَذَهَبَ عَنْهُ الَّذِي يَجِدُ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ فَقَالَ الرَّجُلُ: وَهَلْ تَرَى بِي مِنْ جُنُونٍ} أخرجه أبو داود برقم: ٤٧٨٣، وصححه الألباني.

جینن و، ئەوانەیان کە شوێنی ئیبلیس دەکەون، پێیان دەگوترێ: شەیتانەکان (شیاطین)، وەك ئەصڵی خۆشیان، پێیان دەگوترێ: جند (جن)، کە دیارە ئەوانیش بڕوادارو بێبڕوایان هەیە .

**مەسەلەی دووەم** : هەواڵدانی خوا بە فریشتان کە : مرۆڤێك لە قوڕێ دروست دەکات و دەبێ پاش ڕێکخستن، ڕووح بە بەرداکردنی، کڕنووشی بۆ بەرن، ئەوانیش فەرمانی خوایان ئەنجام دا، جگە لە ئیبلیس :

خوا دەفەرموێ : ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرًا مِّن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٨﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٣٠﴾ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰٓ أَن يَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٣١﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم چوار ئایەتە موبارەکە، لە حەوت بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم** : ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ﴾، یاد بکەوە! کاتێ پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرموو .

لێرەدا دەپرسین : ئایا ئەو فریشتانە کامانە بوون، هەموویان بوون، یاخود کۆمەڵێك لە فریشتەکان بوون؟ بۆ ئێمە دیارە نییەو دەگونجێ هەموو فریشتەکان بوو بن و، دەشگونجێ کۆمەڵێکی دیاریکراویان بووبن، ئەوە زانیارییەکەی هەر لە لای خوای پەروەردگار، چونکە دواییش کە دەفەرموێ : ﴿ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴾، فریشتەکان تێکڕاو وێکڕا، کڕنووشیان برد، دیسان ئابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە هەرچی فریشتەیەو خوا دروستی کردوە، کڕنووشیان بردوە، بەڵکو یانی: ئەو فریشتانەی کە پەروەردگار لەو کاتەدا ئاگاداری کردن و دواندنی، ئەوانە هەموویان کڕنووشیان برد .

**بڕگەی دووەم :** - ﴿إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرًا مِّن صَلۡصَٰلٍ مِّنۡ حَمَإٍ مَّسۡنُونٍ﴾، وشەی (بشر): بەشەرو ئینسانو ئادەمیزاد (آدمي) هەموویان واتایان دەبێتەوە بە یەك، بەڵام :

أ/ بەشەر بەو ئیعتیبارەی کە پێستی دەمو چاو (بَشَرَة)ی دەبینرێ .

ب/ ئادەم بەو ئیعتیبارەی کە لە خاکی زەوی دروستکراوە .

ج/ ئینسان بەو ئیعتیبارەی کە مرۆڤەکان پێکەوە بوونو هۆگرییو ئولفەتیان دەبێ، لە زمانی عەرەبییدا ئەم وشانە بۆیە بەکارهاتوون .

من بەدیهێنەری بەشەرێکم لە قوڕێکی ڕەقهەڵاتوو، ئەویش لە قوڕێکی ڕەشی بۆنکردووی گۆڕاوەوە، هاتوە.

**بڕگەی سێیەم :** - ﴿فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ﴾، ئنجا هەر کاتێك ڕێکمخست، واتە: هەر کاتێك جەستەکەی ئامادەیی ئەوەی تێدا پەیدا بوو، کە ڕووحی بە بەردابکرێ .

**بڕگەی چوارەم :** - ﴿وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي﴾، لەو ڕووحە تایبەتییەی خۆم (کە دروستکراوێکی تایبەتی خۆمە)، فووم بە بەردادکرد .

وَاسْتُعِيرَ النَّفْخ هُنا، لِوَضْعِ قُوَّةٍ لَطِيفَةِ السَّرَيانِ قَوِيَّةِ التأْثِيرِ دَفْعَةً وَاحِدَةً، وَلَيْسَ ثَمَّةَ نفخٌ وَلاَ مَنْفُوخٌ(1)، واتە : وشەی (نفخ) خوازراوەتەوە بۆ دانانی هێزێکی پەنهان، کە هێزەکەی زۆر کاریگەرە بە یەکجار لە نێو جەستەی مرۆڤ (ئادەم)دا، ئەگەر نا، نە فوو هەبووەو، نە فوو تێکراو هەبووە .

واتە: ئەو وشەیە خوازراوەتەوە بۆ ئەوە کە خوا ئەو ڕووحە، ئەو دروستکراوە پەنهانە، کە زۆر کاریگەرە بە یەکجار دروستی کردوەو خستوویەتە نێو جەستەی ئادەمەوە .

---

1) التحرير والتنوير، ج١٤، ص٤٤.

**بڕگەی پێنجەم :** - ﴿ فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴾، هەمووتان بۆی بە کڕنووش دا بکەون ، یانی: سڵاوی لێ بکەن و ڕێزی بگرن .

**بڕگەی شەشەم :** - ﴿ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴾، یەکسەرو بێ دواکەوتن : تێکڕای فریشتەکان، وێکڕا کڕنووشیان برد .

**بڕگەی حەوتەم :** - ﴿ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰٓ أَن يَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴾، جگە لە ئیبلیس ئامادە نەبوو کە لەگەڵ کڕنووش بردووانـدا بێ .

ئنجا ئایا کە ئیبلیس لەگەڵ فریشتاندا، فەرمانی پێکراوە: کڕنووش بۆ ئادەم بەرێ، ئەویش لە فریشتان بووە ؟

لە ئایەتی (٥١)ی سوورەتی (الکهف)دا، خوا ﷻ بە ڕوونیی بۆی دەرخستووین، کە لە فریشتان نەبووە، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُواْ لِأَدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ﴾، واتە: کاتێک بە فریشتەکانمان فەرموو: کڕنووش بۆ ئادەم بەرن (کڕنووشی ڕێزگرتن)، ئەوانیش یەکسەر تێکڕا کڕنووشیان برد، جگە لە ئیبلیس ئەو لە جینن بوو .

واتە : لە جۆرە دروستکراوێکی دیکە بوو کە جینن .

هەڵبەتە ئیبلیس خۆی دوایی دەبێتە بابی جینن، هەندێکیش گوتوویانە: لە پێش ئیبلیسیش دا جینن بوو ونو ئیبلیس یەکێک لەوان بووە، دەشگونجێ بڵێین : (كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ)، یانی : ئیبلیس فریشتە نەبوو، جند بوو، بەڵام بابی جندان بوو[1].

کەواتە : ئایەتەکە زۆر بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنێ، کە ئیبلیس نەخێر لە فریشتان نەبووە، هەڵبەتە هەندێک لە زانایانیش گوتوویانە: (كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ)، واتە: لەو کاتەدا خۆی پەنهان کردبوو، چونکە (جَنَّ، يَجِنُّ)، یانی: (آستتر،

---

١) من وشەی (جند)و (جینن) لە زمانی کوردیی دا بۆ (جِنّ) بەکاردێنم .

یستتر)، (جُنُون، جَنِيْن، جَنَّة) [١]ش، هەموویان توخم (عنصر)ی پەنهانییو شێردراوەییو نەبینرانیان تێدایە، ئنجا خوا ﷻ کە لە سووڕەتی (الحجر)دا دەفەرموێ : ﴿ وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ ﴾، (جَانّ)یش مەشهوورە کە بابی جندانە، کەواتە: مەبەست پێی ئیبلیسەو لە ئاگر دروستکراوە، بەڵام فریشتەکان وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : {خُلِقَتِ الْمَلائِكَةُ مِنْ نُورٍ، وَخُلِقَ الْجَانُّ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ، وَخُلِقَ آدَمُ مِمَّا وُصِفَ لَكُمْ} [٢]. واتە: فریشتە لە ڕووناکیی دروستکراونو، بابی جندانیش لە ئاگر دروست کراوەو، ئادەمیش لەوە دروست بووە کە بۆتان باسکراوە .

کە بریتیە لە قوڕو قوڕیش بریتیە لە : (ئاو + خۆڵ).

<u>مەسەلەی سێیەم</u> : کاتێك خوای کارزان ﷻ بە ئیبلیسی فەرموو: بۆچی کڕنووشت بۆ ئادەم نەبرد؟ (کڕنووشی ڕێز گرتن)، ئیبلیس گوتی: کڕنووش بۆ مرۆڤێکی لە قوڕێ دروستکراو نابەم ! خواش دەریکردو نەفرینی لێکردو، ئەویش داوای هێڵرانەوەی کرد، خواش ﷻ داوایەکەی گرتەوە :

خوا دەفەرموێ : ﴿ قَالَ يَٰٓإِبْلِيسُ مَا لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ لَمْ أَكُن لِّأَسْجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقْتَهُۥ مِن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٣٣﴾ قَالَ فَٱخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَإِنَّ عَلَيْكَ ٱللَّعْنَةَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٣٥﴾ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿٣٦﴾ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿٣٧﴾ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ﴿٣٨﴾ ﴾.

---

١) جنون : شێتیی ، جنین : کۆرپە، جنّة : بەهەشت و باغ .
٢) صحيح: أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم : (٢٩٩٦) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها.

**شیکردنەوەی ئەم حەوت ئایەتە موبارەکە ، لە حەوت بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم :** - ﴿قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ﴾، خوا فەرمووی : ئەی ئیبلیس! ئەوە چیتە کە لەگەڵ کڕنووش بردووان نەبووی !

- شتێك وای لێکردی، - کۆسپو بەرچێکت هاتە بەر، کە تۆش لەگەڵ فریشتەکاندا، کڕنووشی ڕێزو حورمەت گرتن بۆ ئادەم نەبەی ؟

ئەم پرسیارە کە دەفەرموێ : ﴿مَا لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ﴾، لە جۆری : (الإِسْتِفهامُ التوبيخي)، پرسیارکردنێکی سەرزەنشتکارانەیە، سەرکۆنەکارانەیە، بەلام ئەوەی جێی سەرنجە، لە هەموو قورئاندا ئەوەیە کە خوا ﷻ ناوی ئیبلیس هەر وەك خۆی دێنێت: ﴿يَٰٓإِبۡلِيسُ﴾، واتە: ناوەکەی خۆی چۆنە، ئاوا، هەڵبەتە ناوی (إبليس) ئێستا وەك زەمم (ذَم) تەماشا دەکرێ، بەلام لە ئەصڵدا وانەبووەو ناوێکی ئاسایی بووە، وەك چۆن ناوی فیرعەون و نەمروود ئەوانە، ناوی شەخص بوون و ناوی ئاسایین، بەلام دوایی کە مێژوو نووسیویەتەوە: ئەو فیرعەونە ستەمی کردووە ئەو نەمروودە ئاوا بووە، دوایی ئەو ناوانە بوونە مایەی زەم و سەرزەنشت، ئێستا ئەگەر بە کەسێك بڵێی: دەڵێی فیرعەونە، مانای وانیە کە لە ئەسڵدا وشەی فیرعەون بۆ زەم و سەرزەنشت بووە، چونکە وشەی فیرعەون ناوی پادشاکانی میسر بووە، وەك چۆن (هیرەقل) ناوی پاشاکانی ڕۆم بووەو (کیسرا) ناوی پاشاکانی فارس بووەو (نەجاشیی) ناوی پادشاکانی حەبەشە بووەو... هتد .

**بڕگەی دووەم :** - ﴿قَالَ لَمۡ أَكُن لِّأَسۡجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقۡتَهُۥ مِن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ﴾، ئیبلیس گوتی: ناگونجێ کڕنووش ببەم بۆ بەشەرێك کە لە قوڕێکی وشك بووەوە، ئەویش لە قوڕێکی گەنیوی گۆڕاو، یان ڕەشهەڵگەڕاوی بۆنکردوو، دروستکراوە، ناگونجێ کڕنووش بۆ بەشەرێکی وا ببەم .

ئەوەی لێرەدا جێی سەرنجە، ئەوەیە کە ئیبلیس لێرە نەیگوتوە: (لا أَسجُدُ)، دەڵێ : ﴿لَمۡ أَكُن لِّأَسۡجُدَ﴾، یانی: ئەصڵەن کڕنووش بردنی من شتێکی گونجاو نیەو، هەر ئەگەری نیەو، من کڕنووش ببەم‌و لێم ناوەشێتەوە .

ئنجا ئەمە بێئەدەبییەکەی ئیبلیس بەرانبەر بە خوا ﷻ، تۆختر دەکاتەوە، واتە: ئەی خوایە! تۆ فەرمانێکت کردوە، زۆر بێجێیە، چونکە دەڵێ: ﴿لَمۡ أَكُن لِّأَسۡجُدَ﴾، یانی: هەر ئەسڵەن ئەگەری نیەو شتێکی زۆر بێجێیە، کە من کڕنووش بەرم بۆ مرۆڤێك کە لە قوڕ، ئەویش قوڕێکی ڕەشهەڵگەڕاوی بۆنکردوو، دروستت کردوە، کە دوایی وشکبۆتەوەو ڕەقهەڵاتوە .

لێرەدا بێگومان ئیبلیس بە خەیاڵ وەهم کاری کردوەو، تەنیا سەرنجی ڕواڵەتی شتەکانی داوە، لەبەرئەوەی لە ئەسڵدا ئەو قوڕە، ئاوو گڵە، تێکەڵ دەکرێ‌و دەبێتە قوڕ، دوایی کە کاتی پێدەچێ، قوڕەکە ڕەشهەڵدەگەڕێ‌و بۆن دەکات، دوایی کە ماوەیەکی پێدەچێ، قوڕەکە ڕەق هەڵدەگەڕێ، یاخود وشك دەبێتەوە، ئنجا ئیبلیس کە تەماشای ڕواڵەتی ئەو کەرەستەیەی کردوە، کە ئادەمی لێ دروست بووە، تووشی ئەو هەڵەیە بووە، هەر بۆیەش هەموو ئەوانەی کە تەنیا سەرنجی ڕواڵەت دەدەن‌و، چاویان تەنیا لەسەر ڕواڵەتی شتەکانە، وەهم‌و خەیاڵ بەهەڵەیان دادەبات! دەبێ نێوەڕۆکی شتەکان ببینین .

ئنجا ئەگەر هەر لە ڕووە جەستەکەشیەوە، ئیبلیس تەماشای نێوەڕۆکی کردبایە، تەماشای ئەوەی نەکردبایە کە جەستەی ئادەم لە قوڕێکی قێزەون دروست بووە، بەڵکو سەرنجی ئەوەی دابایە کە ئێستا چۆنە؟ نەك جەستەکەی‌و کەرەستەکەی چۆنە؟ ئەدی بۆچی تەماشای ئێستای ناکەی؟ پاشان ئیبلیس تەنیا تەماشای جەستەی ئادەمی کردوەو، تەماشای ئەو نهێنییە خواییەی نەکردوە، ئەو دروستکراوە تایبەتییەی خوا، کە بەوە ئادەم بۆتە ئادەم، بەوە مرۆڤ بۆتە مرۆڤ، کە (رووح)ە! ئیبلیس تەنیا تەماشای یەك لایەنی مرۆڤی کردوە، کە جەستەکەیەتی‌و، بۆ جەستەکەیشی بە شێوەیەکی ڕووکەشانەو ڕواڵەتییانە تەماشای کردوە بۆیە تووشی ئەو هەڵەیە بووە .

کەواتە: دەبێ خۆمان بپارێزین لەوە کە تەنیا سەرنجی ڕواڵەتی شتەکان بدەین، شتێکیش کە لە چەند پێکهاتەیەك پێکهاتووە تەنیا سەرنجی یەك پێکهاتەی بدەین، ئەوە زۆر ئینسان بە هەڵەدا دەبات .

<u>بڕگەی سێیەم</u> : ﴿ قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٞ ﴾، خوا فەرمووی : لێی بچۆ دەرێ، بێگومان تۆ دەرکراوی، بە کەم تەماشاکراوو دەرکراوی .

بێگومان مەخلووقێك لە فەرمانی بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنی خۆی دەربچێ، لەو شوێنەی کە جێگای سەرپێچیی نیە، کە ئاسمانەکانن، یان بەهەشت، دەردەکرێ .

چونکە ﴿ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا ﴾، ئەم ڕاناوە ڕاناوی مێینە (منها)، دەگونجێ بۆ ئاسمان بچێتەوەو، دەشگونجێ بۆ بەهەشت بچێتەوە، کە بێگومان ئیبلیس دوای ئەوەی فەرمانی خوای پەروەردگاری شکاندو کڕنووشی ڕێزگرتنی بۆ ئادەم نەبرد، هەم لە ئاسمانیش دەرکراو، هەم لە بەهەشتیش دەرکرا، وەك لە سوورەتی (الأعراف)دا، دەفەرموێ : ﴿ فَٱهۡبِطۡ مِنۡهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا ﴿١٣﴾ ﴾، واتە: لێی شۆڕ بەوە، (بچۆ دەرێو لێی داپەڕە خوارێ)، واتە: لە ئاسمان، یاخود لە بەهەشت، چونکە ئاسمانیش بەرزەو، بەهەشتیش کە لە ئاسمانە شوێنەکەی هەر بەرزە . هەروەها بە پێی ئەو ڕایەش کە مەبەست لە (جنَّة) باخو بێستانێکی بەرزاییەکی زەمین بووە، دیسان دابەزێنراوە .

ئنجا ﴿ فَٱهۡبِطۡ مِنۡهَا ﴾، ئەو (هُبُوط)ە، (هُبُوط)، واتە: شۆڕ بوونەوەو دابەزین، ئەویش: چ لە ڕووە بەرهەستەکەیەوە تەماشای بکەی: ئیبلیس لە سەرێوە هاتۆتە خوارێ، داپەڕێنراوەتە خوار، چ لە ڕووە مەعنەوییەکەیەوە : لە پلەو مەقامێکی بەرزەوە، شۆڕ کراوەتەوە بۆ پلەو مەقامێکی نزم، بە هەردوو واتای بەرهەستو نا بەرهەستی، ماددیو مەعنەویی، ئیبلیس دوای ئەو فەرمان شکاندنەی خوای پەروەردگار، شۆڕبۆوەو نزم بۆوەو داپەڕێنرایە خوار.

**برگەی چوارەم :** - ﴿ وَإِنَّ عَلَيْكَ ٱللَّعْنَةَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴾، بێگومان تۆ تاکو ڕۆژی سزاو پاداشت، نەفرینت لێبێ .

(اللَّعْنُ: السَّبُّ بالطَّرْدِ، أي: الإبْعَادُ)، لەعنەت هەم بە مانای قسە پێگوتران و دەرکران بە سووکیی دێ، هەم بە مانای دوورخستنەوەش دێ .

**برگەی پێنجەم :** - ﴿ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِيٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴾، گوتی: ئەی پەروەردگارم ! بمهێڵەوە، تاکو ڕۆژێ کە تێیدا زیندوو دەکرێنەوە (واتە: مرۆڤەکان، وەچەی ئەو ئادەمە، کە تۆ لەسەر ئەوەی ڕێزم لەو نەگرت و سلاوی ڕێز گرتنم لێ نەکرد، منت بەو دەردە برد)، واتە: تاکو ڕۆژی قیامەت .

(الإنْظَارُ: الإمْهَالُ وَالتَأخِير)، (إنْظار): بریتیە لە مۆڵەت پێدان و دواخستن .

**برگەی شەشەم :** - ﴿ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴾، خوا فەرمووی: بێگومان تۆ لە هێڵراوانی .

واتە: خوا ئەو داوایەی گرتەوە، بەڵام تاکو ڕۆژی قیامەت نا .

**برگەی حەوتەم :** - ﴿ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ﴾، تاکو ڕۆژی کاتی زانراو، واتە: تاکو ئەو ڕۆژەی کە کاتەکەی زانراوە بۆ خوا ﷻ، یان بۆ خەڵکی عاقڵمەند: ئەو ڕۆژە زانراوە، کە دەبێ هەر بێت، کە ڕۆژی تێدا کۆتایی هاتنی ئەم ژیانەو ئاخیر زەمانە، کەواتە: ئیبلیس داوای کردوە، تاکو قیامەت بهێڵرێتەوە، بەڵام خوا ﷻ تاکو ئاخیر زەمان (السَّاعَة)، تاکو ئەو کاتەی کە بازاڕی ئەم ژیانە دنیاییەی تێدا دەپێچرێتەوە، دەیهێڵێتەوە، چونکە ئیبلیس کاری هەر ئەوەیە کە مرۆڤەکان گومڕا بکات و، هەر تاکو ئاخیر زەمانیش، مرۆڤ لەسەر زەوی دەمێنن، ئەویش ئیشەکەی هەر لەگەڵ مرۆڤانە کە گومڕایان بکات و سەریان لێ تێکبدات، ئنجا کە مرۆڤ لەسەر زەوی نەمان، ئەویش پاساوی بوون و مانەوەی نامێنێ .

**مەسەلەی چوار[redacted] :** هەڕەشەکردنی ئیبلیس، بە گومڕاکردن و بێمرادکردنی مرۆڤان، جگە لە بەندە ساغەکانی خواو هەڕەشەکردنی خوا کە خۆی و شوێنکەوتووانی بێمرادی، بێ ئاکامی، جێگایان دۆزەخە :

خوا دەفەرموێ : ﴿ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنۡهُمُ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٤٠﴾ قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَيَّ مُسۡتَقِيمٌ ﴿٤١﴾ إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴿٤٢﴾ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوۡعِدُهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٤٣﴾ لَهَا سَبۡعَةُ أَبۡوَٰبٖ لِّكُلِّ بَابٖ مِّنۡهُمۡ جُزۡءٞ مَّقۡسُومٌ ﴿٤٤﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم شەش ئایەتە موبارەکە ، [redacted] یازدە (١١) بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم :** ﴿ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي ﴾، ئیبلیس گوتی: پەروەردگارم! بەهۆی ئەوەوە کە منت بێمراد کرد، بێ ئاکام کرد، منت دەستخەڕۆو ڕەنجەڕۆ کرد .

زۆرجار گوتوومانە: (غَواية) بەرهەمی (ضَلال)ە، یانی: گومڕابوون و بەڕێ نەزانین، بەڵام (غَواية) ئەو دەرەنجامەیە کە لە گومڕایی پەیدا دەبێ و، یانی: بێمرادبوون و بێئاکامبوون، هەرچەندە زۆر لە توێژەرەوانی قورئان (ضَلال) و (غَواية) بە یەك مانا بەکاردێنن، واتە: بە هاوواتایان دەزانن، بەڵام پێموایە لە قورئاندا دوو وشەی پێکەوە هاوواتا (مترادف) هەر نین، کتومت دوو وشە، یەك واتایان هەبێ، چونکە ئەوە مانای وایە وشەیەك لە قورئاندا بەکارهاتوە، کە مانایەکی زیادی نیە! ئەوەش لەگەڵ فەرمایشتی بێ هەڵەو پەڵەی خوای بەرزی مەزندا ناگونجێ، بەڵکو وەك پێشتریش باسمان کردوە : (هُدى)و (ضَلال) بەرانبەری یەکن و، (رُشد)و (غَواية)ش، بەرانبەری یەکن: لە ئەنجامی (هُدى) بەڕێ زانیندا، ئینسان سەر ڕاست (رشید)دەبێ، بە

ئامانج و ئاکام دەگات و، لە ئەنجامی (ضلال) بەرێ نەزانیندا، ئینسان بێمرادو بێئاکام (غاوي) دەبێ.

**بڕگەی دووەم:** - سەرنجێکی دیکە لەسەر ئەم ڕستە موبارەکە، ئەوەیە کە ئیبلیس هۆی بێمرادبوون و بێئاکام بوون و دەستخەڕۆبوونەکەی خۆی، دەگێڕێتەوە بۆ خوا ﷻ، دەڵێ: ﴿ رَبِّ بِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي ﴾، کە بێگومان ئەوەش بێ ئەدەبییەکی دیکەیەو، ستەمێکی دیکەیە، ئیبلیس دەیکات، چونکە ئەو بە ویستی خۆی کڕنووشی بۆ ئادەم نەبرد، خوا ﷻ فەرمانی پێکردبوو، بەڵام ئەو بۆخۆی نەیویست و، دوایی پاساویشی هێنایەوە بۆ بێ فەرمانییەکەی خۆی!

کەواتە: بۆچی دەبێ بپێچرێتە ئەستۆی قەدەرو ویستی خوای کارزانی دادگەری بێ هەڵەو پەڵە؟ بێگومان شتێکی بێجێیە، بۆیە هەموو ئەوانەی کە بۆ گوناهو تاوانان، پەنا دەبەنە بەر قەدەری خواو، دەیپێچنە ملی قەدەرو قەزاو ویستی خوای پەروەردگار، گشتیان لەسەر ڕێچەو مەزهەبی ئیبلیسن.

**بڕگەی سێیەم:** - ﴿ لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، واتە: بێگومان، بە جەختکردنەوە: من لەسەر زەوی بۆیان دەڕازێنمەوە، چییان بۆ دەڕازێنێتەوە؟ بێگومان: کوفرو شیرک و نیفاق و ئیلحادو گوناهو تاوان و لادان، ئەوانەیان بۆ دەڕازێنێتەوە، بەڵام خوا ﷻ شتێك کە بە پێی سیاق و سەلیقە بزانرێ، فەرمایشتە بێ هەڵەو پەڵەکەی خۆی، پێ قەڵەبالغ نەکردوە، ﴿ لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمۡ ﴾، هەر دیارە شەیتان چی دەڕازێنێتەوە.

ئنجا ئەگەر خواش ﷻ شتێکی فەرمووبایە، وەك: (لأُزَيِّنَنَّ لَهُمُ الكُفْرَ) یان (لأُزَيِّنَنَّ لَهُمُ الشِّرْك)، یان (لأُزَيِّنَنَّ لَهُمُ المَعَاصِي)، یان (لأُزَيِّنَنَّ لَهُم الإِنْحِرَافَات)، ئەو کاتە ماناکەی سنووردار دەبوو، بەڵام ئێستا ﴿ لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمۡ ﴾، زەمین بۆ هەر وشەیەك دەگونجێ بچێ، کە لەگەڵ جوانکردن و ڕازاندنەوەی شەیتاندا، بگونجێ، بۆ فریودانی مرۆڤەکان، واتە: ماناکەی زۆر فراوان دەبێ، بەهۆی ئەوەوە کە: ﴿ لَأُزَيِّنَنَّ ﴾، بۆیان دەڕازێنمەوە، مەفعوولەکەی فڕتێنراوە، بەڵام بە پێی سیاقی ڕستەکە، دەزانرێ چییە!

**بڕگەی چوارەم :** - ﴿ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾، تێکڕایان بێمرادو بێئاکام دەکەم،
واتە: گومڕایان دەکەم بۆ ئەوەی سەرەنجام بێئاکامو بێمراد بن، وەك چۆن بۆخۆی گومڕا بوو، دواییش بێئاکامو بێمراد بوو .

**بڕگەی پێنجەم :** - ﴿ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ ﴾، جگە لەو بەندانەت، لەوان کە ساغبووەوەن .

مخْلَص) واتە: ساغبووەوە، خوا ساغی کردوونەوە، هەروەها خوێنراویشەتەوە: (مخلِصِين) واتە: ئەوانەی خۆیان ساغکردۆتەوە، واتە: کردەوەکانی خۆیانو، خۆیان بۆ خوا ساغکردۆتەوەو بەشی شەیتانیان بە خۆیانەوە نەهێشتوە، جێی سەرنج ئەوەیە، کە ئیبلیس دوای ئەوەی دەڵێ: تێکڕایان بێمرادو سەرگەردانو بێئاکام دەکەم، دەزانێ کە هەموویان هەر بۆ سەرگەردانو بێئاکام ناگرێن، بۆیە دوایی هەڵاواردنی تێدەخات، دەڵێ: ﴿ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ ﴾، جگە لەو بەندانەت لەوان کە ساغ بووەوەن، واتە: ئیبلیسیش، ویستوویەتی قسەکەی درۆ دەرنەچێ، درۆ هێنده شتێکی خراپە، تەنانەت ئیبلیسیش ویستوویەتی درۆی لەسەر تۆمار نەکرێ !

**بڕگەی شەشەم :** - ﴿ قَالَ هَذَا صِرَاطٌ عَلَيَّ مُسْتَقِيمٌ ﴾، خوا فەرمووی : ئەوە ڕێیەکی ڕاستە لەسەر من .

واتە: ئەو ڕێیە ڕاستە لەسەر من پێویستە، کە ڕێ ڕاستەکە چییە؟ (إشارَة إلَى عَدَمِ تَسَلُّطِ إبليسَ عَلَى عِبادِهِ الـمُخْلَصِين)، ئاماژەیە بۆ بالادەست نەبوونی ئیبلیس، بەسەر بەندە ساغەکانیەوە، واتە: ئەو ڕێیە ڕاستە من لەسەر خۆمم پێویست کردوە، کە بەو شێوەیە بێت: تۆ دەسەڵاتت بەسەر بەندە ساغەکانی مندا نەبێو بە بەندە خۆساغکەرەوەکانم نەوێری !.

واتایەکی دیکەشیان بۆ لێکداوەتەوە: (طَرِيقُكَ عَلَيَّ لاَ تَفُوتُنِي، هَذَا صِرَاطٌ عَلَيَّ مُسْتَقِيمٌ )، واتە: ڕێی تۆ بەلای مندا دێ، واتە: دێیەوە بەردەستی من، ڕێیەکەت هەر بەلای من دایەو، تۆ لەمن دەرباز نابی .

بەڵام مانای یەکەم بەهێزترە واتە: ئەوە ڕێیەکی ڕاستە لەسەر من، یاسایەکە خوا ﷻ بەو شێوەیە مامەڵە دەکات، کە ئەوانەی بەندەی ساغی خوا بن، ئیبلیس ناتوانێ بیانخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوەو، بەسەریاندا زاڵ نابێت، دوایی خوا ﷻ زیاتر ڕوونی دەکاتەوە .

**برگەی حەوتەم :-** ﴿ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَـٰنٌ ﴾، بێگومان بەندەکانی من ، تۆ دەسەڵاتت بەسەریاندا ناشکێ و پێیان ناوێری .

**برگەی هەشتەم :-** ﴿ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴾، جگە لەوانەی کە لە بێمرادان شوێنت دەکەون، واتە: ئەوانەی کە لە ئەنجامی شوێنکەوتنیان دا بۆ تۆ، لە ئەنجامی شوێن پێ هەڵگرتنی تۆ دا، بێئاگامو بێمراد دەبن، بێبەش و چارەڕەش دەبن، جگە لەوانە، تۆ زەفەر بە هیچ کام لە بەندەکان نابەی .

**برگەی نۆیەم :-** ﴿ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾، بێگومان دۆزەخیش ژوانگەی هەموویانە .

(الْمَوعِدُ: مَكانُ الوَعدِ)، بە کوردیی پێی دەڵێن: ژوانگە، یان بەڵێنگە، واتە: ئەو شوێنەی کە هەموویان لێی کۆدەبنەوە، دۆزەخە .

**برگەی دەیەم :-** ﴿ لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَٰبٍ لِّكُلِّ بَابٍ ﴾، حەوت دەرگای هەن، حەوت دەروازەی هەن .

هەندێك لە زانایان گوتوویانە: وشەی: ﴿ سَبْعَةُ أَبْوَٰبٍ ﴾، (مُستَعمَلَة فِي الكَثرَة)، بۆ زۆریی بەکارهاتوە واتە: دەرگای زۆری هەن، دەڵێن: لە عورف و باوی عەرەباندا وابووە، ئەگەر شتێك ویستبایان، بڵێن: ژمارەی زۆر بوو، حەوتیان بۆ بەکارهێناوە .

واتایەکی دیکەی: ئەم حەوت (٧)ە، ئاوە بۆ چینەکانی دۆزەخ، بەپێی جۆری تاوان و گوناهەکان، واتە: هەر کەسێك کە ئەو جۆرە گوناهەی زیاتر کردبێ، لەو دەروازەیەوە دەچێتە ژوورو، یەکی دیکە لە دەروازەیەکی دیکەوەو هەروەها بەو شێوەیە ـــ

بەڵام من مانای دووەمیانم پێ ڕاستە، چونکە ئەگەر مانای یەکەم مەبەست بووایە، خوا دەیتوانی - بۆ وێنە: - بفەرموێ: (لَها سَبعُونَ باباً) حەفتا دەروازەی هەن .

وەك لە شوێنی دیکەدا – بۆ وێنە :- لە سووڕەتی (التوبة)دا، خوای پەروەردگار دەفەرموێ : ﴿إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً ﴿٨٠﴾﴾التوبة، کە ئەمەیان دەگونجێ بڵێین: بۆ زۆرییە، واتە: هەرچەندە زۆریشیان داوای لێبوردن بۆ لە خوا بکەی حەفتا (٧٠) جاریش، هەر لێیان نابووری، لە دەغەڵ‌و موونافیقەکان .

ئنجا ئەگەر وابێ، دەبێ بڵێین: ئاسمانەکانیش کە خوا دەفەرموێ: حەوتن، ئەویش هەر بۆ زۆرییە! ئەوەش ڕاست نیە، کەواتە: ژمارە حەوت، مەبەست پێی پلەو چینەکانی دۆزەخە، یان جۆرەکانی.

<u>برگەی یازدەیەم</u> :- دوایی دەفەرموێ : ﴿لِكُلِّ بَابٍ مِّنْهُمْ جُزْءٌ مَّقْسُومٌ﴾، بۆ هەر دەروازەیەك لە دەروازەکانی دۆزەخ، لەو مرۆڤانەی کە تۆ دەسخەڕۆو ڕەنجەڕۆو بێناکامیان دەکەی، ئەندازەیەکی دیاریکراو هەیە.

هەندێك لە زانایان ئەو حەوت چینەی دۆزەخیان، بەو شێوەیە هێناون، گوتوویانە: (جهنم، لَظَى، الحُطَمَة، السَّعِير، سَقَر، الجَحِيم، الهاوِيَة)، کە بە حیساب لەسەرێوە بۆ خوارێ، پلەی هەرە خوارێ، یاخود چینی هەرە خوارێی دۆزەخ (الهاوية)یە، ئنجا (الجحيم) لەسەر ئەوەوە، ئنجا (سَقَر)ە، ئنجا (السَّعير)، ئنجا (الحُطَمَة) ئنجا (لظى)و، چینی سەرەوەی دۆزەخ، بریتیە لە جەهەننەم، ئنجا گوتوویانە: بڕوادارانێك کە گوناهباربن‌و، پاك نەبووبنەوەو، تۆبەیان نەکردبێ‌و، نەکەوتبنە بەر لێبوردنی گشتی خوای پەروەردگار، تەنیا لە دۆزەخدا سزا دەدرێن، واتە: لە چینی سەرەوەی دۆزەخ، بەڵام چینەکانی دیکەی دۆزەخ، بۆ ناموسوڵمانانن، ئەوانیش هەرکەسە بەپێی تاوان‌و خراپەی خۆیان .

هەڵبەتە ئەوە شتێکی ئیجتیهادییە، واتە: شتێکی تەوفیقییەو تەوقیفی نیە، یانی دەگونجێ وابێ‌و، دەگونجێ وانەبێ .

ئنجا ئەگەر سەرنج بدرێ، دەگونجێ ناوی زیاتریش لەو حەوتانەی کە تاوانباران‌و خراپەکارانیان تێدا سزا دەدرێن، بەکارهاتبن .

**<u>مەسەلەی پێنجەم</u> : باسی جێگاو ڕێگاو پاداشتی پارێزکاران، کە باغ‌و سەرچاوەو سەلامەتیی‌و هێمنیی‌و، پاککرانەوەو ئیسراحەتی هەمیشەییە :**

خوا عزّ و جلّ دەفەرمووێ : ﴿ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ ﴿٤٥﴾ ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ ﴿٤٦﴾ وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ إِخۡوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٖ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٧﴾ لَا يَمَسُّهُمۡ فِيهَا نَصَبٞ وَمَا هُم مِّنۡهَا بِمُخۡرَجِينَ ﴿٤٨﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم چوار ئایەتە موبارەکە ، لە شەش بڕگەدا:**

**<u>بڕگەی یەکەم</u> :** - ﴿ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ ﴾، بێگومان پارێزکاران لە نێو باغ‌و، گوڵ‌و گوڵزار کانیی سەرچاوەکاندان .

(عُيُون) کۆی (عَين)ە، (العَين: ثقب أرضيّ يَخرُجُ منهُ الماءُ)، کونێکە لە زەوی دا ئاوی لێ دێتە دەر، بە کوردیی دەڵێن: کانیی، چاوگ، سەرچاوە .

**<u>بڕگەی دووەم</u> :** - ﴿ ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ ﴾، بە سەلامەتیی بە ئاشتیی‌و، بە هێمنیی‌و ئارامیی، بچنە نێو ئەو باغ‌و گوڵ‌و گوڵزارو کانیی‌و سەرچاوانەوە .

(سَلام)، (السّلامُ: التّحيّة)، بریتیە : لە سڵاوکردن، (الأَمْنُ: النّجَاةُ مِنَ الخوفِ)، واتە: هەم سڵاوتان لێبێ، هەم دەربازیش بن لە مەترسیی‌و ناڕەحەتیی .

**بڕگەی سێیەم :** - ﴿ وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ ﴾، هەرچی کینە بوو لە دڵو سینەیاندا، دەرمانهێنا .

(الغِلُّ: البُغْضُ وَالحِقْدُ)، (غِلّ) بریتییە : لە ڕقو بوغزێك کە لە دڵدا ماوەتەوە، هەروەها پێی دەگوترێ: (حِقْد)، کەسێك لە کەسێك تووڕە بووەو نەیتوانیوە ڕقو تووڕەییەکەی خۆی پێ بڕێژێ‌و، لە دڵی خۆی پەچنیوە، ئەوە پێی دەگوترێ: (غِلّ)و (حِقْد)یشی پێ دەڵێ، خوا دەفەرموێ: سینەیان لەو کینەو بوغزو غەرەزە پاك دەکەینەوە .

**بڕگەی چوارەم :** - ﴿ إِخْوَانًا عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَابِلِينَ ﴾، ئەوانە برایانە لەسەر کورسیی‌و تەختان بەرانبەری یەکدی دادەنیشن .

السُّرُرُ: جَمعُ سَرِيرٍ كَالكرسيّ لكنه مُتَّسعٌ يُمكِنُ الإِضْطِجَاعُ عَلَيْهِ)، (سُرُرْ): کۆی (سریر)ە، کە وەك کورسیی وایە، بەڵام فراوانەو دەگونجێ ئینسان لەسەری ڕاکشێ، لەسەری پاڵداتەوە، ئنجا قەنەفەیە، یان هەر جۆرە تەختێکە بۆ ئیسراحەت .

**بڕگەی پێنجەم :** - ﴿ لَا يَمَسُّهُمْ فِيهَا نَصَبٌ ﴾، لەوێدا، لەو بەهەشتەدا، هیچ ماندوویەتییان تووش نابێ .

(النَّصَبُ: التَّعْبُ النّاشِيءِ عَنِ اسْتِعمَالِ الجُهْدِ)، (نَصَبْ) ماندووبوونێکی پەیدابوویە ، لەوەدا کە ئینسان تواناو وزەی سەرف کردوە .

**بڕگەی شەشەم :** - ﴿ وَمَا هُم مِّنْهَا بِمُخْرَجِينَ ﴾، لەو بەهەشتەش ناچنە دەرێ، نە ماندوویەتییان تووش دەبێ‌و بێزارو ناڕەحەت دەبن، نە لێشی دەچنە دەرێ .

**مەسەلەی شەشەم :** خوا ﷻ بە پێغەمبەر دەفەرموێ : ﷺ کە هەواڵ بداتە بەندەکانی: کە تەنیا خۆی لێبوردەی میهرەبانەو، تەنیا سزای ویش بە ئێش و ژانە :

خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿نَبِّئْ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلْعَذَابُ ٱلْأَلِيمُ ﴿٥٠﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە موبارەکە ، لە سێ بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم :** - ﴿نَبِّئْ عِبَادِيٓ﴾، واتە: هەواڵبدە بە بەندەکانم، بەگشتیی، یان: مادام پاڵیان دەداتە لای خۆی، واتە: ئەو بەندانەم کە لە لای من پەسندن و بەندەی باشن .

**بڕگەی دووەم :** - ﴿أَنِّيٓ أَنَا ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾، کە بە دڵنیایی هەر من لێبوردەی میهرەبانم، ئەمە خوێنراویشەتەوە: (أَنِّيَ أَنا) واتە: لە جیاتی ئەوەی کە لەسەری بوەستین و (ي)ی (أني) درێژبکەینەوە، (يَ)یەکە ، سەر (فتحة)ی هەبێ.

**بڕگەی سێیەم :** - ﴿وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلْعَذَابُ ٱلْأَلِيمُ﴾، هەواڵیشیان پێبدە کە هەر سزای من سزایەکی بە ئێش و ژانە .

ئەمە ئاگادارکردنەوەی خوای کاربەجێیە ﷻ لەسەر زمانی پێغەمبەر ﷺ بۆ بەندەکانی، کە وەك گوتم: (عِبَادِيٓ) دەگونجێ مەبەست پێی بەندە بۆ خوا صوڵحاو پەسند کراوەکان بن و، دەشگونجێ مەبەست پێی کۆی بەندەکان بن، بە چاك و خراپەوە، کە ئەو دوو ڕاستییەیان پێ ڕابگەیەنێ :

یەکەم : بەس خوا ﷻ لێبوردەی میهرەبانو بە بەزەییە .

دووەم : هەروەها تەنیا سزای ئەویش، سزایەکی توندو سەختو بە ئێشو ژانە .

ئنجا بە دڵنیایی لێبوردنو میهرەبانییەکەی خوا، بۆ کەسانێکە کە شایستەی بنو، سزاو جەزرەبەکەشی بۆ کەسانێکە لێیان بوەشێتەوە .

لەوبارەوە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دەکەینە (مِسكُ الختام)ی ئەم دەرسی دووەمەمان، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ :

{إنَّ اللهَ خَلَقَ الرَّحمَةَ يَوْمَ خَلَقَها مِئَةَ رَحمَةٍ، فَأمسَكَ عِنْدَهُ تِسعَةً وَ تِسعِينَ، وَأرسَلَ فِي خَلقِهِ كُلِّهِم رَحمَةً وَاحِدَةً، فَلَو يَعلَمُ الكافِرُ كُلَّ الَّذي عِنْدَ اللهِ مِنْ رَحمَتِهِ، لَمْ يَيْأسْ مِنَ الرَّحمَةِ، وَلَو يَعلَمُ الـمُؤمِنُ بِكُلِّ الَّذِي عِنْدَ اللهِ مِنَ العَذَابِ، لَم يَأْمَنْ مِنَ النارِ}، {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بِرَقم : ٦٤٦٩، وَمُسْلِمٌ بِرَقم: ٢١٠٨، وَغَيْرهُمَا} .

واتە: بێگومان خوا ئەو ڕۆژە کە بەزەیی هێنایە دی، کردی بە سەد (١٠٠) بەش، (سەد بەزەیی هێنایە دی)، لە لای خۆی نەوەدو نۆ (٩٩) بەشی هێشتەوەو، بۆ هەموو دروستکراوەکانیشی، یەکێك لەو سەد ڕەحمەتو بەزەییەی خۆی، (واتە: بەشێك لەو سەد بەشەی) بۆ هەمووان نارد، ئنجا ئەگەر بابای کافر ئەو هەموو بەزەییە بزانێ کە لەلای خوایە، بێگومان هەرگیز لە بەزەیی خوا نائومێدو تەما بڕاو نابێو، ئەگەر بڕواداریش بەو هەموو سزاو ئازارەی کە لەلای خوایە، بزانێ، ئەویش هیچ کاتێك دڵنیا نابێ لە ئاگر، (بێ ترسو بیم نابێو، پشتێندی لێناکاتەوە) .

هەڵبەتە لێرەدا مەبەستی پێغەمبەری خاتەم ﷺ وێنا کردنی فراوانی ڕەحمەتو بەزەیی خوایە، کە لە خوا سەد بەش ، بەشێك (١٠٠/١)ی بۆ هەموو دروستکراوەکانی ، تەرخان کردوە، کەچی بەشی هەمووانیشی کردوە وەك دەفەرموێ : ﴿ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ ﴿١٥٦﴾ ﴾الأعراف، واتە: بەزەیی من هەموو شتێکی گرتۆتەوە (لە دنیادا)، دیسان ئاگادارکردنەوەی مرۆڤەکانیشە،

لە فراوانی سزاو جەزرەبەی خوا، کە خوا سزاو جەزرەبەشی زۆر زۆرە بەشی هەموو کافران و هەموو ملهوڕان و تاوانباران دەکات و، نابێ هیچ کەس پشتێندی لێبکاتەوە ، بەتەمای ڕەحمەت و بەزەیی خوا، بەڵێ خوا ڕەحمەت و بەزەیی زۆری هەیە، بەڵام بۆ کەسانێك کە شایستەی بن و، لە بەرانبەر ئەوەدا کە بەزەیی هەیە، خوا سزاو جەزرەبەشی هەیە، بەڵام بێگومان وەك لە فەرمایشتی قودسیی دا هاتوە، بەزەییەکەی زیاترە : {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ: قَالَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ سَبَقَتْ رَحْمَتِي غضبي} ، {أَخْرَجَهُ مُسْلِم برقم: ٧١٤٦} .

واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوای زاڵی پایەدار فەرموویەتی: بەزەیی من پێش تووڕەییەکەم کەوتۆتەوە .

بەڵێ خوا ﷻ میهرەبانیی و بەخشش و بەزەیی زیاترە لە تووڕەبوون و سزاو جەزرەبەدانی .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَ بِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

# دەرسی سێیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان بیستو نۆ (٢٩) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەكانی: (٥١ – ٧٩)، لەم (٢٩) ئایەتەدا، بە شێوەی تێكهەڵكێش بەشێك لە بەسەرهاتی ئیبراهیم ﷺ پەیوەست بە بەسەرهاتی لووطو گەلەكەی‌و، بەسەرهاتی (لووط)یان تێدا خراونە ڕوو، واتە: هەم بەسەرهاتی ئیبڕاهیم ، كە پەیوەستە بە لووط و گەلەكەیەوە، هەم بەسەرهاتی لووط، هەردووكیان لەم بیستو نۆ ئایەتەدا ، بە تێكهەڵكێشی خراونە ڕوو .

هەروەها ئاماژەیەكی كورتیش بە خاوەنانی باغەكە (أَصْحَابُ الأَيكَة) كراوە، كە مەبەست پێیان گەلی مەدیەنە، ئەو گەلەی كە پێغەمبەر (شعیب) ﷺ یان بۆ ڕەوانە كرا .

شایانی باسیشە كە هەمان بەسەرهات: بەسەرهاتی ئیبڕاهیم ﷺ، كە فریشتەكان میوانی دەبن، پەیوەست بە بەسەرهاتی لووطو گەلەكەیەوە، لە هەر گام لە سوورەتەكانی: (الذَّارِيات) ئایەتەكانی: (٢٤ – ٣٧)و، سوورەتی (هُود) ئایەتەكانی: (٦٩ – ٨٣)و، سوورەتی (العَنْكَبُوت) ئایەتەكانی: (٢٨ – ٣٢)شدا، هاتووە، ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (هُود)دا بە درێژیی قسەمان لەبارەیەوە كرد، بۆیە هەم لێرە لەم پێناسەیەدا (پێناسەی ئەم دەرسە)، هەم لە كۆی تەفسیركردنی ئەو ئایەتە موبارەكانەدا، بە خێرایی بەسەریدا دەڕۆین .

﴿ وَنَبِّئْهُمْ عَن ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٥١﴾ إِذْ دَخَلُواْ عَلَيْهِ فَقَالُواْ سَلَٰمًا قَالَ إِنَّا مِنكُمْ
وَجِلُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُواْ لَا تَوْجَلْ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٍ ﴿٥٣﴾ قَالَ أَبَشَّرْتُمُونِي عَلَىٰٓ أَن مَّسَّنِيَ
ٱلْكِبَرُ فَبِمَ تُبَشِّرُونَ ﴿٥٤﴾ قَالُواْ بَشَّرْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْقَٰنِطِينَ ﴿٥٥﴾
قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ ﴿٥٦﴾ قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا ٱلْمُرْسَلُونَ
﴿٥٧﴾ قَالُوٓاْ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ إِنَّا لَمُنَجُّوهُمْ أَجْمَعِينَ
﴿٥٩﴾ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَآ إِنَّهَا لَمِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا جَآءَ ءَالَ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٦١﴾
قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٦٢﴾ قَالُواْ بَلْ جِئْنَٰكَ بِمَا كَانُواْ فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴿٦٣﴾
وَأَتَيْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٦٤﴾ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ ٱلَّيْلِ وَٱتَّبِعْ أَدْبَٰرَهُمْ
وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ وَٱمْضُواْ حَيْثُ تُؤْمَرُونَ ﴿٦٥﴾ وَقَضَيْنَآ إِلَيْهِ ذَٰلِكَ ٱلْأَمْرَ أَنَّ
دَابِرَ هَٰٓؤُلَآءِ مَقْطُوعٌ مُّصْبِحِينَ ﴿٦٦﴾ وَجَآءَ أَهْلُ ٱلْمَدِينَةِ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٦٧﴾ قَالَ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ
ضَيْفِى فَلَا تَفْضَحُونِ ﴿٦٨﴾ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ ﴿٦٩﴾ قَالُوٓاْ أَوَلَمْ نَنْهَكَ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ
﴿٧٠﴾ قَالَ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِىٓ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿٧١﴾ لَعَمْرُكَ إِنَّهُمْ لَفِى سَكْرَتِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿٧٢﴾
فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ مُشْرِقِينَ ﴿٧٣﴾ فَجَعَلْنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن
سِجِّيلٍ ﴿٧٤﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٍ مُّقِيمٍ ﴿٧٦﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ
لَأَيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٧٧﴾ وَإِن كَانَ أَصْحَٰبُ ٱلْأَيْكَةِ لَظَٰلِمِينَ ﴿٧٨﴾ فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ وَإِنَّهُمَا
لَبِإِمَامٍ مُّبِينٍ ﴿٧٩﴾ ﴾

# مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەواڵیان بدەیە لە بارەی میوانەکانی ئیبراهیمەوە (٥١) کاتێك لێی وەژوور کەوتن، گوتیان: سەلامەت لێبێ، گوتی: ئێمە ترس و بیممان لێتان هەیە! (٥٢) گوتیان: ترس و بیمتان نەبێ، ئێمە مژدەی کوڕێکی زانات پێ دەدەین (٥٣) گوتی: ئایا کاتێ کە کەوتوومە تەمەنەوە ، مژدەتان پێدام ! چۆن مژدەم پێدەدەن؟ (٥٤) گوتیان: مژدەی ڕاستمان پێدای ! لە بێ هیوایان مەبە ! (٥٥) گوتی: ئنجا جگە لە گومڕایان، کێ لە بەزەیی پەروەردگاری نا ئومێد دەبێ ! (٥٦) گوتی: ئەی نێردراوانی خوا ! چ ئەرکێکتان هەیەو، چ کارێکتان پێ سپێردراوە؟ (٥٧) گوتیان: ئێمە بۆ (فەوتاندنی) کۆمەڵێکی تاوانبار نێردراوین (٥٨) جگە لە بنەماڵەی لووط، بێگومان ئێمە ئەوان تێکڕایان دەرباز دەکەین (٥٩) بێجگە لە ژنەکەی، دامانناوە کە لە فەوتاوان بێ (٦٠) ئنجا کاتێك نێردراوەکان هاتنە لای بنەماڵەی لووط (٦١) (لووط) گوتی: ئێوە کۆمەڵێکی نامۆن (ناتانناسم) (٦٢) گوتیان: ئێمە (نەك هەر نەیارو جێگای مەترسییتان نین)، بەڵکو ئەوەمان بۆ هێناوی کە ئەوان (گەلەکەت)، تێیدا لە دوو دڵییدان (٦٣) بڕیاری ڕاستمان (لەبارەیانەوە) بۆ هێناویو، ئێمە لە ڕاستانین (٦٤) هەر بۆیەش خێزانەکەت لە بەشێکی شەوگاردا ببەو بڕۆنو، خۆت لە پشتیانەوە بڕۆ، هیچ کامتان ئاوڕ نەدەنەوەو، چۆنتان فەرمان پێکراوە (ئاوا) بڕۆن (٦٥) ئەو بڕیارەی دابوومان، پێمانڕاگەیاند کە ئەوانە (گەلەکەی)، لە بەرەبەیاندا، دوابڕاو دەبن (٦٦) خەڵکی شارەکەش بە شادمانییەوە هاتن (بە خەیاڵی نێربازیی کردن لەگەڵ

میوانەکانی لووط دا، کە لە شێوەی گەنجی جوان دا بوون) ﴿٦٧﴾ لووط گوتی: ئەوانە میوانمن، عەیبدارم مەکەن ! ﴿٦٨﴾ هەروەها پارێز لە خوا بکەن و ، شەرمەزارم مەکەن ﴿٦٩﴾ گوتیان: ئەدی لێمان قەدەغە نەکردبووی بەرگریی لە خەڵکی بکەی؟ ﴿٧٠﴾ گوتی: چی دەتانەوێ بیکەن، ئەوە کچەکانمن، (یانی: ئەگەر کچەکانم تەسلیم کردوون، میوانەکانمتان تەسلیم ناکەم) ﴿٧١﴾ بە تەممەنت (سوێند)، ئەوانە لە بێهۆشییاندا سەرگەردان بوون ﴿٧٢﴾ ئیدی لە خۆرهەڵاتدا جریکە گرتنی ﴿٧٣﴾ سەرەنجام (شارەکەیانمان) سەرەو بن (ژێرو ژوور) کردو، بەردی قووری سوورکراوەمان بەسەردا باراندن ﴿٧٤﴾ بێگومان لەوەدا نیشانە هەن بۆ عاقڵمەندانی سەر ناس ﴿٧٥﴾ شوێنەواری ئەو (شارو ئاوەدانیی)ە، لەسەر شەقامە رێیە ﴿٧٦﴾ بێگومان لەو (شوێنەوار)ەدا، نیشانە هەیە، بۆ بڕواداران ﴿٧٧﴾ بە دڵنیایی خاوەنانی باغەکەش ستەمکار بوون ﴿٧٨﴾ بۆیە تۆڵەمان لێکردنەوەو (شوێنەوارەکانی) هەردووکیشیان (گەلی لووط و گەلی شوعەیب)، دەکەونە سەر ڕاستە شەقامێکی ئاشکراو ڕوون ﴿٧٩﴾ } .

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(إِنَّا مِنكُمْ وَجِلُونَ ): واتە: ئێمە لە ئێوە ترساوین، بیمداریـن، (الْوَجَلُ: إِسْتِشْعَارُ الخوفِ، وجِلَ، يَوْجَلُ، فَهُوَ وَجِلٌ)، (وَجَلْ): بریتیە: لە ههست كردن بە ترس، دەگوترێ: (وَجِلَ ، يَوْجَلُ)، ترسا، دەترسێ، (فَهُوَ وَجِلٌ)، ئەو ترساوە، بیمدارە .

(ٱلْقَـٰنِطِينَ ): واتە: بێ هیوایان، نائومێد بووان، (القُنُوطُ: اليأسُ مِنَ الخَيْرِ، قَنِطَ، يَقْنَطُ، قُنُوطاً، وَقَنَطَ، يَقْنِطُ)، (قُنُوط): واتە: نائومێد بوون لە چاكە، دەگوترێ: (قَنِطَ، يَقْنَطُ) و (قَنَطَ، يَقْنِطُ): واتە: (عين الفعل)ەكەی (مفتوح) بێ، یاخود (مكسور) بێ، سەری هەبێ، یاخود ژێری هەبێ، بە هەردووكیان هاتوە .

(خَطْبُكُمْ ): (الخَطْبُ: الأَمْرُ العَظِيمُ الّذي يَكْثُرُ فِيهِ التَّخاطُبُ)، (خَطْب): كارێكی مەزنە كە قسەو باسی زۆر لەبارەوە بكرێ، (خَطْبُكُمْ ): واتە: ئەو ئەركە گرنگەی، ئەو كارە گرنگەی پێتان سپێردراوە.

(ٱلْغَـٰبِرِينَ ): (الغَابِرُ: الماكِثُ بَعدَ مُضِيِّ مَا هُوَ مَعَهُ، وَالغُبرةُ، البَقيَّةُ فِي الضَّرْعِ مِنَ اللَّبَنِ)، (غَابِر): بریتیە: لە كەسێك بمێنێتەوە دوای ڕۆیشتنی ئەوانەی كە لەگەڵی بوونە، یان ئەو شتەی كە لەگەڵی بووە، (غُبرة): بەو شیرە دەگوترێ: كە لە بنی گوانی ئاژەڵدایە، ئنجا: حوشترە، مانگایە ، مەڕو بزنە هەروەها (غَابِر) بە مانای (ماضي ، ڕۆیشتوو)ش دێ، یانی : ڕابردووو فەوتاو .

(يَمْتَرُونَ ): (الإِمْتِرَاءُ وَالْمُمَارَاةُ: المُحَاجَّةُ فِيمَا فِيهِ مِرْيَةٌ)، (إمتِراء)و (مُمَارَاة)، هەردووكیان بە مانای مشتومڕ كردنن، لەبارەی شتێكەوە، كە جێی دوو دڵییە، دوو دڵیی تێدایە، یان گومانی تێدایە .

( فَأَسۡرِ ): واتە: بەشەو بیانبە، (السُّرَى: سَيْرُ اللَّيْلِ، سَرَى، وَأَسْرَى)، (سُرَى): واتە: ڕۆیشتنی شەو، هەم بە (سَرَى) هاتووە، هەم بە (أَسْرَى) هاتووە، واتە: هەردووکیان: (سَرَى بِاللَّيْلِ، وَأَسْرَى بِاللَّيْلِ)، یانی: بە شەوێ ڕۆیشت .

بِقِطۡعٖ ): واتە: بە بەشێك، (قِطْعُ اللَّيْلِ)، یانی: (قِطْعَةٌ مِنْهُ)، بەشێك لە شەوگار، کە زۆر لە شارەزایانی تەفسیر گوتوویانە: مەبەست پێی کۆتایی شەوە یاخود سێیەکی کۆتایی شەو .

أَهۡلَكَ): (أَهْلُ الرَّجُلِ: مَنْ يَجْمَعُهُ وَإِيَاهُم نَسَبٌ، أَوْ دِينٌ ، أَوْ مَا يَجْرِي مَجْرَاهُمَا)، ئەهلی پیاو، ئەوانەن کە ڕەچەڵەك، یاخود دین، یاخود شتێك کە وەك ئەوانە، ئەو کەسانە لەگەڵ پیاودا کۆ دەکاتەوە، کەواتە: ژن دەگرێتەوە کوڕەکانی دەگرێتەوە، کچەکانی دەگرێتەوە، نەوەکانی دەگرێتەوە، دایكو بابی دەگرێتەوە ... هتد .

دَابِرَ ): (الدَابِر: الْمُتَأَخِّرُ، التَّابِعُ مَكَاناً، أَوْ زَمَاناً، أَوْ مَرْتَبَةً)، ( دَابِرَ ): واتە: شتێك کە لە دواوە دێ، یاخود شوێنکەوتوو، یان لە ڕووی شوێنەوە، یان لە ڕووی کاتەوە، یان لە ڕووی پلەوە، کەواتە: کە دەفەرموێ: ( دَابِرَ هَٰٓؤُلَآءِ ): واتە: کۆتا نەفەری ئەوانە، کۆتا کەسی ئەوانە دەبڕدرێ، ئنجا ئەگەر قەومێك کۆتا کەسیان ببڕدرێ، مانای وایە ئەوانی دیکە، لەپێشدا بڕدراونو فەوتاون .

فَلَا تَفۡضَحُونِ ): (الْفَضِيحَةُ: الشُّهْرَةُ بِمَا يُعَابُ ، وَالْعَيْبُ)، (فَضِيحَة): بریتییە لە ناوزڕان بە شتێك کە جێی ڕەخنە بێ، هەروەها بریتییە لە خودی شوورەیی، بە کوردیی دەڵێن: شوورەیی، عەیب، نەنگیی، (فَضَحَهُ: عَابَهُ): واتە: عەیبداریی کرد، شوورەیی هێنایە سەر، ڕیسوای کرد .

وَلَا تُخۡزُونِ ): (أَخْزَاهُ: أَهَانَهُ وَفَضَحَهُ وَأَخْجَلَهُ)، (وَلَا تُخۡزُونِ ): واتە: شەرمەزارم مەکەن، (فَضْح): بریتییە: لە عەیبەیەك کە بزانرێو، (خِزْي): بریتییە: لە تەریقبوونەوە، بریتییە لە شتێك کە ئینسان شەرمی لێ بکات، بریتییە لە

سەرشۆڕییەك لە خودی خۆیدا، با خەڵكیش پێی نەزانن، واتە: وام لێ مەكەن كە لە خۆم تەریق ببمەوەو، هەست بە شەرمەزاریی بكەم .

( لَعَمْرُكَ ): (العَمْرُ: جَمْعُ أَعْمَار، مُدَّةُ الحَيَاةِ)، (عَمْر): كە بە (أعْمَار) كۆدەبێتەوە، هەروەها بە (عُمُر)و بە (عُمْر)یش، هەر هاتووە، (العَمْر، العُمُرُ العُمْر)، كە هەرسێكیان بە (أعْمَار)، كۆدەبنەوە، واتە: تەمەن، ئەو ماوەیەی كە ئینسان دەیگوزەرێنێ .

سَكْرَتِهِمْ ): (السُكْر: حَالَةٌ تَعْرِضُ بَيْنَ الْمَرْءِ وَعَقْلِهِ بِالشَّرَابِ أو الغَضَبِ أو العِشْقِ)، (سُكر): حاڵەتێكە كە بەسەر مرۆڤ دێ، تووشی مرۆڤ دێ، عەقڵی كار ناكات، عەقڵی لە كار دەكەوێ، واتە: سەرخۆش یان بێهۆش دەبێ، یان بەهۆی خواردنەوەی مەیەوە، (ماددەی سەرخۆشكەر)، یان بەهۆی تووڕەیی، یان بەهۆی عیشق و خۆشەویستییەكی زۆرەوە .

يَعْمَهُونَ ): (الْعَمَهُ: التَرَدُّدُ فِي الأَمْرِ مِنَ التَّحَيُّرِ، عَمِهَ: فَهُوَ عَمِهٌ وَعَامِهٌ وَالجَمْعُ عُمَّه)، (عَمَهُ): ئەوەیە كە ئینسان لە شتێكدا دڵ لە دڵ بدا، دڵی خۆی ساغ نەكاتەوە، لە ئەنجامی سەراسیمەیی‌و سەرسامییدا لەوبارەوە، واتە: سەرگەردان بێت‌و بچێت، (عَمِهَ: فَهُوَ عَمِهٌ، عَمِهَ، يَعْمَهُ): ئەوە كرداری ڕابردووو ئێستایەتی، (فَهُوَ عَمِهٌ): ئەوەش (إسم الفاعِل)ەكەیەتی، واتە: سەرگەردانە، (عَامِهٌ): دیسان ئەوەشی بۆ بەكاردێ، كۆیەكەشی (عُمَّه): واتە: سەرگەردانان .

سِجِّيلٍ ): لە ئەسڵدا (سَنج جل)ە، وەك پێشتریش گوتوومانەو لە تەفسیری سووڕەتی (هود)دا، بە تەفصیلێ باسمان كردوە، كە ئەم وشەیە لە ئەسڵدا وشەیەكی فارسییە، یان كوردییە، یاخود زمانێكە كە دوایی فارسیی‌و كوردیی لێوە هاتوون، (سَنج جل)، لە ئەسڵدا (سەنگی گڵ) بووە، (سەنگ): واتە: بەرد، (گڵ): واتە: قوڕ، بە فارسیی، ئنجا چونكە لە زمانی عەرەبییدا پیتی گاف (گ) نیە، بۆیە: (سەنگی گڵ) بۆتە (سَنج جل)، دوایی تێكیان دا

دەغەم کردوون، بۆتە (سِجِّيل)، بۆیەش لە تەفسیرەکاندا گوتوویانە: (حَجَرٌ طِينِي)، بەردێکی قوڕیین، هەروەها هەندێکیان گوتوویانە: (حَجَرٌ وَطِينٌ مخْتَلط)، بەردو قوڕی تێکەڵ، بەڵام مانا ڕاستەکەی ئەوەیە کە گوتمان، ئنجا ئەو زانایانەی کە شارەزای زمانی فارسیی بوون، وێڕای عەرەبیی، وەك (تەبەریی‌و فەخرەدینی ڕازیی)و، هەموو ئەو ڕوونکەرەوانەی دیکەی ماناکانی قورئان، ڕەحمەتی خوایان لێبێ، زانیویانە ئەم وشەیە لە کوێوە هاتووە، بەڵام ئەو زانا عەرەبانەی کە شارەزای زمانی فارسیی نەبوون، زانیویانە کە بە مانای قوڕو بەرد دێت، بەڵام نەیانتوانیوە بیبەنەوە سەر ڕیشە زمانییەکەی کە (سجل)، (سَنج جل)ەو، (سَنج جل)یش، لە (سەنگی گڵ)ەوە هاتووەو، دوایی تێکدا دەغم کراون .

(لِّلْمُتَوَسِّمِينَ): واتە: بۆ سەرناسان، (الوَسْمُ: التأثِيرُ وَالسِّمَةُ: الأثَرُ، المُتوسِّمِين: المُعتَبرِين العَارِفِينَ المُتَّعِظِين)، (وَسْم): بە مانای شوێن دانان دێ، کاریگەریی لەسەر شتێك دابنێی، شوێنێکەی لێ بکەی، (وَالسِّمَةُ: الأَثَرُ)، واتە: شوێن، شوێنەوار، (المُتوسِّمِين)، واتە: پەندوەرگران، شارەزایانو، ئەوانە کە ئامۆژگاریی وەردەگرن .

# مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ لە درێژەی ئایەتەکانی سوورەتی (الحجر)دا، کە وەك هەموو سوورەتە مەککەییەکان لە چوارچێوەی فراوانی: بوونناسیی‌و، ئیمان‌و عەقیدەو، بەسەرهاتی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَ السَّلام)و، ناساندنی خوا ﷻ‌و، دەرخستنی سیفەتە بەرزو بێ وێنەکانی‌و، چۆنیەتی مامەڵەی لەگەڵ بەندەکانیدا، پاشان ئەو پاداشتەی کە بۆ دۆستانی دایناوەو، ئەو سزایەی کە بۆ نەیارەکانی دایناوە، لەو چوارچێوە فراوانەدا ، سوورەتە مەککەییەکان دەسووڕێن، لە درێژەی ئەوەدا خوا ﷻ لەم ئایەتانەدا گۆشەیەك لە بەسەرهات‌و سەرگوزشتەی ئیبراهیم ﷺ بۆ ئێمە دەگێڕێتەوە، کە پەیوەستە بە بەسەرهاتی لووط ﷺ‌و، گەلەکەیەوەو دەفەرمووێ :

﴿ وَنَبِّئْهُمْ عَن ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ ﴾، لەبارەی میوانە (بەڕێزە)کانی ئیبراهیمەوە هەواڵیان پێبدە .

پێشتر دەزانین هەواڵ بە کێ بدات! چونکە خوا فەرمووی : ﴿ نَبِّئْ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلْعَذَابُ ٱلْأَلِيمُ ﴿٥٠﴾ ﴾، هەواڵبدە بە بەندەکانم، کە تەنیا من لێبوردەی میهرەبانم‌و ، بەس سزای من سزایەکی سەخت‌و بە ئێشە، ئنجا دەفەرمووێ : ﴿ وَنَبِّئْهُمْ عَن ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ ﴾، هەواڵیان پێ بدە ، دەربارەی میوانەکانی ئیبراهیم، کە دیارە کۆمەڵە فریشتەیەك بوون، وەك بۆمان دەردەکەوێ، لە سیاقی ئایەتەکانداو، لە شوێنەکانی دیکەشدا، کە خوا ﷻ باسی ئەو بەسەرهاتەی کردوە، ﴿ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَقَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴾، کاتێك لێی وەژوورکەوتن، گوتیان: سەلام، یانی: سەلامەتیی‌و ئاشتیی لەسەر تۆ بێ .

﴿ قَالَ إِنَّا مِنكُمْ وَجِلُونَ ﴾، (ئیبراهیم) گوتی: ئێمە بەهۆی ئێوەوە ترساوین، (ترس و بیممان هەیە بەهۆی هاتنتانەوە)، هەڵبەتە ئیبراهیم ﷺ نەیناسیون و، کەسێکیش یەکسەر بچێت بۆ لای کەسێك و لێی وەژوور بکەوێ، بێئەوەی کە پێشتر ناسیبێتی و پێی ناشنا بێ، ناهەقی نیە ئەگەر ترسی ڕێ بنیشێ و بیمێکی پەیدا بێ، دڵەڕاوکەو دڵناڕەحەتییەکی بۆ پەیدابێ: دەبێ ئەوانە کاریان چی بێ، چ کارە بن و، بۆچی هاتبن ؟

لێرەدا خوا ﷻ باسی وەڵامدانەوەی سڵاوی (ئیبراهیم)ی نەکردوە بۆ سڵاوەکەی وان، بەڵام لە سوورەتی (هود)دا، دەفەرموێ : ﴿ قَالُواْ سَلَٰمٗاۖ قَالَ سَلَٰمٞۖ ﴾هود، واتە: ئەوان گوتیان: سڵاوت لێبێ، ئەویش گوتی: سڵاوتان لێبێ، دیارە کە دەفەرموێ: ﴿ قَالُواْ سَلَٰمٗا ﴾هود، یانی: (نُسلّمُ عَلیكَ سَلاَماً)، بەڵام ئەو فەرمووی : (سَلَٰمٞ)، واتە: (سَلامٌ عَلیكُم)، لە زمانی عەرەبیی دا ڕستەی کرداریی، شتێك کە بە ڕستەیەکی کرداریی بێ، مانایەکەی بەهێز نیە ، بە ئەندازەی شتێك کە بە ڕستەیەکی ناویی بێ، چونکە ڕستەی ناویی ، چەسپاویی و بەردەوامیی دەگەیەنێ، بەڵام ڕستەی کرداریی ، تازەبوونەوە دەگەیەنێ .

بۆیەش خوا ﷻ لێرەدا بە کورتیی گێڕاویەتەوە، چونکە لە شوێنەکانی دیکەدا ، وردەکاریی زیاتر هاتوە، کە وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکانیشدا ئاماژەی پێ دەدەین و ، پێشتریش هەر ئاماژەیەکمان پێدا: لە هەموو ئەو شوێنانەدا کە خوا ﷻ بەسەرهاتێك دەگێڕێتەوە، بە وردەکاریەکانیەوە، دوایی کە ئەو بەسەرهاتە دووبارە دەکاتەوە بە کورتیی دەیهێنێ، یاخود هەندێك ڕووی دیکەی ئەو بەسەرهاتە باس دەکات، کە لە گێڕانەوەی پێشێدا نەهاتوون .

﴿ قَالُواْ لَا تَوْجَلْ ﴾، (میوانەکانی کە فریشتەکان بوون)، پێیان گوت: مەترسە! (هەڵبەتە لە شێوەی چەند پیاوێکدا چوون بۆ لای ئیبراهیم ﷺ، ئەگەرنا فریشتە لە شێوەی خۆیاندا نابینرێن، مەگەر خوا ﷻ بە شێوەیەکی موعجیزەو بە شێوەیەکی تایبەت پێشانی کەسێکیان بدات، ﴿ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٖ ﴾،

بێگومان ئێمە موژدەی ئەوەت پێ دەدەین ، کە کوڕێکی زانات پەیدادەبێ. ﴿ قَالَ أَبَشَّرْتُمُونِي عَلَىٰٓ أَن مَّسَّنِيَ ٱلْكِبَرُ فَبِمَ تُبَشِّرُونَ ﴾، (ئیبراهیم) گوتی: ئایا موژدەم پێدەدەن ، دوای ئەوەی کە تەمەنداریم پێگەیشتووە، دوای ئەوەی بەساڵدا چووم؟ موژدەی چییم پێ دەدەن؟ بەچی موژدەم پێ دەدەن؟ لێرەدا بە تەئکید مەبەست لە (غلام علیم) ئیسحاقە، چونکە پێشتر ئیبراهیم ﷺ ئیسماعیلی پەیدابووە لە هاجەر، بەڵام ئەمەیان ئیسحاقە، کە لە سارا خانی خێزانی پەیدادەبێ، کە هەم (ئیبراهیم) لەو کاتەدا کەوتۆتە تەمەنەوە هەم (سارا)ی خێزانیشی، وەك لە شوێنەکانی دیکەدا هاتووە، کە سارا خان دەڵێ: ﴿ وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ ﴿٢٩﴾ ﴾الذاريات، واتە: گوتی: من پیرە ژنێکی نەزۆکم، واتە: پێشتر منداڵم نەبووەو کەوتوومە تەمەنیشەوە، هەروەها (ئیبراهیم)یش، دەفەرموێ: ﴿ عَلَىٰٓ أَن مَّسَّنِيَ ٱلْكِبَرُ ﴾، کەواتە: ئەویش تەمەنی هەبووەو، کە وەك لە بەسەرهاتی (ئیبراهیم)دا ﷺ کە لە تەفسیری سووڕەتی (ئیبراهیم)دا هێنامان، ئەوکاتە دەبێ تەمەنی شتێك لە سەد (١٠٠) ساڵ کەمتر، یاخود لە سەد (١٠٠) ساڵیش زیاتر بووبێ، هەروەها سارا خانیش تەمەنی لە سەرووی نەوەد (٩٠) ساڵەوە، یاخود نزیکی سەد بووبێ، هەر چۆن بێ، تەمەنیان زۆر بووە .

﴿ قَالُوا۟ بَشَّرْنَـٰكَ بِٱلْحَقِّ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْقَـٰنِطِينَ ﴾، گوتیان : بە هەق و بەڕاستیی موژدەت پێ دەدەین، لە نائومێدان مەبە، لە بێ هیوایان مەبە. ﴿ قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ ﴾، گوتی: کێ لە بەزەیی پەروەردگاری نائومێد دەبێ، جگە لە گومڕایان و سەرگەردانان؟ ئەوانەی کە خوا ناناسن و لە ڕێ هەڵە بوون، ئەوانەی ون بوون لە ڕاستە شەقامی خوا، تەنیا ئەوانە نائومێد دەبن، ئەگەرنا هەمیشە ئینسانی بڕوادار، ئومێدەوارو، دڵخۆشە، لە پەروەردگاری خۆی زۆر ڕادەبینێ و، زۆری پێ ڕادەپەڕموێ .

ئنجا کە دڵنیا بوو ئەو مـوژدەیەی پێیان داوە، هەقەو ڕاستە، لێـی پرسـین: ﴿ قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴾، گوتی : ئەدی ئەو کارە گرنگو ئەو ئەرکەی کە بۆی هاتوون ، چییەو بۆچی هاتوون، ئەی نێرراوینە؟! زانی کە ئەرکێکیان پێ سپێردراوە، جگە لەو موژدەیەی پێیاندا: پەیدابوونی (ئیسحاق)، بەڵکو لە سوورەتی (هود)دا، دەفەرموێ : ﴿ وَمِن وَرَآءِ إِسْحَٰقَ يَعْقُوبَ ﴿٧١﴾ ﴾هود، هاو کات موژدەی (یەعقووب)یشیان هەر پێدان، بە سارا خانو بە ئیبراهیم ﷺ، واتە: موژدەتان لێبێ کوڕێکتان دەبێ، کوڕێکی زانا کە ئیسحاقە، دوایی موژدەشتان لێبێ، (ئەوە جووت موژدە بووە)، کە ئیسحاقیش، کوڕێکی پەیدا دەبێ ، بە ناوی یەعقووب .

ئنجا کە لێیان دەپرسێ: ئەی نێردراوان! ئێوە بۆچی هاتوون؟ ئەو ئەرکە چییە پێتان سپێردراوە ؟

ئاوا وەڵام دەدەنەوە :

﴿ قَالُوٓا۟ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ ﴾، گوتیان: ئێمە ڕەوانەکراوین بۆ لای کۆمەڵێکی تاوانبار، خراپەکار، کە مەبەست پێیان گەلی تاوانباری لووط پێغەمبەرە ﷺ، ﴿ إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ ﴾، جگە لە بنەماڵەی لووط، ﴿ إِنَّا لَمُنَجُّوهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾، ئێمە دەربازکەری تێکڕایانین، بە تەئکید تێکڕایان دەرباز دەکەین، ﴿ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَآ إِنَّهَا لَمِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴾، جگە لە ژنەکەی مەزەندەو ئەندازەگیریمان کردوە، کە ئەو دەبێ لە فەوتاوان بێ ، یان بەجێماوان لە سزادا[1] .

ئەمە وەك شارەزایانی زمانی عەرەبیی دەڵێن: (إستثناءٌ مِنْ استِثْناء)، پێشێ دەفەرموێ: هاتووین ئەو گەلە تاوانبارە لەبەین بەرین، کە گەلی (لووط)ە، دوایی دەفەرموێ: جگە لە خێزانو بنەماڵەی لووط، ئێمە ئەوان تێکڕا دەرباز

١) { غَبَر: مَكث ، غبر ، قضى } کەواتە، (غَبَر) دوو واتای دژو پێچەوانەی یەکدی هەن، بە پێی سیاق دیاریی دەکرێ کامیان مەبەستە ! ژنەکەی لووطیش هەردووك واتایەکەی لەگەڵ گونجاون، ژنەکەی لە بەجێماوان بوو لە سزادا، ژنەکەی لە ڕابردووانو فەوتاوان بوو، لەگەڵ گەلی فەوتاوەکەی .

دەکەین، دوایی لەوەش هەڵئاوێرێ (إستِثناء) دەکات، دەڵێ: لە بنەماڵەو خێزانی (لووط)یش، هەموویان قوتار دەکەین، جگە لە ژنەکەی، ئاوا بڕیارمان داوە، دیارە فریشتەکان بە ناوی خوای پەروەردگارەوە قسە دەکەن، واتە: خوا بۆی بڕیار داون، ئێمەش بڕیارەکە ڕادەگەیەنین، کە ئەو دەبێ لە فەوتاوان بێ .

(ٱلْغَـٰبِرِينَ) کۆی (غابِر)ە، (غابِر): وەك لە شیکردنەوەی وشەکاندا باسمان کرد، (غابر): کەسێکە کە هاوەڵەکانی ڕۆیشتبن و ئەو بەجێمابێ .

﴿ فَلَمَّا جَآءَ ءَالَ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴾، ئنجا کاتێ کە نێردراوەکان، واتە: فریشتە نێردراوەکان، هاتنە لای بنەماڵەی لووط، هاتنە لای ماڵی لووط و ئەوانەی پێیەوە پەیوەستن، ﴿ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴾، دیارە سڵاویان لێکردوە، ئەویش وەڵامی سڵاوی داوەتەوە بەڵام لێرەدا کورتی کردۆتەوە، لووط فەرمووی: ئێوە کۆمەڵێکی نەناسراون، (نامۆن ، نائاناسین)، ﴿ قَالُواْ بَلْ جِئْنَـٰكَ بِمَا كَانُواْ فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴾، گوتیان: بەڵکو ئێمە هاتووین بۆ جێبەجێکردنی ئەوەی ئەوان تێیدا لە دوودڵیی دان، واتە: گەلەکەت تێیدا لە دوودڵیی دان، یانی: بەڵێ ئێمە نائاسی و نائاشنایین، بەڵام نەك هیچ شتێکی خراپمان لە بەرنامەدا نیە بۆ تۆ ، جێگای مەترسیی نین، بەڵکو هاتووین: ئەوەی کە گەلەکەت تێیدا لە دوو دڵیی دان، ئەو سزایە بەسەر واندا بچەسپێنین، ﴿ وَأَتَيْنَـٰكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّا لَصَـٰدِقُونَ ﴾، ئێمە هەقمان بۆ تۆ هێناوەو ئێمە لە ڕاستانین، هەواڵێکی ڕاستمان بۆ هێناوی، کە دەبێ ئەو سزایە بدرێن .

﴿ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ ٱلَّيْلِ وَٱتَّبِعْ أَدْبَـٰرَهُمْ ﴾، ئنجا بە شەو خێزانەکەت بەرەو، برۆ ، شەوڕۆ بکەن، ﴿ بِقِطْعٍ مِّنَ ٱلَّيْلِ ﴾، بە بەشێك لە شەوگار، وا پێدەچێ بەشی کۆتایی شەوگار بووبێ، ﴿ وَٱتَّبِعْ أَدْبَـٰرَهُمْ ﴾، خۆشت بە شوێنیاندا بڕۆ، واتە: بۆئەوەی کەسیان لێ بەجێ نەمێنێ، ﴿ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ ﴾، با هیچ کامێك لە ئێوە ئاوڕ نەداتەوە، (ئاوڕ نەداتەوە بەلای ئەو گەلە ستەمکارو خراپەکارەدا)، چونکە دەبێ بفەوتێن، ﴿ وَٱمْضُواْ حَيْثُ تُؤْمَرُونَ ﴾، بۆ کوێتان فەرمان پێ دەکرێ، بڕۆن .

﴿ وَقَضَيْنَآ إِلَيْهِ ذَٰلِكَ ٱلْأَمْرَ أَنَّ دَابِرَ هَٰٓؤُلَآءِ مَقْطُوعٌ مُّصْبِحِينَ ﴾، ئەو بڕیارەشمان پێ ڕاگەیاند، (ئەو بڕیارەی خوا ﷻ) کە ئەوانە لە بەرەبەیاندا دوابڕاو دەبن، واتە: کەسی کۆتاییان دەفەوتێ، ئنجا کۆمەڵێك کەسی کۆتاییان بفەوتێ‌و دوا بڕاو ببن، دیارە کەسیان لێ نەماوە، یانی: کۆمەڵێك دوایان ببڕێ، مانای وایە ئەوەی کە لە پێشەوە بووە، زووتر فەوتاوە .

﴿ وَجَآءَ أَهْلُ ٱلْمَدِينَةِ يَسْتَبْشِرُونَ ﴾، خەڵکی شارەکەش زۆر دڵخۆشانەو شادمانانە، هاتن، بۆچی؟ لەبەر ئەوەی ئەوانە ئەو پیشەو عادەتە خراپەیان هەبووە ، کە لەگەڵ پیاواندا جووت بوون، ئەو فریشتانەش لەسەر شێوەی گەنجی جوان هاتوون، ئیدی گوتویانە: ئەوە نێچیرێکی باشمان بۆ هەڵکەوتوە، بۆیە بە دڵخۆشییەوە هاتوون .

﴿ قَالَ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ ضَيْفِى فَلَا تَفْضَحُونِ ﴾، (لووط ﷺ)، گوتی: ئا ئەوانە میوانی منن، شەرمەزارم مەکەن ! ﴿ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ ﴾، پارێز لە خوا بکەن‌و ڕیسوام مەکەن، یان خەجاڵەتم مەکەن‌و، عەیبەم مەهێننە سەر ! ﴿ قَالُوٓا۟ أَوَلَمْ نَنْهَكَ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ گوتیان: ئەدی ئێمە لێمان قەدەغە نەکردبووی کە بەرگریی بکەی لە خەڵکی، یاخود میوانداریی خەڵکی بکەی؟ هەردوو واتایەکەی هەن. ﴿ قَالَ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِىٓ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴾، لووط ﷺ، گوتی: ها ئەوانە کچەکانمن، ئەگەر دەتانەوێ کارێك بکەن، واتە: ئەگەر کچەکانی خۆمم تەسلیم کردوون، میوانەکانتان تەسلیم ناکەم .

ئەوە واتاکەیەتی، وەك لە تەفسیری سوورەتی (هود)یشدا، ئەو واتایەمان هەڵبژارد، چونکە هەندێکیان گوتوویانە: ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِىٓ ﴾، واتە: کچەکانی ئەو کۆمەڵگایە، یان ئافرەتەکانی ئەو کۆمەڵگایە ، کچی منن، فەرموون لەگەڵ ئەواندا هاوسەرگیریی بکەن‌و، غەریزەی جینسیی خۆتان تێر بکەن !

هەندێکیش ئاوایان لێکداوەتەوە: هاوسەرەکانی خۆتان، ئەوانیش کچی منن لەگەڵ ئەواندا ئەوەی کە دەتانەوێ بیکەن‌و، غەریزەی جینسیی خۆتان تێر بکەن.

ئەمما ئەوە کە مەبەستی ئەوە بووبێ: ها کچەکانی خۆمتان بدەمێ ! ئەوە شتێکی بێجێیە، چونکە :

١/ لە جوامێریی‌و غیرەتی لووط ﷺ دوورە، کچەکانی خۆی بداتە ئەو ڕەوشت نزمانە! کچەکانی لووط ﷺ، ئەگەر دووان بوون، ئەگەر سێ بوون، ئەگەر چوار بوون .

٢/ بەڵام ئەوانە خەڵکێکی زۆر بوون، ئنجا دوو، سێ، کچ، گوا بەشی هەموویان دەکەن؟ بە تەئکید مەبەست ئەوە نەبووە، بەڵام : ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِيٓ ﴾ ئەوە تەعبیرێکە، وەك کەسێك لە کوڕەکەی تووڕە دەبێ، لە کەسێك تووڕە دەبێ، دەیەوێ لێی بدات، یەکێ دیکەش وەك بەرگریی کردن لە کوڕەکەی، دەڵێ: قبووڵ ناکەم لێی بدەی، وەرە لە من بدە! دڵنیاشەو دەزانێ کە لەو نادات، واتە: ئەگەر لە منت داوە، نایهێڵم لەو بدەی !

ئەوە مەبەستی (لووط)ە ﷺ، کە دەفەرموێ : ها ئەوە کچەکانمن، واتە: ئەگەر کچەکانی خۆمم تەسلیم کردوون، میوانەکانتان تەسلیم ناکەم، ئەوەش ئەوپەڕی جوامێرییە بۆ لووط ﷺ، نەك مەبەستی ئەوە بووبێ، وەرن کچەکانی خۆمتان بدەمێ ! چونکە ئەو قەومە داوێن پیس‌و نزم‌و خراپە، لووط ﷺ بە تەئکید کچەکانی خۆی تەسلیمی ئەوان ناکات، ئنجا ئەوە جیاوازیی چییە لەگەڵ ئەوەدا، کە لێیانگەڕێ تەعدا لە میوانەکانی بکەن !.

﴿ لَعَمۡرُكَ إِنَّهُمۡ لَفِي سَكۡرَتِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴾، بە تەمەنت سوێند، (لێرەدا ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەمە ﷺ)، سوێند بە تەمەنی تۆ، ئەوانە لە بێ هۆشییاندا سەراسیمەو سەرگەردان بوون، واتە: وەك چۆن کەسێك سەرخۆش‌و بێهۆش دەبێ، سەرگەردان دەبێ‌و، جموجۆڵی نا هاوسەنگی دەبێ، ئەوانیش ئاوایان لێ هاتبوو، ﴿ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ مُشۡرِقِينَ ﴾، دەمەو خۆرهەڵات هاتوون‌و چریکە گرتنی.

(ٱلصَّيۡحَةُ ): هاڕژن، دەنگێکی گەورەیە، چریکە، نەعرەتە، یانی: دەنگ‌و سەدایەکی زۆر بێڕەزاو زەبەلاح گرتنی، بەڵام چ وەخت؟ دەمەو خۆرهەڵات، ﴿ فَجَعَلۡنَا

عَـٰلِيَهَا سَافِلَهَا ﴾، ئەو شارە یاخود ئەو شارانە، یان ئەو دەڤەرە سەرەوەیمان کردە خوارێ، واتە: ژێرەو ژوورمان کرد، سەرەو بنمان کرد. ﴿ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ ﴾، بەردێك کە لە قوڕی وشکبووەوە، بوو . یان: قوڕێك کە بوو بوو بە بەرد، بەسەرماندا باراندن، بەرد بارانمان کردن.

واتە: ناوچەکەیان هەڵگێڕدرایەوە، وەك لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ : (الْمُؤْتَفِكَات)، وەك چۆن ئەوانە سروشتێك کە خوا ئەوانەی لەسەر خوڵقاندوە، پیاو بۆ ئافرەت و، ئافرەت بۆ پیاو، ئەوان وایانکردبوو: پیاو لەگەڵ پیاو ڕابوێرێ و، ئافرەت لەگەڵ ئافرەت! ئنجا وەك چۆن ئەوانە فیترەتی خوا، زگماکی خوایان هەڵگێڕاوەتەوە، خواش دەڤەری ئەوانی هەڵگێڕایەوە، چونکە سزا بەپێی جۆری تاوانە، دوایی بەردیشی بەسەردا باراندن، کە پێشتریش ئاماژەمان پێیدا: (حِجَارَةً )، یانی: بەرد، (سِجِّيلٍ )، یانی: بەردێك کە لە ئەسڵدا قوڕ بووە، وشك بۆتەوەو ڕەقهەڵاتووە، وەك بەردی لێهاتووە کە وەك پێشتر باسمان کرد لە تەفسیری سوورەتی (هود)دا، ئێستاش لە شوێنەواری گەلی (لووط)دا، دۆزراوەتەوە کە ئەو بەردانە ، وەك قوڕی سوورەوە کراون، چۆن خشتێك سوور دەکرێتەوە، بەو شێوەیەن. ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ ﴾، لەوەدا (واتە: لەو بەسەرهاتەدا)، نیشانە زۆرن بۆ کەسانێکی سەرناس، کەسانێك کە ورد ببینن، کەسانێك کە پەند وەربگرن. ﴿ وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٍ مُّقِيمٍ ﴾، ئەو شارو ئاوەدانییەش لەسەر ڕێیەکی بەردەوامە، (واتە: ڕێیەك کە بەردەوام خەڵکی بەسەردا دەڕوات)، کە دەریاچەی مردوو، (بَحْرُ الْمَيِّت)، شوێنەواری گەلی بەهیلاکچووی (لوط)ە.

﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾، لەوەدا (لە شوێنەوارەکەیاندا)، نیشانە هەیە بۆ بڕواداران، یانی: لە کۆی بەسەرهاتەکەیاندا، نیشانە زۆرن، بۆ سەر ناسان، بۆ کەسانێك کە ورد تەماشا بکەن، بەڵام لە شوێنەوارەکەیاندا بە تایبەت، نیشانەیەکی گەورە هەیە بۆ بڕواداران، نیشانە لەسەر باڵادەستیی خوا، لەسەر دادگەریی خوا، لەسەر ئەوە کە ئەم دنیایە، شاری بێ خاوەن نیە .

﴿ وَإِن كَانَ أَصْحَٰبُ ٱلْأَيْكَةِ لَظَٰلِمِينَ ﴾، بێگومان هاوەڵانی درەختەکە، یاخود باغەکەش، ستەمکار بوون، ﴿ فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ وَإِنَّهُمَا لَبِإِمَامٍ مُّبِينٍ ﴾، ئێمەش تۆڵەمان لێستاندنو هەردووکیان، واتە: هەم شوێنەواری گەلی لووط ﷺو هەم شوێنەواری هاوەڵانی درەختەکە، کە گەلی مەدیەنو شوعەیبیان بۆ ■ ڕەوانە کراوە، صەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ، هەردووکیان لەسەر ڕاستە ڕێیەکن، لەسەر شەقامە ڕێیەکی ڕوونو ئاشکران، کە خەڵك بەوێدا دەچن، ئێستاش شوێنەواری گەلی مەدیەن، لە ئوردونەو، شوێنەواری گەلی (لووط)یش، بۆتە دەریاچەی مردوو (البَحْرُ المَيِّت) .

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**<u>مەسەلەی یەکەم</u> : هەواڵ دانی خوای پەنهانزان لەبارەی ئەو فریشتانەی کە وەک میوان چوونە لای ئیبراهیم ﷺ و، مژدەی کوڕێکی زانایان پێدا، پاشان ئامانجی سەرەکیی هاتنی خۆیانیان پێڕاگەیاند، کە فەوتاندنی گەلی ڕەوشت نزمی (لووط)ە ﷺ :**

**خوا دەفەرمووێ :** ﴿ وَنَبِّئْهُمْ عَن ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٥١﴾ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَقَالُوا۟ سَلَٰمًا
قَالَ إِنَّا مِنكُمْ وَجِلُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا۟ لَا تَوْجَلْ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٍ ﴿٥٣﴾ قَالَ أَبَشَّرْتُمُونِى
عَلَىٰٓ أَن مَّسَّنِىَ ٱلْكِبَرُ فَبِمَ تُبَشِّرُونَ ﴿٥٤﴾ قَالُوا۟ بَشَّرْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ فَلَا تَكُن مِّنَ
ٱلْقَٰنِطِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ ﴿٥٦﴾ قَالَ فَمَا
خَطْبُكُمْ أَيُّهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٥٧﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ إِنَّا
لَمُنَجُّوهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٩﴾ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَآ ۙ إِنَّهَا لَمِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دە ( ١٠ ) ئایەتە موبارەکە ، لە پازدە ( ١٠ ) بڕگەدا:**

**<u>بڕگەی یەکەم</u> :** ﴿ وَنَبِّئْهُمْ عَن ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ﴾، **هەواڵیان پێبدە دەربارەی میوانەکانی ئیبراهیم، بێگومان مەبەست لە میوانەکانی، فریشتەکان بوونو هەر ئەو فریشتانەی چوون بۆ لای ئیبراهیم، دوایی چوون بۆ لای (لووط)یش،**

ئنجا وەك چۆن ئیبراهیم ترسی ڕێ نیشت بەرانبەریان، لەبەر ئەوەی نەیدەناسین و، لە شێوەی پیاوی نەناسراودا بوون، (لووط)یش، دیسان گوتی: ناتانناسین، پێتان نائاشناین و، ئێوە بۆ ئێمە نامۆن، چونکە فریشتە لەسەر شێوەی خۆیان نابینرێن، مەگەر بچنە سەر شێوەی بەشەر .

لە زمانی عەرەبییدا دەڵێ: (نَبَأَ، يَنْبَؤُ) لەگەڵ (أَنبأ، يُنْبِيءُ)، هەردووکیان یەك واتایان هەیە، واتە: هەواڵی پێدا، هەواڵی پێدەدا .

﴿ ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ ﴾، وشەی (ضَيْف)، هەم بە مانای تاك بەکاردێ، هەم بە مانای کۆ . (أَصْلُ الضَّيْفِ: الـمَيْلُ، ضِفْتُ إِلى كَذَا، وَأَضَفْتُ كَذَا إِلى كَذَا، وَضَافَتِ الشَّمْسُ لِلغُرُوبِ، وَأَصْلُ الضَّيْفِ مَصدَرٌ، لِذَا اسْتَوى فِيهِ الوَاحِدُ وَالجمْعُ، وَقَدْ يُجْمَعُ عَلَى: ضُيُوف، وَأَضْيَاف، وَضِيفَان) .

واتە: وشەی (ضَيْف)، ئەسڵەکەی بریتیە: لە مەیل، مەیل کردن، لادان، نزیکبوونەوەی شتێك لە شتێك، دەگوترێ: (ضِفْتُ إِلى كَذَا)، واتە: ئەو شتەم خستە پاڵ ئەوە، (وَأَضَفْتُ كَذَا إِلى كَذَا)، ئەو شتەم خستە پاڵ ئەو شتە، لێم نزیك خستەوە، (وَضَافَتِ الشَّمسُ لِلغُرُوب)، خۆر مەیلی کرد بەرەو ئاوا بوون، وشەی (ضَيْف)، چاوگە، هەر بۆیەش تاك (مفرد)و کۆ (جمع)ی تێدا یەکسانن، جاری واش هەیە وشەی (ضَيْف) بە (ضُيُوف)و (أَضياف)و (ضِيفَان)، هەموویان بە مانای (میوانەکان)ن، کۆ دەکرێتەوە .

ئەگەرنا وشەی (ضَيْف)یش، بە مانای: کۆ (جمع)ش هەر دێ، بۆ وێنە: ﴿ وَنَبِّئْهُمْ عَن ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ ﴾، مەبەست پێی میوانەکانن .

<u>برگەی دووەم</u> : - ﴿ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَقَالُوا۟ سَلَـٰمًا ﴾، یاد بکەوە! کاتێ لێی وەژوور کەوتن، چوونە ئەو شوێنەی کە (ئیبراهیم)ی لێبوو، چوونە ماڵەکەی، چوونە ئەو ژوورەی کە تێیدا دانیشتبوو، گوتیان: سەلامت لێبێ، لێرەدا - وەك پێشتر باسمان کرد - ئاماژە نەکراوە بە وەڵامدانەوەی ئیبراهیم ﷺ، بەڵام لە سوورەتی (الذّاريات)دا، دەفەرموێ : ﴿ فَقَالُوا۟ سَلَـٰمًا ۖ قَالَ سَلَـٰمٌ قَوْمٌ

مُّنكَرُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾، واتە: گوتیان: سەلامەت لێبێ، گوتی: سەلامێکی چەسپاوتان لێبێ، ئێوە کۆمەڵێکن ناتانناسم . کە دەبێ ئەم وشەیەی لەبەرخۆیەوە فەرمووبێ : ﴿ قَوۡمٞ مُّنكَرُونَ ﴾، چونکە خۆش نیە بە کۆمەڵێک بڵێی: ئێوە نامۆن، پێتان نائاشناین، وابێدەچێ لەبەرخۆیەوە ئەوەی گوتبێ، یاخود هەر ئەوەندەی مەبەست بووە: من ناتانناسم .

**برگەی سێیەم :** - ﴿ قَالَ إِنَّا مِنكُمۡ وَجِلُونَ ﴾، ئیبراهیم گوتی: ئێمە ترسمان ڕێتیشت بەهۆی ئێوەوە، ترس و بیمان ڕێتیشت، ئێمە حاڵەتی ترس و بیمان هەیە لێتان .

لە سوورەتی (الذّاريات)دا، دەفەرمویّ : ﴿ فَأَوۡجَسَ مِنۡهُمۡ خِيفَةٗۖ ﴿٢٨﴾ ﴾، بەهۆی وانەوە ترسی ڕێتیشت، ترسی هاتێ، بیمی هاتێ، کە دەبێ کێبن؟ چۆن بن؟ چونکە نایانناسێ و لە نەخافڵ هاتوون، (وَجِلُون: خائِفُون)، واتە: ترساو، ترساوان، (الوَجَلُ: إستِشعَارُ الخوفِ)، (وَجَل): بریتیە: لە هەستکردن بە ترس .

**برگەی چوارەم :** - ﴿ قَالُواْ لَا تَوۡجَلۡ ﴾، (فریشتەکان) گوتیان: مەترسێ، ترست ڕێتەنیشێ .

**برگەی پێنجەم :** - ﴿ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٖ ﴾، بێگومان ئێمە موژدە بە تۆ دەدەین بە کوڕێکی زانا، بێگومان مەبەست لە کوڕە زانایەکە (ئیسحاق)ە، چونکە تەنیا ئیبراهیم ﷺ و سارا خانی خێزانی بوون، کە فریشتەکان موژدەیان پێداون، ئنجا لە سوورەتی (الذّاريات)دا، (سارا) خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: ﴿ عَجُوزٌ عَقِيمٞ ﴿٢٩﴾ ﴾، واتە: پیرەژنێکی نەزۆکم، بەڵام هاجەر نە پیرەژن بووەو نە نەزۆکیش بووە، بەڵکو هاجەر کەنیزەکێک بووەو ، وا پێدەچێ کچێک بووبێ، تەمەنی کەم بووبێ کە (ئیسماعیل)ی بووە .

(نُبَشِّرُكَ ): حەمزە خوێندوویەتەوە: (نَبْشُرُكَ)، واتە: موژدەت پێ دەدەین، دڵخۆشت دەکەین، کە هەر یەک واتایان هەیە .

لە سووڕەتی (هود)دا، ئەمە بەو شێوەیە هاتوە : ﴿ وَٱمۡرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٞ فَضَحِكَتۡ فَبَشَّرۡنَٰهَا بِإِسۡحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسۡحَٰقَ يَعۡقُوبَ ﴿٧١﴾ ﴾هود، واتە: ژنەکەی ئیبراهیم وەستا بوو ، کە ئەو موژدەیەمان پێدا (کە کوڕێکی زاناتان دەبێ) پێکەنی، ئێمەش موژدەمان پێدا بە ئیسحاق و لە دوای ئیسحاق بە یەعقووب، (واتە: ئیسحاقیش کوڕێکی دەبێ بە ناوی یەعقووب) .

کەواتە: ئەوەی کە ئیبراهیم ویستوویەتی سەری ببڕێ (ذَبیح)، ناگونجێ ئیسحاق بووبێ، چونکە هەم ئیبراهیم و هەم سارا خانی هاوسەری، زانیویانە کە (ئیسحاق)یش (یەعقووب)ی، لێ وەپاش دەکەوێ، کەواتە: کاتێ خوا ﷻ پێشتر موژدەی بە ئیبراهیم دابێ ، کە (ئیسحاق)یش کوڕێکی دەبێ بە ناوی یەعقووب، ناگونجێ خوا ﷻ بە ئیبراهیم بفەرموێ : وەرە ئیسحاق سەربڕە ! چونکە لە پەیمانی کۆندا، دەڵێ: (ذَبیح) (ئیسحاق) بووەو هەندێك لە زانایانی ئیسلامیش وایانگوتوە، بەڵام لە ڕاستییدا تێینەگەیشتوون، بە تایبەتی ئەم ئایەتە وەك (إبن كثير)یش دەڵێ: بەڵگەیەکی یەکلاییکەرەوەیە لەوبارەوە کە (ذَبیح)، (واتە: ئەوەی هێنراوەتە سەر سەربڕان)، ئیسماعیل ﷺ بووە، نەك ئیسحاق، چونکە ئیسحاق کاتێ خوا موژدەی بە ئیبراهیم و بە سارا داوە: (ئیسحاق)تان دەبێ، هاوکات پێشێ موژدەشی پێداون ، کە (ئیسحاق)یش (یەعقووب)ی دەبێ .

کەواتە: ئەگەر ئیسحاق بووایە کە دەهاتە سەر سەربڕان، ئیبراهیم دەیزانی کە ناگونجێ سەر ببڕدرێ، چونکە ئەدی موژدەکەی خوا چی لێهات ؟ کە فەرموویەتی: (ئیسحاق)یش (یەعقووب)ی دەبێ[1] ؟!

**بڕگەی شەشەم :-** ﴿ قَالَ أَبَشَّرۡتُمُونِي عَلَىٰٓ أَن مَّسَّنِيَ ٱلۡكِبَرُ ﴾، (ئیبراهیم) گوتی: ئایا موژدەتان پێدام، دوای ئەوەی کە گەورەیی تەمەنم گەیشتۆتێ؟ (واتە: پیرییم گەیشتۆتێ)، کەوتوومە تەمەنەوە، پیر بووم، بەساڵ داچووم ؟!

---

١) لە تەفسیری سووڕەتی (الصافات)دا کە بەسەرهاتی هێنانە سەر سەربڕانی ئیسماعیلی تێداهاتوە، کورتە باسێکمان لەوبارەوە کردوە. چەندان بەڵگەی بوونمان لەوبارەوە هێناونەوە.

**برگه‌ی حه‌وته‌م :** - ﴿ فَبِمَ تُبَشِّرُونَ ﴾، (به‌سه‌ر سوڕمانه‌وه)، موژده‌ی چییم پێ ده‌ده‌ن؟ هه‌ڵبه‌ته‌ ئه‌مه‌ خوێنراوه‌ته‌وه: (فَبِمَ تُبَشِّرُونِ) و خوێنراویشه‌ته‌وه: (فَبِمَ تُبَشِّرُونْ)، كه‌ یه‌ك واتایان هه‌یه‌و، قسه‌كه‌ی بریتیه‌ له‌ سه‌رسوڕمان، نه‌ك نكووڵیی لێكردن، واته: پرسیاركردنه‌كه‌ی پرسیاركردنێكی سه‌رسوڕمان بووه، نه‌ك نكووڵیلێكردن، كه‌ بڕوا ناكات !

**برگه‌ی هه‌شته‌م :** - ﴿ قَالُواْ بَشَّرْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ ﴾، گوتیان: به‌ڕاستیی موژده‌ت پێ ده‌ده‌ین .

وشه‌ی (حَقّ)، لێره‌دا به‌ مانای (صِدق)ه‌، چونكه‌ وشه‌ی (حَق)، به‌ پێی ئه‌و سیاقانه‌ی كه‌ تێیان دا دێ، ماناكه‌ی ده‌گۆڕێ، جاری وایه‌ (حَق) به‌ مانای حیكمه‌ته‌، جاری وایه‌ (حَق)، به‌ مانای شتێكی چه‌سپاوه‌، لێره‌شدا به‌ مانای ڕاستییه‌، واته: به‌ڕاستیی موژده‌مان پێداى .

**برگه‌ی نۆیه‌م :** - ﴿ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْقَٰنِطِينَ ﴾، له‌ نائومێدان مه‌به‌، (القُنُوطُ: اليأسُ منَ الخَيْرِ)، (قُنُوط): بریتیه‌ له‌ بێهیوایی له‌ چاكه‌و، له‌ خێرو له‌ سوودێك كه‌ پێت ده‌گات .

**برگه‌ی ده‌یه‌م :** - ﴿ قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ ﴾، گوتی: ئنجا ئایا كێ له‌ به‌زه‌یی په‌روه‌ردگاری نائومێد ده‌بێ، جگه‌ له‌ گومڕایان ؟ وه‌ك پێشتریش باسمان كرد، وشه‌ی (قُنُوطُ) كه‌ چاوگه‌، ده‌گونجێ له‌: (قَنِطَ، يَقْنَطُ)ه‌وه‌ هاتبێ، ده‌شگونجێ له‌ : (قَنَطَ، يَقْنِطُ) .

ئنجا جێی سه‌رنج ئه‌وه‌یه‌ كه‌ له‌ قورئاندا، خوای زاناو شاره‌زا، كرداری ڕابردووی (قَنَطَ) یان (قَنِطَ)ی نه‌هێناوه‌، به‌ڵكو ته‌نیا حاڵه‌تی (مضارع)ه‌كه‌ی هاتووه‌و به‌ هه‌ردوو شێوه‌كانیش ده‌خوێنرێته‌وه‌، ده‌گونجێ بڵێی: (وَمَن يَقْنِطُ مِنْ رَحْمَةِ رَبِّهِ) یان (وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ ).

**برگەی یازدەیەم :** - ﴿ قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴾، گوتی: ئایا ئەی نێردراوان! ئێوە چ ئەرکێکتان هەیە، چ کارێکتان پێ سپێردراوە !

(الخَطْبُ: الأَمْرُ الشَّدِيد ، يَكثُرُ فِيهِ التخاطُبُ)، کارێکی گرنگو سەخت، کە قسەی زۆری تێدا دەکرێ .

**برگەی دوازدەیەم :** - ﴿ قَالُوٓاْ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ ﴾، گوتیان: ئێمە رەوانکراوین بۆ لای کۆمەڵێکی تاوانبار، کە مەبەست پێی گەلی (لووط)ە.

**برگەی سێزدەیەم :** - ﴿ إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ إِنَّا لَمُنَجُّوهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾، جگە لە بنەماڵەو خێزانی لووط، ئێمە تێکڕایان دەرباز دەکەین .

﴿ إِنَّا لَمُنَجُّوهُمْ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (إنـا لَمُنجُـوهُم)، هەردووکیان یەك واتایان هەیەو، لێرەدا ئەمە پێی دەگوترێ: هەڵاواردنێکی دابڕاو، (إستِثناءٌ منْقَطِع)، چونکە هەڵاوێردراو (مستثنى)و لێ هەڵاوێردراو (مستثنى منه) لێك جیان، یانی: گەلەکە جیایە لە بنەماڵەی لووط، گەلەکە دەفەوتێن، بەڵام بنەماڵەی لووط دەرباز دەبن، ئنجا گەلەکە کافرن، بەڵام بنەماڵەی لووط جگە لە ژنەکەی، بڕوادارن، هەر کات (مُستَثنَى) جیا بوو لە (مُستَثنَى مِنهُ)، ئەوە پێی دەگوترێ: (إستِثناء مُنقَطِع)، واتە: هەڵاواردنێکی دابڕاو .

**برگەی چواردەیەم :** - ﴿ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ ﴾، جگە لە ژنەکەی، واتە: هەموو بنەماڵەکەی دەرباز دەکەین، جگە لە ژنەکەی .

ئەمە لێرەدا ئەم (إستِثناء)ە، (إستِثناء)ێکی پەیوەست (مُتَّصِل)ە، هەڵاواردنێکی پەیوەستە، چونکە ژنەکەش بەشێك بووە لە بنەماڵەی لووط، لە ڕووی ڕەچەڵەکەوە، بەڵام لەو ڕووەوە کە بڕیاری فەوتانی بۆ دراوە لەگەڵ گەلەکەی دا، لە لووط ﷺ و خێزانەکەی جیابۆتەوە، کە تاکو ئەو کاتەی سزای خوا، بڕیار دەدرێو، فریشتەکان دێنو، خوا ئەو موعجیزەیە پێشانی (لووط)ﷺ پێشانی خێزانەکەشی دەدا، خێزانەکەی هەر بڕوا ناهێنێو، لەسەر

کوفری خۆی بەردەوام دەبێ، بۆیە بڕیاری فەوتانی بۆ دەدرێ لەگەڵ گەلە بێبڕوایەکەیدا .

ئنجا ئەمە شارەزایانی زمانی عەرەبیی دەڵێن: (إستِثناءٌ مِنْ إستِثناء)، هەڵاواردنە لە هەڵاواردن، پێشێ خوا بنەماڵەی (لووط)ی هەڵاوارد لە گەلەکەی، دوایی ژنەکەشی هەڵاوارد لە بنەماڵەی لووط، ئەوەش هەڵاواردنە لە هەڵاواردن .

**بڕگەی پازدەیەم** : - فریشتەکان دەڵێن : ﴿ قَدَّرْنَآ إِنَّهَا لَمِنَ ٱلْغَـٰبِرِينَ ﴾، ئەمیش بە دوو جۆر خوێنراوەتەوە :

أ/ (قَدَرنا) .

ب/ (قَدَّرنا)، کە ئەمەش لێرەدا وەك حاڵەتێکی مەجاز بەکارهاتووە چونکە ئەوەی بڕیارەکەی داوەو ئەندازە گیرییەکەی کردوە، خوایە ﷻ، یان ئەمە فەرمایشتی خوایە ڕاستەوخۆ، نەك قسەی فریشتەکان بێ، واتە: ئێمە بڕیارماندا کە دەبێ ئەو (ئەو ژنە) لە ڕابردووان و فەوتاوان ، یان لە بەجێماوان ، بێ .

**مەسەلەی دووەم** : چوونی فریشتەکان بۆ ماڵی لووط ﷺ، ئاگادارکردنەوەی لە ئامانجی هاتنیان، پاش مشتومڕی لەگەڵ گەلەکەیدا لەسەر میوانەکانیو ، سەرەنجام فەوتێنرانی گەلی لووط ﷺ ، هاوسەرەکەیشی لەگەڵیاندا:

خوا دەفەرموێ : ﴿ فَلَمَّا جَآءَ ءَالَ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٦٢﴾ قَالُوا۟ بَلْ جِئْنَـٰكَ بِمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴿٦٣﴾ وَأَتَيْنَـٰكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّا لَصَـٰدِقُونَ ﴿٦٤﴾ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ ٱلَّيْلِ وَٱتَّبِعْ أَدْبَـٰرَهُمْ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ وَٱمْضُوا۟ حَيْثُ تُؤْمَرُونَ ﴿٦٥﴾ وَقَضَيْنَآ إِلَيْهِ ذَٰلِكَ ٱلْأَمْرَ أَنَّ دَابِرَ هَـٰٓؤُلَآءِ مَقْطُوعٌ مُّصْبِحِينَ ﴿٦٦﴾

وَجَآءَ أَهْلُ ٱلْمَدِينَةِ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٦٧﴾ قَالَ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ ضَيْفِى فَلَا تَفْضَحُونِ ﴿٦٨﴾ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ
وَلَا تُخْزُونِ ﴿٦٩﴾ قَالُوٓا۟ أَوَلَمْ نَنْهَكَ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٠﴾ قَالَ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِىٓ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ
﴿٧١﴾ لَعَمْرُكَ إِنَّهُمْ لَفِى سَكْرَتِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿٧٢﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ مُشْرِقِينَ ﴿٧٣﴾ فَجَعَلْنَا عَٰلِيَهَا
سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ ﴿٧٤﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهَا
لَبِسَبِيلٍ مُّقِيمٍ ﴿٧٦﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٧٧﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم حەڤدە (١٧) ئایەتە موبارەکە ،**

**لە بیست و شەش (٢٦) بڕگەدا:**

**<u>بڕگەی یەکەم :</u>** - ﴿ فَلَمَّا جَآءَ ءَالَ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴾، **کاتێک نێردراوەکان چوون بۆ لای بنەماڵەی (لووط)، چوون بۆ لای ماڵی لووط، بۆ لای خێزانی لووط، خێزان بە واتای (أُسرَة)، واتە: ئەوانەی کە شوێنی کەوتبوون لە خێزانەکەی، کە دیارە ئەوان مەبەست بوون، لە سەردانەکەیاندا.**

**<u>بڕگەی دووەم :</u>** - ﴿ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴾، **(لووط) گوتی: بێگومان ئێوە کۆمەڵێکی نەناسراون، واتە: ئێمە ناتانناسین، نامۆن بۆ ئێمەو پێتان ناناشناین .**

**<u>بڕگەی سێیەم :</u>** - ﴿ قَالُوا۟ بَلْ جِئْنَٰكَ بِمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴾، **بێگومان کە (لووط ﷺ) گوتوویەتی: ئێوە نامۆن، ناتانناسین، نەناسراون، یانی: گومانی خراپتان لێ دەکەین، وەك چۆن (ئیبراهیم ﷺ)، ترسی ڕێنیشت بەرانبەریان، (لووط)یش هەروا مەترسیی لێیان هەبووە، بۆیەش ئەوان، ئاوا وەڵامیان داوەتەوە :** ﴿ قَالُوا۟ بَلْ جِئْنَٰكَ بِمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴾، **گوتیان :**

(بەڵێ نەناسراوین، بەڵام نەک جێگای مەترسیی نین‌و، جێی گومانی خراپ پێبران نین)، بەڵکو هاتووین ئەوەمان بۆ هێناوی ، کە گەلەکەت تێیدا لە دوو دڵیی دان، گومانیان تێیدا هەیە، کە بریتیە لەوەی خوا سزایان بدات !

**برگەی چوارەم :** - ﴿ وَأَتَيْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴾، مسۆگەر هەقمان بۆ تۆ هێناوەو، ئێمە لە ڕاستانین، واتە: هەواڵێکمان بۆ هێناوی کە جێی دڵنیاییە، ئەویش ئەوەیە ، خوا سزای ئەو گەلە خراپەی تۆ دەداو، ئێمەش لەوەدا کە هەواڵی پێ بە تۆ دەدەین، ڕاستگۆیین‌و، جیت پێ دەڵێین، بەو شێوەیە.

**برگەی پێنجەم :** - ﴿ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ ﴾، ئنجا تۆ خێزانەکەت بە شەوێ بەرە .

گەواتە: بۆیە بەو جۆرەش دڵنیایان کردۆتەوە: ﴿ وَأَتَيْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴾، چونکە کاریان هەبووە ، بەو هەواڵ پێدان‌و بەو جەختکردنەوەیە، چونکە پێی دەڵێن: تۆ بڕۆ، دەبێ ماڵ‌و حاڵەکەت بەجێبهێڵی، شوێنەکەت‌و شارەکەت بەجێبهێڵی، پەلی ماڵ‌و منداڵەکەت بگری‌و بڕۆی! ئنجا بڕیارێکی ئاوا، پێویستیی بەوەیە کە لووط عليه السلام، دەبێ تەواو دڵنیا بێت، ئەگەرنا ئێستا پەلی ماڵ‌و منداڵی بگرێ‌و بڕوات، لەسەر بناغەیەکی پتەوو جێی دڵنیایی نەبێ، هەڵوێستی وا نانوێنرێ و بڕیاری وا نادرێ .

﴿ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ ﴾، یانی: (سِرْ بِهِم لَيلاً)، شەوێ بیانبە، (سَرَى وَأَسرَى: أي سَارَ لَيلاً)، هەردووکیان یانی: بەشەوێ ڕۆیشت .

**برگەی شەشەم :** - ﴿ بِقِطْعٍ مِّنَ ٱلَّيْلِ ﴾، بە بەشێك (بە پارچەیەك) لە شەو کە وەك گوتمان: زۆر لە زانایان دەڵێن: سێیەکی کۆتایی شەو بووە .

**برگەی حەوتەم :** - ﴿ وَٱتَّبِعْ أَدْبَٰرَهُمْ ﴾، تۆش بەدوایاندا بڕۆ، واتە: تۆ بیانخە پێشخۆتەوەو لە دوایانەوە بڕۆ، بۆ ئەوەی کەسیان لێ بەجێنەمێنێ .

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە لووط ﷺ، ئەگەر هەر کچیشی بووبن، وا پێدەچێ کچەکانی دەبێ شوویان کردبێ‌و منداڵیان بووبن‌و، واپێناچێ کە وەك پەیمانی کۆن دەڵێ: تەنیا دوو کچی بووبن، وا پێدەچێت زیاتری بووبن، یاخود دەبێ کچەکانی شوویان کردبێ‌و نەوەیان بووبن، بەلاّم باسی کوڕان نەکراوە، نە لە قورئاندا باسکراوەو، نە لە پەیمانی کۆنیشدا باسکراوە، بەلاّم بە تەئکید کە گوتوویەتی: ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِيٓ ﴾، ئەوە کچەکانمن، وا پێدەچێ: سێ کچ، یان زیاتر بووبن، چونکە ئەگەر دووان بوونایە، دەیفەرموو: (هاتان ابنَتَايَ)، ئەوانە دوو کچەکەمن، بەلاّم کە فەرموویەتی: ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِيٓ ﴾، بە کۆ هێناونی، دەبێ کچەکانی: سێ، یان زیاتر، بوو بن .

**برگەی هەشتەم :-** ﴿ وَلَا يَلۡتَفِتۡ مِنكُمۡ أَحَدٞ ﴾، با هیچ کام لە ئێوە ئاوڕ نەداتەوە بەرەو دوا، (بەرەو دوا) واتە: کە ئێوە دەڕۆن‌و، گەلەکەتان لە پشتەوە دەفەوتێ، ئاوڕیان لێ مەدەنەوە .

هەندێ لە زانایان دەڵێن: بۆیە ئەو ئامۆژگارییەی لووطو بنەماڵەکەی کراوە، چونکە کاتێك ئەو هاڕژن‌و چریکەو دەنگە گەورەیە، لێیداون، دوایی بۆتە بۆمەلەرزەو ئاگر پرژێنێك‌و ، بڵێسەیەکی گەورەو جۆرە تیشکێکی لێ پەیدابووە، ئاگرو بڵێسەو تیشکێك، کە هەر کەسێك ئەو تیشکەی بینیبایە، یان کوێر بووە، یاخود زیانی لێکەوتوە .

ئنجا هەندێك لە زانایان دەڵێن: (وەك لە پەیمانی کۆنیشدا هاتووەو واپێدەچێ پشتیان بەوێ بەستبێ)، ژنەکەی ئاوڕی دایەوە بۆیە فەوتا، واپێدەچێ لەو حاڵەتەدا، ئەو هاڕژن‌و چریکەو ئاگرپرژێنە، تیشکێکی لێ پەیدابووبێ، تیشکێکی زۆر زیانبەخش بووبێ‌و، بووبێتە هۆی فەوتانی مرۆڤ، بۆیە خوا فەرموویەتی: با هیچ کامتان ئاوڕ نەداتەوە، چونکە کاتێك ئینسان دەڕواو زرمەو گرمەیەکی گەورە لە پشتەوەی بێت، ئەگەر زۆر لە خۆی وریا نەبێت، ئاوڕ دەداتەوەو بزانێ: داخۆ چ قەوما؟ بەلاّم خوا فەرموویەتی: ئاوڕ مەدەنەوە .

دەشگونجێ مەبەست ئەوە بێ، کە ئاوڕ مەدەنەوە لەوە لەو نیشتیمانەو، لەو خەڵکە خراپەو، لەو خاكو ئاوە . کە خەڵکێکی هێندە خراپی لەسەر دەژی، واتە: دڵتان لە دوای نەبێت، دەگونجێ ئەوەش مانایەکی بێت، هەرچەندە، لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوە .

بڕگەی نۆیەم : - ﴿وَٱمۡضُواْ حَيۡثُ تُؤۡمَرُونَ﴾، وەك چۆن فەرمانتان پێکراوە، بڕۆن، بڕۆن خۆتان دەرباز بکەن، پەلی ماڵو منداڵت بگرەو بڕۆ .

بڕگەی دەیەم : - ﴿وَقَضَيۡنَآ إِلَيۡهِ ذَٰلِكَ ٱلۡأَمۡرَ﴾، ئەو کارەمان پێ ڕاگەیاند .

لێرەدا : {قَضَينا : أي قَدَّرنا، وَضُمِّنَ مَعنى أوحَينا فَعُدِّيَ بـ (إلى)، أي وَقَضَينا ذَلِكَ الأمْرَ، فَأوحَينا إليهِ بِمَا قَضَيناهُ}.

(قَضَينا إلَيهِ): وشەی (قَضَينا) بە (إلى)، تەعەددا ناکات، چونکە: (قَضَينا)، واتە: بڕیارمان دا، ئیدی پێویستیی بە حەرفێك ناکات بەرکار (مَفعُول بِهِ)، بخوازێ بەڵام لێرەدا: (قَضَينا)، (ضُمِّنَ مَعنَى أوحَينا)ی، مانای (أوحَينا) خراوەتە نێو کە لە زمانی عەرەبییدا بنچینەیەك هەیە : (فعل)ێك ئەگەر بە پیتێك بگوازێتەوە بۆ بەرکار (مَفعُول بِهِ)، کە عادەت نەبێ بەوە بیخوازێ و پێویستیی پێی نەبێ، لەو حاڵەدا : وێڕای مانا ئەسڵییەکەی خۆی، مانایەکی دیکەشی دەخرێتە نێو و پێی دەگوترێ: (تَضمِين)، واتە: خرانە نێو، ئنجا لێرەدا: (قَضَينا)، مانای (أوحَينا)شی خراوەتە نێو، بەهۆی ئەوەوە کە بە پیتی (إلى) (مَفعُول بِهِ)ی خواستوە، واتە: ئەو بڕیارەمان بۆداو، پێمانڕاگەیاند : کە بڕیارمان بۆ داوە .

بڕگەی یازدەیەم : - ﴿أَنَّ دَابِرَ هَٰٓؤُلَآءِ مَقۡطُوعٞ مُّصۡبِحِينَ﴾، ئەو بڕیارەمان پێ ڕاگەیاند کە ئا ئەوانە : لە بەرەبەیاندا دوابڕاو دەبن .

الدابر: الأخِر، وَالقَطعُ كِنايَةٌ عَن الإستئصَال)، (مُصبحِين: داخِلين في الصَّباح: وَقت شرُوقِ الشَّمس)، (دَابِرَ): بە مەعنای کۆتا دێت، (قَطع)یش

﴿ مَقْطُوعٌ مُّصْبِحِينَ ﴾، كینایەیە لە بنەبڕ كران، واتە: ئەوانە هی كۆتاییان لەبەین دەچێت، كەواتە: ئەوانی دیكە زووتر لە بەین چوون، (مُّصْبِحِينَ ): واتە : لە حاڵێك دا كە دەچنە نێو بەرەبەیانەوە، ئنجا كە لە دوایی دا دەفەرموێ : ﴿ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ مُشْرِقِينَ ﴾، واتە: لە كاتی خۆرهەڵاتندا، بێگومان : بەیان (صَباح) درێژە دەكێشێ لە كاتێكەوە كە سپێدە (فَجر) شەبەقی بەرەبەیان دەردەكەوێ، تاكو خۆرهەڵاتن، خۆركەوتن، هەمووی پێی دەگوترێ : (صَباح) .

**بڕگەی دوازدەیەم :** - ﴿ وَجَآءَ أَهْلُ ٱلْمَدِينَةِ يَسْتَبْشِرُونَ ﴾، خەڵكی شارەكە هاتن زۆر بە دڵخۆشیی‌و شادمانییەوە: كە ئەوە ماڵی لووط ﷺ، كۆمەڵێك گەنجی جوانیان میوانن، بابچین تاوانی نێربازییان لەگەڵدا ئەنجام بدەین! (يستبشرون: مُطاوِعُ، بَشَّرَهُ، فَاستَبشَر، وَالمُضارِعُ يُفِيدُ التَجَدُّد)، (يَسْتَبْشِرُونَ ): (بَشَّرَهُ، فَاستَبشَرَ)، مژدەی پێدا ئەویش دڵخۆش بوو، كە دەفەرموێ: (يَسْتَبْشِرُونَ ): (الفعل المضارع) مانای تازەبوونەوە دەگەیەنێ، یانی: دڵخۆشییان بۆ تازە دەبۆوە، خەیاڵ پلاویان دەكرد .

**بڕگەی سێزدەیەم :** - ﴿ قَالَ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ ضَيْفِى فَلَا تَفْضَحُونِ ﴾، لووط گوتی: ئەوانە میوانی منن، ئنجا ئایا سێ بوون، چوار بوون، پێنج بوون؟ دیاریی نەكراوە، گوتی: ئەوانە میوانی منن، عەیبدارم مەكەن .

(الفَضحُ وَالفَضِيحَةُ: شُهرَةٌ وحَالَةٌ شَنِيعَةٌ)، (فَضَح)و (فَضِيحَة): بریتییە: لە حاڵەتێكی ناشیرین كە ئینسان ئابرووی پێ بچێ، ئاشكرابێ‌و پێی عەیبدار بێ .

**بڕگەی چواردەیەم :** - ﴿ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ ﴾، پارێز لە خوا بكەن‌و سەر شۆڕم مەكەن، شەرمەزارم مەكەن، وا مەكەن كە لە خۆم تەریق ببمەوەو، شەرمەزاریی بكێشم .

**بڕگەی پازدەیەم :** ﴿ قَالُوٓاْ أَوَلَمۡ نَنۡهَكَ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، گەلەکەی پێیان گوت: (ئەوانەی کە هاتن دەورەی ماڵیاندابوون)، ئەدی ئێمە لێمان قەدەغە نەکردبووی کە خەڵکی میوان بکەی، یاخود بەرگرییان لێ بکەی ؟!

**بڕگەی شازدەیەم :** ﴿ قَالَ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِيٓ إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ ﴾، گوتی: ئا ئەوە کچەکانمن، ئەگەر دەتانەوێ شتێك بکەن، یانی: ئەگەر کچەکانی خۆمم تەسلیم کردوون، تەعەددان لێکردوون، ڕێگاتان نادەم دەستدرێژیی بکەنە سەر میوانەکانم .

چونکە جارێ لووط ﷺ، نازانێ کە ئەوانە فریشتەن، تاکو تاقیکرانەوەکەی بگاتە لووتکەو کۆتایی خۆی !

**بڕگەی حەفدەیەم :** ﴿ لَعَمۡرُكَ إِنَّهُمۡ لَفِي سَكۡرَتِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴾، خوا سوێند بە تەمەنی پێغەمبەر ﷺ دەخوات، دەفەرموێ: سوێند بە تەمەنی تۆ، ئەوانە لە بێ هۆشییاندا سەراسیمەو سەرگەردان بوون، [ لَعَمۡرُكَ : أي لَعَمرُكَ قَسَمي)، بە تەمەنی تۆ سوێندی من بێ .

(السُكرةُ: ذَهابُ العَقْلِ)، (سَكرة): واتە: لاچوونی عەقڵ، بێهۆشیی، سەرخۆشیی .

(العَمَهُ: التَرَدُّدُ وَالتَّحيُّرُ)، (عَمَە): بریتیە: لە سەراسیمە بوونو سەرگەردان بوون .

**بڕگەی هەژدەیەم :** ﴿ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ مُشۡرِقِينَ ﴾، دەمەو خۆرکەوتن : هاڕژن و چریکەکە گرتنی، (ٱلصَّيۡحَةُ : صَعْقَةٌ فِي الهَوَاءِ): دەنگێکی گەورە کە لە هەوا بێ، چریکە، هاڕژن، نەعرەتە، دەنگێکی بێڕەزا، (مُشۡرِقِينَ : دَاخِلِينَ فِي وَقْتِ الشُرُوق)، واتە: کە دەکەونە کاتی خۆرکەوتن، خۆرهەڵاتن .

**بڕگەی نۆزدەیەم :** ﴿ فَجَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا ﴾، لە ئەنجامی ئەو هاڕژنو چریکەیەدا، ئێمە شوێنەکەیانمان، ژێرو ژوورکرد .

﴿ فَجَعَلْنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا ﴾، ڕاناوەکەی، (ها) بۆ شارەکە دەچێتەوە، هەرچەندە باسی شارەکە نەکراوە، بەلام بە سیاق دەزانرێ، واتە: ئەو شوێنەو ئەو شارەی گەلەکەی لووط تێیدا بوون، سەرێیمان کرد خوارێو، سەرەو بنمان کرد، بنیمان هێنا سەرێ، سەرێمان برد خوارێ، واتە: ژێرەو ژوورمانکردو، هەلمانگێڕانەوە.

**بڕگەی بیستەم :** - ﴿ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ ﴾، لە بەردێ کە لە قوڕە، قوڕەو کراوە بە بەرد، سوورکراوەتەوە، بەسەرماندا باراندن .

**بڕگەی بیست و یەکەم :** - ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَٰتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ ﴾، بێگومان لەوەدا نیشانە هەن بۆ کەسانێك پەند وەربگرن، یاخود بۆ کەسانێك کە سەرناس بن .

وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : { إِنَّ لله تعالى عِبـاداً يَعْرِفُـونَ النـاسَ بالتوسُّم} {أَخْرَجَهُ الطَّبراني في (الأوسط) رقم: ٢٩٣٥، قَالَ الهَيْثَمي: إِسْنَادهُ حَسَنٌ، وَحَسَّنَهُ الألباني في (صَحيح الجَامع) رقم: ٢١٦٨}.

واتە: خوا چەند بەندەیەکی هەن، خەلك بە تەماشاکردنو تێفکرین دەناسن، واتە: دیوی پەنهانیان دەبینن .

**بڕگەی بیست و دووەم :** - ﴿ وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٍ مُّقِيمٍ ﴾، ئەو شارە هەلگێڕدراوەیە، سەرەوبن کراوە، ژێرەوژوور کراوەش، لەسەر شەقامە ڕێیەکە، لەسەر ڕێیەکە کە بەردەوام خەلك پێیدا دەڕوا .

أي: المَدِينَـةُ المَقلُوبَـة المَنكوسَـة، بطَرِيـقِ بـاقٍ ، يُشـاهِدُ كَـثيرٌ منكُـم آثَارَهـا فِـي بِلادِ فِلسـطِين ، فِـي طَرِيقِ تِجَارَتكُم إلـى الشـام)، واتـە: ئـەو شارە هەلگێڕدراوەو سەرەوبن کراوە لەسەر ڕێیەکە، کە ڕێیەکە ئێستا هەیەو زۆرێکتان شوێنەوارەکەی دەبینن لە وڵاتی فەلەستین، لە کاتێکدا کە بۆ بازرگانیی دەچن بۆ شام، (بەنسبەت خەلکی حیجازەوە)، بەنسبەت خەلکی دنیاشەوە: ئێستاکە شوێنەکەی بووە بە دەریاچەی مردوو، {بَحرُ المَيِّت}، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ ﴿١٣٧﴾ وَبِٱلَّيْلِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٣٨﴾ ﴾.

الصافات. واتە: ئێوە دەمەو بەیانیان و بە شەوگار بەلایاندا، (بەلای شوێنەواری ئەو گەلە فەوتێنراوەی (لووط)دا)، ڕەت دەبن، ئایا نافامن؟

کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٍ مُّقِيمٍ ﴾، (مقيم) لە ئەسڵدا بریتیە لە کەسێ: کە لە شوێنێك نیشتەجێیەو، لێی لاناچێ، بەڵام لێرە خوازراوەتەوە بۆ ئەو ڕێیەی کە شوێنەوارە ماوەکان لەو جێیەدان، چوێنراوە بە کەسێکی نیشتەجێوە .

سیفەتە بۆ (سبیل) یانی: شوێنەوارەکان دەکەونە سەر ڕێیەك کە بەردەوامە، وەك چۆن کەسێك لە شوێنێك نیشتەجێیەو لێی لاناچێ، ئەو ڕێیەش ئاوا بەردەوامەو قەڵەباڵغە، شەقامە ڕێیە .

**برگەی بیست و سێیەم :** - ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾، بێگومان لەوەدا، واتە: لە کۆی بەسەرهاتی گەلی لووط و خراپەکاریان و، ئاگادارکرانەوەیان لە لایەن (لووط)ەوە ﷺو گوێ پێنەدانیان و، بەردەوامبوونیان لەسەر خراپەکارییان، پاشان سزا بەسەردا سەپێنرانیان، بەو شێوەیە کە باسمانکرد، کە بریتی بوو لە هەڵگێڕانەوەو سەرەوبنکردنی شارەکەیان، لە ئا ئەوەدا، نیشانە هەیە بۆ بڕواداران، واتە: کۆی بەسەرهاتەکە بە شوێنەوارەکانی گەلی (لووط)یشەوە، نیشانەیەو بەڵگەیەکی گەورەیە بۆ بڕواداران .

(الخَطيبُ الإسكافي) لە کتێبەکەی خۆی (دُرَّةُ التَّنزيلِ وَغُرَّةُ التأويل)[1]دا، دەڵێ: پێشێ خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ ﴾، دوایی دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾، هۆکارەکەی ئەوەیە کە لە کۆی بەسەرهاتی گەلی (لووط)دا، ئەو هەموو ڕووداوانە کە هاتوونە پێش، چەندان نیشانە هەن، بۆ کەسانێك کە تێبفکرن و وردبنەوەو، دیوی پەنهانی شتەکان ببینن و، خاوەنی فیراسەت بن، بەڵام لە شوێنەواری گەلی (لووط)دا، لەو شارە هەڵگێڕراوەیەدا، نیشانەیەکی گەورە هەیە بۆ بڕواداران، ئەوەی پێشێ لەبەرئەوەی

---

١) ص ١٨٠ .

کۆمەڵێ شتن ، هەرکامێکیان نیشانەیەکە، بۆ کەسانی برواداری خاوەن فیراسەت و وردبینیی، بەڵام ئەمەیان شوێنەوارەکە خۆی، یەك نیشانەیە بۆ برواداران .

بڕگەی بیست و چوارەم : ﴿ وَإِن كَانَ أَصْحَٰبُ ٱلْأَيْكَةِ لَظَٰلِمِينَ ﴾، بێگومان هاوەڵانی درەختەکەش لە ستەمکاران بوون .

وشەی: (أيكة: الغَيضَةُ مِنَ الأَشجَارِ المُلتَفُّ بَعضُها بِبَعضٍ وَاسمُ الجَمعِ أَيكٌ) .

(أَيكة)، بە باغێك، بە کۆمەڵە دارودرەختێك دەگوترێ: کە هەندێکی لە هەندێکی هاڵاوە، ناوی کۆی بریتییە: لە (أَيك)، بە یەکێکیان دەگوترێ: (أَيكة)، بێگومان مەبەست لە هاوەڵانی درەختەکە، گەلی مەدیەنن، کە شوعەیب ﷺ، وەك پێغەمبەر بۆیان ڕەوانە کرا، خوا دەفەرموێ: ئەوانیش بێگومان لە ستەمکاران بوون .

بڕگەی بیست و پێنجەم : ﴿ فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ ﴾، ئێمەش تۆڵەمان لێستاندن .

(الإنتِقَام: العُقُوبَة لِأَجلِ ذَنبٍ)، (إنتِقَام) بریتییە: لە سزادانێك بەهۆی گوناهو تاوانێکەوە .

ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (هود)دا، بە درێژیی باسی گەلی (شوعەیب)مان کرد، بۆیە لێرەش خوای پەروەردگار هەر بە ئاماژە فەرموویەتیەوە، چونکە لەوێ بە تەفصیلێ هێناویەتی، ئێمەش لەوێ بە تەفصیلێ باسمان کرد، لێرەش لە قەدەر ئاماژەکەی خوای کارزان، هەروا چەند وشەیەکی لەبارەوە دەڵێین .

بڕگەی بیست و شەشەم : ﴿ وَإِنَّهُمَا لَبِإِمَامٍ مُّبِينٍ ﴾، هەردووکیان لەسەر ڕێیەکی ڕوونن .

(الإِمَامُ: الطَّرِيقُ الوَاضِح لِأَنَّهُ يأتَمُّ بِهِ السَّائِرُ، أَي: يَعرِفُ أَنَّهُ يُوصِلُ)، واتە: (إمام) ڕێیەکی ڕوونە، چونکە بابای پێرۆ کە بەسەری دادەڕوا، بەدوای دەکەوێ و دەزانێ کە دەیگەیەنێتە ئامانج .

کە دەفەرموێ: (وَإِنَّهُمَا )، ئایا ئەو ڕاناوی دووانە، بۆ چیو چی دەچێتەوە؟ دەڵێین: بۆ شوێنەواری گەلی لووط، کە پێشتر باسکراو، بۆ شوینەواری گەلی مەدیەن، خاوەنانی باخەکە، یان خاوەنانی درەختەکە، دەفەرموێ: هەردووکیان لەسەر ڕێیەکی ڕوونو ئاشکران، کە ئەو ڕێیە هەم ڕێگای بازرگانییو هاتوچۆی گەلی عەرەب بووە، کە لە حیجازەوە هاتوون بۆ شام، یان بۆ عێراق، هەم بۆ خەڵکی دیکەش بەگشتی.

ئێستاش گەلی لووط، شوێنەکەیان بۆتە دەریاچەو، گەلی مەدیەنیش لە ئوردونن، هەر بەسەر یەکەوەن، ئێستاش هەر ڕێو بانی خەڵکێکی زۆریان بەسەرەوەیە .

کەواتە: (وَإِنَّهُمَا )، واتە: ئاوەدانییەکانی گەلی لووطو، ئاوەدانییو شاری گەلی مەدیەن، هەڵبەتە دەشگونجێ کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّهُمَا لَبِإِمَامٍ مُّبِينٍ ﴾، مەبەست پێی: هاوەڵانی باخەکەو ، گەلی مەدیەن بێ، لەسەر ئەو تەفسیرەی کە شوعەیب ﷺ، تاکە پێغەمبەرێکە ، بۆ دوو گەلان نێردراوە، هەم بۆ گەلی مەدیەنو هەم بۆ ﴿ أَصْحَٰبُ ٱلْأَيْكَةِ ﴾، بەڵام ئێمە لە تەفسیرماندا بۆ سوورەتی (هود)، ئەو ڕایەمان پەسند کرد، کە مەبەست لە مەدیەنو ﴿ أَصْحَٰبُ ٱلْأَيْكَةِ ﴾، هەر یەك گەلە، کە (شوعەیب)یان بۆ نێردراوە صەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت، واش پێدەچێ ئەوانە هەم شوێنی نیشتەجێبوونیان هەبووبێ، (شوێنی زستانە) کە شارەکەیان بووە، هەم شوێنی هاوینەو هاوینە هەواریشیان هەبووبێ، کە باخەکەیان بووە، یاخود لە یەك کاتدا ، هەم ئەو شارەشیان هەبووەو ، هەم لە دەوری شارەکەش، باخو بێستانو گوڵو گوڵزارێکیشیان هەبووە، بۆیە خوای پەروەردگار جارێك بە گەلی مەدیەنو، جارێکیش بە : ﴿ أَصْحَٰبُ ٱلْأَيْكَةِ ﴾، خاوەنانی درەختەکە، ناوی بردوون .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چوارەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە پێنج (٥) ئایەت پێکدێت، ئایەتەکانی: (٨٠ - ٨٤)، لەو پێنج ئایەتەدا خوا ﷻ بەسەرهاتی گەلی سەموود کە صالح ﷺ پێغەمبەریان بووە، دەگێڕێتەوە ، کە لێرە لەم سوورەتی (الحجر)دا، بە: ﴿أَصْحَٰبُ ٱلْحِجْرِ﴾، ناویان هاتووە ، ئەم سوورەتە تەنیا شوێنێکە کە گەلی سەموود بە ناوی ﴿أَصْحَٰبُ ٱلْحِجْرِ﴾، ناوزەد کراون، هەر بۆیەش ئێمە ئەوەمان هەڵبژارد کە لێرە، لە تەفسیری ئەم سوورەتەدا، بەسەرهاتی گەلی سەموود: ﴿أَصْحَٰبُ ٱلْحِجْرِ﴾، خاوەنانی (الحجر)، بتوێژینەوەو ، لێکۆڵینەوەی تێرو تەسەلی لەبارەوە بکەین، دوای لێکدانەوەی مانای ئایەتەکان .

﴿ وَلَقَدْ كَذَّبَ أَصْحَٰبُ ٱلْحِجْرِ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٨٠﴾ وَءَاتَيْنَٰهُمْ ءَايَٰتِنَا فَكَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ
﴿٨١﴾ وَكَانُوا۟ يَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا ءَامِنِينَ ﴿٨٢﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ مُصْبِحِينَ ﴿٨٣﴾
فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾.

# مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بێگومان خاوەنانی حیجریش پێغەمبەرانیان بەدرۆ دانان ﴿٨٠﴾ نیشانەکانی خۆمانمان پێیاندا، کەچی پشتیان تێیانکرد، (پشتگوێیان خستن) ﴿٨١﴾ (عادەتیشیان وابوو) خانوویان لە چیاکاندا دەتاشین، لە حاڵێکدا کە هێمن و بێ ترس و بیم بوون ﴿٨٢﴾ (بەڵام بەهۆی لادان و تاوانەکانیانەوە)، لە بەرەبەیاندا هاڕژن و چریکەیەکی گەورە گرتنی ﴿٨٣﴾ ئیدی ئەوەی کردبوویان لە خانوو کۆشکی مەحکەم، هیچ دادی نەدان و نەیپاراستن (لە بەڵای خوای دادگەر) ﴿٨٤﴾ } .

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(أَصْحَٰبُ ٱلْحِجْرِ) : (أَصْحَاب)، كۆی (صَاحِب)ە، كە بە مانای هاوەڵ دێو، بە مانای خاوەنیش دێ، (ٱلْحِجْرِ): لە زماندا: (المَكانُ المَحجُورُ أي: المَمْنُوعُ)، (حِجْر): ئەو شوێنەی كە قەدەغە كراوە، شوێنێك كە پاوانكراوە، بەلام وەك زاراوەیەكی باو دەڵێ: (الحِجْر: مَكان بَينَ المَدينَةِ وَالشام)، شوێنێكە دەكەوێتە نێوان شامو مەدینەوە، كە كاتی خۆی گەلی سەموود لەوێ نیشتەجێ بوون .

(يَنْحِتُونَ): واتە: دادەتاشن، (النَّحْتُ: بَرِيُ الحَجَرِ، أَوِ العُودِ في وَسَطِهِ، أَو مِنْ جَوانِبِهِ)، (نحت) ئەوەیە كە بەرد، یاخود تەختەدارێك، دابتاشرێ، لە نێوەڕاستیەوە، یاخود لەملاولایەوە، بە تەشوێ دەتاشرێ، یاخود ئەگەر بەرد بێ، پێی دەگوترێ : نەقاری .

(ءَامِنِينَ): (الأَمْنُ: طُمَأنِينَةُ النَّفْسِ، وَزَوالُ الخوفِ)، (أَمْن): بریتیە لەوە كە نەفس ئارامگرتوو بێو، ترس و بیمی نەبێ، واتە: زۆر بە هێمنیی و ئارامیی لەو شوێنەی خۆیاندا نیشتەجێ بوون .

(ٱلصَّيْحَةُ): (رَفْعُ الصَّوتِ)، (صیحة) بریتیە: لە چریكە، نەعرەتە، دەنگێكی زۆر بەرز، هاڕەیەكی گەورە ، هاڕژن .

(مُصْبِحِينَ): (دَاخِلِينَ فِي الصَّبَاحِ)، لە كاتێكدا كە دەكەوتنە نێو بەرەبەیانەوە، واتە: لە بەرەو بەیاندا، ئەو هاڕژن و چریكەیە گرتنی .

(فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَكْسِبُونَ): (يَعني: مَا دَفَعَ عَنْهُمْ كَسْبُهُم)، واتە: ئەوەی كە كردبوویان لە خانوو بەرەو كۆشك، یاخود لە سەروەت و سامان كە وەسەریەكیان نابوو، هیچ سوودی پێنەگەیاندن، هیچ بەلای خوای لێ دوور نەخستنەوە .

# مانای گشتی ئایەتەکان

ئێمە بە خێرایی بەسەر مانای گشتی ئەم پێنج (٥) ئایەتە موبارەکەدا ڕەت دەبین، چونکە وەك پێشتر گوتمان: دواتر لێکۆڵینەوەیەك لە بارەی صالح و گەلەکەی (سەموود)ەوە دەکەین، بۆیە ئێستا بە خێرایی بەسەریدا ڕەت دەبین، خوا ﷻ وەك یادانەوە سەر ئەو بەسەرهاتانەی کە پێشتر باسکران، ئەمیش یادەداتەوە سەر ئەوان، دەیگێڕێتەوە بۆ سەر ئەوان، دەفەرموێ :

﴿ وَلَقَدْ كَذَّبَ أَصْحَٰبُ ٱلْحِجْرِ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾، بە دڵنیایی هاوەڵانی حیجر، یان خاوەنانی حیجریش پێغەمبەرانیان بە درۆ دانان، هەڵبەتە ئەوان یەك پێغەمبەریان بە درۆ داناوە، کە صالح بووە، صەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت، بەڵام بۆیە خوا هەم لێرە، هەم لە چەند شوێنی دیکەدا، دەفەرموێ: فلان گەلە پێغەمبەرانیان بە درۆ دانان، چونکە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، پەیامەکەیان یەکە، لە هێڵە گشتییەکانیدا ، یەکە، لە نێوەڕۆکی دا یەکە، بۆیە هەر کەسێك یەك لە پێغەمبەرانی خوا بە درۆ دابنێ، وەك هەموویانی بە درۆ دانابێ، وایە، چونکە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، هەموویان پشتگیریی یەکلییان کردووە، هەر کامێکیان ئەوەی پێشی خۆی بە ڕاست زانیوەو، ئەوەی دوای خۆیشی موژدە پێداوە .

﴿ وَءَاتَيْنَٰهُمْ ءَايَٰتِنَا فَكَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴾، نیشانەکانی خۆمانمان پێدابوون، بەڵام پشتیان تێکردن .

نیشانەکانی خۆمان ، (آیاتنا) دەگونجێ مەبەست ئەو وشە موبارەکانە بن کە خوا لە ڕێی وەحییەوە بۆ پێغەمبەر دەیانێرێ، واتە: بەرنامەی خۆمانمان پێدابوون .

دەشگونجێ مەبەست ئەو موعجیزەو بەڵگانەبن، کە صالح صەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت، بۆ گەلەکەی بردوونی بۆ ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی خۆی، کە حوشترەکەی بووە بە پلەی یەکەم، شێوەو هەڵسوکەوتی خۆی بووەو، ئەو پەیامە

هەقە بووە ، کە عەقڵو دڵی دواندوونو ، ڕاستییەکانی بوونیان دەخاتە بەرچاوو، ڕێنماییان دەکات بۆ حەڵاڵو حەرام، بۆ چاکەو خراپە، هەروەها بۆ ڕەوشتو بەها بەرزەکان کە خۆیانیان پێ برازێننەوەو، خووخدە خراپەکان ، کە خۆیانیان لێ بژار بکەن، ئەوانە هەموویان نیشانەو بەڵگەن لەسەر ڕاستیی هەر کام لە پێغەمبەران صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بێت، کە هەموویان بەو شێوەیە بوون .

﴿ وَكَانُوا۟ يَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا ءَامِنِينَ ﴾، عادەتیان وابوو کە زۆر بێ ترسو بیمانە ، لە شاخو چیایان خانوویان دادەتاشین .

کە شوێنەوارەکانیان ئێستاش ماون .

﴿ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ مُصْبِحِينَ ﴾، هاڕژن و چریکەیەکی گەورە، هاڕەو دەنگێکی گەورە گرتنی لە بەرەو بەیاندا، واتە: لە بەرەو بەیاندا ، ئەو بەڵایەیان بەسەر هات، دوای ئەوەی کە صالح ﷺ، زۆر خۆی لەگەڵ ماندووکردنو ئاگاداری کردنەوە، وەك لە بەسەرهاتەکەیدا باس دەکەین، بەڵام لاملییان کردو بە گوێیان نەکرد، بۆیە سەرەنجام شایستەی ئەوە بوون کە خوا سزایان بدات: گەسکێکیان لێبدرێو سەر زەویان لێ پاك بکرێتەوە .

﴿ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴾، ئەوەی کە وەدەستیان دەهێنا، هیچ سوودی پێ نەگەیاندن، ئەمە ئەگەر (ما) لابەر (نافیة) بێ: ﴿ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم ﴾، سوودی پێنەگەیاندن ئەوەی کە بەدەستیان دەهێنا، لە خانووبەرەو سەروەتو سامان، لە کارو کەسابەت .

دەشگونجێ (ما)، پرسیارکەر (إستفهامیة) بێت، یانی : ﴿ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴾، ئایا ئەوەی وەدەستیان دەهێنا ، چ سوودێکی پێگەیاندن؟! بێگومان هیچ سوودی پێنەگەیاندن، بەڵای خوایان بۆ هاتو لەگەڵ زەویدا تەخت بوونو، شوێنەوارەکانیشیان بۆ دەرسو پەند لێ وەرگرتنی خەڵکی ماونەوە، لەو شوێنەی کە پێی دەگوترێ : (الحجر) .

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم :** گەلی حیجر سەرجەم پێغەمبەرانیان بە درۆ دانان :

خوا فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدۡ كَذَّبَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡحِجۡرِ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴾، بە دڵنیاییەوە هاوەڵانی حیجر، یان خاوەنانی حیجر پێغەمبەرانیان بە درۆ دانان و پێیان بێبڕوا بوون .

وشەی : ﴿ أَصۡحَٰبُ ٱلۡحِجۡرِ ﴾، تێرە تاکە شوێنە کە لە قورئاندا کە گەلی سەموود بە ﴿ أَصۡحَٰبُ ٱلۡحِجۡرِ ﴾، ناویان هاتبێ، (حیجر)یش وەك شارەزایانی جوگرافیاو مێژوو دەڵێن، بۆ وێنە: خاوەنی (التَّحرير والتّنوير)، دەڵێ :

الحِجرُ: هُوَ المَعْرُوفُ بِوَادِي القُرَى، وَهُوَ بَيْنَ المَدِينَةِ وَالشام ، وَهُوَ المَعرُو اليَومَ باسمِ مَدَائِنِ صالِح عَلَى الطَّرِيقِ مِن خَيبَر إِلَى تَبُوك)[١]، واتە: (حیجر): ئەو شوێنەیە کە بە (وَادِي القُرَى)، ناسراوە، کە شوێنێکە لە نێوان مەدینەی پێغەمبەری خوا ﷺ و دەڤەری شام داو، ئێستا لەم ڕۆژگارەدا بە (مَدَائِن صالِح)، ناسراوە، لەسەر ڕێی خەیبەرە بەرەو تەبووك، تەبووك لە ئوردونەو، خەیبەریش یەکێکە لە شارەکانی نیوە دوورگەی عەرەبیی .

لێرەدا پرسیارێك دەکرێ: گەلی سەموود ﴿ أَصۡحَٰبُ ٱلۡحِجۡرِ ﴾، تەنیا (صالح)یان بە درۆ داناوە، ئایا بۆچی خوا ﷻ دەفەرموێ: پێغەمبەرانیان بەدرۆ دانا ؟!

وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا، ئەوە لە سوورەتی (الشعراء)یشدا، چەند جارێك دووبارە بۆتەوە بۆ وێنە: ﴿ كَذَّبَتۡ قَوۡمُ نُوحٍ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ١٠٥ ﴾.

---

١) ج ١٤، ص ٧٣.

﴿ كَذَّبَتۡ عَادٌ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ ﴾ الشعراء .

﴿ كَذَّبَتۡ ثَمُودُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٤١﴾ ﴾ الشعراء.

﴿ كَذَّبَتۡ قَوۡمُ لُوطٍ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٦٠﴾ ﴾ الشعراء.

﴿ كَذَّبَ أَصۡحَٰبُ لۡـَٔيۡكَةِ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٧٦﴾ ﴾ الشعراء.

هۆیەکەشی ئەوەیە کە پەیامی پێغەمبەران یەکێکەو، پێغەمبەران هەموویان یەکدییان بەڕاست زانیوەو، هەموویان پشتگیری یەکدی بوون، پەیامەکەیان لە نێوەڕۆکداو لە هێڵە گشتییەکانیدا یەك بووە، کەواتە: هەر کەسێك یەکێ لە پێغەمبەران بە درۆ دابنێ، مانای وایە هەموویانی بە درۆ داناوەو، بەرانبەر بە هەموویان بێبڕوا بووە .

<u>مەسەلەی دووەم</u> : گەلی سەموود نیشانەکانی خوایان پشتگوێ خستن :

خـوا دەفـەرموێ: ﴿ وَءَاتَيۡنَٰهُمۡ ءَايَٰتِنَا فَكَانُواْ عَنۡهَا مُعۡرِضِينَ ﴾، نیشانەکانی خۆمانمان پێدان، بەڵام ئەوان پشتیان تێکردن .

لێرەش دیسان پرسیارێك دەکرێ: ئەگەر صالح ﷺ موعجیزەکەی بریتی بووبێ لە حوشترەکە، ئەو حوشترەی کە خوا بە تایبەت خوڵقاندی، حوشترەکە یەك ئایەت بوو، یەك نیشانە بوو، بۆچی خوا دەفەرموێ :

﴿ وَءَاتَيۡنَٰهُمۡ ءَايَٰتِنَا ﴾؟! نیشانەکانی خۆمانمان پێدان ؟

ئەمە چوار وەڵامی هەن :

<u>وەڵامی یەکەم</u> : حوشترەکە بۆخۆی چەندان نیشانەی گرتوونە خۆی :

١- حوشترێك لە چیایەك بێتە دەرێ .

٢- ئنجا بەچکەیەکی لەگەڵدابێ .

٣- ئنجا ئەو حوشترە هێندە گەورە بێ، خەڵکی شارەکە هەموویان بتوانن شیرەکەی لێ بدۆشن .

٤- پاشان ئاوی کانییەکە ، ڕۆژێك بە تایبەت بۆوی تەرخان بێو، لێی بخواتەوە !

مانای وایە چەندان نیشانەی گرتوونە خۆی، ئەوە وەڵامێك .

وەڵامی دووەم : ئەوەیە کە صالح ﷺ جگە لە حوشترەکە، کە موعجیزەی تایبەتیی‌و گەورەی بووە، موعجیزەی دیکەشی هەبوون، بەڵام خوا باسی نەکردوون.

وەڵامی سێیەم : دەگونجێ مەبەست لە (آیات) لێرەدا وشەکانی خوای پەروەردگاربن‌و، مەبەست بەرنامەی خوا بێت، کە لە ڕستەکان پێکدێن، واتە: (آیات) لێرەدا مەبەست موعجیزەکان نەبێ، بەڵکو مەبەست ئەو وشە موبارەکانە بن، کە خوا دەیاننێرێ بۆ پێغەمبەران، وەك وەحیی، کە بەرنامەی خوای پەروەردگاریان تێدا بەرجەستەیە، ئەوانیش زیاتر لە ئایەتێك بوون .

وەڵامی چوارەم : دەگونجێ وەڵامێکی دیکەش بدرێتەوە، ئەویش ئەوەیە کە بێگومان صالح ﷺ :

١- حوشترەکەی نیشانەیەك بووە .

٢- بۆ خۆی نیشانەیەك بووە .

٣- بەرنامەکەی نیشانەیەك بووە .

٤- ئەوە کە صالح ﷺ خوا پاراستوویەتی، چونکە کافرە زلە زلەکانی گەلەکەی زۆر دژی بوون، ئەوەش نیشانەیەك بووە، هەروەها چەندان شتی دیکەش لە (صالح)و لە پەیامەکەی‌و لە شێوەی ژیان‌و هەڵسوکەتی دا هەبوون، هەموویان بەڵگە بوون لەسەر ئەوەی کە صالح پێغەمبەری خوایە ﷺو، نیشانەو بەڵگە بوون لەسەر ڕاستێتیی صالح، بۆیە خوا دەفەرموێ : ﴿ وَءَاتَيْنَٰهُمْ ءَايَٰتِنَا ﴾.

**مەسەلەی سێیەم : گەلی سەموود لە چیایان، خانووبەرەیان دادەتاشین، تاکو تێیاندا بێ ترس و هێمن بن :**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَكَانُوا۟ يَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا ءَامِنِينَ ﴾، (گەلی ئەوو ا عادەتیان وابوو لە چیایان خانووبەرەیان دادەتاشین، زۆر دڵنیایانە، یاخود بۆ ئەوەی تیایاندا هێمن و بێ ترس و بیم بن لە دوژمنانو، زەفەریان پێ نەبەن .

دەگوترێ : (نَحَتَ شَيئاً : قَشَرَهُ وَبَراهُ، نَحَتَهُ السَّفَرُ أنضاهُ وَأرَقَهُ، وَنُحِتَ فُلانٌ عَلَى الكَرمِ : طُبِعَ عَلَيهِ، وَنَحَتَ الجَبَلَ: قَطَعَ مِنهُ، وَالمِنحَاةُ: مَا يُنحَتُ بِهِ، كَالقَدُومِ، وَالجَمعُ مَناحِت) .

ئەمە لە فەرهەنگەکانی زماندا هاتوە .

(نَحَتَ شَيئاً): واتە: سپی کردو توێکڵی لێکردەوە، یاخود دایتاشی، دەگوترێ: نَحَتَهُ السَّفَرُ) واتە: کەسێ کە دەچێتە سەفەرێ، زۆر لە سەفەر دەبێو، دوایی باریک دەبێتەوەو لاواز دەبێ، هەروەها دەگوترێ: (نُحِتَ فُلانٌ عَلَى الكَرمِ، أي: طُبِعَ عَلَيهِ)، واتە: فلان کەس لەسەر سەخاوەت داتاشراوە، واتە: پەیکەری سەخاوەت و کەرەمە. (وَنَحَتَ الجَبَلَ)، واتە: لە چیایەکەی بڕی، (مِنحَاة)یش، ئەوەیە کە وەك تەشوێ، چۆن داری پێ دەتاشرێ (مِنحَاة)یش، شتێکە شتی پێ دەتاشرێ، کە بە (مَناحِيت) کۆدەبێتەوە .

**مەسەلەی چوارەم و کۆتایی : لە دەمەوبەیاندا هاڕژن چریکەیەکی گەورە گەلی حیجری گرت و، فەوتان و خانووەبەردینەکانیان چەپاڵەیان نەدان :**

خوا دەفەرموێ :

١/ ﴿ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ مُصْبِحِينَ ﴾: هاڕژن و چریکەو دەنگێکی گەورە بەرەو بەیان گرتنی .

٢/ ﴿ فَمَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴾، ئەوەی کە وەدەستیان دەهێنا، هیچ سوودی پێ نەگەیاندنن، یاخود: ئایا سوودێکی پێ گەیاندن، ئەوەی کە بەدەستیان دەهێنا؟ بێگومان هیچ، چونکە کە بەڵای خوا هات ﷻ بێگومان شوێنی خۆ تێگرتنو خۆ تێدا پەنادان، لە بەڵای خوا نیە .

# بەسەرهاتی صالح (علیه السلام) وگەلەکەی

بەڕێزان !

ئێمە لە شەش بڕگەدا بەسەرهاتی گەلی سەموود، کە صالح ﷺ پێغەمبەریان بووو، بە (أصحاب الحجر)یش ناسراون، دەتوێژینەوە .

بڕگەی یەکەم : ژمارەی ناوهێنرانی صالح لە قورئانێدا .

بڕگەی دووەم : پلنتایی تەرخانکراو بۆ بەسەرهاتی صالحو گەلەکەی (سەموود) لە قورئاندا .

بڕگەی سێیەم : ڕەچەڵەکی صالحو گەلەکەی (سەموود) .

بڕگەی چوارەم : کورتەی ژیانی صالح لەگەڵ گەلەکەیدا .

بڕگەی پێنجەم : موعجیزەی صالح بۆ گەلەکەی .

بڕگەی شەشەم : هۆکارو چۆنیەتی فەوتانی گەلی سەموود .

بڕگەی حەوتەم : دوو فەرموودەی پێغەمبەری خوا لە بارەی شوێنەواری گەلی ثەموودەوە .

**بڕگەی یەکەم : ژمارەی ناوهێنرانی صالح لە قورئاندا :**

پێغەمبەر صالح ﷺ سەرجەم نۆ (٩) جاران ناوی لە قورئاندا هاتوە :

١/ لە سووڕەتی (الأعراف)دا لە ئایەتەکانی: (٧٣و ٧٥و ٧٧)دا، سێ جار .

٢/ لە سووڕەتی (هود)دا لە ئایەتەکانی: (٦١و ٦٢و ٦٦و ٨٩)دا، چوار جار .

٣/ لە سووڕەتی (الشعراء)دا، لە ئایەتی (١٤٢)دا، یەك جار .

٤/ لە سووڕەتی (النَّمْل)دا، لە ئایەتی (٤٥)دا، یەك جار .

کۆی گشتیو هەمووی دەکاتە نۆ (٩) جار .

**بڕگەی دووەم: پانتایی تەرخانکراو بۆ بەسەرهاتی (صالیح)و گەلەکەی ثەموود، لە قورئاندا :**

١/ لە سووڕەتی (الأعراف)دا، ئایەتەکانی: (٧٣ – ٧٩)ی گرتۆتەوە، کە حەوت (٧) ئایەتن .

٢/ لە سووڕەتی (هود)دا، ئایەتەکانی: (٦١ – ٦٨) بۆ بەسەرهاتی صالحو گەلەکەی تەرخانکراون، واتە: هەشت (٨) ئایەت.

٣/ لە سووڕەتی (الحِجر)دا، ئایەتەکانی: (٨٠ – ٨٤)، واتە: پێنج (٥) ئایەت .

٤/ لە سووڕەتی (الشُعَراء)دا، ئایەتەکانی: (١٤١ – ١٥٩) واتە: نۆزدە (١٩) ئایەتی بۆ تەرخانکراون .

٥/ لە سووڕەتی (النمل)دا، ئایەتەکانی: (٤٥ – ٥٣) واتە: نۆ (٩) ئایەتی بۆ تەرخانکراون .

٦/ لە سووڕەتی (فُصِّلَت)دا، ئایەتەکانی: (١٧ و ١٨) واتە: دوو ئایەتی بۆ تەرخانکراون .

٧/ لە سوورەتی (الذّاريات)دا، ئایەتەکانی: (٤٣ و ٤٤ و ٤٥) واتە: سێ ئایەتی بۆ تەرخانکراون .

٨/ لە سوورەتی (النّجم)دا، هەردوو ئایەتی: (٥٠ و ٥١) واتە: دوو ئایەتی بۆ تەرخانکراون .

٩/ لە سوورەتی (القمَر)دا، ئایەتەکانی: (٢٣ - ٣٢) واتە: دە (١٠) ئایەتی بۆ تەرخانکراون .

١٠/ لە سوورەتی (الحاقّة)دا، ئایەتەکانی : (٤ و٥) واتە: دوو ئایەتی بۆ تەرخانکراون .

١١/ سوورەتی (الشّمس)دا، ئایەتەکانی: (١١ - ١٥)، واتە: پێنج (٥) ئایەتی بۆ تەرخانکراون .

کۆی ئایەتەکانی کە لە قورئانی بەرزو بەڕێزدا، بۆ گێڕانەوەی بەسەرهاتی صالح ﷺ و گەلەکەی سەموود تەرخانکراون: حەفتاو سێ (٧٣) ئایەتن .

## بڕگەی سێیەم : ڕەچەڵەکی صالح و گەلەکەی ثەموود :

(إبنُ كثير) لە (قِصَصُ الأَنْبِياء)ی خۆیدا[1]، هەروەها لە تەفسیرەکەی خۆشیدا، کورتەکەی: (المصباحُ المُنير في تهذيب تفسير إبن كثير)[2]، بەم شێوەیە ڕەچەڵەکی گەلی سەموودو صالحی پێغەمبەریشیان دەخاتە ڕوو، دەڵێ :

ثَمُود: وَهُم قَبِيلَة مَشهُورَةٌ، يُقَالُ لَهُم: ثَمُود باسمِ جَدِّهِم: ثَمُودُ أَخِ جَدِيس وَهُمَا ابْنَا حَاثِر بنِ إِرَم بنِ سَام بنِ نُوح، وَكَانُو عَرَباً مِنَ العَارِبة، قَبلَ إبراهيمِ الخَلِيل عَلَيهِ السَّلام، يَسكُنُونَ الحجرَ الّذي بَينَ الحجَازِ وَتَبُوك، وَصالِحُ بنُ عُبَيد بنُ مَاسِح بنُ عُبَيد بنِ حَادِر بنِ ثَمُود بنِ حَاثِر بنِ إِرَم بنِ نُوح).

---

١) ص١٠٧.

٢) ص٤٨٥.

واتە: سەموود هۆزێکی ناسراون، پێیان گوتراوە سەموود، بە ناوی باپیرەیان، سەموود کە برای جەدیس بووە، ئەوانیش (واتە: سەموودو جەدیس)، هەردووکیان کوڕی حاثیر بوون، ئەویش کوڕی ئیرەم، ئەویش کوڕی سام، ئەویش کوڕی نووح بووە، (صەلاتو سەلامی خوا لەسەر نووح)، ئەوانە هۆزێکی عەرەب بوون لە عەرەبی عاریبە، واتە: (لەو عەرەبیانەی کە لە ئەسڵدا عەرەب بوون)، پێش ئیبراهیمی خەلیل ﷺ لە حیجردا نیشتەجێ بوون، ئەو شوێنەی دەکەوێتە نێوان حیجازو تەبووکەوە .

ئەوە بە نسبەت گەلی سەموودو ڕەچەڵەکیانەوە .

بە نسبەت (صالح)ەوە دیسان (ابنُ كثير) دەڵێ: صالح کوڕی عوبەیدە، ئەویش کوڕی ماسیحە، ئەویش کوڕی عوبەیدە، ئەویش کوڕی حادیرە، ئەویش کوڕی سەموودە، ئەویش کوڕی حاثیرە ئەویش کوڕی ئیرەمە، ئەویش کوڕی (نووح)ە .

منیش دەڵێم: بێگومان هیچ شتێکی جێی دڵنیایی لەوبارەوە نیە، بەلام دیارە مێژوونووسان کە هێناویانە، یان لە شوێنەوارە مێژوییەکان کە ماونەوە، یاخود لە قسەی دەماودەم کە گێڕدراونەوە، یاخود لە کتێبەکانی خاوەن کتێبان، بە تایبەتی جوولەکەو نەصرانییەکان، سوودیان بینیوە، بۆیە جێی لێ دڵنیا بوونو پشت پێبەستن نیە، بەلام وەك بەرچاوڕوونییەك دەگونجێ سوودیان لێ ببینین، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: {وَحَدِّثُوا عَن بَنِي إِسرَائِيلَ وَلا حَرَج}، {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: ٦٤٨٦، وَالبُخَارِي: ٣٣٧٤}، واتە: لە بەنی ئیسرائیلەوە شت بگێڕنەوەو سەغڵەتییتان لەسەر نیە، واتە: ئەو شتانەی کە لەگەڵ قورئاندا تێکناگیرێنو، لەگەڵ عەقڵو واقیع دا تێکناگیرێن، وەك بەرچاوڕوونیی، دەگونجێ، وەك سەرچاوەیەکی مێژوویی سوود لە کتێبەکانیان، وەربگیرێ .

بەلام بێگومان لە ڕووی کاتی مێژووی ژیانیانەوە، مادام خوا ﷻ بە زۆریی لەگەڵ گەلی عاددا کە هوود پێغەمبەریان بووە، باسی کردوون، وا دیارە پاش گەلی عاد بوون، ئەوەش لە قورئاندا بە ڕوونیی هاتووە، وەك لە سووڕەتی (الأعراف)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَـٰلِحًا ۝٧٣﴾الأعراف، واتە: بۆ لای گەلی سەموود صالحی برایانمان ڕەوانەکرد، دوایی لە ئایەتی (٧٤)ی سووڕەتی

(الأعراف)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ عَادٍ ... ﴿٧٤﴾ ﴾ الأعراف، واتە: یاد بکەنەوە! کە خوا ئێوەی کردۆتە جێنشین لە دوای گەلی عاد .

کەواتە: بە دڵنیایی گەلی سەموود لە دوای گەلی عادەوە هاتوون، واپێدەچێ ماوەیەکی کاتیی درێژیان لە بەیندا نەبووبێ .

**برگەی چوارەم: کورتەی ژیانی ساڵح لەگەڵ گەلەکەی (ثەموود)دا.**

ئێمە لە حەوت (٧) خاڵ دا بەسەرهاتی ساڵح لەگەڵ گەلەکەیدا، دەخەینە ڕوو :

١) گەلی سەموود لە پێدەشتەکان کۆشک، لە چیایەکان خانووبەرەی لە بەرد داتاشراویان هەبوون، خاوەنی باغ و بێستان و کشتوکاڵ و ژیان و گوزەرانێکی زۆر خۆش بوون، ئەمە لە کوێ دەزانین؟ خوا ﷻ لە سوورەتی (الأعراف)دا، لە سوورەتی (الشُعَراء)دا، لە شوێنەکانی دیکەشدا، ئاماژەی پێ دەدا، بۆ وێنە :

أ - لە سوورەتی (الأعراف)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ ٱلْجِبَالَ بُيُوتًا ۖ فَٱذْكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْاْ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٧٤﴾ ﴾، ساڵح ؈ ئاوا گەلەکەی خۆی (ثەموود) دەدوێنێ، دەڵێ: یاد بکەنەوە! کە خوا ئێوەی لە دوای گەلی عاد کردۆتە جێنشین، لە پێدەشتەکان دا کۆشکان بنیات دەنێن و، لە چیایەکانیش دا خانووبەرە دادەتاشن، چاکەکانی خوا بەسەر خۆتانەوە یادبکەنەوەو، لە زەویدا خراپەکاریی مەکەن .

ب - لە سوورەتی (الشُعَراء)دا، ئاوا ساڵح ؈ گەلەکەی خۆی سەموود دەدوێنێ: ﴿ أَتُتْرَكُونَ فِى مَا هَٰهُنَآ ءَامِنِينَ ﴿١٤٦﴾ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴿١٤٨﴾ وَتَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا فَٰرِهِينَ ﴿١٤٩﴾ ﴾، پێیان دەفەرموێ : ئایا ئێوە وازتان لێ دەهێنرێ، لێرەدا ئاوا بە هێمنیی و ئارامیی بژین، (بەبێ ئەوەی کە حیساب بۆ خواو بۆ دوارۆژ بکەن؟) لەنێو چەندان باغ و کانیی و سەرچاوەدا،

هەروەها لە نێو کشتوکاڵو درەختی خورمادا، کە بەرەکەی زۆر گەیو خۆشەو، (بە لێوان دەخورێ)، لە چیایان خانووبەران دادەتاشن زۆر بە خۆشگوزەرانانە

ئەگەر پێتان وابووبێ، وازتان لێ دەهێنرێو دنیا شاری بێ خاوەنە، ئەوە خەیاڵ پلاوتان کردوە ؟

٢) صاڵحیش ﷺ وەك سەرجەم پێغەمبەرانی خوا، لە خوا بەیەکگرتن (توحید)ەوە، دەستی بە دواندنی گەلەکەی کردوە، وەك لە سووڕەتی (الأعراف)دا، دەفەرموێ :

﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًاۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ﴿٧٣﴾ ﴾،

واتە: هەروەها بۆ لای گەلی سەموود صاڵحی برایانمان ڕەوانە کرد، گوتی: ئەی گەلەکەم! خوا بپەرستن جگە لەو پەرستراوێکی دیکەتان نیە .

لە سووڕەتی (هود)یش دا، هەر هەمان شت دووبارە بۆتەوە، دەفەرموێ:

﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًاۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ﴿٦١﴾ ﴾هود،

بە هەمان دەق دووبارە بۆتەوە .

ئنجا صاڵح ﷺ کە خۆی بە گەلەکەی دەناسێنێو، بەرنامەو ئامانجی خۆیان بۆ ڕوون دەکاتەوە، وەك لە سووڕەتی (الشُعَراء) ئایەتەکانی: (١٤١ - ١٤٥) لەو (پێنج) ئایەتەدا، هاتوە دەفەرموێ : ﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٤١﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٤٢﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٤٣﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٤٤﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٤٥﴾ ﴾الشعراء.

واتە: گەلی سەموود پێغەمبەرانیان بەدرۆ دانا (پێشتر باسمانکردوە کە ئەوان یەك پێغەمبەر بە درۆ داناوە، بەڵام خوا ﷻ دەفەرموێ: پێغەمبەرانیان بە درۆ دانان، لەبەرئەوەی پێغەمبەران هەموویان یەك پەیامو بەرنامەیان پێبووە لە نێوەڕۆکیداو، لە هێڵە گشتییەکانیدا)، کاتێك کە صاڵحی برایان پێی گوتن: ئایا پارێز ناکەن؟ من بۆ ئێوە ڕەوانەکراوێکی ئەمیندارم، پارێز لە خوا بکەنو فەرمانبەریی من بکەنو، من هیچ پاداشتتان لێ داوا ناکەم، پاداشتی من تەنها لەسەر پەروەردگاری جیهانییانە .

٣) گەلی سەموود بتپەرست بوون، هەر بۆیەش دوای ئەوەی کە صالح بانگی کردن بۆ خوا پەرستییو، دەست هەڵگرتن لە بتپەرستیی، تووڕە بوونو دەماریان گیراوەو، زۆر لە صالح قەڵسو لالووت بوونو، بەینیان لەگەڵیدا تێکچووە. ئەوەش لە سوورەتی (هود)دا ، زۆر بە ڕوونیی دیارە خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالُواْ يَٰصَٰلِحُ قَدْ كُنتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَٰذَآ أَتَنْهَىٰنَآ أَن نَّعْبُدَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا وَإِنَّنَا لَفِى شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٦٢﴾ ﴾، واتە: گوتیان: ئەی صالح! ئایا لێمان قەدەغەدەکەی: ئەوە بپەرستین، کە بابو باپیرانمان پەرستوویانە؟ بێگومان ئێمە لە دوو دڵییدایـن، بەرانبەر بەوەی کە تۆ ئێمەی بۆ بانگ دەکەی .

٤) سەرەنجام کۆمەڵگای صالح دەبن بە دوو بەش :

ا/ بەشی یەکەمیان : خۆ بەزلگرە خۆشگوزەرانە زێدەڕۆییکارەکان، کە پێی بێبڕوا دەبن .

ب/ بەشی دووەمیان: ڕەشو ڕووتو چەوسێنراوەکان، کە زۆربەیان بڕوای پێدێنن .

ئەمەش لە سوورەتی (النَّمل) لە ئایەتی (٤٥)دا، زۆر بە ڕوونو ڕاشکاویی خراوەتە ڕوو، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا أَنِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ فَإِذَا هُمْ فَرِيقَانِ يَخْتَصِمُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾النمل، واتە: بە دڵنیاییی بۆ لای گەلی سەموود، صالحی برایانمان ڕەوانە کرد، پێی گوتن: خوا بپەرستن، کەچی ئەوان بوونە دوو کۆمەڵی پێکەوە ناکۆك، واتە: بوونە دوو دەستە :

یەکەم : دەستەیەکیان (لایەکیان) بێبڕوا بوون، کە زلەزلەکانو قسە ڕۆیشتووەکانو بڕیار بەدەستەکانو خۆشگوزەرانەکان بوون، ئەوان پێی بێبڕوا بوون، چونکە ئەگەر بە دوای صالح بکەون، ئەو بەزمو بازاڕەی کە لەسەر حیسابی خەڵکی ڕەشو ڕووتو بە زوڵمو ستەمو بە گەندەڵیی پێکیان وەناوە، لێیان تێکدەچێ .

دووەم : بەشی دووەمیش خەڵکە ڕەش و ڕووت و چەوسێنراوەکان بوون، ئەوانەی ئازادیی خۆیان و مافەکانی خۆیان، لە بەرنامەکەی صاڵحدا بینیوەتەوە، چونکە هەمیشە بەرنامەکانی خوا ، لە قازانجی خەڵکی چەوساوەو بێدەسەڵاتن، مافەکانیان بۆ دەستێننەوەو بۆ دابین دەکەن، ئەوەش بە زیانی زۆرداران و ملهوڕان تەواو دەبێ، ئەمەش لە سووڕەتی (الأعراف) هەردوو ئایەتی: (٧٥ و ٧٦)یش دا، هاتوە، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِمَنْ ءَامَنَ مِنْهُمْ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَٰلِحًا مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ قَالُوٓا۟ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلَ بِهِۦ مُؤْمِنُونَ ﴿٧٥﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا بِٱلَّذِىٓ ءَامَنتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٧٦﴾ ﴾، واتە: بڕیار بەدەستە خۆ بەزلگرەکانی گەلەکەی، بەوانەی کە چەوسێنرابوونەوەو بڕوایان هێنابوو (لە خەڵکەکە، لە جەماوەرەکە)، پێیان گوتن: ئایا دەزانن کە صاڵح لەلایەن پەروەردگاریەوە ڕەوانکراوە؟ (واتە: قەناعەتتان وایە، بڕواتان وایە؟) بڕوادارەکان گوتیان: ئێمە ئەوەی کە صاڵح پێی ڕەوانکراوە، پێی بڕواداریـن، خۆ بەزلگرەکان (ئەوانەی خۆیان لە بەرانبەر خواو خەڵکدا بەزلگرتبوو) گوتیان: ئەوەی ئێوە بڕواتان پێی هێناوە، ئێمە پێی بێبڕواین .

٥) هەروەها خۆ بەزلگرە خۆشگوزەرانەکانی گەلەکەی، ئەوە دەکەنە بیانووی بڕوا نەهێنانیان: کە صاڵح کە بەشەرێکە وەك وان، ئەدی چۆن لە نێویاندا وەحیی بۆ نێردراوەو کراوەتە پێغەمبەر ﷺ!؟ کە وەك زۆرجار باسمان کردوە، ئەوە بیانووی سەرەکیی زۆربەی گەلانی کافر بووە، ئەوان هەمیشە لە هەمبانەی خۆیاندا گوێزیان ژماردوە، خۆیان پێ لەوە نەوەشاتەوە: خوا بیانکاتە نوێنەر، خوا بیاندوێنێ، پێشیان وابووە کە پێغەمبەرانیش هەر وەك ئەوانن، بە زۆریی ئینسان خۆی چۆن بێ، خەڵکیش هەروا دەبینێ، خۆی خراپ بێ، پێی وایە خەڵك خراپە، ئەگەر خۆیشی چاك بێ، خەڵکی بە چاك دەبینێ، زۆرجار وایە: مرۆڤ خەڵك قیاس دەکاتە سەر نەفسی خۆی !

ئەمەش لە سوورەتی (القَمَر)دا خراوەتە ڕوو، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِٱلنُّذُرِ ﴿٢٣﴾ فَقَالُوٓاْ أَبَشَرًا مِّنَّا وَٰحِدًا نَّتَّبِعُهُۥٓ إِنَّآ إِذًا لَّفِى ضَلَٰلٍ وَسُعُرٍ ﴿٢٤﴾ أَءُلْقِىَ ٱلذِّكْرُ عَلَيْهِ مِنۢ بَيْنِنَا بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ ﴿٢٥﴾ سَيَعْلَمُونَ غَدًا مَّنِ ٱلْكَذَّابُ ٱلْأَشِرُ ﴿٢٦﴾ ﴾. واتە: گەلی سەموود بە ئاگادارکەرەوەکان، بە ترسێنەرەکان، بێبڕوابوون، بە درۆیان دانان {هەڵبەتە ئەوان یەك ترسێنەر (نَذِیر)یان بۆ هاتوە کە صالحە، بەڵام کە (صالح)یان بە درۆ داناوە، کە هاتوە بۆ وریاکردنەوەو ترساندنیان، وەك هەموو پێغەمبەرانیان بە درۆ دانابێ}، گوتیان: ئایا بە دوای یەك مرۆڤ لە خۆمان بکەوین؟ کەواتە: ئێمە لە گومڕایی داین و لە شێتیی داین، ئایا لە نێو ئێمەدا بیرخەرەوە (ذِکر) بۆ وی نێردراوە؟ (واتە: وەحیی و پەیامی خواو کتێبی خوا، کە بیرخەرەوەیە، بۆ وی نێردراوە لە نێو هەمووماندا؟) بەڵکو ئەو زۆر درۆزنەو زۆریش خۆ بەزلگرە، (دەیەوێ خۆیمان بەسەردا فەرز بکات و هەڵکێشێ بۆیە، دەڵێ: خوا پەیامی بۆ ناردووم)، بەیانی دەزانن کێ : زۆر بە درۆدانەری خۆ پێ زۆری لەخۆباییە!

٦) هەروەها زلەزلانی گەلەکەی، صالح تۆمەتبار دەکەن بەوەی کە مایەی نەگبەتیی و بێخێرییانەو، تۆمەتباریشی دەکەن بە شێتیی و، بە جادوولێکراویی، وەك خوا لە سوورەتی (النمل)دا ، لەسەر زمانی گەلە کافرەکەی، دەفەرموێ : ﴿ قَالُواْ ٱطَّيَّرْنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَ ۚ قَالَ طَٰٓئِرُكُمْ عِندَ ٱللَّهِ ۖ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تُفْتَنُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾، واتە: گوتیان: ئێمە بەهۆی تۆو ئەوانەوە کە لەگەڵتن، نەگبەتیی و بێخێرییمان تووش بوو، (صالحیش ﷺ) گوتی: نەگبەتییەکەتان لەلای خوایە، (واتە: ئەگەر بێخێریی و نەگبەتییتان بۆ هاتبێ، ئەوە بە بڕیاری خوایە)، بەڵکو ئێوە کۆمەڵێکن ، کە هەڵدەخەڵەتێنرێن و ، سزا دەدرێن .

یانی : هەڵدەخەڵەتێنرێن لە لایەن شەیتانەوەو، سزا دەدرێن لە ئەنجامی بێبڕواییتاندا .

لە سوورەتی (الشعراء)یشدا گەلی سەموود دەڵێن: ﴿ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴿١٥٣﴾ مَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا ﴿١٥٤﴾ ﴾، واتە: گوتیان: بێگومان تۆ لە جادوولێکراوانی، تۆش تەنیا مرۆڤێکی وەك ئێمەی .

(مسَحَّر) واتە: جادوولێکراو، بەزۆرییش وایە کە کەسێك جادووی لێبکرێ، تێکدەچێو شێت دەبێ، بۆیە دەگونجێ بڵێین: جادووت لێکراوەو تێکچووی، واتە: شێت بووی .

٧) (صالح)یش ﷺ ئامۆژگارییان دەکات: کە داوای لێبووردن لە خوا بکەن، هەروەها هۆشدارییان دەداتێ، کە نەکەونە شوێن فەرمانی خۆشگوزەرانە زێدەڕۆییکارە تێکدەرەکان .

وەك لە سوورەتی (النمل)دا دەفەرموێ : ﴿ قَالَ يَـٰقَوْمِ لِمَ تَسْتَعْجِلُونَ بِٱلسَّيِّئَةِ قَبْلَ ٱلْحَسَنَةِ ۖ لَوْلَا تَسْتَغْفِرُونَ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٤٦﴾ ﴾، واتە: صالح ﷺ گوتی، ئەی گەلەکەم! بۆچی پەلە دەکەن خراپەتان بۆ بێ، پێش چاکە؟ واتە: لە جیاتی ئەوەی بڕوابێنن‌و بەهۆی بڕواوە، خوا بەرەکەت‌و پێزتان بەسەردا بڕێژێ، بەرەکەت‌و پێزی مادیی‌و مەعنەویی، بۆچی پەلە دەکەن بەوەی کە بەڵای خراپتان بەسەر بێ، بەهۆی کوفرو بێ بڕواییتانەوە؟ ﴿ لَوْلَا تَسْتَغْفِرُونَ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٤٦﴾ ﴾النمل، دەبووایە داوای لێبووردن لە خوا بکەن ، بەڵکو بەزەییتان لەگەڵدا بنوێنرێ .

هەروەها لە سوورەتی (الشُعَراء)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُطِيعُوٓاْ أَمْرَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿١٥٢﴾ ﴾، (صالح پێی فەرموون:) فەرمانبەریی زێدەڕۆییکاران مەکەن، ئەوانەی تێکدان لە زەوییدا دەکەن‌و، چاکسازیی ناکەن .

بە دوای ئەوانە مەکەون، کە هەمیشە خەریکی تێکدانن، خەریکی خراپەکارییەن، چونکە کەسێك ئامانجی خراپی هەبێت ، بە ئامرازی خراپیش

بۆی تەحقیق دەبێ، هەروەك كەسێك ئامانجی باشی هەبێت، خەفتانی ئامرازو رێبازی باشی بۆ دەكات، هەمیشە ئامانجە باشو شەرعییەكان ، پەكیان لەسەر ئامرازو هۆكارە شەرعییو باشەكان كەوتوە بە پێچەوانەشەوە هەر راستە: كەسێك ئامانجێكی ناشەرعییو خراپی هەبێت، بۆی لە ئامرازو شێوازو رێبازی ناشەرعییو خراپیش دەخەفتێ .

## برگەی پێنجەم : موعجیزەی صالح ﷺ بۆ گەلەكەی :

دوای ئەوەی صالح ﷺ، بەو شێوەیەی گوتمان: لەگەڵ گەلەكەیدا رووبەڕوو دەبێتەوە، زۆر دڵسۆزانە، زۆر بە بەزەییانە، زۆر ئەمینداران‌ە: پەیامی خوایان پێ رادەگەیەنێو ئامۆژگارییان دەكاتو، هۆشدارییان دەداتێو، دڵخۆشیان دەكات بە پاداشتی خواو، دەیانترسێنێ لە سزای خواو، بۆیان رووندەكاتەوە كە ئێوە خوا بەهرەمەندی كردوون لە زۆر نازو نیعمەت، بەڵام بێگومان ئێوە وەك هەموو مرۆڤەكانی دیكە ، بۆ تاقیكردنەوە دروستكراون، دەبێ بزانن كە ئەم ژیانە دنیاییە شوێنی تێدا تاقیكرانەوەیە، نەك شوێنی تێدا حەسانەوە، ئاگادارییان دەكاتەوە، بەڵام ئەوان ئایەنە ژێربارو ، سەرەنجام گەلی سەموود داوا لە صالح دەكەن ﷺ بەڵگەیەكیان بۆ بێنێ، وەك خوا لە سوورەتی (الشعراء)دا، باس دەكات، گوتوویانە: ﴿ مَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا فَأْتِ بِـَٔايَةٍ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿١٥٤﴾ ﴾ واتە: تۆش هەر مرۆڤێكی وەك ئێمەی ، نیشانەیەكمان بۆ بێنە، موعجیزەیەكمان بۆ بێنە، ئەگەر لە راستانی !

بێگومان پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، ئەگەر موعجیزەو بەڵگەشیان بۆ خەڵك نەهێنابایە، هەر رواڵەتی حاڵی خۆیانو، پەیامو بەرنامە بەرەكەتدارو بەختەوەركەرەكەیان بۆ دنیاو دوارۆژو، رەوشتو ئاكاری بەرزو پەسندییانو، مەعدەنی چاكیانو، عەقڵو دڵی پاكو بێگەردیان، هەمووی بەڵگە بووە لەسەر ئەوە، كە ئەوەی دەیڵێن راستەو، لە بەرژەوەندیی خەڵكە .

بەڵام خوا ﷻ هیچ پێغەمبەرێكیشی بەبێ موعجیزەو بەڵگە رەوان نەكردوە، بۆیە ئەوان كە دەڵێن: ئەگەر تۆ لە راستانی نیشانەیەكمان بۆ بێنە، موعجیزەیەكمان بۆ بێنە، خوای میهرەبانو كاربەجێ ﷻ حوشترێكی تایبەت بە

صاڵح دەدات، وەك بەڵگەو موعجیزەیەكی ڕاستی پێغەمبەرایەتییەكەی‌و، هەر لە سەرەتاوەش خوا ﷻ لەسەر زمانی صاڵح، گەلی سەموود ئاگادار دەكاتەوە، كە ئەگەر زیان بەو حوشترە بگەیەنن، تووشی سزاو جەزرەبەی خوا دەبن، وەك لە سوورەتی (الشعراء)دا دەفەرمووێ : ﴿ قَالَ هَٰذِهِۦ نَاقَةٌ لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿١٥٥﴾ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥٦﴾ ﴾، واتە: (صالح عليه السلام)، گوتی: ئەمە حوشترێكە ئەو نۆرە ئاوێكی هەیەو، ئێوەش نۆرە ئاوێكتان هەیە، {دیارە كانیی‌و سەرچاوەیەكیان هەبووە، یانی: با ڕۆژێك حوشترەكە لێی بخواتەوەو خۆشتان ڕۆژێك، لە كانیی‌و سەرچاوەیە ئاو هەڵبهێنجن} و بە خراپە دەستی بۆ مەبەن، ئەگەرنا ئازاری ڕۆژێكی مەزن دەتانگرێ .

هەڵبەتە ئەم وردەكارییە نەهاتووە بەڵام زانایان دەڵێن: كە صاڵح گوتوویەتی: ڕۆژێك نۆرەی ئێوە بێت‌و ڕۆژێكیش نۆرەی ئەو بێت، ئاو بخواتەوە، ئەو ڕۆژە كە نۆرەی حوشترەكە بووە، ئەوانیش شیریان لێ دۆشیوەو، ئەو ڕۆژەش كە نۆرەی خۆیان بووە، ئاویان لە بیرەكە یان كانییەكە هەڵهێنجاوە، یانی: ئەوان ڕۆژێك ئاویان هەبووەو، ڕۆژێكیش شیری حوشترەكەیان هەبووە، دەبێ حوشترێكی زۆر گەورە بووبێ‌و، بەشی هەموو خەڵكی ئەو ئاوەدانییە ، شیری تێدابووە .

لە سوورەتی (هود)دا دەفەرمووێ : ﴿ وَيَٰقَوْمِ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِىٓ أَرْضِ ٱللَّهِ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ قَرِيبٌ ﴿٦٤﴾ ﴾، واتە: {(صالح عليه السلام) گوتی:} ئەی گەلەكەم! ئەمە حوشتری خوایە، بۆ ئێوە نیشانەیە، لێیگەڕێن با لەسەر زەمینی خوا بلەوەڕێ‌و، بە خراپە دەستی بۆ مەبەن، ئەگەرنا سزایەكی نزیكتان تووش دێ‌و دەتانگرێ .

لە سوورەتی (الأعراف)دا، هەر لەوبارەوە خوا دەفەرمووێ : ﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا ۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً ۖ فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِىٓ أَرْضِ ٱللَّهِ ۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ ﴾، واتە: بۆ لای گەلی سەموود صاڵحی برایانمان نارد،

(کە دەفەرموێ: صالحی برایان، واتە: لە ڕووی ڕەچەڵەك و نەسەبەوە برایان بووە، با لە ئیمان و عەقیدەشدا لێیان جیا بووبێ)، گوتی: ئەی گەلەکەم! خوا بپەرستن . جگە لەو پەرستراوێکی دیکەی بە هەقتان نیە، لە پەروەردگارتانەوە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکراتان بۆ هاتوە، ئەمە حوشتری خوایە بۆ ئێوە نیشانەو موعجیزەیە، (بەڵگەو نیشانەیە کە : من ڕاست دەکەم پێغەمبەری خوام)، لێیگەڕێن با لەسەر زەوی خوا بخواو بلەوەڕێ و، بە خراپە دەستی بۆ مەبەن .

بۆیە دەفەرموێ : ﴿وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ﴾، چونکە کە شیریان لێدۆشیوە، دەبووایە دەست بگەیەننە گوانی، ئەگەرنا لەوەڕی لەسەر وان نەبووە، هیچی لەسەر وان نەبووە، لە ئاوی وانیشی نەخواردۆتەوە ، ئاوی کانییەکەش کە خوا خوڵقاندوویەتی، هەر خۆشیان شیری لێدەدۆشن . واتە: ئەگەر بە چاکەو لە ڕووی بەهرە لێوەرگرتنەوە، دەستی بگەیەننێ، کە بریتیە لە دۆشینی، قەیناکا، بەڵام بە خراپە دەستی لێمەدەن، ئەگەر نا ، ئازارێکی بە ئێش دەتانگرێ .

لەبارەی ئەو ئازارەشەوە :

أ/ لە جێیەك دەفەرموێ : ﴿عَذَابُ يَوۡمٍ عَظِيمٍ ١٥٦﴾الشعراء، ئازاری ڕۆژێکی مەزن .

ب- لە شوێنێکی دیکە دەفەرموێ : ﴿عَذَابٌ قَرِيبٌ ٦٤﴾ هود، سزایەکی نزیك .

ج- لێرەش دەفەرموێ : ﴿عَذَابٌ أَلِيمٌ ٧٣﴾الأعراف، ئازارێکی بە ئێش .

کە بێگومان ئەوانە هیچیان تێکگیرانیان تێدانیە، چونکە :

<u>یەکەم</u> : ئازارەکە هەم ڕۆژێکی مەزن بووە بۆ گەلی سەموود، کە هاڕژن و چریکەیەکی گەورە گرتوونی و هەموویان لەبەین چوون، یاخود بڵێسەیەکی ئاگر لە ئاسمانەوە هاتوەو هەموویان فەوتاون، یان بۆتە بومەلەرزەو بۆتە حاڵەتێك کە کەسیان نەماوە .

<u>دووەم</u> : هەم ئازارەکە سزایەکی نزیك بووە .

<u>سێیەم</u> : هەم بە ئێشیش بووە .

بەڵام با سەرنجی ئەو قسەیەی (إبنُ كَثِير) بدەین، کە لە تەفسیرەکەیدا هاتووە، لە پوختەکەیدا بە ناوی: (المصباح المُنير في تَهذيب التَّفسير إبن كَثير)[1]: {سَأَلُوا صَالِحاً أَنْ يأْتِيَهُمْ بآيةٍ، وَاقْتَرَحُوا عَلَيْهِ بأَنْ تَخْرُجَ لَهُمْ مِنْ صَخْرَةٍ صَمَّاء عَيَّنوها بأنفسهم، وهي صخرة منفردة في ناحية الحِجْر، يقال لها: الكاتبة، فطلبوا منه: أن يخرج لهم منها ناقة عُشَراء تَمْخَضُ، فأخذ عليهم صالح العهود والمواثيق، لَئِنْ أَجَابَهُم الله إلى سُؤَالِهم ، وَأَجَابَهُم إلى طَلْبَتِهم ، لَيُؤمِنُنَّ به وليَتَّبِعُنَّه؟ فَلَمَّا أَعْطوهُ عَلَى ذَلِكَ عُهودهُم وَمَوَاثِيقَهُمْ، قَامَ صَالِح، عَلَيْهِ السَّلام، إلى صَلاتِهِ وَدَعَا الله، فَتَحَرَّكَت تِلْكَ الصَّخْرَة، ثُمَّ انْصدعَت عَنْ نَاقة جَوْفَاء وبراء، يَتَحَرَّكُ جَنِينُها بَيْنَ جَنبيها، كما سألوا، فعِنْدَ ذَلِكَ آمَنَ رَئِيس القَوْمِ وَهُوَ: (جُنْدع بْنُ عَمْرٍو) وَمَنْ كَانَ مَعَهُ عَلَى أَمْرِهِ ، وَأَرَادَ بَقِيَة أَشْرَافِ ثَمود أَنْ يُؤْمِنُوا فَصَدَّهُم (ذُؤَاب بْنُ عَمْرٍو بن لبيد)، والحباب صاحب أوثانهم}.

واتە: داوایان لە صاڵح کرد کە نیشانەیەکیان بۆ بێنێ، بۆشیان پێشنیار کرد کە تاتە بەردێکی گەورە، (لەتکە چیایەك لەوێ بوو، کە خۆیان دیاریانکرد)، ئەو لەتکە چیایەش لە پەرگەیەکی ناوچەی حیجر بوو، کە ئەو بەردە زلە، یاخود ئەو لەتکە چیایە پێی دەگوترا: (الكاتبة) داوایان لێکرد کە لەو بەردە، حوشترێك بێتە دەرێ، ئاوسبێ، لە کاتی ژان لێهاتن دابێ‌و بەچکەی ببێ، بەو شێوەیە، صاڵح ﷺ، پەیمان‌و بەڵێنی پتەوی لێوەرگرتن، ئەگەر خوا ئەو داواکارییەی بۆ جێبەجێ کردن‌و، ئەوەی کە داوایان کردوە، هێنایە دی، دەبێ بڕوای پێبێنن‌و شوێنی بکەون، ئەوانیش بەڵێن‌و پەیمانی پتەویان پێدا .

ئنجا صاڵح ﷺ، هەڵسا بۆ نوێژکردن‌و لە خوا پاڕایەوە، ئیدی هەر ئەوەندەی زانی : ئەو لەتکە چیایە جووڵاو دوایی شەقی بردو، حوشترێکی ساغ‌و سەلیم کە بەچکەکەی لە نێو دوو تەنیشتەکانی دا دەهات‌و دەچوو، (واتە: خەریکی ئەوە بوو : بزێ)، بەو شێوەیە کە داوایان کردبوو، حوشترێکی ئاوا لەو لەتکە چیایە هاتەدەر، لەو کاتەدا سەرۆکی خەڵکی سەموود کە ناوی (جُندَع بن عمرو) بووو، هەموو ئەوانەی شوێنی دەکەوتن، بڕوایان پێهێناو، زۆربەی ڕیش سپییەکانی

---

١) ص ٤٨٦ .

سەموودیش ویستیان بڕوابێنن، بەڵام (ذُؤاب بن عمرو بن لبید)و (الحباب) کە خاوەنی بتەکانیان بوو، ئەو دووانە ڕێیان لێگرتن .

(بۆیەش خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ فَإِذَا هُمْ فَرِيقَانِ يَخْتَصِمُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾النمل، سەرەنجام لە نێو خۆشیاندا بوونە دوو کۆمەڵی پێکەوە ناکۆك) .

هەڵبەتە ئەوەی (إِبنُ کَثِیر) هێناویەتی لە ڕێیەکی دڵنیاکەرەوەوە پێمان نەگەیشتووەو، لە تەفسیری سوورەتی (الأعراف)یشدا، لەوبارەوە شتێکمان باسکردووەو، هەندێك لە زانایان گوتویانە: ئەو حوشترە تەنیا حوشترێکی ئاسایی بووە، بۆ وێنە: (عبدالوهاب النجار) لە (قِصَصُ الأنبیاء)[1]دا، ئەو رایە دێنێ، بەڵام دوایی لیژنەیەك لە ئەزهەر کە قسەی ئەوانیش هەر دێنێ، بەرپەرچی دەدەنەوە .

منیش پێموایە: بە شێوەیەکی نائاسایی پەیدابوونی حوشترەکە، لە ئایەتەکاندا، زۆر بە ڕوونیی دەفامرێتەوەو ناگونجێ بڵێین: حوشترێك بووە وەك ئەو حوشترانەی دیکە، چونکە هەموو جارێ خوا دەفەرموێ: ئەو حوشترە نیشانەو بەڵگە بووە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الإسراء)دا، دەفەرموێ : ﴿ وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرْسِلَ بِٱلْءَايَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلْأَوَّلُونَ ۚ وَءَاتَيْنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبْصِرَةً فَظَلَمُوا۟ بِهَا ۚ وَمَا نُرْسِلُ بِٱلْءَايَٰتِ إِلَّا تَخْوِيفًا ﴿٥٩﴾ ﴾، واتە: هیچ شتێك ڕێگرمان نەبوو کە موعجیزان ، نیشانان بنێرین، مەگەر ئەوە کە پێشووەکان ئەو جۆرە موعجیزەو نیشانانەمان پێدان، بەڵام پێیان بێبڕوا بوون، ئنجا ئێمە حوشترێکمان دا بە گەلی سەموود، کە موعجیزەیەکی زۆر ڕوون بوو، (دەیانتوانی هەقی پێ ببینن)، بەڵام ستەمیان لێکردو، ئێمە بۆ ترساندن نەبێ ئەو موعجیزانە نانێرین .

واتە: بۆیان دەنێرین و هەر کات ئەو گەلەی ئەو موعجیزەو نیشانەیەی بۆ دەنێردرێ، بڕوای پێنەهێنا، بە دڵنیایی خوا سزای دەدات .

---

١) ص ٥٨ - ٦٥.

ئەوانەی کە لە سەردەمی پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ داوای موعجیزەی وەك هی گەلی پێشووەکانیان کردوە خوا دەفەرموێ: بۆیە بۆیان نانێرین، چونکە پێشووەکان پێیان بێبڕوابوون و سەرەنجام سزادران، چونکە یاسای خوا وایە: موعجیزەو نیشانەیەکی بەرهەست بە هەر گەلێك بدات، بۆ ترساندنیانە، واتە: بۆ ئەوەیە کە ئەگەر بێت و بڕوا نەهێنن، لە بەینیان دەبات، ئنجا لە دوای ئۆممەتی پێغەمبەریش ﷺ هیچ ئۆممەتی دیکە نایەن، بۆیە خوا ﷻ موعجیزەو بەڵگەو نیشانەیەکی وای پێنەداون، کە ئەگەر بڕوای پێنەهێنن، لەبەینیان بەرێ، موعجیزەیەکی بەرهەستی پێ نەداون، بەڵکو موعجیزەیەکی عیلمیی، فیکریی، عەقڵیی پێداون، دەبێ عەقڵی خۆیان بۆ دەرککردنی بەکاربێنن، چونکە: موعجیزەکە (کە قورئانە) عەقڵیان دەدوێنێ، نەك هەستەکانیان چونکە بەشەرییەت لە دوای هاتنی پێغەمبەری خاتەم (محمد ﷺ) گەیشتۆتە قۆناغی کامڵ بوون و، نابێ مامەڵەی ئەو گەل و کۆمەڵگا پێشووانەی لەگەڵدا بکرێ، کە لە قۆناغی ساوایی دابوون، موعجیزەو بەڵگەکانی ئۆممەتانی پێغەمبەرانی پێشوو (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، موعجیزەو بەڵگەی بەرهەست بوون، لەبەرئەوەی ئەوان خۆیان لە قۆناغێکی ساوایی دا بوون و کرچ و کاڵ بوون، بەڵام دوای ئەوەی کە مرۆڤایەتیی گەیشتۆتە قۆناغی کامڵ بوون و پێگەیشتن، دەبێ موعجیزەو بەڵگەیەکیش کە بە پێغەمبەری خاتەم دەدرێ، لەگەڵ ئاستی ئەو مرۆڤایەتییەدا بگونجێ .

## بڕگەی شەشەم: هۆکارو چۆنیەتی فەوتانی گەلی سەموود

هەوڵدەدەین لە چوار خاڵدا، ئەم بڕگەیە باس بکەین :

یەکەم : صالح ﷺ، ئاگاداری کردوونەوە کە دەبێ ئەو سەرچاوە ئاوەی هەیانە، ڕۆژێك تایبەت بێ بە حوشترەکەو، ڕۆژێکیش بۆخۆیان لێی بخۆنەوە، ئەمە وەك هەنگاوی یەکەم بووە، وەك خوا ﷻ لە سووڕەتی (الشعراء)دا دەفەرموێ:

﴿ قَالَ هَٰذِهِۦ نَاقَةٌ لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿١٥٥﴾ ﴾، واتە: ئەو موعجیزەو نیشانەیەی کە داوای دەکەن، فەرموون : ئەوە ئەو حوشترەیە کە بەو شێوەیە پەیدابووە .

ئنجا ئەگەر ئەوەی (إبنُ كثير)یش، گێڕاویەتەوە واش نەبێت، بە تەئكید هەر شێوەیەكی تایبەتیی هەبووەو، پەیدابوونەكەی پەیدابوونێكی سروشتیی و ئاسایی نەبووە، وەك حوشترەكانی دیكە، ئەگەرنا نەدەبوو بە موعجیزەو بەڵگە، ئنجا هەرچۆنبێ، ئەو حوشترە حاڵەتو شێوەیەكی تایبەتیی هەبووە، كە بۆ خەڵكەكە ئیقناعكەربێ: ئەوە حوشترێكی ئاسایی نیە، چونكە ئەگەر حوشترێكی ئاسایی بووایە، دەیانگوت: ئەوە چییە؟ سەدان حوشتری دیكە هەیە، یانی: ئەگەر شێوەی پەیدابوونەكەشی بەو شێوەیە نەبووبێ، كە (إبن كثير)، باسی كردوە، بەڵام بە تەئكید شێوەی پەیدابوونی حوشترەكەو چۆنیەتییەكەی، هەر حاڵەتێكی تایبەتیی و ڕیزپەڕو دەگمەنی هەبووە .

صالح پێیان دەڵێ : ئەوە حوشترێكە ئەو نۆرە ئاوێكی هەیەو، ئێوەش نۆرە ئاوتان هەیە لە ڕۆژێكی دیاریكراودا، واتە: نۆرەبڕیی لێمەكەن .

لە سووڕەتی (القمر)دا دەفەرموێ : ﴿ إِنَّا مُرْسِلُوا۟ ٱلنَّاقَةِ فِتْنَةً لَّهُمْ فَٱرْتَقِبْهُمْ وَٱصْطَبِرْ ﴿٢٧﴾ وَنَبِّئْهُمْ أَنَّ ٱلْمَآءَ قِسْمَةٌۢ بَيْنَهُمْ ۖ كُلُّ شِرْبٍ مُّحْتَضَرٌ ﴿٢٨﴾ ﴾، واتە: (خوا دەفەرموێ:) ئێمە حوشترێكیان بۆ دەنێرین بۆ تاقیكردنەوەیان، تۆ چاوەڕێیان بەو، لەسەریان ئارامگرو خۆڕاگر بەو، هەواڵیان پێ بدە كە ئاوەكە لە بەینیاندا بەشدەكرێ، ﴿ كُلُّ شِرْبٍ مُّحْتَضَرٌ ﴾، هەر نۆرە ئاوێك خەڵكی خۆی لەلا ئامادە دەبێ، واتە: لە نۆرەی خۆیاندا، ئاوەكە هەڵدەهێنجن، لەو بیرە لەو سەرچاوەیەو، لە نۆرەی حوشترەكەشدا، دەبێ عایدی حوشترەكە بێ، بێگومان حوشترەكە زۆر گەورە بووەو، ئاوی ڕۆژێكی پێویست بووە بیخواتەوە .

ئنجا وەك گوتمان : لە بەسەرهاتەكاندا واهاتووە، كە خەڵكی سەموود هەموویان شیریان لەو حوشترە دۆشیوە، لە بەرانبەر ئاو خواردنەوەی لە كانییەكەیاندا، كە هەڵبەتە قازانجیان بووە، چونكە كانییەكەیان هەر لە جێی خۆی بووەو، ئەو ڕۆژەش كە حوشترەكە ئاوی لە كانییەكە خواردۆتەوە ئەوان شیریان لێ دۆشیوە، ئنجا بە تەئكید شیرەكەش بۆ ئەوان خۆراك بووەو بژیوێكی زۆر باش بووە .

**دووەم:** سەرەنجام نۆ (٩) کەسی ئاژاوەگێڕ لە گەلی سەموود، دەیانەوێت پیلانێک لە دژی صالح بگێڕن‌و بیفەوتێنن، بەڵام خوا هەوڵەکەیان پووچ دەکاتەوەو، صالح دەپارێزێ، وەك لە سووڕەتی (النمل)دا هاتوە : ﴿ وَكَانَ فِي ٱلْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿٤٨﴾ قَالُواْ تَقَاسَمُواْ بِٱللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِۦ مَا شَهِدْنَا مَهْلِكَ أَهْلِهِۦ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٤٩﴾ وَمَكَرُواْ مَكْرًا وَمَكَرْنَا مَكْرًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾، واتە: لە شارەکەدا نۆ (٩) کەس هەبوون خراپەکاریی‌و تێکدانیان لە زەویدا دەکردو، چاکەیان نەدەکرد، (هەتا خراپە لەوێبایە چاکەیان نەدەکرد)، ئەو نۆ (٩) کەسە لە بەینی خۆیاندا، بەڵێنیان بە یەکدیداو سوێندیان بە خوا خوارد، کە دەبێ صالح خۆی‌و خێزانەکەی لە بەین بەرن، دوایی بە سەرپەرشتیارەکەی، بڵێین: (ئەوەی کە سەرپەرشتیاری بووە، ئنجا ئەگەر سەرۆکی هۆزەکە بووە، خزمێکی پشتێی بووبێ کە سەرپەرشتیاری بووە، ڕیش سپیێکی عەشیرەتەکە بووبێ، کە بەرگریی لە صالح کردبێ)، ﴿ مَا شَهِدْنَا مَهْلِكَ أَهْلِهِۦ ﴾، ئێمە ئاگاداری فەوتانی ماڵ‌و خێزانەکەی نەبووین، ﴿ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴾، ئێمەش لە ڕاستانین، ﴿ وَمَكَرُواْ مَكْرًا وَمَكَرْنَا مَكْرًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾، ئەوان پیلانیان گێڕاو، ئێمەش (بۆ پووچەڵکردنەوەی نەخشەی وان)، نەخشەمان دانا، لە حاڵێکدا کە ئەوان هەستیان نەدەکرد بە نەخشەدانانی ئێمە .

هەندێك لە تەفسیرەکان باسی ئەوەیان کردوە، کە گوتوویانە: دەبێ پێکەوە سوێند بە خوا بخۆین کە خۆی‌و خێزانەکەی لە بەین بەرین، دوایی بە سەرپەرشتیارەکەی بڵێین‌و سوێندی بە خوا بۆ بخۆین: کە ئێمە ئاگاداری فەوتانی ماڵ‌و خێزانەکەی نین، ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە کە مەبەستمان لەبەینبردنی ماڵ‌و خێزانەکەی نەبووەو تەنیا خۆی بووە، ئێستا کە خۆیشی لەگەڵ ماڵ‌و خێزانەکەی دا فەوتاوە، ئەوکاتە ئەگەر ئێمە سوێندمان خوارد ، کە ئاگامان لە فەوتانی خێزانەکەی نەبووە، سوێندمان

لێناگەوێ، چونکە ئێمە نیەتی لەبەینبردنی خێزانەکەیمان نەبووە، بەڵام خێزانەکەی لە پەنای صاڵحدا فەوتاون!

ڕەنگە بەتەما بووبن: خانووەکەیان بەسەردا بڕووخێنن، ئاگریان بدەن، بە شێوەیەك لە شێوەکان، بە خۆی و ماڵ و خێزانیەوە مەقعیان بکەنەوەو لەبەینیان بەرن، بەڵام خوا ﷻ وەك ڕوونی کردۆتەوەو فەرموویەتی: ئێمەش نەخشەمان دانا، بێ ئەوەی هەست بکەن! ئنجا ئێمە نازانین ئەو نەخشەیەی خوای زاڵ و زانا چۆن بووە، تەفصیل و وردەکارییەکەی باس نەکردوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە خوای بالادەست صالحی چەپاڵەداوەو پاراستوویەتی، لەو پیلان و فێڵە گڵاوەی ئەوان .

سێیەم : لە کۆتایی دا کە زەفەر بە صالح نابەن، بڕیاری سەربڕین و پەیکردنی حوشترەکە دەدەن و، پیاوێك کە خراپترینیان دەبێ، ئەو بڕیارەیان جێبەجێ دەکات .

ئەمە لە چەند شوێنێکدا هاتوە، بۆ وێنە:

أ ـ سوورەتی (الشعراء)، کە دەفەرموێ : ﴿ فَعَقَرُوهَا فَأَصْبَحُوا نَادِمِينَ ﴿١٥٧﴾ ﴾، واتە: حوشترەکەیان سەربڕی و لە پەشیمانان بوون .

وشەی : (ذبح) بۆ جگە لە حوشترە، وەك: گا، مانگا، مەڕو بزن، پەلەوەر، بەڵام بەتایبەت بۆ حوشتر سەربڕین، دەگوترێ: (عَقْر) .

هەندێکیش دەڵێن: (عَقَرُوها)، (عَقر) ئەوەیە کە پێشێ چوار پەلی ببڕی ، ئنجا دوایی سەری ببڕی، لەبەرئەوەی حوشتر تاکو چوار پەلی نەبڕدرێ ، کە بە کوردیی پێی دەگوترێ : (پەیکردن) هەتاکو چوار پەلی، بە تایبەت : پاشووەکانی هەردوو لاقی پاشەوەی، نەبڕدرێن ناکەوێت و ناگونجێ کە سەر ببڕدرێ .

ب ـ لە سوورەتی (القمر)دا دەفەرموێ : ﴿ فَنَادَوْا صَاحِبَهُمْ فَتَعَاطَى فَعَقَرَ ﴿٢٩﴾ ﴾،

واتە: بانگی هاوەڵەکەی خۆیانیان کرد، (فَتَعَاطَى) ئەویش بە قسەی کردن،

واتــە: بەدەمیــانەوە هــات، (فَعَقَرَ)، ئنجــا حوشــترەکــەی پەیکــرد، یاخــود حوشــترەکەی سەربڕی .

ج ـ لە سوورەتی (الشمس)یش، لەم چوار ئایەتەدا، دەفەرموێ : ﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَىٰهَآ ﴿١١﴾ إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشْقَىٰهَا ﴿١٢﴾ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ نَاقَةَ ٱللَّهِ وَسُقْيَـٰهَا ﴿١٣﴾ فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنۢبِهِمْ فَسَوَّىٰهَا ﴿١٤﴾ ﴾، واتــە: گەلی سەموود بێبڕوا بوو بەو بەڵا گەورەیەی کە بەسەری دێ، (ئەگەر بێتو سەرپێچیی لە فەرمانی پێغەمبەرەکەی صالح بکات)، کاتێك کە خراپترینیان ڕۆیشت بۆ ئەوەی حوشترەکە سەرببڕێ، پێغەمبەری خوا پێی گوتن: ئاگاداری حوشتری خواو ئاو خواردنەوەکەی بن! بەڵام ئەوان بە درۆیان داناو، حوشترەکەیان پەیکرد، یاخود حوشترەکەیان سەربڕی .

د ـ لە سوورەتی (هود)دا، خوای بەرز، ئاوا دەفەرموێ : ﴿ فَعَقَرُوهَا فَقَالَ تَمَتَّعُوا۟ فِى دَارِكُمْ ثَلَـٰثَةَ أَيَّامٍ ذَٰلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ ﴿٦٥﴾ ﴾، واتــە: حوشترەکەیان سەربڕی، یاخود پەییانکرد، ئەویش فەرمووی: سێ ڕۆژان مۆڵەتە ڕابوێرن بۆخۆتان، ئەوە بەڵێنێکە درۆی تێدانیە، (بەڵێنێکی ڕێك‌و ڕاستە، دوای سێ ڕۆژان بەڵاتان بۆ دێ) .

<u>چــوارەم :</u> ئیدی سەرەنجام پاش تێپەڕبوونی ئەو سێ ڕۆژە مۆڵەتەی کە پێغەمبەر صالح ﷺ بۆی دانابوون، بە هاژەو چریکەو دەنگێکی زۆر بێزەرا، کە دەبێتە مایەی بوومەلەرزەیەك‌و گڕکانێکی گەورەش، گەلی سەموود قڕبەر بوون‌و، صالح‌و بڕوادارانیش دەرباز بوون .

خوا ﷻ لە چەند شوێنێك لە قورئاندا، چۆنیەتی فەوتاندنی گەلی یاخیی‌و سەرکەشی سەموودی کردوەو، بێگومان چۆنیەتی فەوتاندنی گەلی سەموود کارەساتێکی زۆر گەورە بووەو، خوا ﷻ پانتاییەکی باشی لە ئایەتەکانی قورئان، بۆ تەرخان کردوە :

١) لە سوورەتی (النمل)دا، خوا دەفەرموێ : ﴿ وَمَكَرُواْ مَكۡرٗا وَمَكَرۡنَا مَكۡرٗا وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ٥٠ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ مَكۡرِهِمۡ أَنَّا دَمَّرۡنَٰهُمۡ وَقَوۡمَهُمۡ أَجۡمَعِينَ ٥١ فَتِلۡكَ بُيُوتُهُمۡ خَاوِيَةَۢ بِمَا ظَلَمُوٓاْۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ٥٢ وَأَنجَيۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ٥٣ ﴾.

واتە : ئەوان پیلانیان گێڕا پیلانێك، ئێمەش نەخشەمان دانا، نەخشەو پلانێكی باش، لە حاڵێكدا كە ئەوان هەستیان پێ نەدەكرد، سەرنج بدە! سەرەنجامی پیلانەكەیان چۆن بوو، ئێمە خۆیان و گەلەكەیان، (پیلانگێڕەكان و ئەو خەڵكەش كە لەگەڵیاندا هاوهەڵوێست بوو، هاودەنگ بوو، یاخود بێدەنگ بوو)، هەموویانمان تێكڕا وێران كرد، ئا ئەوانە خانوو بەرەكانیانن بە چۆڵیی ، یاخود بە ڕووخاویی ماونەوە ! بەهۆی ئەوەوە كە ستەمیانكرد، بێگومان لەوەدا نیشانە هەیە بۆ كەسانێك بزانن، ئەوانەش كە بڕوایان هێنابووو پارێزیان دەكرد، دەربازمان كردن .

٢ ) لە سوورەتی (هود)دا، ئاوا باسی چۆنیەتیی لەبەینبرانی گەلی سەموود، كراوە : ﴿ فَعَقَرُوهَا فَقَالَ تَمَتَّعُواْ فِي دَارِكُمۡ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٖۖ ذَٰلِكَ وَعۡدٌ غَيۡرُ مَكۡذُوبٖ ٦٥ فَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا نَجَّيۡنَا صَٰلِحٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا وَمِنۡ خِزۡيِ يَوۡمِئِذٍۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡعَزِيزُ ٦٦ وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيۡحَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمۡ جَٰثِمِينَ ٦٧ كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَآۗ أَلَآ إِنَّ ثَمُودَاْ كَفَرُواْ رَبَّهُمۡۗ أَلَا بُعۡدٗا لِّثَمُودَ ٦٨ ﴾.

واتە: حوشترەكەیان سەربڕی، (یاخود پەییانكرد، پاشووەكانیان بڕین، یاخود چوار پەلەكانیان بڕین، دوایی سەریان بڕی)، صالح گوتی: سێ ڕۆژان مۆڵەتە لە ماڵ و خانووەكانی خۆتاندا بمێننەوە، ژیان بەسەر بەرن، ئەوە بەڵێنێكە درۆی تێدانیە، ئنجا كاتێك فەرمانی ئێمە هات، صالح و ئەوانەی كە لەگەڵی بڕوایان هێنابوو، دەربازمانكردن بە بەزەییەكی تایبەت لە لایەن

خۆمانەوە، لە سەرشۆڕیی ئەو ڕۆژە دەربازمان کردن، بێگومان پەروەردگارت بەهێزی زاڵە، ئەوانەش کە ستەمیان کردبوو، هاڕژن و چریکەیەکی گەورە گرتنی و، لە ماڵەکانی خۆیاندا لەپەوڕوو کەوتن، (وەك چۆن باڵندە هەڵدەنیشێ ئاوا)، وەك ڕۆژێ لە ڕۆژان لەو شوێنانەدا نەبووبن، (چۆڵەکەکوژی تێدا نەما)، ئاگاداربن! سەموود سپڵە بوون بەرانبەر بە پەروەردگاریان، ئاگادار بن! دووریی بۆ گەلی سەموود لە ڕەحمەت و بەزەیی خوا .

٣ ) لە سوورەتی (الأعراف)یشدا، ئاوا باسکراوە : ﴿ فَعَقَرُواْ ٱلنَّاقَةَ وَعَتَوْاْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ وَقَالُواْ يَٰصَٰلِحُ ٱئْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧٧﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٧٨﴾ فَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰقَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَالَةَ رَبِّي وَنَصَحْتُ لَكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٧٩﴾ ﴾.

واتە: حوشترەکەیان سەربڕی، (یاخود پەییانکرد) و گوتیان: ئەی صالح! ئەوەی کە بەڵێنت پێ دەداین (هەڕەشەت پێ لێدەکردین)، ئەگەر تۆ لە ڕەوانەکراوانی، بۆمان بێنە، ئیدی یەکسەر لەرزینەوەیەکی گەورە گرتنی و، لە ماڵەکانی خۆیاندا لەپەوڕوو کەوتن، بە زەوییەوە نووسان (پێوەی تەخت بوون، وەك چۆن باڵندە هەڵدەنیشێ)، ئەویش پشتی تێکردن و، گوتی: ئەی گەلەکەم! پەیامی پەروەردگارم پێ ڕاگەیاندن و دڵسۆزییم بۆ نواندن، بەڵام ئێوە دڵسۆزانتان خۆشناوێن .

٤ ) لە سوورەتی (القمر)یشدا، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٠﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ صَيْحَةً وَٰحِدَةً فَكَانُواْ كَهَشِيمِ ٱلْمُحْتَظِرِ ﴿٣١﴾ ﴾.

واتە: سزای من و ترساندنی من ئاگادارکردنەوەیەکی چۆن بوو؟ ئێمە یەك هاڕژن و چریکەمان ناردە سەریان، ئیدی سەرەنجام وەك پووش و پەڵاشی بابای خەرمانداریان لێهات، (وەك ئەو پووش و پەڵاشەی کە بابای جوتیار لەسەر خەرمان کۆی دەکاتەوە، دوای ئەوەی گێرە دەکرێ، ئەو پووش و پەڵاشە، ئەو چەوەڵە چۆنە؟ بەو شێوەیە ئەوانەش ئاوا بوونە پووش و پەڵاش و تێکشکێنران و لەبەین بران) .

هَشِیم) واتە: پووش و پەلاشی تێکشکاو، (مُحتَظِر) واتە: کەسێك کە (حَظیرة)ە، دروست دەکات، (حَظیرة)ش، یانی: خەرمان، یاخود (گادێن) ئەوەی کە پووش و پەلاش و گیاو گوڵی تێدا کۆدەکرێتەوە، وەك لەوەڕ بۆ ئاژەڵان .

محتَظِر) واتە: بابای کا کۆکەرەوە، بابای پووش و پەلاش و ئالف کۆکەرەوە .

■ ) لە سوورەتی (فصلت) ئایەتەکانی: (١٧و١٨)دا، ئاوا باسی چۆنیەتی فەوتانی گەلی سەموود دەکات، دەفەرموێ : ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَهُمْ فَاسْتَحَبُّوا الْعَمَىٰ عَلَى الْهُدَىٰ فَأَخَذَتْهُمْ صَٰعِقَةُ الْعَذَابِ الْهُونِ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٧﴾ وَنَجَّيْنَا الَّذِينَ ءَامَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ ﴿١٨﴾ ﴾.

واتە: هەرچی گەلی سەموودە، ڕێنماییمان کردن، بەلام کوێرییان بەسەر ڕێبینیندا هەلبژارد، بۆیە بڵێسەی (یاخود: دەنگێك کە ببێتە هۆی پەیدابوونی بڵێسە) سزایەکی ڕیسواکەر، گرتنی، بەهۆی ئەوەوە کە دەیانکرد، (بەهۆی کردەوەکانیانەوە)، ئەوانەش کە بڕوایان هێنابووو پارێزیان دەکرد، دەربازمان کردن .

٦ ) لە سوورەتی (الحاقة)دا، دەفەرموێ : ﴿ فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهْلِكُوا بِالطَّاغِيَةِ ﴿٥﴾ ﴾.

واتە: بەلام گەلی سەموود بە بەلای بێڕەزا (طاغیة)، (واتە: بە کارەساتێك، کە لە سنوور دەرچوو بوو) لەبەینمان بردن .

٧ ) کۆتا شوێن کە دەمەوێ ئاماژەی پێ بدەم، دەربارەی چۆنیەتی لەبەینچوونی گەلی سەموود، سوورەتی (الشمس)ە، کە دەفەرموێ : ﴿ فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنبِهِمْ فَسَوَّىٰهَا ﴿١٤﴾ وَلَا يَخَافُ عُقْبَٰهَا ﴿١٥﴾ ﴾.

واتە: ئەوان (صالح)یان بە درۆدانا، حوشترەکەیان سەربڕی، پەروەردگاریان بەهۆی گوناهەکەیانەوە، زەوییەکەی لەرزاندنەوە، تەختی کرد، {خانوبەرەکەیانی لەگەڵ خاکدا یەکسانکرد}، خواش لە سەرەنجامی ئەو کارەساتە (ئەو بەلایە کە بۆ ئەو گەلەی ناردوە) ناترسێ .

کێ تۆڵەی لێ بکاتەوە !

جاری خوا ﷻ دادگەرەو کاربەجێیەو، شتی بێجێ ناکات و، کەسیش نیە لە بەرانبەر خوای بالادەست و زاڵدا بوەستێ.

وەك دەبینین خوا ﷻ چەند وشەیەکی بەکارهێناون، بۆ ئەو بەلایەی کە بۆ گەلی سەموودی ناردوە: (صَيْحَةٌ، ٱلرَّجْفَةُ، صَٰعِقَةُ، طاغية، فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ )، ئەمانە بۆ کەسێ کە ڕواڵەت بین بێ، بۆ کەسێکی کرچ و کاڵ، لە شت تێبگات، دەڵێ : چۆن خوا ﷻ یەك گەل و کە گەلی سەموودە، بەلام هەرجارەو بە وشەیەك تەعبیری کردوە لە سزایەکەیان :

١ - جارێك دەفەرموێ : چریکەو هاڕژن .

٢ - جارێك دەفەرموێ : لەرزینەوە .

٣ - جارێك دەفەرموێ : بڵێسەیەکی ئاگر .

٤ - جارێك دەفەرموێ : بەلایەکی لە سنوور دەرچوو .

٥ - جارێك دەفەرموێ : بوومەلەرزە .

بەلام لە ڕاستییدا ئەمە ئەوپەڕی حیکمەتی خوای زاناو کارزانی تێدایە، چونکە: خوا ﷻ بەو وشانە هەرجارە تەعبیر دەکات لە لایەکی ئەو سزایە، لە ئەسڵدا چریکەو دەنگێکی گەورە بووە، ئەو هاڕژن و دەنگە گەورەیە بۆتە هۆی لەرزینەوە بۆتە هۆی هاژەو هاڕەو لەرزینەوە، سەرەنجام ئەوەش بۆتە هۆی ئەوە کە بوومەلەرزە دروستبێ، ئەوەش بۆتە هۆی ئەوە کە شوێنەکە گڕکانێکیشی لێبێ و، بڵێسەی ئاگر پەیدابێ، کە ئەوەش کارەساتێك بووە لە سنوور دەرچووە، چونکە خەڵك کارەساتی وای نەبینیوە لە حاڵەتی ئاسایی داو، ئەو بەلایە بەلایەکی نائاسایی بووە .

**بڕگــەی حــەوتــەمو کۆتــایی : دوو فــەرموودەی پێغەمبــەری خــوا ﷺ لــەبــارەی شــوێنــەواری ســەموودەوە :**

کۆتـایـی بە بـەسـەرهـاتی صالّح عليه السلام و گەلـەکـەی سـەموود، بـەم دوو فەرموودەیـە دێنیـن، کە لـەبارەی ئـەو دەڤـەرەوە هـاتـوون، کە گەلی سـەموودی تێـدا ژیـاوە، کـە حیجـرە :

<u>فەرموودەی یـەکـەم</u> : {عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: لَمَّا نَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالنَّاسِ عَامَ تَبُوكَ نَزَلَ بِهِمُ الْحِجْرَ عِنْدَ بُيُوتِ ثَمُودَ، فَاسْتَسْقَى النَّاسُ مِنَ الآبَارِ الَّتِي كَانَ يَشْرَبُ مِنْهَا ثَمُودُ، فَعَجَنُوا مِنْهَا وَنَصَبُوا الْقُدُورَ بِاللَّحْمِ، فَأَمَرَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَهْرَاقُوا الْقُدُورَ وَعَلَفُوا الْعَجِينَ الإِبِلَ، ثُمَّ ارْتَحَلَ بِهِمْ حَتَّى نَزَلَ بِهِمْ عَلَى الْبِئْرِ الَّتِي كَانَتْ تَشْرَبُ مِنْهَا النَّاقَةُ، وَنَهَاهُمْ أَنْ يَدْخُلُوا عَلَى الْقَوْمِ الَّذِينَ عُذِّبُوا، قَالَ: إِنِّي أَخْشَى أَنْ يُصِيبَكُمْ مِثْلُ مَا أَصَابَهُمْ، فَلا تَدْخُلُوا عَلَيْهِمْ} {أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٥٩٨٤، قَالَ شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ} .

واتـە: عەبدوڵڵای کـوڕی عومـەر خـوا لـە خـۆیو بـابـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: کـاتێك پێغـەمبـەری خـوا ﷺ خەڵکـی بـردە نـاوچـەی تـەبووك، لـەوێ لـە دەڤـەری حیجـر لـە لای ماڵـەکـانی سـەموود دایبـەزانـدن، خەڵـك لـەوێ لـەو بیـرانە کـە گـەلی سـەموود ئـاویـان لـێخـواردبوونەوە، ئـاویـان هـەڵێنجـابووو هـەویریـان پـێ شـێلابووو چێشـتیـان پـێ لـێنـابوو، لـە مەنجـەڵانـدا خستبوویـانە سـەر ئـاگـر، بـەڵام پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمانی پێکـردن: مەنجەڵـەکان بـڕێـژنو هـەویرەکـەش بکەنە ئـاڵف بۆ حوشـتـرەکـانیـان، (دوایی لـەوێ گواسـتـنیـەوە {خەڵکەکـە چووبوون لـەوێ دابـەزیبـوون، لـە نـاوچـەی حیجـر، چونکـە سوپایـەکی گـەورە بـوو، سـی هـەزار (٣٠,٠٠٠) کـەس، کەسانێکیـان چـوون بـۆ ئـەوێ}، تـاکو بـردنی بـۆ سـەر ئـەو بیـرەی کـە حوشـتـرەکـە ئـاوی لـێ دەخـواردەوە (فـەرمووی: لـێرە ئـاو هـەڵهێنجـنو بخـۆنەوەو بـۆ چێشـتو ئـەوانە بـەکاری بێـنن)، لـێی قەدەغەکـردن کـە بـە

شوێنی ئەو کۆمەڵە خەڵکەدا کە سزا دراون بڕۆن، فەرمووی: توختی ئەو شوێنانە مەکەون، فەرمووی: دەترسێم کە ئەوەی بەسەر ئەوان هاتووە بەسەر ئێوەش بێ، (بۆیە مەچنە شوێنی ئەو گەلە سزادراوانەوە) .

فەرموودەی دووەم: {عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ تَدْخُلُوا عَلَى هَؤُلاَءِ الْمُعَذَّبِينَ، إِلاَّ أَنْ تَكُونُوا بَاكِينَ، فَإِنْ لَمْ تَكُونُوا بَاكِينَ، فَلاَ تَدْخُلُوا عَلَيْهِمْ ، لاَ يُصِيبُكُمْ مَا أَصَابَهُمْ} {أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٥٦٤٥، وَالبُخَارِيُّ: ٤٢٣، وَمُسْلِمٌ: ٢٩٨٠} .

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە حیجر فەرمووی: مەچنە شوێنی ئەو گەلە سزادراوانەوە، مەگەر بە چاوی بە فرمێسکو بە گریانەوە ئەگەر نەگریەن، مەچوون بۆ شوێنەکەیان، نەوەك ئەوەی بەسەر وان هاتوە (ئەو بەڵایە)، بەسەر ئێوەش بێ .

هەڵبەتە لێرەدا مەبەستی پێغەمبەری خاتەم ﷺ ئەوە نەبووە کە ئێمە بە شوێنەواری گەلە پێشووەکاندا نەگەڕێین و چاونەگێڕین و، دەرس و پەندیان لێوەرنەگرین، چونکە خوا ﷻ لە چەندان ئایەتدا، ئەوەی پێ فەرمووین: بۆ وێنە :

أ - ﴿قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ ثُمَّ ٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١١﴾﴾ الأنعام .

ب - ﴿أَوَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ ﴿٩﴾﴾ الروم

ئایا بە زەویدا نەڕۆیشتوون؟ بە پرسیارکردنی نکوولیلێکەرانەوە واتە: خوای زاناو توانا فەرمانی پێکردووین کە بە زەویدا بڕۆین و شوێنەوارەکان ببینین، بەڵام مەبەستی پێغەمبەری خاتەم ﷺ ئەوەیە کە بێئاگانە ئینسان بەو شوێنانەدا نەڕواو، کاتێك کە دەچێتە ئەو شوێنانە، سەرەنجامی خراپی ئەو خەڵکە کە ئەو بەڵایەیان بەسەرهاتووە بێنێتە بەرچاوی خۆی و گوناهو تاوانەکانیش کە هۆکاری ئەو بەڵایە بوون، ئەوەش بێنێتە بەرچاوی خۆی، بۆ ئەوەی پەندو دەرس وەربگرێ لەو شوێنەوارانە .

من ئاوا لەو دوو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ تێدەگەم .

هەڵبەتە ئەگەر وابێت کە ئینسان گریانیشی بێت، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی، ئەوە باشتر، بەلام بە بۆچوونی من پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستی ئەوە نەبووە کە بەو شوێنانەدا نەڕۆین، چونکە ئایەتەکان زۆر بە روونیی ئەوە دەگەیەنن، کە دەبێ بە شوێنەواری پێشووەکاندا بڕۆین، دەرس و پەندیان لێوەربگری، بەلام مەبەستی پێغەمبەر ﷺ هەر ئەوەیە کە بێباکانە بەوێ دانەڕۆین، غافڵانەو بێئاگایانە نەچین، بەس تەماشای لایەنە شارستانییەکەی و لایەنە بیناسازییەکەیان بکەین، بەلام تەماشا نەکەین: ئەو خەڵکە چۆن فەوتاون و، بۆچی ئەو بەلایانەیان بەسەرهاتوە!

ئنجا چ بە نسبەت هەرەمەکان (اهرام)ەوە کە لە میسرن، هی فیرعەونەکان، چ بە نسبەت شوێنەوارەکانی گەلی عاد، گەلی سەموودەوە، چ کاتێ کە تۆفانی نووح ﷺ یاد دەکرێ، کەشتییەکەی نووح لەسەر چیای جوودیی، یان دەریاچەی مردوو، شوێنەواری گەلی لووط ﷺ، هەروەها شوێنەواری گەلی پێغەمبەر شوعەیب ﷺ و گەلانی دیکە، پێویستە ئینسان بە چاوی عەقڵ و دڵ تەماشای شوێنەوارەکانیان بکات و، دەرس و پەند لەوە وەربگرێ کە بەسەریان هاتوە .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَ بِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی پێنجەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان دەرسی کۆتاییە لە سووڕەتی (الحجر)ە، ئایەتەکانی: (٨٥ - ٩٩) واتە: پازدە (١٥) ئایەت دەگرێتە خۆی، تەوەری سەرەکیی ئەم پازدە ئایەتە، بریتییە لە: ئامۆژگاریی‌و ڕێنمایی خوا ﷻ بۆ پێغەمبەری خۆی موحەممەد ﷺ لە بواری هەڵسوکەوت کردنی لەگەڵ ناحەزانیدا، بە تایبەتی‌و خەڵکی دا بە گشتی، کە سەرجەمیان یازدە (١١) ئامۆژگاریی‌و ڕێنمایی گەورەو گرنگن .

﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۗ وَإِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَءَاتِيَةٌ ۖ
فَٱصْفَحِ ٱلصَّفْحَ ٱلْجَمِيلَ ﴿٨٥﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨٦﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى
وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ لَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ وَلَا تَحْزَنْ
عَلَيْهِمْ وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨٨﴾ وَقُلْ إِنِّىٓ أَنَا ٱلنَّذِيرُ ٱلْمُبِينُ ﴿٨٩﴾ كَمَآ أَنزَلْنَا عَلَى
ٱلْمُقْتَسِمِينَ ﴿٩٠﴾ ٱلَّذِينَ جَعَلُوا۟ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ ﴿٩١﴾ فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾
عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾ فَٱصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٩٤﴾ إِنَّا كَفَيْنَٰكَ
ٱلْمُسْتَهْزِءِينَ ﴿٩٥﴾ ٱلَّذِينَ يَجْعَلُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ۚ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَقَدْ نَعْلَمُ
أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴿٩٧﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٩٨﴾ وَٱعْبُدْ
رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ ﴿٩٩﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیانمان بە هەق نەبێ دروست نەکردوون و، رۆژی دواییش دێ، بۆیە بە چاوپۆشییەکی جوان چاوپۆشیی بکە (لە هەڵسوکەوتی بێنەزاکەتانەی بێبڕوایەکان) (٨٥) بە دڵنیایی هەر پەروەردگارت بەدیهێنەری زانایە (٨٦) بێگومان حەوت لە ئایەتە دووبارەبووەکان و قورئانی مەزنمان پێ بەخشیوی (٨٧) کەواتە چاو مەبڕە ئەو نازو نیعمەتەی چەند کۆمەڵێک لەوان، (کافران)و، خەمیان بۆ مەخۆ، {کە گوێت پێنادەن و بڕوات پێناهێنن} و، باڵت بۆ بڕواداران شۆڕبکە{و، لەگەڵیان میهرەبان بە} (٨٨) بڵێ: هەر منم ترسێنەری ئاشکرا (لە سزاو تۆڵەی خوا) (٨٩) وەك ئەو (سزاو تۆڵە)ەی دامانبەزاندە سەر دابەشکەران {یان سوێند خۆران، کە سوێندیان بۆ یەکدی خوارد، لە دژی (صالح)} (٩٠) ئەوانەی قورئانیان بەش بەشکرد {بە ئارەزووی خۆیان، پۆلێنیان کرد بۆ شیعرو جادوو ئەفسانە} (٩١) دەجا سوێند بە پەروەردگارت، بەدڵنیایی لە هەموانیان دەپرسینەوە (٩٢) لەبارەی ئەوەوە کە دەیانکرد (٩٣) (بۆیە بە دەنگی بەرزو زوڵاڵ) ئەوەی فەرمانت پێکراوە ڕایبگەیەنەو، هاوبەشدانەرەکان پشتگوێ بخە، (لەوە کە لەبەروان، بەشێك لە پەیامی خوا نەگەیەنی) (٩٤) ئێمە گاڵتە پێکەرەکانت بۆ چارە دەکەین (٩٥) ئەوانەی لەگەڵ خوادا پەرستراوی دیکە دادەنێن و، لەمەودوا دەزانن چۆن سزایان دەدەین (٩٦) دەشزانین تۆ بەهۆی ئەوەوە کە دەیڵێن: سینەت تەنگ دەبێ (٩٧) دەجا بە ستایشکردنەوە پەروەردگارت بە پاك بگرەو، لە کڕنووشبەران بە (٩٨) هەتا مردنێك کە لێی دڵنیای بۆت دێت، هەر لەسەر پەرستنی پەروەردگارت بەردەوام بە (٩٩)} .

# شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

﴿ٱلسَّاعَةَ﴾: واتە: ئەو كاتەی كە دنیای تێدا كۆتایی پێدێ، بۆیە من بە (ئاخیر زەمان) مانام كردوە، بەڵام لێرە وا پێدەچێ مەبەست لە (السَّاعَة): (وَقْتُ قِيامِ القِيامَة)، كاتی هاتنی قیامەت، بێ .

﴿ٱلصَّفْحَ﴾: صَفَحَ، صَفْحاً، والصَّفحُ: تَرْكُ التثريب، وهو أبلغ من العفو)، (صَفْحَ)، پشتی تێكرد، (صَفْحَ)، بریتییە لە لۆمەو سەركۆنە نەكردن، (صَفْح) لە (عَفْو) بەهێزترە، (عَفْو) ئەوەیە لێی ببووری، بەڵام (صَفْح) ئەوەیە هەر وەسەرخۆت نەهێنی، وەك ئەو كەسە، ئەو خراپەو هەڵەیەی هەر نەكردبێ، بەرانبەر بە تۆ .

﴿ٱلْمَثَانِى﴾: (الآياتُ الَّتِي تُتْلَى وتُكرَّر، جَمْعُ مَثنَى، أو مَثْناة، أو مِنَ الثَّناء)، مَثانِي): ئەو ئایەتانەی كە دەخوێنرێن‌و، دووبارە دەبنەوە، كە كۆی مَثنی)یە، یان كۆی (مَثناة)ە، یاخود دەشگونجێ كۆی (ثَناء)بێ، واتە: ئەو ئایەتانەی كە سوپاس‌و ستایشی خوایان پێ دەكرێ، كە مەبەست پێی حەوت ئایەتەكانی سوورەتی: (الفاتحة)ن .

﴿لَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ﴾: واتە: چاوی تێ مەبڕە هەردوو چاوتی تێ مەبڕە (أَصْلُ المَدِّ: الجَرُّ، مَدَدْتُ عَيْنِي إِلَى كَذَا: طَمَعْتُ فِيهِ)، وشەی (مَدّ) لە ڕیشەدا بە مانای درێژكردنەوەو لێك كێشانەوە دێ، بەڵام (مَدَدْتُ عَينِي إِلَى كَذا)، واتە: تەماعم تێكرد، چاوم تێبڕی، چاوم لەسەر چڕ داگرت .

﴿أَزْوَاجًا مِّنْهُمْ﴾: (أزواج: أي أقرانٌ وَ أشباه)، واتە: ئەوانەی كە وەك یەكن، وێك دەچن پێكەوەن، یاخود (أزواج) یانی: (أنواع وأصناف وَ مَجمُوعَات)، واتە:

چەند جۆرێكو چەند پۆلێك لەو خەڵكە، چەند كۆمەڵێك لەو خەڵكە كە خۆشگوزەرانمان كردوون، چاو لەو نازو نیعمەتە مەبڕە كە لە دەستی ئەوان دایە، شتێكی زوو تێپەڕو كەم بایەخە، بە نسبەت ژیانی دوارۆژەوە. یاخود (أَزوَاج)، یانی : نێرو مێیەكان پێكەوە، چەند جووتێك .

وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ ): بە هۆیانەوە دڵتەنگ مەبە، خەفەتیان بۆ مەخۆ، دەڵێ: الحَزَنُ وَالحُزُونَةُ: خُشُونَةُ الأَرْضِ وَخُشُونَةٌ فِي النَّفسِ لِمَا يَحصُلُ فِيهِ مِنَ الغَمِّ)، (حَزَن) و (حُزُونَة) بە زبریی زەوی دەگوترێ، بە زبرییەك دەگوترێ، كە لە نەفسدا پەیدادەبێ ، بەهۆی خەمو خەفەتێكەوە كە دەچێتە نێوی .

وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ ): باڵت شۆڕبكە، (الخَفْضُ: ضِدُّ الرَّفعِ، لِينُ الجَانِبِ وَالإِنقِيَاد)، واتە: لەگەڵیان میهرەبانو نەرمو نیان بە، چونكە (خفض) دژی بەرزكردنەوەیە .

ٱلۡمُقۡتَسِمِينَ ): واتە: سوێند خۆران، یاخود دابەشكەران، بۆیە گوتراوە: (الَّذِينَ تَحَالَفُوا)، ئەوانەی كە سوێندییان بۆ یەكدی خوارد، یاخود پەیمانیان پێكدا، یاخود (الَّذِينَ تَقَاسَمُوا شُعَبَ مَكَّةَ، لِيَصُدُّوا عَن سَبِيلِهِ)، ئەوانەی كە كۆڵانەكانی شاری مەككەیان لەبەینی خۆیاندا بەشكردن، بۆ ڕێگریی كردن لە ڕێی خوا. (تۆ لەوێ بە، ئەو لەوێ بێ، هەر كەسێك هات، با ئاگادار بكرێتەوە، لەوە كە موحەممەد ﷺ جادووگەرە یاخود موحەممەد ڕاست ناكاتو پەیامەكەی ڕاست نیە) .

عِضِينَ ): (عِضُون: جَمعُ عِضَة، مِثلُ ثُبُون جَمعُ ثُبَة، وَالتَّعضِيَةُ : تَجزِيَةُ الأَعضَاءِ وَعَضَّيتُهُ أَي جَزَّئتُهُ)، (عِضُون): كۆی (عِضَة)یە، وەك (ثبون) كۆی (ثُبة)یە، (تَعضِيَة)ش، بریتیە: لەوە كە ئەندامەكانی شتێك بەش بەش بكرێن، (عَضَّيتُهُ) واتە: بەش بەشم كرد .

كَفَيْنَٰكَ ): واتە: بۆت چارە دەکەین، لە کۆڵت دەکەینەوە، (الكِفَايَةُ: مَا فِيهِ سَدُّ الخُلَّةِ وَبُلُوغُ المُرَادِ فِي الأَمرِ)، (كِفَايَة): بریتیە: لەوە کە کەلێن بگیرێو ئاوات بێتە دی لە شتێکداو، ئەو شتە تەواو بکرێ .

فَٱصْدَعْ ): واتە: بە دەنگی بەرز بیڵێ، (الصَّدْعُ: الشَقُّ فِي الأَجسَامِ الصُّلْبَةِ كَالزُّجَاجِ وَالحَدِيدِ)، (صَدْع)، بریتیە: لە لەت بوون، شەق بوون لەو تەنانەدا کە ڕەقن، وەك شووشەو ئاسن، {یان تەختە کە شەق دەبێو دەنگی دێ، پێی دەگوترێ : (صَدْع)}.

ٱلْيَقِينُ ): یانی: دڵنیایی، (اليَقِينُ: مِنْ صِفَةِ العِلْمِ فَوْقَ المَعرِفَةِ وَالدِّرَايَةِ، يُقَالُ عِلْمٌ يَقِينٌ، وَلاَ يُقَالُ مَعرِفَةٌ يَقِينٌ، وَهُوَ سُكُونُ الفَهْمِ مَعَ ثَبَاتِ الحُكْمِ) (يَقِين): لە سیفەتی زانیارییە، کە لە سەرووی (مَعرِفَة)و (دِرَايَة)ەوەیە، ((مَعرِفَة) بە زانستو (دِرَايَة) بە زانین، واتا دەگێڕن لە زمانی کوردییدا)، دەگوترێ: (عِلمٌ يَقِين)، زانیارییەکی جێی دڵنیایی، بەڵام ناگوترێ: (مَعرِفَةٌ يَقِين)، زانستێکی جێی دڵنیایی، یەقینیش بریتیە لەوە کە ئینسان بڕیار لەسەر شتێك بداتو دڵی لەسەر بچەسپێو، دڵ لە دڵدانو دوودڵیی لەبارەیەوە نەمێنێ، ئەوە ئەسڵی مانای یەقینە لە زماندا .

بەڵام لێرە مەبەست پێی مردنە، بە ڕای زۆربەی هەرە زۆری مانا لێکدەرەوانی قورئان، (اليَقِينُ: أَي المَوتُ الَّذِي مَجِيئُهُ شَيءٌ يَقِينِيٌّ لاَ شَكَّ فِيهِ)، (يقين) یانی : ئەو مردنەی کە هاتنی شتێکی جێی دڵنیاییەو، هیچ دوو دڵیی تێدانیە، لێرەدا بەپێی سیاق دەزانین کە مەبەست لە (یەقین) مردنە، چونکە مردن ڕاستییەکە هیچ دوو دڵیی تێدانییە، هەموو کەس دڵنیایە کە مردنی بۆ دێ، ڕۆژێ لە ڕۆژان دەبێ تامی مردن بچێژێ، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۝١٨٥ ﴾آل عمران، واتە: هەموو نەفسێك دەبێ مردن بچێژێ .

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوای پەروەردگار لە کۆتایی سووڕەتی (الحجر) دا، کۆمەڵێك ئامۆژگاریی‌و ڕێنمایی گەورەو گرنگ بۆ پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ دەخاتە ڕوو، کە سەرجەم یازدە (١١) ڕێنماییـن‌و، لە کۆتایی ئەم دەرسەدا بە ڕیز دەیانهێنین .

سەرەتا خوای بێ هاوتا، دەفەرموێ : ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۗ وَإِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَءَاتِيَةٌ ۖ فَٱصْفَحِ ٱلصَّفْحَ ٱلْجَمِيلَ ﴾، واتە: ئێمە ئاسمانەکان‌و زەوی‌و ئەوەی دەکەوێتە نێوانیان، تەنها بە هەق دروستمان کردوون، بە دڵنیاییەوە (ساعَة) هەر دێ، بۆیە چاوپۆشییەکی جوان ئەنجام بدە . لەگەڵ خەڵك دا بە گشتی، یان لەگەڵ ئەوانەی بانگیان دەکەی بۆ لای خوا، بە تایبەت لەگەڵ هاوبەش بۆ خوا دانەران، کە ئەوان پێغەمبەری خاتەم ﷺ پێویستیی بەوە هەیە، چاوپۆشییەکی جوانیان لێ بکات، چونکە بە شێوەیەکی ناشایست لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ڕووبەڕووبوونەوە .

لێرەدا خوای زاناو شارەزا ئەو ڕاستییە گەورەیە ڕادەگەیەنێ، کە لە گەلێك جێگای دیکەی قورئاندا ڕایگەیاندوە: ئەم گەردوونە، بەسەرو خوارییەوە ئاسمانەکان، کە حەوت (٧)ن‌و، زەوی کە نشینگەی ئێمەیەو ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوە، خوا دەفەرموێ: بە هەق نەبێت، دروستم نەکردوون، تەنها بە هەق دروستم کردوون، ئەو هەقەش لەوەدا بەرجەستە دەبێت، کە ئەم گەردوونە حیکمەتێك‌و ئامانجێکی لە پشتەوەیەو، ژیانی مرۆڤ، ژیانێکی پووچ‌و بێ حیکمەت نیەو، ئەم گەردوونە کراوە بە شوێنێك کە مرۆڤ ماوەی چەندی تێدا تاقی دەکرێنەوە .

(ساعَة)ش وا پێدەچێت لێرەدا زیاتر مەبەستی پێی قیامەت بێت، چونکە لە قیامەتدا لێپرسینەوەو سزاو پاداشت ئەنجام دەدرێت، ئەگەرنا (ساعَة) واتە:

کاتێکی دیاریکراو بۆ شتێکو، (سَاعَة) لە بەکارهێنانی قورئاندا، زیاتر بۆ ئاخیر زەمان، بۆ کۆتایی پێهێنانی ئەم ژیانی دنیایە بەکارهاتووەو (قِیامَة)ش، واتە: هەڵسانەوە، بۆ ڕۆژی دوایی بەکارهاتووە، بەڵام لێرە وا پێدەچێت : مەبەست لە (سَاعَة) ئەو کاتە بێ ، کە ڕۆژی دوایی تێدا دێ، کە بێگومان هەر دێ، بۆیەش دەڵێین: (ساعة) لێرەدا بە مانای قیامەتە، چونکە: گونجاو نیە بگوترێ: چاوپۆشیی جوان بکە، چونکە ئاخیر زەمان دێ، بەڵکو ئەوە گونجاوە بگوترێ: بێگومان کاتی سزاو پاداشتو لێپرسینەوە هەر دێ، بۆیە تۆ چاوپۆشییەکی جوان ئەنجام بدە، لەگەڵ نەیارەکانتدا، چونکە کاتێکی دیکە هەیە، ئەوانە سزاو پاداشتی تێدا وەردەگرنەوە .

﴿ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴾، واتە: بێگومان تەنیا پەروەردگارت، زۆر بەدیهێنەری زانایە .

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴾، واتە: بە دڵنیاییەوە ئێمە حەوت لە دووبارە بووەوەکانو، قورئانی مەزنمان بە تۆ داوە .

مەبەست لە حەوت دووبارە بووەوەکان، بە ڕای زۆربەی زانایان، حەوت ئایەتەکانی سوورەتی (الفاتحة)ن، کە دووبارە دەبنەوە، یاخود لەبەرئەوەی کە ستایشی خوایان تێدا دەکرێ، هەندێکیش گوتوویانە: مەبەست حەوت سوورەتە درێژەکانە، بەڵام وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین، ئەو ڕایە بێهێزە، لەبەر چەند هۆیەك، یەکیان ئەوەیە کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ بۆخۆی فەرموویەتی: مەبەست لە ﴿ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى ﴾، سوورەتی مەزنی (الفاتحة)یە .

ئنجا کە خوا دەفەرموێ: بێگومان، بە دڵنیایی ئێمە حەوت ئایەتە دووبارە بووەوەکانو قورئانی مەزنمان بە تۆ داوە، ئەمە وەك ڕێ خۆشکردن وایە، بۆ ئایەتی دواتر کە دەفەرموێ :

﴿ لَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ ﴾، واتە: چاومەبڕە ئەوەی کە کۆمەڵانێك، کەسانێك لە بێبڕوایەکانمان پێ بەهرەمەند کردوە، واتە: چاو مەبڕە ئەو سەروەتو سامانو ماڵو ئیمکانییەتەی بە وەتمان داوەو، ئەوەتمان تێدا بەهرەمەند کردوە، چونکە خوای پاكو بێگەرد شتێکی بە تۆ داوە، کە لەگەڵ

ئەو سەروەتو سامانو، جوانییو ڕازاوەیی ژیانی دنیا، کە بەشێك لە بێبڕوایەکانی پێ بەهرەمەند کردوە، ناچێتە تەرازووەوە !

﴿ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ ﴾، واتە: خەمیشیان لێ مەخۆ، واتە: ئەو خەمەیان لێ مەخۆ : شتێك بخەیە سەرشانی خۆت ، کە ئەرکی تۆ نیە، کە بریتیە لە: ڕێی ڕاست پێگرتنی ئەوان، یاخود خەم لە قسەکانیانو پڕوپاگەندەکانیان مەخۆو بەهۆی ئەوەوە پەژارەدار مەبە. ﴿ وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴾، واتە: باڵیشت شۆڕ بکە بۆ بڕواداران، واتە: لەگەڵیان میهرەبانو بە بەزەیی بەو ئاگات لێیان بێت .

﴿ وَقُلْ إِنِّىٓ أَنَا ٱلنَّذِيرُ ٱلْمُبِينُ ﴾، واتە: بڵێ: تەنیا من ترسێنەری ڕوونو ئاشکرام، (ڕیاکەرەوەی ڕوونو ئاشکرام، بۆ ئێوە ئەی خەڵکینە !

﴿ كَمَآ أَنزَلْنَا عَلَى ٱلْمُقْتَسِمِينَ ﴾، ئەوە دەگونجێ پەیوەست بێتەوە بە ئایەتی پێشێ، کە فەرمووی : ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ ﴾، بێگومان بە تۆمان بەخشیوە : حەوت ئایەتە دووبارە بووەوەکان، یان: حەوت ئایەتە ستایش پێکراوەکانو قورئانی مەزنیش، ئێمە قورئانمان دابەزاندە سەر تۆ، وەك چۆن کتێبەکانی دیکەو پەیامەکانی دیکەشمان دابەزاندن، بۆ سەر ئەوانەی کە پێکەوە سوێندیان خوارد بوو، پەیمانیان دابوو، لە دژی پێغەمبەران .

چونکە وشەی : (مُقْتَسِمِينَ) :

أ / دەگونجێ مەبەست پێی: سوێند خۆران، بەڵێن پێکدەران، بێ، ئەوانەی دژایەتیی پێغەمبەرانیان کردوە، بۆیە پەیمانیان پێکەوە بەستوەو سوێندیان پێکەوە خواردوە، کە دژایەتییان بکەن .

یاخود مەبەست پێی نۆ (٩) کەسە خراپو تێکدەرەکەی گەلی (ثَمود)ن، کە خوای پاكو بێگەرد لە ئایەتەکانی پێشێدا، باسی کردن .

ب / دەشگونجێ مەبەست پێی ئەوە بێت کە پێغەمبەر ﷺ بفەرموێ: من بۆ ئێوە ترسێنەرێکی ڕوونو ئاشکرام، بە سزایەك وەك ئەو سزایەی کە کاتی خۆی دامانبەزاندۆتە سەر، سوێند خۆرانی دژی پێغەمبەرانو، بەڵێن

بەیەکدەران، لە گەلی (ثَمُود)، لە غەیری گەلی (ثَمُود)، یاخود من ترسێنەرێکی ئاشکرام بۆ ئێوە، بە سزایەك، وەك ئەو سزایەی کە دامانبەزاندە سەر ئەوانەی قورئانیان بەش بەش و پۆلین کرد بوو، لە کافرانی مەککە، کە هەندێکیان دەیانگوت: قورئان جادوویەو، هەندێکیان دەیانگوت: شیعرەو، هەندێك دەیانگوت: قسەی فاڵچییانەو، هەندێك دەیانگوت: ئەفسانەی پێشینانە، یاخود وەك ئەو سزایەی دامانبەزاند بۆ سەر ئەوانەی کە کۆڵانەکانی مەککەیان بەسەر خۆیان دابەشکرد بوو: تۆ لەوێ بەو، تۆ لەوێ بە، ئەگەر کەسێکی بێگانەو نامۆ هات، کە موحەممەد ﷺ نەناسێت، ئاگاداری بکەنەوە : کە موحەممەد شاعیرە یان جادووگەرە یاخود کاهینە، بۆ ئەوەی بە قسەکانی هەڵنەخەڵەتێ ، ئەم ئایەتە چەند واتایەکی جۆراو جۆری هەن، کە دوایی زیاتر ڕوونیان دەکەینەوە .

﴿ ٱلَّذِينَ جَعَلُوا۟ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ ﴾، واتە: ئەوانەی کە قورئانیان بەش بەش کرد، (عِضِينَ)، کۆی (عِضَة)یە، واتە: (جُزءٌ)، پارچە، ئەوانە قورئانیان پارچە پارچە کرد، بەش بەش کرد، بە گومانی خۆیان .

هەندێکیان بە شیعر دادەنا، هەندێکیان بە جادوو دادەنا، هەندێکیان بە ئەفسانەی پێشینان دادەنا، یاخود هەر کامێکیان ناوو ناتۆرەیەکی تایبەتیی بە دوای قورئان دەخست .

﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾، واتە: سوێند بە پەروەردگارت بە دڵنیاییەوە لە تێکڕایان دەپرسینەوە، واتە: لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکەین و وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرناچن .

﴿ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾، واتە: لێیان دەپرسینەوە، لەبارەی ئەوەوە کە دەیانکرد، لە دژایەتیی کردنی قورئان و پێغەمبەری خاتەم ﷺ.

﴿ فَٱصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ ﴾، کەواتە: تۆ ئەوەی فەرمانت پێکراوە، بە دەنگی بەرزی زوڵاڵ ڕایبگەیەنە .

(صَدْعْ)، بە دەنگی شتێکی ڕەق دەگوترێ، کە بشکێ‌و زرینگەی لێ بێت، یان شەقەی بێ، ئەوەی فەرمانت پێکراوە بە دەنگی بەرزی زوڵاڵ بیگەیەنە، با هەموویان گوێیان لێ بێ‌و بیبیستن .

﴿ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾، پشت لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بکە، واتە: پشت گوێیان بخە، ئیهمالیان بکە، هەڵبەتە بەو واتایە نا، کە پەیامی خوایان پێ نەگەیەنێ، چونکە پێشتر خوا فەرمووی: پێیان بگەیەنە، بەڵکو واتە: ئازارەکانیان‌و قسەو قاڵەکانیان‌و، پیلانەکانیان پشت گوێ بخەو، دڵی خۆتیان پێوە خەفەتخان مەکەو، پشت بە خوا ببەستە .

﴿ إِنَّا كَفَيْنَٰكَ ٱلْمُسْتَهْزِءِينَ ﴾، ئێمە چارەی گاڵتە پێکەرانت بۆ دەکەین، ئەوان بۆ ئێمە لێگەڕێ .

هەندێك لە زانایان گوتوویانە: پێنج لە زلەزلەکانی مەککە، خوا ﷻ بە دوای یەکدا، هەر یەکێکیانی بە دەردێکی کوشندە لە بەین بردوون، مەبەست پێی ئەوەیە، بەڵام پێم وایە چەمك‌و واتایەکەی فراوانترە، دەگونجێ ئەوەش بوو بێ، بەڵام واتایەکەی فراوانترە .

بەڵێ قورئان سەرەتا زۆربەی لە مەککە دابەزیوەو، دوایی ئەوی دیکەی لە مەدینە دابەزیوەو، بێگومان جاری وا هەیە، هەندێك ئایەت پەیوەستن بە کات‌و شوێن‌و ڕووداوێکی دیاریکراوەوە لە مەککە، یان لە مەدینە، یان لەو شوێنەی کە قورئانی لێ دابەزیوە، بەڵام وەك زانایان گوتوویانە: (إِنَّ خُصُوصَ السَّبَبِ لا يَمْنَعُ شُمُولَ الـمَعْنى)، واتە: تایبەتمەندبوونی هۆی هاتنە خوار، ڕێ لە گشتگیربوونی واتا ناگرێ .

ئنجا ئەو گاڵتە پێکەرانە کێن کە خوا دەفەرموێ: من چارەیان دەکەم، بۆ منیان لێگەڕێ، من ئەوانەت لە کۆڵ دەکەمەوە ؟!

﴿ ٱلَّذِينَ يَجْعَلُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴾، ئەوانەی لەگەڵ خوادا پەرستراوی دیکە دادەنێن، ئیعتیراف بە بەدیهێنەرایەتیی‌و پەروەردگارێتیی‌و پەرستراوێتیی خوا، دەکەن، بەڵام وێڕای خوا، پەرستراوی دیکە دەپەرستن،

﴿ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ﴾، لەمەودوا دەزانن، واتە: لەمەودوا دەزانن چییان بەسەر دێ! یان لەمەودوا دەزانن چەند بەهەڵەداچوون! کە دەگونجێ مەبەست لە: (لەمەودوا) دنیا بێ، هەر لە ژیانی دنیادا بۆیان دەردەکەوێت، یاخود مەبەست پێی ڕۆژی دوایی بێت، هەردووکیان دەگرێتەوە .

﴿ وَلَقَدۡ نَعۡلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدۡرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴾، بە دڵنیاییەوە ئێمە دەزانین، کە تۆ سینەت تەنگ دەبێ بەوەی دەیڵێن .

پێغەمبەر خاتەم موحەممەد ﷺ وەك هەر مرۆڤێکی دیکە، مرۆڤ بووە، قسەی خۆشی پێ خۆش بووەو، قسەی ناخۆشی پێ ناخۆش بووە، بەڵکو ئینسانی بەرێزو بە حورمەت، قسەی ناخۆشی لە خەڵکی دیکە، پێناخۆشترە چونکە نە قسەی ناخۆش بە خەڵکی دەڵێ‌و، نە چاوەڕێی قسەی ناخۆشیش دەکات، لەبەر ئەوە: قسەی ناخۆش، توانج‌و پلار، پڕوپاگەندەی خراپ، تانەوتەشەر، قسەی ناشیرین پێگوتران، تۆمەتبارکردنی بە ناهەق، زۆر لەسەر دڵی قورس دەبێ، خوا دەفەرموێ : ئێمە دەزانین، تۆ سینەت تەنگ دەبێت، بەهۆی ئەوەوە کە دەیڵێن .

﴿ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ ٱلسَّـٰجِدِينَ ﴾ بۆ ئەوەی کە بتوانی بەرهەڵستیی ئەو قسە ناخۆشانە بکەی‌و، سینەت فراوانتر بێ: بە ستایشکردنەوە پەروەردگارت بە پاك بگرە، واتە: بە پاکی بگرەو دووری بخەوە لە کەموکوڕیی‌و هەڵەو پەڵە، کە بۆخۆی هەر دوورو پاکە، بەڵام تۆ ئەو حاڵەتە لە خۆتدا پێشان بدە، ئەگەرنا، خوای پاك‌و بێگەرد، ئەگەر کەسیش بە پاکی نەگرێ، هەر پاك‌و بێگەردەو، ئەگەر کەسیش ستایشی نەکات، هەر شایستەی ستایشە، بەڵام ئەوە مرۆڤەکانن ، کە دەبێ لە دڵ‌و دەروونی خۆیاندا ، پاکێتیی‌و دووریی خوا ، لە کەم‌وکوڕیی‌و هەڵەو پەڵەکان، بچەسپێنن، هەروەها ستایشکردن‌و مەدح‌و پێهەڵگوتنی خوا لە دڵ‌و دەروونیاندا، جێ دەکەنەوە، ئەگەرنا، ئەگەر ئەوانیش تەسبیح‌و تەحمیدی خوا نەکەن، خوا هەر پاك‌و بێگەردەو، هەر ستایشکراو (حَمِيد)و شکۆدار (مَجِيد)ە .

﴿ وَكُن مِّنَ ٱلسَّـٰجِدِينَ ﴾، تۆ لە کڕنووش بەران بە، واتە: بە ستایشکردنی خواوە، بە پاکی بگرەو، زۆریش کڕنووش (سجدة) بۆ خوا بەرە، کە بێگومان لێرەدا مەبەست لە : (کرنووش بەران بە)، واتە: زۆر نوێژکەری باشبە، بە شێوەیەك

سیفەتی نوێژکردن، تۆ بباتە نێو جەرگەی نوێژکەرانەوە، کە ئەوە بەهێزترە لەوەی فەرموویای: (وَكُنْ سَاجِداً)، یان (وَاسْجُدْ)، کە لە شوێنی دیکەشدا ئەوانە هاتوون، بەڵام ئەم حاڵو مەقامەی ئێرە، ئەوە دەخوازێ، کە خوای پاكو بێگەرد بەم شێوەیە بیدوێنێ، واتە: تۆ بەهۆی بە پاکگرتنی خوای پەروەردگارو بەهۆی ستایشکردنیەوەو، بەهۆی زۆر کڕنووش بردنو نوێژو تاعەت ئەنجامدانەوە بۆ خوای پاكو بێگەرد، سینەت فراوانتر دەبێو، دڵ گەورەتر دەبێو، زیاتر دەتوانی بەرهەڵستیی ئەو شێوە ناشایستە مامەڵەکردنەی کافرەکان لەگەڵت دا، تەحەممول بکەیو، لە بەرانبەریدا خۆڕاگربی .

لە کۆتاییدا دەفەرموێ : ﴿ وَٱعۡبُدۡ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأۡتِيَكَ ٱلۡيَقِينُ ﴾، واتە: پەروەردگاری خۆشت بپەرستە، تاکو یەقینت بۆ دێ .

هیچ گومانی تێدانیە کە (یقین) لێرەدا مەبەست مردنە، چونکە ئەگەر بەپێی مانا زمانەوانییەکەی بووایە، واتە: زانیارییەکی تەواو، کە دڵ لەسەری بوەستێ، عەقڵ لەسەری بوەستێو بەملاولادا نەچێ، دەگوترێ: (يَقَنَ الماءُ، أيْ: ثَبَتَ وَرَكَدَ)، واتە: ئاوەکە وەستا، ئەگەر مەبەست ئەوە بووایە، بە دڵنیایی هەر لە هەنگاوی یەکەمەوە، پێغەمبەری خاتەم ﷺ یەقینی هەبووەو دڵنیا بووە ، کە پێغەمبەری خوایە، دڵنیا بووە کە ئەو فریشتەیەی وەحیی بۆ دێنێ (جیبریل): نوێنەری خوایە، هەروەها دڵنیا بووە لە هەموو ئەو ڕاستییانەی کە بوونناسیی ئیسلامییو، ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی، گرتوویانن خۆیان، کەواتە: لێرەدا مەبەست دڵنیایی نیە، چونکە دڵنیایی هەر هەبووەو، پێویستیی بەوە نەکردوە، کە زیاتر بەندایەتیی بۆ خوا بکات، خواپەرستیی زیاتر بکات، تاکو دڵنیایی بۆ بێت! بەڵکو دڵنیاییەکەی هەر هەبووە، بۆیە (یقین) لێرەدا، واتە: مردنێك کە لێی دڵنیای هەر دێ، هەڵبەتە لە سوورەتی (المُدثّر)یشدا، خوای پەروەردگار هەر وشەی یەقینی بە مانای مردن بەکارهێناوە، وەك لەسەر زمانی کافران دەفەرموێ: ﴿ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ ٤٦ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلۡيَقِينُ ٤٧ ﴾المدثر، واتە: ئێمە بڕوامان بە ڕۆژی سزاو پاداشت نەبوو، بە درۆمان دەزانی، تاکو یەقینمان بۆ هات، واتە: مردنمان بۆ هات، چونکە هیچ کەس گومانی نیە لە مردندا، کە دێ .

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم :** ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە، كە خوای كاربەجێو پاكو بێگەرد، ئاسمانەكانو زەویو ئەوەی نێوانیانی، بە هەق هێناونە دیو، ڕۆژی دوایش هەر دێ، بۆیە پێویستە پێغەمبەر ﷺ بە سینگ فراوانیی لێبوردەییەكی جوانەوە . مامەڵە لەگەڵ خەڵكدا بكات بە گشتیو . نەیارو نەحەزەكانی بە تایبەت :

خوا تبارك و تعالى فەرموویەتی : ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۗ وَإِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَءَاتِيَةٌ ۖ فَٱصْفَحِ ٱلصَّفْحَ ٱلْجَمِيلَ ﴿٨٥﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨٦﴾ ﴾ .

شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە موبارەكە ، لە چوار بڕگەدا:

**بڕگەی یەكەم :** - ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴾، واتە: ئێمە ئاسمانەكانو زەویو، ئەوەی دەكەوێتە نێوانیانەوە، بە هەق نەبێت نەمانهێناونە دی، یاخود: ئێمە ئاسمانەكانو زەوی، ئەوەی نێوانیان، تەنیا بە هەق دروستمان كردوونو، بە قەدەر نووكی دەرزیی ناهەقیو پووچیو بێ حیكمەتیی لە دروستكراوی خوادا نیە .

وەك خوای پاكو بێگەرد لە شوێنی دیكەدا دەفەرموێ :

١/ ﴿ صُنۡعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ أَتۡقَنَ كُلَّ شَيۡءٍۚ ﴿٨٨﴾ ﴾النمل، واتە: دروستكراوی خوا، كە هەمووی شتێكی زۆر بە وردەكاریی هێناوەتە دی .

٢/ هەروەها دەفەرموێ : ﴿ ٱلَّذِيٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥۖ ﴿٧﴾ ﴾السجدة، واتە: (خوا) كەسێكە هەر شتێكی دروستیكردوە، زۆر بە چاكیی دروستیكردوەو بە باشترین شێوە دروستی كردوە.

٣/ هەروەها دەفەرموێ : ﴿ مَّا تَرَىٰ فِي خَلۡقِ ٱلرَّحۡمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٖۖ ﴿٣﴾ ﴾الملك، واتە: لە دروستكراوی (خوای) بە بەزەییدا، نارێكیی نابینی، كەموكوڕیی نابینی .

لێرەدا دەڵێم ستایش بۆ خوا :

ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (یونس)دا، باسێكی فراوانمان لەوبارەوە كردوە، كە خوای پاكو بێگەرد، ئەم گەردوونەی بە سەروو خوارەوە، بە ئاسمانو زەوییەوە، بە حیكمەتو هەق هێناوەتە دی، پوختەی مەبەستیش لە وشەی (حق) ئەوەیە كە گەردوون بۆ تێدا تاقیكرانەوەی جندو مرۆڤان هێنراوەتە دی، كە ئەمە لە سووڕەتی (الجاثِیَة)دا، خوا زۆر بە ڕوونیی ڕایگەیاندوە، وەك دەفەرموێ : ﴿ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّ وَلِتُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾، واتە: خوا ئاسمانەكانو زەوی بە هەق هێناونە دیو، بۆ ئەوەی هەر كەسە، بە پێی ئەوەی كە كردوویەتی، سزاو پاداشت بدرێتەوە، لە حاڵێكدا كە هیچ جۆرە ستەمێكیان لێناكرێت .

ئنجا ئێمە لەو باسەدا كە لە سووڕەتی (یونس)دا كردوومانە، زیاتر لە پازدە (١٥) ئایەتمان هێناون، لە پازدە (١٥) شوێندا، كە خوا ﷻ ئەم ڕاستییە دووبارە دەكاتەوە هەڵبەتە هەر ڕاستییەك، لە یەك ئایەتو لە یەك شوێن لە قورئاندا، لە یەك ڕستەی فەرمایشتی خوادا، بێ، بەسە بۆئەوەی بزانین: ئەوە ڕاستییەكە ، خوا ڕایگەیاندوە، ئەدی ئەگەر ڕاستییەك، بە پازدە (١٥) شێوازی دەربڕین، لە پازدە (١٥) شوێندا، لە پازدە (١٥) ئایەتدا، بێ ! بێگومان بە ئەندازەی دووبارەبوونەوەی : ئەو ڕاستییە گرنگو بایەخی هەیە .

**بڕگەی دووەم:** - ﴿ وَإِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَأٓتِيَةٌ ﴾، واتە: بێگومان (سَاعَة) هەر دێ، وشەی (سَاعَة) وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا، لە بەکارهێنانی قورئاندا، زیاتر بۆ ئەو کاتەی کە دنیا تێیدا کۆتایی دێ، بەکارهاتووە، بۆیە ئێمە بە (ئاخیر زەمان) مانامان کردوە، لە زۆربەی شوێنەکاندا، وشەی (سَاعَة) بۆ ئەو کاتە دیاریکراوە بەکاردێ، کە دنیای تێدا کۆتا دێ، واتە: ئاخیر زەمان، کۆتایی هاتنی ژیانی دنیا، بەلام لێرە، لەم سیاقەدا ئەوە گونجاوترە کە بگوترێ: (سَاعَة) مەبەست پێی ئەو کاتەیە کە ڕۆژی دوایی تێدا دێ، واتە: هەلسانەوەو زیندووکرانەوە (قیامة و بعث)و سزاو پاداشتی تێدا دێ، چونکە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَأٓتِيَةٌ ﴾، ئەمە زەمینە خۆشکەرە بۆ ڕستەی دوایی کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱصْفَحِ ٱلصَّفْحَ ٱلْجَمِيلَ ﴾، ئنجا لێبوردن و چاوپۆشییەکی جوان ئەنجام بدە، لەگەڵ ئەو بێبڕوایانەدا، کە دڵت دەئێشێنن، لاملیی و سەرپێچیی دەکەن، یاخود گاڵتەت پێدەکەن و ناوو ناتۆرەی خراپت بەدوا دەخەن، مادام قیامەت دێ، ڕۆژی دوایی دێ، کە ڕۆژی سزاو پاداشت و حیسابە، تۆ لێرەدا بەو شێوەیەی کە بۆ تۆ شایستەیەو، بۆ بەرنامەکەت شایستەیەو، لە نوێنەری خوای پەروەردگار دەوەشێتەوە، ئاوا مامەڵە بکە، حیساب و کتاب و لێپرسینەوەو سزاو پاداشتی مرۆڤەکان، عایدی خوایەو، لە کاتێکی دیکەدا دێ، نەك لەم ژیانە دنیاییە کاتییەدا .

**بڕگەی سێیەم:** - کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱصْفَحِ ٱلصَّفْحَ ٱلْجَمِيلَ ﴿٨٥﴾ ﴾، بە شێوەیەکی جوان چاوپۆشی بکە .

وشەی (صَفْحُ) مانایەکەی ئەوەیە: کەسێك کە هەڵەیەکی بەرانبەر کراوە، لاملی لەو کەسە بکات، ئنجا کە لاملی تێکرد، وەك هەر نەیدیبێ، وایە .

لە زمانی کوردیس دا: ئێمە وشەی (عَفُو) بە لێبوردن مانا دەکەین، وشەی (صَفح) بە چاوپۆشیی، واتە: نەك هەر لێیان ببوورە، بەڵکو هەر نادیدەیان بگرە ئەو قسەیەی بەرانبەر بە تۆی دەکەن، ئەو شێوازە ناشایستەیەی بەرانبەر تۆ پێشانی دەدەن، ئەو ڕەفتارە، ئەو تەعبیرە نارێکانە، وابزانە هەر

نەیانکردوە، هەر خۆتی بە سەرەوە مەبە، چونکە ئەگەر کەسێك لاملی لە کەسێك کرد، نایبینێ .

تۆش وابزانە ئەو قسەیان هەر نەکردوە هەر لە بیر خۆتی بەرەوە، ئنجا لێرە سیفەتی جوان (جَمِیل)یشی دەخاتە پاڵ ﴿ فَٱصۡفَحِ ٱلصَّفۡحَ ٱلۡجَمِيلَ ﴾! لە شوێنێکی دیکە دەفەرموێ : ﴿ فَٱصۡفَحۡ عَنۡهُمۡ وَقُلۡ سَلَٰمٞۚ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ٨٩ ﴾ الزخرف . واتە: چاوپۆشییان لێبکەو بڵێ : سەلام، لەمەودوا دەزانن، بەلام لێرەدا دەفەرموێ : ﴿ فَٱصۡفَحِ ٱلصَّفۡحَ ٱلۡجَمِيلَ ٨٥ ﴾، واتە: چاوپۆشییان لێبکە، بەلام چاوپۆشییەکی جوان، ئەمە ماناکەی زۆر تۆختره بە قوەتتره واتە: بە شێوەیەك مامەڵەیان لەگەڵ بکە، وەك ئەو قسە ناشیرینانەت هەر نەبیستبن لێیانەوە، ئەو رەفتارو کردارە ناشیرینانەت هەر لێیان نەبینیبن، ئەویش لەبەر چەند حیکمەتێك :

یەکەم: بۆ ئەوەی بیانوویان ببڕی، چونکە جاری وایە، ئەگەر قسەیەکی زبرو توند بەرانبەر کەسێك بکەی، ئەو قسەی زبرو توندەت دەکاتە بیانوویەك، کە هەقەکەت لێ وەرنەگری، بۆیە پێویستە بیانوویان ببڕی .

دووەم: ئەرکی خۆت بە باشترین شێوە ئەنجام بدەی، بێگومان پێغەمبەری خاتەم ﷺ هەر ئەوەی لێوەشاوەتەوە، کە خۆی بە باشترین سیفەتو خەسڵەت برازێنێتەوەو، باشترین هەڵوێستو ئاکار لە خۆیدا بەرجەستە بکات .

سێیەم: ئاوێنەیەکی جوانی ئایینەکەشت بی، ئایینەکەی تۆ هەر رێزو حورمەتو نەزاکەتو باشیی و پەسندیی لێ چاوەڕێ دەکرێ .

چوارەم: نوێنەرێکی باشی پەروەردگاریشت بی، خوای پەروەردگار هەر ئەوە شایستەیەتی ، کە نوێنەرەکەی بە باشترین شێوە نوێنەرایەتیی بکات، ئنجا خوای بەرزو مەزن ، خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزو پەسندو جوانە، نوێنەرەکەشی دەبێت لە قەدەر خوا بێ و، لە قەدەر ئایینە ڕاستو تێرو تەواوەکەی بێ .

**برگەی چوارەم :** - ﴿ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلۡخَلَّٰقُ ٱلۡعَلِيمُ ﴾، واتە: بێگومان هەر پەروەردگارت زۆر بەدیهێنەرەو، زۆریش زانایە .

(خَلّاق) صیفە موبالەغەی (خَالِق)ە، وشەی (خَالِق)، واتە: بەدیهێنەر، (خَلّاق)، واتە: زۆر بەدیهێنەر، واتە: زۆر شتان بەدی دێنێ و، پەیدا دەکات، ئنجا پەروەردگارێك وا بێ، واتە: بتوانێ هەموو شتێك بەدی بێنێ، دروستی بکات، لە نەبوونەوە بیهێنێتە بوونەوەو زۆریش زانا بێ، کەواتە: سزاو پاداشتی مرۆڤەکان هەر عایدی ئەوە، خۆی دەزانێ چۆنیان سزا دەدا، لەسەر خراپەکانیانو، پاداشتیان دەداتەوە، لەسەر چاکەکانیان.

**مەسەلەی دووەم :** مادام خوا حەوت (٧) ئایەتە دووبارەبووەوەکانو قورئانی مەزنی پێداوی، چاو مەبڕە زرق و برق و نازو نیعمەتی دەستی هەندێك لە بێبڕوایانو، خەمیان لێ مەخۆو، ئاگاداری بڕواداڕانی ڕەش و ڕووت بەو، لەگەڵیان میهرەبان بە :

وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَٰكَ سَبۡعٗا مِّنَ ٱلۡمَثَانِي وَٱلۡقُرۡءَانَ ٱلۡعَظِيمَ ٨٧ لَا تَمُدَّنَّ عَيۡنَيۡكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ٨٨ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە موبارەکە ، لە پێنج برگەدا:**

**برگەی یەکەم :** - ﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَٰكَ سَبۡعٗا مِّنَ ٱلۡمَثَانِي وَٱلۡقُرۡءَانَ ٱلۡعَظِيمَ ﴾، بە دڵنیاییەوە ئێمە حەوت لە دووبارەبووەکان و، قورئانی مەزنمان بە تۆ داوە .

وشەی (مَثَانِي):

١/ یان کۆی (مَثْنى)یە، کە (اسْمُ مَفْعُولٍ مُشْتَقٌّ مِنْ ثَنَى، إِذَا كَرَّرَ)، ناوی مفعول)ە، وەرگیراوە لە (ثَنَى)، واتە: نوشتانلدیەوە، یان دووبارەی کردەوە .

٢/ یان کۆی (مَثْناة) کە ئەویش لە ناوی (إِثْنَيْن) وەرگیراوە، (إِثْنَيْن) واتە: دووان، ئەویش یەکێکەو دووبارە دەبێتەوەو دەبێتە دوو .

٣/ یان کۆی (مُثَنًّى) یە یانی : دووان .

٤/ دەشگونجێ (مَثَانِي) کۆی (مَثْنَى) بێ، ئەویش لە (ثَناء)ەوە هاتبێ، واتە: مەدح و ستایش، کەواتە: حەوت دووبارەبووەوەکان واتە: ئەو حەوت ئایەتانەی کە دووبارە دەبنەوە، یاخود ئەو حەوت ئایەتانەی کە ستایشی خوایان تێدا دەکرێ‌و، بێگومان مەبەست پێیان: حەوت ئایەتەکانی سوورەتی (الفَاتِحَة)ن، لەبەرچی ؟

لەبەرئەوەی کە (مَثَانِي) دەبێ کۆمەڵە شتێك بن، مێینەی مەجازیی (مؤنث مجازي) بن، چونکە ڕاناوی مێینەیان بۆ بەکارهاتووە، واتە: دەبێ کۆمەڵە شتێك بن ، کە بگونجێ ڕاناوی مێینەیان بۆ بەکاربێ، گوتراوە: (وَهِيَ أَشْيَاءٌ تَجْرِي تَسْمِيَتُهَا عَلَى التَّأْنِيث)، وەك (ثَوَانِي) کە کۆی (ثَانِيَة)یە، (خَبَايَا) کۆی (خَبِيَّة)یە، (خَفَايَا) کۆی (خَفِيَّة)یە، (مَثَانِي)یش کۆی (مَثْنِيَّة)یە .

ئەوانیش حەوت ئایەتەکانن: (سَبْعاً مِنَ المَثَانِي)، پاشان کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ ﴾، دیارە قورئانی مەزن، کە یادەدرێتەوە سەر (مَثَانِي)، کەواتە: دەبێ ئەو حەوت دووبارەبووەوانەش لە جینسی قورئان بن، کەواتە: حەوتەکان دەبێت حەوت ئایەتی قورئان بن، کە بێگومان مەبەست پێیان حەوت ئایەتەکانی (فَاتِحَة)یە، دەتوانین بڵێین: بەم سێ بەڵگەیە، ئەم مەسەلەیە یەکلادەبێتەوە :

یەکەم : سوورەتی (الفَاتِحَة) حەوت ئایەتن‌و دووبارەش دەبنەوە .

دووەم : ئایەتەکانی سوورەتی (الفَاتِحة)، حەوت ئایەتن خوای پەروەردگاریان پێ مەدح و ستایش دەکرێ .

سێیەم : فەرموودەی پێغەمبەری خواش ﷺ ئەوەی دیاریی کردووەو، ئەو مەسەلەی هەڵبڕیوەو یەکلای کردۆتەوە .

هەر بۆیەش شتێك کە پێغەمبەر ﷺ نوقتەی تێدا خستۆتە سەر پیت، پێم سەیرە هەندێ لە زانایان بەملاولای دیکەدا دەڕۆن! مادام پێغەمبەر ﷺ دیاریی کردوە، پێویست ناکات بەملاولادا بڕۆین، با تەماشای ئەو چەند فەرموودەیە بکەین :

١/ {عَنْ أَبِي سَعِيدِ بْنِ الْمُعَلَّى الأَنْصَارِيِّ، عَنِ النبيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: أَلاَ أُعَلِّمُكَ أَعْظَمَ سورَةٍ فِي الْقُرْآنِ قَبْلَ أَنْ أَخْرُجَ مِنْ الْمَسْجِدِ، فَذَهَبَ النَّبِيُّ ﷺ لِيَخْرُجَ مِنْ الْمَسْجِدِ فَذَكَّرْتُهُ، فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، هِيَ السَّبْعُ الْمَثَانِي وَالْقُرْآن الْعَظِيمُ الَّذِي أُوتِيتُهُ } {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ، رقم: ٤٤٢٦}.

واتە: ئەبی سەعیدی کوڕی موعەللا دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: ئایا پێش ئەوەی لە مزگەوت بچمە دەرێ، گەورەترین سوورەتت فێر بکەم؟ دەڵێ: دوایی پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت، کە لە دەرگای مزگەوت بچێتە دەرێ، منیش بیرم خستەوە، (پێی وابووە کە پێغەمبەر ﷺ لە بیری چۆتەوە)، ئەویش فەرمووی: باشترین سوورەت لە قورئاندا، سوورەتی (الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِينَ)ە، (ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان)، (واتە: ئەو سوورەتەی کە بەوە دەست پێدەکات)، ئەوە ئەو حەوت دووبارەبووەوەو قورئانە مەزنەن، کە پێمدراوە .

٢/ {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ : أُمُّ القُرآن هي السَّبْعُ المَثَاني وَالقُرانُ العَظِيم} {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ رقم: ٤٤٢٧}.

واتە: ئەبو هورەیرە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (أُمُّ القُرْآن)، {کە یەکێکە لە نازناوەکانی سوورەتی (الفَاتِحة)}، دایکی قورئان، ئەسڵی قورئان، ئەو بریتییە لە حەوت دووبارەبووەوەکان و قورئانی مەزن .

کە بە پێی ئەم دوو فەرموودەیە بێ: هەر کام لە (السَّبْعُ المَثَاني)و والقرآن العظيم) هەردووکیان سیفەتی سوورەتی (الفاتحة)ن .

٣/ {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ: أُمُّ الْقُرْآنِ، وَأُمُّ الْكِتَابِ، وَالسَّبْعُ الْمَثَانِي)}.

واتە: سوورەتی (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ) ئەسڵی قورئانو، ئەسڵی کتێبو حەوت ئایەتە دووبارەوەوەکانن .

پێشتریش گوتمان : هەندێك لە زانایان گوتوویانە : مەبەست لە (السَّبْعُ المَثَاني) حەوت سوورەتە درێژەکانن، واتە : لە (البَقَرة)وە، پێداوەرە : (آلِ عِمْرَان)و (النِّسَاءُ)و (المَائِدَة)و (الأَنْعَامُ)و (الأَعْرَاف)، ئنجا (الأَنْفَال)و (التوبة)یان پێکەوە باسکردوون .

بەلام ئێمە دەڵێین: ناگونجێ مەبەست لێرەدا ئەوە بێت، چونکە :

أ) هەموو ئەو فەرمایشتانەی پێغەمبەر ﷺ دیارییان کردوە (السبع المثاني) حەوت ئایەتەکەی (الفاتحة)ن .

ب) ئەو کاتەی سوورەتی (الحجر) هاتۆتە خوار، کە سوورەتێکی مەککەییە، جارێ ئەو حەوت سوورەتانە بۆ پێغەمبەر ﷺ دانەبەزێنراون، تاکو خوا بفەرموێ: ئەو حەوت سوورەتەم پێداوی، بەڵکو ئەو کاتە تەنها (الأَنْعَام)و (الأَعْرَاف) دابەزیبوون، لەو حەوتانە .

ج) سیفەتی (مَثَاني)، ئەگەر بە مانای (ثَناء)بن، ئەوە خاڵی هاوبەشی نێوان سەرجەم سوورەتەکانی قورئانە، بەلام ئەگەر لە : (مَثْنَى)، یان (مُثَنَّى) یان (مَثْنَاة)وە، وەرگیرابێ ، ئەوانەی کە دووبارە دەبنەوە ئەوە بێگومان ئەو سیفەتە لەو حەوت سوورەتانە دا نیە، کە رۆژانە مسوڵمانان دووبارەیان بکەنەوەو، تەنها لە سوورەتی (الفاتحة)دا ئەو سیفەتە هەیە .

**بڕگەی دووەم :** - ﴿ لَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ ﴿٨٨﴾ ﴾، واتە: چاو مەبڕە ئەوەی كۆمەڵانێك لەوانمان لێ بەهرەمەند كردوە، ئەو زرق و برق و سەروەت و سامانەی، كە هەندێك لە كافرانمان لێ بەهرەمەند كردوە، چاوی تێمەبڕە پێی سەرسام مەبە، پێت شتێكی گەورەو گرنگ نەبێ .

وشەی (أَزْوَاجاً مِنْهُم)، دەگونجێ مەبەست لە (أَزْوَاج)، (أَصْنَاف) بێ، یانی : چەند كۆمەڵێكیان، چەند كەسانێكیان، دەشگونجێ مەبەست چەند جووتێك بێ، یانی: چەند ژن و مێردێك، چەند ماڵێك لەوانمان لێ بەهرەمەند كردوە .

**بڕگەی سێیەم :** - ﴿ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ ﴾، واتە: خەفەتیان لێ مەخۆ، بەهۆی بڕوا نەهێنانیانەوە پەژارەدار مەبە، هەڵبەتە پێغەمبەر ﷺ زۆر خەمی لێخواردوون و پەرۆشی بوون، بۆیە خوای پاك و بێگەرد هەم لێرە هەم لە زۆر جێی قورئاندا، بە پێویستی زانیوە ئەوەندە جەخت بكاتەوە، لە پێغەمبەر ﷺ كە زۆر خەمیان لێ نەخوات و پەرۆشی نەبێ، ئنجا ئەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ فەزیلەتێكەو سیفەتێكی بەرز و گەورەی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، كە زۆر خەمی لێخواردوون، زۆر پەرۆشی ئەو خەڵكەی بووە، بە رادەیەك كە پێویستی كردوە خوای پاك و بێگەرد بفەرموێ: لێیانگەرێ ئەوەندە خەمیان لێ مەخۆ، وەك لە سوورەتی (الشُعَرَاء)داو، لە سوورەتی (الكهف) یشدا هاتوە .

لە سوورەتی (الشُعَرَاء)دا دەفەرموێ : ﴿ لَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ أَلَّا يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾ ﴾الشعراء، واتە : ڕەنگە خۆت بفەوتێنی، لە سۆنگەی ئەوەوە كە نابنە بڕوادار لە سوورەتی (الكهف)یشدا دەفەرموێ : ﴿ فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُواْ بِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَسَفًا ﴿٦﴾ ﴾الكهف، واتە: ڕەنگە تۆ خۆت بفەوتێنی، لە خەفەتان، كە ئیمان ناهێنن .

واتایەكی دیكەی ئەوەیە: بەهۆی ئەوەوە كە دەیڵێن و، بەو جۆرەی مامەڵەی پێ دەكەن لەگەڵ تۆدا، بە شێوازی ناشایست و بێنەزاكەت، دڵ

تەنگ مەبەو خۆت نارەحەت مەکە، بەلام کە دەفەرموێ : ﴿ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ ﴾، زیاتر مانای یەکەم دەگەیەنێ، واتە: خەمیان بۆ دامەگرە ئەوەندە پەرۆشت نەبن، ئەوەندە بۆیان نارەحەت مەبە، بەهۆی بڕوا نەهێنانیانەوە .

**برگەی چوارەم :** ﴿ وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴾، بالت شۆڕکە بۆ بڕواداران .

خَفض) پێچەوانەی (رَفع)ە، واتە: بەرزکردنەوە، (خَفض)، واتە: شۆڕکردنەوە، (جَناح)یش واتە: بال، ئاشکرایە مرۆڤ بالی نیە، بەلام ئەم تەعبیرە بۆ ئەوە بەکاردەهێنرێ، کە وەك چۆن بالندەیەك بالەکانی خۆی شۆڕ دەکاتەوەو بلاویان دەکات، نەك بەخۆییانەوە بنووسێنێ، تاکو بتوانێ بەچکەکانی لە بن بالی بگرێ، تۆش ئاوا لەگەل بڕواداراندا، کە شوێنکەوتووتن، بە ڕەحمو سۆزو پەرۆش بە، لە بن بالی خۆتیان بگرە! ئەو تەعبیرەش لە کوردییدا زۆر بەکاردێ، دەلێن: فلانکەس فلانە کەسی لەبن بالی خۆی گرت، خستیە ژێر بالی خۆی، یان بالی بەسەردا شۆڕکردەوە، واتە: وەك بالندە بۆ بەچکەکانی : بالە شۆڕەیان بۆ بکەو ئاگات لێیان بێت .

**مەسەلەی سێیەم :** خوا فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکات، کە بلێ: من ترسێنەرێکی ئاشکرام، لە سزایەك لە لایەن خوداوە، وەك ئەوەی دابەزاندە سەر (مُقْتَسِمِین)، واتە: سوێندخۆرەکان، پەیمان پێکەوەدەرەکان، دابەشکەرەکانی قورئان، دابەشکەرەکانی کولانەکانی مەککە :

خوا فەرموویەتی : ﴿ وَقُلْ إِنِّىٓ أَنَا ٱلنَّذِيرُ ٱلْمُبِينُ ﴿٨٩﴾ كَمَآ أَنزَلْنَا عَلَى ٱلْمُقْتَسِمِينَ ﴿٩٠﴾ ﴾.

شایانی باسە: شیکردنەوەی واتای ئەم دوو ئایەتە موبارەکە، پێویستیی بە نەفەسێکی درێژ دەکات :

ئایەتی یەكەم : ﴿ وَقُلْ إِنِّىٓ أَنَا ٱلنَّذِيرُ ٱلْمُبِينُ ﴿٨٩﴾ ﴾، بڵێ: من ترسێنەرێكی ئاشكرام، ترسێنەرێكی ڕوونم، یانی: من ترساندن و ئاگاداركردنەوە ئەركمەو ئەوەی ئەركی منە، بریتیە لە ترساندن و وریا كردنەوەو هۆشیار كردنەوەیەكی ڕوون و ڕاشكاو .

ئەمە مەبەست پێی ئەوەیە، كە ئەی بێبڕواینە !

ئەگەر ئێوە بڕواتان نەهێناو لەسەر لاملیی و پشت تێكردنی خۆتان، لەسەر سەرپێچیكردنی خۆتان، لە پەیام و هیدایەتی خوا، بەردەوام بوون، ئەوە ئەركی من نیە، ئێوە هیدایەت بدەم و، بتانخەمە سەر ڕاستە ڕێ، ئەركی من تەنیا ئەوەیە، كە هۆشیارتان بكەمەوەو، ئاگادارتان بكەمەوەو، بتانترسێنم، من ترسێنەرێك و ریاكەرەوەیەكی ڕوون و ڕاشكاوم و، ئەوەش ئەركی منە .

ئایەتی دووەم : ﴿ كَمَآ أَنزَلْنَا عَلَى ٱلْمُقْتَسِمِينَ ﴿٩٠﴾ ﴾، وەك چۆن دامانبەزاندە سەر دابەشكەران (مُقْتَسِمِين) .

ئەم (مـا)یـە، كـە دەفـەرموێ: (كَمَـا) یـانی: (مِثْـلَ مَـا)، (مَـا) دەگونجـێ مَوْصُولـة) بـێ، یـانی: (كَالَّـذِي أَنْزَلْنـاهُ عَلَـى الْمُقْتَسِمِين)، وەك ئـەوەی كـە دامانبەزانـدە سـەر (مُقْتَسِمِين) .

دەشگونجـێ (مَـا)، (مَصْـدَرِيَة)بـێ، یـانی: (كَالإِنْزَالِ الـذِي فَعَلْنَـاهُ مَـعَ الْمُقْتَسِمِن)، وەك ئـەو دابـەزاندنـەی كـە دامانبـەزاند سـەر (مُقْتَسِمِين)، هـەر چۆنێكی بێ، ئـەم (مَـا)یـە، دەبێتـە (مُشَبَّهٌ بِهِ)، وێچوێنـراو، شـتێك تەشبیه كراوە بـە دابـەزانـدن، ئنجـا مانـای ئـەم ئایـەتـە چـەند ئـەگـەرێكی هـەن :

١) دەگونجێ مەبەست لە (مُقْتَسِمِين) خەڵكی شاری مەككە بێ :

یـانی : (أُنْذِرُكُم كَإِنْذَارِ الَّذِينَ قَسَّمُوا الْقُرْآنَ)، دەتانترسێنـم وەك ئـەو ترساندن و ریاكردنەوەیە، كە ئاڕاستەی دابەشكەرانی قورئان كرا، ئنجا ئایا ئەوانە چۆنیان قورئانیان دابەش كردبوو ؟

أ ـ هەندێكیان دەیانگوت : جادووە .

ب ـ هەندێکیان دەیانگوت : قسەی کاهینانە .

ج ـ هەندێکیان دەیانگوت : شیعرە .

د ـ هەندێکیان دەیانگوت : ئەفسانەی پێشینان (أَسَاطِيرُ الأَوَّلِين)ە .

ئەوە ئەگەر مەبەست پێی خەڵکی شاری مەککە بێ .

٢) دەگونجێ مەبەست جوولەکەو نەصرانییەکان، یان بەگشتی خاوەن کتێبەکان، بن، کە ئەوانیش بەشێك لە قورئانیان بڕوا پێدەهێنا، ئەوەی لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیاندا دەگونجا، یان لەگەڵ کتێبە تێکدراوەکەی خۆیاندا دەگونجاو، بەشێکیشی بڕوایان پێ نەدەهێنا .

بەڵام مانای یەکەمیان بەهێزترە .

٣) یاخود وشەی (مُقتَسِمِين) دەگونجێ مەبەست پێی ئەو کافرانە بێ، کە لە بەینی خۆیاندا ڕێککەوتبوون کە کۆڵانەکانی مەککە، گەڕەکەکانی مەککە، دابەش بکەن: فڵانکەس تۆ لە فڵانە گەڕەکە بە، با ئەویش لە فڵانە گەڕەکە بێ و، ئەوی دیکە لە فڵانە گەڕەکە ... هتد، بۆ دژایەتیی پێغەمبەر ﷺ .

٤) یاخود (مُقْتَسِمِين)، واتە: ئەوانەی سوێندیان پێکەوە خواردوە، یان پەیمانیان پێکەوەداوە، کە ئەوەش دوو ئەگەری هەن :

یەك : دەگونجێ مەبەست پێی زلەزلەکانی شاری مەککە بێ، کە پەیمانیان پێکەوە دابووو، سوێندیان بۆ یەکتری خواردبوو، لەسەر دژایەتیی پێغەمبەر ﷺ و پەیامەکەی .

دوو : دەگونجێ مەبەست پێی ئەو نۆ (٩) کەسە تێکدەرەی گەلی (ثَمُود) بن، کە چەند ئایەتێك لەمەوپێش، خوا بەسەرهاتی گەلی (ثَمُود)، (أصحاب الحجر)ی بەیان کردو فەرمووی : ﴿ وَلَقَدْ كَذَّبَ أَصْحَٰبُ ٱلْحِجْرِ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٨٠﴾ وَءَاتَيْنَٰهُمْ ءَايَٰتِنَا فَكَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴿٨١﴾ ﴾، کە پێشتر تەفسیرمان کردن، چونکە :

خوای پاك و بێگەرد لە سووڕەتی (النمل)دا، باسی ئەوە دەكات كە لە نێو گەلی (ثَمُود)دا، نۆ (٩) كەسی تێكدەر هەبوون، دەفەرمووێ : ﴿ وَكَانَ فِي ٱلْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿٤٨﴾ قَالُوا۟ تَقَاسَمُوا۟ بِٱللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِۦ مَا شَهِدْنَا مَهْلِكَ أَهْلِهِۦ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾.

واتە: لە شارەكەدا نۆ (٩) كەسی خراپەكار هەبوو، كە هەر تێكدانیان لە زەویدا دەكردو چاكسازییان نەدەكرد، گوتیان: وەرن لە بەینی خۆتاندا سوێند بخۆن، پەیمان پێكەوە بدەن، كە صالح و خێزانەكەی بە شێوەیەك لە بەین بەرین، دواتر بە سەرپەرشتیارەكەی بڵێین: ئاگامان لە لەبەین چوونی خێزانەكەی نەبووە ئێمە لە ڕاستانین .

{واتە: مەبەستمان ئەوە نەبووە ماڵو خێزانەكەی بفەوتێنین، ئنجا ئەگەر سوێندیشی لەسەر بخۆین، سوێندمان لێناكەوێ، چونكە ئێمە مەبەستمان كوشتنی صالحە، بەلام با ماڵو خێزانەكەشی بەویەوە بفەوتێن} وەك پێشتر باسمان كرد، واتە: ئەی كافرەكانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ ئێوە دەترسێنم و وریا دەكەمەوە لە سزایەك وەك ئەو سزایەی كە دامانبەزاندە سەر ئەوانەی كە سوێندیان خوارد بوو، سوێند خۆری یەكدی بوون، پەیمانیان پێكەوە دابوو، لە دژایەتییكردنی صالح و پەیامەكەی دا .

٥) واتایەكی دیكەی ئەوەیە كە: (الـمُقْتَسِمِين) مەرج نیە مەبەست پێی ئەوانە بێ، كە قورئانیان بەش بەش كردبوو، بەڵكو دەگونجێ مەبەست پێی ئەوانە بێ، لە گەلانی پێشوو كە وەحیی پەروەردگاریان بەش بەش كردوە، واتە: وەك چۆن سزامان دابەزاندە سەر گەلە پێشووەكان، كە پەیامی خوا، كتێبی خوێنراوەی خوایان دابەزیبووە سەر، كەچی بەش بەشیان كرد، بڕوایان بە هەندێكی هێناو ، بڕوایان بە هەندێكی نەبوو، یاخود ئەوانیش ئەو وەحییەی بۆ پێغەمبەرانی خۆیان دەهات، بە جادوویان لە قەڵەم دەدا، بە شیعریان لە قەڵەم دەدا، بە ئەفسانەیان لە قەڵەم دەدا، وەك چۆن ئەوانەمان سزادا، ئێوەش دەترسێنم بە سزایەكی شێوەی، ئەوە كە ئەو گەلە پێشووانەمان پێ سزا داون .

چونکە وشەی قورئان، وێڕای مانا باوو عورفییەکەی : کە قورئانی ئیسلامە، خوێنراوە دێو، بە مانای خوێندنەوەش دێ، چونکە ئایەتی دوایش کە دەفەرموێ : ﴿ ٱلَّذِينَ جَعَلُواْ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ ﴿٩١﴾ ﴾، ئەوانەی قورئانیان بەش بەش کرد، ئنجا قورئان وەك چۆن دەگونجێ مەبەست پێی ئەو کتێبە خوێنراوە بێ، کە بۆ پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ هاتوە، دەشگونجێ مەبەست پێی ئەو کتێبانە بێ، ئەو وەحیی‌و پەیامانە بێ، کە پێغەمبەرانی پێشوو خوێندوویانەتەوە، چونکە وشەی قورئان دوایی بە شێوەی عورف‌و باو، بووە بە ناوی عەلەم، بۆ ئەو وەحییە موبارەکەی کە بۆ پێغەمبەری خاتەم هاتوە وەك چۆن وشەی (کتاب)یش بە هەمان شێوە بووە، (کتاب) واتە: کتێب، کتێبێك کە نووسراوەتەوە قورئانیش واتە: دەقێکە خوێندراوەتەوە، دەخوێنرێتەوە ئنجا بێگومان تەنیا قورئان نەنووسراوەتەوەو، تەنیا قورئانیش نەخوێنراوەتەوە بەڵکو دوایی وەك مانای عورفیی، وشەی (قرآن)و (کتاب) تایبەت کراون بە پەیامەکەی پێغەمبەر (محمد)ەوە ﷺ، هەروەك وشەی: (مُسْلِمِين)، (مُسْلِمون)، بە مانای ملکەچان دێ، ئنجا خۆ تەنیا مسوڵمانانێك کە بڕوایان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ هێناوە، بۆ خوا ملکەچ نەبوون، شوێنکەوتووانی پێغەمبەرانی دیکەش هەموویان بۆ خوا ملکەچ بوون، بەڵام دوایی وەك بەکارهێنانێکی عورف‌و باو، وشەی (مُسْلِمِين) کراوە بە نازناو بۆ شوێنکەوتووانی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ .

ئێستاش بۆ ئەوەی ماناکە ڕوونتر بێ، دەڵێین :

دەگونجێ وشەی : (مُقْتَسِمِين) سێ واتای هەبن :

<u>یەکەم</u> : دابەشکەران :

ئەویش سێ واتای هەن :

١ - دابەشکەران بۆ قورئان . کە قورئانیان پۆلێن‌و بەش بەش کردوە بۆ چەند جۆرێك .

٢ - دابەشکەران بۆ کۆڵان‌و گەڕەکەکانی شاری مەککە، کە کافرەکان لە بەینی خۆیاندا بەشیان کرد بوو، کە هەر کامێکیان عایدی کۆڵانێك‌و

گەڕەکێك بێ، تاکو ئەگەر خەڵك هات، ئاگاداری بکەنەوە لە پێغەمبەر ﷺ، یاخود هەر کەسێك گەڕەکی خۆی عاید بێ، بۆ ئەوەی ئاگای لە خەڵکەکە بێ، بە دوای پێغەمبەری خاتەم نەکەوێ ﷺ .

■ - دابەشکەران بۆ کتێبی خوا بە گشتی، ئەو وەحییەی خوا بۆ پێغەمبەرانی ناردوە، دابەشیان کردوە، پۆلێنیان کردوە .

**دووەم** : دەگونجێ مەبەست لە (المُقتسمِین) سوێند خۆران و پەیمان پێکەوەدران بێ :

أ) ئەوانەی سوێندیان بۆ یەکدی خواردوەو پەیمانیان پێکەوە داوە کە دژایەتیی قورئان بکەن و دژایەتیی موحەممەد بکەن ﷺ، لە خەڵکی شاری مەککەو دەوروبەری .

ب) یاخود ئەوانەی پێکەوە پەیمانیان دابوو، سوێندیان بۆ یەکدی خواردبوو، کە دژایەتیی پێغەمبەران بکەن، هەر کام لە کۆمەڵگاکان بۆ پێغەمبەری خۆیان .

**سێیەم** : یاخود ئەوانە پەیمانیان پێکەوە دابوو، سوێندیان بۆ یەکدی خواردبوو، کە دژایەتیی صالِح و پەیامەکەی بکەن، لە گەلی (ثَمود) .

هەروەها وشەی (أَنْزَلْنا)ش، دیسان دەگونجێ مەبەست پێی :

أ- ناردنی کتێب و وەحیی بێ .

ب - دەشگونجێ مەبەست پێی ناردنی سزا بێ .

ئنجا ئەگەر مەبەست پێی ناردنی کتێب و وەحیی بێ، ئەوە باسمان کرد، واتە: ئەو سوێندخۆرانەی یاخود ئەو دابەشکەرانەی کە ئێمە کتێب و وەحییمان بۆ ناردوون، لە پێغەمبەرانی پێشوو، چۆنمان وەحیی بۆ وان دابەزاندوە ئاواش پەیامەمان بۆ تۆ ناردوە حەوت ئایەتە دووبارەبووەوەکان و قورئانی مەزنیشمان بۆ تۆ ناردوە .

ئەگەر مەبەستیش لە (أَنْزَلْنا) ناردنی سزا بێ، واتە:

١/ تۆ بڵێ ئەی خەڵکینە، من ئێوە دەترسێنم، هۆشیارتان دەکەمەوە، لە هاتنی سزایەك وەك ئەو سزایەی کە دابەزیو نێردرا، رەوانە کرا، بۆ ئەوانەی

بەگشتی کتێبی خوایان بەش بەش دەکرد، یاخود لە دژی پێغەمبەران سوێندیان بۆ یەکدی دەخواردو پێکەوە پەیمانیان دەدا .

ب/ ئەی خەڵکینە ا دەتانترسێنم لە سزایەك، وەك سزای دابەزێنراو بۆ سەر گەلی ثەموود .

ئنجا زانایان و ڕوونکەرەوانی مانا و مەبەستەکانی قورئان دەڵێن: ئەو کەسانەی لە بەینی خۆیاندا، پەیمانیان پێکەوە دابوو، یان سوێندیان بۆ یەکدی خواردبوو، یاخود گەڕەك و کۆڵانەکانی شاری مەککەیان لە بەینی خۆیان دابەش کردبوون، بۆ دژایەتیی پێغەمبەر ﷺ، شازدە (١٦) کەس بوو، کە ئەمانە ناوەکانیانن :

{ ١ – حَنْظَلَة بن أَبِي سُفيان، ٢ – عُتْبة بن رَبِيعة، ٣ – شَيْبة بن ربيعة، ٤ – الوَلِيدُ بن المُغيرة، ٥ – أبُو جَهْل بن هِشام ، ٦ – العَاصُ بن هِشام، ٧ – أبُو قَيْسُ بن الوَلِيد، ٨ – قَيْس بنُ الفَاكِه، ٩ – زُهَيْرُ بن أُمية، ١٠ – هِلالُ بن عَبْد الأَسود، ١١ – السَّائِبُ بن سَفيه، ١٢ – النَضرُ بن الحَارث، ١٣ – أبُو البُخْتُري بن هِشام، ١٤ – زَمعَةُ بن الحِجَاج، ١٥ – أُمَيَّةُ بن الخَلَف، ١٦ – أَوسُ بن المُغيرة} .

هەڵبەتە ئەگەر مەبەست لە (مُقْتَسِمِين) دابەشکەرانی قورئان بێ: ئایەتی دوایی کە دەفەرموێ : ﴿ ٱلَّذِينَ جَعَلُوا۟ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ ﴿٩١﴾ ﴾، ئەوانەی قورئانیان بەش بەش کردوە، تەواوکەرو زیاتر ڕوونکەرەوەی مانا و مەبەستی (مُقْتَسِمِين)ە، کە لە ئایەتی پێش خۆیدا هاتوە .

**مەسەلەی چوارەم :** خوا سوێند بە پەروەردگارێتیی خۆی دەخوات : لەوانە دەپرسێتەوە، کە قورئانیان بەش بەش کردوە :

خوا دەفەرموێ : ﴿ ٱلَّذِينَ جَعَلُوا۟ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ ﴿٩١﴾ فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾ ﴾ .

شیکردنەوەی ئەم سێ ئایەتە بەرێزە ، لە سێ بڕگەدا:

بڕگەی یەکەم : - ﴿ ٱلَّذِينَ جَعَلُوا۟ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ ﴾، ئەوانەی قورئانیان بەش بەش کرد، (عِضِينَ جَمْعُ عِضَة، الجُزْءُ والقِطْعَةُ مِنَ الشَّيْءِ)، (عضین) کۆی (عِضَة)یە، کە بریتیە لە بەشێك و پارچەیەك لە شتێك، (وَأَصْلُها عُضْوٌ فَحُذِفَتِ الواو، وَعُوِّضَ عَنْهَا الهاءُ) وشەی (عِضَة) لە ڕیشەدا (عُضو)ە، بەڵام واوەکەی فڕێنراوەو لە جیاتی واوەکە، هاء (ه)، دانراوەو، (عُضو) کراوە بە (عِضَة) .

بڕگەی دووەم : - ﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾، سوێند بە پەروەردگارت، لە تێکڕایان دەپرسینەوە لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکەین .

هەڵبەتە لێیان دەپرسینەوە، جیایە لە لێیان دەپرسین، خوا لێیان ناپرسێ: چیتان کردوە ! لێپرسینەوە، ئەوەیە کە سزاو پاداشتی لە دوا دێ .

بڕگەی سێیەم : - ﴿ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾، لە تێکڕایان دەپرسینەوە، لە بارەی ئەوەوە دەیانکرد، لە بارەی کردەوەکانیانەوە، کردەوەکەیان کە بریتی بوو لە بەش بەشکردنی قورئان .

مەسەلەی پێنجەم : خوا فەرمان بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکات، کە بە دەنگی بەرزو زوڵاڵ پەیامی خوا بگەیەنێ و، ئازارو پیلان و هەڕەشەی هاوبەشدانەرەکان پشتگوێ بخات و، بەڵێنی پێدەدات: چارەی ئەو گاڵتە پێکەرانەی بۆ بکات، کە جگە لە خوا دەپەرستن :

خوا دەفەرموێ : ﴿ فَٱصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٩٤﴾ إِنَّا كَفَيْنَـٰكَ ٱلْمُسْتَهْزِءِينَ ﴿٩٥﴾ ٱلَّذِينَ يَجْعَلُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ ۚ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم سێ ئایەتە موبارەکە ، لە پێنج بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم :** - ﴿ فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ ﴾، بە دەنگی بەرزو زوڵاڵ ، ئەوە بگەیەنە کە فەرمانت پێکراوە .

الصَّدْعُ: الجَهْرُ وَالإعْلانُ، وَأَصْلُهُ الإنْشِقَاقُ، وَمِنْهُ: انصِدَاعُ الإنَاءِ)، (صَدْع) بریتیە لە ئاشکرا کردنو دەربڕینو ڕاگەیاندن، ڕیشەکەشی بریتیە: لە لەتبوونی شتێك، بۆ وێنە قاپ، کە کاتی خۆی ، یان قاپی شووشە بووە، یان قاپی خەزەف بووە، کە لە قوڕ دروست دەکرێو، سوور دەکرێتەوە وەك دیزەو گۆزە، کە وەختێك کە دەشکێ دەنگی لێوە دێ، واتە: دەنگ هەڵێنە، بە پەیامەکەی خۆت، بە دەنگی بەرزو زوڵاڵ ڕایبگەیەنە، لە ژێر لێوەوە مەیڵێ، کە دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەنگی بەرزو زوڵاڵ ، ئەوەی خوا فەرمانی پێکردوە، گەیاندوویەتی.

هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەم فەرمایشتەی خوا، جیاکەرەوەی قۆناغی بانگەوازی نهێنییو بانگەوازی ئاشکرایە، کە پێغەمبەر ﷺ سەرەتا فەرمانی پێکراوەو بە پەنهانیی خزمە نیزیکەکانی، ئەوانەی کە تێیڕادیتوون، ئاگاداری کردوون، بەڵام دوایی خوا فەرمانی پێکردوە کە دەنگ هەڵێنێو، بەگشتی خەڵکی لێ ئاگادار بکاتەوە :

منیش دەڵێم ، دەگونجێ ئەوە بووبێو ، دەشگونجێ هەر مەبەست ئەوە بێ : ئەی موحەممەد ئەو پەیامەی خوا کە دەیگەیەنی، بە دەنگی بەرزو زوڵاڵ، بەبێ شەرمکردنو بەبێ منەتیو زۆر بە ڕوونیی بیگەیەنەو، بەرانبەرەکانت حاڵی بکە .

**بڕگەی دووەم :** - ﴿ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴾، پشت لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بکە .

ئەهلی تەفسیر گوتوویانە: (الإعْرَاضُ عَنْ بعْضِ أحْوَالِهِم، وَلَيْسَ عَنْ ذَوَاتِهِم)، کە دەفەرموێ: پشت لە هاوبەشدانەرەکان بکە! مەبەست ئەوە نیە: هەر لێیانگەڕێ، چونکە ئەگەر لەوان گەڕێ، ئەدی کێ ئاگادار بکاتەوە؟ کۆمەڵگایەکەی هەمووی کۆمەڵگایەکی بێبڕاو ﺇ هاوبەشدانەر بووە! بەڵکو مەبەست ئەوەیە هەندێ حاڵو کارو ڕەفتاریان هەیە، پشگوێی بخە، بە تایبەت ئەوە کە قسەی ناشایستەت پێ دەڵێن، گاڵتەت پێدەکەن، ناڕەحەتت دەکەن، لەو ڕووەوە ئیهمالیان بکەو پشتگوێیان بخە .

**برگەی سێیەم :** - ﴿ إِنَّا كَفَيْنَٰكَ ٱلْمُسْتَهْزِءِينَ ﴾، ئێمە گاڵتە پێکەرانمان لە کۆڵ کردیەوە، ئێمە گاڵتە پێکەرانمان بۆ چارەسەر کردی .

خوا ﷻ لێرەدا بە کرداری ڕابردوو دەیهێنێ : ﴿ إِنَّا كَفَيْنَٰكَ ٱلْمُسْتَهْزِءِينَ ﴾ لە کۆڵمان کردیەوە، دەگونجێ ئەمە لەبەرئەوەبێ کە خوای بالادەست، شتێ بیەوێ، دەیکات، ئنجا ئەگەر لە داهاتووشدا بیکات، بە شێوەی ڕابردوو دەیهێنێ، چونکە وەك کرا بێ وایە، خوا هیچ شتێکی لێ عاسێ نابێ، یاخود: مەبەست ئەوەیە کە خوا هەندێك لە کافرەکان کە گاڵتەیان بە پێغەمبەر ﷺ کردوە، کە وەك دوایی باسی دەکەین: پێنج (٥) کەسیانی بە جۆرێکی تایبەت سزا داون، لە کۆڵ پێغەمبەری خوای کردوونەوەو، لە بەینی بردوون .

وشەی (كَفَيْنَاكَ)، (الكِفَايَةُ تَوَلِّي الكافِي مُهِمَّ المَكْفِيِّ)، (كِفَايَة) ئەوەیە کە بابای (كافِي) ئەوەی کە (مَكْفِيٌّ) بەلایەوە گرنگە، لە جیاتی ئەو بیکات .

(كِفَايَة) واتە: ئەنجامدانی کارێك لە جیاتی کەسێك، (كافِي) کەسێکە، کارێك لە کۆڵ کەسێکی دیکە دەکاتەوە، ئیشێکی لەجیاتی دەکات، چارەسەری گرفتو کێشەیەکی دەکات، دوژمنێکی لێ دووردەخاتەوە ﺇ لێرە خوا ﷻ دەفەرموێ : ئێمە گاڵتەکەرەکانمان لە کۆڵ کردیەوە، بۆمان چارە کردی .

**برگەی چوارەم :** - ﴿ ٱلَّذِينَ يَجْعَلُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ﴾، ئەوانەی کە لەگەڵ خوادا، پەرستراوی دیکە دادەنێن، پەرستراوی دیکە دەپەرستن .

**بڕگەی پێنجەم :** - ﴿ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴾، لەمەودوا دەزانن .

لەمەودا، دوو واتای هەن :

أ/ واتە : هەر لە دنیادا، لەو کاتەدا کە دێ، بۆیان دەردەکەوێ چەندە بە هەڵەداچوو بوون، بۆیان دەردەکەوێ ئەو ئیمان و ئیسلامەی تۆ بانگەشەی بۆ دەکەی، ئەو قورئانە مەزنە، کە ئەوان بە جادووی تێدەگەن، بە شیعری تێدەگەن، بە ئەفسانەی پێشینانی تێدەگەن، چەندە ڕاستە! چەندە هەقە! چۆن دەچەسپێ! چۆن بەشەریەت بەهرەمەند دەکات و بەرەو پێشی دەبات و، بەختەوەری دەکاو، گەشەی پێدەدات! لەمەودوا لە دنیادا ئەوەیان بۆ دەردەکەوێ .

ب/ ﴿ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴾، واتە: لە دوارۆژدا، لە ڕۆژی دوایی دا بۆیان دەردەکەوێ، خۆیان چەندە بەهەڵەداچوو بوون و، موحەممەد ﷺ چ ڕێیەکی ڕاستی هەبوو! موحەممەد چەندە پیاوێکی بەرزو مەزن بوو! پەیامەکەی چەندە ڕاست بوو! ئایین و ڕێبازەکەی چەندە تێرو تەواو بوو! ڕێچکەو کوێرە ڕێیەکانی ئەوانیش چەندە خراپ بوون! نەك هەر کافرەکانی مەککە، کافرەکانی هەموو ڕۆژگارەکان، بێبڕواکانی هەموو ڕۆژگارەکان، بۆیان دەردەکەوێ .

چونکە ئێمە بەڵێ، هەندێ جار، ئایەتەکان تەفسیر دەکەین، بە پێی ئەو کەش و بارودۆخەی کە قورئان یەکەم جار تێیدا دابەزیوە، بەڵام بە تەئکید وەك زۆر جار گوتوومانە: قورئان تەنیا بۆ خەڵکی مەککەو، بۆ خەڵکی نیوە دورگەی عەرەبیی، دانەبەزیوەو، بگرە تەنیا بۆ تێکرای خەڵکی ئەو ڕۆژگارەش دانەبەزیوە! بەڵکو بۆ خەڵکی هەموو دنیا بە درێژایی زەمان، بە پانایی زەمین، تاکو دنیا کۆتایی دێ، هاتووە قورئان دوا کتێبی خوایە بۆ بەندەکانی خواو، موحەممەد ﷺ دوا ڕەوانەکرای خوایە، بۆ سەرجەم مرۆڤەکان، بەڵکو بۆ تێکڕای (جینن)یش .

پێشتر باسمان کرد کە ئەوانەی گاڵتەیان بە پێغەمبەر کردوە ﷺ، هەندێك لە زانایانی شارەزای مێژووو سیرەی پێغەمبەر ﷺ گوتوویانە: پێنج (٥) کەسیان بە گاڵتەپێکەرە سەرەکییەکان، کە لە هەموویان گەورەتر بوون، داناون :

١) (الوَلِيدُ بن المُغِيرة) .

٢) (الأسودُ بن عَبْدُ اليَغُوث) .

٣) (الأسودُ بن المُطّلب) .

٤) (الحارثُ بن عَيْطَلة) او (الحارثُ بن الطَلاطِلة) .

٥) (العَاص بنُ وَائِل) .

ئنجا ئەم پێنجە، هەر پێنجیان لە شاری مەککە، یەك بە دوای یەکدا، بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر، فەوتاون، (القُرطُبي) لە (الجامع لإحكامِ القُرآن)دا[1]، بەسەرهاتی چۆنیەتی فەوتانی ئەو پێنج کەسە دێنێ، بە تەفصیلْ دەیهێنێ و لە کۆتاییەکەیدا دەڵێ :

(أهلَكهمُ الله جَمِيعا قَبْل بَدْرٍ فِي يَوم وَاحِدٍ ، لاسْتهْزائِهم برسول الله)، واتە: خوا هەموویانی پێش جەنگی بەدر لە یەك ڕۆژدا فەوتاندن، بەهۆی گاڵتەکردنیانەوە بە پێغەمبەر ﷺ، ئەو بە درێژی باس دەکات، کە یەکێکیان تووشی فلان نەخۆشییە بووەو، یەکێکیان بەو دەردە مردووەو، یەکێکیان بەو بەسەرهاتە کۆتایی پێهاتووە بەڵام بێگومان هەرچەندە هۆی هاتنە خوارەوەکەش ئەوەبێ، یان مەبەستی یەکەمیش ئەو جۆرە کەسانە بووبن، بەڵام چەمکەکەی فراوان و گشتگیرە، بۆ تێکڕای دۆستانی خواو ناحەزو دوژمنە گاڵتەکەرو بێ نەزاکەتەکانیان، لە هەموو کات و شوێنێکدا.

دەشگونجێ کە خوا دەفەرموێ : ﴿ إِنَّا كَفَيْنَٰكَ ٱلْمُسْتَهْزِءِينَ ﴾، مەبەست ئەوە نەبێ: خوا ئەو گاڵتە پێکەرانە بفەوتێنێ، بەڵکو مەبەستی ئەوەبێ، کە

---

١) ج ١٠، ص ٥١، ٥٢.

مسوڵمانان بەهێز دەبنو، دوایی كەسانی دیكە لە كافرەكان، لەسەرانیان، لە ناودارانیان مسوڵمان دەبن، وەك (عمر بن الخطاب) و (حمزة بن عبدالمطلب) و ئەوانی دیكە خوا لێیان ڕازی بێو، دوایی مسوڵمانان لە شاری (یثریب) پەیدا دەبنو، ئەویٚ دەبێتە نشینگەی پێغەمبەر ﷺ و، دەبێتە چەقی حوكمڕانیی ئیسلام، دەگونجێ مەبەست ئەوە بێ، یانی: ئێمە ئەو گاڵتە پێكەرانەت لە كۆڵ دەكەینەوەو بۆت چارە دەكەین، بەهۆی بەهێزكردنی ئیسلامو مسوڵمانانەوە .

**مەسەلەی شەشەمو كۆتایی** : خوا بە پێغەمبەرەكەی ﷺ ڕادەگەیەنێ :

ئاگاداری ئەوەیە كە بە قسەكانی كافران سینەی تەنگ دەبێ، بەڵام فەرمانی پێدەكات، كە لە بەرانبەر ئەوەدا ، خوا بە پاك بگریو ستایشی بكاتو كڕنووشی بۆ ببات، هەروەها هەتاكو دەمرێ، بیپەرستێ :

خوا دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدۡ نَعۡلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدۡرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴿٩٧﴾ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٩٨﴾ وَٱعۡبُدۡ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأۡتِيَكَ ٱلۡيَقِينُ ﴿٩٩﴾ ﴾.

**شیكردنەوەی ئەم سێ ئایەتە موبارەكە ، لە شەش بڕگەدا:**

**بڕگەی یەكەم :** - ﴿ وَلَقَدۡ نَعۡلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدۡرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە دەزانین كە سینەت تەنگ دەبێ ، بەهۆی ئەوەوە كە دەیڵێن .

وەك پێشتریش باسمان كرد: هەموو كەسێك بە قسەی خۆش، دڵخۆش دەبێو، بە قسەی ناخۆش، دڵناڕەحەت دەبێ، بە تایبەتی كەسێك سروشتو مەعدەنەكەی هێندە پاكو چاك بێ، وەك پێغەمبەری خاتەم ﷺ، كە

هەرگیز قسەیەکی ناشایستو، وشەیەکی ناڕێکو، هەڵویستێکی دزێوو خراپی بەرانبەر بە کەس دەرنەبڕیبێ، ئینسانی ئاوا، چ پێغەمبەری خاتەم ﷺ، چ هەر کەسێکی دیکە، کە کەمو زۆر وەك پێغەمبەر دەچێو، بە ڕێی پێغەمبەر ﷺ دادەچێ، بە تەئکید بە قسەی ناخۆش، زیاتر دڵی ناخۆش دەبێ .

بۆیە خوا دەفەرموێ : ئێمە دەزانین کە تۆ سینەت تەنگ دەبێ، بەهۆی ئەوەوە کە دەیڵێن.

ئنجا ئایا ئەوەی کە دەیانگوت، چی بوو ؟

١) دەیانگوت : جادووگەرە .

٢) دەیانگوت : شێتە .

٣) دەیانگوت : شاعیرە .

٤) دەیانگوت : ئەفسانەی پێشینانمان بۆ دەگێڕێتەوە .

٥) دەیانگوت : فاڵچی (کاهن)ە .

٦) دەیانگوت : ئەم قسانە کە دەکات، خەڵکی دیکە فێری کردوونو، هی خۆی نین .

وەك خوا دەفەرموێ : ﴿لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلۡحِدُونَ إِلَيۡهِ أَعۡجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾﴾ النحل، واتە: زمانی ئەوەی کە ئاماژەی پێدەکەن، (کە گوایە قورئانت لەو وەرگرتوە) عەجەمییەو، ئەمەش زمانێکی عەرەبیی ڕۆشنە لە تەفسیرەکاندا هاتوە[1]، دوو غولامی نەصرانیی بوون، خەڵکی (عین التمر) بەناوی : (یَسارو جَبْر) هاوبەشدارەکان، گوتوویانە : گوایە ئەوان قورئانیان فێری موحەممەد کردوە! خوا دەفەرموێ: ئەوەی کە ئاماژەی

---

١) وەك لە تەفسیری سوورەتی (النحل)دا هێناومانە، هەروەها بڕوانە :
الإستيعاب في بيان الأسباب، ج ٢ ، ص ٤٢٢، أخرجه الطبري في جامع البيان (١٤/١٢٠) والواحدي في أسباب النزول ص ١٩٠ ، والبيهقي في (شعب الإيمان): ١٣٨ ، قلنا : وسنده صحيح ، صحَّحه الحافظ في (الإصابة) .

پێدەکەن، زمانەکەی زمانی غەیری عەرەبییە، بەڵام ئەم قورئانە زمانێکی عەرەبیی زۆر ڕوونە، کە ڕەوانبێژەکانی عەرەبو، ئەوانە کە زۆر خۆیان بە بلیمەت دەزانن، لە بواری ڕەوانبێژیی و قسە زانییدا، لە بەرانبەریدا بە چۆك داهاتوونو دەستە پاچەن! ئنجا چۆن دەگونجێ کەسێك خۆی چاك عەرەبیی نەزانێ، کەچی قورئانێك بفەرموێ، کە ڕەوانبێژو وتاربێژەکانو، بلیمەتەکانی بواری قسەو وتاری عەرەبیی، لە بەرانبەریدا دەستەو ئەژنۆ بنو، لە بەرانبەریدا بە چۆك دابێن ؟!

<u>بڕگەی دووەم</u> : - ﴿يَضِيقُ صَدْرُكَ﴾، سینەت تەنگ دەبێ.

(ضِيقُ الصَّدْرِ: مَجَازٌ عَنْ كَدَرِ النَّفْسِ)، واتە: سینگ تەنگ بوون، مەجازە بۆ دەروون لێڵ بوون، مەبەست ئەوەیە کاتێك دڵی ئینسان لێڵ دەبێو، دڵی نارەحەت دەبێو خەفەت دەخوات، مەبەست ئەوەیە، ئەگەرنا، سینە بەرهەستەکە، ئەو سینەیەی کە دیارە، بۆ خۆی تەنگ نابێتەوە، بەڵکو مەبەست دڵنارەحەت بوونو، خەمبار بوونە .

<u>بڕگەی سێیەم</u> : - ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ﴾، واتە: پەروەردگارت بە ستایش کردنیەوە، بە پاك بگرە، (أي قُل: سُبْحَانَ اللهِ، والحَمْدُ للهِ)، بڵێ: خوا بە پاك دەگرمو ستایشی خوا دەکەم ، پاکیی بۆ خواو ستایش بۆ خوا، چونکە وشەی (سُبحانَ) ئەسڵی خۆی ئاوایە : (أُسَبِّحُ اللهَ تَسْبِيحاً)، یانی: من بە پاکگرتن، خوا بە پاك دەگرم .

<u>بڕگەی چوارەم</u> : - ﴿وَكُن مِّنَ ٱلسَّـٰجِدِينَ﴾، لە کڕنووشبەران بە، واتە: بەردەوامبە، لەسەر نوێژ، کە ئەمە ماناکەی بەهێزترە لەوەی فەرمووبای: (وَكُنْ سَاجِداً)، یان (وَاسْجُدْ) واتە: کڕنووشبەربە، یان کڕنووش بەرە ، چونکە : ﴿وَكُن مِّنَ ٱلسَّـٰجِدِينَ﴾، لەگەڵ کڕنووشبەران بە، واتە: ئەوەندە سیفەتی کڕنووش بردن لە خۆتدا بێنە دی، کە بچیە نێو جەرگەو قووڵایی ئەوانەوە کە بۆ خوا کڕنووش دەبەن، کە بە تەئکید مەبەست لە (سَاجِدِين)

لێرەدا نوێژکەرانن. بەڵام لەبەر ئەوەی کڕنووش (سجدة) بردن لە نێو نوێژدا، گرنگترین بەشی نوێژەو، ئەوپەڕی ملکەچیی مرۆڤ بۆ خوا، لە کاتی کڕنووش بردندا، دەردەکەوێ، بۆیە خوای پاکو بێگەرد، لێرەو لە چەند شوێنێکی دیکەدا، بە تایبەت باسی کڕنووش بردن (سجود) دەکات .

__بڕگەی پێنجەم :__ - ﴿ وَٱعۡبُدۡ رَبَّكَ ﴾، پەروەردگاری خۆت بپەرستە .

یانی: بە هەموو شێوەکانی پەرستن، نوێژ، سەجدە بردن، چ ڕکووع، غەیری نوێژ، بە هەموو شێوەکانی پەرستن، پەروەردگارت بپەرستە.

__بڕگەی شەشەم :__ - ﴿ حَتَّىٰ يَأۡتِيَكَ ٱلۡيَقِينُ ﴾، هەتا یەقینت بۆ دێ .

وەك دەبینین: خوای پاكو بێگەرد لە بەرانبەر قسەو قاڵی کافرەکانداو، بۆ چارەسەری ئەو دڵ تەنگبوونەی، کە بەهۆی قسەی کافرەکانەوە بەسەری دێ، ئەو خەفەت خواردنە، ڕێنمایی پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکات: پێشێ کە خوا بە پاك بگرێو ستایشی بکات، دوایی نوێژی چاك بکات، لە نێو نوێژیشدا کڕنووش بردن، پاشان بە گشتی پەروەردگاری خۆی بپەرستێو بەندایەتیی بۆ بکات .

کە دەفەرموێ : ﴿ حَتَّىٰ يَأۡتِيَكَ ٱلۡيَقِينُ ﴾، (اليَقينُ: الإِعْتِقَادُ الجازِمُ الثَّابتُ، فَكَأَنَّ المَوْتَ نَفْسَهُ يَقينٌ)، وشەی (یقین) واتە: بڕوا بوون بە شتێك، بە شێوەیەك خۆی لەسەر ساغ بکاتەوە، بچەسپێنێ، وەك مردن، خودی یەقین بێ .

دەشگونجێ مەبەست لە یەقین، قیامەت بێ، واتە: تاکو قیامەت دێ، کە ئەویش – بۆ باوەڕدار – گومانی تێدا نیە کە دێ، یان مەبەست پێی (سَاعة)یە، کە ئەگەر قیامەت، کافرەکان دوو دڵیی و گومانیان تێیدا بووبێ، بەڵام ئاخیر زەمان (سَاعة) بە مانای تایبەتیی، کە بریتییە: لە کۆتایی پێهاتنی ژیانی هەر کەسێك، کە ئەوە شتێکی جێی دڵنیاییە، چ بە مانای کۆتایی هاتنی ئەم ژیانە دنیاییە، ئەویش ئێستا شتێکی مسۆگەرو جێی دڵنیاییە، چونکە: ئەگەر کاتی خۆی کە زانست هێندە بەرەو پێشەوە نەچوو بوو، دوودڵیی و گومانێکیان لەوەدا بووبێ، کە ئەم ژیانە دنیاییە کۆتایی

پێ دێ، ئێستا دوای ئەوەی زانست بەرەو پێش چووە، زانستی گەردوونناسیی و فیزیا، دەڵێ : کۆتایی هاتنی ئەم ژیانە دنیاییە، کۆتایی هاتنی ئەم گەردوونە، بۆتە شتێکی بەڵگە نەویست و ڕوون و ئاشکرا، بە تایبەت بە پێی یاسای دووەمی (دینامیکای گەرمیی)، کە بەردەوام لە تەنە گەرمەکانەوە گەرمیی دەچێ بۆ ساردەکان و، دوایی یەکسان دەبن لە گەرمییداو، ئەو کاتەش جوولە نامێنێ و ئەم بوونەوەرە کۆتایی پێدێ، واتە: ئەگەر خوای پاک و بێگەردیش لە کاتێکی دیاریکراودا، کۆتایی پێنەهێنێ، گەردوون هەر بۆخۆی کۆتایی پێدێ، بۆخۆی سروشتەکەی وایە، ناتوانێ بەردەوام بێ[1].

ئنجا ئەوە کە مەبەست لە (یقین) لێرەدا: مردنە، ئێمە لەوبارەوە سێ (٣) بەڵگە دێنینەوە :

بەڵگەی یەکەم : لە سوورەتی (المُدثر)دا، خوا لەسەر زمانی کافرەکان دەفەرمووێ: ﴿ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ الدِّينِ ﴿٤٦﴾ حَتَّىٰ أَتَانَا الْيَقِينُ ﴿٤٧﴾ ﴾، واتە: ئێمە لە ڕابردوودا، لە دنیادا بە ڕۆژی سزاو پاداشت بێبڕوا بووین، بە درۆمان دادەنا، تاکو یەقینمان بۆ هات، واتە: تاکو مردین، هەر کات مردی، ئەو کاتە دەزانی کە ڕۆژی دوایی و هەموو ئەو شتانەی کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەواڵیان پێداوە، ڕاستە .

بەڵگەی دووەم: پێغەمبەر ﷺ کاتێک (عثمان بن مظعون) وەفاتی کردوە، فەرموویەتی: {أَمَّا عُثْمَانُ فَقَدْ جَاءَهُ الْيَقِينُ وَإِنِّي لأَرْجُو لَهُ الْخَيْرَ ، وَوَاللهِ مَا أَدْرِي وَأَنَا رَسُولُ اللهِ ، مَا يُفْعَلُ بِي}، (أخرجه البخاري: ١٢٤٣) .

واتە : (پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :) هەرچی عوسمانە، یەقینی بۆ هات، (واتە: مردنی بۆ هات) و من خێری بۆ چاوەڕێ دەکەم و بە ئومێد دەخوازم، بەڵام سوێند بە خوا ، من کە پێغەمبەری خوام، نازانم چیم پێدەکرێ !

---

١) لە موسووعەی (ئیمان و ئیلحاد)دا، زۆر بە درێژیی لەوبارەوە دواوین، واتە، مەوسووعەی : { دەرەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد، لەبەر تیشکی: زگماک و عەقڵ و زانست و وەحیی دا}.

ئەوەش لە وەڵامی کەسێك دابوو، کە گوتی: (عثمان بن مظعون) بۆخۆی جێگای بەهەشتە، ئەویش بەرپەرچی ئەوی دایەوە، کە ئەوە مەڵێ، من خێری بۆ چاوەڕێ دەکەم، بەلام کەس بۆی نییە، بە جەزمیی بڵێ: فلانکەس لە بەهەشتە، یان فلانکەس لە دۆزەخ دایە، مەگەر کەسێك کە بە ئاشکرا دیار بێ، کە لەسەر کوفر مردوە، واتە: لەوبارەوە خوا هەواڵی دابێ، یاخود رواڵەتیی ئاشکرای حاڵەکەی وای پێشان بدا .

<u>بەڵگەی سێیەم :</u> لەسەر ئەوە کە یەقین بە مانای مردنە، نەك بە مانای دڵنیایی، ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ هەتا گیانی سپاردوە، لەسەر نوێژ بەردەوام بووە، تەنانەت نوێژەکانی کۆتایی تەمەنی، یاخود کۆتا نوێژی دوو کەس چوونە بن باڵی : عەبباس و عەلی کوڕی ئەبی تالب خوا لێیان ڕازی بێ، وەك لە (صحیح البخاري)دا هاتوە[1]، چوونە بن باڵی، (نەیتوانیوە بۆخۆی بچێ)، تاکو چووە ڕاوەستاوە، لە ڕیزی نوێژدا، کە ئەبوو بەکر خوا لێی ڕازی بێ نوێژی بە مسوڵمانان دەکرد .

زانایانیش بۆیە ئەو بەڵگانەیان هێناون، چونکە هەندێك لەوانەی کە لە بن باڵی تەصەووفدا جموجۆڵی تێکدەرانەو لادەرانەیان بووە، هەندێك جار وشەی یەقینیان بەوە لێکداوەتەوە کە یانی : دڵنیایی، وەك ئەو بیرۆکە لادەرانەیە کاتی خۆی لە ناوچەی (بارزان) بووەو لە ناوچەی (شەدەڵەش) بووەو، لە مێژووی ئیسلامیشدا لە چەند شوێنێك دا بووە، کە ئەوانەی خۆیان بە شێخی خەڵکەکە زانیوە وازیان لە نوێژو ڕۆژوو هێناوە، بگرە هەیانبووە سزای خەڵکیشیان داوە، کە نوێژو ڕۆژویان کردوە! هەشیان بووە بە خەڵکیان گوتوە: بۆ خۆم نوێژ ناکەمو ڕۆژوو ناگرم، ئێوەش کەیفی خۆتانە! شایانی باسیشە بە زۆریی ئەو گرووپە تێکدەرو سەر لێشێوێنەرو لادەرانە، لە بن باڵی تەریقەت و تەصەووفدا بوون، هەڵبەتە پێشەوایانی تەصەووف لە ڕۆژگاری خۆیاندا ، هەوڵیان داوە لە هەموو کەس بەدینتر بن، چاکتر بن، پابەندتربن بە شەریعەتەوە، ئازاترین بۆ نوێژ، بۆ ڕۆژوو، بۆ هەموو کردەوەیەکی چاك،

---

١) صحيح البخاري : ٧١٢ .

بەڵام كەسانێك هەبوون، لە بن باڵی تەریقەتو تەصەووفدا، ویستوویانە سەر لە خەڵك بشێوێنن .

ئنجا ئەوانە ئەم ڕستەیان كردۆتە بەڵگەو بیانوو، گوتوویانە خوا فەرموویەتی : ﴿ وَٱعۡبُدۡ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأۡتِيَكَ ٱلۡيَقِينُ ٩٩ ﴾، واتە: پەروەردگارت بپەرستە، تاكو یەقینت بۆ دێ، گوتوویانە: ئێمەش یەقینمان بۆ هاتووەو گەیشتووینە پلەی یەقین، واتە: دڵنیایی، ئێمە دڵنیاین لە هەموو ڕاستییەكانی ئایین، خواش فەرموویەتی، هەتا یەقینتان بۆ دێ، پەروەردگارت بپەرستەو، ئێمەش یەقینمان بۆ هاتووە بۆیە ئێمە خواپەرستییمان لەسەر نەماوە! ج فێڵێك بووە شەیتان لێیكردوون، یاخود بۆخۆیان ئەو فێڵەیان لە خۆیان كردووەو لە خەڵكیشیان كردوە، بەڵام بە تەئكید - وەك باسمان كردوە - یەقین لێرەدا بە مانای مردنە، چونكە هیچ كەس گومانی لەوەدا نیە كە دەمرێ، بۆیە خوای كارزان ئەو وشەیەی وەك ناو (إسم) بۆ (مردن) بەكارهێناوە .

# سەرنجێکی پێویست

خوای پاك و بێگەرد کە لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: ﴿ لَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ ﴾، دەبێ بزانین کە مەبەست ئەوە نیە، چ بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ، چ بۆ شوێنکەوتووانی، کە گرنگیی بە ژیانی دنیا نەدەن، هەروەها دەبێ بزانرێ: کەسێك جوانییەکی ژیانی دنیای پێ جوان بێت، یان خواردنێکی خۆشی پێخۆش بێ، یان بەرگ و پۆشاکێکی جوانی حەز لێ بێ، یان کەسێك هاوسەرگیریی بکات، یان بۆنی خۆشی پێخۆش بێ و شتی چاکی پێ چاکبێ و... هتد، ئەوە هیچی تێك ناگیرێ، لەگەڵ ئەو فەرموودەیەی خوادا، چونکە دەفەرموێ: ﴿ لَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ ﴿٨٨﴾ ﴾ واتە: ئەوەی کۆمەڵێك لەوانمان پێ بەهرەمەند کردوە، چاوی تێ مەبڕەو، بەوە سەرسام مەبە، ئەگەرنا، ئەگەر مسوڵمان ماڵی حەڵاڵ بەدەست بێنێ، کارو کەسابەت بکات، خاوو خێزانی هەبێ، خانووبەرەی باشی هەبێ، بەرگ و پۆشاکی چاك بێ، بۆنی خۆی خۆشبکات، پێڵاوی جوان بێ، پۆشاکی جوان بێ، ئەوە ناکۆك نیە لەگەڵ ئەو ئایەتەدا، نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو لە چەندان ئایەتداو، لە چەندان فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، کە خوا هەرچی نازو نیعمەتە لەم سەرزەوییە، بۆ بەندەگانی بەدیهێناوەو، دەبێ لێیان بەهرەمەند بن، گرنگ ئەوەیە زێدەڕۆیی نەکەن و، لەسەر حیسابی خەڵك نەبێ و، بە حەرامیی نەبێت، بۆ وێنە:

١ - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {إِنَّمَا حُبِّبَ إِلَيَّ مِنْ دُنْيَاكُمْ: النِّسَاءُ وَالطِّيبُ، وَجُعِلَتْ قُرَّةُ عَيْنِي فِي الصَّلاةِ}، {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ: ١٢٣١٥، وَالنَّسَائِيُّ: ٣٩٣٩، وَأَبُو يَعْلَى: ٣٥٣٠، وَالحَاكِمُ: ٢٦٧٦، وَقَالَ: صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ، وَالبَيْهَقِيُّ: ١٣٢٣٢، وَاللَّفْظُ لِلنسائي}.

واتە: بێگومان لە ژیانی دنیاتاندا : ئافرەتانم لەلا خۆشەویست کراون و بۆنی خۆش و، تروسکایی چاوم، (یان ئەوەی دڵم ئارامی پێدەگری) لە نوێژدایە، واتە: دڵ ئارامیی من و ئەوەی کە لە هەموو شت زیاتر چێژی لێوەردەگرم، نوێژو خواپەرستییە .

ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئافرەتیشم خۆشدەوێن، بۆ هاوسەرگیریی بە حەڵاڵیی و، بۆنی خۆشیش .

هەروەها پێغەمبەر ﷺ بەرگی جوانیشی لەبەرکردووەو، خواردنی خۆشیشی ئەگەر لێ هەڵکەوتبێ، خواردوویەتی، بەڵام زێدەڕۆیی تێدا نەکردووە، نەیکردوە بە ئامانج، مسوڵمانانیش دەبێ وابن .

٢ـ هەروەها پێغەمبەر ﷺ مەدحی سەروەت و سامانی ئەبووبەکر (رضي الله عنه)ی کردووە، فەرموویەتی: هیچ ماڵ و سامانێك هێندە بە کەڵکم نەهاتووە، وەك ماڵ و سامانی ئەبووبەکر بە کەڵکم هاتووە: {إنَّ أَمَنَّ الناس عليَّ في صحبته بماله و نفسه: أبوبكر}، رواه البخاري (٣٦٥٤):

٣ـ کاتێك عوسمان خوای لێ ڕازی بێ لە جەنگی تەبووکدا ماڵ و سامانێکی زۆری بەخشی و هاوکاریی زۆری سوپایەکەی پێغەمبەری ﷺ کرد، سەد (١٠٠) حوشتری بە بارەوە بەخشی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : {مَا ضَرَّ عُثْمَانَ مَا عَمِلَ بَعْدَ الْيَوْمِ}، {أخرجه الترمذي: ٣٧٠١، وحسَّنَه الألباني} .

واتە: لەمەودوا عوسمان هەر شتێك بکات، زیانی لێنادات، واتە: چاکەیەکی هێندە گەورەی کردوە لەگەڵ ئیسلام و مسوڵماناندا، دەبێتە قەرەبووکەرەوەو سڕەرەوەی ئەوەی کە لە دواییدا دەبێ، ئەگەر کەم وکورییەکی لەدەست بقەومێ، کە ئەوە ئاماژە بوو بۆ ئەوە، کە عوسمان خوا لێی ڕازی بێ، لە کۆتایی تەمەنیدا، هەندێك تێبینی و سەرنجی لەسەر پەیدا بوون، کە وەك (ابن تيمية) ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: عوسمان ئەو توندو تۆڵیی (حَزْم)ەی ئەبووبەکرو عومەر خوا لێیان ڕازی بێ، هەیانبوو، ئەو نەیبوو، بە لای نەرمیی و لێبووردن و چاوپۆشیی دا تێیبەڕاند بوو، بە تایبەت بە نسبەت خزمەکانییەوە، زیاتر لای نەرمیی دەگرت، ئەوانیش هەندێك لە خزمە

خراپەکانی، میهرەبانییو چاکیی عوسمانیان، ئیستیغلال کردو، سەرەنجام ئەوە قەوما کە قەوما، کە بە تەئکید ئەوەی لە دژی عوسمان کرا، ناهەقو ستەم بوو، کەموکورییەکەی بایی ئەوە نەبوو، کە بەو شێوەیە بێ، بەلاّم گرنگ ئەوەیە: ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ ئاماژە بووە بۆ عوسمان خوا لێی ڕازی بێ، کە پێشتر لە کاتی سەغڵەتییو ڕۆژە نارەحەتەکاندا، هەڵوێستی وای نواندووەو کاری وایکردوە، کە لە داهاتوودا، ئەگەر کەموکورییو هەڵەو پەڵەیەکی ببێ، ببێتە هۆی سڕینەوەیو ببێتە قەرەبووی .

٤ـ ئنجا با ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێنین، کە لەگەڵ واتای ئەو ئایەتەدا گونجاوە، کە خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: لە سۆنگەی ئەوەوە، کە ئێمە حەوت ئایەتە دووبارەبووەوەکانو قورئانی مەزنمان بە تۆ داوە چاو مەبڕە ئەوەی کە هەندێك لەو خەڵكە بێبڕوایانەمان لێ بەهرەمەند کردوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {لَيْسَ مِنا مَنْ لَمْ يَتَغَنَّ بالْقُرآنِ}، {أخْرَجَهُ البُخَارِيُّ: ٧٠٨٩، وَأبُو دَاوُدَ: ١٤٧٠، وَابْنُ حِبان: ١٢٠}.

واتە: هەر کەسێك بەهۆی قورئانەوە بێنیاز نەبێ، لە ئێمە نیە .

واتە : تۆ مادام ئەهلی قورئانی، دەبێ خۆت بە بێنیازو دەوڵەمەند بزانیو، چاوت لە دەستی کەس نەبێ، چاو نەبڕیە هیچ شتێکی دیکە، واتە: تۆ مادام ئەهلی قورئانی، دەبێ خۆت زۆر پێ دەوڵەمەندو بەهرەمەندو بێنیاز بێ .

ئەم واتایەش بۆ وشەی (يَتَغَنَّ) چاکترەو گونجاوترە لەوەی کە هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست لە (يَتَغَنَّ) واتە: ئەوەی کە دەنگی بە قورئان نەلارێنێتەوەو دەنگی خۆی پێخۆش نەکات، بەڵکو ئەم فەرموودەیە، واتە: {لَيْسَ مِنّا مَنْ لَمْ يَسْتَغْنِ بالْقُرآنِ}، یانی: هەر کەس بەهۆی قورئانەوە بێنیاز نەبێ، خۆی بە دەوڵەمەند نەزانێ، ئەوە لە ئێمە نیە، چونکە مادام خوا نیعمەتی قورئانت پێ ببەخشێو هیدایەتت بدات، بەدوای فەرمایشتی خوا بکەوی، دەبێ خۆت زۆر پێ دەوڵەمەندو بێنیازو بەهرەمەند بێ، بە شێوەیەك کە وات لێبکات: بێ ئیحتیاجو بێنیازت بکات، لەوەی کە چاو ببڕیە زرقو برقێکی ژیانی دنیا، کە بە دەست ئەهلی کوفرو نیفاقەوە هەیە، کە ئەویش بە

زۆریی وایە، بەهۆی ستەمو لە ڕێی حەرامەوە دەستگیریان بووە، ئنجا چ بە دەستی ئەهلی کوفرەوە بێ، ﴿ ﴾ بە دەستی کەسانێکەوە ﴿ ﴾ کە خۆشیان بە مسوڵمان دەزانن، یان مسوڵمانیشن، بەڵام مادام لە ڕێی حەرامو لە ڕێی خراپەو ناشەرعییەوە، سەروەتو سامانێکیان وەسەرێک ناوە[1]، پێت گرنگ نەبێو بایەخی پێ مەدە، مادام ئەهلی قورئانی، ئەو قورئانە نیعمەتێکە، کە گەلێنی هەموو نیعمەتان پڕ دەکاتەوە ﴿ ﴾ بەڵام بێگومان هیچ نیعمەتێک، گەلێنی نیعمەتی قورئانو ئیمانو ئیسلام پڕناکاتەوە ﴿ ﴾.

# هەڵوەستەیەك لە بەرانبەر بەش بەشکردنی قورئان و ئیسلام دا

لێرەدا دەبێ ئەوە بزانین: قورئان کە کتێبی کۆتایی خوایەو دوا پەیامی خوایەو، بە کۆتا پێغەمبەری خۆی موحەممەددا ﷺ رەوانی کردوە، ئەم قورئانە دەبێ هەمووی پێکەوە وەربگیرێو، نابێ بەش بەش بکرێ، مەبەستم ئەوەیە کە بەڵێ: کافرەکانی مەککە قورئانیان بەش بەش و پۆلێن دەکرد: ئەوە جادوویە، ئەوە شیعرە، ئەوە ئەفسانەی پێشینانە، ئەوە قسەی کاهینانە .

هەروەها خاوەن کتێبەکان ، دەیانگوت ، ئەوەندەی لەگەڵ کتێبی ئێمەدا دەگونجێ، وەریدەگرین، ئەوەی لەگەڵ پەیمانی کۆندا دەگونجێ، ئەوەی لەگەڵ چوار ئینجیلەکاندا دەگونجێ، بەڵام ئەوەی ناگونجێ، وەریناگرین! بەڵام دەبێ ئاگاداری ئەوە بین، کە ئەو دابەشکردنی قورئانە، هەرچەندە خوای پاك و بێگەرد لێرەدا مەبەستی پێ ئەهلی کوفرە، بەڵام زۆرجار مسوڵمانانیش ئەگەر لە خۆ وریا نەبن، سیفەتەکانی ئەهلی کوفر، چ خاوەن کتێبەکان و، چ غەیری ئەوانیش، وەك هاوبەشدانەر و بتپەرستەکانیش، سیفەتی ئەوان هەڵدەگرنەوەو، ئاکارەکانی ئەوان لە خۆیاندا دووبارە دەکەنەوە .

ئێستاش ئەگەر کەسانێك لە مامەڵەیان لەگەڵ قورئاندا: یەکێکیان تەنیا بۆ ئەو ئایەتانە بگەرێ کە بۆ نموونە: باسی لایەنی فیکریی دەکەن و، ئەوەی دیکە تەنیا ئەو ئایەتانە بێنێ ، کە باسی لایەنی حوکم و سیاسەت دەکەن، ئەوەی دیکە تەنیا ئەو ئایەتانە بێنێ ، کە باسی لایەنی رووحیی، دەکەن: پەروەردەو تەزکیەی نەفس و...هتد و، یەکێکی دیکە تەنیا ئەو ئایەتانە بێنێ کە باسی جەنگ و جیهاد

دەكەن‌و، یەكێكی دیكە تەنیا ئەو ئایەتانە بێنێ، كە باسی لایەنی بانگەواز دەكەن‌و ... هتد، بێگومان ئەوەش جۆرێكە لە دابەشكردنی قورئان، بە پێی ئارەزووا بەڵێ مسوڵمانان :

<u>یەك</u> : دەگونجێ لە نێوان خۆیاندا بە پێی پسپۆڕیی، بە پێی ئەوە هەر كەسێك چی لە توانادا هەیە، چی باشتر دەزانێ، ئەركەكانی ئیسلام لە بەینی خۆیاندا دابەشكەن، بەلام نابێ هیچ كامیان تەنیا ئەوەی خۆی بە ئیسلام بزانێ‌و، ئەوەی لە دەرەوەی ئەو بازنەیە، بە جیا لە ئیسلامی بزانێ .

<u>دوو</u> : نابێ هیچ كامیان دەمارگیریی بۆ شتەكەی خۆی هەبێ‌و، هەستیاریی بەرانبەر كاری ئەوانی دیكەو بازنەكانی چالاكی ئەوانی دیكە، هەبێ، كە بەداخەوە ئێستا لە نێو مسوڵمانانداا، ئەوە هەیە، بۆ وێنە :

١/ هەندێكیان تەنیا بە دوای ئەو ئایەت‌و فەرمایشتانەدا دەگەڕێن كە باسی ئیمان‌و عەقیدە دەكەن، ئەویش ئیمان‌و عەقیدەكە بە تێگەیشتنی خۆی، یان بە تێگەیشتنی هەندێك كتێب‌و نامیلكە كە زانایەكی دیاریكراو نووسیونی، لە كاتێكی دیاریكراوو لە ژینگەیەكی دیاریكراودا، كە ڕەنگە بۆ ئەو ژینگەیەی وی پێویست بووبێ، كە لەو ڕووەوە باسی ئیمان‌و عەقیدە بكات، بۆ نموونە: باسی سیفەتە خەبەرییەكان‌و باسی شیركی گۆڕەكان (شرك القبُور) زەق بكاتەوە، چونكە ژینگەكەی وابووەو، ئەوەی بە پێویست زانیوە، بەلام مەرج نیە ئەوە بۆ هەموو كات‌و شوێنێك گونجاو بێ .

٢/ هەروەها هەندێكی دیكە لە مسوڵمانان، تەنیا شوێن یەكێكی دیكە لە زانایانی ئیسلام دەكەون، كە لە واقیع‌و قۆناغی خۆیدا، گرنگیی پێدان‌و جەختكردنەوەی لەسەر لایەنی ڕووحیی بووە، لایەنی عیرفانیی‌و تەزكیەی نەفس .

٣/ هەورەها هەندێكی دیكەیان تەنیا زانایەكی دیكە دەكەنە سەرمەشقیان كە زیاتر تەركیزی لەسەر لایەنی جەنگ‌و جیهاد بووە.

٤/ هەورەها بەشێكی دیكەیان تەنیا یەكێكی دیكە لە زانایان كە داكۆكیی لەسەر لایەنی پەروەردەیی كردوە، دەكەنە چاوساغ ‌و پێشەوایان كە بێگومان هیچ

كەس بۆی نیە، تەنیا ئەو بەشەی خۆی بە ئیسلام بزانێ و، ئەوەی دەرەوەی چالاكییەكانی خۆی، بە شتێكی نامۆ لە ئیسلام بزانێ، یان ئەوەی خۆی بە چاكتر بزانێ لەوەی دیكە! لە ڕاستییدا قورئان هەمووی چاكەو، ئەركەكانی ئیسلام، هەموویان باشن، بەڵام هەر كەسە شتێكی لێدێ، هەر كەسە شتێك چاكتر دەزانێ، هەر كەسە لە ڕوویەكەوە باشتر خوای پەروەردگار تواناى پێداوە، بەڵام دەبێ هەموویان دان بە یەكدی دابێنن، بۆ ئەوەی وەبەر حوكمی ئەو دوو ئایەتە نەكەون، كە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا ۖ كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾ الروم، واتە: لە هاوبەش بۆ خوا دانەران مەبن، ئەوانەی ئایینەكەی خۆیان بەش بەش كردو، پەرتەوازەو كۆمەڵ كۆمەڵ بوون و، هەر كامێكیان بەوەی كە خۆی لەسەریەتی، پێی دڵ خۆشە .

ئا، تۆ دەبێ بەوەی خۆشت دڵ خۆش بی، كە بەشێك، كارێك لە كارەكانی ئیسلام، ئەنجام دەدەی و، دەبێ بەوەی براو خوشكەكانی دیكەشت دڵ خۆش بی، كە ئەوانیش لە قوڵێكی دیكەوە لە ڕوویەكی دیكەوە بە شێوەیەكی دیكە، دڵسۆزیی بۆ ئیسلامو مسوڵمانان دەخەنە ڕوو .

# یازدە (١١) ڕێنمایی و ئامۆژگاری گرنگی خوا بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ

ڕێنمایی (١) : خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : ﴿ فَٱصۡفَحِ ٱلصَّفۡحَ ٱلۡجَمِيلَ ﴿٨٥﴾ ﴾
بە چاوپۆشییەکی جوان چاوپۆشییان لێبکە، واتە: لەگەڵیاندا بە، ڕووحێکی پاک و، بە دڵێکی فراوانەوەو، ڕەوشت و ناکارێکی پەسندەوە، مامەڵە بکە .

ڕێنمایی (٢) : کە دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَٰكَ سَبۡعٗا مِّنَ ٱلۡمَثَانِي وَٱلۡقُرۡءَانَ ٱلۡعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ ﴾
بە دڵنیایی ئێمە حەوت لە دووبارەبووەوەکان و قورئانی مەزنمان بە تۆ داوە .

واتە: شتێکی مەزنمان بە تۆ داوە، ئەی موحەممەد ! ﷺ و نەی هەر کەسێک کە بە دوای پێغەمبەر (محمد) ﷺ دەکەوێ، مادام تۆ ئەهلی قورئانی، مادام ئەهلی ئیسلامی، خوا خەڵات و دیارییەکی زۆر گەورەی بە تۆ داوەو شانازیی پێوە بکەو قەدری بزانە !

ڕێنمایی (٣) : ﴿ لَا تَمُدَّنَّ عَيۡنَيۡكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا مِّنۡهُمۡ ﴿٨٨﴾ ﴾الحجر،
چاومەبڕە ئەوەی کە بەشێکیانمان لێ بەهرەمەند کردوە، لە سەروەت و سامان و ماڵ و جوانیی دنیا، چاوی تێ مەبڕەو، پێی سەرسام مەبەو ، بە شتێکی گرنگ و گەوری مەزانە .

ڕێنمایی (٤) : ﴿ وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ ﴿٨٨﴾ ﴾، خەمیان بۆ دامەگرە، خەمیان لێ مەخۆ، بەهۆیانەوە دڵ تەنگ مەبە، کە بە قسەت ناکەن، کە نایەنە سەر ڕێ،

چونکە تۆ گەیاندنی پەیامی خوات لەسەرەو، هەر کات ئەرکی خۆت جێبەجێ کرد، بەرپرسیارێتیی لەسەر خۆیانە، بەرپرسیارێتیی لەسەر تۆ نیەو، بەهۆیانەوە خەمبارو پەژارەدار مەبە .

رێنمایی (٥) : ﴿ وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ٨٨ ﴾، باڵت شۆڕبکە بۆ بڕواداران، واتە: لەگەڵیان میهرەبان بە، لەگەڵیان بە بەرۆش و بە سۆزو بە بەزەیی بە، ئاگات لێیان بێ، مشوورپان لێ بخۆ، وەك چۆن باڵندەیەك بێچووەكانی خۆی دەخاتە ژێر باڵی خۆیەوەو، باڵیان بۆ شۆڕ دەكاتو، لە بن باڵیان دەگرێ ، تۆش ئاوا ئاگات لە بڕواداران بێ .

رێنمایی (٦) : ﴿ وَقُلۡ إِنِّيٓ أَنَا ٱلنَّذِيرُ ٱلۡمُبِينُ ٨٩ ﴾، بڵێ: منم هۆشیارکەرەوەو ترسێنەری ئاشکرا، واتە: ئەوە ئەركی منەو ، دوای ئەوە خۆتان بەرپرسیارن .

رێنمایی (٧) : ﴿ فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ ٩٤ ﴾، ئەوەی كە فەرمانت پێكراوە، بە دەنگی بەرزی زوڵاڵ رایبگەیەنە، لە ژێر لێوەوە مەیڵێ، بە دەنگی بەرز بیڵێ .

ئەمەش ئامۆژگارییەكی گەورەیە، كە پێشێ ئاراستەی پێغەمبەری خوا كراوە ﷺ، ئنجا هی شوێنكەوتوانیشی، لێرەدا مەبەستم ئەوەیە بڵێم: پێویستە ئەهلی ئیسلام شانازیی بە ئایینەكەی خۆیانو، بە پەیامەكەی خواوە بكەن، بە دەنگی بەرزی زوڵاڵ، پێیان شەرم نەبێ، بە بێ منەت بیڵێن، لە ژێر لێوەوە نەیڵێن، چونكە چ شتێك هەیە لە پەیامی خوا، لە كتێبی خوا، لە رێبازی خوا: گەورەتر، چاكتر، رێكتر، بەڵكو چ شتێك، تۆزی رێگای بەرنامەی خوا بشكێنێ، تۆزی رێی كتێبی خوا بشكێنێ !!

كەواتە: ئەی مسوڵمان ! دەبێ شانازیی بكەی بە ئیسلامو ئیمانی خۆتەوە، بە قورئانی خۆتەوە، بە پێغەمبەری خۆتەوە ﷺ، پێت شەرم نەبێ .

رێنمایی (٨) : ﴿ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٩٤ ﴾، پشت بكە، هاوبەش بۆ خوا دانەران، ئەمە وەك پێشتر باسمان كرد: مەبەست ئەوە نیە كە لێیانگەڕێو وازیان لێبێنە، بەڵكو واتە: پشت بكە ئازارەكەیان، پشت بكە پڕوپاگەندەكانیان، پشت

بکە ئەو قسەو قاڵو تۆمەت بەخشینەوەیان، کە ئاڕاستەی تۆی دەکەن، ئەوە نادیدە بگرە، وابزانە هەر لەگەڵ تۆشیان نیە، دڵی خۆتی پێوە سەغڵەت مەکە، چونکە تفی بەرەو سەر، بۆ خاوەنی دەگەڕێتەوە چونکە کەسێك قسەیەکی پێ بگوترێ، شایستەی نەبێ، قسەکەرەکە خۆی لێی زەرەرمەندە .

ڕێنمایی (٩) : ﴿ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ ﴿٩٨﴾ ﴾، بە بە پاکگرتنەوە ستایشی پەروەردگارت بکە، یانی: هەم بە پاکی بگرە، هەم ستایشی بکە، بە پاکی بگرە لە کەموکوڕییەکانو، ستایشی بکە، بە ناوە هەرە بەرزەکانیو، سیفەتە هەرە پەسەندەکانی، کە هەر شایستەی خوای بەرزی بێ وێنەن .

ڕێنمایی (١٠) : ﴿ وَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٩٨﴾ ﴾، لە کڕنووشبەران بە، ئەوانەی کە زۆر کڕنووش بۆ خوا دەبەن، واتە: زۆر نوێژ دەکەن، چونکە (سَجْدَة) بریتیە: لە پایەی هەرە گەورەی نوێژو بەندایەتیی کردن بۆ خوا .

ڕێنمایی (١١) : ﴿ وَٱعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ ﴿٩٩﴾ ﴾، پەروەردگاری خۆشت بپەرستە، تاکو مردنێکت دەگاتێ، کە دوودڵیی تێدانیە، مردنێکت دەگاتێ، کە لێی دڵنیایی، تاکو گیان دەسپێری، بەندایەتیی بۆ پەروەردگاری خۆت بکە .

خوا ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ، کە بە پێی ئەم یازدە (١١) ئامۆژگاریی و ڕێنماییەی، خوای پاكو بێگەرد، بەڕێوە دەچن، خوا بمانگێڕێ لە کەسانێك کە هەتا ڕووحە ئەمانەتەکەمان تەسلیمی خوای پەروەردگار دەکەینەوە، بەندەی ڕاستو ساغو پاكو چاکی خوای پەروەردگار بین .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

کۆتا پێداچوونەوەی ئەم بەرگە :

٢٢ ی صفر ١٤٤١ ك - ٢٠١٩/١٠/٢١ ز

هەولێر

# سەرچاوەکان


١) تفسير الطَّبَري المُسمى جامع البيان في تأويل القُرآن ، لأَبي جَعفَر محمد بن جرير الطَّبَري، تحقيق: هاني الحاج، عماد زكي البارودي، خَيْري سعيد، المكتبة التوفيقية، ٢٠٠٤ القاهرة .

٢) المِصبَاحُ المُنير في تَهْذيب تفسير ابن كثير للإمام الجليل عماد الدِّين أَبي الفداء إِسْماعيل بن عُمَر بن كثير القرشي الدمشقي ، إِعداد جماعة مِنَ العُلَمَاء ، بإِشراف الشيخ صَفي الرحمن المباركفوري ، دار السلام ، الطبعة الثانية (١٤٢١هـ - ٢٠٠٠ م) .

٣) التفسير الكبير أَو مَفَاتيحُ الغَيْب للإمام فَخْرالدِّين محمد بن عُمَر بن الحسين بن الحسن ابن علي التميمي البكري الرازي الشافعي ، حَقّقَهُ وَعَلّقَ عَلَيْهِ وَخَرَّجَ أَحاديثهُ عماد زكي البارودي المكتبة التوفيقية .

٤) الجامع لأحكام القُرآن، تفسير القُرطُبي لأبي عبدالله محمد بن احمد الأنصاري القُرطُبي، حَقّقَهُ وَخَرَّجَ أَحاديثهُ عماد زكي البارودي، خَيْري سعيد، المكتبة التوفيقية .

٥) أَحْكَام القُرْآن ، لأبي بَكر محمد بن عبدالله المعروف بابن العربي، راجع اصولهُ وَخَرَّجَ أَحاديثهُ وَعَلّقَ عَلَيْهِ محمد عبدالقادر عطا، الطبعة الأولى (١٤٠٨هـ - ١٩٨٨م) .

٦) فتح القدير، الجامع بين فني الرواية و الدراية من علم التفسير (تفسير الشوكاني) تأليف ، الإمام العلامة محمد بن علي بن محمد الشوكاني ، تحقيق : عبدالرزاق المَهدي ، دار الكتاب العربي ، الطبعة الأولى (١٤٢٠هـ - ١٩٩٩م) .

٧) زاد المسير في علم التفسير : لابن الجوزي .

٨) روح المعاني : للالوسي .

٩) تفسير القاسمي المُسمى محاسن التاويل ، تاليف : علامة الشام محمد جمال الدين القاسمي ، دار الفكر الطبعة الأولى (١٣٩٨هـ - ١٩٧٨م) .

١٠) تفسير المراغي ، تأليف احمد مصطفى المراغي ، دار الفكر ، بيروت .

١١) تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام الْمَنان، تأليف: العلامة الشيخ عبدالرحمن بن ناصر السعدي، تحقيق: عبدالرحمن بن معلا اللويحق مؤسسة الرسالة، الطبعة الأولى (١٤٢٠هـ - ١٩٩٩م).

١٢) تفسير الجواهر للطنطاوي، (دار الكتب العلمية – بيروت ، ١٤٣٧ هـ - ٢٠١٦م).

١٣) صفوة البيان لمَعَاني القُرآن، تأليف: الشيخ حسين محمد مخلوف الطبعة الثالثة.

١٤) صفوة التفاسير، تأليف: العلامة محمد بن علي الصابوني، مكتبة الهداية، اربيل/ العراق، الطبعة الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤م).

١٥) البحر المديد في تفسير كتاب المجيد، ابن عجيبة.

١٦) الأساس في التفسير، تأليف: سعيد حوى، دار السلام، الطبعة الثانية (١٤٠٩ هـ - ١٩٨٩م).

١٧) في ظلال القُرآن، تأليف: سيد قطب دار الشروق، الطبعة الشرعية الخامسة والعشرون (١٤١٧ هـ - ١٩٩٦م).

١٨) التفسير الْمُنير في العَقيدة والشَّريعَة والْمَنْهَج، تأليف: الأستاذ الدكتور وهبة الزحيلي، دار الفكر الطبعة الثالثة (١٤٢٦ هـ - ٢٠٠٥م).

١٩) التحرير والتنوير، محمد الطاهر بن عاشور.

٢٠) تفسير النابلسي، د. مجد راتب النابلسي.

٢١) الميزان، محمد حسين الطباطبائي.

٢٢) تفسير الشعراوي، محمد متولّي الشعراوي.

٢٣) تفسير نمونه، ناصر مكارم شيرازي.

٢٤) تفسير الكاشف، محمد جواد مغنية.

٢٥) التفسير التوحيدي، د. حسن الترابي.

٢٦) مُفرَدات ألفاظ القُرآن، تأليف: العلامة الراغب الأصفهاني، تحقيق: صفوان عدنان داوودي، دار القلم، الطبعة الثالثة (١٤٢٣ هـ - ٢٠٠٢م).

٢٧) الإستيعاب في بيان الأسباب.

٢٨) أسباب النزول، للنيسابوري.

٢٩) لُباب النقول في اسباب النزول، للإمام الحافظ جلال الدين عبدالرحمن بن أبي بكر السيوطي خَرَّجَ أحاديثهُ وَعَلّقَ عَلَيْهِ عبدالرزاق المَهْدي ، دار الكتاب العربي (١٤٢٦ هـ - ٢٠٠٦م) ، (أسباب النزول) للنيسابوري .

٣٠) مختار الصّحاح ، للرازي .

٣١) المعجم الوسيط ، دار الدعوة ، الطبعة الثانية

٣٢) المُوطأ للإمام مالك بن أنس برواية يحيى بن يحيى الليثي ، تحقيق : الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا ، دار المعرفة ، الطبعة الثانية (١٤٢٩هـ - ٢٠٠٨ م)، (أسباب النزول) للواحدي .

٣٣) المُسنَد للإمام أحمد بن محمد بن حنبل ، الناشر مؤسسة قرطبة ، القاهرة ، الأحاديث مذيلة بأحكام شعيب الأنؤوط عليها .

٣٤) صَحيح البُخَاري للإمام أبي عبدالله [redacted] بن إسماعيل البُخَاري ، تحقيق : الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا ، دار المعرفة ، الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤ م) .

٣٥) صَحيح مسلم للإمام الحافظ مسلم بن الحجاج النَّيسابوري ، حقوق اصولهُ و خَرَّجَ أحاديثهُ على الكتب الستة : الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا ، دار المعرفة ، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م) .

٣٦) سُنَن أبي داود للإمام أبي داود سُليمان بن الأشعث السجستاني ، تحقيق : محمد ناصر الدين الألباني ، مكتبة المعارف ، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م) .

٣٧) سُنَن التِّرمذي للإمام الحافظ محمد بن عيسى بن سورة التِّرمذي، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، مكتبة المعارف، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م) .

٣٨) سُنَن النَّسَائي للإمام أبي عبدالرحمن أحمد بن شعيب بن علي الشهير بـ(النَّسَائي)، تحقيق : محمد ناصر الدين الألباني ، مكتبة المعارف ، الطبعة الثانية (١٤٢٩هـ - ٢٠٠٨م) .

٣٩) سُنَن ابْنُ مَاجَهْ، للإمام أبي عبدالله محمد بن يزيد القزويني الشهير بـ (ابْنُ مَاجَهْ)، تحقيق : محمد ناصر الدين الألباني ، مكتبة المعارف، الطبعة الثانية (١٤٢٩هـ - ٢٠٠٨ م) .

٤٠) سُنَن الدار قُطني، للإمام الحافظ علي بن عُمر الدار قُطني ، تحقيق : مجدي بن منصور بن سي الشورى ، دار الكتب العلمية ، الطبعة الثانية (١٤٢٤هـ - ٢٠٠٣ م) .

٤١) الْمُستَدْرَك على الصحيحين للإمام الحافظ ابي عبدالله الحاكم النَّيسابوري، تحقيق: صالح اللحَّام، دار ابن حزم، الطبعة الأولى (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٤٢) صَحيح ابْنُ حبَّان للإمام ابي حَاتم محمد بن حبَّان الخُراساني، تحقيق: حقوق اصولهُ وخَرَّجَ اَحاديثه: الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا، دار الْمعرفة، الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤ م).

٤٣) الْمُعجم الكبير للحافظ ابي القاسم سُليمان بن احمد الطَّبَراني، حَقَّقَهُ وَخَرَّجَ اَحاديثهُ حمدي عبدالمجيد السلفي، مكتبة الأصالة والتُّراث، الطبعة الأولى (١٤٣١هـ - ٢٠١٠ م).

٤٤) سُنَن الدَّارمي للإمام ابو محمد بن عبدالرحمن بن الفضل بن بهرام الدَّارمي، حَقَّقَهُ وَشَرَحَ الفَاظَهُ وَجُمَلَهُ وَعَلَّقَ عَلَيه وَوَضَعَ فَهارِسَهُ: الأستاذ الدكتور مصطفى ديب البغا، دار المصطفى، الطبعة الأولى (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٤٥) مشكاة المصابيح، تأليف: محمد بن عبدالله الخطيب التبريزي، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، المكتب الإسلامي، الطبعة الثانية (١٤٠٥هـ - ١٩٨٥ م).

٤٦) إرواء الغليل في تخريج أحاديث منار السبيل، تأليف: محمد ناصر الدين الألباني، المكتب الإسلامي، الطبعة الثانية (١٤٠٥هـ - ١٩٨٥ م).

٤٧) السراج الْمُنير في ترتيب احاديث صحيح الجامع الصغير، للحافظ جلال الدين السيوطي، العلامة محمد ناصر الدين الألباني، رتبهُ وَعَلَّقَ عَلَيْهِ: عصام موسى هادي، ار الصديق، الطبعة الثانية (١٤٣٠هـ - ٢٠٠٩م).

٤٨) السنن الكبرى تصنيف: الامام ابي عبد الرحمن احمد بن شعيب النسائي، تحقيق: دكتور عبدالغفار سليمان البنداري، وسيد كسروي حسن، دار الكتب العلمية بيروت – لبنان، الطبعة الاولى (١٤١١ هـ - ١٩٩١ م).

٤٩) سلسلة الأحاديث الصحيحة، تأليف: مُحَمَّد ناصر الدّين الألباني، رحمه الله، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع، الرياض، الطبعة الأولى.

# نێوەڕۆك